رۆمان

میکا ڤالتاری

# پیاوێک بەخاچەوە

وەرگێڕانی: ئەیمەن محمد ابراهیم

چاپی یەکەم

٢٠١١

میکاواڵتاری
پیاوێ بەخاچەوە، رۆمان/ میکاواڵتاری، وەرگێڕانی: ایمن محمد ابراهیم
کوردستان، سلێمانی ٢٠١١
ناوی کتێب: پیاوێ بەخاچەوە
زنجیرە (٢٦٣)ی بڵاو کراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی رێنما

پرۆژەی ١٠٠ رۆمان

زنجیرە ٦٣

پیاوێ بەخاچەوە

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی رێنما

چاپی یەکەم، وەرگێڕانی کوردی، أمین محەمەد ئیبراهیم، سەرپەرشتیاری چاپ، صەلاحەدین بایەزیدی، دیزایین و بەرگ: هەرێم یاسین، پاچوونەوەی، جەمال لەتیف، شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج، ٢٠١١

تیراژ ١٠٠٠ دانە

ناونیشان: سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.
ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

## ڕوونکردنەوەیەکی کورت دەربارەی پەیدابوونی مەسیحییەت و ئەوکتێبەی ئێستا

ئەو کتێبەی کە وەرگێڕدراوە فارسیەکەی لەبەردەستی تامەزرۆیانی سەربردەی پێغەمبەرانی خودادایە، مەنەرێکی توێژەرییە لەلایەن "میکاوالتاری" نووسەرو توێژەری بابەتی مێژوویی (فنلەندی))، هەروەکو لە ناونیشانەکەیەوە دیارە، ئەو پێشهاتە مێژووییەی کە لەم کتێبەدا نووسراوە، تایبەتە بە سەردەمی پێغەمبەرایەتی عیسای مەسیح لەسەر خاکی فەلەستین و، ناوەرۆکەکەی لەسەر بنەمای ئەنجامگیری ڕاوەستاوە کە نووسەر سوودی لەهەر چوار ئینجیلی (مەرقۆس، لۆقا، مەتتا و یۆحەننا) وەرگرتووەو لەسەر شێوازی چیرۆك نووسین، لە زاری چیرۆکخوانەوە بەیانی کردووە.

لەگێڕانەوەی سەربوردەکەدا دەردەکەوێت کە چیرۆکخوان، هاوڵاتیەکی ڕۆمییە لە بنەماڵەیەکی ناسراو بەناوی "مەزن تیوس" کەخۆی بینەرو گەواهیدەری ڕووداوەکانی ڕۆژی کۆتایی ژیانی جەستەیی عیسای مەسیح بووە.

چیرۆکخوان، دوای ئەوەی کە پشوویەك وەردەگرێ بۆ کۆتایی هێنان بە خوێندن و سوودوەرگرتن لە پەرتوکخانەکەی "ئەسکەندەرییە"، گەشت دەکات بۆ "میسر"و بە درێژی باسی سەرنجەکانی خۆیشی دەکات لەڕێگەی ئەو نامانەی کە دەینێرێ بۆ دەستگیرانەکەی لە شاری ڕۆما.

ئەو، لەو پەرتوکخانە گەورەیەی ئەسکەندەرییەدا، بەهۆی ئاشنایەتی و هاموشۆکردنی لەگەڵ هەندێك لە زانایان و بیرمەندانذا، ئەوەی بۆ دەرکەوت کە پێشبینی ئەستێرەناسەکانی پێشوو بەڕاست گەڕاوەو، ئەو نیشانانەی کەلە ئەستێرەکان دەردەکەوێت، نیشانی دەدات کە دنیا چۆتە قۆناغێکی تازەوە و ئەوکەسەی پێغەمبەرایەتی جیهان دەکات، لەدایك بووە.

ئەو. دوای ئەوەی لەو ڕووداوە ئاگادار دەبێتەوە، ڕۆژێ لەیەکێ لە شەقامەکانی ئەسکەندەرییەدا دەبینێ پیاوێ بە دەنگێکی بەرز هاوار دەکات:((پادشای جیهان)) لە قودس سەری هەڵداوە.

لەو پیاوە نزیك دەبێتەوەو لێی دەپرسێ: تۆ چون زانیت کە پادشای جیهان لە قودس سەری هەڵداوە؟ ئەو پیاوە بەبێ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی بداتەوە، بەردەوام ئەم ڕستەیە دووبارە دەکاتەوە کە ((پادشای جیهان)) لە قودس سەری هەڵداوە.

دەنگدانەوەی مزگێنی دەرکەوتنی ئەو کەسەی پێغەمبەرایەتی جیهان دەکات و لەهەمان کاتدا نزیك بوونەوەی جەژنی گەورەی جوولەکان (یەهوودییەکان) لەگەڵ بەڕاست گەڕانی پێشبینی ئەستێرەناس و فەیلەسوفەکانی پێشوو، بەتایبەت کاتێ لەلایەن پێشبینیکەرانی سەردەمەکەی پشتگیری لێکرا، ئەو پیاوە گەنج و ناودارە بۆ بینینی خاکی فەلەستین بەشێوەیەك ئارامی لێبڕا کە وای لێ کرد یەکسەرو بەبێ ئەوەی پێشتر بەرنامەی بۆ داڕشتبێ، لەگەڵ گروپێکی گەورەی جوولەکەکان کە بۆ بەشداری کردن لە مەراسیمی جەژنی گەورەی جوولەکە، بۆ فەلەستین دەچوون، بۆ ئەو شوێنە پیرۆزە بەڕێ کەوت.

ئامادەبوونی چیرۆکخوان لە باسکردنی ڕووداوە مێژووییەکەدا، کاتێك دەست پێدەکات کە سەرەتا دەچێتە ناو شاری قودس و لە دەروازەی شاردا کۆمەڵێك دەبینێت کە لەخاڵێکدا کۆ بوونەتەوە. هەڵاهەڵای خەڵکەکە وای لێدەکات بڕوات بۆلای ئەو خەڵکەی کە کۆبوونەتەوە و، بەهۆی ئەو شتەی کە دەیبینێت، تووشی ترس و دڵەڕاوکێ دەبێت. ئەو، لەگەڵ پەیکەری لەخاچ دراوی سێ کەس ڕووبەڕوو دەبێتەوە. لەخاچ دراوی ناوەڕاست بەتاجێکی دڕکاوییەوە کە لەسەریان کردووە، بەشێوەیەکی بێ بەزەییانە مێخی لێدراوە و برینەکانی مەچەك و قاچی بەسەختی خوێناوڵیان کردبوو.

ئەو یەکسەر تێدەگات ئەو دیمەنە ئازاراویە کە پیاوکوژ و خوێنمژانی ڕۆما لە جێبەجێ کردنی فەرمانی (بەکافرکردن) لەلایەن ئەنجومەنی باڵای جوولەکەو فەرمانی کاربەدەستی حکومەتی ڕۆم دروستیان کردووە، هەمان ئەو کەسەیە کە لە ئەسکەندەریە مزگێنی پەیدابوونی لە زمانی پیاوێکی یەهوودییەوە بیستبوو.

گێڕەرەوەی ئەم چیرۆکە، واتە ئەو گەنجە ڕۆمییەی کە لە پەیڕەوانی تەریقەتی ئاینی ڕۆمییەکان بوو کە خودایانی دەستکردیان دەپەرست، کەوتبووە ژێر کاریگەری

مەزڵومیەت، بێ گوناهی، ڕووە نوورانی و ڕەفتاری هێمن و بەرەنگارییە ئازایانەکەی ئەو لەخاچدراوە لەبەرامبەر مەرگدا و، لە لایەکی ترەوە کەوتبووە ژێر کاریگەری هێمنیی لایەنگرەکانی کە لەشوێنی لەخاچداندا، بە باراندنی فرمێسکەوە بینەری کارە بێ بەزەییەکانی پیاوکوژانی ڕۆمی بوون. بە بینینی ئەمانە تیشکێك لە ئیمانی خودایی لە دڵیدا دەدرەوشایەوەو، ئەمانە هەمووی ئەو دەکەنە تامەزرۆیەکی بێقەرار لە ڕاستی پێغەمبەرایەتیەك کە عیسای لەخاچ دراو بانگەوازەکەیی بە ڕاستی و ڕەوایی لە ئەستۆ گرتووە، بۆیە پێداگری لەسەر ئەوە دەکات تا کۆتایی کارەکە لەوێ بمێنێتەوەو هەوڵێکی زۆر بدات بۆ دۆزینەوەی ڕاستی و ئاشنابوونی بە نهێنی پێغەمبەرایەتی و ڕازە نهێنییەکانی پادشایەتی عیسا.*



ئەو بەهۆی پەیوەندی دێرینی بنەماڵەکەیەوە کە لەگەڵ نوێنەری دەوڵەتی ڕۆما هەیبووە، دەچێ بۆ دیداری ئەو نوێنەرەو بە گوتەکانی ژنی فەرمانڕەوادا بۆی دەردەکەوێت کە ئەویش لەدڵەوە بە خۆشەویستی عیسادا ڕۆچووەو، بەهۆی ئەوەی مێردەکەی بەبێ هەڵسەنگاندن خۆی داوەتە دەست بڕیاری ئەنجومەنی باڵای جوولەکەو، فەرمانی کوشتنی کەسێکی بێ تاوانی دەرکردووە، بەسەختی دڵگران و خەمبارەو لەبەرئەوەی مێردەکەی بیری لە دواڕۆژێکی وا ناپەسەند نەکردۆتەوە کە نزای شەڕی هەتاهەتایی بە نسیبی خۆی و خێزانەکەی کردووە، سەرزەنشتی ئەکات.

لەم دیدارەدا، ئەفسەری بەرپرسی جێبەجێ کردنی فەرمانەکان دەچێتە لای فەرمانڕەواو ڕاپۆرتێکی پێ دەدات کە زۆر جێی سەرسوڕمانە.

ڕاپۆرتی ئەفسەرە بەرپرسەکە ئەوە بوو کە پاسەوانە چاودێرەکانی گۆڕی مردووە لەخاچ دراوەکە، شوێنی پاسەوانێتیەکەیان جێ هێشتووەو ئەگەری ئەوە هەیە هەوادارانی عیسا تەرمەکەیان لەشوێنی ئەسپەردەکردنەکەدا ڕفاندبێ و بردبێتیان بۆ جێگەیەکی نادیار!

---

* پادشاهێتی لە فارسیەکەدا "ملکوت" نووسراوەو ئەویش موبالەغەی (مالِك)ە کە مانای (خاوەن)ە، وە (مَلَکوت)یش یانی (زۆر-خاوەن). بەڵام ئەوەندەی من سەیری وەرگێڕاوە کوردیەکەی (ئینجیل)م کرد، ووشەی (پادشاهێتی ئاسمان)م بینیوە کە لەوەوە نزیك بێت، بۆیە منیش بە (پادشاهێتی) وەرمگێڕاوە. (و.کوردی)

فەرمانڕەوا کە لەم ڕووداوە واقی وڕمابوو و نیگەرانی ئەوە بوو خەڵك ئاژاوەیەکی گشتی بەرپا بکەن، داوا لەو گەنجە ڕۆمییە دەکات لەگەڵ ئەفسەرە بەرپرسەکە و چەند سەربازێکدا بڕۆن بۆ شوێنی ئەسپەردەکردنی تەرمەکە و تەنیا خۆی سەیری ناو گۆڕەکە بکات و ئەم هەواڵەی بۆ پشتڕاست بکاتەوەو شوێنی خۆشاردنەوەی دوو پاسەوانە هەڵهاتووەکە بدۆزێتەوەو، لە ئەنجامەکەی ئاگاداری بکاتەوە.

کاتێ گەنجە ڕۆمییەکە دەگاتە شوێنی ئەسپەردەکردنی تەرمەکە، یەکسەر دەچێتە ناو گۆڕەکەو سەرسام دەبێت بەوەی دەیبینێت، چونکە کفنی لەخاچ دراوەکە بەبێ ئەوەی دەستی لێ درابێت و هیچ تەرمێکی تێدا بێت، کەوتبووە گۆشەیەکی گۆڕەکەوە. ئەو، بۆ پشتڕاست کردنەوەی ئەوەی بینیویەتی، ئەفسەرە ڕۆمییەکەش بانگ دەکات بۆ ناو گۆڕەکە بۆئەوەی ئەو شتەی کە بینیویەتی، ئەویش ببینێ. بینینی ئەم حاڵەتە نائاسایی و سەرسوڕهێنەرە بڕوایەکی وای لەناخدا دروست دەکات کە هەواڵی ڕفاندنی تەرمەکە هیچ بنەمایەکی گونجاو و بەجێی نابێت لەلای و تەنها ئەوە نەبێت لەلایەن ئەندامانی ئەنجومەنی جوولەکەوە هەڵبەستراوە کە فەرمانی کافربوونیان دەرکردووە. ئەو حاڵەتە دەست لێنەدراوەی کفنەکە دەریدەخات کە عیسا، بەشێوەیەکی مۆجیزەئاسا دووبارە چۆتە ژیانێکی جەستەییەوە و لەناو گۆڕەکە هاتۆتە دەر!

درك کردن بەم خاڵە دەیگەیەنێتە لوتکەی دڵگەرمی و لەناخیدا باوەڕێکی لەلا دروست دەبێت بۆ مەسیح و، سەبارەت بەوەش کە عیسا نێردراوی خودایەو هەمان ئەو مەسیحەیە کە ئەستێرەناس و فەیلەسوفەکانی سەردەمی ڕابردوو، پێشبینی سەرهەڵدانی ئەویان کردووە و هەستانەوە و پایەداری جەستەکەی لەدوای مردن، مۆجیزەیەکی خودایی و ڕووداوێکی ڕاست و دروستە، باوەڕەکەی بەهێزتر دەکات.

لەوە بەدواوە هەموو بیرکردنەوەیەکی گەنجە ڕۆمییەکە بۆ دۆزینەوەی ڕاستی و پەی بردن بە نهێنییەکانی پێغەمبەرایەتی مەسیح تەرخان دەبێت و، دەڕوات بۆ بینینی زۆربەی ئەو کەسانەی بەدەستی مەسیح لە دەردو بەڵای نەخۆشیەکان ڕزگاریان بووە و چاك بوونەتەوە. بەدوای قوتابییەکانی عیساشدا دەگەڕێ و تەنانەت دوو جاریش مەسیح خۆی پێ نیشان دەدات بەبێ ئەوەی گەنجەکە لەو ساتەدا نێردراوەکەی خودا بناسێتەوە.

لەئەنجامیشدا گەنجە ڕۆمییەکە بەهۆی هیدایەتێکی تەواوو ئیمانێکی نهێنییەوە لەگەڵ هەندێك لە دۆستانی مەسیح-ڕاستگۆترین شوێنکەوتوانی مەسیح- بەرەو شاری (تەبەرییە) کە دەکەوێتە دەڤەری (جەلیلە)وە، بەڕێ دەکەوێت و هەرلەوێ مزگێنی ئامادەبوونی جەستەیی عیسا لەنێو شوێنکەوتوانی مەسیح لە ((کێوی میعاد))، پێش ئەوەی بۆ ئاسمان هەڵبکشێ، دەبیستێت و لەخۆشی مزگێنییەکی.وادا نازانێ چی بکات، بۆیە لەڕۆژی دیاریکراودا بەرەو ((کێوی میعاد)) بەڕێ دەکەوێت و بە تاریکی شەو دەگاتە لوتکەی ((کێوی میعاد)) و لەنێوان یارانی مەسیح و شوێنکەوتوانیدا کە گیانی خۆیان دەکردە قوربانی بۆی، لە بێدەنگیەکی تەواودا چاوەڕێی وادەی دیاریکراو دەبێت بۆئەوەی چاوی بە پێشەوای ئایینی بکەوێت و، لە نیوەی شەودا دەگاتە گرنگترین و دوایین ئارەزووی دڵی خۆی کە ئایەتێك لە میهری خودایی و ڕزگارییەکی هەمیشەیی بوو. دەستکەوتنی ئەو مەعنەویەتە، خاڵی کۆتایی داستانەکەیە.



نووسەری ئەم پەرتوکە هەوڵی داوە بە دەرخستنی گەواهیدەرە بڕواپێکراوەکانی مێژوو و، لەسەر بنەمای گوتەی قوتابییەکان* و ئینجیلە نووسراوەکان بەو جۆرەی کە لەسەرچاوە مەسیحییەکاندا هەیە، وێنەیەکی ڕوون لە ڕووداو و سەرگورشتەی سەردەمی پێغەمبەرایەتی عیسای مەسیح پیشان بدات و لە قاڵبی داستانێکی دڵگیرو بە زمانێکی سادەو ڕەوان و بە ئارایشتێکی ئەدەبی بیخاتە ڕوو.

شایانی گوتنیشە کە لەبارەی پێغەمبەرایەتی مەسیح و پەیامەکەی، هەندێ کتێب نووسراوەو هەر نووسەرو توێژەرێکیش لەسەر بنەمای بینین و زانین و لێکدانەوەو، بە باوەڕی خۆی دادوەرییەکی خاوێنی کردووە.

خوێندنەوەی سەرگورشتەی نێردراوانی خودا بەتایبەت پێغەمبەران، ئەوەیە کە ئەوان لە بڵاوکردنەوەی پەیامەکەیان و دەرخستنی ڕاستیەکانی خودا بەرگەی ئازارو ئەشکەنجەی زۆریان گرتووە و زۆر ڕێگەی دژواریان بڕیوەو، ئەوکاتەی پەیامێکی تازە ئایینەکەی تری سڕیوەتەوە، ئەوان ڕووبەڕووی ڕقەبەرایەتی و دوژمنایەتیەکی زۆری ئایینەکانی پێشتر بوونەتەوە. ژیانی حەزرەتی مەسیحیش لەم ناڕەحەتی و ناخۆشی و دوژمنایەتیە بەدوور نەبووە" بەتایبەت کە سەردەمی پەیامەکەی ئەم پەیامبەرە خوداییە

---

* قوتابییەکان ئەو دوازدە پیاوەن کە دوای عیسا دەکەون و باوەڕی پێ دەهێنن. (و. کوردی)

زۆر کورت بووەو، پێش ئەوەی بناغەی ئایینی مەسیح و ئامۆژگاریەکانی ژیانی جەستەیی لەسەر سیستەمێکی تەواو و یاسایەکی پتەو بوەستێت، بەفەرمانی ئەنجومەنی جوولەکەو فەرمانڕەوای ڕۆمیی لە فەلەستین ژیانی دنیای جێ هێشت و بۆ مەلەکوتی ئاسمان ڕۆشت.



بەم شێوەیە سەردەمی سەرەتای پەیدابوونی مەسیحییەت و ژیانی حەزرەتی عیسا بە خەرمانەیەکی نهێنی و پڕلە ناکۆکی داپۆشراوە" بەتایبەت کە یەکێ لە دوازدە قوتابییەکەی مەسیح بەناوی "یەهوودا ئەسخەریوتی" لەژیانی جەستەییدا ڕێگەی خیانەتی گرتەبەرو بەنهێنی لەگەڵ ئەنجومەنی جوولەکەدا ڕێککەوت، ئەوانی تریش لەگەڵ ڕاونان و داواکردنیان لەلایەن حکومەتی ناوچەکە و ئەشکەنجەدان لەلایەن جوولەکە ڕق لەدڵەکاندا ڕووبەڕوو بوونەوە و، دواتر ئەوەی بەناوی مەسیحەوە لە ئینجیلەکاندا هاتووە، لەلایەن هەندێ لەیارانی عیساو گواستنەوەی گوتەی قوتابییەکانییەوە تۆمار کراوە.

پێویستە وتووێژێکی زۆر لەسەر ئینجیلەکان بکەین. ئەو چوار ئینجیلەی لەبەردەستی مەسیحییەکاندایە، بەرماوەی ئینجیلێکی ئێجگار زۆرترن کە لەدوو سەدەی یەکەمی میلادیەوە لەنێو مەسیحییەکاندا باوبووە. بە دەستەواژەی ئینگلیزی"GOSPEL" و (بە ئینگلیزی دێرین"GODSPEL"= مزگێنی) و بە وەرگێڕدراوی دەستەواژە یۆنانییەکەی "EUANGELION"، یەکەمین وشەی ئینجیلی مەرقۆس بەواتای ((مزگێنی)) دێت، واتە –مەسیح هاتووە و قودرەتی خواوەندی لەدەستدایە– ئینجیلی مەرقۆسو مەتتا و لۆقا، ئینجیلی هاوواتای یەکن. دەتوانرێ ناوەرۆك و ڕوونکردنەوەکانیان لەسێ ستوونی تەریب بەیەك دابنێین و بەئاشکرا واتا لێکچووەکانیان بەدی بکەین. ئەسڵ و بنەمای ئەو ئینجیلانە بە زمانی یۆنانی کۆن نووسراون و لەڕووی شێوەی زمان و ئەدەبەوە نموونەیەکی کامڵ نین" لەگەڵ ئەمانەشدا، تەنانەت قاڵبڕێژییە سادە بەهێزو ئاشکراکەیان و، هێزی زیندووی نمایش و هاوشێوەکانیان و، قوڵترین ئیحساس و دڵڕفێنی ئەو چیرۆکانەی دەیگێڕنەوە، دیاریەکی بێوێنە دەدات بەدەقە ئەسڵییە دەست لێنەدراوەکەیان.

کۆنترین دەستنووسی پارێزراوی ئینجیلەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێیەم. دەرکەوتووە کە دەستنووسە ئەسڵییەکان لەنێوان سالآنی ٦٠ و ١٢٠ ی میلادیدا نووسراون. کەواتە لەماوەی دوو سەدەدا کەوتۆتە بەر هێرشی هەڵەی چاپ و ئەگەری گۆڕانکاری بۆ گونجاندنی ناوەرۆکەکەی لەگەڵ بۆچوون یان مەبەست و بنەمای خوداناسی گرووپێك یان سەردەمی وەرگێڕەکە.*

هزرڤانەکان ((ئینجیلی مەرقۆس)) بە کۆنتر و لەپێشتر دەزانن لە ئینجیلەکانی تر و مێژووەکەی لەگەڵ ساڵەکانی ٦٥-٧٠ ی میلادیدا دەگونجێ. لە ((ئینجیلی مەرقۆس))دا یەك مەبەست بەچەندین جۆر دووبارە دەبێتەوە. ((ئینجیلی مەرقۆس)) بەو شێوەیەی کە لەبەردەستی مەسیحییەکاندایە، بەڕوونی دیارە کە لەژیانی چەند کەسێك لە قوتابییەکان یا لەناو حەفتاو دوو شاگردی مەسیحیدا بوونی هەبووە، واش پێناچێت یادەوەری و شرۆڤەکانی ئەم قوتابیانە جیاوازییەکی بنچینەییان لەبارەی مەسیحەوە هەبێت، بۆیە توێژەرە ناسراوەکانی مەسیحییەت لەو خاڵەدا هاوڕان کە بەشە ئەسڵیەکەی ((ئینجیلی مەرقۆس))، ((مێژووی باوەڕپێکراو)) پێك دێنێ.

بەڵام پاپاکانی کڵێسای ئەرتۆدۆکس، ((ئینجیلی مەتتا)) بە لەبەرتر دەزانن و پێیان وایە کە ئەسڵیەکەی بە ((عیبری)) واتە زمانی ئارامی نووسراوە، بەڵام ئەوەی کە گەشتۆتە دەست مەسیحییەکان تەنیا بە زمانی یۆنانی بووە.

ئامانجی ئینجیلی مەتتا، هاندانی جوولەکەکان بووە بۆسەر ئایینی مەسیح، بەڵام ئینجیل نووسەکانی تر زیاتر بەلای مۆجیزەکانی تایبەت بە حەزرەتی عیسادا دەڕۆن و، بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە بۆ سەلماندنی ئەو شتانە تێدەکۆشن کە لەزۆربەی پێشبینییەکانی ((سەردەمی کۆندا)) بەڕاست گەڕاون. بەهۆی ئەوەی کە ((ئینجیلی مەتتا)) بزوێنەرترین ئینجیلە لەناو چوار ئینجیلەکەدا بە چاوپۆشی لە یاساکانی مەسیحییەت، بەیەکێ لە شاکارە نەناسراوەکانی ئەدەبیاتی جیهان لەقەڵەم دەدرێ.

((ئینجیلی لۆقا)) کە مێژووی نووسینەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی یەکەم، لێبڕاوانە هەوڵی داوە ڕوونکردنەوەکانی پێشوو سەبارەت بە حەزرەتی عیسا

* مێژووی شارستانییەت- گەنجی مەسیحییەت- کتێبی پێنجەم. مەبەست لە (وەرگێڕ) ئەو کەسانەیە کە نسخەیان لێ نووسیوەتەوەو لە زمانی بنچینەییەوە ئینجیلیان وەرگێڕاوە. (و. کوردی)

بەشێوەیەکی گونجاو پێکەوە گرێ بدات. ئامانجی ئینجیلی لۆقا هاندانی جوولەکەکان نییە، بەڵکو هاندانی بێ باوەڕەکانە بۆ ناو ئایینی مەسیحییەت.

((ئینجیلی لۆقا))ش وەك ئینجیلی مەتتا، زۆرێك لە بابەتەکانی لە ((ئینجیلی مەرقۆس))ەوە وەرگرتووە" لە ٦٦١ ئایەتی ((ئینجیلی مەرقۆس)) زیاتر لە ٦٠٠ ئایەتی لە ((ئینجیلی مەتتا)) و ٣٥٠ ئایەتی لە ((ئینجیلی لۆقا))دا وشە بە وشە نەقڵ کراوە.

زۆرێك لەو بەشانەی ((ئینجیلی لۆقا)) کە لە ((ئینجیلی مەرقۆس))دا نییە، وشەکانیان نزیکە لە وشەکانی ((ئینجیلی مەتتا))وە و وادیارە لۆقا ئەو وشانەی لە ((ئینجیلی مەتتا))وە وەرگرتووە، یانیش ئینجیلەکانی لۆقا و مەتتا هەردووکیان ئەو وشانەیان لە سەرچاوەیەکی هاوبەشەوە وەرگرتووە کە ئەمڕۆ لەبەردەستی لێکۆڵەرانی مێژووی مەسیحدا نییە.

((ئینجیلی چوارەم)) باسی حاڵی عیسا ناکات. ئەم ئینجیلە لەڕووی خوداناسیەوە مەسیح وەکو ((لوگوس))* ی خواوەندی بەدیهێنەرو ڕزگارکەری مرۆڤایەتی دەناسێنێ و، لەزۆر ڕووەوە لە ستایش کردنی مەسیحدا جیاوازی هەیە لەگەڵ ئینجیلەکانی تردا. خوێندنەوە تازەکانی توێژینەوەکانی مەسیحییەت، مێژووی ئینجیلی چوارەم دەگێڕنەوە بۆ نزیکی کۆتاییەکانی سەدەی یەکەمی میلادی.

کورتەی باس ئەوەیە کە جیاوازییەکی ئێجگار زۆر هەیە لە ئینجیلێکەوە بۆ ئینجیلێکی تر و، هەرچوار ئینجیلەکە پڕن لە هەواڵی مێژوویی نادیار و ڕووداوی ناهاوتا کە بۆ سەلماندنی ڕاستی پێشبینییەکانی سەردەمی دێرین متمانەیان پێ ناکرێت" ئەو ئەگەرانەش کە لەم بارەوە هەیە ئەوەیە کە لەسەر بنەمای بەمێژووکردنی ئایین یان مەراسیمەکانی کڵێسا، دەستیان تێوەردراوەو گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، ئەو ئەگەرەش هەیە کە بەهۆی ئەو گوفتار و بیستراوانەی کە لە ئینجیلەکاندا نەقڵ کراون، لە ئەنجامی لاوازی هزری نەخوێندەوار و هەڵەی تۆمار و چاکسازییەکانی وەرگێڕەکانەوە زیانی لێکەوتووە.

---

* لوگوس واتە (وشە).

# پێغەمبەرایەتییەکەی حەزرەتی عیسا بەپێی گێڕانەوەی ئینجیلەکان

مەتتا و لۆقا، هەردوکیان لەدایك بوونی حەزرەتی عیسا دەگێڕنەوە بۆ سەردەم و ڕۆژگارێك کە (هیرۆدۆس) لە بەشێکی فەلەستیندا فەرمانداری چوار شار بووە. هەردوو ئینجیلەکە دەڵێن زێدی حەزرەتی عیسا لە (بەیت لەحم) بووە کە هەشت کیلۆمەتر لە قودسەوە دوورە. ئەوان دەڵێن لەوێوە خانەوادەکەی حەزرەتی عیسا چوون بۆ (ناصرە) کە دەکەوێتە (جەلیلە)وە و لەوێ جێگیر بوون، بەڵام مەرقۆس باسی (بەیت لەحم) ناکات و تەنیا بە ((عیسای ناصری)) ناوی مەسیح دێنێ.

پێش ئەوەی مەسیح ـ ئەرکی پێغەمبەرایەتیەکەی خۆی بەجێ بهێنێ، (یەحیا) مزگێنی پەیدابوونی مەسیحی دابوو. لەو ڕۆژگارەدا بارودۆخی فەلەستین پڕ ببوو لە جموجۆڵە ئایینییەکان. هەزاران جوولەکە لەگەڵ نیگەرانییەکەیاندا چاوەڕوانی ڕزگارکردنی گەلی نەوەی ئیسرائیلیان دەکرد. لەلای ئەوان سیحر و جادوو، فریشتە و دێو، جن تێچوون و شێت بوون، مۆجیزە و پێشبینی، غەیبەت کردن و بەخت گرتنەوە لەهەموو شوێنێکدا بە شتی ڕاست لەقەڵەم دەدرا.

لەم سەردەمەدا، یەحیا ڕوویەکی ناسراوی ناو کۆمەڵگا بوو. بەپێی نووسینەکانی مەرقۆس و مەتتا، پۆشاکێکی لەبەردا بوو کە لەکوڵکی وشتر دروست کرابوو، پشتێنێکی چەرمینی دەبەست بە کەمەریەوە، خۆراکی سادە بوو، خەڵك لە (یەهوودا-فەلەستین)و دەوروبەری ئەردەن دەهاتن بۆلای و دانیان دەنا بە گوناهەکانی خۆیاندا و، لە ڕووباری ئەردەندا بەدەستی ئەو لەئاو هەڵدەکێشران.* یەحیا لەکاتی مەراسیمی

* لەئاو هەڵکێشان بە فارسی و عەرەبی (تعمید)ە کە مانای تۆبە کردن و دووبارە لەدایك بوونەوەیە، ئینجیلی پیرۆز بەکوردی. ئەمە لە مەراسیمێکی تایبەتدا ئەنجام دەدرێ و کاتێ کەسێ دان بەتاوانەکانیدا دێنێ، لەلایەن پێشەوای ئاینییەکانیانەوە لەناو هەڵدەکێشرێ و بەمەش ڕۆحیان لەگوناه پاك دەبێتەوەو وەك ئەوە وایە گوناهیان نەکردبێ، بەڵام بەتایبەت بەلایانەوە بۆ منداڵان زۆر پێویستە کاتێ تازە لەدایك دەبێ چونکە پێیان وایە منداڵ ڕۆحی گوناهبارەو پێویستە لەناو هەڵبکێشرێ تا لەگوناه پاك ببنەوە، ئەمەش بەپێچەوانەی ئاینی ئیسلام کە مرۆڤ لەسەرەتای بوونییەوە بێ تاوانەو کە گەورە بوو بە تۆبە کردنێ لەگوناه پاك دەبێتەوەو ئەوەی کە دەبێتە هۆی ئەوەی ژیان نوێ بکاتەوە، حەجکردنە. (و. کوردی)

((پاك بوونەوەی نموونەیی-لەناو هەڵکێشان))، دوو ڕوویی و، ڕیا و ژیانی بێ سەروبەری ئیدانە دەکرد و گوناهکارانی ئاگادار دەکردەوە و بەڵێنی پێ دەدان خۆیان ئامادە بکەن بۆ لێپرسینەوە لە ڕۆژی دوایی و، ڕایدەگەیاند کە مەلەکوتی خودا نزیکە و دەیگوت ئەگەر سەرتاسەری (یەهوودا-فەلەستین) تۆبەیان بکردایە و پاك بوونایەتەوە لە گوناە، ئەوا مەسیح و مەلەکوتەکەی بە زوویی دەگەشتنەجێ.

دەقی (لۆقا) باس لەوە دەکات کە لەساڵی پازدەهەمی فەرمانڕەوایی ((تی بریوس)) یان کەمێك پێش ئەو، عیسا چووە بۆ ڕووباری ئەردەن بۆئەوەی بەدەستی یەحیا لەناو هەڵبکێشرێ. ئەوکاتەی کە عیسا ئەم بڕیارەی داوە، تەمەنی نزیکەی سی ساڵان بووە. ئەو گەواهی دەدات کە مەسیح باوەڕی بە ئامۆژگاریەکانی یەحیا هەبووەو ئامۆژگاریەکانی عیساش لە بنچینەدا هەمان ئامۆژگاریەکانی یەحیا بوون.

دوای ئەوەی یەحیا بەفەرمانی هیرۆدۆس (فەرمانڕەوای چوار شار- کە خۆی بە پادشای یەهوود ناو دەبرد) گیراو خرایە زیندانەوە، عیسا هات بۆ جەلیلە و خەڵکەکەی بۆ مزگێنی مەلەکوتی خودا بانگ کرد. لۆقا دەنووسێ: (( عیسا بەهێزی ڕۆح گەڕایەوە بۆ جەلیلە... ئەو لە کەنیسەکاندا بانگی خەڵکەکەی دەکرد و لە ناصرە لەناو کۆمەڵێ کەس خەریکی خوێندنەوەی ئەسفار* و بەشێك لە کتێبی "ئەشعیا"ی پێغەمبەر دەبوو.

((ڕۆحی ئەو لە مندا هەیە، بۆیە منی کردووە بە مەسیح تا مژدە بدەم بە هەژاران و منی ناردووە تا شیفای دڵڕەنجاوەکان بدەم و برینەکانیان سارێژ بکەم و دیلەکان بۆ ڕزگاری و بەندکراوەکان بۆ ئازادی بانگ بکەم... و دڵی پرسەدارەکان بدەمەوە.))

کاتێ یەحیا بەفەرمانی هیرۆدۆس کوژراو سەریان لەلاشەی جیاکردەوە و هەواڵی شەهید بوونیان ڕاگەیاند، شوێنکەوتووەکانی ڕوویان کردە عیسا. ئەو(عیسا) لەو بارودۆخە ناهەموارەدا و بەهۆی دەسەڵاتی ستەمکارانەی ڕۆمییەکان، بەبێ ئەوەی گوێ بدات بەوەی مەترسیەك گیانی دەخاتە بەر هەڕەشە، دەچوو بۆ گوندەکان و میراتی ئاوات و ڕەوشتی یەحیای دەگەیاند و لە ڕۆژانی تۆبەکردندا، بە بوێرانە مزگێنی باوەڕ و ڕزگاریی بە خەڵك دەبەخشی. کۆمەڵێك لە گوێگران لەوباوەڕەدا بوون کە ئەو، خودی یەحیای لەناو هەڵکێشە و لەناو مردووەکاندا هەستاوەتەوە.

---

* ئەسفار بەشێکە لە کتێبی تەورات.

ئەمەش دەستپێکی ئەو بزووتنەوە بوو کە حەزرەتی عیسا بەناوی نێردراوی هەڵبژاردەی خودا لەنێو کۆمەڵانی خەڵکدا مزگێنییەکەی ڕادەگەیاند.

مەسیح ماوەیەکی دوورو درێژ تەنیا بانگەوازی بۆ مەسیحییەکان دەکرد، ئەو ئەرکی مزگێنی دەسپاردە قوتابییەکانی خۆی و بەتەنیا دەیناردن بۆ شاری جوولەکەکان، پێی دەگوتن:(( بە ڕێگای خەڵك و نەتەوەکاندا مەڕۆن و بەجێ پێی "سامریەکان"دا نەچنە ژوورەوە)). بەم شێوەیە دوای لەخاچدان، قوتابییەکانی گومانیان بۆ پەیدا بوو لە بردنی ((مزگێنی)) بۆ دنیای ((بێ باوەڕەکان)).

لەگەڵ ئەوەشدا حەزرەتی عیسا بەهێزێکی مەعنەوی و هەستێکی باوەڕدارانە هەموو شتێکی گۆڕی، ئەو فەرمانەی بۆ شەریعەتەکەی زیاد کرد کە دەبێ مەلەکوت بە ژیانێکی دادپەروەرانە و، بەسادەیی و میهرەبانییەوە ئامادە بێت. لەبارەی ڕەوشت و تەڵاقەوە شەریعەتەکەی توندتر کرد، بەڵام لە ڕوویەکی ترەوە بە لێبووردەیی و چاوپۆشیەوە ئاسانتری کرد، قانوونەکانی پەیوەست بە خۆراك و پاکوخاوێنی گۆڕی و دووبارە واتای ئاکاری دروستی گەڕاندەوە بۆ ئەو ئایینەی کە ببووە ئاینێکی ئامادەکراو بەبێ ئەوەی ڕەفتاری پێ بکرێت، مەراسیمی بەخاك سپاردنی جوانکارانەی ئیدانە کردو ئەو هەستەی کە گوایە شەریعەتی جوولەکە بەهۆی هاتنی مەسیحەوە بەتاڵ دەبێتەوە، لەناخی زۆربەی خەڵکدا دروست کرد.

حەزرەتی عیسا لە ڕۆژی دووشەممە پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات، لە (ئۆرشەلیم–قودس) نزیك بوویەوە تا لە دواین ڕۆژەکانی ژیانیدا پەیامەکەی خۆی بگەیەنێتە گوێی خەڵکەکە.

هەموو ئەو شوێنکەوتوانەی هاتبوون بۆ پێشوازی، بەم شێوەیە ((موبارەك بێت ئەو پادشایەی بەناوی خواوەندەوە دێت)) درووديان بۆ نارد.

هەندێك لە "فەریسییەکان"* داوایان لێ کرد شوێنکەوتووەکانی دوور بخاتەوە لە بەکارهێنانی ئەو جۆرە ناونیشانانە. حەزرەتی عیسا وەڵامی دایەوە: ((من پێتان دەڵێم کە ئەگەر ئەمانە بێدەنگ بن، هەموو بەردەکان دێنە قسە)). لە ئینجیلی یۆحەنادا هاتووە کە خەڵکەکە بەناوی ((پادشای ئیسرائیل))ەوە پێشوازییان لێ کردووە. دیارە شوێنکەوتووەکانی باوەڕیان وابووە کە عیسا قودرەتی ((ڕۆم))ەکان لەناو دەبات و

---

* دەستەیەکن لە جوولەکە ڕق لەدڵەکان کە پابەند بوون بە جێبەجێ کردنی هەموو سوننەتەکانی ئایینی.

سەروەری دەگەڕێنێتەوە بۆ جوولەکە. ئەم بەزم ورەزمی شادیە بوو کە ترسی خستە دڵی ئەنجومەنی باڵای جوولەکەو فەرمانڕەوای ڕۆم و، ڕێگای بۆئەوە خۆش کرد کە دەستگیر بکرێت.

جەژنی تێپەڕ بوون* نزیك بوویەوە، کۆمەڵێکی زۆری جوولەکەکان لە شوێنە جیاجیاکانی ئۆرشەلیم کۆ دەبوونەوە تا مەراسیمی قوربانییەکەیان لە پەرستگای "هیگل" دەست پێ بکەن. کە عیسا بەیانییەکەی دەگاتە ئۆرشەلیم، سەرێك لە پەرستگای "هیگل" دەدات. ئەو سەری لە قەڵەباڵغی خەڵکەکە و، بانگ و هاواری ژوورەکان و، کڕین و فرۆشتن و چالاکی سەررافەکانی حەوشەی هیگل، سوڕمابوو. ئەو و شوێنکەوتووەکانی بە توڕەیی و هەڕەشەوە خەڵکەکەیان لە هەڵسوکەوتی نابەجێ و خۆخەریك کردن بە ژیانی دنیاوە لە شوێنێك کە پیرۆزی تێدابێت، دوور خستەوەو، تا چەند ڕۆژێك بەبێ هیچ ڕێگرێك لەو پەرستگایەدا دەستیان کرد بە ئامۆژگاری خەڵك. بەڵام شەوانە ناوشاریان بەجێ دەهێشت و دەچوون بۆ کێوی زەیتون، چونکە ئەگەری ئەوە هەبوو دەستگیر بکرێن یان بکوژرێن.

کارگوزارانی دەوڵەت و، ڕۆحانی و ڕۆمی و یەهوودی، کردارو ڕەفتارەکانی عیسایان خستبووە ژێر چاودێرییەوە بەهۆی ئەوەی شوێن پێی پێغەمبەرایەتیەکەی یەحیای لەناو هەڵکێشی هەڵگرتووە.

لەبەرئەوەی عیسا لایەنگری زۆری پەیدا کردبوو بۆیە زۆر گوێیان پێ نەدەدا، بەڵام کە لە ئۆرشەلیم ئەو پێشوازیە گەورەی لێ کرا، ڕابەرانی جوولەکەی خستە ئەو گومانەوە کە نەکا جموجۆڵ و پێشوازی ئەو خەڵکەی کە بۆ جەژنی تێپەڕبوون کۆبوونەتەوە، کاریگەری هەبێت و ببێتەهۆی هەڵایسانی شۆڕشێکی لەناکاو دژی دەسەڵاتداری دەوڵەتی ڕۆما و ببێتەهۆی لەناوچوونی هەموو جۆرە سەربەخۆیی و ئازادیەکی مەراسیمی ئایینی لە فەلەستیندا.

خاخامی گەورە،* کۆبوونەوەی ئەنجومەنی باڵای یەهوودای بەست و بەم شێوەیە ڕای خۆی دەربڕی:

---

* جەژنی تێپەڕ بوون یەکێکە لە جەژنە گەورەکانی جوولەکە، لەم ڕۆژەدا بوو نۆبەرەی جوولەکەکان لە میسر دەرچوون و ڕزگاریان بوو لە مردن، وە لەم ڕۆژەدا باوەڕدارانی مەسیحیش بەهۆی هەستانەوەی عیسا و زاڵ بوونی ئەو بەسەر مردندا، جەژن دەگێڕن، وەرگێڕدراوی کوردی "ئینجیلی پیرۆز". (و. کوردی)

* خاخامەکان: پێشەوای ئاینی جوولەکەن. (و. کوردی)

(( ئێمە وای بەچاك دەزانین یەك كەس لەرێی گەلێكدا بمرێت باشترە بۆئەوەی هەموو گەلەكە لەناو نەچن)).

زۆریان ڕازی بوونی خۆیان دەربڕی و ئەنجومەن فەرمانی دەستگیركردنی عیسای دەركرد.

بێگومان عیسا لەلایەن چەند ئەندامێكی ئەنجومەنی باڵای جوولەكەوە لەو بڕیارە ئاگادار كرابوویەوە، هەروەها دەیزانی یەكێ لە قوتابییەكانی خیانەتی لێ دەكات و پیلانی بۆ دادەڕێژێ، بۆیە ڕۆژی چواردەیەمی مانگی یەهوودی ((نیسان)) بەرامبەر سێیەمی ئەپریل كە دەكاتە نزیكەی ساڵی ٣٠ی میلادی، عیساو قوتابییەكانی لە ئۆرشەلیم نانی جەژنی تێپەڕبوونیان لەلای هاوڕێیەكیان خوارد، لە كۆتایی نانخواردنەكە بەئاشكرا "یەهوودا ئەسخەریوتی" تاوانبار كرد، بەپێی ئینجیلی یۆحەننا ڕایگەیاند كە ((دوای كەمێكی تر)) ئیتر لەگەڵ ئەواندا نامێنێت و پێی گوتن: ((فەرمانێكی تازەتان پێ دەكەم بەوەی یەكترتان خۆش بوێت... دڵتان چەواشە نەبێت.. بڕوا بە خودا بێنن، بڕوا بە منیش بێنن، ماڵی باوكم مەنزڵی زۆری لێیە... دەچم تاكو جێگەیەكتان بۆ ئامادە بكەم)).

دەڵێن هەمان شەو، گرۆیەكی بچوكیان لە دەرەوەی ئۆرشەلیم لە باخی "جێتسمانی" خۆیان حەشار دا، دەستەیەك لەلایەن سەربازانی ئینتیزامی هیكل دۆزرانەوەو عیسایان دەستگیر كرد. سەرەتا دەیبەن بۆ ماڵی "حەنا"ی خاخامی گەورەی پێشوو، پاشان بردیانە لای "قیافا". بەپێی گێڕانەوەی مەرقۆس، ((ئەنجومەنی جوولەكە)) پێشتر لەوێ دروست بووە. چەند گەواهیدەرێكی جیاواز لە دژی شاهێدیان دا، بەتایبەت ئەو هەڕەشانەیان وەبیرهێنایەوە كە لەبارەی تێكدانی پەرستگای هیكل كردبووی. كاتێ "قیافا" لێی دەپرسێ ئایا ((مەسیح كوڕی خودا))یە یان نا؟ عیسا وەڵام دەداتەوە: ((من هەم)). ئەنجومەن بە كافری لەقەڵەم دەدەن و بڕیار دەدەن بیبەنە لای "پراكوراتور"ی نوێنەری دەوڵەتی ڕۆما كە بۆ بینینی ئەو خەڵكەی هاتبوون بۆ جەژنی تێپەڕبوون، هاتبوو بۆ ئۆرشەلیم.

پونتوس پیلاتۆس (پیلاتس) نوێنەری حكومەتی ڕۆما، پیاوێكی دڵڕەق بوو كە پێشتر بەتۆمەتی ستەمكاری بانگ كرا بۆ ڕۆماو لەسەركار لابرا. لەگەڵ ئەمانەشدا چاوەڕێ نەدەكرا ئەم بانگەوازكەرە ڕەفتار خۆشە، مەترسیدار بێت بۆ دەوڵەتی ڕۆما.

لەعیسای پرسی: ((ئایا تۆ پادشای جوولەکەیت؟)) بەپێی گێڕانەوەی مەتتا، عیسا وەڵامی دایەوە: ((تۆ وادەڵێی)). یۆحەننا وا نەقڵی دەکا کە عیسا گوتی: ((من بۆئەوە لەدایك بووم تا شاهێدێ لەسەر ڕاستی بدەم)). نوێنەری ڕۆما دەپرسێ: ((ڕاستی چییە؟)) بەڵام بیسەری قسەکانی عیسا بەهۆی لاوازی باوەڕەکەی، نەیتوانی لە گوتە واتادارەکانی عیسا تێبگات.

بەهەرحاڵ، دوای ئەم وتووێژو دانپێدانانەی مەسیح، بەپێی قانون تاوانبار بوو، بۆیە پیلاتۆس بەناچاری فەرمانی مردنی بۆ دەرکرد.



## مەسیحییە یەکەمینەکان بەپێی مێژوو

قوتابیان و مەسیحییە یەکەمینەکان، لە مێژووی ئایینی مەسیحدا لە دوو ڕووەوە لەگەڵ ئەو دوژمنانەدا ڕووبەڕوو بوونەوە کە ڕق و تووڕەیی خۆیان سەبارەت بە مزگێنی مەسیح دەردەبڕی. یەکەم جوولەکە ڕق لەدڵەکان ئایینی تازەیان بە بەتاڵکەرەوەی ئایینەکەی خۆیان دەزانی و چالاکی مەسیحییەکانیان بە واتای تازەکردنەوەی ئاین و هەڵگەڕانەوە لە ئایینەکەیان لێك دەدایەوەو لەلایەکی ترەوە فەرمانڕەوایانی ڕۆما، ئەوانیان بەهۆکاری بزوتنەوەی ئاژاوەگێڕی لەناو خەڵکدا تۆمەتبار دەکرد.

باوەڕهێنان بە پێغەمبەرایەتی و، ژیانەوەی ژیانی جەستەیی و گەڕانەوەی مەسیح بۆسەر زەوی، پایەی باوەڕی مەسیحییە یەکەمینەکانی دامەزراند. بەڵام ئەو باوەڕە وای کرد قوتابییەکان باوەڕیان بە ئایینی جوولەکە نەمێنێت. لە کتێبی ((ئەعمالی ڕەسولان))دا هاتووە کە: ((بەردەوام هەموویان دەچوون بۆ پەرستگا))، یاسای تایبەت بە خواردن و پێشوازی ئایینیان پەیڕەو دەکرد. سەرەتا باوەڕەکەی خۆیان بە جوولەکە ڕادەگەیاندو زیاتر لە حەوشەی پەرستگای هیکلدا باسیان لەو ئایینە دەکردو ئامۆژگاریەکانیان ڕادەگەیاند.

هەروەها بەهۆی ئەوەی شوێنکەوتووەکانیان زیادی دەکرد، بۆیە قوتابییەکان لەناو خۆیاندا ڕێك کەوتن و حەوت ڕۆحانی (خاخام)یان بۆ بەڕێوەبردنی

شوێنکەوتووانی ئایینی مەسیح دانا. دەسەلاّتدارانی جوولەکە تاماوەیەك گوێیان بەو گروپە بچوك و بێ ئازارە نەدەدا، بەلاّم کاتێ هەندێ لە "نەصرانی"یەکان لەماوەیەکی کەمدا، لە ٢٠ کەسەوە گەیشتنە ٨٠٠٠ کەس، پێشەوایان (ڕۆحانییەکان)ی جوولەکە ترسیان لێ نیشت. پترۆسی قوتابی و چەند باوەڕدارێکی تر دەستگیر کران. ئەنجومەنی جوولەکە بەردەوام پرسیاریان لێ دەکات. "صەدوقی"یەکان-گروپێکی جوولەکەکان- دەیانویست فەرمانی کوشتنیان بەسەردا بسەپێنن، بەلاّم "فەریسی"یەکی جێبەجێ کار پێشنیاری کرد فەرمانەکە بە هەڵپەسێردراوی بهێڵنەوەو وەکو ڕێگەچارەیەکی ناوەنجی، بەقامچی لە زیندانییەکانیان داو ڕەهایان کردن.

پاش کەمێکی تر بانگی یەکێ لەو حەوت پێشەوایەیان کرد کە بە پشتگیری قوتابییەکان هەڵبژێردرابوو بۆئەوەی بەتۆمەتی گوتاری کوفرئامێز دژ بە موساو خواوەند لەکۆبوونەوەی ئەنجومەندا ئامادە بێت. ئەویش بەتوندی بەرگری لەخۆی و ئایینی مەسیح کرد. ئەندامانی ئەنجومەنەکە زۆر تووڕە بوون، پاشان بە بەردباران کردن لەشار دەریان کردو دوای ئەوە لە ئۆرشەلیم ماڵ بەماڵ دەگەڕان و ژن و پیاوەکانیان دەگرت و دەیانخستنە زیندانەوە.

لەساڵی ٤١ دا یەعقوب ناوێکیان-یەکێ لە مەسیحییە ناودارەکان- سەربڕی و "پترۆس"یش کە یەکێ بوو لە قوتابییەکان دەستگیر کرا. لەساڵی ٦٢ دا "یەعقوب"ی دادپەروەر کوژرا. دوای چوار ساڵ کە جوولەکەکان دژی دەسەلاّتدارێتی حکومەتی ڕۆما شۆڕشیان کرد، مەسیحییەکان بەبێ ئەوەی دەست وەربدەنە ئەم شۆڕشە، شاریان بەجێ هێشت و لە لێوارەکانی تری ڕووباری "ئوردن" لە شوێنی ژیانی لایەنگرانی ڕۆما نیشتەجێ بوون. جوولەکەکان، مەسیحییەکانیان بە خیانەتکار تۆمەتبار دەکرد، مەسیحییەکانیش وێرانکردنی پەرستگای هیکل بەدەستی "تیوس" لە پێشبینییە ڕاستەکانی مەسیح لەقەڵەم دەدا. ڕق وکینە لەدڵی هەردوولادا ڕەگی داکوتا. لەو ڕۆژەبەدواوە دووبەرەکی کەوتە نێوان جوولەکەو ئایینی مەسیحەوە.

"بولس" کە یەکێکە لە ڕووە دیارو دامەزرێنەرەکانی زانستە خوداییەکانی ئایینی مەسیح و "پترۆس"ی قوتابی ناودار، لەساڵی ٦٢ دا لەشاری ڕۆما شەهید کران. "پترۆس"یان بەبێ سەروشوێن کوشت و سەری "بولس"یان لەلاشە جیا کردەوە.

خەمناكترین و ترسناكترین ڕووداو لە ژیانی مەسیحییەكاندا سەرەتا لەسەردەمی "نەرون"ی ئیمپراتۆری خوێنمژی ڕۆما بوو، كورتەی باسەكەی بەم شێوەیە:

ڕۆژی ١٨ی ژوئیەی ساڵی ٦٤ی میلادی، بەپێی پیلانێكی نهێنی "نەرون"، ئاگركەوتنەوەیەكی گەورە لەشاری ڕۆما ڕووی دا كە نزیكەی نۆ ڕۆژ درێژەی كێشاو دوولەسەر سێ ی شارەكە تووشی سووتان هاتن.

لەم ئاگركەوتنە بەئەنقەستەدا-كە ئارەزووی نەرون بۆ دروست كردنی شارێكی تازە، ببووە هۆی ئەو كارە- زۆربەی ماڵەكان، پەرستگاكان، كتێبی دەست نووس، شتی گرانبەهاو شوێنەواری هونەری زۆر لەناوچوون، بە هەزاران كەس لەناو خانووەكانی خۆیاندا گیانیان لەدەست دا، سەدان هەزار كەسی بێ پەناو سەرگەردان، بە داماوی و سەرلێ شێواوی، شەوانیان لەناو وێرانكاریەكانی ئەو ئاگرەدا بەسەر دەبرد، بەنهێنی گوێیان بۆ هەواڵێك ڕادەدێرا كە نەرون خۆی فەرمانی داوە بە كردنەوەی ئەو ئاگرە. نەرون بەبێ ئەوەی ڕەفتارێكی توند بنوێنێ لەبەرامبەر گاڵتە و جوێن و تۆمەتباریەكانی خەڵك، خۆی ڕادەگرت و بەدوای شتێكدا دەگەڕا تا تاوانەكە بخاتە ملی خەڵكەكە. نەرون فێڵی خۆی بەكار هێنا، گروپێكی قەرزارو ئەوانەی باجی حكومەتیان لەلا مابوو، دۆزیەوە كە ئامادە بوون دان بە تاوانەكانیاندا بنێن و دواتریش لەناوی بردن، بەم شێوەیە برێكی زۆری مەسیحییەكان تاوانبار كران. بەفەرمانی نەرون-كە ڕقێكی زۆری لەدڵا بوو بەرامبەر بە مەسیحییەكان- ئەوانیان بە شێوەیەكی دڵتەزێن و بێ ڕەحمانە كوشت. هەندێكیان بە پێستی گیانەوەر دادەپۆشی و بەرەڵایان دەكردن تا ببنە خۆراكی سەگەكان، هەندێكیشیان بە مێخ دادەكوتاو لەخاچیان دەدان، گروپێكیشیان بە زیندوویی سوتاندو زۆرێكیان بە سوتەمەنی دادەپۆشی و گڕیان پێوە دەنان بۆئەوەی شەوانە ڕووناكییان پێ ببەخشێ.

دواتر ئەم تۆقاندن و كارە نامرۆڤانەیە بەزەیی لە دڵەكاندا نەهێشت و ڕۆمییەكان دڵیان بۆ مەسیحییەكان هاتەجۆش و "نەرون"یش بە چارەنووسێكی شوم گرفتار بوو.

مەسیحییە یەكەمینەكان بەهۆی ئەم ستەمكاری و نادادپەروەری و ڕقەبەرایەتیانە، بە پشت بەستن بە باوەڕەكەیان، بەدڵ بەرگرییان لە ئایینە تازەكەی خۆیان دەكرد.

زۆریی ناوەندەكانی مەسیحی ببووە هۆی ئەوەی هەركەس و شوێنكەوتەیەكی ڕێبازە جیاوازەكانی ئایین لە شوێنە جیاوازەكاندا، ئایینی مەسیحی برەو پێ بدەن.

شوێنکەوتووانی مەسیح لە سێ سەدەی سەرەتای میلادیدا بەهۆی زۆری ئەو ناوەندانەوە-جگە لە شوێنە سەرەکیەکان- بیروبۆچوونی جۆراوجۆریان هەبووەو بەپێی ئەم بیروبۆچوونانەش دابەش دەبوون. کڵێساش بەناوی ناوەندێکی پیرۆزی ڕێکخستنی ئایینی، زۆرێك لەو ناوەندانەی بەناوی ((هەڵگەڕانەوەو هاتنی شتێکی نوێ کە دەبێتە مایەی لەناوچوونی کڵێساو لاواز کردنی ئایینی مەسیحی)) یەك لەدوای یەك ئیدانە کردو وردە وردە دەسەڵات و ڕێکخستنی خۆی وەکو ڕێکخراوێکی بەهێزی ئایینی لەناو مەسیحییەکان دامەزراند، بەڵام زۆرێك لەو ڕێباز و بیروبۆچوونە جیاوازانەش کە شتی دوور لە مەسیحییان تێدا بوو، لەناویدا جێی بوویەوە-کە لە باسێکی جیادا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین.

لەهەموو ڕوویەکەوە ئایینی مەسیح لەکۆتایی سەدەی سێیەم، لەڕۆما گەیشتە سەدهەزار کەس، مەسیحییەکانی ڕۆما توانیان لەڕووی داراییەوە هاوکاری بۆنە ئایینییەکانی تریش بکەن. ڕۆما لە دێر زەمانەوە خوازیاری پایەی یەکەم بووە بۆ ئەسقەفەکانی خۆی لە کڵێسا. بەگشتی دەتوانین بڵێین نزیکەی ساڵی ٢٠٠ی میلادی، یەك لەسەرچواری کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی زەوی و یەك لەسەر بیستی خۆرئاوا مەسیحی بوون.

"تەرتولیانووس" لە نزیکەی ساڵی ٢٠٠ی میلادیدا، وتەی قوتابییەکانی مەسیحی بەم شێوەیە نەقڵ کردووە:

((... ئێمەی مەسیحی هەموو وڵاتەکان دەگرینەوە، خەڵك لەهەموو تەمەن و پلەو پایەیەکدا ڕوو دەکەنە ئێمە، پێشینەی ئێمە تەنیا لە دوێنێدایە، بەڵام هەنوکەش دنیا پڕ دەکەینەوە)).



هەروەکو لە دێڕەکانی سەرەوە ئاماژەمان پێ کرد، لە ئایینی مەسیحیدا ڕێباز و بیروبۆچونی زۆری تێدا بووە کە لەناو مزگێنییەکانی حەزرەتی عیسادا نەبووەو لە مەراسیمی مەسیحییە یەکەمینەکانیشدا نموونەیان نابینرێت. لێرەدا بەکورتی لەهەندێك ڕووەوە دەدوێین و ئاماژەیان پێ دەکەین.

زۆربەی ئەوانەی دەچوون بۆ کڵێسا خاچیان دەکردە ملیان یانیش لەماڵەکانی خۆیاندا وەکو پیرۆزییەك وێنەی مەسیح کە بە خاچدا هەڵواسراوە، هەڵدەواسن. لە زۆربەی کڵێساکانیشدا خاچی تێدا دەبینرێ، لەکاتێکدا بیروباوەڕی خاچ پەیوەندی بە

ئاینی مەسیحییەوە نییەو بەڵگە مێژووییەکان دەریدەخەن کە لەجیاتی ئەوەی نیشانەی مەسیحییەت بێ، لەسەدەکانی پێش لەدایك بوونی مەسیحیشدا بەکار هاتووە.

لە "دائیرەتولمەعاریفی کاتۆلیك" چاپی ١٩٠٨، بەرگی چوارەم، لاپەڕە ٥١٧دا هاتووە: ((نیشانەی خاچ کە سادەترین شێوەی دوو هێڵی لەسەریەك ستوونە، پێش دەست پێ کردنی مێژووی مەسیحییەت لەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا هەبووەو پەیوەندی بە شارستانییەتی دێرینی مرۆڤەوە هەیە)).

لە پەرتوکی ((کڵێسای دێرین)) (Ancient church)، لە نووسینەکانی "و.د.کیلن"، چاپی ١٨٥٩، لاپەڕەی ٣١٦دا نووسراوە: ((لە ڕۆژگارە دێرینەکاندا لە میسر و سوریا، خاچ جێگەی ڕێز بووەو بوداییەکانی ڕۆژهەڵاتی زەویش، بۆئەو مەبەستە ڕێزیان لێ ناوە... هاوکات لەگەڵ پەیدابونی ئایینی مەسیحیشدا، لەلای هەندێك لە گروپە نامەسیحییەکان وا باو بووە کە لە هەندێك جەژن و شاییدا نیشانەی خاچ لەسەر نێوچاوانیان دروست بکەن)).

نووسەری پەرتوکی "دائیرەتولمەعاریف"، "وەردز-ئینجیلی نوێ" لە بەرگی یەکەم، لاپەڕەی ٢٥٦دا دەنووسێ: ((خاچ و بنەماکەی لەلای کلدانی دێرین (بابل)دا بووەو وەکو سومبولی خودای "تامور" بەکار دەهات، چونکە شکڵی هێمای ((T)) کورتکراوەی ناوی ئەو بووە)).

ئەو خاڵە کە شایانی تێڕامان بێت ئەوەیە کە پیرۆز ڕاگرتنی خاچ، هیچ بنەمایەکی لۆژیکی نییەو ڕێك وادەردەکەوێ ئەو شتەی کە بۆتە هۆی مەرگی کەسێك، ڕێزی لێ بگیرێت.

هەروەها ئەو پەیکەرو وێنانەی لە کڵێساکاندا بەکارهاتووە، دەرهاویشتەی نەریتە زۆر کۆنەکانی خەڵکی "میسر و بابل"ە و، پارێزگاری کردن لە پەیکەرو وێنە ئاینییەکان لەماڵەکاندا لەنێو خەڵکانی ئەو وڵاتانەدا باوبووە، لەسەردەمی "ئەلیکساندەر سرورس"، ئیمپراتۆری ڕۆم لەسەدەی سێیەمی میلادیدا و بەفەرمانی ئەو، سوود لە پەیکەرەکانی حەزرەتی عیساو مریەم وەرگیراوەو پارێزراوە.

بەم شێوەیە جەژنەکانی وەکو ((جەژنی پاك)) کە ئەمڕۆ بەیەکێ لە جەژنە گەورەکانی مەسیحی دەژمێردرێت، لەسەردەمی مەسیحییە یەکەمینەکاندا نەبووە، بۆیە دەتوانین بڵێین کە لەسەر بنەمای کردەوەی نامەسیحییەکانی سەردەمی کۆندا

چەسپاوەو بەپیرۆز ڕاگرتنی ئەم ڕۆژە تایبەتیانە لە بیروبۆچوونی مەسیحییە یەکەمینەکان بەدوور بووە.

دکتۆر "ئەلیکساندەر هێرلۆپ" دەربارەی ڕێوڕەسمی جەژنی پاك دەڵێ: ((ئایین و ئەو نەریتە یەك لەدوایەکانەی لەم سەردەمەدا گرنگی تایبەتیان پێ دەدرێت، لە بەڵگە مێژووییەکاندا وا تۆمار کراوە کە لە بابلییەکانەوە گواستراوەتەوە. ئەو کێکە گەرمەی کە نیشانەی خاچی لەسەرە، تایبەت بووە بە ڕۆژی هەینی و هێلکە ڕەنگاوڕەنگەکانیش لە مەراسیمی کلدانییەکان (بابلیەکان)دا نمایش دەکران)).

لەم بارەیەوە قسە زۆرە و ڕوون کردنەوەی پێشینەی مێژوویی و دزەکردنی دابونەریتی وڵاتانی دیکە بۆناو دابونەریتی کڵێساو مەراسیمی ئایینی مەسیحییەکان لە حەوسەڵەی ئەم وتارەدا بەدوورە، بۆیە بەکورتی بڕیمانەوە. کۆتا وتەش دەربارەی پەیدا بوونی حەزرەتی عیسایە کە لە باوەڕپێکراوترین دەقی ئایینیدا کە قورئانی بەرز و پیرۆزە، باسی لێوە دەکەین و کۆتایی بە گوتەکەمان دێنین.



دەقی قورئان گوتەیەکی خودایيە کە لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەری مەزندا (پێغەمبەری ئیسلام)، لەلایەن نووسەرانی (وەحی)یەوە نووسراوەتەوە، بەبێ ئەوەی بچوکترین دەست تێوەردانی تێدا کرابێت. پلەوپایەی حەزرەتی عیسا لە سورەتی (ئالی عیمران)دا (سێیەمین سورەتی قورئانی پیرۆز) زۆر بەرزترە لەوەی کەلە سەرچاوە مەسیحییەکاندا هاتووەو زۆر لەوەی کەلەم کتێبەی "میکاوالّتاری"دا باس کراوە، گەورەترە.

لە قورئلنی پیرۆز زیاتر لە بیست ئایەت لە سورەتی (ئالی عیمران)دا کە پەیوەندی بە حەزرەتی عیساو حەزرەتی مریەمەوە هەیە، هاتۆتە خوارەوە. خوداوەند لە ئایەتی چل و شەشەمی سورەتی (ئالی عیمران)دا کە دواندنی حەزرەتی مریەمی دایکی عیسایە، دەفەرمێ: ((ئەم منداڵەی کە بەتۆی دەبەخشم، لە بێشکەداو بەگەورەییش قسە

دەکات و هیچ جیاوازیەك نابینریٚ لە نیٚوان قسەی ناو بیٚشکەو دەورانی گەورەبوونیداو یەکیٚك لە پیاوچاکان دەبیٚ)) *.

هەروەها لە ئایەتی چل و هەشتەمی سورەتی (ئالی عیمران)دا دەفەرمیٚ: ((خوداوەند هەرخۆی عیسای فیٚری نووسین و کتیٚب وەخویٚندن و لەکارزانی (واتە هەموو زانستەکان)و تەورات و ئینجیلی کردو ئەو توانایەی پیٚ بەخشی کە کویٚری زگماك چاك بکاتەوەو پیٚست بەلەکان چار بکات و مردوو، زیندوو بکاتەوە)).

خوداوەند لە سورەتی (ئالی عیمران)دا ئەوەندە پلەوپایەی حەزرەتی عیسای بەرز نرخاندووە کە لەئایەتی شەستەمی * ئەو سورەتەدا بە دوایین پیٚغەمبەر (پیٚغەمبەری ئیسلام) دەفەرمیٚ: ((الحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلا تَكُن مِّنَ المُمتَرِينَ)) لیٚکدانەوەی واتاکەی بەم شیٚوەیە (( هەوالٚی پەیوەست بە عیسا کە لەناو ئایەتەکانی ئەم قورئانەدا گەیشتووە بەتۆ، هەوالٚی دروستەو ئەوەی لەبارەی عیساوە پیٚم وتی، ڕاستەو خۆت لە ڕیزی دلٚ بەدگومانان دەراویٚ)).

هەلٚبەتە ئەم ئایەتە لەشیٚوەی قسەکردنە لەگەلٚ پیٚغەمبەری ئیسلامدا، بەلاٚم لەڕاستیدا خودا قسە لەگەلٚ هەموو خەلٚکی دەکات، نەك بەتەنیا پیٚغەمبەری هەلٚبژیٚردراوی خۆی، چونکە مەحالٚە پیٚغەمبەر بەگومان بیٚت لەڕاستی هەوالٚیٚك کە خودا خۆی ڕاستەوخۆ پیٚی دەگەیەنیٚ. خودا بە خەلٚکەکە دەلٚیٚ کە کاتیٚ هەوالٚیٚ دەربارەی مۆجیزەکانی عیسا دەبیستن، تووشی گومان نەبن و نەلٚیٚن مۆجیزەکانی حەزرەتی عیسا ئەقلٚ نایبڕیٚت. خویٚنەری ئەم دیٚڕە، ئەگەر سورەتی (ئالی عیمران) بخویٚنیٚتەوە، تیٚدەگا لەوەی کە لە قورئاندا –کە کتیٚبیٚکی ئاسمانی موسولٚمانانە– پایەی عیسا گەورەترو بەرزترە لەوەی کە لەم سەرگورشتەیەدا پیشان دراوە.

هەروەها لە سەرچاوەکانی مەسیحیدا دەربارەی لەخاچ درانی حەزرەتی عیسا، ئالٚۆزی و ناکۆکی زۆر هەیە. دەستەیەکیان لەسەر ئەوە کۆکن کە عیسا لەخاچ دراوە، بڕیٚکیشیان پیٚیان وایە لەسەر درەختیٚکدا کوژراوە، لەکاتیٚکدا قورئانی پیرۆز کۆتایی

* بۆ وەرگیٚڕانی ئایەتەکان لەفارسیەوە سوود لە (وەرگیٚڕاوی–قورئانی پیرۆز بە کوردی–مامۆستا هەژار) وەرگیراوەو بەراوردیان پیٚ کراوەو دیارە سوود لە (تەفسیری قورئان) وەرگیراوە بۆ وەرگیٚڕانی بۆ فارسیەکەی. (و. کوردی)

* نووسەری ئەم وتارە لە چاپە فارسیەکەدا بە هەلٚە نووسیویەتی ئایەتی پەنجاو نۆیەم (٥٩)، بەلاٚم ڕاستیەکەی ئایەتی شەستەمە (٦٠). (و. کوردی)

هێناوە بەم ئاڵۆزی و ناکۆکیەو لە سورەتی (نیسا ﷺ)دا، لەئایەتی ١٥٧دا* دەفەرمێ: ((... ما قَتَلوهُ وَما صَلَبوهُ وَلكِن شُبِّهَ لَهُم...)) واتە ((نە ئەوان کوشتیان، نە توانیان لە خاچی دەن، بەڵکو سەریان لێ تێك چوو)). پێش ئەوەی کۆتایی بە وتارەکە بهێنم، بە پێویستی دەزانم خاڵێکی گرنگتان بیربخەمەوە لەڕووی ناسین و بەئاگابوونی زیاتر لەسەر پەیدابوونی مەسیحییەت و دامەزراندن و چەسپاندنی بنەماکانی سیستەمی کلێساو تەشەنەکردنی "پاپا"کان لە زنجیرەی پایەکانی پێشەوایەتی کلێسادا.

هەروەکو لە لاپەڕەکانی سەرەتای ئەم پێشەکیەدا ئاماژەمان پێدا، لە دوو سەدەی یەکەمی میلادیدا ئینجیلێکی زۆر لەبەر دەستی شوێنکەوتوان و باوەڕدارانی عیسای مەسیحدا بووە کە زۆربەی ئەو ئینجیلانە ڕاپۆرتی قوتابی و شوێنکەوتووەکان یان ئامۆژگاریەکانی مەسیح بووە. لەگەڵ شکڵ گرتنی سیستەمی پێشەوایەتی کلێسا، زۆربەی ئەو ئینجیلانە بەفەرمانی (پاپا-بابا)کان کە لەپلەی سەرەوەی کلێسادا فەرمانڕەواییان دەکرد، کۆکرانەوەو لەژێر دەستی شوێنکەوتووانی مەسیحدا دەرهێنران، پاشان کۆپی کردنیان قەدەغەکراو وردە وردە لەناوچوون. بەڵام ژمارەیەکی تر لەو ئینجیلانەی کە دوورە دەست بوون، لە گۆشەو لێوارەکانی دەسەڵات و لەسەرخاکی مەسیحی نشینەکاندا لەلایەن بڕوادارو بەوەفاکانی سەرەتای پەیدابوونی مەسیحییەت و، سەردەمی قوتابییەکان و ئامۆژگاری کراوەکان، لە دوورە دەستی فەرماندارانی کلێسادا پارێزراوە.

هەر بەو شێوەیەی کەلە دائیرەتولمەعاریفی ئینگلیزی، بەرگی دووەم، لاپەڕەکانی ١٧٩-١٨٠، چاپی سێزدەیەم، ناونیشانی بیست وچوار ئینجیلی باس کردووە کە لە دوورە دەستی پلەدارەکانی کلێسادا پارێزراون، بەڵام لە هەموو ئەو ئینجیلانە گرنگتر، دۆزینەوەی ئینجیلی "بارنابا"یە.

ئینجیلی "بارنابا" یەکەم جار لەساڵی ١٧٠٩ی میلادی، لە پەرتوکخانەی یەکێ لە شارەکانی "ئامستردام" لەلایەن کەسێك بەناوی "کریمەر" کە ڕاوێژکاری پادشای "پروس" بوو، دۆزراوەیەوە.

لەبەرئەوەی ئەو ئینجیلەی کە دۆزرایەوە بەزمانی ئیتاڵی نووسرابوو، بۆیە لەلایەن یەکێ لە مامۆستایانی زانکۆی ئۆکسفۆردی لەندەن وەرگێڕدرا بۆ زمانی ئینگلیزی.

---

* نووسەری وتار لە چاپە فارسیەکەدا بەهەڵە نووسیویەتی ئایەتی (١٥٦)، بەڵام ڕاستیەکەی ئایەتی (١٥٧)ە. (و. کوردی)

بڵاوبوونەوەی ئەم ئینجیلە تازە دۆزراوەیە، شڵەژانێکی زۆری لە کۆمەڵگای زانستی و ئایینیی وڵاتانی ئەوروپی بەتایبەت لە (ئینگلستان-بەریتانیا)، دروست کرد. کڵێسای کاتۆلیك، ئینگلیکان، پرۆتستان و لقەکانی تری مەسیحی، ئەو ئینجیلەیان بە تەزویر لەقەڵەم داو دەیانگوت ئینجیلی "بارنابا" لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لەلایەن موسوڵمانێکی بەڕەگەز عەرەبەوە نەخشێنراوە بۆئەوەی ئاراستەو بەڵگەیەك بۆ ڕاستی ئایینی ئیسلام و بەتاڵ کردنەوەی ئایینەکانی تر بهێنێتە ئاراوە. گروپێکی تریان، زیاتر پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە ئەو ئینجیلە لەلایەن یەکێ لە جوولەکە موسوڵمان بووەکانەوە نووسراوە، بۆئەوەی ببێتە هۆی ئاژاوەگێڕی لەبنەماکانی باوەڕداریی سیستەمی کڵێسای مەسیحیدا! ئەگەرچی شڵەژانێك لەکۆمەڵگای زانستی و ئەنجومەنە ئایینییەکانی پەراوێزی ئینجیلی "بارنابا" دروست بوو، بەڵام گەواهیدەرە باوەڕپێکراوە مێژووییەکان ئەو ئینجیلەیان بەدرۆ خستەوەو گومانیان لە ڕاست و دروستی ئەو ئینجیلی "بەرنابا"یە خستەڕوو کە پێش ئیسلام هەبووبێت؛ هەروەها مێژووش پشتگیری ئەو پوچەڵکردنەوەیەی کرد. ئەم گەواهیدەرە مێژووییە، فەرمانێکە لەلایەن پاپا "جەلاسیوسی یەکەم" کە لەساڵی ٤٩٢ی میلادیدا گەیشبووە پلەوپایە-دەرکراوە، لەنێو ئەو فەرمانەدا ناو وناونیشانی ژمارەیەك لەو کتێبانەیان هێناوە کە خوێندنەوەیان لەلایەن کڵێساوە قەدەغە کراوە، لەناو ئەوانەشدا ناوی ئینجیلی "بەرنابا"یان هێناوە. ئەمە مێژووی دەیان ساڵ پێش هەڵهاتنی ئیسلامە (دروست سەدوسی ساڵ پێش کۆچی و سەدوسێزدە ساڵ پێش هاتنی پێغەمبەری ئیسلام). هەڵبەتە لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەیەمدا کۆپیەکی تری ئەم ئینجیلە بەزمانی ئیسپانی دۆزرایەوە. بۆچوونی نزیك لەگومانی توێژەرانی مێژوویی ئایینەکان ئەوەیە کە ئینجیلی "بارنابا" لە بنەڕەتدا بە زمانی عیبری یان یۆنانی بووە، پاشان وەرگێڕدراوە بۆ زمانی ئیتاڵی و ئیسپانی و کۆپیە بنەڕەتیەکە بەهۆی دژایەتی کردنی "پاپا"کان -گوایە ئامۆژگاریە دەستوریەکانی کڵێسا تێك دەدات- بە درێژایی فەرمانڕەوایەتی "پاپا"کان لەناوچووە و ئەم کۆپیە بەرێکەوت لە دوورە دەستی دوژمنکارییەکانی ڕۆژئاوا، پارێزراوە. هەروەها لە دائیرەتولمەعاریفی ئینگلیزی، بەرگی دووەم، چاپی سێزدەیەم، لاپەڕە ١٨٠دا لەبارەی ئینجیلی "بارنابا"و فەرمانی چاپی جەلاسیوسی یەکەمیش دوواوە.

ئینجیلی "بارنابا" یەکەمجار لەلایەن دکتۆر "خەلیل سەعادەت" لە ئینگلیزیەوە وەرگێڕدراوە بۆ عەرەبی، لەساڵی ١٩٠٨ی میلادیدا لە قاهیرە چاپ کراوە، پاشان لەساڵی ١٣١١ی هەتاوی (١٩٤٢- ١٩٤٣ی میلادی) (و.کوردی) لەلایەن "حەیدەر قلی خانی قزڵباش"ی ناسراو بە (سەردار کابوڵی) لە عەرەبییەوە وەرگێڕدراوە بۆفارسی و لە کرماشان چاپ کراوە.

سەردار کابوڵی پێشەکیەکی لێزانانەو سادەی لەسەر نووسیوەو بە بەڵگەی تەواو وەڵامی بیروبۆچوونی نەیارەکانی داوەتەوەو لە پەراوێزی زۆربەی لاپەڕەکاندا ناوەرۆکەکەیی بە ئایەتی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر هەڵسەنگاندووەو ئەو ئینجیلەی کە بە بڕواپێکراوترین ئینجیل دانراوە، یەکێ لە قوتابییەکانی عیسای مەسیح نووسیویەتی و بە شێوەیەکی پەرجوئاسا، لە دوورە دەستی ڕووداوەکانی ڕۆژگارو نەیارەکاندا، بە پارێزراوی ماوەتەوە.

لەم ئینجیلەدا هاتووە کە "حەزرەتی عیسا" لەخاچ نەدراوە، بەڵکو "یەهوودا" کە خیانەتی لێ کردبوو، بەهەڵە لەخاچ دراو هۆکاری ون بوونی "یەهوودا" کە لە ڕاستیدا خیانەتەکەی لە ئەستۆدابوو، لەخاچ دراوەو سەرچاوەی مەسیحییەت بەهەڵە بڵاویان کردۆتەوە کە گوایە شوێنکەوتووانی حەزرەت (حەزرەتی عیسا) کوشتوویانە!

هەروەها لە ئینجیلی "بارنابا"دا هاتووە کە حەزرەتی عیسا، دوای سێ ڕۆژ، خۆی پیشانی شوێنکەوتووەکانی بەتایبەت مریەمی پیرۆز، دەدات و ئەوانی لە گومان هێنایە دەرەوەو هەواڵی تەندروستی خۆیی گەیاندو ئیتر بۆهەمیشە لە دنیا دیارنەماو پێش دیار نەمانەکەی، باسی ناونیشانەکانی دوایین پێغەمبەری خودا ((ڕەسوڵی خودا)) (پێغەمبەری ئیسلام) درودی خوای لەسەر بێت، کردووە.

م. زنجانی

## پێشەکی وەرگێڕی کوردی

ئەم کتێبە یەکێکە لە بەرهەمە گەورەکانی نووسەری گەورەی فنلەندی (میکاوالْتاری) کە لەدوای دوو کتێبە بەناوبانگەکانی (بەسەرهاتی سینۆهە پزیشکی تایبەتی فیرعەون) و (ڕووخانی قوستەنتنییە)ەوە دێت. نووسەر زۆر بوێرە لە هەڵبژاردنی بابەتە مێژووییەکاندا چونکە هەڵبژاردنی بابەتێك کە سەرچاوەی کەم بێت تا بتوانرێ پشتی پێ ببەسترێ بۆ تەواو کردنی بەرهەمێك، بوێری دەوێت و دەبێ بە ئەمانەتەوە ئەو بەرهەمانە و بەتایبەت بابەتە مێژووییەکان بخاتە بەردەم خوێنەر. نووسەر وەك دوو بەرهەمەکەی تری باسی سەردەمێکی مێژوویی دەکات کە چیرۆکخوان بەردەوام یادەوەریەکانی خۆی لە گەشتەکەی بۆ "میسر" و "فەلەستین" لە ڕێگەی نامەکانییەوە کە دەینێرێ بۆ خۆشەویستەکەی بە ناوی "تولیا" لە وڵاتی ڕۆم، بەیان دەکات.

ئەم کتێبە ئەگەرچی باسی سەردەمی حەزرەتی عیسا (دروردی خوای لێ بێ) دەکات کە سوود لە هەر چوار ئینجیلەکەی (لۆقا، مەتتا، یۆحەننا، مەرقۆس) وەرگیراوە، بەڵام بەشێوەی چیرۆك نووسراوە و بۆ لایەنە مێژووییەکەش، خوێنەر دەتوانێ لە چۆنییەتی دروست بوونی مەسیحییەت و ئەم ئینجیلەی ئێستا تێ بگات و بزانێ هەر لەو ڕۆژەی کە جوولەکەکان ویستیان ئەو پێغەمبەرە پیرۆزە لەخاچ بدەن، شوێنکەوتووانی عیسا بیروبۆچوونیان چۆن بووە سەبارەت بە مەسیح و پیرۆز کردنی خاچ.

ئێمە لە وەرگێڕانی ئەم کتێبە مێژووییەدا —لە فارسیەوە— کە بە شێوەیەکی ئەدەبی نووسراوە هەوڵمان داوە دەقە ئەدەبیەکانی لەدەست نەدات هەربۆیە لە وەرگێڕانەکەیدا تەنانەت یەك وشەمان لێ نەپەڕاندووە و، بۆ مانای وشەکانیش هەوڵمان داوە کورتترین و جوانترین وشەی کوردی بەکار بهێنین بەڵام هەندێ وشەی تر هەبووە کە لە فەرهەنگی فارسیشدا واتاکەیمان نەبینیوە بۆیە وەك خۆی نووسیومانەتەوە بەڵام لە پەراوێزدا ڕوونکردنەوەمان داوە و ئەگەریش هەر هەڵە و کەمو کورتیەکی تێدا هەبێ داوای لێبووردن لە خوێنەران دەکەین چونکە هیچ کارێك بێ کەموکورتی نییە بۆیە داوا لە خوێنەر دەکەین هاوکاریمان بکەن بۆئەوەی لە چاپی دواتردا هەڵەکان ڕاست بکەینەوە.

لێرەدا دەمەوێ سوپاسی هەموو ئەو کەسانە بکەم کە لە تایپ کردن یان تەنانەت بە یەك وشەش هاوکارییان کردووم. هیوادارم توانیبێتم خوێنەری کوردی ڕازی بکەم.

ایمن محمد

## دەستپێکی سەرگورشتەکە

"تولیا"، لە نامەکەی پێشتر ڕونکردنەوەیەکم سەبارەت بە نووسینەکانی خۆم و وڵاتی میسر بۆ نووسیت و پێم گوتوویت کە بە کەشتی لە ڕووباری "نیل"ەوە گەشتم کردووەو دوای گەڕانەوەم بۆ "ئەسکەندەریە" هەموو ڕۆژێ دەچووم بۆ لەنگەرگا بۆئەوەی بزانم تۆ بە کەشتی لە "ڕۆما"وە دێیت یان نا؟ من لە چاوەڕوانی تۆدا ئەوەندە دەچووم بۆ لەنگەرگا کە بڕوا ناکەم هیچ کەسێ لە دانیشتوانی ئەو شارە گەورەیە هێندەی من ناوەندی شاریان ناسیبێت. ئەوەندە چاوەڕوانت بووم تا وەرزی پاییز هات و ئیتر لەهاتنت بۆ میسر بێ ئومێد بووم. بەڵام هەندێ لە ژنە نەجیبزادەکانی ڕۆما بەبێ مێردەکانیان هاتن بۆ میسر بۆئەوەی وەرزی هاوین لە ئەسکەندەریە بەسەر بەرن.

"تولیا"، ئەگەر لەبیرت بێ، لەنامەکانی پێشتردا ماڵئاواییم لێ نەکردی و پێم گوتی کە ئیتر ناتبینمەوە و لەلێواری دەریای "سور"دا سواری کەشتی دەبم و بەرەو "هیندستان" بەڕێ دەکەوم. ڕاستیەکەی ئەوەیە کاتێ نامەکانم بۆت دەنووسی، هۆشم لای خۆم نەبوو و نەشمدەزانی چەندە تۆم خۆش دەوێ. لەکاتی نووسینی ئەو نامانەدا بە لەخۆبایی بوونێك بەخۆم دەگوت: ((ئەی پیاو! تۆ ئێستە تەمەنت سی ساڵ دەبیت و پیاوێکی تەمەن سی ساڵیش نابێ وەکو کوڕەتازە پێگەیشتووەکان، لە بەرامبەر عەشقدا بێ توانا بن)) و بێ ئاگا بووم لەوەی کە ناتوانرێ ململانێ لەگەڵ عەشقدا بکرێت.

"تولیا" من دەزانم لەبەرچی بۆ هاوینی ئەمساڵ لە "ڕۆما"وە نەهاتی بۆ میسر و نەگەشتیە لای من، لەکاتێکدا خۆت بەمنت گوت کە دەبێ لە "ڕۆما" دوور بکەومەوە، چونکە ئەگەر لە "ڕۆما" بمێنمەوە، گیانم دەکەوێتە مەترسیەوە. هۆکاری مانەوەی تۆ لە"ڕۆما" ئەوەیە کە تۆ ژنێکی پلەوپایە پەرستیت و خوازیاری بەرزبوونەوەو وەرگرتنی هێزی سیاسیت و ئەمانەش لە ئەڤینداری دوورت دەخەنەوە. من دەبێ پێت بڵێم لەم کاتەدا حەزی سیاسیت بۆ پلەوپایەو بەدەست هێنانی هێزی سیاسی، هەڵەیەکی گەورەیە.

"تولیا" تۆ ئەمڕۆ گەنجیت و تاڵەکانی پرچت ڕەشەو ددانەکانت وەکو مرواری دەدرەوشێنەوە، بەڵام سبەی ڕۆژ پیردەبیت و مووەکانت سپی دەبن و ددانەکانیشت

بەجۆرێ دەکەون کە ڕووت نایە دەمت بکەیتەوەو قسەبکەیت لەبەرئەوەی نەوەك خەڵك چاویان بە ناو دەمەبێ ددانەکەت بکەوێ.

"تولیا"، تا ئەوکاتەی لە "ئەسکەندەریە" بووم، هەموو ڕۆژێ دەچووم بۆ ناوەندی بەندەریی تا بزانم گەمیە هەڵگرەکەت لە "ڕۆما"وە گەیشتووە یان نا و، دوای ئەوەی لە چاوەڕوانی کردنت ماندوو بووم، بەرەو پەرتوکخانە بەڕێ دەکەوتم یانیش گەشتم دەکردو دەچووم بۆ باشور و خۆم دەگەیاندە هەرەمەکان و ناوی تۆم لەسەر بەردی هەرەمەکان هەڵدەکەند.

من دەزانم ئەو ڕۆژەی لە "ڕۆما"وە بەڕی کەوتم، تۆ منت خۆش دەویست. بەڵام نازانم ئێستەش منت خۆش دەوێت یان نا؟ بەڵام بیستوومە کە کاتێ مرۆڤ دوور دەکەوێتەوە، لەبیر دەچێتەوەو هەرکەسێ لەچاو ون بوو، لە دڵیشدا نامێنێ. کاتێ لە هاتنی تۆ بۆ میسر بێ ئومێد بووم و دڵنیا بووم کە ئیتر نایەیت، حەزی گەشت کردنم بۆ میسر و باشووری میسر نەما، بەڵکو تەنیا بۆ پەرتوکخانە دەڕۆشتم. تاکو نەیەیت بۆ "ئەسکەندەریە"و پەرتوکخانەکە نەبینی، نازانی کە چەندە گەورەو فراوانە. ئەوەی لە ئەسکەندەریە بە پەرتوکخانە ناوی دەبرێت، بۆخۆی شارێکە. بینایەی کتێبخانەی "ئەسکەندەریە" وەکو شارێك وایە لەناو شارێکی تردا.

"تولیا"، بۆئەوەی نموونەیەکت لە کتێبخانەی ئەسکەندەریە نیشان بدەم، دەبێ بڵێم کە مرۆڤ ناتوانێ لەماوەی سێ مانگدا تەنانەت ناوی گشت کتێبەکان بخوێنێتەوە چی بگات بەوەی خودی کتێبەکان بخوێنێتەوە. لە پەرتوکخانەی ئەسکەندەریە تەنیا دەهەزار پەرتوکی تێدایە کە هەموویان لێکدەرەوەی دلێریەکانی ناسراوی "هۆمەر"ن کە شاعیری یۆنانییەو ناوەکەی بە "ئیلیاد" نووسراوە، ئەو کتێبانەش کە لەبارەی "ئەفلاتۆن"و "ئەرستۆ" نووسراون، لە دوو هۆڵی گەورەدا دانراون: یەکێکیان بەناوی یانەی "ئەفلاتۆن"و ئەوی تر بەناوی "ئەرستۆ"یە. ئەو کەسانەی لەم کتێبخانەیەدا کاردەکەن، شەوو ڕۆژیان لەوێ بەسەر دەبەن و هەموو شتێکی خۆیان کردووە بە قوربانی کتێب. من لە کتێبخانە پیاوێکی پیرم بینی چاوێکی لەدەست دابوو، تەنیا نیوەی چاوەکەی تری دەیبینی، بەڵام دەمزانی کە ئامادەیە نیوەی چاوەکەی تریشی بە فیدای کتێب بکات. لە ڕۆژی یەکەمەوە کە چووم بۆ کتێبخانە، کاتی خۆم تەرخان کرد بۆئەوەی بزانم پێشبینی ئەستێرەناسەکانی زوو، لەبارەی سەردەمی ئێمە چی بووە. من

تێگەیشتم کە لەهەموو وڵاتەکاندا ئەستێرەناس و زانایانی وا هەبوون کە پێشبینی دواڕۆژیان کردووە، بەڵام ئەستێرەناسە تازەکان چ لە "ئەسکەندەریە"و چ لە "کلدە"و چ لە "ڕۆما" دەڵێن لە نیشانەی ئەستێرەکانەوە دەزانین کە بێگومان دنیا کەوتۆتە سەردەمێکی نوێوەو "پادشای جیهان" لەدایک بووە.

لە کتێبخانەکەی ئەسکەندەریەدا پیاوێکی یەهوودی هەبوو بەناوی "فیلۆ". هەروەکو "یۆنانییەکان"و ئێمەی ڕۆمی کە دلێریەکانی "هۆمەر" لێك دەدەینەوە تا واتای دروشمەکانی ڕوون بکەینەوەو هەموو کەسێ تێبگات کە هۆمەر چی دەڵێ، "فیلۆ"ش کتێبی ئایینی جوولەکەکانی لێك داوەتەوە تا لەوشتانە تێ بگەن کە لەناو ئەو کتێبەدایە.

"تولیا"، تۆ جوولەکەکان دەناسیت و لە"ڕۆما" بینیوتن و دەزانی کە ئەوان تەنیا یەك خودا دەپەرستن، هەروەها ئەوەش دەزانی کە ئەوان هاوڕێیەتی لەگەڵ کەسانی تر ناکەن و، جگە لەوەش ئێمەی ڕۆمی پشووی هەفتانەمان لاسایی کردۆتەوەو چونکە وەکو ئەوان هەفتەی جارێك واز لەکار دەهێنین.

گەلی یەهوودی، هەر لەم ڕووەوە لەگەڵ هۆزەکانی تر جیاواز نین، بەڵکو جیاوازییەکی تریشیان ئەوەیە کە جگە لەیەك خودا، تەنیا یەك پەرستگاشیان هەیە ئەویش لە "قودس"دایە. کەنیسەکانی ئەوان لەشوێنەکانی تر بە پەرستگا ناژمێردرێ، بەڵکو تەنیا جێگەیەکی جوولەکەکانە کە تێیدا کۆدەبنەوەو کتێبی ئایینی دەخوێننەوە.

ئەو ڕۆژە دوای ئەوەی زانا یەهوودییەکە لەو کتێبخانەیەدا، لەبارەی ئەمانەوە قسەی لەگەڵ کردم، چوومە دەرەوە و ڕۆشتم بۆ گەرماو و دوای شێلان و خۆشتن، هاتمە دەرەوەو بەبێ هیچ مەبەستێك لەشەقامەکانی "ئەسکەندەریە"دا ڕێم دەکرد تا کاتێ نزیك بوومەوە لە بازاڕی گەورەی کەلوپەل فرۆشەکان، سەرنجم دا یەکێ لە جوولەکەکان پێش ئەوەی بگاتە بازاڕ، لە تەنیشت شەقامەکەدا ڕاوەستاوەو بە دەنگێکی بەرز شتێك ئەڵێ. پیاوانی یەهوودی قژو ڕیشێکی درێژو ئاڵۆزیان هەیە، بۆیە بەیەکەم نیگا دەناسرێنەوە. کاتێ نزیك بوومەوە لەو پیاوە، بیستم هاوار دەکات: پادشای جیهان لە "قودس" پەیدا بوو.

"تولیا"، من ئەو ڕۆژانە بایەخێکی تایبەتم دەدا بە بابەتی پادشای جیهان، بۆیە کاتێ ئەو قسەیەم بیست، زۆر کاری تێکردم و لێم پرسی: ((تۆ چۆن دەزانی پادشای

جیهان له "قودس" پەیدا بووه؟))، بەڵام ئەو پیاوه بەبێ ئەوەی سەیرم بکات، هەر دەیگوت: ((پادشای جیهان له "قودس" پەیدا بووه)).

یەکێ له پیاوەکانی بازاڕ که دواتر دەرکەوت سەرڕافه، پێی گوتم: جەژنی گەورەی جوولەکەکان نزیك بۆتەوەو ژمارەیەکی زۆریان به گەمیه دەچن بۆ "یوده" تا خۆیان بگەیەننه "قودس"و لەوێ له جەژنی گەورەی جوولەکەکاندا ئامادە بن. ئەگەر تۆش حەز بکەیت، دەتوانم له یەکێ له کەشتییەکاندا جێگایەکت بۆ بگرم بەکرێ بۆئەوەی تۆش بچی بۆئەوێ و پەرستگای جوولەکەکان ببینی، چونکه پەرستگای جوولەکەکان له "قودس" یەکێکه له جێگا سەیرەکانی دنیا.

"تولیا"، پێش ئەوەی پیاوه سەرڕافەکه باسی پەرستگای جوولەکەکانم بۆبکات، ناوبانگی ئەو پەرستگایەم بیستبوو، حەزیشم دەکرد ڕۆژێ ئەو پەرستگایه ببینم. بەڵام ئەو ڕۆژه لەبەرئەوەی دەمزانی وەرزی هاوین تێپەڕ بووەو تۆش ئیتر نایەیت بۆ میسر و، هەروەها لەبەرئەوەش که مێشکم پڕ ببوو له بابەتی پادشای جیهان و لەدەمی ئەو پیاوه یەهوودییەوه بیستم که ئەو له "قودس" پەیدا بووه، بۆیه بڕیارم دا بڕۆم و لەکاتی جەژنی گەورەی جوولەکەکاندا ئەو شاره ببینم و سەیری پەرستگای جوولەکەکانیش بکەم.

پیاوه سەرڕافەکه منی برد بۆ نووسنگەی یەکێ له بنکەکانی کەشتی و له گەمیەیەکدا که دەیانگوت دوایین کەشتییه بەرەو لێوارەکانی "یوده" دەڕوات، جێگەیەکی بۆ گرتم بەکرێ. من لەو پیاوەی که له نووسینگەکه دانیشتبوو، پرسیم: کەشتییەکەتان متمانەی پێ دەکرێ یان نا؟ ئەو گوتی: گەمیەکەی ئێمه تازەبەتازەیی خراوەته ناو ئاوەوەو له دووجار زیاتر گەشتی نەکردووه. من بۆیه ئەو پرسیارەم لێ کرد، چونکه دەمزانی کەشتییەکۆنەکان کێشه دروست دەکەن و مشکی بێزارکەریان تێدایەو ترسی نوقوم بوونیشی هەیه.

پیاوه سەرڕافەکه، دوای ئەوەی جێگەیەکی بۆ گرتم بەکرێ، پێنج درهەمی لێ وەرگرتم. منیش که دەمزانی ڕۆژی دواتر کەشتییەکه بەڕێ دەکەوێ، قەرزەکانی خۆم دایەوه بەو کەسانەی شتم لەلایان هێنابوو وەکو کوتاڵ فرۆش و دروومان و...هتد. داوام له سەرڕافێك کرد که مامەڵەم لەگەڵی هبوو تا پارەم بۆ حەواڵه بکات بۆ سەرڕافێکی تر له قودس، چونکه دەمزانی هەڵگرتنی پارەی نەختینه لەکاتی گەشتدا ترسناکه. پاشان ماڵئاواییم لەچەند کەسێك کرد که نەمدەتوانی بەبێ ماڵئاوایی

بەجێیان بهێڵم و بەبێ ئەوەی بڵێم بۆکوێ دەچم، بەیانی ڕۆژی دواتر چووم بۆ بەندەری ئەسکەندەریە تا سواری کەشتییەکە ببم.

من کە دەمزانی ئەو کەشتییەی گەشتی پێ دەکەم کەشتییەکی "سریانی"یەو خاوەنەکەی خەڵکی سوریایە، دەگەڕام تا چاوم بە باشترین کەشتی بکەوێت لەبەندەر، چونکە ڕۆژی پێشتر بەڕێوەبەری نووسینگەی بنکەی کەشتییەکە پێی گوتم کە ئەو کەشتییە لە دوو جار زیاتر گەشتی نەکردووە. بەڵام دوای گەڕانێکی زۆر و پرسیارکردن لە ئەم و ئەو، زانیم ئەو کەشتییەی کە دەبێ من بگەیەنێتە "یودە" لە کۆنترین ئەو کەشتییەکانەیە کە لە ئەسکەندەریەدا هەن. کاتێ چوومە ناو کەشتییەکە، بینیم کرێکارەکانی کەشتییەکە خەریکی بە دووکەڵکردنی "ئیسفەند"ن[1] بۆئەوەی بۆنە ناخۆشەکانی کەشتییەکە لەناو ببات، بەڵام تەنانەت دوکەڵی ئیسفەندیش نەیتوانی بۆنە ناخۆشەکانی کەشتییەکە لەناو ببات. ئەوەندە گەشتیار لەناو کەشتییەکەدا بوو کە مەترسی ئەوە هەبوو کێشی گەشتیارەکان کەشتییە کۆنەکە نوقوم بکات. لەسەر کەشتییەکە گوریسێکی زۆریان لەلایەکەوە بەستبوو بە لایەکی ترەوەو جلی کۆنەیان پێدا هەڵخستبوو بۆئەوەی وشك ببنەوە. تازە ناڕەزایی من و گەشتیارەکان بێسوود بوو، ئێمە ئەگەر ناڕەزاییمان دەربڕیایە ئەوا جگە لە دابەزین لە کەشتییەکە هیچ ئەنجامێکمان شك نەدەبرد، بۆیە من ناڕەزاییم دەرنەبڕی.

ئەوکاتە لەنگەریان هەڵگرت و سەوڵ لێدەرەکان سەوڵەکانیان خستەکار. کەشتییەوانەکە نەزری کرد[2] تا کەشتییەکە بە سەلامەتی بگاتە جێی مەبەست. جوولەکەکانیش دەستەکانیان بەرز کردەوەو داوایان لە خودای خۆیان کرد بیانگەیەنێتە "یودە".

---

[1] ئیسفەند، گیایەکی خڕوسکی بۆنخۆشە، وشك دەکرێتەوەو پاشان کە دەپرژێنریت بەسەر سکڵی سوور بووەوەدا، دوکەڵێکی بۆنخۆش بڵاو دەکاتەوە. (و. کوردی)

[2] نەزر، پەیمانێکە لەلایەن بەندەوە کە دەیدات بە خودا و دواتر پێویستە لەسەری ئەو پەیمانە جێبەجێ بکات. (و. کوردی)

# له ڕێگای قودسدا

لەسەر کەشتییەکە، کچێکی گەنج کە تاجێکی گوڵینی لەسەربوو و عودێکیشی بەدەستەوە بوو، دەستی بە مۆسیقا لێدان کردو گەنجێکی تریش لە تەنیشتیدا دەستی کرد بە نەی لێدان. کە چاوم بەو ژن و پیاوە کەوت، زانیم کە مۆسیقاژەن و گۆرانی بێژن. دوای چەند خولەکێك پیاوە گەنجەکە وازی لە نەی لێدان هێناو دەستی کرد بە گۆرانی گوتن. ئەو گۆرانییەی کە ئەو گەنجە دەیگوت یەکێ لەو گۆرانیانە بوو کە لە ئەسکەندەریە بیستبووم، بۆیە بەلامەوە شتێکی نوێ نەبوو. من بۆم دەرکەوت کە جوولەکەکان لە بیستنی دەنگی ئەوعودەی کە بەدەستی گەنجەکەوە بوو و، گۆرانی گوتنەکەی کە لەگەڵ عودەکەدا دەیگوت، ناڕازی بوون. هەندێکیان، کاتێ لەتەنیشت ئەو ژن و پیاوەوە تێدەپەڕین، دامێنی جلەکانیان دەدایەوە بەسەر ڕوخساریاندا، بۆئەوەی ئەو دووانە نەبینن. ئەگەر چەند گەشتیاری دەوڵەمەند، کە بۆ خۆشی دەچوون بۆ قودس و "برێك لە سەربازانی ولاتی ڕۆم کە بۆ "یودە" سەفەریان دەکرد، لەناو کەشتییەکەدا نەبوونایە، ئەوا جوولەکەکان ڕێگرییان لە مۆسیقاژەنین و گۆرانی گوتنی ئەو دووانە دەگرت. بەلام ئەوان لە گەشتیارە دەوڵەمەندەکانی ناو کەشتییەکەو بەتایبەت لە سەربازەکانی دەوڵەتی ڕۆم دەترسان. تۆ دەزانی کە "یودە" لەژێر دەسەلاتی داگیرکاری حکومەتی "ڕۆم"دایەو سەربازان و لەشکرەکانی ڕۆم، ئەوێ بەڕێوەدەبەن. کاتێ لە میسرەوە بە کەشتی کەوتمەڕێ بۆ "یودە" بۆئەوەی شاری "قودس "ببینم، بەتەنیا بەڕێ کەوتم، واتە نە کەنیزەکم لەگەڵ خۆم بردو نە غولامیش تا خزمەتی من بکەن. چونکە باوەڕم وایە لەم سەردەمەدا کە ئێمە تیای دەژین، تەنیایی بەخششێکە کە هێندەی تەندروستی و ئاسایش بایەخی هەیە و کاتێکیش ئەو دیاریە دەست کەسێك دەکەوێ، نابێ لەدەستی بدات، بۆیە من بەتەنیا گەشتم دەکرد.

جوولەکەکان کە گەشتیان بۆ "قودس" دەکرد، لەگەڵ گەشتیارانی تردا نەدەگونجان و شوێنی خەوتن و شوێنی نانخواردنیان جیابوو، چونکە یەهوودییەکان نانی ئێمە ناخۆن. ئەم جوولەکانە لە ڕۆژێکدا سێ جار واتە بەیانیان و نیوەڕوان و شەوان نزایان دەکرد و هەموو جارێ دەستیان بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوەو داوایان لە

خودای خۆیان دەکرد تەندروستیو تەمەن درێژی و سەروەتیان بداتێ و وەچەکانیان زیاتر بکات. من پێموایە ئەگەر شنەی با نەبوایەو کەشتییەکەمان چارۆکەکەی هەڵنەدایە، هەرگیز نەماندەتوانی خۆمان بگەیەنینە کەنارەکانی "یودە" چونکە سەوڵ لێدەرەکان پیرو بێ توانابوون و نەیاندەتوانی بە هێزەوە سەوڵ لێ بدەن. من هیچ شتێکم نییە لەبارەی پێشهاتەکانی گەشتە دەریاییەکەم لە"میسرە"وە یان لە"یودە" تا پێتی بڵێم، چونکە ڕووداوی گرنگ ڕووی نەداوەو هەموو کاتەکانی من لە کەشتییەکەدا وەکو یەك تێدەپەڕین و زیارەتکارە یەهوودییەکانیش یان نوێژیان دەخوێند یانیش بە کۆرس و بەیەك دەنگ سرودی ئایینیان دەخوێندو یانیش نانیان دەخوارد.

لەهەمان ڕۆژی یەکەمدا، زانیم ئەو کچەی کە عود لێدەدات و ئاواز دەخوێنێ ناوی"میرنا"یەو هونەرمەندێکی لێهاتووە. چونکە من لە کەشتییەکەدا ژوورێکی تایبەتم هەبوو کە پاش ئەوەی شەو داهات، هاتە ژورەکەمەوەو دانیشت. "میرنا" کچێکی جەستە بچوك دیاربوو کە خاوەنی لوتێکی بچوكو چاوێکی خۆڵەمێشی بوو. ئەو پێی گوتم ئەو گەنجەی کە لە گەڵیدایەو گۆرانی دەڵێ، برایەتی و گوتیشی کە پێشتر گەشتیان کردووە بۆ "یودە"و چوون بۆ"قودس"یش. لە قسەکانی "میرنا"دا بۆم دەرکەوت کە خۆی و براکەی"یۆنانی"ن و هونەرمەندی گەڕۆکن. میرنا دەیگوت لە قودس هۆڵێکی ڕۆشنبیری لێیە بەڵام هیچ ڕەونەقی نییەو ئەو جوولەکانەی کە دانیشتوی ئەو شوێنەن، ناچن بۆ هۆڵی ڕۆشنبیری و ڕقیان لە شانۆ و نمایش و هونەرەکانی ترە.

من لێم پرسی: ئێوە کە دەزانن جوولەکەکان ڕقیان لە شانۆ و هونەرمەندەکانە، ئەی بۆچی دەچن بۆ ئەوێ؟

وەڵامی دایەوە: من و براکەم بۆ گۆرانی گوتن ناچین بۆئەوێ، بەڵکو بۆئەوە دەچین تاوەکو لەوێوە بچین بۆ ئەو شارەی کە سەربازگەی (لژیون-هێزی) ژمارە دوانزەی "ڕۆمی" لێیەو، لەوێ گۆرانی دەڵێین. لەوێوە دەچین بۆ "تەبەرییە" کە ناوەندی فەرماندەیی فەرمانداری هەموو ناوچەی"بحرالجليل"ە[3] و لەوێ نمایش دەکەین و دواتر لەوانەیە بچین بۆ "قەیسەرییە".

---

[3] بحرالجليل، دەریاچەیەکە لە باکوری فەلەستیندا.

ئەو شەوە "میرنا" پێی گوتم: ئەوەی کە لەژیانی هونەرمەندیی ئێمەدا زیاتر کێشەمان بۆ دروست دەکات، بەدەستهێنانی پۆشاك و پێلاوە، چونکە بەهۆی پیشەکەمانەوە ناچارین پۆشاك و پێلاوی خۆمان بگۆڕین، ئەوەش خەرجییەکی زۆری دەوێ.

دواتر پێی گوتم: ئەگەر دوو سکەی زیوم[4] بدەیتێ تا بتوانم جوتێ پێلاوی پێ بکڕم، زۆر خۆشحاڵ دەبم.

من دەستم کرد بە گیرفانمدا و لەجیاتی دوو سکەی بچوك کە بەشی جوتێ پێلاوی دەکرد، دوو سکەی زیوی گەورەم پێدا کە دەیکردە نزیکەی پێنج درهەم.

کچە گەنجەکە سوپاسی کردو گوتی: ئەگەر کارێکت هەیە پێم بڵێ تا بۆت ئەنجام بدەم.

بەڵام "تولیا" من لەو کاتەدا تۆم بیرکەوتەوەو بەو کچە گەنجەم گوت کە هیچ داواکاریەکم نییە.

"میرنا" سەری سوڕمابوو لە وەڵامەکەی من و پرسی: ناوت چییە؟

گوتم: نازناوی من"مەزن تیوس"ە.

گوتی: دەزانم کەسەردەمی سەرکەوتنی من وەکو وەرزی گوڵی بەهار کورتەو دەبێ لەم وەرزە کورتەدا بیرێك لەخۆم بکەمەوە. هیوادارم دوای ئەوەی چوینە ناو "یودە" بتوانم لە یەکێ لە شارەکانی ئەو کەنارانە، وەکو شاری "یافە" یان شاری "قەیسەر" دوکانێك بکەمەوەو دوای ئەوەی سەردەمی هونەرمەندیم کۆتایی هات، لەو دوکانەدا بژێوی خۆم دابین بکەم. کاتێ کەشتییەکە چووە ناو "یافە" خۆرداچوو، لەبەرئەوەی زیاتر لەسێ ڕۆژمان نەمابو بۆجەژنی گەورەی جوولەکەکان، زیارەتکارە یەهوودییەکان بەبێ پشوودانو تەنانەت بێ ئەوەی بۆ نانخواردن تۆزێ ڕابوەستن، ڕێگەی سەفەریان گرتەبەر. من پاش ئەوەی لە کەشتییەکە هاتمە دەروە، ژورێکم گرت بەکرێ بۆئەوەی خۆم لە پیسیەکانی کەشتی و بەتایبەت لەو گیانەوەرە وردانەی کە لە لەشی ئەوانی ترەوە هاتبونە لەشی من، پاك بکەمەوە. یەکەمجار جلم کڕی و دواتر جلەکانی پێشترم فڕێ داو خۆم شۆردو جلی نوێم کردەبەرم. ئەو جلانەی کە لەناو کەشتییەکە لەبەرمدا

[4] سکەی زیو: پارەی ئەو کاتە بوو لەو ناوچانەدا.(و. کوردی)

بوو، سوتاندم، چونکە دەمزانی ئەگەر بیاندەم بە هەرکەسێ، ئەوا بەدەست ئەو گیانەوەرە وردانەوە گرفتار دەبێت.

"میرنا"و براکەی دەیانویست لەگەڵ من ژوور بگرن، بەتایبەت دەیانویست لەگەڵ من بێن بۆ"قودس" چونکە دەیانزانی من ڕۆمیم و خاکی "یودە" و "قودس"یش لەژێر دەسەلاتی داگیرکاری"ڕۆم"دان، بۆیە ئەگەر لەگەڵ من بوونایە، ئەوا لەبەرئەوەی من خەڵکی "ڕۆما"م، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەلایەن "ڕۆم"ەوە پشتگیریان لێ دەکرا. هەرچەندە من ڕقم لە "میرنا"و براکەی نەبوو، بەلام نەمویست لەگەڵ ئەواندا ژوور بگرم، بۆئەوەی ئەو شەوەی کە لە بەندەری "یافە" دەمێنینەوە، ئەم نامەیە تەواو بکەم و بۆتی بنێرم. ئەگەر لەگەڵ ئەواندا هاومەنزڵ بوومایە، ئەوا قسەیان لەگەڵم دەکردو منیش نەمدەتوانی ئەم نامەیە تەواو بکەم، هەروەها دەشمزانی کە کاتێ مرۆڤ بەتەنیا گەشت دەکات، خۆی ئازادە لە بڕیاردان و، کاتێکیش لەگەڵ کەسێکی تردا هاوسەفەر بێت، ئەوا پێویستە بیروبۆچوون و حەزی ئەویش لەبەرچاو بگرێت.

ئێستە کە من ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم، خەریکە دەبێت بەنیوەی شەو و بەنیازم دوای تەواوکردنی ئەم نامەیە، پشوو بدەم. بەیانی زوو دەچم بۆ بازاڕ و گوێدرێژێك و مەشکۆلەیەك بۆئاو و، تورەکەیەك دەکڕمو ئەوانەی کە هەمە وەکو شتومەکی نووسینی نامە، دەیانخەمە ناو تورەکەکەوەو مەشکۆلە ئاوەکەش دەبەستم بە بەشی دواوەی زینەکەوە بۆئەوەی هەرکاتێ تینووم بوو، ئاو بخۆمەوە. دواتر ڕێگەی "قودس"دەگرمەبەر.

من دەمتوانی سواری گوێدرێژ نەبم و لەسەر تەختی ڕەوان یان بەسواری گالیسکە کە چەند گایەك ڕایدەکێشێت، گەشت بکەم، بەلام کاتێك پێویست بە تەختی ڕوان یان گالیسکە(فایتۆن) دەکات کە کۆمەڵێك غولام لەگەڵ خۆمدا ببەم بۆ ئەوێ بۆئەوەی تەختەڕەوانەکە بگرن بە کۆڵیانەوەو هەڵم بگرن یان بۆئەوەی چاودێری گایەکان بکەن یانیش بۆئەوەی گالیسکەکە بخەمە ئەستۆ، بەلام من هەروەك بۆم نووسیویت، دەمەوێ تەنیا بم و ئەو تەنیاییە بە بەخشیشێك دەزانم کەنابێ لە دەستی بدەم. من لەوە ناترسم کە بەتەنیا بچم بۆ "قودس" چونکە لەم کاتانەدا زیارەتکارانی یەهوودی بە ڕۆژو شەو لە"یافە"وە بۆئەو شارە دەچن و، جادە قەڵەباڵغەو دزەکان ناتوانن هێرش بکەن. هەروەها سەربازی هێزی دوانزەی ڕۆم کە سەربازگەکەیان

له"یوده"یه بەردەوام چاودێری ڕێگاکان دەکەن و لەهەر شوێنێك سەربازی ڕۆمی لێبێت، لەو شوێنە ئاسایش بەرقەرارە.

"تولیا" تۆ ئەمساڵ نەهاتی بۆ میسر، بەڵام من ساڵی ئاینده وەکو ئەمساڵ، چاوەڕوانی هاتنی تۆ دەکەم بۆ "ئسکەندەریە" و هەموو ڕۆژێ دەچم بۆ ناوەندی بەندەر بۆئەوەی بزانم کەشتی هەڵگری تۆ، هاتووە یان نا.

ئەگەر ڕۆژێ هاتی بۆ"ئەسکەندەریە"و من لە ناوەندی بەندەر نەبوم، ناونیشانەکەم لە نووسینگەی ئەو صەڕافە وەربگرە کە من مامەڵەی لەگەڵ دەکەم، چونکە ئەو نووسینگەیە، ناونیشانی من دەزانێ و دەتوانێ بتگەیەنێتە لای من.

"تولیا"دەزانم کاتێ دەگەیتە ئەو بەشەی نامەکە کە تایبەتە بە سوڵتانی جیهان، بزە دەتگرێ و دەڵێی دووبارە ئەم "مەزن تیوس"ە دوچاری خەیاڵات بۆتەوە. من دان بەوەدا دەنێم کە کەسێکی خەیاڵاویم و کەمێکیش هەستیارم، بەڵام ئەگەر من خەیاڵاوی نەبوومایە و هەستم ناسك نەبوایە. تۆ منت خۆش نەدەویست.

"تولیا"، من هەست دەکەم کە خوداکان ئێمەیان بۆ یەکتر دروست کردووەو لە ئەزەلەوە من بۆئەوە دروست کراوم تا لەگەڵ تۆدا بژیم. ئایا تۆش هەست بەمە دەکەیت و دەزانی کە بۆئەوە دروست کراویت تا لەگەڵ مندا بژیت؟ ئەگەر هەست بەوە دەکەیت، ئەی بۆچی ئەمساڵ نەهاتی بۆ میسر بۆ لام؟

بەهەر حاڵ، من لە هاوینی داهاتوو چاوەڕێی تۆم و هیوادارم لەبیرت نەچمەوە. من ئەم نامەیە دەدەم بە نووسینگەی ناوەندی کەشتی بۆئەوەی بە کەشتی بگەڕێتەوە بۆ ڕۆما، بەڵام دەزانم کە بەچەند ڕۆژ دواکەوتن دەگاتە دەستت، چونکە تا جەژنی گەورەی جوولەکەکان تەواو نەبێ و زیارەتکارە یەهوودییەکان نەڕۆن بۆ شوێنی مەبەست و نەگەڕێنەوە، ئەو کەشتیانەی لەم بەندەرەدا لەنگەریان گرتووە، ناگەڕێنەوە بۆ ڕۆماو شوێنەکانی تر، چونکە چاوەڕوانی زیارەتکارە یەهوودییەکانن تا دەگەڕێنەوە.

# خاچی پیاوێکی ڕێکوپێک

"تولیا" ئەمە دووەمین نامەیە کە لەدوای ئەوەی گەشتم کرد بۆ"یودە"، لە شاری ئایینی و پیرۆزی جوولەکەکاندا کە قودسە، بۆم نووسیویت. کاتێ کەسێ گەشت دەکات و نامە بۆهاوڕێ و بەتایبەت خۆشەویستەکەی دەنووسێ، تەنیا مەبەستی ئەوە نییە لەحاڵی خۆی ئاگاداری بکاتەوە، بەڵکو دەیەوێ بەهۆی ئەو نامەوە دڵی خۆی ئاسوودە بکات و ئەوەی لە دڵیدا هەیە بیدرکێنێ. ئەو ڕووداوانەی کە لەدوای نووسینی نامەی یەکەم تا گەیشتن بە قودس بۆمن هاتۆتە پێش، دەیسەلمێنێ کە گەشتەکەی من بۆ ئێرە چارەنووسسازانە بووەو من نەمدەتوانی ئەم گەشتە نەکەم، بەڵکو دەبوو گەشت بکەم بۆئێرەو ئەو شتانە ببینم کە لێرەدا ڕوویداوە.

هەروەکو لە نامەی یەکەمدا پێم گوتی، من لە"یافە" گوێدرێژێك لەگەڵ تورەکەیەکی گەورە و کوندەیەکی بچوکی ئاو خواردنەوەم کڕی و پاشان بەڕێ کەوتم. ماوەی نێوان بەندەری "یافە"و شاری "قودس" زۆر نییەو ئەگەر سەربازێکی لەشکر کە بە هەنگاوی گەورە ڕاهاتووە، بڕوات بۆ ئەوێ، ئەوا بە دووڕۆژ ئەو ڕێگایە دەبڕێت. من لەبەرئەوەی لە وەرزی بەهاردا هاتم بۆ "یودە"، کاتێ لە "یافە" بەڕێکەوتم، درەختەکانی بادەم گوڵیان کردبوو، بەڵام کاتێ گەیشتمە "یودە" کە بە ڕۆژە کۆتایەکانی وەرزی گوڵی بادەم دەژمێردرا، بەدرێژایی ڕێگاکە، لەجیاتی گوڵی بادەم بەزۆری گوڵە دەشتیەکانی وەکو گوڵاڵە سورە دەبینرا.

سەر زەمینی "قودس" بەو شێوەیەی من بینیومە، وڵاتێکی جوانەو دیمەنی جۆراوجۆری تێدایە. ئاوو هەواکەشی لەوەرزی بەهاردا ئەوەندە خۆش بوو کە من هەندێ جار لەسەر گوێدرێژەکە دادەبەزیم و بەپێ بەڕێ دەکەوتم و لەوڕێگا پان و بەرینەدا چێژم لە بەپێ ڕۆیشتن وەردەگرت.

هەرچەندە من ڕۆمیم، بەڵام نەمدەتوانی پێشیان بکەوم و خۆم لەو گەشتیارانەی کە لەو ڕێگایەوە تێدەپەڕین و دەچوون بۆ قودس، خۆم بە لەپێشتر نیشان بدەم! و هەرچەندە جوولەکە نەبووم، بەڵام هەستی ڕەزامەندی بوونم بۆ ئەو سروودە ئایینیانە دەردەبڕی کەزیارەتکارە یەهوودییەکان لە ڕێگادا دەیانخوێند. کاتێ گروپێ لە

زیارەتکارەکان لەدواوە بەپەلە دەهاتن و دەیاویست زووتر خۆیان بگەیەننە"قودس"، من گوێدرێژەکەی خۆمم دەخستە سەرتەنیشتی ڕێگاکە تاوەکو ڕێگەیان لێ نەگرم و زیارەتکارە یەهوودییەکان تێپەڕ بن. من بەبێ ئەوەی ڕقم لە قسەکانی ئەو گەشتیارانە بێتەوە، حەزم نەدەکرد تەنانەت لە گەڵ بە توانا و دەوڵەمەندەکانیشیاندا گفتوگۆ بکەم، چونکە چێژم لە وتووێژکردن لەگەڵ ئەواندا وەرنەدەگرت. کاتێ کە گوێدرێژەکەم، گوێیەکانی خۆی قوت دەکردەوە و ڕووی وەردەگێڕا بۆ دواوە، لە چاوەکانیدا ئەوەی نیشاندەدا کە من دەناسێ، بۆیە منیش زیاتر چێژم لە سەیرکردنەکانی ئەو دەدیت وەك قسەکردن لەگەڵ بە تواناکان، هەروەها ڕۆژگاریشم بەخۆشی دەبردە سەر.

جلوبەرگی ئەو جولەکانەی کەبۆ زیارەتی"قودس" دەچوون، جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ جلوبەرگە ئاساییەکانی وەکو ئەو جلەی کە من لەبەرم کردبوو، نەبوو. جگەلەوەی کە جوولەکەکان زوناریان[5] دەبەست و بەهۆی ئەو پشتوێنەوە یەهوودییەك لەهەر خاڵێکی ئەم دنیایەدا بێت، یەهوودییەکی تر دەناسێتەوە. بەڵام ئەگەرچی من زونارم نەبوو، کاتێ لە میوانخانەکانی تەنیشت ڕێگاکە نزیك دەبووینەوە تاوەکو گوێدرێژەکە تێرئاو بکەم و منیش خواردنێك بخۆم، کەس گوێی پێ نەدەدام، واتە خوازیار نەبوون بزانن من یەهوودیم یان نا، چونکە ئەو ڕێگایەی کە لە "یافە"وە دەچێت بۆ قودس. ڕۆمییەکان فراوان و ڕێکیان کردووەو شۆستەیان بۆ کردووە کە ئەمڕۆ یەکێکە لەباشترین ڕێگاکانی ڕۆم و یەکێکە لە شاڕێگا دێرینەکانی جیهان. هەروەها لەو ڕۆژەوەی کەمرۆڤ بەبیری دێت هۆزگەلێکی جۆراوجۆر بەم ڕێگایەدا تێپەڕیون، بۆیە هیچ جوولەکەیەك سەرسام نابێ بەوەی کەسێکی نایەهوودی بەسەر گوێدرێژێکەوە بەو ڕێگایەدا تێپەڕ ببێ.

"تولیا" لە وانەیە تۆ بزانی خەڵکی"یودە" هەموویان جوولەکەن و خاوەنی ئەو میوانخانانەی کە من تیایاندا دەمامەوە و تەنانەت خزمەتکارەکانیشیان، جوولەکەن. ئەو شوان و وەرزێرانەی کە لە ئەملاولای ڕێگاکەدا دەردەکەوتن، ئایینی جوولەکەیان هەبوو، بەڵام بۆ یەکجاریش ڕێ نەکەوتوە کەسێ لێم بپرسێ ((تۆ کە جوولەکە نیت بۆچی دەچی بۆ قودس؟)) جگە لەمن، بێگانەی تریش واتە نایەهوودی لەوێ دەبینران و کەسیش لێیان نەدەپرسین بۆ کوێ دەچن. دەبێ بڵێم جەژنی گەورەی یەهوودییەکان

---

[5] زنار یان زونار: پشتوێنێکە کە جوولەکەکان لە خۆیانی دەبەستن و بەوەش لە شوێنانی تر دەناسرێنەوە. (و. کوردی)

که زیارەتکارە یەهوودییەکانیش بەو مەبەستە دەچوون بۆ"قودس"، جەژنی ڕزگاربوونە لە میسر کەبە ڕابەرایەتی پێغەمبەرەکەیان "حەزرەتی موسا" ئەو سەرکەوتنەیان بەدەست هێنابوو، بۆیە هەموو ساڵێ لەوڕۆژەدا جوولەکەکان چوونە دەرەوەیان لەمیسر دەکەن بەجەژن و مەراسیمی ئایینی ساز دەکەن. ئەگەر من پەلەم بکردایە، دەمتوانی شەوی دووەم، دوای دەست پێ کردنی گەشتەکەم خۆم بگەیەنمە "قودس". بەڵام من وەکو جوولەکەکان پەلەم نەبوو و وام بەباشتر دەزانی بەهێواشی بەردەوام بم لە ڕۆیشتن و سەیری دیمەنە سروستییەکان بکەم و ئەو هەوا خۆشەی فەلەستین هەڵمژم. پاش ئەوەی ماوەیەك لە ئەسکەندەریە ژیام و خواردنی شتی گرانبەهای ئەو شارە گەدەمی ماندوو کردبوو، چێژم لەو ژییانە سادەیە وەردەگرت و هەستم دەکرد یەك نانی وشك بەلامەوە بەتامترە لەوخواردنە چەورو بۆنخۆشانەی کە لە ئەسکەندەریە دروست دەکرێن. لەبەرئەوەی مەشکۆلەی پڕ لەئاوم لەگەڵ خۆم هێنابوو، ئاوی کانییەکانم دەخواردەوە. من بیستبوم کە گەشتیارێك بڕۆشتایە بۆ قودس، دەبوو دیمەنی ئەو شارە لەڕۆژدا ببینێ تاکو لەبەر ڕۆشنایی خۆردا چاوی بە گەورەیی و جوانیی پەرستگای جوولەکەکان بکەوێت، بۆیە پێش ئەوەی بگەمە قودس، خێرایی ڕۆیشتنی گوێدرێژەکەم کەم کردەوەو نزیکی خۆر داچوون دەنگی "نەی"ی شوانێکم بەرگوێ کەوت.

شوانکارەکەم بینی کە مەڕەکانی خۆی لەسەر گردێك کۆکردۆتەوەو نەی لێ دەدات. چووم بەرەو ڕووی و لەبەرئەوەی لەسەردەمی دەرس خوێندنمدا فێری زمانی "ئارامی" ببووم، توانیم لەگەڵ ئەو شوانکارە یەهوودییەدا قسە بکەم. دوای ئەوەی تۆزێ ڕێگام بڕی، بایەك هەڵی کردو ئەوەندە تەپوتۆز بە ئاسماندا بڵاوبوویەوە کەڕەنگی خۆر بەسور هەڵگەڕا. من کە سەنگین و ماندوو ببووم، بەو بایەی کە ڕۆژی ڕۆشنی تاریك کردبوو زیاتر ماندوو بووم، تاکو گەیشتمە شوێنێك کە شارم لێوە دیاربوو، یەکەم بینا کە بەرچاوم کەوت کۆشکی"هیرود"[6] بوو. دواتر بینایەی تەماشاخانە و بینایەی"سێرك" و ئینجا پەرستگای سپی و زێڕینی یەهوودییەکانی ئەو شارەم بەستونی جیاواز و بڵندیی جۆراوجۆر بینی. بەڵام ئەو بینا گەورانە، لەو

[6] (هیرود) پادشای فەلەستین بوو و بەشێك لە بینا مێژووییەکانی قودس بینایەی ئەون و دوای ئەو چەندین کەس لە جێنشینەکانی بە ناوی هیرود فەرمانڕەواییان کردووە.(و.کوردی).

هەوا تەپوتۆزاوی و نیوەتاریکەدا، بەو شێوەیەی کەچاوەڕێم دەکرد، خۆی نەنواند، چونکە هەوا نیوەتاریك بوو منیش کەمێك ماندوو بووم. بەم حاڵەشەوە کەوتمە ژێر کاریگەری جوانی و گەرەیی بیناکەو باوەڕم بەوەکرد کە بینایەی پەرستگاکە لەگەورەترین شاکارەکانی بیناسازیە. ئەو شوێنەی کەمن تێیدا ڕاوەستابووم و تەماشای بیناکانی شارم لێوەدەکرد، شوێنێکی بەرز بوو، هەواش کە تەپوتۆزی بیابانی دەکردە چاوەکانم نەیدەهێشت دیمەنی شار بە جوانی ببینم. گوێدرێژەکەم سەری وەگێڕاو سەیری منی دەکرد و بەزمانی حاڵ تێی دەگەیاندم کە لەوەزیاتر ڕاوەستان ڕەوا نییەو دەبێ بڕۆین. من هەردوو پێی خۆم ڕاوەشاندو گوێدرێژەکەم بەڕێ کەوت. ئینجا گەشتمە خاڵێك کە ڕێگای "یافە"ی -ئەو ڕێگایەی کە من لێوەی هاتبوم- لەگەڵ ڕێگایەکی تر بەیەك دەگەیاند کەلە"قەیسەر"ەوە دەهات و، ئیتر پاش ئەوە ڕێگاکە زیاتر فراوان دەبوو و، وردە وردە دەبوو بە شاڕێگەیەکی ڕاستەقینەی ڕۆمی.

منیش لەسەر هێڵی ڕێڕەوی کۆمەڵەکە دەڕۆیشتم و بەرەوڕووی شارەکە دەچووم تاوەکو لە دەروازەی شار نزیك بوومەوە. لەوێ کۆمەڵێ خەڵکم بینی کە کۆبوونەتەوەو دەتگوت سەیری شتێك دەکەن و سەیرم کرد هەندیك لە جوولەکەکان چمکی کراسەکەیان داوەتەوە بە ڕوخساریاندا.

جوولەکەکان نەریتیان وایە کەکاتێ نایانەوێ شتێك بینن، واتە ڕقیان لێیەتی یان لێی دەترسن، ئەوا چمکی کراسەکەیان دەدەنەوە بە ڕوخسارییانداو چاویان دادەپۆشن. کاتێ بینیم چەند جوولەکەیەك داوێنی جلەکانیان داوەتەوە بەڕوخسارییاندا، ویستم بزانم هۆکاری گردبوونەوەی خەڵکەکە لە دەروازەی شاردا چیە. هەوا هەر بەوشێوەیە نیوەتاریك و تەپوتۆزاوی بوو بەردەوام شەپۆلی دەدا. من لەو کۆمەلە خەڵکە نزیك بوومەوەو ئینجا زانیم ئەوەی بۆتە هۆی گردبوونەوەی خەڵکەکە، سێ خاچە کە لەسەر گردێکی نزم چەقێنرابوون. لەنزیکی دەروازەی شاردا سێ خاچیان چەقاندبوو و سێ لەخاچدراویش لەسەر خاچەکان دەبینران. دوای ئەوە، ڕێگاکە بەجۆرێك پڕببوو لەبینەر کە نەمدەتوانی تێپەڕ ببم و بڕۆم بۆ ناوشارەکە، بۆیە ڕاوەستام تاوەکو لە خاچدراوەکانیش ببینم.

بینینی لە خاچدراوێك بۆمن، شتێکی بێ ئەزموون نەبوو، چونکە لە ڕۆمیشدا دەمبینی -ڕۆمییەکان نەبێ- کە تۆمەتبارو خولامەکانیان لەخاچ دەدا. سەیرکردنی

پیاوێکی لەخاچدراو بەپێچەوانەی دیمەنەکانی سێرك، بزوێنەر نییەو مرۆڤ ڕاناچڵەکێنێ. سزادان بەخاچ، سزادانێکی دێرینەو بە بۆچوونی من وەحشیانەیە. ئەم سزایەیان بۆئەوە داناوە تا تۆمەتبار بەیەکجاری نەمرێت بەڵکو بەدرەنگی و سەختی گیان لەدەست بدات. من خۆشحاڵم کەخاوەنی ناسنامەی ڕۆمیم، چونکە کەسێك کە خاوەنی ناسنامەی ڕۆم بێت، لەخاچ نادرێ و ئەگەر تووشی تاوانێك بوو، ئەوا بە لێدانی یەك شمشێر، سەری لەلاشە جیادەکەنەوە. سزادانی بەخاچ، تایبەتە بەو غوڵام و تاوانبارانەی کە خاوەنی ناسنامەی ڕۆم نین. کاتێك لە دوورەوە لەخاچ دراوەکانم بینی، وامدەزانی تاوانبارن و پیاویان کوشتووە یانیش دزییان کردووە. بەڵام کاتێك نزیك بوومەوە، بۆم دەرکەوت کە لەخاچ دراوەکان تاوانباری ئاسایی نین، چونکە کۆمەڵێك لە سەربازانی هێزی دوانزەی ڕۆم، لەبن خاچەکاندا دانیشتوون و خەریکی گەمەکردن بوون و بەقەڵغان شەراویان دەخواردەوەو کەمێك دوورتر ئەفسەرێکی ڕۆمی کە پلەی (سەنتوریون)ی هەبوو، پاسەوانی دەکرد. قەت نەبووە بۆ لەخاچ دانی تاوانبارە ئاساییەکان، پێویست بەو ئامادە بوونە بکات و ئەفسەرێك و کۆمەڵێك سەرباز لەبنی خاچەکاندا چاوەڕێ بکەن. من سەیرێکی تری لە خاچدراوەکانم کردو بینیم کە تەختەیەکیان لەڕووی سەرەوەی ئەو لەخاچدراوەی کە لە ناوەڕستدا بوو، هەڵواسیوە. لەسەر تەختەکە دەستەواژەی "عیسا" نووسرابوو. کاتێ چاوم بەم دەستەواژەیە کەوت، موچڕکەم پێداهات و چاوەکانم کردەوە بۆئەوەی لەخاچدراوی ناوەڕاست باشتر بناسم. بینیم کە ئەو پیاوێکی گەنجەو تاجێکی دڕکاوییان کردۆتە سەری و دڕکەکان سەریان بریندار کردووەو جۆگەلەی بچوکی خوێن بە سەریدا هاتۆتە خوارەوە و ڕوخساری خوێناوڵ کردووە.

من پاش بینینی شکڵی ئەو پیاوە، بەشێوەیەك تێك چووم کەدنیام لەلا تاریك بوو. ئەگەرچی هێشتا نیوەڕۆ بوو بەڵام دنیام بەتاریکی دەبینی. دەنگێك لەو خەڵکەوە نەدەهات کە بۆبینینی لەخاچدراوەکان کۆببوونەوە. من دەنگی باڵندەکانیشم نەدەبیست و لەبەرئەوەی دنیام بەتاریکی دەبینی، وامدەزانی خۆر گیراوە، چونکە کاتێ خۆر دەگیرێ، دنیا تاریك دەبێ و باڵندەکان دەنگیان لێوە نایەت.

خەڵکەکە ئەوەندە بێدەنگ بوون کە گوێم لەدەنگی کەوتنی قەڵغانی سەربازەکان بوو تەنانەت دەنگی هەناسەدانی ئەفسەرە ڕۆمییەکەشم دەبیست. لەخاچدراوی

ناوەڕاست پیاوێکی بەژن باریك بوو، شکڵێکی ڕێکوپێکی هەبوو بەڵام غەمگین، هەستم دەکرد ئەو پیاوە لە دوو لەخاچدراوەکەی تر زیاتر بەهۆی ئەو سزایەوە ئازار دەچێژێ. ئەو دوو لەخاچدراوەی تر پیاوێکی بەهێزن و بە شکڵیاندا دیاربوو هاوڵاتی سادەبن، بەڵام شکڵی لەخاچدراوی ناوگین وادەردەکەوت هاوڵاتی پلەنایاب بێت. لەشکڵی دوو لەخاچدراوەکەی تر شوێنەواری ڕق و کینە بەدی دەکرا. بەڵام شکڵی لەخاچدراوی ناوگین گوزارشتی لە خۆشی ژیانی ڕۆح و ستەم لێکراوی دەکرد.

من سەرنجی پەشۆکاویی ئەو پیاوەم دەدا کە بەخاچەکەوە بوو و سەیرم دەکرد توندیی ئازارەکەی بێقەراری کردووە وهەر هەڵدەسوڕێ و ناتوانێ بۆ ساتێك ئارام بگرێ.

دواتر ژمارەیەك لەجوولەکەکان، کە زوناری گرانبەهایان لەخۆیان بەستبوو، دەرکەوتن و لە سەروسەکوتیاندا بۆم دەرکەوت کە لەکەسە زاناو دیارەکانی شارن. ئەوان کە زانییان خەڵکەکە بێدەنگن، بڕیاریاندا ئەو بێدەنگیە بشکێنن، چونکە دەیانزانی ئەگەر ئەو بێدەنگیە بەردەوام بێت ڕەنگە زیانیان لێ بدات. ئەوەبوو بەدەنگی بەرز لەخاچدراوی ناوەڕاستیان دایەبەر قسەو گوتیان: ئەی عیسا، لەسەر خاچەکە وەرە خوارەوە و لەسەر تەختی پادشایی دابنیشە! ئەوان جگە لەوەی عیسایان دابووە بەر قسەو تانەوتەشەر، ڕووشیان دەکردە خەڵکەکە بۆئەوەی ئەوانیش هان بدەن سەرزەنشتی عیسا بکەن و گاڵتەی پێ بکەن، بەڵام تەنیا ژمارەیەك لە ئامادەبووان زمانی گاڵتەپێ کردنیان بەکارهێنا و ئەوانی تر هەر بەبێدەنگی مانەوە.

زۆربەی ئامادەبووان بە جلەکانیاندا دیاربوو کە هەژارن و بۆم دەرکەوت کە هەندێکیان خەڵکی لادێن و بەبۆنەی جەژنی گەورەی یەهوودییەکان هاتون بۆ ئێرە. هەروەها بە شکڵ و شێوەیاندا بۆم دەرکەوت کە هاوخەمی عیسان و حەزیان دەکرد یارمەتی بدەن، بەڵام نەیاندەوێرا هەستی خۆیان لە بەرامبەر گەورەبەرپرسانی جوولەکە و سەربازە ڕۆمییەکاندا دەربڕن.

عیسا کاتێ گوێی لە تانەوتەشەری جوولەکەکان بوو، چاوەکانی کردەوە و کەمێك خۆی لەسەر هەردوو قاچی کە بەمێخ داکوترابوون بەخاچەکەوە، ڕاست کردەوە. بۆم دەرکەوت ئەو پیاوەیان بەخراپترین شێوە بەخاچەکەدا داکوتاوە وەك لەکەسێکی تر. هەردوو دەستی بە مێخ داکوترابوون بەخاچەکەوە و پێیەکانیشی داکوترابوون

بەخاچەکەوە و هیچ ئەندامێکی سەرەکی لاشەی مێخی لێ نەدرابوو، بۆیە دوچاری سەرەمەرگێکی دووروودرێژ ببوو و زۆری پێدەچو تاکو گیانی لەدەست بدات.

کاتێ ئەو پیاوە چاوەکانی کردەوە، کەمێك خۆی ڕاست کردەوەو هەناسەیەکی قوڵی هڵکێشا و سەری وەرگێڕا بەلای ڕاست و چەپیدا وەکو ئەوەی بەشوێن کەسێك یان شتێکدا بگەڕێ، بەڵام لە یەك دووجار زیاتر نەیتوانی سەری بەلای ڕاست و چەپدا بگێڕێ، چونکە ئەوەندە ئازاری دەچێژا کە تەنانەت نەیدەتوانی بۆماوەیەکی زۆر ئاگای لە دەوروبەری خۆی بێت. وەکو گوتم دوو لەخاچدراوەکەی تر وەکو دوو پیاوی بەهێز دەهاتنە بەرچاوم بۆیە یان ئازاریان نەدەچێژا یانیش ئەوەندە بەتوانا بوون کە خۆیان بە داماو و خەمگین نیشان نەدەدا.

ئەو پیاوەی کە لای چەپدا لە خاچدرابوو، دوای ئەوەی بەچاو و ئەبرۆ گاڵتەی بە خەڵکەکە کرد، ڕووی کردە لەخاچدراوی ناوەڕاست و گوتی: تۆ کە هەڵبژێردراوی خودای، بۆچی خۆت ڕزگار ناکەیت و ئێمە ئازاد ناکەیت؟ بەڵام ئەو پیاوەی کە لەلای ڕاستی عیسادا لەخاچ درابوو، بۆپشتگیری عیسا هاتە قسەو بەپیاوەکەی گوت: ئێمە کە لەخاچ دراوین پێویستە سزا بدرێین چونکە کوشتارمان کردووە، بەڵام ئەم پیاوە بێتاوانە و بەبێ هۆ لەخاچیان داوە.

عیسا کاتێ وتەکانی ئەوپیاوەی بیست، بەسەر ئاماژەیەکی بۆ کردو گوتی: خەیاڵت ئاسوودەبێت! تۆ لەگەڵ مندا دێیتە ناو باخەکە.

من نەمزانی پیاوە هێمنەکە مەبەستی لە (باخەکە) چییە، بۆیە حەزم دەکرد واتای ئەو وشەیە لە کەسێك بپرسم. لەوکاتەدا چاوم بەپیاوێ کەوت کە بەڕوخسار و جلەکانیدا دیاربوو مامۆستایە و چووم بۆلای و گوتم: ئەوپیاوە چی دەڵێ و مەبەستی لە باخەکە چیە؟ ئایا ئەوپیاوە بێ تاوانە؟ ئەگەر وایە بۆچی لەخاچدراوە؟

مامۆستاکە پێکەنی و گوتی: دیارە تۆ بێگانەیت و تازە هاتوویتە ناو ئەم شارەوە بۆیە بڕوات بە وتەی دەستبڕێك کردووە کە ئێستە بەخاچەوەیە. ئەم پیاوە بەفەرمانی ئەنجومەنی باڵای ئێمەو ڕەزامەندی فەرمانڕەوای ڕۆم لەم وڵاتەدا، حوکم دراوە تا بەخاچدا هەڵبواسرێت، ئەو گەورەی ئێمە نییەو کەسیش ئەوی بە سەرکردە هەڵنەبژاردووە، بەڵام ئەو خۆی بەسەروەری ئێمە دەزانێ و هەمیشە کوفر دەکات و

تەنانەت ئێستەش کە بەخاچەوەیە دەست لە کوفرکردن هەڵناگرێت و هەروەك گوێم لێی بوو ناوی باخ دێنێت.

دوای ئەم وتانە، ئەوماموٚستایە چمکی کراسەکەی لەخوٚی ئالاٚند بوٚئەوەی نەوەکا زونارەکەی لەلەشم بکەویٚ، گوایە منی بەگلاٚو دەزانی. من لە ڕەفتارەی ئەو یەهوودییە بێزار ببووم، گوتم: من حەزدەکەم لەبارەی ئەم پیاوەی کە لەخاچ دراوە، بەدواداچونێك بکەم و بزانم ئایا ئەو تاوانبارە یان نا؟

ماموٚستا یەهوودییەکە سەیرێکی منی کرد و گوتی: ئاگات لەخوٚت بیٚ، چونکە ئەوەی کە دەیبلێیت بەگران لەسەرت دەوەستیٚ، من هەست دەکەم توٚ بیانیت و لە لایەنگرانی ئەم پیاوە نیت. ئەم پیاوە نەیتوانیوە لەم شارەشدا ژمارەیەکی زوٚر بکات بە لایەنگری خوٚی. توٚ هەرکاتیٚ بتەویٚ بەزەیی بوٚ بنوێنی، بەگران لەسەرت تەواو دەبیٚ.

کاتیٚ ئەم قسەیەم لەو پیاوە بیست، بوٚئەوەی بزانیٚ کە لەهەڕەشەکانی ناترسم، بەرەوڕووی سەنتوریون کەئەفسەرێکی ڕوٚمی بوو، ڕوٚشتم و بەزمانی ڕوٚمی پێم گوت: من کەسێکی ڕوٚمیم، بەلاٚم ئەو پیاوە یەهوودییە (ئاماژە بەماموٚستاکە) هەڕەشەم لیٚ دەکات. کاتیٚ ئەفسەرە ڕوٚمییەکە زانی من ڕوٚمیم، سەرسام بوو، چونکە چاوەڕێی نەدەکرد یەکیٚ لە ڕوٚمییەکان بەو جلانەوە ببینیٚ کە من لەبەرم کردبوو، ئینجا بەزمانی ڕوٚمی پێی گوتم: هاوڕێکەم، ئەگەر توٚ خەڵکی ڕوٚمی، نابیٚ لەم کاتەدا کە شەممە نزیك دەبێتەوە لەگەڵ جوولەکەیەکدا دەمەقاڵیٚ بکەیت چ بگات بەشەڕکردن، چونکە ئاستی ڕوٚمییەك لەوە بەرزترە کە دەمەقاڵیٚ لەگەڵ جوولەکەیەکدا بکات.

دوای ئەم قسەیە، ئەفسەرە ڕوٚمییەکە ڕووی کردە خەڵکەکەو بەدەنگی بەرزو بەزمانی ناوچەکە گوتی: ئەوەندەی کە چاوەڕێتان کرد بەسە. لەمە زیاتر چاوەڕیٚ مەکەن، چونکە هیچ موٚجیزەیەك ڕوونادات و سەروەرو پێشەواکەتان لە خاچەکە نایەتە خوارەوە. بڕوٚنەوە بوٚ ماڵەکانی خوٚتان و گوٚشتاوی مەڕەکانی خوٚتان بخوٚنەوە و زگتان تێر بکەن. من بە قسەکانی ئەم ئەفسەرەدا زانیم کە هەندیٚ لەو جولەکانەی کوٚبوونەتەوە وایاندەزانی لەوانەیە عیسا لەسەر خاچەکە بێتە خوارەوە و بچێت بوٚ ناویان. بەلاٚم هیچ کەسیٚ نەبوو هوٚکاری ئەم ڕوداوە بوٚمن ڕوون بکاتەوەو تێمبگەیەنیٚ کە جوولەکەکان چاوەڕێی موٚجیزە دەکەن.

ژمارەیەکی زۆر لە ئامادەبووەکان دوای ئەوەی فەرمانی ئەفسەرە ڕۆمییەکەیان بیست، کەوتنەڕێ و ڕۆشتن. پاشان سەنتوریون لە من نزیك بوویەوە و پێی گوتم: لەبەرئەوەی تۆ ڕۆمیت، بۆیە دەعوەتت دەکەم، ئێستەش لەگەڵم وەرە بابڕۆین و قومێ شەراب بخۆینەوە. دواتر ئاماژەیەکی بۆ عیسا کردو ئاشکرای کرد: لەخاچدانی ئەم پیاوە پەیوەندی بەئێمەی ڕۆمییەکانەوە نییەو من وەکو ئەرکی پاسەوانی لێرە ئامادە بووم. نەریتی یەهوودییەکان وایە کە پێغەمبەرەکانی خۆیان دەکوژن. ئەم پیاوەش پێغەمبەری ئەوان بووە و بەم شێوەیە لەخاچیان داوە، بەڵام داوای یارمەتیان لە ئێمەی ڕۆمی کرد. ئێمەش بۆئەوەی جوولەکەکان لەخۆمان ڕازی بکەین بۆیە یارمەتیمان دان.

دواتر منی – کە لەبەرامبەر خاچەکاندا بووم- برد بۆ بن خاچەکان و بینیم جلەکانی هەرسێ پیاوە لەخاچدراوەکە لەوێدا کەوتووە. سەنتوریون مەشکۆلەیەك ئاوی لەیەکێ لەسەربازەکان وەرگرت و دای بەدەستی منەوە تاوەکو ئاو بخۆمەوە. پاشان گوتی: یەکێك لەکارە ماندووکەرەکان، پاسەوانی کردنە لەخاچەکان. خۆشبەختانە ئەمشەو ئەرکی پاسەوانیی من لێرەدا تەواو دەبێت و دەڕۆم، چونکە شەممە نزیك بۆتەوەو جوولەکەکانیش لەڕۆژی شەممەدا تەرمی لەخاچدراو لەسەر خاچ ناهێڵنەوە. پاشان بەردەوام بوو: لەوکاتەوەی من هاتوم بۆ ئێرە، ئەم شارە وەکو هێلانەیەکی پڕ لە ئەژدیها دەبینم و ئەژدیهاش هەرگیز باش نابێت مەگەر بە مردوویی، یەهوودیش دوای ئەوەی کە گیانی سپارد باش دەبێ. کەواتە لەخاچدانی دوو سێ جوولەکە بۆمن گرنگ نییە، بەڵام ئەم پیاوە (ئاماژە بە عیسا) بێتاوانە.

هەروا بەو شێوەیە هەوا نیوەتاریك بوو، هەروەها بەهۆی گەرماوە مرۆڤ نەیدەتوانی بە ئاسانی هەناسە بدات. ئەفسەری ڕۆمی سەری بەرز کردەو سەیرێکی ئاسمانی کردو گوتی: ئەم تاریکیە بەهۆی هەوای تۆزاوییەوەیە و هەندێ جار لێرە هەڵدەکات‌و بەتەواوی بەر لەتیشکی خۆر دەگرێت، بەڵام من هەرگیز بەم شێوەیە نەمبینیوە کە تەپوتۆز ئەوەندە لەهەوا بڵاو بێتەوە و بەم شێوەیە دنیا تاریك بکات. ئەگەر من جوولەکە بوومایە، وامدەزانی هەتاو لە پشتی پەردەوە خۆی شاردۆتەوە بۆئەوەی مەرگی عیسای مەسیح نەبینێت و، ئاسمان بەهۆی مەرگی ئەوەوە پرسە دەگێڕێت.

کاتیٚ ئەفسەرە ڕۆمییەکە قسەی لەگەڵ دەکردم، لە جلەکانم ورد دەبوویەوە و سەیری شکڵ و شێوەی دەکردم. من دەمزانی مەبەستی لەم سەرنجدانەی جلەکانم ئەوەیە تا بزانیٚ من ئیشم چییە و لەکام چین و توێژەی کۆمەڵگادام. جارێکی تریش ئەفسەرە ڕۆمییەکە سەیری ئاسمانی نیوەتاریکی کردو گوتی: ئەمڕۆ ئەم ئاسمانە تاریکە گیانەوەرەکانی زۆر ترساندووەو سەگەکان خزاونەتە گۆشەیەك و جوڵە ناکەن و هەندیٚ جار نوزەیەك دەکەن و وشترەکانیش لە دەروازەی شار ناچنە دەرەوە. ئەمڕۆ ڕۆژێکی ناخۆشە بۆ ئەم شارە.

من گوتم: ئەمڕۆ نەك تەنیا ڕۆژێکی ناخۆشە بەڵکو بۆ هەموو جیهان ڕۆژێکی ناخۆشە، چونکە پیاوێکی بیٚ تاوان لەخاچ دراوە.

ئەفسەرە ڕۆمییەکە بڕێك سەیری کردم و منیش هەستم کرد تێنەگەیشتووە چیم گوتووە. منیش نەمدەتوانی مەبەستەکەی خۆمی تێبگەیەنم، چونکە سەنتوریون وەکو من توانای بیرکردنەوەی نەبوو بۆ تێگەیشتن لە واتای بێتاوانیی عیسا. بۆیە گوتی: من نازانم بۆچی گوتت کە ئەمڕۆ بۆهەموو جیهان ڕۆژێکی ناخۆشە، بەڵام کوشتنی ئەم پیاوە پەیوەندی بە خودی جوولەکەکانەوە هەیە و ئێمەی ڕۆمی بەرپرس نین لە کوشتنی و فەرمانداری گشتی "یودە" نەیدەویست بیکوژێت و گوتی کە ڕەنگە دووری بخەنەوە، بەڵام نەیدەویست بکوژرێت، کەچی ئەنجومەنی باڵای جوولەکەکان دەیگوت دەبیٚ ئەم پیاوە لەخاچ بدریٚ. ئەنجومەنی باڵای جوولەکەکان هەڕەشەی لە فەرمانداری گشتی"یودە" کردو پێی گوت ئەگەر ئەم پیاوە لەخاچ نەدەیت، ئەوا لەلای (قەیسەر) شکایەت دەکەین و دەڵێین فەرمانداری ڕۆم پیاوێکی عەوامی فێڵباز و ئاژاوەگێڕ کە بەردەوام کوفر دەکات، بە ئازادی دەهێڵێتەوە بۆئەوەی چی لەدەست دیٚ بیکات. کاتیٚ فەرمانداری گشتی"یودە"یان ناچار کرد ڕەزامەندی دەربڕێت بۆ لەخاچدانی عیسا، داوای قاپیٚ ئاوی پیرۆزی کردو دەستەکانی لەناو ئەو قاپەدا شۆرد بۆئەوەی بزانریٚ کە بەخوێنی ئەم پیاوە سور نەبووە، بەڵام ئەو جوولەکانەی کە ئەندامی ئەنجومەنی باڵا بوون، گوتیان ((کاتیٚ خوێنی ئەم پیاوە برژیٚ، ئێمە بە خوێنەکەی دەستی ڕەنگ دەکەین)) من لە ئەفسەرە ڕۆمییەکەم پرسی: فەرمانداری گشتی کێیە؟

ئەفسەرە ڕۆمییەکە بە سەرسامییەوە پرسی: چۆن تۆ ناوی فەرمانداری گشتیت نەبیستووە؟

گوتم: من لە ئەسکەندەریەوە دێم و لەوێ خەریکی خوێندنەوەی کتێب بووم لە کتێبخانە، بۆیە ناوی فەرمانداری گشتی نازانم.

ئەفسەرە ڕۆمییەکە گوتی: ناوی"پونتوس پیلات"ە.

کاتێ ئەم ناوەم لە ئەفسەرە ڕۆمییەکە پرسی، بەهۆی سەرسامیەکی زۆرەوە هاوارم کردو گوتم: من ئەو دەناسم. ئایا ژنەکەی ناوی " کلودیا" نییە؟

ئەوەی کە بە ئەفسەرە ڕۆمییەکەم گوت ڕاست بوو، منْ "پونتوس پیلات"م دەناسی و لەگەڵ ژنەکەیدا هاوڕێ بووم. لەبیرم ناچێت کە ڕۆژێ لە ڕۆما میوانیان بووم و، ئەگەرچی ئەو ژنەی "پونتوس پیلات" لەڕووی تەمەنەوە لەمن گەورەتر بوو، بەڵام چێژم لەقسەکانی وەرگرت. ئەو ڕۆژە"کلودیا" کتێبێکی پێ نیشان دام کە پەیوەندی بەو کارە گەورانەی باب و باپیرانییەوە هەبوو کە لەئاسیادا بۆ سوودی ڕۆمییەکان ئەنجامیان دابوو. ئەو ڕۆژەی من لەماڵی"پونتوس پیلات" میوان بووم، میوانەکان ئەوەندەیان خواردو خواردیانەوە کە هەندێکیان چوون بۆ ژووری"ڤۆمیتۆریۆم"[7]. کاتێ میوانی تەواو ببوو، دەمویست لەو ماڵە بچمەدەرەوە، "کلودیا" بەڵێنی پێدام دووبارە یەکتر ببینین، بەڵام ئیتر مەجالێك نەبوو بۆ نوێ کردنەوەی دیدار، بۆیە نەمتوانی بیبینمەوە.

ئەوەندە خەیاڵی"کلودیا" زاڵ بوو بەسەرمدا کە لەبیرم چوبوو لەکوێم و سەیری چی دەکەم، بەڵام ئەفسەرە ڕۆمییەکە سەرنجی منی بۆ کات و شوێن ڕاکێشا و گوتی: ئەگەر بەڕاستی تۆ ڕۆمیت و یەکێ لە ناسراوەکانی فەرمانداری گشتی "یودە"یت، پێت دەڵێم کە لەڕۆژەکانی جەژنی جوولەکەکاندا هەوڵ بدە لەناو ڕۆمییەکاندا بیت و دوور بگرە لە جوولەکەکان، چونکە یەهوودییەکان لە جەژنە گەورەکاندا زوو توڕە دەبن و لەوانەیە ڕووداوێکی بچوك هانیان بدات بۆ پیاوکوشتن. بۆیە فەرمنداری گشتی لەم شارەدا لە کۆشکی پاشایەتیدا دەمێنێتەوە و، بۆئەوە هاتووە بۆئەم شارە تاکو ئەگەر لە ڕۆژانی جەژندا شتێ ڕوو بدات، ئەم بتوانێ بەپەلە پێش لە ڕووداوەکە بگرێ و نەهێڵێ تەشەنە بکات و ڕووداوەکە گەورەتر بێت. هەروەها لەبەرئەوەی یەهوودییەکان بەئامانجی خۆیان گەیشتن و عیسایان لەخاچ دا، بۆیە تۆ دەبێ پارێز بکەیت، چونکە سەرهەڵدانی توڕەیی جوولەکەکان لەناکاوەو ناتوانرێ پێشبینی بکرێت.

---

[7] ڤۆمیتۆریۆم بە زمانی ڕۆمی، واتە ئەو ژوورەی کە تیایدا دەڕشێنەوە. ڕۆمییە دێرینەکان لە میوانخانە ئەوەندە نانیان دەخوارد و شەرابیان دەخواردەوە کە دوچاری ڕشانەوە دەبوون و ناچار دەبوون بچن بۆ "ڤۆمیتۆریۆم" تا لەوێ بڕشێنەوە.

# تاریکی هەوا و بوومەلەرزەی زەوی

ئەفسەرە ڕۆمییەکە چەند هەنگاوێکی هاویشت و لە خاچەکان نزیك کەوتەوە و وەکو پیاوێکی نابینا سەیرێکی عیسای کردو گوتی: ئەم پیاوە بەم زووانە دەمرێ. پاشان ڕوونی کردەوە کە شەوی ڕابردوو، کاتێك ئەم پیاوەیان دەستگیر کردو بردیان بۆلای ئەنجومەنی بالآی جوولەکەکان، حالّی خراپ نەبوو، هەروەها دوای ئەوەی کە ئەنجومەنی بالاّ فەرمانی دەرکرد لەخاچ بدرێ، فەرمانداری گشتیش فەرمانی دا بە قامچی لێی بدەن.

من بەم وتەیە سەرسام بووم و پرسیم: بۆچی فەرمانداری ڕۆم فەرمانی دا ئەو پیاوەی کە دەبێ لەخاچ بدرێ بە قامچی لێی بدەن؟

ئەو گوتی: بۆئەوەی دەیویست هەستی بەزەیی جوولەکەکان بجولّێنێت تاکو واز لەسزای لەخاچدان بهێنن و بە لێدانی قامچی کیفایەت بکەن.

گوتم: پێش ئەوەی ئەم پیاوە ستەم لێکراوە لەخاچ بدەن، ئازاریان داوە؟

ئەفسەرە ڕۆمییەکە ڕوونی کردەوە: بەلاّم ئازاردانی ئەو، لەڕووی دلّسۆزیەوە بوو، دەیانویست کارێك بکەن تاکو ڕێگری بکەن لە لەخاچدانی ئەو.

جارێکی تریش ئەفسەرە ڕۆمییەکە سەیرێکی هەر سێ لەخاچدراوەکەی کردو گوتی: عیسا بە زووترین کات دەمرێ، بەلاّم دوو لەخاچدراوەکەی دیکە بە سەختی گیان دەدەن و بەم زووییە نامرن.

ئیمە دەبێ ئێسکەکانی ئەم دووانە بشکێنین تاکو بەهۆی تەنگەنەفەسیەوە زوو گیان لەدەست بدەن. لەو کاتەدا دەنگێکی ترسناك دەهاتە گوێ و لە هەوای نیوەتاریکدا، ڕووناکییەکی سور شەوقی دایەوە. خەلّکەکەی تریش وەکو من، لە بیستنی ئەو دەنگە و بینینی ئەو تیشکە ترسیان لێ نیشت و گوێدرێژەکەی من زەرمزەری کرد و بەرەو شار هەلّهات. چەند کەسێکی ڕێبوار پێشیان لە گوێدرێژەکەی من گرت و منیش خۆم گەیاندە لای گوێدرێژەکە و ڕەشمەکەیم گرت، بەلاّم گوێدرێژەکە نەیدەتوانی ئارام بگرێ و نیازی وابوو دووبارە هەلّبێت. هەر چوارپێیەکانی دەلەرزین و بەدەنی ئارەقی کردبوو و هەولّی دەدا خۆی لە دەستم دەرباز بکات و هەلّبێت. من سەرم

سوڕمابوو لەوەی بۆچی ئەم گوێدرێژەی من ئەوەندە دەترسێ، چونکە ئیتر هیچ دەنگێ نەدەبیسترا و تیشکی سور بەرچاو نەدەکەوت، تاوەکو زەوی لەرزەیەك دروست بوو و بوومەلەرزە دەستی پێ کرد. ئەو کاتە تێگەشتم کە بۆچی گوێدرێژەکەم دەترسێ و نیازی وایە غار بدات و هەڵێت، چونکە گیاندارە گوێدرێژەکان پێشبینی ڕووداني بوومەلەرزە دەکەن و پێش ئەوەی بوومەلەرزە بێت، ئەوان هەڵدێن. ڕووداوی بوومەلەرزە بۆ من شتێکی نوێ نەبوو، چونکە پێش ئەو ڕۆژەش ڕووداوی بوومەلەرزەم بینیوە و دەمزانی چیە، دوای ئەوەی کە بوومەلەرزە دەستی پێ کرد، دنیا تاریك بوو و ئەو کەسانەی بینەری لەخاچدراوەکە بوون، لە ترسان هاواریان لێ بەرز بوویەوە.

من خۆشحاڵ بووم کە لەو کاتەدا لە ناو شار نەبووم، چونکە ئەگەر لە شار بوومایە لەوانە بوو سەقف و دیواری ماڵەکان بە سەرمدا بڕوخێ و لەناو بچم. من نازانم بوومەلەرزەکە چەندە درێژەی کێشا، چونکە کاتێ زەوی دەلەرزێ، مرۆۋ ئەوەندە دەترسێ کە بیری هەژمارکردنی کاتی ناکەوێتەوە.

دوای ئەوەی کە بوومەلەرزەکە کۆتایی هات، جارێکی تریش هەستم بەوە کرد کە ئامادەبوونی من لەوێدا و لەو ڕۆژەدا چارەنووس بووە و هەموو ئەو ڕووداوانەی کە لە ڕۆمەوە تا میسر بۆ من هاتۆتە پێش، پێشەکیەك و هۆکارێ بووە بۆئەوەی من، ئەو ڕۆژە لەوێدا ئامادە بم. بوومەلەرزە تەواو بوو و ترسی گوێدرێژەکەی من نەماو چوومەوە بۆ لای خاچەکان. لەو کاتەدا چاوم کەوت بە کۆمەڵێ ژن کە دەگریان بەڵام ڕوخساریانم نەدەبینی، چونکە پەرچەیان دابویەوە بە ڕوخساریاندا.

لە یەکێ لە ئامادەبووانم پرسی: ئەم ژنانە کێن کە وا دەگریەن؟

ئەو پیاوە گوتی: عیسا لە "جەلیلە" دەژیا و لەوێدا بوو کە هەوڵی دەدا خەڵك لەسەر ڕێ لابدات و دژی یاساکانی جوولەکە ڕاپەڕن، بۆیە ئەویان گرت و هێنایان بۆ ئێرە و، ئەو ژنانەش لەگەڵ ئەو هاتوون بۆ ئێرە.

گریانی ژنەکان زۆر کاری تێ کردم. یەکێ لە دیمەنە خەمهێنەکان ئەوەیە کاتێك کەسێ لەسێدارە دەدەن یان لەخاچی دەدەن، دەبێ ژن و منداڵی خزم و خێشەکان بینەری گیان سپاردنەکەی بن. ئەگەر من لەو ناوچەدا فەرمانڕەوای ئەو شارە بوومایە، فەرمانم دەدا عیسا لە جێگەیەك لەخاچ بدەن کە خزم و خێشەکانی نەتوانن ببینن.

لەلای ژنەکان پیاوێکی گەنج و سیما جوان دەبینرا کە قۆڵی یەکێ لە ژنەکانی گرتبوو، وا دیاربوو کە دڵی دەدایەوە.

من لەو پیاوە یەهوودییەی کە لەبارەی ژنەکانەوە هەندێ زانیاری پێدام، پرسیم: ئەم پیاوە گەنجە کێیە؟

ئەو گوتی: ئەم پیاوە یەکێکە لە شوێنکەوتووانی عیسا و بەهۆی ئامۆژگاری ئەوەوە لە ڕێی ڕاست لای داوە، بەڵام لەبەرئەوەی لەگەڵ ژمارەیەك لە گەورەکانی ئێمە هاوڕێیە، بۆیە کەس ئازاری نادات.

گوتم دەبینم ئەم پیاوە بازووی یەکێ لە ژنەکانی گرتووە و وادیارە گرنگیەکی تایبەت بەو ژنە دەدات. ئایا تۆ دەزانی ئەو ژنە کێیە؟

پیاوە یەهوودییەکە گوتی: ئەو ژنە دایکی عیسایە. کاتێ ئەم قسەیەم بیست، زیاتر کاری تێ کردم، چونکە یەکێ لە ترسناکترین و ناخۆشترین ئەشکەنجە ڕۆحیەکان ئەوەیە کە دایکێك دیمەنی گیاندانی منداڵەکەی خۆی، بەتایبەت بەخاچەوە، ببینێ. ویستم لەو ژنە نزیك ببمەوە و لێی بپرسم چی بوو وای کرد کوڕەکەت بە خاچدا هەڵبواسن بەڵام بیرم کردەوە کە داوای ڕوونکردنەوەی ئەو شتە لەو ژنە، بەتایبەتی لەو کاتەدا کە کوڕەکەیان لەخاچ داوە، جێی خۆی نییە و بگرە زیاتر ئازاری ڕۆحی دەچێژێ.

دوای بوومەلەرزەکە، ئەگەرچی کە هێشتا ڕۆژ بوو، کەچی هەوا تاریکتر بوو. ئەفسەرە ڕۆمییەکە پێی گوتم: لێرە هەوا شەپۆل نادات، تەنانەت گەڵای دارەکان ناجوڵێن، بەڵام لە بیابان تۆفان بەردەوامە و لمی سەر زەوی بەرز دەکاتەوە و لە هەوادا بڵاوەی پێ دەکات و گەردیلەی لمەکان بەری تیشکی هەتاو دەگرێت و لەئەنجامدا بەو شێوەیەی کە دەیبینی، ئێرە بەهۆی ئەوەوە تاریك بووە.

تاریکیەکە بەو شێوەیە نەبوو کە مرۆڤ نەتوانێ ڕوخساری ئەوانی تر نەبینێ و نەیانناسێتەوە. من نەك هەر شکڵی عیسام بەباشی بەخاچەکەوە دەبینی، بەڵکو ئەو مێروانەشم دەبینی کە لە دەوری زامەکانی ئەو پیاوەدا دەفڕین و هەندێ جاریش دەنیشتن بەزامەکانییەوە. جارێکی تر عیسا لەسەر هەر دوو پێی خۆی کە بەمێخ بە خاچەکەدا داکوترابوون، خۆی ڕاگرت و کەمێك سەری بەرز کردەوە و گوتی: ئەی بەتواناکەم! ئەی بەتواناکەم! ئایا دەستبەرداری من بوویت؟ بەڵام لەبەرئەوەی دەنگی

زۆر کەم بوو، بۆیە هەندێ لە ئامادەبووان وایاندەزانی ئەو، خودای خۆی بانگ دەکات و دەڵێ: ئەی خودای من! ئایا وازت لە من هێناوە؟ بەڵام من بەجوانی گوێم لێ بوو کە گوتی: ئەی بەتواناکەم! هەندێ لە ئامادەبووانیش گوتیان کە ئەو"ئیلیاس" بانگ دەکات.

"ئیلیاس" یەکێکە لە پێغەمبەران کە دەڵێن سواری گالیسکەیەکی ئاگرین بووە و لەکاتێکدا ئەو گالیسکەیە گڕی لێ بەرز بۆتەوە، بەرە و ئاسمان بەڕێ کەوتووە. ئەو کەسانەی کە وایاندەزانی عیسا ناوی"ئیلیاس"ی هێناوە، زمانی گاڵتە پێ کردنیان کردەوە و گوتیان: ئەگەر تۆش دەتوانی سواری گالێسکەیەکی ئاگرین ببە و بەرەو ئاسمان بەڕێ بکەوە. بڕێکی تریشیان بە گاڵتە پێ کردنەوە دەیانگوت لەوانەیە "ئیلیاس" لە ئاسمانەوە بێت بۆ یاریدەدانی و مێخەکان لە دەست و پێیەکانی دەربهێنی و ئازادی بکات.

دوای ئەوەی گاڵتەچیەکان بێدەنگ بوون، عیسا شتێکی گوت، بەڵام ئەمجارە نەمتوانی تێبگەم چی دەڵێ، هەندێك لەو کەسانەی لە بن خاچەکاندا بوون، گوتیان، ئەو تینویەتی و دەیەوێ شتێ بخواتەوە.

یەکێ لە پیاوە خێرخوازەکان کە لەنێوان ئامادەبووەکاندا بوو، ئیسفەنجێکی پەیدا کرد و خستیە بەر مەشکۆڵەی ئاوی سەربازەکانی هێزی لژیون تاوەکو تەڕ ببێت. کاتێ ئیسفەنجەکە تەڕ بوو، دارێکی درێژی پەیدا کرد و ئیسفەنجەکەی پێوە کرد و نزیکی کردەوە لە دەمی عیسا. ئەفسەرە ڕۆمییەکە و ئەو سەربازانەی کە لەوێ بوون، ڕێیان لەو هەڵوێستەی ئەو پیاوە نەگرت، بەڵام عیسا ئەوەندە لاواز بوو کە نەیدەتوانی لە ئیسفەنجەکە ئاو بخواتەوە. ئەو پیاوەی کە ئیسفەنجەکەی ڕاگرتبوو، هێنای بەلێوی عیسادا و لێوەکانی پیاوە لەخاچدراوەکەی تەڕ کرد.

دیسان هەوا تاریکتر بوو، بەجۆرێك کە بۆ یەکەم جار لەو ڕۆژەدا نەمدەتوانی بەباشی ڕوخساری عیسا ببینم، بەڵام بینیم کە خۆی لەسەر هەردوو پێکەی کە بەخاچدا داکوترابوو، ڕاگرت و گوتی: ((تەواوبوو)). پاشان سەری کەوتە سەر سنگی و ئیتر زانیم کە عیسا ناتوانێ سەری بەرز بکاتەوە و مردووە، یانیش بە زوویی دەمرێ. من پێم خۆش بوو، چونکە دەمزانی کە ئیتر عیسا ئازار ناچێژێ، ئەفسەرە ڕۆمییەکەش وەکو من دەیزانی کە عیسا گیانی سپاردووە و سەربازەکانیش زانییان کە

لەخاچدراوەکە مردووە. ئەفسەرە ڕۆمییەکە هەستی سەربازەکانی خۆی سەبارەت بە لەخاچدراوەکە بە ڕستەیەك دەربڕی و گوتی: ئەو مرۆڤێکی باش بوو. ئیتر نەیتوانی قسە بکات، چونکە جارێکی دی زەوی کەوتەوە لەرزە و گوێدرێژەکان ڕەشمەکەیان قرتاند و هەڵهاتن و ئامادەبووەکانیش وەکو من، بەهۆی ترسێکی زۆرەوە خۆمان دا بە زەویدا و هەندێ لە ئامادەبووەکان ڕوخساریان بە جلەکانی خۆیان داپۆشی.

دوای ئەوەی بوومەلەرزەکە کۆتای هات، ئامادەبووەکان لە جێگەی خۆیان هەستانەوە و منیش هەستامەوە. هەوا کەمێك ڕۆشن بوویەوە و ئیتر توانیم ڕوخساری عیسا ببینم و لە نیشانەکانی ڕوخساریدا بۆم دەرکەوت کە ڕۆح لە لاشەیدا نییە. بە خۆم گوت: من دەبێ بزانم بۆچی ئەم پیاوە ستەم لێکراوەیان بەم شێوە دڵتەزێنە کوشت. مەگەر ئەم پیاوە چی دەگوت و چی دەکرد کە بووە هۆی لەخاچدانی؟ بۆچی کەس پشتگیری لێ نەکرد و ڕێی لە لەخاچدانی نەگرت؟

ئەگەرچی تاریکایی نەما و هەتاو درکەت، کەچی ڕەنگی تیشکی خۆر جۆرێکی تر بوو، کاتێ تیشکەکە دەیدا لە ڕوخساری ئامادەبووەکان، ڕنگی ڕوخساریان بە سپی دەردەکەوت. ئەفسەرە ڕۆمییەکە دەیگوت: ڕەنگی هەتاو بە هۆی ئەوەیە کە هێشتا بڕێك لە گەردیلەی لمی بیابان لە هەوادا بڵاوە و ئەو گەردیلانە ڕەنگی هەتاویان گۆڕیوە و تاکو ئەو گەردیلە ڕیخانە نەنیشنە سەر زەوی، ڕنگی هەتاو بەو شێوەیە دەمێنێتەوە.

من سەیرێکی عیسام کرد تاکو ببینم کە ئایا ڕوخساری ئەویش بە ڕەنگی سپی دەردەکەوێت یان نا. ڕوخساری ئەویش سپی بوو، بەڵام نەك وەکو سپێتی ڕوخساری خەڵکەکەی تر. ڕوخساری سپی ئامادەبووەکان وەك ڕەنگی هەتاو وابوو کە کەمێك تاریك دەردەکەوت، بەڵام سپێتی ڕوخساری عیسا وەکو سپێتی ئەو بەفرە وابوو کە بەسەر لوتکەی شاخی "ئاڵپ"ەوە لەڕۆژێکی خۆرەتاودا دەدرەخشایەوە. من کاتێك سەیری شکڵیم کرد، جۆرێك لە ڕۆحانییەتم تێدا دەبینی کە تا ئەو ڕۆژە لە هیچ کەسێکم نەبینیبوو. بە خۆم گوت: ئەم پیاوە بێگومان مرۆڤێکی گەورە و پایەبەرزە، چونکە ئەگەر وانەبوایە ئەوا لەم کاتەدا کە مردووە، شکڵێکی وەهای بە خۆی نەدەگرت.

کاتێ عیساماڵئاوایی لە ژیان کرد، ژمارەیەك لە جوولەکەکان کە چاوەڕێی مردنی ئەویان دەکرد، لەبەرئەوەی دەیانبینی کە ئەوەندەی نەماوە شەو دابێت و، هەروەها

ئەوەندەی نەماوە شەممە دەست پێ بکات، ڕۆیشتن، بەڵام هەندێ لە ئامادەبووەکان هەر مانەوە.

یەکێ لەو دوو تاوانبارەی کە لە هەردوو لای عیسادا لەخاچ درابوون، بەهۆی زۆریی ئازارەوە هاواری لێ بەرز بوویەوە و گوتی کە تینویەتی. دوو ژنی چاکەکار کە گۆزەیەکی ئاویان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، چوون بۆلای ئەفسەرە ڕۆمییەکە و پێیان گوت کە ئایا ڕێگە دەدەن کەمێك ئاو بگەیەننە لێوەکانی ئەو پیاوە. ئەفسەرە ڕۆمییەکە ڕازی بوو و ئەوانیش بۆئەوەی ئاو بگەیەننە دەمی لەخاچدراوە تاوانبارەکە، سوودیان لەو ئیسفەنج و دارە وەرگرت کە پێشتر بۆم باس کردی و ئیسفەنجەکەیان پڕ کرد لە ئاو و کردیان بەدارەکەوە و نزیکیان کردەوە لە لێوەکانی لە خاچدراوەکە. ئەو پیاوە هەموو ئاوی ناو ئیسفەنجەکەی خواردەوە. ژنە چاکەکارەکان ویستیان دووبارە ئیسفەنجەکە پڕ بکەنەوە لە ئاو و بیگەیەننە لێوی ئەو پیاوە، بەڵام ئەفسەرە ڕۆمییەکە نەیهێشت و گوتی: ئەوا شەو دادێت و من حەز دەکەم کاتێك شەو داهات، ئەرکی پاسەوانم لەم شوێنەدا کۆتایی بێت و بتوانم بڕۆم و پشوو بدەم. ئەگەر ئێوە جارێکی تر ئاو بدەن بەم پیاوە، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ژیان و بەم نزیکانە نامرێت و چاوەڕوانییەکی زیاتری دەوێت تا دەمرێت.

کاتێ ژنەکان ئەمەیان بیست، بەناچاری گەڕانەوە و ئیتر ئاویان نەدا بەو پیاوە تاوانبارە. ئینجا دوو کەس لە شارەوە هاتن، یەکێکیان سەرباز و ئەوی تریان جەلاد بوو. جەلادەکە شیشێکی ئاسنی بە دەستەوە بوو سەربازەکەش ڕمێکی بە دەستەوە بوو. کاتێ ئەو دوو کەسە گەیشتنە لای ئێمە، بینیم جەلادەکە سەرەتا سەیرێکی عیسای کرد تاکو بزانێ ئایا ئەو زیندووە یان مردووە. کاتێ زانی عیسا گیانی سپاردووە، ئیتر گرنگی پێ نەدا و ئەو پەیژەیەی کە لە سەر زەوی دانرابوو، هەڵ گرت و هەڵیپەسارد بە خاچییەکێ لە دوو تاوانبارەکەی تر و لە پەیژەکە چووە سەرەوە و بە شیشە ئاسنینەکەی ئێسکی پێیەکانی ئەو تاوانبارەی تێك شکاند. دەنگی تێك شکانی ئێسکەکە، موچورکەی بە لەشدا دەهێنا و تاوانبارەکە هاواری لێ بەرز بوویەوە.

جەلاد گوتی هاوار مەکە! چونکە دەمەوێ چاکەت لە گەڵ بکەم و بۆیەشە ئێسکی پێیەکانت دەشکێنم بۆئەوەی قورسایی هەموو لەشت بکەوێتە سەر دەستەکانت، ئەوکاتە هەناسەدان بۆتۆ دژوار دەبێت و بە زوویی گەروت دەگیرێت و گیان دەسپێریت.

جەلادەکە، ئێسکی پێیەکانی تاوانبارەکەی تریشی بەشیشە ئاسنینەکەی خۆی شکاند و پەیژەکەی داگرت و لە سەر زەوی داینا. دواتر زانیم ئەو سەربازەی کە ڕمێکی بەدەستەوە بوو ناوی "لونجی نووسە"ە، ڕمەکەی خۆی بەرز کردەوە و نوکی ڕمەکەی گەیاندە سنگی عیسا و یەکجار کردی بە ناو دڵیدا. کاتێ نوکی ڕمەکەی لە دڵی هێنایە دەرەوە، بڕێك خوێن و خوێناو لە کونی زامەکەوە هاتە دەرەوە.

ئەو کاتە کە جەلادەکە خەریکی شکاندنی ئێسکی پێی دوو تاوانبارەکە بوو، ژمارەیەك لە ئامادەبووەکان کە دەیانزانی ئەو جەلادە ڕۆمییە، دروشمیان لە دژی ڕۆم دەگوتەوە. سەربازە ڕۆمییەکان هێرشیان بۆ خەڵکەکە برد و بە تەنیشتی نێزەکانیان و بە قڵغان، بڕێکیان دا لە خەڵکەکە تاوەکو دووریان بخەنەوە و، ئێسکی چەناگەی یەکێ لە ئامادەبووەکانیشیان شکاند.

ئەم هەڵوێستە جوولەکەکانی توڕە کرد و کاتێ دوور دەکەوتنەوە، هاواریان دەکرد: هەر کە چەکمان دەست کەوت، هەموو ڕۆمییەکان لەم شارە دەکوژین.

ئەفسەرە ڕۆمییەکە پێی گوتم: ئەمانەی کە دەیانبینی هاوار دەکەن، هاوڕێکانی عیسا نین، بەڵکو لە ئاشنایانی ئەم دوو دز و دەسبڕەن. من دەمتوانی فەرمان بدەم بیانکوژن، بەڵام فەرمانداری گشتی فەرمانی پێ کردووین کە جوولەکەکان نەکوژین مەگەر کاتێك کە ناچار بین.

فەرمانداری گشتی گوتوویە مەیانکوژن، چونکە دەبێتە هۆی توڕە بوونی یەهوودییەکان و دروست بوونی شۆڕش و، کێشە بۆ ڕۆمییەکان دروست دەکەن. من بەو شێوەیەی کەپێم گوتی ڕقم لە جوولەکەکانە و ئەگەر دەسەلاتم بووایە گشتیانم دەکوشتن، بەڵام لەبەرئەوەی "پونتی پیلات "، فەرمانداری " یودە " گوتویەتی جوولەکەکان مەکوژن، بۆیە ناچارین گوێڕایەڵ بین. ئەو کاتە خاوەن پایەی ڕۆمییەکە گوتی: کاتێ کاری من لێرە تەواو بوو و، بۆ پێشکەش کردنی ڕاپۆرت و پشوودان بەرەو قەلاّ بەڕێ کەوتم، ئەوا لە گەڵ خۆم دەتبەم و دەتناسێنم بە فەرمانداری گشتی و، پێموایە واباشترە لەکاتی جەژنی گەورەی جوولەکەکاندا لە کۆڵانەکانی ئەم شارەدا نەبینرێیت. لەبەرئەوەی یەهوودییەکان ئەمڕۆ تۆیان لەگەڵ من بینیوە کە پێکەوە قسە دەکەین و زانیویانە تۆ یەهوودی نیت، ئەوا هەرکاتێ بەتەنیا بتبینن، لەوانەیە هێرشت بۆ بێنن و بتکوژن. خاوەن پایەکەی ڕۆم پێکەنی و گوتی: ئەو خۆشەویستیەی کە

بەرامبەر تۆ هەمە لەبەرئەوە نییە کە تۆ ڕۆمیت، بەڵکو هەست دەکەم پیاوێکی دانایت و لەبەرئەوەی خۆم خوێندەواریم هەیە و دەتوانم بنووسم و بخوێنمەوە، بۆیە ڕێز لە پیاوی دانا دەگرم و هەرچەندە لە قەڵاداکەشدا شوێنێکی وای تێدا نییە تاکو لێی دابنیشی، بەڵام هەوڵ دەدەم لەوێ ئاسوودە بیت.

پرسیم: مەبەستت لە "قەڵا" چییە؟

ئەفسەرە ڕۆمییەکە گوتی: مەبەستم،قەڵای "ئەنتۆنییە"یە کە قەڵایەکی قایم و نیزامیی ئەم شارەیە و بارەگای سەربازانی ڕۆمییە و فەرمانداری گشتیش لەوێ نیشتەجێیە.

گوتم: بەوشێوەیەی من بیستوومە، کۆشکێکی گەورە و بەشکۆ لەم شارەدایە کە لەلایەن "هیرود"ەوە دروست کراوە. بۆچی فەرمانداری گشتی لەو کۆشکەدا نیشتەجێ نابێ؟

ئەفسەرە ڕۆمییەکە گوتی: ئەگەر فەرماندار لەوکۆشکەدا نیشتەجێ بێ، دەبێ ئەو سەربازە ڕۆمییانەی کە لەم شارەدان، بکرێن بە دوو بەشەوە و نیوەیان لە قەڵاکە دابنێ و نیوەکەی تریان ببات بۆ کۆشکەکەی خۆی بۆئەوەی پارێزگاری لێ بکەن. بەم شێوەیە سەربازە ڕۆمییەکان دابەش دەبن بەسەر دوو گروپدا و هەر دوو گروپەکە لاواز دەبن و بۆیەش فەرمانداری گشتی لە قەڵای "ئەنتۆنییە" نیشتەجێ بووە تاکو ناچار نەبێت سەربازەکان بکات بە دوو بەشەوە. قەڵای "ئەنتۆنییە" کە دواتر دەیبینیت، قەڵایەکی قایمە و ناتوانرێ تێك بدرێت، هەروەها گرنگیەکی تریشی ئەوەیە کە بەسەر پەرستگای گەورەی قودسدا دەڕوانێت و تۆ، دوای ئەوەی چویتە ناو قەڵاکە، دەتوانی لەوێوە هەموو بەشەکانی پەرستگاکە ببینی. هەروەها لەبەرئەوەی زۆربەی شۆڕشی یەهوودییەکان لەپەرستگاوە دەست پێدەکات، بۆیە ڕوانینی قەڵاکەی ئێمە بەسەر پەرستگاکەدا لەڕووی ڕێگری کردن لە شۆڕشی یەهوودییەکان زۆر بەسوودە.

ئەفسەرە ڕۆمییەکە دوای ئەوەی ناوی خۆی بەمن گوت کە ناوی "ئادان ئابر"ە، پاڵی دا بەو خاچەوەی کە عیسای پێوە بوو و گوتی: ئەگەر تۆ لێرە بوویتایە کاتێك ئەم پیاوە هاتە ناوەوە، ئەوا دەتبینی کە ئەویان وەکو دەستەڵاتدار و پاشاکان هێنایە ناو شارەوە. ئەو ڕۆژە عیسا سواری گوێدرێژێك ببوو و کۆمەڵێك لە ژنان و پیاوانی دەوروبەری، پەلی دارخورماکانیان بەدەم ڕێوە دەشکاندەوە.

کۆمەڵێك لە پیاوانیش جلەکانی خۆیان دادەکەند و لە ڕێگەکەی ئەودا دایاندەخست تاکو گوێدرێژەکەی، سمی خۆی بخاتە سەر جلەکانی و دەیانگوت: ئەی عیسا، تۆ نەوەی "داوود"یت؟

ئەفسەرە ڕۆمییەکە گوتی: من بەدواداچوونم کرد و زانیم کە عیسا لە دایکەوە باوانی دەچێتەوە سەر "داوود". دواتر ئەفسەرە ڕۆمییەکە ئەو ژنەی نیشان دام کە دایکی عیسا بوو و گوتی: ئەم ژنە لە نەوەکانی "داوود"ە.

ئەو ژنانەی کە لە خزمان یان هاوڕێکانی عیسا بوون، بەهۆی جیابوونەوەیان خەڵکە ئامادەبووەکان، پەچەیان لە ڕوخساری خۆیان لادابوو و لەسەر زەوی دانیشتبوون و هەموویان سەیری عیسایان دەکرد. من بەباشی ڕوخساری دایکی عیسام دەبینی و زانیم کە کەسێکی بەتەمەن نییە، بەڵکو هێشتا گەنجە و، جوانی ئەو ژنە بووە هۆی سەرسامی من. جوانییەکەی دایکی عیسا جۆرێك لە جوانی ئاسمانی بوو و هەرکەسێ ئەوی بدیایە، ئەوا دەیزانی کە ئەو جۆرە جوانییە زۆر دەگمەنە.

من زۆر حەزم دەکرد لە جێی خۆم هەستمەوە و لەو گروپە ژنە نزیك ببمەوە کە لەسەر زەوی دانیشتبوون و پێیان بڵێم کە دایکی عیسا لەوێ دوور بخەنەوە و بیبەن بۆ جێگەیەکی تر تاکو دوای ئەوەی دوور کەوتنەوە، بچم بۆ لای ئەو ژنە و سڵاوی لێ بکەم و پێی بڵێم کە ((ئەی دایکی عیسا، من دەزانم ئەو بەڵایەی کە بە سەرتدا هاتووە، زۆر بە ئازارە، بەڵام ئێستە خۆشحاڵ بە کە کوڕەکەت ماڵئاوایی لە ژیان کرد و ئیتر ئازار ناچێژێ، چونکە لەخاچدراوێك دوای ئەوەی وەفاتی کرد، ئیتر ڕەها دەبێت و لە هەموو دەرد و ئازارێك ڕزگاری دەبێت)).

دوو ژن لەلای دایکی عیسا دانیشتبوون کە زیاتر لە ژنەکانی تر گرنگیان بە دایکی عیسا دەدا. یەکێ لەوان ژنێکی پەرێشان و خەمناك بوو کە نیگای لەسەر خاچەکە نەدەبڕی، ئەوی تریان ژنێکی بەتەمەنتر بوو لەژنەکەی تر. مریەم- دایکی عیسا، بەجۆرێك سەیری کوڕەکەی خۆی دەکرد وەك بڵێی هەست بەئازارەکانی دەکات و حەزی دەکرد ئازارەکانی لەشی کوڕەکەی بگوازێتەوە بۆ لەشی ئەو. لە کاتێکدا کە عیسا مردبوو و ڕۆحی لە لەشدا نەمابوو، کەچی دایکی عیسا بە ڕوخسارە خەماویەکەیەوە سەیری کوڕەکەی کرد. بەڵام دوو ژنەکەی دیکە بەجۆرێ سەیری عیسایان دەکرد وەك بڵێی چاوەڕێی پەرجوو بن و هیوادار بوون عیسا زیندوو ببێتەوە

و ئەو میخانەی کە بە دەست و پێیەکانیدا داکوترابوون، هەر لەخۆوە دەربێن و عیسا لەسەر خاچەکە بێتە خوارەوە.

دایکی عیسا نیگای لەسەر کوڕەکەی هەڵنەدەگرت و منیش نیگام لەسەر ئەو هەڵنەدەگرت، تا کاتێك هەستم کرد کەسێك قۆڵی گرتم و ڕووم وەرگێڕا و بینیم "ئادان ئابر"- ئەفسەرە ڕۆمییەکەیە.

ئەو گوتی: کاری من تەواو بووە و ئیتر پێویست ناکات لێرە بمێنمەوە، چونکە هەر سێ لەخاچدراوەکە گیانیان سپاردووە و ئەگەر جوولەکەکان بیانەوێ پێش شەممە ئەم سێ تەرمە لەسەر خاچ دابگرن، ئەوا دایدەگرن.

لێم پرسی: شەممە لە کەیەوە دەست پێ دەکات؟

ئەفسەرە ڕۆمییەکە ڕووی کردە ڕۆژئاوا و سەیری هەتاوی کرد و گوتی: خۆر هێشتا لەسەر ئاسۆیە و دوای ئەوەی کەوتە پشتی ئاسۆوە، شەممەی جوولەکەکان دەست پێ دەکات.

دواتر چەند کەسێك لە سەربازەکانی لەبەردەم خاچەکاندا بە پاسەوانی دانا و بەوانی تری گوت کە ئیتر ئازادن و دوای ئەوەی گەیشتینە قەڵاکە، دەتوانن پشوو بدەن. من و "ئادان ئابر" لە پێشەوە دەڕۆیشتین. یەکێ لە سەربازەکان ڕەشمەی گوێدرێژەکەی منی گرتبوو و بە دوای خۆیدا دەیهێنا و سەربازەکانی تریش، کە جیابوون لەوانەی لەلای خاچەکاندا پاسەوانییان دەکرد، لە پشتی ئێمەوە دەهاتن.

من چێژم لە دەنگی بەهێز و یەك سەدا و ڕێکوپێکی هەنگاوی سەربازە ڕۆمییەکان وەردەگرت و لەبەرئەوەی ئەوان بە هەنگاوی نیزامی دەهاتن بەڕێوە، بۆیە من و "ئادان ئابر"یش ناچار بووین کە بە هەنگاوی نیزامی بڕۆین بەڕێوە.

کاتێ گەیشتینە شار، بۆنی شیو لە هەموو ماڵەکاندا دەگەیشتە لوتمان و، "ئادان ئابر" گوتی: هەموو ئەو خواردنانەی کە ئەمشەو لەم شارەدا دروست دەکرێت، بە گۆشتی مەڕ دروست دەکرێت. دوێنێ و ئەمڕۆ، پەرستگای گەورەی یەهوودییەکان بەبۆنەی سەربڕینی مەڕەکانەوە ببوو بە کوشتارگەیەکی گەورە.

نەریتی جوولەکەکان وایە کەکاتێ مەڕێك سەردەبڕن، ڕانەکەی دەدەن بە پێشەواکانی خۆیان و چەوریی و بەزەکەی دەهێڵنەوە بۆ خوداکەی خۆیان.

ئێمە کە بەهەنگاوی خێرا دەڕۆیشتین، گەیشتینە قەڵای "ئەنتۆنییە" و تورەکە گەورەکەی منیان بردە ناو قەڵاکە و گوێدرێژەکەیان برد بۆ تەویلە و، پاشان ئێمەش چووینە ناو حەوشەی قەڵاکەوە. لەوێدا "ئادان ئابر" سەیرێکی منی کرد و زانیم کە سەیری جلەکانم دەکات و بەزمانی حاڵ پێم دەڵێ کە جلەکانم بۆ سەربازخانەی ڕۆمی، بەتایبەت بۆ دیدار لەگەڵ فەرماندەی گشتی، شیاو نییە. من لە ناخمدا پشتگیریم لە مەبەستەکەی کرد. جلەکانی من بۆ دەرەوەی سەربازخانە و کاتێ لەنێوان کۆمەڵێ لە ئامادەبوواندا سەیری لەخاچدراوەکانم دەکرد، باش بوو، بەڵام بۆناو سەربازخانەی ڕۆمی شیاو نەبوو. چونکە سەربازخانەی ڕۆمییەکان کە لژیونێك (لەشکر)ێك لەناویدا بەسەری دەبرد، یەکێکە لە خاوێنترین شوێنی دنیا و پاکوتەمیزی و ڕێکوپێکیی لژیون بەناوبانگە. لە سەربازخانەیەکی ڕۆمیدا، بۆنی ئاسن و چەرم دێت بە لوتدا، چونکە چەکی سەربازەکانی لژیون و، زرێ و جلی جەنگیان ئاسنینە و پشتوێن و هەڵگری چەرمینیان هەیە. هەروەها سوارەکانی نیزامی ڕۆمییش زینی چەرمینی هەیە، بەڵام هەرگیز بۆنی ناخۆش لە سەربازخانەی ڕۆمیدا نایە بە لوتدا.

من لەبەرئەوەی ڕۆمیم و بڕوام وایە سەربازخانەی لژیون جگە لەوەی کە خاوێنە، میحرابی ئەرتەشی ڕۆمە، بۆیە بڕیارمدا جلەکانی خۆم بگۆڕم و بە "ئادان ئابر"م گوت: ئایا لێرەدا جێگەیەك نییە بتوانم خۆمی تێدا بشۆم و جلەکانمی تێدا بشۆم؟

ئەفسەرە ڕۆمییەکە گوتی: لەم سەربازخانەیەدا لەو حەمامانەی تێدا نییە کە ئێوە لە ڕۆم بینیوتانە تا بتوانیت خۆتی تێدا بشۆی، بەڵام جێگەیەکمان هەیە کە ئەفسەرەکان خۆیانی تێدا دەشۆن. ئینجا دوو کەس لەغوڵامەکانی بانگ کرد و منی بەوان سپارد و گوتی: ئەو ببەن بۆ حەمام و لەشی بشۆن و ڕۆنی بۆن خۆش بدەن لە لەشی و قژی شانە بکەن.

غوڵامەکان منیان برد بۆ حەمام و شوتمیان و دوای ئەوەی لەشم پاك بوویەوە، ڕۆنی بۆنخۆشیان دا لە لەشم.

## له قەڵای ئەنتۆنییەدا

من هەرکە چوومە ناو حەوشەی قەڵای "ئەنتۆنییە"، لەو کاتەدا "پونتوس پیلات"، فەرمانداری گشتی، لەگەڵ چەند کەسێکی تر کە لە دوایەوە بوون، لە بورجی قەڵاکەوە هاتە خوارەوە. من زانیم کە ژمارەیەك لە یەهوودییەکان لە حەوشەی قەڵاکەدا وەستاون و چاوەڕوانی نزیك کەوتنەوەی فەرمانداری فەرمانداراکەن. لەشێوەی فەرمانداردا بۆم دەرکەوت دڵی گیراوە و زانیشم ئەو جوولەکانەی کە هاتوون بۆ ئەوێ و گەرەکیانە لەگەڵ "پۆنتوس پیلات"دا گفتوگۆ بکەن، مەبەستیان چاکەیە لەگەڵ فەرمانداردا و بۆیە فەرمانڕەواش لەگەڵیان ڕێك کەوتووە تا لەو کاتەدا بیانبیغێت، چونکە عادەت نییە فەرمانداریکی گشتی لەو کاتەدا ڕێگە بدات بە کۆمەڵێ خەڵك بیان بینێت، بۆیە کەسە دیارەکانی جوولەکە کاتێ فەرمانداری گشتیان بینی، داوای مۆڵەتیان لێ کرد پێش ئەوەی شەممە دەست پێ بکات تەرمی عیسا لەسەر خاچ بهێنرێتە خوارەوە.

فەرمانداری گشتی لە یەهوودییەکانی پرسی: عیسا بەسەر خاچەکەوە چۆن گیانی دەرچوو؟

ئەوان گوتیان: هەر وەکو لەخاچدراوەکانی تر مرد.

فەرمانداری گشتی گوتی: ڕووداوەکەی ئەمڕۆ زۆر منی شەکەت کرد و ژنەکەم بەهۆی ئەو ڕووداوەوە نەخۆش کەوت. با لە خاچەکە بهێنرێتە خوارەوەو بۆ هەرشوێنێکی دەبەن، بیبەن تاکو ئەم مەسەلەیە کۆتای پێ بێت.

یەهوودییەکان گوتیان کە دوای ئەوەی تەرمی عیسایان هێنایە خوارەوە، لەو باخەی کە لەنزیك شوێنی لەسێدارەدانەکەدایە ئەسپەردەی بکەن، سەرنجم دا لە کاتێکدا کە گەورەکانی جوولەکە لەگەڵ فەرمانداردا قسەیان دەکرد، تەنها یەکێکیان بە نوێنەری قسەی دەکرد و ئەوانی تر خۆیان نەدەکێشایە ناو قسەکانەوە. ئینجا ئیتر تێگەیشتم ئەو کەسەی کە بە نوێنەری یەهوودییەکان نێردرابوو کە لەلایەن ئەوانەوە قسەی دەکرد، بەجۆرێ گفتوگۆی دەکرد کە گومانم برد لە هاوڕێ و لایەنگرانی عیسا بێت.

دوای ئەوەی گفتوگۆی یەهوودییەکان تەواو بوو و کەوتنەڕێ و لە حەوشەی قەڵاکە چوونە دەرێ، "پونتوس پیلات" بە دەورووبەرەکەی خۆی گوت: بەڵێ خۆیەتی، ئایا ئەم پیاوەی کە قسەی دەکرد، "یوسفی ئەریماتی"، ئەندامی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان نەبوو؟

دەورووبەر گوتەکەی فەرمانڕەوایان بەڕاست دانا و گوتیان: بەڵێ، خۆیەتی.

فەرماندار گوتی: ئەو پیاوەی کە ئەمڕۆ بەرگری لە عیسا دەکرد و دەیگوت دەبێ تەرمەکەی لەخاچ بێتە خوارەوە و لەو باخەدا ئەسپەردە بکرێ، بۆچی لەلای ئەنجومەنی باڵا لایەنی عیسای نەگرت تاوەکو نەکوژرێ؟

لەو کاتەدا "ئادان ئابر" منی نیشانی فەرماندار دا و سەرنجی ئەوی بۆلای من ڕاکێشا. منیش دوو هەنگاو لێوەی نزیك بوومەوە و بە ڕێزەوە سلاوم کرد و ناوی خۆم پێ گوت. ئەو هەر کە منی بینی ناسیمی و، دەرکەوت کە پیاوێکی خاوەن هزری بەتوانایە و گوتی: "مەزن تیوس"! من باش تۆ دەناسم و دەزانم کە باوکت ئەستێرەناسێکی گەورە بوو. بەڵام بەداخەوە، لە ڕۆژێکی باشدا نەهاتوویت بۆ قودس، چونکە ئەمڕۆ بەهۆی تۆفانی گەرد و خاکەوە هەوا تاریك بوو پاشان بوومەلەرزە ڕووی دا، بەڵام ماڵەکانی ناو شار وێران نەبوون. ئینجا یەکێك لە ڕووداوە ناخۆشەکان ئەوە بوو کە عیسایان لەخاچ دا. پێموایە تۆش ئەوت بە خاچەوە بینیوە. بەڵام ئەم ڕووداوە تا ساڵێکی تر بە تەواوی فەرامۆش دەکرێت و هیچ کەسێ یادی عیسا ناکاتەوە.

فەرمانداری گشتی"یودە" بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی من بێت، گوتی: ژنەکەم هەرچەندە پێش نیوەڕۆی ئەمڕۆ نەخۆش بوو، بەڵام بە بینینی ئێوە خۆشحاڵ دەبێت و پێموایە ئێستە حاڵی باشتر بووە و دەتوانێ لەگەڵ ئێمە نانی ئێوارە بخوات. خۆیشم باش نیم و ئازاری ڕۆماتیسمەی کۆنم سەری هەڵداوەتەوە، لەو کاتەدا ئاماژەی بۆ بورجی قەڵاکە کرد و گوتی: هەرچەندە گیانم ئازاری هەیە، بەڵام کاری سەرەکی من لێرە ئەوەیە کە بە پلیکانەکانی ئەم بورجەدا بڕۆمە سەرەوە و پیایدا بێمە خوارەوە.

بۆم دەرکەوت شوێنی ئیشی فەرماندار لەسەر ئەو بورجەیە و بۆیە ناچارە ڕۆژی چەند جارێك بە پلیکانەکاندا بچێتە سەرەوەو پیایدا بێتە خوارەوە. هەرچەندە حاکم دەیگوت کە نەخۆشی ڕۆماتیسمە کۆنەکەی سەری هەڵداوەتەوە و هەمو گیانی ئازاری هەیە، بەڵام چوست و چابوك دەهاتە بەرچاو و هەروەها هەرچەندە کەمێك قەڵەو بوو بەڵام

هەڵسوکەوتی خێرای هەبوو. لە ڕابردودا کە "پونتوس پیلات"م لە"ڕۆم" بینیبوو، قژی سەری پڕ بوون. بەڵام ئەو ڕۆژە بینیم موی سەری بڕێك ڕوتاوەتەوە و نیوەی تاس بووە و بۆئەوەی پێستی سەری دەرنەکەوێت، ئەو بڕە قژەی کە ماوەتەوە بەجۆرێك شانەی دەکات کە پێستی سەری دابپۆشێت، بەڵام ئاشکرایە بەم نزیکانە هەموی سپی دەبێت. من دەمزانی کە "پونتوس پیلات" لە پیاوە دیارەکانی ڕۆم نەبوو و، بەرز بوونەوەی پلە و دەرکەوتنی کاتێك دەستی پێ کرد کە لە گەڵ "کلودیا"دا بوونە هاوسەر و، لەبەرئەوەی خانەوادەی ژنەکەی لە خانەوادە ناودار و ناسراوەکانی ڕۆمە، بۆیە توانی پلەی فەرمانداری گشتی "یودە" بەدەست بهێنێت.

بەشێوەیەکی گشتی من، فەرمانداری گشتیم وا دەهاتە بەرچاو کە پیاوێکی ئێسك سوکە و بۆم دەرکەوت کە زۆر حەزی لەوەیە ئەرکی خۆی لە "یودە" بەباشی ئەنجام بدات و بەپێی یاسا ڕەفتار بکات و دادگەری بکاتە قوربانی لایەنگری ئەم و ئەو. بۆیە ئەو ڕۆژە بە لەخاچدانی عیسا زۆر ناڕەحەت بوو، چونکە دەیزانی لەسێدارەدانی ئەو پیاوە چاکە، ئەویش بە ئەشکەنجەدان، بە پێچەوانەی دادگەریەوەیە.

من سەیرم لەوە دەهات کە بۆچی فەرماندار لە حەوشەی قەڵادا پیاسە دەکات و ناچێتەوە بۆ ژورەکەی خۆی، بەڵام ئەو خۆی هۆی پیاسەکردنی خۆی ڕونکردەوە و گوتی: ئەمشەو، شەوی شەممەی جوولەکەکانە و جەژنی گەورەی ئەوان دەستی پێ کردووەو بۆیە پێشبینی دەکەم دیسان ئیشیان پێم دەبێت و ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ ژورەکەی خۆم لەسەر بورجی ڕۆم و، دوای ئەوەی یەهوودییەکان هاتنەوە، ناچار دەبم بێمە خوارەوە. بۆیە لە حەوشەکەدا پیاسە دەکەم بۆئەوەی ئەگەر یەهوودییەکان هاتنەوە، بتوانم پێشوازیان لێ بکەم. حکومەتی ڕۆم کە منی بۆ ئێرە ناردووە، وادەزانێ من ئاغای جوولەکەکانم، لەکاتێکدا من وەك نۆکەری ئەوانم.

فەرماندار ڕێگەی پێدام لەگەڵی پیاسە بکەم، پاشان لێی پرسیم: تۆ پەرستگای یەهوودییەکانت دیتووە؟

گوتم: نەخێر، بەڵام زۆر حەز دەکەم پەرستگاکەیان ببینم.

فەرماندار گوتی: ئێمەی ڕۆمییەکان تەنها دەتوانین بەشێکی بچوکی پەرستگاکە ببینین. یەهوودییەکان مۆڵەت نادەن ئێمە بچینە ناو بەشی سەرەکی پەرستگا و میحرابەکەوە. ئەوان دەڵێن تەنیا پیاوێك دەتوانێ بچێتە ناو بەشی سەرەکی

پەرستگاکەوە کە خەتەنە کرابێت. جوولەکەکان لەم بەشەی پەرستگادا ئەوەندە توندن کە ئەگەر گومانیان لە یەکێ هەبێت، یەهوودی نەبێت، ئەوا لەناو خودی میحرابەکەدا جەستەی دەپشکنن و ئەگەر ببینن و بزانن خەتەنە نەکراوە، یەکسەر بەردبارانی دەکەن، بەم شێوەیە دەیبەستنەوە بە شتێك یان بە ستونێکەوە تاکو نەتوانێت جوڵە بکات و لە دوورەوە بەردی تێ دەگرن و، ئەوەندەی بەرد لێ دەدەن تا لەشی دادەوەشێ و لەژێر ئەو هەموو بەردەدا ئەسپەردە دەبێ.

تا ئەوکاتە فەرمانداری گشتی لەبارەی ڕۆمەوە قسەی نەکردبوو و لەو کاتەدا باسی ڕۆمی هێنایە پێشەوە و لێی پرسیم: هەواڵە تازەکانی ڕۆم چییە؟

لە وەڵامیدا گوتم: من ئاگاداری بارودۆخی ڕۆم نیم، چونکە لە وەرزی زستاندا لە ئەسکەندەریە بووم و لەوێ لە کتێبخانەدا دەمخوێندەوە و، من لە"میسر"ەوە هاتووم بۆ"یودە".

کاتێ فەرماندار زانی من لە "میسر" بووم و لە "ڕۆم"ەوە نەهاتووم، هەستم کرد خەیاڵی ئاسوودە بووە. تا ئەو کاتە فەرماندار بایەخی پێ دەدام، چونکە وایدەزانی من لە ڕۆمەوە هاتووم و نەیدەزانی لە کام گروپی سیاسیدام. بەڵام دوای ئەوەی کە زانی من لە ڕۆمەوە نەهاتووم، خەیاڵی ئاسوودە بوو و زیاتر خۆشەویستی بۆ من دەردەبڕی و گوتی: وەرە بچین بەرەو بورجەکە تاکو لەسەرەوە پەرستگای یەهوودییەکانت پێ نیشان بدەم، چونکە بورجی ئەم قەڵایە بەسەر پەرستگادا دەڕوانێت.

من و فەرماندار چووینە سەر بورجەکە و چاوم کەوت بە دیمەنی پەرستگای گەورەی جوولەکەکان و بینیم ئەو پەرستگایە چەندین حەوشەی هەیە. فەرماندار یەکێ لە حەوشەکانی کە ژمارەیەکی زۆر خەڵکی تێدا کۆببوویەوە، پێ نیشان دام و گوتی: ئەو حەوشەیەی کە دەیبینی بچوکترین شوێنی پەرستگاکەیە و ئەو کەسانەی کە لە سەر ئایینی جوولەکە نین دەتوانن بچنە ناو ئەو حەوشەیە. ئەو حەوشە بچەکە، بەو شێوەیەی کە دەیبینی، بازاڕێکە و ژمارەیەك لە پارەگۆڕەوەکان لەوێدا خەریکی مامەڵە کردنن، بەڵام ئەو بێگانانە کە لەو حەوشەیەدا خەریکی مامەڵە کردنن، مۆڵەتیان نییە بچنە ناو بەشەکانی تری پەرستگاوە. ئینجا حەوشەیەکی تری پێ نیشان دام و گوتی: ئەوێ حەوشەی ژنەکانە و ژنە یەهوودییەکان لەوێدا کۆدەبنەوە و ئەو لایەی تریش کە دەیبینی، حەوشەی پیاوانە. ئینجا بینایەکی پەرستگاکەی پێ نیشان دام و گوتی:

ئەوێش پیرۆزترین شوێنی پەرستگایە و هیچ کەسێ بۆی نییە بچێتە ناو ئەو شوێنە، تەنیا پێشەوای ڕۆحانی گەورەی جوولەکەکان نەبێ. ئەویش ساڵی جارێك پێ دەنێتە ئەو شوێنە.

گوتم: من پێش ئەوەی بێم بۆ ئێرە لە میسر بیستبوم، لەو شوێنەی کە تۆ دەیڵێی پیرۆزترین شوێنی پەرستگایە، ئێسکی سەری گوێدرێژێکیان تیاداناوە و وەك هەندێك دەڵێن باوەڕیان بەو ئێسکە هێناوە و جوولەکەکان ئەو ئێسکە دەپەرستن.

فەرماندار گوتی: ئەوە تەنیا ئەفسانەیە، ئەگینا لەوێدا هیچ شتێکی لێ نییە و ئەو بینایە بەتاڵە.

گوتم: مەگەر تۆ چوویت بۆ ئەوێ، بە چاوی خۆت بینیوتە کە بەتاڵە؟

فەرمانداری گشتی گوتی: من نەچووم بۆ ئەوێ، بەڵام کاتێ پەرستگا کۆنەکە ئاگری گرت و وێران بوو، فەرمانداری گشتی "یودە" لەگەڵ ژمارەیەك لە ئەفسەرە ڕۆمییەکان پێی خستە ناو شوێنی پیرۆزی پەرستگاکە و ئەوێی بە بەتاڵی بینیوە.

کاتێ من و فەرماندار خەریکی گفتوگۆ بووین، ئاگاداریان کردینەوە کە دەستەیەك لە یەهوودییەکان هاتون و گەرەکیانە چاویان بە فەرماندار بکەوێت. "پونتوس پیلات" گوتی: ئێستە بڕوام پێ بکە کە من جوولەکەکان باش دەناسم و بەو جۆرەی کە گوێت لێ بوو، پێشبینیم کرد کە دیسان دێنەوە بۆ لای من. بەڵام نازانم ئەم جارەیان چ داواکاریەکیان هەیە.

ئێمە لەسەر بورجەکە هاتینە خوارەوە و پێمان خستە ناو حەوشەکەوە و یەهوودییەکان بە ڕێزەوە لە فەرمانڕەوا نزیك بوونەوە. فەرماندار پرسی: چی بووە کە بۆ دووەمین جار دێن بۆ لام؟

دیسان یەکێ لە یەهوودییەکان بە نوێنەری ئەوانی تر دەستی بە قسەکردن کرد و گوتی: ئەی فەرماندار، ئێمە بۆئەوە هاتووین بۆ لای تۆ تا مۆڵەتمان بدەیتێ، لە دوای تەواو بوونی ڕۆژی شەممە، کاتێ جەژنی گەورەی ئێمە دەست پێ دەکات، تەرمی عیسا بسوتێنین. فەرماندار بە سەرسامیەوە پرسی: گەرەکتانە تەرمی عیسا لەناو ئاگردا بسوتێت؟! ئەو پیاوەی کە بە نوێنەری ئەوانی دیکە قسەی دەکرد، گوتی: دوای ئەوەی شەممە تەواو بوو، ئێمە بەبۆنەی جەژنی گەورەی خۆمانەوە ئاگر دەکەینەوە و ئاگری ئێمە سێ شەو و سێ ڕۆژ بەردەوام دەبێت. ئەی فەرماندار، تۆ دەزانی کە ئێمە هەندێ

جار تەرمی دزەکان دەسوتێنین و لەبەرئەوەی لە جەژندا ئاگر دەکەینەوە، بۆیە تەرمی ئەو دزەی کە لەگەڵ عیسادا لەخاچ دران، دەسوتێنین. دەمانەوێ مۆڵەتمان بدەیتێ تا تەرمی عیساش بخەینە ناو ئاگرەوە و بیسوتێنین.

فەرماندار گوتی: ئەمڕۆ پێش ئەوە دەستەیەك لە یەهوودییەکان هاتن بۆلای من و پێیان گوتم کە دەیانەوێ دوای ئەوەی تەرمی عیسایان لەخاچ هێنایە خوارەوە، لەو باخەی کە لە شوێنی لەسێدارەدانەکەدایە ئەسپەردەی بکەن. ئێستە ئێوە چۆن دەتانەوێ تەرمەکەی بسوتێنن؟

ئەو پیاوەی کە نوێنەری یەهوودییەکان بوو، گوتی: ئێمە وادەزانین هەرکاتێ تەرمی عیسا ئەسپەردە بکەین، ئەوا لە داهاتودا گۆڕەکەی دەبێت بە زیارەتگای لایەنگرەکانی، بەڵام ئەگەر لاشەکەی بسوتێنین و بەتەواوی لەناوی بەرین، لایەنگرەکانی ناتوانن ئەو بپەرستن.

فەرماندار گوتی: من بۆ سوتاندنی لاشەی عیسا ڕەزامەندی دەرنابڕم و ئێوە دەبێ لاشەکەی بە خاك بسپێرن.

نوێنەری جوولەکەکان گوتی: ئاخر ئەگەر ئێمە لاشەی ئەم پیاوە بەخاك بسپێرین، لە داهاتودا گۆڕەکەی کێشەمان بۆ دەنێتەوە.

فەرمانڕەوا پشتی کردە ئەو پیاوە و یەهوودییەکان و دوورکەوتەوە تا نیشانیان بدات کە ئیتر حەز ناکات لەبارەی ئەو بابەتەوە قسە بکات. منیش لە فەرمانڕەوا نزیك بوومەوە و پێم گوت: وادەردەکەوێت مەسەلەی عیسا، تەنانەت دوای مردنیشی کێشەی بۆ دروست کردویت.

فەرمانڕەوا گوتی: ڕاست دەڵێی. بە داخەوە ئەم بابەتە دوای مەرگی ئەویش کێشەی بۆ من دروست کردووە. من پیاوێکی سوکەسەرە نیم، بەڵام بووم بە دارە دەستی هەڵوێستی جوولەکەکان و ئەوان منیان ناچار کرد تا ڕەزامەندی بۆ لەسێدارەدانی عیسا دەربڕم. دەبێ بڵێم جوولەکەکان خۆیان عیسایان لە نیوەی شەودا دەست بەسەر کرد، نەك من. دوای ئەوەی ئەویان بە تۆمەتی کوفر دەستگیر کرد، دەیانتوانی بەرد بارانی بکەن و بەبێ دەست تێوەردانی حکومەتی ڕۆم بیکوژن. هەڵبەت ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان لێرە ناتوانن فەرمانی لەسێدارەدان دەربکەن و جێ بەجێی بکەن. هەرکاتێ ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان بیەوێت کەسێك لەسێدارە

بدات، دەبێ بە ڕەزامەندی فەرمانڕەوا بێت و فەرمانی لەسێدارەدان دەربکات. بەڵام چەندین جار ڕووی داوە کە خودی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان فەرمانی لەسێدارەدانی دەرکردووە و جێ بەجێشی کردووە، کاتێکیش ئێمەی ڕۆمییەکان پێمان گوتن بۆچی ئەو کەسەیان کوشتووە، ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان وەڵامیان دایەوە کە ئەوان هیچ تاوانێکیان نییە و، هەروەها فەرمانی لە سێدارەدانیان دەرنەکردووە، بەڵکو خەڵکەکە بەهۆی تورەییەوە هێرشیان بۆ تاوانبارەکە بردووە و بەردبارانیان کردووە. لەبارەی عیساشەوە دەیانتوانی وا بکەن و بیکوژن و، پاشان بڵێن لەبەرئەوەی کوفری کردووە، خەڵك تووڕە بوون بۆیە کوشتوویانە، بەڵام یەهوودییەکان مەبەستیان ئەوە بوو کە حکومەتی ڕۆمیش بێننە ناو کێشەکەوە تاکو بگوترێ حکومەتی ڕۆم عیسای کوشتووە نەك جوولەکەکان.

گوتم: ئەی فەرمانڕەوا، من پیاوێکی خورافات و خەیاڵ پەرست نیم، بەڵام ئەمڕۆ کاتێ عیسا لەخاچ درا، لێرە بووم و بینیم کە ئاسمان تاریك بوو و زەوی هاتە لەرزین و گیانداران ترسیان لێ نیشتبوو، وەك ئەوە وابوو کە زەوی و ئاسمان بەهۆی لەخاچ درانی عیسا خەفەتبار بووبن.

فەرمانڕوا بەتوندی سەیرێکی منی کرد و گوتی: ئەوەی کە دەیڵێی، لەو قسانە دەچێ کە ئەمڕۆ ژنەکەم دەیگوت و، ئەویش تاریکیی ئاسمان و بوومەلەرزەکەی دەگەڕاندەوە بۆ لەخاچ درانی عیسا. بەڵام من ئەوە لە تۆ، کە پیاوێکی ڕۆمیت، چاوەڕێ ناکەم تا باوەڕ بە هەندێ شت بکەیت کە خەڵکی عەوام و لابەلا باوەڕیان پێی هەیە.

ئیتر من لەگەڵ فەرمانداردا سەبارەت بە عیسا قسەم نەکرد، چونکە دەمزانی تووڕە دەبێت.

## لەسەر خوانی ئێوارەی فەرمانڕەوادا

فەرمانڕەوای گشتی کە دەیویست بچێتەوە مەنزڵی خۆی، لە من جیابوویەوە، بەڵام پێش ئەوەی لێم جیابێتەوە گوتی: بۆ نانخواردنی ئێوارە چاوەڕێتم و دوای ئەوەی دنیا تاریك بوو و چراكان ڕۆشن كران، تۆ بۆ نانخواردن وەرە بۆ مەنزڵەكەم. من ڕۆشتم بۆ ئەو بەشەی قەڵا، كە شوێنی پشوودانی ئەفسەرە ڕۆمییەكان بوو، سەیرم كرد ئەفسەرەكان لەبەرئەوەی كاریان تەواو بووە و كاتی پشوویان هاتووە، خەریكی خواردنەوەن. كاتێ من چوومە جێی خڕبوونەوەی ئەفسەرەكان، گوێم لێ بوو ئەوان لەبارەی لەخاچدانی عیسا قسە دەكەن و دەبێژن كە فەرمانڕەوای گشتی نەیدەویست بیكوژێت و پێداگری جوولەكەكان ئەویان ناچار كرد فەرمانی لەسێدارەدان دەربكات. ئینجا من لە گفتوگۆی ئەفسەرەكان بۆم دەركەوت كە بوومەلەرزەكەی ئەو ڕۆژە زۆر كاری لەوان كردووە و ڕوودانی بوومەلەرزەكە لەگەڵ كوشتنی عیسا، بەبێ هۆ نازانن. ئەفسەرە ڕۆمییەكان كە هەموویان بەرپرسی بەشەكانی لژیون بوون، دەیانگوت كە عیسا خاوەنی گەورەیی بووە و دەیتوانی نەخۆشەكان چاك بكاتەوە و تەنانەت چەند ڕۆژێك پێش ئەوەی لەخاچ بدرێ، مردوویەكی، كە ماوەی چەند ڕۆژێ لە گۆڕ نرابوو، زیندوو كردۆتەوە.

من پرسیم: ئەو مردووە لە كوێ زیندوو بوویەوە؟

ئەفسەرێكی ڕۆمی وەڵامی منی دایەوە: لێرە، واتە لە گۆڕستانی شاردا.

لەو ئەفسەرەم پرسی: تۆ ئەو مردووەت بینیوە كە زیندوو بۆتەوە؟

ئەو ئەفسەرە گوتی: من خۆم ئەوم نەبینیوە، بەڵام ژمارەیەكی زۆر خەڵك بینیویانە و دەزانن ناوی چیە. ئەوەی كە بووە هۆی ئەوەی یەهوودییەكان عیسا بكوژن، ئەمەبوو كە زانیان ئەو پیاوە مردوو زیندوو دەكاتەوە و خاوەنی ئەم مۆجیزانەیە، بۆیە زۆر ترسان و بڕیاریاندا بیكوژن.

من ئەگەرچی ئەو ڕۆژە بینیم كە دنیا تاریك بوو و هەستم كرد زەوی دەلەرزێ، بەڵام نەمتوانی باوەڕ بە مەسەلەی زیندوو كردنەوەی مردوو بكەم، بەڵام لەبارەی ئەوەوە لەگەڵ ئەفسەرە ڕۆمییەكاندا قسەم نەكرد، چونكە دەمزانی بێسوودە و لەبەرئەوەی

ئەوان باوەڕیان بە زیندوو بوونەوەی مردوو کردووە، بۆیە ناتوانن تێ بگەن کە مردوو زیندوو نابێتەوە. ئەو شتانەی تر کە لە ئەفسەرە ڕۆمییەکانم بیست ئەوە بوو کە کۆمەڵێك لە یەهوودییەکان  لە خاکێکی بیاباندا، لە نزیکی ڕووباری دەریای مردوودا (بحرالمیت) کۆبوونەتەوە و لە خەڵك جیابوونەتەوە و لەوێ چاوەڕوانی عیسا دەکەن.

کاتێ شەو داهات و چراکان ڕۆشن کران، من لە جێی خۆم هەستامەوە و بە ئەفسەرەکانم گوت کە دەبێ بچم، چونکە فەرمانڕەوا بۆ نانخواردنی ئێوارە چاوەڕوانی منە. ئەوان گوتیان: دوای نانخواردنی ئێوارە وەرەوە و شەو لە گەڵ ئێمە بیگوزەرێنە، چونکە ئێمەش لە ڕۆژانی جەژنی جوولەکەکاندا سوودمان بینیوە و ئەمشەو جەژنێکی بچوکمان ساز داوە و چەند گۆرانی بێژێکی"سریانی" دێن و سەرقاڵمان دەکەن. تۆش بێیت تا لە گەڵ ئێمە بیت.

من بەڕێ کەوتم و چوومە ناو مەنزڵەکەی فەرمانڕەوا و دیار بوو کە فەرمانڕوا و ژنەکەی چاوەڕێی منن. غولامێك ڕێنمایی کردم بۆ ئەو ژوورەی کە فەرمانڕەوا و ژنەکەیی لێ بوو.

کاتێ چوومە ژوورەوە، بینیم پێداویستی نانخواردن ئامادە کراوە. ژنەکەی فەرمانڕوا کاتێ منی بینی، ئەوەندە خۆشحاڵ بوو کە هەستایەوە و گوتی:"مەرن تیوس" ئەمشەو بەتایبەت بە بینینی تۆ زۆر شادومانم، چونکە ئەمڕۆ بۆ من زۆر ناخۆش بوو.

شێوەی"کلودیا" زۆر گۆڕابوو. بۆم دەرکەوت پرچی سپی بووە، چونکە بە خەنە پرچی ڕنگاو ڕەنگ کردبوو. بەلاّم چاوەکانی ئەو ژنە، لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵ، هێشتا هەر جوان بوو. فەرمانڕوا بە وتەی ژنەکەی خۆی، بێزار بوو و ئەو دوو پیاوەی تریش کە لەوێدا بوون بێزار بوون. یەکێ لەو دووانە، فەرماندەی مەخفەر بوو، واتە فەرماندەیی هێزەکانی ڕۆمی لەو شارەدا لە ئەستۆدا بوو و، دووهەمیشیان "ئادان ئابر" بوو کە منی برد بۆ قەلاّی"ئەنتۆنییە".

فەرمانڕەوای گشتی گوتی:"کلودیا"، گەرچی ئەمڕۆ بێحاڵ boویت، بەلاّم ئاگات لە هەڵسوکەوتت بێت.

"کلودیا" بە مێردەکەی گوت: بێحاڵی من بەهۆی تۆوەیە. من بە تۆم گوت عیسا کە پیاوێکی پیرۆزە، ئازار مەدە، کەچی تۆ ئەوت بەشێوەیەکی دڵتەزێن لەناو برد. من

پێموایە کە ئەگەر فەرمانڕەوا لە سەرکەوتنەکانیدا قەرزاری هاوسەرەکەی نەبوایە، بێگومان بە گژیدا دەچوو و لەوانەشە بیکردایەتە دەرەوە لەو ژورە. بەلام "پونتوس پیلات" دەیزانی سەرکەوتنەکانی ئەو بەهۆی ژنەکەیەتی و، ئەو ژنە لە ڕۆمادا خاوەنی پلەوپایەیە و ئەگەر دوژمنایەتی لەگەلْ بکات، ئەوا بە زەرەری مێردەکەی کۆتایی دێت.

"کلودیا" ڕووی کردە من و گوتی: لە تەنیشت منەوە دابنیشە.

من بەقسەیم کرد و لەتەنیشت "کلودیا" دانیشتم. ئینجا بەپێی نەریتی ڕۆمییەکان لەسەر ئەو کورسیە ئاسوودە بەخشانەی کە لە چواردەوری مێزێکی نزم، کە خواردەمەنییەکانی لەسەر دانرابوو، ڕاکشاین و دەستمان بە نانخواردن کرد. هەندێ لە خواردنەکان، خۆمان بەدەستی خۆمان لەسەر مێزەکە هەلْمان دەگرت و دەمان خستە ناو دەممان. هەندێکی تریان غولامەکان پێیان دەداین و لە بەردەمماندا دەفری خواردنەکەیان بە دەستەوە دەگرت و ئێمەش چەند تیکەیەکمان لێ دەنان، ئینجا ئەو دەفرەیان دەبردەوە و خواردنی تریان دەهێنا. من لەو جۆرە پیاوانەم کە وەکو هەندێ لە ڕۆمییەکان خۆراك ناسم[8] و ناتوانم چێشتی خراپ[9] بخۆم. ئەگەر بچم بۆ شوێنێك و لەو شوێنە چێشتی خراپیان لێنابێت، تیکەنانێکی وشك لە هەموو ئەو چێشتە دروست کراوە بەباشتر دەزانم. من پێموایە هەموو ڕۆمییە خانەدانەکان بەم شێوەیەن و هەر لەسەرەتای دەست بەکاربوونیان، خۆراك ناسن، چونکە باشترین خواردنی دنیا لە ڕۆمدا دروست دەکرێت و چێشت لێنەرەکانی ڕۆم لە هەموو دنیا ناوبانگیان هەیە. لەبەرئەوەی ڕۆمییە خانەدانەکان لە مندالْیەوە خوو بە دروست کردنی خواردنی باشەوە دەگرن، بۆیە خۆراك ناس دەردەچن و دوای ئەوەی کە گەورە بوون، ناتوانن خۆراکی خراپ دروست بکەن و بیخۆن. من وای بۆ دەچم شیولێنەری فەرمانڕەوا خەلْکی ڕۆم بێت، چونکە هەموو ئەو خواردنانەی کە ئەو شەوە بۆ ئێمەیان هێنا، تامی خواردنەکانی ڕۆمییان دەدا و، بۆ دروست کردنیان باشترین جۆری ئازوقە و داودەرمانیان بەکارهێنابوو. بەلام باشترین خواردن کە ئەو شەوە خواردمان، ئەو

---

[8] مەبەست ئەوەیە کە خواردنی باش نەبێ نایخوا و هەرکەسێ وای کرد ئەوا پێی دەلێن (خۆراك ناس) واتە دەتوانێ خواردنی باش دروست بکات، ئەوەش دیارە بە هەژار و کەم دەرامەتەکان ناکرێ. دیارە زۆربەی زۆری ڕۆمانییەکان لەو کاتەدا دەولْەمەند بوون.( و. کوردی)

[9] مەبەست لە خواردەمەنی خراپ ئەوە نییە کە بە کەلْکی خواردن نایەن بەلْکو خواردنی سادەیە، چونکە ڕۆمییەکان لەو سەردەمەدا خوادنی چەور نەبوایە نەیان دەخوارد. نمونە لای خۆمان وەك ئەوە وایە خواردنی نیسك و ساوەر بە خراپ بزانێ. (و. کوردی)

خواردنه بوو که له کۆتاییدا خواردمان. لەو کۆتاییەدا، دوو غولام دەفریکی گەورەیان هێنا، دەفرەکە ڕووپۆشێکی بەسەرەوە بوو و لەسەر مێزەکە دایان نا. دوای ئەوەی دەفرەکەیان هێنا، فەرمانڕەوای گشتی، هەموو ئەو خزمەتکارانەی کە لە ژووری نانخواردن بوون ئیزن دا و بە ئێمەی گوت، کە تا ئەوکاتە لەسەر کورسیەکان درێژ کشابووین[10]، هەستنەوە!

لەبەرئەوەی خزمەتکارەکان لەژوورەکە چووبوونە دەرەوە، ئێمە نەماندەتوانی بە درێژکشاوی نان بخۆین، چونکە کەس نەبوو خواردنمان پێ بدات. دوای ئەوەی کە هەستاینەوە و دانیشتین، فەرمانڕەوا خۆی ڕووپۆشی دەفرەکەی لابرد و بۆنی خۆشی خواردنەکەش هات بە لوتماندا. سەرم لە دەفرەکە نزیك کردەوە و بینیم لەو دەفرەدا بەرازێکی برژاوی تێدایە. فەرمانڕەوا خۆی کێردێکی گرت بە دەستەوە و ئەو بەرازەی بەش بەش کرد و داوای لە ئێمە کرد کە هەر یەکەمان بەشێك لەو بەرازە برژاوە هەڵبگرین و بیخۆین. ئینجا گوتی: لە ڕۆم وادەزانن من، کە لێرەدا فەرمانڕەوای گشتیم، خاوەنی دەسەلاتم و ئەوەی حەزم لێی بێ ئەنجامی دەدەم. لەکاتێکدا یەهوودییەکان تەنانەت نانخواردنەکانیشمان دەخەنە ژێر چاودێرییەوە و ئێمە ناتوانین بە ئارەزووی خۆمان نان بخۆین.

من پرسیم: جوولەکەکان بە چ جۆرێ نانخواردنی ڕۆمییەکان دەخەنە ژێر چاودێرییەوە؟

فەرمانڕەوای گشتی گوتی: ئەو ڕۆمییانەی کە لێرەن، ڕێگەیان پێ نادرێت گۆشتی بەراز بخۆن، چونکە خواردنی گۆشتی بەراز لە ئاینی یەهوودییەکاندا قەدەغە کراوە. ئێمە لەم بەشەدا ئەوەندە خۆمان دەپارێزین کە ناتوانین لەپێش چاوی خزمەتکارەکانیشماندا گۆشتی بەراز بخۆین بۆئەوەی نەوەك بگاتە گوێی یەهوودییەکان. بۆیە دوای ئەوە بەرازە برژاوەکەیان هێنا، هەموو خزمەتکارەکانم لەم ژوورە کردە دەرەوە تاکو ئێمە نەبینن کە گۆشتی بەراز دەخۆین.

من گوتم: بەلام دوای ئەوەی کە گەشتمە ناو "یودە"، لە چەندین شوێندا مێگەلی بەرازم بینی.

---

[10] دیارە کورسیەکانیان بەجۆرێك بووە کە توانیویانە لە سەری درێژ بکشێن.( و. کوردی)

فەرمانڕوا گوتی: لە"یودە"دا بەراز زۆرە، بەڵام جوولەکەکان گۆشتی بەراز ناخۆن، بەتایبەت هێنانە ناوەوەی بەراز بۆ ئەم شارە قەدەغەیە. ئەم بەرازەی کە ئێستە دەیخۆین، بە پۆستەبەرێکی دەوڵەتی بەناوی نێردراوێکی دەوڵەتی، لە سندوقێکی تایبەتدا نێردراوە بۆ ئێرە و جوولەکەکان نەیانزانیوە بەراز لەناو ئەو سندوقەدایە، ئەگینا مەحاڵ بوو بهێڵن ئەم بەرازە بێتە ناوەوە و ئەمشەو تامی دەممان خۆش بکات.

"ئادان ئابر" گوتی: لەبەرئەوەی باسی بەرازتان کرد، ڕووداوێکم بیرکەوتەوە کە گێڕانەوەی بێ هۆ نییە. ڕووداوەکە ئەمەیە کە عیسا، ئەوەی ئەمڕۆ درا لەخاچ، نزیکەی هەزار بەرازی خستە ناو ڕووباری ئەردەن و، ئاو بردنی.

ئەفسەرە ڕۆمییەکە دوای گێڕانەوەی ئەو ڕووداوە پێکەنی، بەڵام فەرمانڕەوا بەشداری نەکرد لە پێکەنینەکەیدا و کەمێك ڕووی گرژ کرد. ئەفسەرە ڕۆمییەکە، کە بینی فەرمانڕەوا بە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوە ناڕەحەت بووە، پێکەنینەکەی تەرك کرد و فەرمانڕەوا گوتی: ئێمە بە پێی پێویست لەبارەی عیساوە قسەمان کردووە و باشتر وایە ئیتر ئەو مەسەلەیە تازە نەکرێتەوە.

بەڵام "کلودیا" بە تووڕەییەوە ڕووی کردە مێردەکەی و پێی گوت: عیسا پیاوێکی پیرۆز بوو و خاوەنی مۆجیزەی گەورە بوو. تۆ ئەگەر بە ڕۆمییەکی خانەدان دەژمێردرای، نەدەبوو ئەو بکوژیت. ئایا هیچ بیری ئەوەت کردۆتەوە کە لەمەودوا ئەم خوێنەی عیسا داوێنت لەکەدار دەکات؟ مەگەر خۆت نەتدەگوت کە عیسا بێ تاوانە؟ بۆچی بە ئەشکەنجەدان پیاوێکی بێگوناهت کوشت؟ تۆ دەڵێی کە لەسەر پێداکری و زۆرکردنی جوولەکەکان ئەو پیاوە ستەم لێکراوەت کوشت، بەڵام ئایا تۆ فەرمانڕەوای گشتیت یان جوولەکەکان فەرمانڕەوای ئەم شارەن؟

"پونتوس پیلات" گوتی: گومانی تێدا نییە کە من فەرمانڕەوای ئەم وڵاتەم. بەڵام لەبارەی عیساوە، ئەگەرچی کە دەیانگوت مۆجیزە دەکات، بەڵام من مۆجیزەیەکم لێ نەبینی و "هیرود"، پادشای یەهوودییەکانیش هیچ مۆجیزەیەکی لێ نەبینیبوو.[11] بابەتی کوشتنی عیسا هۆکاری سیاسی لە پشتەوەیە و من دەستم لە کوشتنی عیسادا نییە. تەنها لە ڕووی سیاسی و گونجاندنی ڕۆمییەکان لە گەڵیاندا، ڕەزامەندیم

[11] لەو سەردەمەدا لە کیشوەری (یودە)دا چەندین پاشای یەهوودی (هیرود) دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست و نابێ ئەو (هیرود)ەی کە فەرمانڕەوای (یودە) گوتی لەگەڵ ئەو (هیرود)ەی کە پەرستگای یەهوودییەکانی دروست کردووە، تێکەڵ بکەین.

دەربڕیوە تاوەکو سیاسەت لەسەر ڕێڕەوی خۆی بەردەوام بێت. سیاسەتی ڕۆم ئەوەیە کە لە مەسەلە بچوك و لاوەکیەکاندا دڵی یەهوودییەکان لە خۆی ڕازی بکات تاکو ئەوانیش ڕەزامەندی لەسەر ئەو بابەتە گرنگانە دەربڕن کە سوودی ڕۆمای تێدایە. مەرگی عیسا بۆ ڕۆم شتێکی گرنگ نەبوو، بەڵام بۆ جوولەکەکان زۆر گرنگ بوو، بۆیە ڕازی بووم بە لەسێدارەدانی تاکو یەهوودییەکان ڕازی بکەم و بێگومان من فەرمانڕەوای "یودە"م و حوکمی من بەردەوامە.

"کلودیا" گوتی: ئەگەر تۆ فەرمانڕەوای "یودە"یت و حوکمی تۆ بەردەوامە، بۆچی لەبارەی گەیاندنی ئاو بۆ ئەم شارە بە پێی پێویست هەوڵت نەدا؟ مەگەر تۆ نەتگوت کە دەبێ ڕووبارێك دروست ببێ و ئاوی لەبەر ڕۆشتووی نوێ بێتە ناو ئەم شارەوە بۆئەوەی خەڵك بەپێی پێویست سوودی لێ وەربگرن؟ بۆچی ئەم بڕیارەی تۆ نەچووە خانەی جێبەجێ کردنەوە؟

فەرمانڕەوا گوتی: مەسەلەی قەرەبوو کردنەوەی کەمیی ئاو، پەیوەندی بە مەسەلەی عیساوە نەبووە و نیشە. بۆ هێنانی ئاو بۆ ئێرە پێویستە جوولەکەکان خۆیان ئاویان بوێت و لەگەڵ یەکدی لەسەر ئەوە ڕێك بکەون کە بڕێك پارە خەرج بکەن بۆ هێنانی ئاو، بەڵام ئەوان نایانەوێ پارە خەرج بکەن تاکو بەپێی پێویست ئاویان هەبێت. منیش خەزێنەی پەرستگای یەهوودییەکانم لەژێر دەستدا نییە تا ئەوەندەی کە دەمەوێ، لێی دەربهێنم و لە پڕۆژەی هێنانی ئاودا خەرجی بکەم.

"کلودیا" بە مێردەکەی گوت: وانییە. لە بابەتی ئاویشدا تۆ کەوتیتە ژێر کاریگەری جوولەکەکانەوە و لەبەرئەوەی ئەوان لەگەڵ دروستکردنی ڕووباری تازەدا دژایەتیان دەکرد، بۆیە لە بڕیارەکەت پاشگەز بوویتەوە. بەڵام لە مەسەلەی عیسادا یەهوودییەکان نەیاندەتوانی ناچارت بکەن تا پیاوێکی بێ تاوان بکوژیت. ئەوان دەتوانن پێت بڵێن مۆڵەتت نییە بەراز بهێنیتە ناو شارەوە، چونکە بە بۆچوونی یەهوودییەکان خواردنی گۆشتی بەراز قەدەغە کراوە. ئەوان دەتوانن پێت بڵێن کە ئێمە ئاوی لە بەر ڕۆشتوومان ناوێ و لەگەڵ ئەو ئاوە کەمەی ئێستای خۆمان دەگونجێین. بەڵام ناتوانن پێت بڵێن کە پیاوێکی بێتاوان بکوژیت.

"ئادان ئابر" ویستی بەهۆی گاڵتەیەکەوە بابەتی گفتوگۆکە بگۆڕێت و گوتی: پڕۆژەی دروستکردنی ڕووباری تازە بۆ هێنانی ئاوی ڕەوانی نەبڕاوە بۆ ناو شار بۆیە

جێبەجێ نەکرا چونکە ژنەکان ئەوەیان نەیاندەویست بۆئەوەی بتوانن بۆ ئاو هێنان یان شتنی جلوبەرگ بڕۆن بۆ سەر بیرەکان یان جۆگەی ڕووبارە کۆنەکە و کاتەکانی خۆیان لە ڕۆیشتن و گەڕانەوەدا بەسەر بەرن و پێکەوە گفتوگۆ بکەن و پێ بکەنن و گاڵتە بە ئەم و ئەو بکەن.

بەلام ئەم گاڵتەیە نەیتوانی "کلودیا" لە بابەتی گفتوگۆ کردن دەربارەی عیسا دوور بخاتەوە. ئەو گوتی: ئەگەر ئەوەندە پەلەیان نەکردایە بۆ کوشتنی ئەم پیاوە بێتاوانە و بیانهێشتایە ڕۆژی جەژنی جوولەکەکان کۆتایی پێ بێت و، گەرموگوڕی و توڕەیی یەهوودییەکان دابمرکایەتەوە، ئەوا ئەم پیاوە ستەم لێکراوە کە ئیتر ڕۆژگاری هاوشێوەی ئەم ڕۆژکارە نابینێ، نەدەهاتە کوشتن. من نامەم بۆ ناردی (لە کاتێکدا ڕووی لە فەرمانڕەوای گشتیەوە بوو) کە ڕۆژ بە ڕۆژ دەستی دەستییان پێ بکە تا ڕۆژی جەژنی گەورەی یەهوودییەکان کۆتایی پێ دێ، بەلام تۆ بە قسەی منت نەکرد و خوێنی ئەم پیاوە سروشت پاکە، دەست و داوێنی تۆی لەکەدار کرد.

"پونتوس پیلات" هەردوو دەستی خۆی وەکو بێ توانایەك ڕاگرت و گوتی: ئەگەر من ئەم پیاوەم نەناردایە تا لەخاچ بدرێ، جوولەکەکان لەلای حکومەتی ڕۆم شکایەتیان لێ دەکردم و ئەو شکایەت کردنەش بۆ من بەگران تەواو دەبوو. پاشان ڕووی کردە من و دوو پیاوەکەی تر کە لەو مەجلیسەدا بوون و گوتی: ئێوە کە خەڵکی ڕۆمن، بڵێن، ئەگەر لەجێی من بوونایە چیتان دەکرد؟ ئایا ئامادە بوون پیشە و ئایندەی خۆتان بۆ پارێزگاری کردنی گیانی جوولەکەیەك کە لەلایەن هاوئایینەکانی خۆیەوە نەفرەتی لێ کراوە، بخەنە مەترسیەوە؟

ئەو پیاوەی کە فەرماندەی مەخفەر بوو گوتی: بە بڕوای من، جوولەکە هەر جوولەکەیە و بەم قامچی و نێزو خاچە نەبێ کەس ناتواتێ لە گەڵیان بگونجێ.

"ئادان ئابر" گوتی: بەلام کاتێك عیسا ماڵئاوایی لە ژیان کرد، زەوی لەرزیەوە، ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە پیاوێکی باش بووە. بەلام ئێستە ئەو مردووە و قسەی ئێمە زیندوی ناکاتەوە.

من گوتم: ئەو مردووە و زیندوو نابێتەوە. بەلام من حەزدەکەم سەبارەت بە دەستەلات و تواناکەیەوە زانیاری بەدەست بێنم.

ژنەکەی فەرمانڕەوا دەست بەجێ نیگای لەسەر ئێمە لابرد و پاشان گوتی: بەڵام لەوانەیە ئەو زیندوو ببێتەوە و دووبارە لە نێوانماندا دەربکەوێ. پاشان ڕووی کردە مێردەکەی و گوتی: ئەگەر ئەو زیندوو ببێتەوە تۆ چی دەکەیت؟

من زۆر سەیرم لەو قسەیە هات، چونکە "کلودیا" شتێکی دەگوت کە دوور بوو لە ڕاستییەوە. من ئەو ڕۆژە بە هەر دوو چاوی خۆم دیتم کە عیسا بە خاچەکەوە گیانی سپارد و کەسێکیش ماڵئاوای لە ژیان کردبێ، زیندوو نابێتەوە.

فەرمانڕەوا بە گاڵتەوە گوتی: ئەگەر عیسا زیندوو بوویەوە و لە نێوان ئێمەدا دەرکەوت، ئەوا بە بینینی خۆشحاڵ دەبین.

پاشان، بۆئەوەی بابەتی گاڵتە کردنەکە بگۆڕێت، بە منی گوت: "مەزن تیوس"، لەبەرئەوەی تۆ لە ئەسکەندەریەوە دێیت، وا چاکە یەك دوو گۆرانی لە گۆرانییەکانی ئەسکەندەریەمان بۆ بێژی، با سەرمان مەست بێت.

من بە دەنگێکی لەرزۆك و پچڕ پچڕەوە یەکێ لەو گۆرانیانەی کە لە ئەسکەندەریە فێری ببوم، بۆم گوتن و دوای منیش "ئادان ئابر" یەکێك لەو سرودانەی گوت کە سەربازەکانی لژیون دەیانگوت. پاشان غولامێك هاتە ژوورەوە و بە فەرمانڕەوای گوت: نووسەری تۆ (باش کاتب) مۆڵەتت لێ دەخوازێ بێتە ژوورەوە و ئەو ڕاپۆرتانەی کە پێویستە بگاتە دەستت، پێتی بڵێ.

فەرمانڕەوا مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی پێ دا. دوای ئەوەی کە (باش کاتب) هاتەژوورەوە، نزیك بوویەوە لە فەرمانرەوا و دەمی نزیك کردەوە لە گوێی و بڕێك چپەچپی کرد. حاکم بۆئەوەی پیشانی بدات کە من و ئەوانی دیکە بێگانە نین، فەرمانی بە باش کاتبەکە دا بە دەنگی بەرز، واتە بەشێوەیەکی ئاسایی قسە بکات.

باش کاتب گوتی: ئەمرۆ ئەو کەسانەی کە لە پەرستگای جوولەکەکاندا بوون، زۆر ترسان لە بوومەلەرزەکە، چونکە بوومەلەرزەکە دیواری پەرستگاکەی وا جولاندووە کە جوولەکەکان وایاندەزانی پەرستگاکە وێران دەبێ و دەڕوخێ. هەواڵێکی تر ئەوەیە کە ئەو پیاوەی ٣٠ دیناری وەرگرتووە و لە پێناو ئەو پارەدا عیسای فرۆشتبوو بەوانی دیکە، ئەمرۆ چوو بۆ پەرستگا و، بڕیارەکەشی گەڕاندەوە بۆ پێشەوایانی جوولەکە.

هەواڵێکی تر ئەوەیە کە ئەمرۆ پێشەوایان لە ماڵی پێشەوای ڕۆحانی کۆبوونەتەوە و نەفرەتیان لە کردارەکانی ئەو دوو کەسەی کە ئەندامی ئەنجومەنی یەهوودین، دەکرد

و دەیانگوت کە ئەو دوو کەسە، یەکێکیان بەناوی "یوسف" و ئەوی تر بەناوی "نیکۆدموس" نەدەبوو تەرمی عیسا لەسەر خاچ بێننە خوارەوە و ئەسپەردەی بکەن. بەڵام ئەو دوو کەسە ئەگەرچی ئەندامی ڕیزگاری جوولەکەکان بوون، بەڵام تەرمی عیسایان لەخاچ داگرتووە و لە گۆڕێکدا کە دەکەوێتە نزیکی شوێنی لەسێدارەدانەکە، ئەسپەردەیان کردووە. "نیکۆدموس" بە پارەی خۆی کفنی کڕیوە بۆ عیسا و تەرمەکەی پێ داپۆشیوە و شتی بۆنخۆشی کڕیوە بۆئەوەی لاشەکەی عیسا لەناو گۆڕدا بۆنی خۆشبێت. ئیتر جگە لەمانە، هیچ هەواڵێك نییە کە شایانی گوتن بێت و، شار ئارامە و جوولەکەکان خەریکی دەست پێ کردنی مەراسیمی جەژنی گەورەی خۆیانن. لایەنگرانی عیساش بڵاوەیان لێ کردووە و ناکەونە بەرچاو. ڕاویژکاری باڵای یەهوودییەکان دروشمێکی سەبارەت بەمەرگی عیسا داناوە کە دەڵێ: "ئەگەر کەسێك لە پێناوی مانەوەی گەلێك یان هۆزێکدا بمرێت، باشترە لەوەی هۆزێك لە پێناوی مانەوەی کەسێکدا لەناو بچێت".

دوای ئەوەی کە قسەکانی باش کاتب تەواو بوو، فەرمانڕەوا گوتی: هەواڵێکی ترت پێیە پێمان بڵێی یان نا؟

باش کاتب کەمێك ڕاما و ترس و گومانی لە گوتنی لەو شتە هەبوو کە دەیزانیّ، پاشان گوتی: ئەگەر من ئەم بابەتەم لە دوو سەرچاوەی جیاوازەوە نەبیستایە، ئەوا نەمدەگوت، چونکە هزری ژیر بڕوای پێ ناکات. ئەو مەسەلەیەش کە لە دووسەر چاوەی جیاوازەوە گوێم لێ بووە ئەوەیە کە عیسا پێش ئەوەی لەسێدارە بدرێ، گوتوویەتی کە سێ ڕۆژ دوای مردنی، زیندوو دەبێتەوە. من نازانم سەرچاوەی سەرەکی ئەم پڕوپاگەندەیە لە کوێوەیە و، یەکەمجار لە زمانی کێوە هاتە دەرەوە، بەڵام ئەوەندە دەزانم کە هەموو ڕۆحانییەکانی یەهوودی و پێشەوای گەورەی ڕۆحانییەکان ئاگایان لەوە هەیە و، ئێستەش ڕۆحانییەکان لە ماڵی پێشەوای گەورەی خۆیان کۆبوونەتەوە و تەگبیر دەکەن تا ب چ شێویەك ڕێگە لەم جۆرە کارە بگرن.

کاتیّ "کلودیا" گوێی لەم قسانە بوو، بە ئێمەی گوت: زانیتان کە من گوتم لەوانەیە عیسا زیندوو ببێتەوە.

باش کاتب گوتی: عەقڵ باوەڕ بەوە ناکات کەسێك زیندوو ببێتەوە کە ماڵئاوایی لە ژیان کردبێت. ڕۆحانییەکانی یەهوودی کە هەنوکە لەماڵی پێشەواکەی خۆیاندا

کۆبوونەتەوە، ئاگایان لەم مەسەلەیە هەیە، بەڵام ئەوان بڕوایان وایە کە لەوانەیە لایەنگرانی عیسا، تەرمەکەی لە گۆڕ دەربهێنن و پاشان ئەوە بڵاو بکەنەوە کە عیسا زیندوو بۆتەوە و لە گۆڕ هاتۆتە دەرەوە و ڕۆشتووە. مەبەستی ئەوان لەو تەگبیرکردنە ئەوەیە کە چلۆن و بەچ شێوەیەك ڕێگە لەوە بگرن کە تەرمی عیسا لە گۆڕ دەرنەهێنن.

فەرمانڕەوای گشتی گوتی: دەی کەواتە لەمەودوا ئێمە نابێ شەوان بخەوین بۆئەوەی نەوەك لایەنگرانی عیسا تەرمەکەی لە گۆڕ دەربهێنن.

ئینجا فەرمانڕەوا داوای لە من و "ئادان ئابر" کرد لێی نزیك بکەوینەوە و، دوای ئەوەی کە نزیك بووینەوە، گوتی: هیچ خاوەن هۆشێك بڕوا بەوە ناکات کەسێك زیندوو ببێتەوە کە مردبێت، بەڵام لەوانەیە عیسا نەمردبێت و دوای ئەوەی کە لەخاچ هێناویانەتە خوارەوە، زیندوو بووە و بەم جۆرە لایەنگرانی عیسا دەنگۆی ئەوە بڵاو دەکەنەوە کە ئەو، سێ ڕۆژ دوای مردنی زیندوو دەبێتەوە. جا لەبەرئەوەی ئێوە ئەوتان بە خاچەوە بینیوە، داواتان لێدەکەم بڵێن کە عیسا مردووە یان نا؟

من و "ئادان ئابر" گوتمان کە بێگومان عیسا بەخاچەکەوەماڵئاوایی لە ژیان کرد و گوتیشمان کە سەربازێك سەری ڕمەکەی خۆی کرد بەناو دڵیدا. من و "ئادان ئابر" تەنانەت سوێندمان بۆ فەرمانڕەوا خوارد کە عیسا بەخاچەکەوە ماڵئاوایی لە ژیان کرد و کاتێ ئەویان لە خاچەکە هێناوەتە خوارەوە، بێگومان گیانی تێدا نەبووە.

گوتەی ئێمە بووە هۆی ئاسوودەیی فەرمانڕەوا. پاشان من خوداحافیزیم لە فەرمانڕەوا و ژنەکەی و فەرماندەی مەخفەر و ئادان ئابر کرد، بەڵام نەچووم بۆ مەنزڵەکەی خۆم کە لە قەڵادا بوو، بەڵکو لەسەر بانگهێشتی ئەفسەرە ڕۆمییەکان، چووم بۆ نشینگەی ئەوان. چونکە بەو جۆرەی کە گوتم، داوایان لە من کردبوو کە دوای نانخواردنی ئێوارەم لەگەڵ فەرمانڕەوا، شەو لەگەڵ ئەواندا بەسەربەرم و نەخەوم. من ئەو شەوە بەباشی نەنووستم و بێتاقەت بووم، بەیانیش دوای ئەوەی لەخەو هەستام، هەستم بە بێ هێزی دەکرد.

کەمێك دوای ئەوەی بەئاگا هاتمەوە، "ئادان ئابر" هاتە ژوورەکەم و گوتی: لە ژوورەکەی خۆت وەرە دەرەوە و نوێنەرەکانی جوولەکە، لە حەوشەی قەڵاکەدا، ببینە.

من جلەکانم لەبەر کرد و چوومە حەوشەی قەڵاکە و سەیرم کرد "پونتوس پیلات" لەگەڵ هەندێك لە یەهوودییەکان قسە دەکات. "ئادان ئابر" ئەوانی پێ

ناساندم. دیار بوو کە هەندێکیان ئەندامی ئەنجومەنی باڵای یەهوودین و هەندێکیشیا لە ڕۆحانییەکانن. نوێنەرەکانی ئەنجومەنی باڵا و ڕۆحانییە یەهوودییەکان زۆر نیگەران بوون و بەم بۆنەیەوە، بەیانی زووی ڕۆژی شەممە، هاتوون بۆ بینینی فەرمانڕوا، لە کاتێکدا ڕۆژی شەممە هەموو جۆرە کارێك بۆ یەهوودییەکان قەدەغە کراوە.

جوولەکەکان گوتیان: ئێمە لەوە دەترسین کە لایەنگرانی عیسا تەرمی ئەویان لە گۆڕ دەرهێنابێت و پاشان گۆڕی بەتاڵ نیشانی خەڵك بدەن و بڵێن کە عیسا بە پێی قسەی خۆی، لە ڕۆژی سێیەمی دوای مردن، زیندوو بۆتەوە و لە گۆڕ هاتۆتە دەرەوە و ڕۆشتووە.

فەرمانڕەوا گوتی: ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە منەوە نییە و پەیوەندی بە ئێوە و لایەنگرانی عیساوە هەیە، بەڵام بڵێن کە چیتان لە من دەوێ و بۆچی ئەمڕۆ هاتوون بۆ لای من؟

یەهوودییەکان گوتیان: ئێمە بۆئەوە هاتووین کە داوات لێ بکەین کۆمەڵێك لە سەربازانی ڕۆمی بۆماوەی چەند ڕۆژێك و بەتایبەت چەند شەوێك، لە نزیکی گۆڕی عیسا بکەیت بە پاسەوان و گۆڕەکەی ئەویش بە مۆری تایبەتی خۆت مۆر بکەیت، چونکە کەس ناوێرێ مۆری فەرمانڕوا بشکێنێ تا تەرمێك لە گۆڕ دەربهێنێت.

فەرمانڕەوا گوتی: بۆچی خۆتان لە دەوری گۆڕەکەدا پاسەوانی ناکەن و داوا لە من دەکەن ئەم کارە بکەم؟

یەهوودییەکان کەمێك لە یەکتری ڕا مان و گوتیان: ئێمە بڕوامان بە کەسانی خۆمان نییە.

فەرمانڕوا ڕازی بوو بەوەی دوو کەس لە سەربازان بنێرن کە لە دوو لای گۆڕی عیسادا پاسەوانی بکەن و لە شەویشدا، بەهۆی ئەوەی کە گۆڕی عیسا کەوتۆتە دەرەوەی شار، ژمارەی پاسەوانەکان زیاتر بکات. ئیتر فەرمانڕەوا باش کاتبی لژیونی ڕاسپارد کە بڕوات و گۆڕی عیسا بە مۆری لژیون مۆر بکات.

"پونتوس پیلات" نەیویست گۆڕی عیسا بە مۆری خۆی مۆر بکات، بەڵام مۆری لژیونیش وەکو مۆری فەرمانڕەوای گشتی وابوو و، کەس نەیدەتوانی تێکی بشکێنێت.

نوێنەرەکانی یەهوودی ڕازی و شادومان بوون و بە فەرمانڕەوایان گوت: ئەمڕۆ ڕۆژی شەممەیە، بۆیە نەمانتوانی دیاریت بۆ بهێنن، بەڵام هەرکە شەممە تەواو بوو،

دیاریەکی زۆر گرنگت بۆ دێنین. کاتێ باش کاتب بەڕێ کەوت تاکو گۆڕی عیسا مۆر بکات، منیش لەگەڵی چووم، چونکە پێم وابوو پیادەڕەوی و هەڵمژینی هەوای ئازاد، ئەو بێ هێزیەی کە بەهۆی دوێنێ شەوەوە توشم ببوو، لەناو دەبات. کاتێ گەیشتینە شوێنی لەسێدارەدانی عیسا و دوو لەخاچدراوەکەی تر، هێشتا نیشانەی خوێناوی لەسەر زەوی دیار بوو، بەڵام خاچەکانیان لابردبوو. لەوێ چاوم بە گۆڕی عیسا کەوت و سەیرم کرد کە گۆڕەکەی لە باخێکی پڕ لە گوڵ و درەختدایە و گۆڕەکەیان لە جێگەیەکدا هەڵکەندووە کە پاڵی داوە بە بەردێکی تەختی گەورەوە و، باشتر وایە بڵێم لە پاڵ گردێکی بەردیندایە. من وامدەزانی گۆڕی عیسا پاسەوانی نییە، چونکە جوولەکەکان داوای پاسەوانی ڕۆمییان لە فەرمانڕوا کردبوو. دواتر دەرکەوت کە چەند کەسێ لە یەهوودییەکان لە نزیك گۆڕی عیسادا پاسەوانی دەکەن بۆئەوەی نەوەك یارانی عیسا، تەرمەکەی لەگۆڕ دەربهێنن. بەردێکی ئاشیان خستبووە سەر گۆڕەکە و بە یەك کەس نەدەجولاً بەڵکو دەبوایە دوو کەس هێزی خۆیان بەکار بێنن تاکو بتوانن ئەو بەردە لە گۆڕ دوور بخەنەوە.

باش کاتبی لژیون پێش ئەوەی گۆڕەکە مۆر بکات، ویستی بەردە ئاشەکە لەسەر گۆڕەکە لابدات و دووری بخاتەوە تاکو بەچاوی خۆی تەرمی عیسا لەناو گۆڕدا ببینێ، بەڵام ئەو جوولەکانەی کە پاسەوانی گۆڕەکە بوون، گوتیان پێویست ناکات سەری گۆڕەکە هەڵبدەیتەوە، چونکە ئێمە دڵنیاین کە کاتێ "یوسف" و "نیکۆدموس"، دوو یەهوودییە خیانەتکارەکە، تەرمی عیسایان لەخاچ هێنایە خوارەوە و خستیانە گۆڕەوە و پڕیان کرد لە بۆنی خۆش، هیچ کەسێ گۆڕەکەی هەڵنەداوەتەوە و بێگومان تەرمی عیسا لەناو گۆڕدایە. ئەوە بوو کە باش کاتب بەبێ ئەوەی سەری گۆڕەکە هەڵبداتەوە و بە دوو چاوی خۆی تەرمی عیسا ببینێت، گۆڕەکەی مۆر کرد. کاتێ کە ئەو گۆڕەکەی مۆر دەکرد، من بۆنی عەترێکی تیژ بە لوتمدا هات و بە خۆم گوت لەوانەیە شتی بۆن خۆش بێت کە لەناو گۆڕی عیسایان داناوە و، پاشان بۆم دەرکەوت کە ئەگەر شتی بۆن خۆش ئەسپەردە بکەن ئەوا بۆنەکەی نایەتە دەرەوە و بێگومان ئەم بۆنە خۆش و بەهێزەی کە من هەستی پێ دەکەم بۆنی گوڵەکانی ئەو باخەیە. دوای سەردانی گۆڕی عیسا، من کە بە ڕەزامەندی باش کاتب گەڕابوومەوە، ویستم بڕۆم و لە شارەکەدا پەرستگای جوولەکەکان ببینم.

باش کاتب گوتی: تۆ دەتوانی بچیتە ناو یەکەم حەوشەی پەرستگاکەوە و چوونە ژوورەوەی بێگانە بۆ ئەو جێگایە ئاساییە و کەس ناتوانێ ڕێگات لێ بگرێت. من بڕوام وایە ئەو ڕۆژەی کە هەموو ئەو جوولەکانەی لەو شارەدا بوون و بەرەو پەرستگا بەڕێ کەوتوون لە حەوشە جۆراوجۆرەکانی پەرستگا جێیان دەبێتەوە چونکە ئەوەندە فراوانە. لەبەرئەوەی من بێگانە بووم، بۆیە تەنیا چوومە حەوشەی یەکەمەوە. لەوێ ئەوەندە خەڵکی تێدا کۆببویەوە کە مرۆڤ نەیدەتوانی بە یەك کاتژمێر دوو هەنگاو بنێ، بۆیە ناچار دەبێ بەهێواشی ڕێ بکات. جوولەکەکان ئەوەندە قوربانیان کردبوو کە لە هەوادا بۆنی خوری و ڕیخۆڵە و خوێنی مەڕ دەگەشتە لوت و لەهەموو حەوشەکاندا، جگە لە حەوشەی گشتی، دەنگ و ئاوازی نزا خوێندن و خوێندنەوەی کتێبە پیرۆزەکانی یەهوودییەکان دەبیسترا. بەڵام ئەگەرچی کە گەورەیی بینای پەرستگاکە و بەتایبەت پایە و ستوونەکانی، منی بە بینینیان سەرسام کردبوو، کەچی نەمدەتوانی بیرکردنەوەی عیسا لە دڵی خۆم دەربکەم[12] بۆیە بە خۆم گوت کە دەبێ لەبارەی عیساوە پرسیار لەو کەسانە بکەم کە دەیانناسی و لە گەڵیدا کۆبوونەتەوە و، لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەم تاکو بتوانم ئەو بناسم و زانیاری لەسەر کردار و گوفتاری پەیدا بکەم کە لە ماوەی ژیانیدا ئەنجامی داون.

ئەم نامەیەی کە ئێستە دەیخوێنیتەوە پاش ئەو کاتە بۆم نووسیت کە ماوەیەك لە حەوشەی گشتی پەرستگای یەهوودییەکاندا بووم و گەڕامەوە بۆ قەڵای "ئەنتۆنییە".

---

[12] ئەمڕۆ ئێمە دەزانین کە ناوەندی بیروهۆشی مرۆڤ، مێشکە، بەڵام دێرینەکان (دڵ)یان بە ناوەندی بیروهۆش زانیوە بۆیە ئەم پیاوە دەڵێ کە نەمدەتوانی بیرکردنەوەی عیسا لە دڵی خۆمدا دەربکەم. (و. کوردی)

# ئەو شەوەی کە گۆڕی عیسا هەڵدرایەوە

"تولیا" ئەمە سێیەمین نامەیە کە بۆتی دەنووسم. کاتیٚ کە تۆ ئەم نامەیە بەدەستەوە دەگریت و دەیخوێنیتەوە، لەوانەیە وابزانی من پیاوێکی خەیاڵاویم، لە کاتێکدا من لە هەموو تەمەنمدا بە دوای وەهم و خەیاڵاتدا نەگەڕاوم و دڕدۆنگ نەبووم. هەرچەندە هزری خۆم لە هزری کەسانی تر بە پێشکەوتوتر و باشتر نازانم لە کەسانی تر، بەڵام دانایی و هێزی ژیری من ساق و ئاساییە. من هەم لە ڕووی جەستەوە پیاوێکی ساق و بیٚ لەکەم، هەمیش لە ڕووی هەست و هێزی ژیریەوە. ئەوەشی کە لەم نامەیەدا بۆتی دەنووسم، ئەو شتانەیە کە خۆم بینیومە و هەستم پیٚ کردووە و، گومانم لە بینین و ڕوودانی ئەو شتانە نییە. ئەو شەوەی کە لە پەرستگای جوولەکەکان گەڕامەوە، خۆم خەریك کرد بە نووسینی نامەیەك بۆ تۆ. لەبەرئەوەی دوای تەواو بوونی ئەو نامەیە ماندوو ببووم، بۆیە خۆم بۆ خەوتن ئامادە کرد و زوو خەوم لیٚ کەوت. بەڵام بەهۆی بوومەلەرزەیەك کە لە بوومەلەرزەکەی پێشوو بەهێزتر بوو، لەخەو ڕاپەڕیم. گۆزەکان بەهۆی ئەو بوومەلەرزەوە لەسەر ڕەفەکان دەکەوتنە خوارەوە و تێك دەشکان و قەڵغانی سەربازەکانیش کە لە جێگەیەکی تایبەت دادەنران، دەکەوتنە سەر زەوی و دەنگێکی ترسناکیان دروست دەکرد. من لە ترسی بوومەلەرزەکە هەستامەوە، بەڵام زەوی ئەوەندە لەژێر پێمدا دەجولاٚ، تا خستمی بە زەویدا.

یەکیٚ لە ئەفسەرەکان کە ئەو شەوە لە حەوشەی قەڵای "ئەنتۆنییە"دا پاسەوان بوو، فەرمانی دا شەیپور لیٚ بدەن و هەموو سەربازەکانی بۆ حەوشەکە بانگ کرد. من ئەو شەوە توانیم جارێکی تر پەی بە شارەزایی و دسیپلینی سەربازە ڕۆمییەکان بەرم، چونکە لە گەڵ ئەوەدا کە زەوی دەلەرزی، سەقف و دیوارەکانی قەڵا لە بەرد دروست کرا بوون و ئەگەر بکەوتنایەتە خوارەوە، ئەوا هەموو سەربازەکانی لەژێر دارو پەردودا لەناو دەبرد، کەچی هیچ سەربازێك بیٚ ئەوەی چەکەکانی خۆیان بەجیٚ بهێڵن، چوونە حەوشەکەوە و ئەگەرچی کە سەربازەکان بە پێی یاسای گشتی دەبوو لە ترسی گیانی خۆیان لە ژوورەکان بێنە دەرەوە تاکو نەکەونە ژێر دارو پەردوو، بەڵام چەکەکانی خۆیان فەرامۆش نەکرد و هەموویان بە چەکەوە لە ژوورەکانیان چوونە دەرەوە.

حەوشە تاریك بوو، چراکانیان ڕۆشن کرد بۆئەوەی حەوشەکە ڕوناك ببێتەوە. دوای ئەوەی گەڕان تاکو بزانن بوومەلەرزەکە چ زیانێکی گەیاندووە، دەرکەوت دیوارەکە لە دوو لاوە درزی بردووە و لە چەند لایەکیشەوە بەرد کەوتۆتە خوارەوە و چەند سەربازێکی بریندار کردووە.

کاتێ فرماندەی مەخفەر زانی کە لەناو قەلاْکەدا بەهۆی بوومەلەرزەوە کەس نەکوژراوە، بڕێك لەسەربازەکانی لەگەڵ تیمی ئاگر کوژێنەوەی لژیوندا نارد بۆ شار تاکو بزانن لەناو شاردا چی ڕووی داوە و، ئایا بوومەلەرزە زیانی گیاندووە یان نا. فەرمان درا بە لێپرسراوانی ئاگر کوژێنەوە تا هەر شوێنێك تووشی ئاگرکەوتنەوە بووە، دەست بەجێ بیکوژێننەوە، چونکە فەرماندەی مەخفەر دەیزانی کە کاتێ بوومەلەرزە دێت، ئەو ئاگرانەی کە دەکرێنەوە، هێندەی خراپەکاریەکان کە بەهۆی بوومەلەرزەوە ڕوو دەدەن، زیان دەگەیەنێت.

فەرمانداری گشتیش وەکو ئەوانی دیکە لەخەو هەستا و بالاْ پۆشەکەی دا بەشانی خۆیدا و بەپێ خاوس لە ژوورەکەی خۆی هاتە دەرەوە و، چەند پلەیەك لە قادرمەکان هاتە خوارەوە، بەلاْم نەهاتە حەوشەکەوە و لە ناوەڕاستی پلیکانەکاندا سەیری حەوشە و سەربازەکانی کرد. دیار بوو کە دوای ئەو ڕووداوە، کەس نەیدەتوانی هەلْپە بکات و بگەڕێتەوە بۆ ژوورەکان و بخەوێ، چونکە هەمویان دەترسان بکەونە ژێر دار و پەردووەوە. پاشان، سپێدەی بەیانی هەلْهات و کەلْەشێرەکان خوێندیان و یەکسەر و بەیەك دەنگ کەڕەناکانی پەرستگای جوولەکەکان دەنگیان لێ بەرز بوویەوە و وای دەردەخست کە بوومەلەرزەکە بەرنامەی جەژنی گەورەی یەهوودییەکانی نەگۆڕیوە، ئیتر لەو کاتەوە مەراسیمی جەژن وەکو ڕۆژی پێشوو دەستی پێ کردەوە.

لەبەرئەوەی بەیانی داهات و دنیاش ڕووناك ببوویەوە، بۆیە سەربازەکانیان ناردەوە بۆ خزمەت کردن. بەلاْم ئەو سەرلە بەیانییە تەنیا ئازوقەی وشکیان دا بە هەموو سەربازەکان، واتە خواردنی ئامادەکراو و پاککراویان بەناو سەربازەکاندا دابەش نەکرد، چونکە خواردنی پاککراو و ئامادەکراو پێویستی بە ئاگر کردنەوە دەکرد و، فەرماندەی مەخفەریش فەرمانیدا تا دوور بکەونەوە لە ئاگر کردنەوە تا ئەگەر بوومەلەرزە ڕووی دایەوە، ئاگر بەرنەبێتەوە. هەندێ لە سەربازەکان کە بە فەرمانی

فەرماندەی مەخفەر ڕۆشتبوون بۆ شار، گەڕانەوە و گوتیان کە خەڵکی شارەکە زۆر ترساون و هەندێکیان ڕایان کردووە و ڕۆشتوون بۆ بیابان تاکو نەکەونە ژێر سەقف و دیوارکان. بەڵام بە پێچەوانەی بۆچونی فەرماندەی مەخفەر، لە شارەکەدا لە دوو خانوو زیاتر وێران نەبووە و کەسیشی لێ نەکوژراوە و دەرکەوت کە ناوەندی بوومەلەرزەکە لە قەڵای "ئەنتۆنییە" و پەرستگادا بووە و، ئەگەر قەڵا و پەرستگاکە قایم دروست نەکرابان، وێران دەبوون.

هەندێ لە سەربازەکان بەرە و سێرك ڕۆشتن بۆئەوەی لەوێ ڕاهێنانی نیزامی ئەنجام بدەن. من بیستوومە کە چەند ساڵێکە سێرکی ئەم شارە لە کار کەوتووە و ئیتر لەوێ نە، گلادیاتۆرەکان دەدەن بە شەڕدا و نە پێشبڕکێی گالیسکە سواری ڕێك دەخەن، چونکە هەموو ساڵێك ئەم سێرکە بەتاڵە و سوودی لێ وەرناگیرێت بۆ نمایش، بۆیە سەربازە ڕۆمییەکان ئەوێیان کردووە بە جێگەی مەشق و ڕاهێنانی نیزامی و جەنگی.

من گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم و، خۆم شوشت و جلم لەبەر کرد. لەو کاتەدا کەسێك هات و گوتی: فەرمانڕەوای گشتی دەڵێ کە بڕۆیت بۆ حەوشەی قەڵا بۆ لای.

من چووم بۆ حەوشەکە و سەیرم کرد فەرمانڕەوای گشتی لە حەوشەکەدا ڕاوەستاوە و پێنج کەسی لە بەرامبەردا وەستاوە، یەکێکیان فەرماندەی لژیون و ئەوی تریان باش کاتبەکەی و سێیەمیان "ئادان ئابر" بوون و دوو کەسەکەی تر دیار بوو لە سەربازانی لژیون بوون. بۆشم دەرکەوت کە ئەو دوو سەربازە خەڵکی "سوریا"ن یانیش خووی سوریەکانیان گرتووە، چونکە لە کاتی قسەکردندا زۆر خۆیان دەجوڵێنن و بە ئاماژە کردن و جوڵەی دەست و سەریان قسە دەکەن.

کاتێ گەیشتمە نزیك فەرمانڕەوای گشتی، سڵاوم کرد. ئەو گوتی: "مەزن تیوس" شەوی ڕابردوو بەهۆی ڕوودانی بوومەلەرزەوە، تازەکردنەوە و گۆڕینی پاسەوانەکانی گۆڕی عیسا درەنگ کەوتووە. من گوتم کە شەوی پێشوو شەش کەس لە سەربازەکان، دوودوو لە تەنیشت گۆڕی عیسا پاسەوانی بکەن، واتە کاتێ دوو کەس پاسەوانی دەکەن، چوار کەسی تریش لێرە لە قەڵاکەدا بخەون و، هەرکە کاتی تازەکردنەوە و گۆڕینی پاسەوانەکان گەیشت، ئەوا دوو کەسی تر لێرەوە بڕۆن و جێگەی دوو پاسەوانە ماندووەکە بگرنەوە. دوای بوومەلەرزەکە ئەم دوو کەسەی کە دەیبینی، لێرەوە ناردوویانن و ئەوان ڕۆشتوون و کاتێکیش گەیشتوونەتە گۆڕی تەرمەکەی

عیسا، بینیویانە کە مۆری گۆڕەکە تێك شکاوە و بەردەکە لەسەر گۆڕەکە دوور خراوەتەوە و دوو پاسەوانەکەی تریش کە دەبوو لەوێ بن، دیار نین.

دوای ئەم گوتانە، فەرمانڕەوای گشتی لەو دووسەربازەی پرسی: تەرمی عیسا لە ناوگۆڕدا بوو یان نا؟

ئەو دوو کەسە بە یەکەوە وەڵامیان دایەوە: ئێمە نازانین، چونکە فەرمان بەئێمە نەدرابوو تا گۆڕەکە بپشکنین.

فەرمانڕەوای گشتی گوتی: من لەم ڕووەوە فەرمانم دا کە شەوی پێشوو لە تەنیشت گۆڕی عیسا پاسەوانی بکەن تا تەرمەکەی لە گۆڕ دەرنەهێنرێت، ئەگینا پێویستی بە دانانی پاسەوان نەدەکرد. ئەرکی سەرەکی ئێوە ئەوە بوو کە نەهێڵن تەرمی ئەو دەربهێنرێت، کاتێکیش بینیتان کە گۆڕێك شکاوە و بەردی گۆڕەکە جێگۆڕکێی پێ کراوە، ئەوا دەبوو سەیرێکی ناو گۆڕەکە بکەن و بزانن کە ئایا تەرمی عیسای لێ ماوە یان نا.

دوو سەربازەکەی تر گوتیان: ئەوفەرمانەی کە بەئێمەدرا ئەوە بوو تا ئاگادار بین مۆری گۆڕەکە نەشکێنن. کەس فەرمانی بە ئێمە نەداوە تاکو ناو گۆڕەکە بپشکنین.

فەرمانڕەوا گوتی: کاتێ ئێوە بینیتان مۆری گۆڕەکە شکاوە و بەردەکە لەجێی خۆی لادراوە، بۆچی هەردووکتان گەڕانەوە؟

سەربازەکان بەسەرسامیەوە گوتیان: مەگەر نەدەبوو ئێمە بگەڕێینەوە و هەواڵی ئەم ڕووداوە بگەیەنینە فەرماندەی خۆمان؟

فەرمانڕەوا گوتی: یەکێ لە ئێوە دەبوو لەلای گۆڕەکە پاسەوانی بکات و ئەوی ترتان بێت و هەواڵەکە بگەیەنێ تاکو گۆڕی عیسا بەبێ پاسەوان نەمێنێتەوە.

لەو کاتەدا فەرماندەی لژیون بەرگری لە دوو سەربازەکەی خۆی کرد و گوتی: ئەم دوو سەربازە لەم بارەیەوە لێپرسراو نین، چونکە بڕیاری تەواویان وەرگرتبوو کە بە تەنیایی پاسەوانی نەکەن و هەمیشە پێکەوە بن.

فەرمانڕەوا گوتی: ڕووداوی شکاندنی مۆری گۆڕەکەی عیسا و جێگۆڕکێی بەردی گۆڕەکە ئاساییە، چونکە بوومەلەرزەکەی دوێنێ شەو مۆرەکەی شکاندووە و جێگۆڕکێی بە بەردەکە کردووە. بەڵام لەبەرئەوەی پاسەوانەکانی گۆڕی عیسا ڕۆمی نەبوون و خەڵکی سوریا بوون، بۆیە وەکو هەموو سریانییەکان بەهۆی خورافە پەرستی

زۆرەوە ترساون و ڕایان کردووە و بە هەڵهاتنی خۆیان ئابڕووی لژیونیان بردووە. بڕیاری من ئەمەیە کە ئەم دوو سەربازەی جێی پاسەوانیان بەجێ هێشتووە و ڕایان کردووە، وەکو دوو سەربازی ڕاکردوو ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێت. دەبێ بە زووترین کات بگەڕێن بە دوایاندا و دەستگیریان بکەن و بیانگەڕێننەوە بۆ قەڵاکە و دادگایی بکرێن.

فەرماندە گوتی: بەڵێ قوربان.

من نەمدەزانی فەرمانڕەوا منی بۆچی بانگ کرد، چونکە من لە قەڵاکەدا میوان بووم و لایەنێکی سەرەکی نەبووم تا بابەتی هەڵاتنی دوو پاسەوانەکەی گۆڕی عیسا پەیوەندی بە منیشەوە هەبێت. بەڵام فەرمانڕەوا هزری ڕوون کردمەوە و گوتی: "مەزن تیوس"، من بۆیە ئەم زەحمەتەم بە تۆ دا و بانگم کردی بۆ ئێرە، چونکە دەمەوێ کارێکت پێ بسپێرم. ڕووداوی هەڵاتنی دوو سەرباز لە شوێنی پاسەوانیدا ڕووداوێکی گەورەیە و هەروەکو گوتم، زەرەرێکی گەورە دراوە لە ئابڕووی لژیون. دەبێ لێکۆڵینەوە بکرێت و بزانرێ کە شەوی ڕابردوو چی ڕووی داوە کەوا ئەو دوو سەربازە جێی پاسەوانی خۆیان ڕەها کردووە و هەڵاتوون. بەڵام لێکۆڵینەوە لەم بارەیەوە دەبێ لەلایەن کەسێکەوە ئەنجام بدرێ کە بێ لایەن بێت و بتوانێت بەبێ لایەنگری، ڕاستیەکان ئاشکرا بکات. من دەزانم تۆ پیاوێکی بێ لایەنیت و بە پێی پێویستیش زانیاریت لەسەر بابەتی ماف و نیزامی هەیە و دەتوانی بێ لایەنانە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەیت و ئەنجامەکەی بە من بڵێیت. جا ئێستە داوات لێدەکەم لەگەڵ "ئادان ئابر" و ئەم دوو سەربازەی کە لە گۆڕی عیساوە گەڕاونەتەوە، بڕۆن بۆ ئەوێ و بە وردی لێی بکۆڵەرەوە. هەرکاتێکیش بۆ دوورخستنەوەی جوولەکەکان و کەسی بزێو، سەربازت بوێ، دەتوانی هەندێ کەسی لژیون لەگەڵ خۆت بەریت.

فەرماندەی لژیون گوتی: من ئامادەم یەك کوهورس[13] (کۆرس) لە سەربازەکانی خۆمان بخەمە بەردەستی مەزن تیوس.

فەرمانڕەوا گوتی: پێویست بە ناردنی یەك کوهورس سەرباز ناکات، چونکە ئەو تەنیا پێویستی بە چەند دانە سەربازێك هەیە کە خەڵکەکە دوور بخەنەوە لە گۆڕەکەی عیسا تا ئەویش بتوانێ لێکۆڵینەوە بکات. ئەگەر بە دوو هەزار سەربازەوە بچێتە سەر

---

[13] لژیونێکی ڕۆمی خاوەنی شەش هەزار سەرباز بووە و هەر لژیونێکیش دابەش بووە بۆ سێ کوهورس ((کە ڕەنگە لە (کۆرس)ەوە هاتبێت– و. کوردی)). بەم جۆرەش هەر کوهورسێك دوو هەزار سەربازی هەبووە.

گۆڕەکەی عیسا، سەرسامی و بزێوی دروست دەکات و هەموو دانیشتوانی شارەکە دێنە دەرەوە تاکو بزانن چی ڕووی داوە کەوا دوو هەزار سەربازمان لە دەوری گۆڕەکەی عیسا جێگیر کردووە.

ئادان ئابر گوتی: بە بڕوای من بەلایەنی زۆرەوە گروپێك سەرباز، واتە دە سەرباز بەسە بۆ دوور خستنەوەی خەڵك لە دەوری گۆڕەکە.

ئینجا بە ڕەزامەندی فەرماندەی لژیون، ئادان ئابر گروپێکی دە کەسی لە سەربازەکان هەڵبژارد و ئێمە، واتە من و ئادان ئابر و ئەو دوو سەربازەی کە لە گۆڕی عیساوە گەڕابوونەوە، لەگەڵ ئەو دە کەسەدا کەوتینە ڕێ و چووین بۆلای گۆڕی عیسا. کاتێ لە شارەکە چووینە دەرەوە، سەیرمان کرد ئەو کەسانەی کە شەوی پێشوو لە ترسی بوومەلەرزە لە شارەکە هەڵاتبوون و چووبوون بۆ بیابان، دەگەڕێنەوە. ئەوان بەهۆی بوومەلەرزەوە ئەوەندە ترسیان لێ نیشتبوو کە گوێیان بە ئێمە نەدەدا و تەنانەت لەکاتی تێپەڕ بوونی سەربازەکان، جوولەکەکان تفیان نەدەکردە سەر زەوی تا نەفرەت و توڕەیی خۆیان بەرامبەر بە ڕۆمییەکان ئاشکرا بکەن.

کاتێ ئێمە گەیشتینە ئەو باخەی کە گۆڕی عیسای تێدا بوو، سەیرمان کرد دوو یەهوودی لە نزیك باخەکەدان. من نەمدەزانی ئایا ئەوان لە باخەکە دەچنە دەرەوە یان نیازیان وایە بڕۆنە ناو باخەکەوە. من کە ئەو دوو کەسەم بینی، گومانم برد لە یارانی عیسا بن، چونکە یەکێکیان هەر ئەو پیاوە گەنجە بوو کە کاتی لەخاچ دانی عیسا، دڵی ژنەکانی دەدایەوە. ئەوی تریان پیاوێکی ڕیشن بوو کە سەرێکی خڕی هەبوو. من ئەوم نەدەناسی، بەڵام لەبەرئەوەی لەگەڵ ئەو گەنجەدا بوو، زانیم کە ئەویش لە یارانی عیسایە. ئادان ئابر هەڵهاتنی ئەو دوو یەهوودییەی بینی، بەڵام سەربازەکانی خۆی نەنارد بە دوایاندا تا دەستگیریان بکەن و بە منی گوت: ئەم دەورووبەرە باخ و گرد و بەردەڵانی زۆر تێدایە و ئەگەر سەربازەکانی خۆم بنێرم بەدوایاندا، ئەوان خۆیان لە سەربازەکانی من دەشارنەوە و، ئەکاتەش هێزی ئێمە لێرەدا لاواز دەبێ. ئینجا ئەو دوو کەسەی کە هەڵهاتن، هیچ شتێکیان لەگەڵ خۆیان نەبردووە و ئەگەر تەرمی عیسایان دەرهێنابێت تا بیبەن، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەمانبینین، چونکە تەرم شتێ نییە کە دوو کەس بتوانن لەکاتی ڕاکردندا بیشارنەوە.

پێشتر گوتم کە گۆڕی عیسا لەلایەکەوە پاڵی دابوو بە گردێکی بەردینەوە و ئێستەش دەڵێن گۆڕەکە کەوتۆتە شوێنێکی لێژەوە و، لە دەوروبەریشیدا چەند گۆڕێك بەدی دەکرێت. کاتێ من و ئادان ئابر و ئاوانی تر گەیشتینە ئەوێ، سەیرمان کرد هیچ بەردێ لەسەر گۆڕەکەی عیسا نییە. دواتر زانیم کە بوومەلەرزەکەی شەوی ڕابردوو بەردەکەی لەسەر مەزاری عیسا دوور خستۆتەوە و، لەبەرئەوەی زەوی لێژ بووە، بۆیە بەردەکە بە هێزێکی زۆر کەوتۆتە خوارەوە، بۆیە دوای ئەوەی کە کەوتۆتە خوارەوە، بووە بە دوو کەرتەوە. گۆڕەکە بچوکترین نیشانەی پاچ و خاکەنازی پێوە دیار نییە و هەرکەسێك ئەو گۆڕەی بدیبایە، دەیزانی کە بەردی سەر مەزارەکە بەهۆی بوومەلەرزەوە لاچووە نەك بە هێزی پاچ و خاکەناز. لەتێك لەو گوریسەی کە باش کاتبی لژیون بۆ مۆرکردنی گۆڕەکە بەکاری هێنابوو، لە تەنیشت ئارامگاکەی عیساوە دەبینرا و لە گۆڕەکەشەوە بۆنی عەتر و گوڵاو دەهات.

ئادان ئابر گوتی: با بزانین تەرمەکەی عیسا لەناو گۆڕدایە یان نا. یەکەمجار تۆ بڕۆرە ناو گۆڕەکە و پاشان منیش دێمە ناوەوە.

من دەمزانی کە ئەو بێزار بووە و ڕەنگی ڕوخساری پەڕیوە و، دەشترسێ کە بچێتە ناو گۆڕەکەی عیساوە. من ئەگەرچی ناوەوەی گۆڕی عیسام نەبینیبوو، بەڵام دەمزانی کە یەهوودییەکان چۆن گۆڕی مردووەکان هەڵدەکەنن. ئەوان لە زەویدا دوو ژووری بچوك هەڵدەکەنن کە بەهۆی ڕێکەیەکی تەنگ و نزمەوە بەیەك دەگەن و مردووەکە دەخەنە ژووری دووەم و لەسەر زەوی دایدەنێن.

من چوومە ناو ژووری یەکەم و لەبەرئەوەی چاوم ڕانەهاتبوو بە تاریکی، کەمێك وەستام تا چاوم بە تاریکی ڕاهات. پاشان لە ڕێکە تەنگەبەرە کورتەکەوە کە لەنێوان دوو ژوورەکەدا بوو، چوومە ژووری دووهەمەوە (ژووری تەرمەکە). لە ژووری دووهەمدا بۆنی عترەکە زۆر تیژ بوو، بەڵام مرۆڤی بێزار نەدەکرد. سەیرم کرد شتێك لەسەر زەوییە کە لەشێوەی تەرمدایە و لە تەنیشتیدا پارچەیەك دەبینرێت کە یەهوودییەکان دەیدەن بە ڕوخساری مردووەکاندا. بە بینینی ئەو پارچە، زۆر سەرم سوڕ ما، چونکە دەریدەخست کە تەرمەکە دەستی لێ نەدرابێت، هەروەها ئەو پارچەیەی کە یەهوودییەکان دەیدەن بەسەر مردووەکاندا، هەر لە خۆیەوە لەسەر ڕوخساری لاناچێت.

من بۆئەوەی بەباشی تەرمی عیسا ببینم، کەمێك چەمامەوە، بەڵام سەیرم کرد تەرمەکە ڕوخساری نییە. پاشان بۆ ڕوون بوونەوەی ئەم بابەتە، دەستم دا لەوەی کە وامزانی تەرمی عیسایە، بەڵام دەستم کەوت لە پارچەیەکی ناو بەتاڵ و بە سەرسامیەوە سەیرم کرد تەرمی عیسا لەناو کفندا نییە و، ئەوەی کە من وامزانی تەرمی مردووە، جگە لە کفنێکی ناو بەتاڵ هیچی تر نەبوو. ئەو کفنەی کە باسمان کرد، ئەوەندە پێ دەچوو کە مرۆڤێکی تێدا بێت کە هەرکەسێك بیدیتبایە، وایدەزانی پارچەیەکە و کراوەتە بەر تەرمی مردوویەك. عەقڵی من بڕوای نەدەکرد کە تەرمێك لەناو ئەو کفنەدا دەربهێنرێت بەبێ ئەوەی کفنەکەی عیسا شکڵی بگۆڕدرێت. بەڵام ئەو شتەی کە عەقڵم بڕوای پێ نەدەکرد، چاوەکانم دەیانبینی و دەستەکانم هەستیان پێ دەکرد. بەبێ ئەوەی گۆڕانێك لە کفنەکەدا ڕوو بدات، تەرمەکە دیار نەمابوو. بۆئەوەی بتوانرێت مردوویەك لەناو کفنەکەی دەربهێنرێت کە بە بەریدا دووراوە، دەبێ کفنەکە بدڕێنرێت، بەڵام هیچ نیشانەیەکی دڕاوی لە کفنەکەی عیسادا بەدی نەدەکرا و کفنەکە هەر وەکو قاڵبی تەرمێك مابوویەوە.

بە "ئادان ئابر"م گوت: ئەوەی دەیبینم ڕاستە یان چاوەکانی من بە هەڵە دەبینن؟

ئەویش وەکو من چەمایەوە و دەستی لە کفنەکە دا و زانی کە هیچی لەناودا نییە. گوتم: چلۆن تەرمی عیسایان لەناو کفنەکەی دەر هێناوە کە هیچ گۆڕانێك لە کفنەکەدا ڕووی نەداوە؟ مرۆڤ هەرچەندە زیرەك و لەکارزان بێت، ناتوانێت دوای ئەوەی تەرمێکی لەناو کفنەکەی دەرهێنا، کفنەکە بخاتەوە سەر ئەو شکڵەی کە وەك ئەوەی تەرمی تێدابێت، وابێت.

من و ئادان ئابر لەو کاتەدا زانیمان کە ڕووبەڕووی شتێك بووینەتەوە کە عەقڵ ی مرۆڤ درکی پێ ناکات. ئێمە ئەگەرچی دەمانزانی تەرمی عیسا لەناو کفنەکەدا نییە، بەڵام دووبارە دەستمان دایەوە لە کفنەکە و گوتمان نەوەك هەڵەمان کردبێ، بەڵام ئیتر بە تەواوی بڕوامان کرد کە تەرمی عیسا لەناو ئەو گۆڕەدا نییە. لە گۆڕەکە هاتینە دەرەوە و بەو سەربازانەی کە لەوێدا بوون، گوتمان کە تەرمی عیسا لەناو گۆڕدا نییە. هیچ یەکێ لەوان نەیاندەویست بچنە ناو گۆڕەکەوە تا بەچاوی خۆیان ببینن کە تەرمی عیسای لەناودا نییە. من دەمزانی کە نەچوونیان بۆ ناو گۆڕەکە بەهۆی ترسەوەیە.

یەکێ لە سەربازەکان ئاماژەی بۆ دوو گۆڕەکەی تر کرد کە بەهۆی بوومەلەرزەوە بەردەکانیان بەسەرەوە نامابوو و، گوتی: باشتر وایە یەکێ لەو مردووانە بگوازینەوە بۆ ناو گۆڕی عیسا تاکو گۆڕی عیسا بەبێ تەرم نەمێنێتەوە.

من ڕێگریم لەم کارە کرد و گوتم: تەنانەت بیریشی لێ مەکەنەوە.

لەو کاتەدا دوو سەربازی لژیون لە پشتی درەختەکانی باخەکەوە دەرکەوتن و هەر کە ئادان ئابر چاوی پێیان کەوت، هەردووکیانی ناسی و گوتی: ئەمانەن کە دوێنێ شەو لێرەدا پاسەوانییان دەکرد و پاشان دیار نەمان. ئینجا بەوانی گوت: وەرنە پێشەوە!

ئەو دوو سەربازەی کە خەڵکی سوریا بوون، هاتنە پێشەوە و ئادان ئابر پێی گوتن: ئێوە وەکو سەربازە هەڵاتووەکان وان، چونکە شوێنی پاسەوانیتان بەجێ هێشتووە و ڕۆشتوون. بۆیە دەبێ چەکەکانتان دابنێن و دەست بەسەر بکرێن.

ئەوان گوتیان: ئێمە سەربازی هەڵاتوو نین و شوێنی پاسەوانی خۆمان بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو ئەرکی خۆمان بەجێ گەیاندووە و پاسەوانیمان کردووە. ئێمە شەش کەس بووین کە دەبوایە دوو دوو لێرەدا پاسەوانی بکەین. بە ئێمەیان گوتبوو کە نەهێڵین هیچ کەسێ تەرمی عیسا لەناو گۆڕ دەربهێنێت.

من لەو دوو پاسەوانەم پرسی: ئایا فەرمانتان پێ نەدراوە کە نەهێڵن هیچ کەسێ لە گۆڕەکە نزیك بێتەوە؟

ئەوان وەڵامی نەخێریان دایەوە و گوتیان: کەس ئەم فەرمانەی بە ئێمە نەداوە و تەنیا بە ئێمەیان گوتووە کە ئەرکی ئێمە ئەوەیە نەهێڵین هیچ کەسێ تەرمی عیسا لەناو گۆڕ دەربهێنێت. شەوی ڕابردوو چەندین جار یەهوودییەکان لە گۆڕەکە نزیك بوونەوە تاکو لەوە دڵنیا بن کە کەس ناتوانێ گۆڕەکە هەڵبداتەوە و، تەرمی عیسای لەناودا دەربهێنن، بەڵام هیچکامیان دەستیان لە مۆری گۆڕەکە نەدا.

من لەو دوو سەربازەی لژیونم پرسی: دواتر چی ڕووی دا؟

ئەوان گوتیان: کاتێ نۆرەی پاسەوانیی ئێمە بوو، کەمێك پێش هەڵهاتنی خۆر، بوومەلەرزە ڕووی دا. بوومەلەرزەکە ئەوەندە قایم بوو کە بەردی گۆڕەکانی لەجێی خۆیان جوڵاند و فڕێی دان. ئێمە بەهۆی ترسێکی زۆرەوە لەم سنوورە دوور کەوتینەوە، چونکە ئەگەر لێرە بمابایەوە، ئەوا بەهۆی کەوتنە خوارەوەی بەردەکان، دەکوژراین.

بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە لە گۆڕەکە دوور کەوتبووینەوە، هێشتا دەمانتوانی لەو ڕێگە دوورەوە گۆڕەکە بخەینە ژێر چاودێریەوە.

من لەو دووانەم پرسی: ئێوە کە لەو ڕێگە دوورەوە گۆڕەکەتان خستۆتە ژێر چاودێریەوە، شتێکی نائاساییتان نەبینی؟

سەربازەکان گوتیان: بەهیچ جۆرێ.

پرسیم: دوای ئەوەی کە بوومەلەرزەکە کۆتایی هات، ئێوە لە کوێ بوون؟ چونکە ئەو دوو کەسە (ئاماژە بە دوو سەربازە سریانییەکان کە لەگەڵ خۆمان هێنابوومان) هاتوون کە تا لەجیاتی ئێوە پاسەوانی بکەن، کەچی ئێوەیان نەبینیوە. ئەگەر ئێوە لە شوێنێك بوون کە توانیوتانە گۆڕی عیسا بخەنە ژێر چاودێریەوە، دەبوو ئەم دوو کەسە ئێوەیان بدیبایە یان ئێوە ئەم دوو کەسەتان بدیایە و خۆتان بگەیاندایەتە ئەوان و شوێنی پاسەوانیتان بدایە بە دەستیانەوە و بۆ پشوودان بگەڕێنەوە بۆ قەڵا.

دوو سەربازەکە گوتیان: ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئێمە لە دووبارە بوونەوەی بوومەلەرزە دەترساین و نەماندەوێرا خۆمان بگەیەنینە ئێرە، بۆیە لە دوورەوە چاوەدێری گۆڕەکەمان دەکرد.

گوتم: خۆ تەنیا ماوەیەکی کەم، دوای بوومەلەرزەکە، هەوا تاریك بوو، ئینجا سپێدەی بەیانی هەڵهات. ئێوە چۆن دەتانتوانی لەو تاریکیەدا لە دوورەوە چاوەدێری گۆڕی عیسا بکەن؟ ئێوە ئەوەندە لە گۆڕەکەوە دوور بوون کە ئەو دوو سەربازەتان نەبینیوە کە هاتبوون تا شوێنی پاسەوانییەکەتان لێ وەربگرن و، بگەڕێنەوە بۆ قەڵا. کەواتە چۆن توانیوتانە گۆڕی عیسا بخەنە ژێر چاوەدێریەوە؟

دوو سەربازەکە بێدەنگ بوون. من درێژەم پێدا: پاسەوانیی ئێوە لە شوێنێکی دوورەوە، لە شەوی ڕابردوودا ئەوەندە کاریگەر بووە کە ئێستە تەرمی عیسا لەناو گۆڕدا نەماوە.

دوو سەربازەکە بە سەرسامیەوە پرسییان: تەرمی عیسا لەناو گۆڕدا نییە؟

گوتم: نەخێر.

پێش ئەوەی قسەی تر بکرێت، پێنج کەس دەرکەوتن کە لە شارەکەوە دەهاتن و، سەیرمان کرد دوو کەسیان لە سەربازانی لژیونن و سیانەکەی تریان لە گەورەکانی جوولەکەن. کاتێ نزیك کەوتنەوە، دەرکەوت کە ئەو دوو سەربازەش خەڵکی سوریان و

لەو گرووپە شەش کەسیەی سەربازە سریانییەکانن کە دەبوایە شەوی ڕابردوو دوو کەس دوو کەس، لە تەنیشت گۆڕی عیسا پاسەوانی بکەن.

ئەو سیٚ یەهوودییە، ئەندامانی ئەنجومەنی بالآی جوولەکە بوون و کاتیٚ گەیشتنە لای ئێمە، بە ڕێزەوە سەریان دانەواند و گوتیان: ئێمە لە شارەکە بووین و بیستمان کە نیازتان وایە دوو سەربازی ڕۆمی، بەهۆی ئەوەی کە شەوی ڕابردوو پاسەوانی گۆڕی عیسا بوون و شوێنی پاسەوانییان بەجیٚ هێشتووە، تەمبیٚ بکەن. ئێمە دوای ڕاوێژ کردن لەگەڵ ئەندامانی ئەنجومەنی بالآی یەهوودی، هاتووین بۆ ئێرە تا پێتان ڕابگەیەنین واز لە تەمبیٚ کردنی ئەو دوو سەربازە بهێنن، چونکە سەربازە ڕۆمییەکان بەهۆی داخوازی ئێمەوە پاسەوانیی گۆڕی عیسایان پیٚ سپێردراوە، ئەگینا ئەوان خۆیان حەزیان لەو پاسەوانییە نەکردووە. هەروەها دوێنیٚ شەو بوومەلەرزە ڕووی دا و بارودۆخێکی نائاسایی خولقاندووە، بۆیە نابیٚ مەسەلەی بەجیٚ هێشتنی شوێنی پاسەوانی لەلایەن ئەم دوو سەربازەوە بایەخی پیٚ بدرێت. ئێمە داواتان لیٚ دەکەین کەمتەرخەمی ئەوان، کە بە دڵنیاییەوە بەهۆی بوومەلەرزەوە بووە، لەبەرچاو مەگرن و کۆتایی بەم مەسەلەیە بهێنن.

گوتم: یاسا و بڕیارەکانی لژیون سەبارەت بە پاسەوانی، ئاشکرا و بیٚ پێچ و پەنایە و ئەگەر پاسەوان شوێنی خۆی بەجیٚ بهێڵیٚ، ئەوا دەبیٚ سزا بدرێت. ئەم دوو کەسەش بەهۆی ئەوەی کە شوێنی پاسەوانییان بەجیٚ هێشتووە، دەبیٚ تەمبیٚ بکرێن.

جوولەکەکان گوتیان: ئەی لاو، تۆ کێیت کەوا بەم جۆرە لەگەڵ ئێمە دەدوێیت؟ ئایا ئێمە دەناسی؟

گوتم: بەڵیٚ، ئێوە دەناسم و دەزانم کە ئەندامی ئەنجومەنی بالآی یەهوودییەکانن.

گەورەکانی یەهوودی گوتیان: تۆ نابیٚ بەم جۆرە لەگەڵ ئێمە بدوێیت، چونکە ئێمە پیاوانی بەتەمەنین و خاوەنی پلەوپایەین، تەنیا فەرمانڕەوای گشتی دەتوانیٚ بەم جۆرە لەگەڵ ئێمە بدویٚ.

گوتم: من شتێکم نەگوتووە کە بیٚ ڕێزی بێت بەرامبەر بە ئێوە. گوتومە ئەم دوو پاسەوانە لەبەرئەوەی بە پێچەوانەی یاسای نیزامی ڕەفتاریان کردووە، دەبیٚ تەمبیٚ بکرێن، ئەگەریش نازانن ئەوە بزانن کە تەرمی عیسا لەناو گۆڕدا دیار نەماوە و من دەبیٚ لەبارەی ئەم بابەتەوە لێکۆڵینەوەیەکی تەواو ئەنجام بدەم.

جووله‌که‌كان به قسه‌كه‌ی من سه‌رسام نه‌بوون و گوتیان: ئێمه ده‌زانین هۆی دیار نه‌مانی ئه‌و ته‌رمه چییه.

من پرسیم: هۆی دیار نه‌مانی ته‌رمی عیسا چییه؟

یه‌هوودییه‌كان گوتیان: هۆی دیار نه‌مانی ته‌رمه‌كه ئه‌وه‌یه كه ئه‌م دوو پاسه‌وانه شه‌وی ڕابردوو له ته‌نیشت ئه‌م گۆڕه‌دا خه‌ویان لێ كه‌وتووه و لایه‌نگرانی عیساش هاتوون و سوودیان له خه‌وی پاسه‌وانه‌كان وه‌رگرتووه و ته‌رمی عیسایان له گۆڕ ده‌رهێناوه. ئێمه بڕوامان وایه ئه‌م دوو پاسه‌وانه‌ی كه دوێنێ شه‌و خه‌ویان لێ كه‌وتووه و له ئه‌نجامدا ته‌رمی عیسا ده‌رهێنراوه، دان به كه‌مته‌رخه‌می خۆیاندا ده‌نێن. به‌ڵام ئێمه له‌م دوو كه‌سه خۆش ده‌بین و نامانه‌وێ سزا بدرێن.

من زانیم ڕێككه‌وتنێك هه‌یه له‌نێوان یه‌هوودییه‌كان و ئه‌و دوو سه‌ربازه‌ی كه پێش ڕوودانی بوومه‌له‌رزه‌كه پاسه‌وانی عیسا بوون و، یه‌هوودییه‌كان به‌و دوو كه‌سه‌یان گوتووه كه ئه‌وانیش بڵێن به‌هۆی خه‌وه‌وه بێ ئاگا بوون. من ده‌مزانی كه مه‌به‌ستی جووله‌كه‌كان ئه‌وه‌یه به‌و جۆره لێكۆڵینه‌وه بكرێت كه گوایه ئه‌و دوو سه‌ربازه له خه‌ودا بوون و شوێنكه‌وتووانی عیسا هاتوون و ته‌رمه‌كه‌یان ده‌رهێناوه.

ئادان ئابر، كه له دووری منه‌وه ڕاوه‌ستابوو، بانگم كرد بۆ لای خۆم و دوو سه‌ربازه سه‌رپێچی كاره‌كه‌م پێ نیشان دا و گوتم: ئه‌م دوو كه‌سه شه‌وی ڕابردوو له‌كاتی پاسه‌وانی كردندا خه‌وتوون. خۆ تۆ ئه‌وه ده‌زانی كه هه‌ر سه‌ربازێكی لژیون له‌كاتی پاسه‌وانی كردندا خه‌وی لێ بكه‌وێ یان جێگه‌كه‌ی خۆی به‌جێ بهێڵێت، ئه‌وا یه‌كه‌مجار به قامچی لێی ده‌ده‌ن پاشان ده‌یكوژن.

دوو پاسه‌وانه سه‌رپێچی كاره‌كه كاتێ ئه‌و قسه‌یان له من بیست، ترسان و كه‌مێك له‌گه‌ڵ یه‌كدیدا قسه‌یان كرد و پاشان به‌ره‌و ڕووی یه‌هوودییه‌كان ڕۆشتن و داوای یارمه‌تیان لێ كردن.

یه‌هوودییه‌كان گوتیان: ئه‌م سه‌ربازانه به‌پێی خواستی ئێمه له‌م شوێنه پاسه‌وانییان له گۆڕی عیسا كردووه نه‌ك به‌پێی خواستی ڕۆم. كه‌واته ئه‌وه ئێمه‌ین كه ده‌توانین داوا بكه‌ین سزا بدرێن یان نا.

گوتم: ده‌ڵێی ئێوه تێنه‌گه‌یشتوون كه من چیم گوتووه و تێ ناگه‌ن كه هۆی كه‌مته‌رخه‌می ئه‌م دوو سه‌ربازه له‌كاتی ئه‌نجامدانی ئه‌ركه‌كانیان چی ئاكامێكی لێ

کەرتوتەوە. بۆیە دووبارە پێتان دەڵێمەوە تەرمی عیسا لەناو گۆڕدا نەماوە. ئەگەر باوەڕم پێ ناکەن، ئەوا خۆتان بڕۆنە ناو گۆڕەکەوە تاکو بەچاوی خۆتان بیبینن کە تەرمەکەی تێدا نییە.

من نەدەبوو ئەم قسەیەم بە جوولەکەکان بگوتایە و ئیزنم بدانایە بڕۆنە ناو گۆڕەکەی عیساوە، چونکە کاتێ ئەوان چوونە ناو گۆڕەکەوە، کفنەکەی عیسا کە گوتم دەستی لێ نەدراوە و وەکو ئەوە وابوو کە تەرمێکی تێدا بێت، دڕاندیان و بە دەست شێواندیان و کفنەکەیان وا لێ کرد کە هەرکەسێ بیبینیایە دەیگوت کفنی عیسایان دڕاندووە و عیسایان لەناویدا دەرهێناوە.

بەهەرحاڵ، سێ پیاوە یەهوودییەکە دوای ئەوەی کەمێك لەگەڵ یەك قسەیان کرد، چوونە ناو گۆڕەکەوە. لەبەرئەوەی لەناو گۆڕەکە زۆریان پێ چوو، بۆیە منیش چوومە ناو گۆڕەکەوە تاکو بزانم چی دەکەن. کاتێ گەیشتمە ژوورەکەی عیسا، سەیرم کرد ئەو سێ کەسە خەریکی گفتوگۆ کردنن و لەبەرئەوەی بە زمانی عیبری قسەیان دەکرد، بۆیە نەمدەزانی چی دەڵێن.

کاتێ ئەوان منیان بینی، گوتیان: ئێمە گومانمان نییە کە شوێنکەوتوانی عیسا، ئەو کاتەی دوو پاسەوانەکەی گۆڕەکە لەخەودا بوون، هاتوون و تەرمی پێشەواکەی خۆیان لەناو گۆڕ دەرهێناوە و بردوویانە. ئێمە ئێستە دوای ئەوەی لێرە ڕۆشتینە دەرەوە، دەچین بۆ لای فەرمانڕەوا و ڕاستیەکەی پێ دەڵێین تا ئەو پڕوپاگەندانەی کە دوور لە ڕاستین و لەبارەی تەرمەکەی عیساوە دەکرێت، نەکەوێتە سەر زاران.

کاتێ ئەو سێ جوولەکە لە ژوری تەرمەکە چوونە دەرەوە، سەیرم کرد کفنەکەی عیسایان دڕاندووە و شێواندوویانە. پێش ئەوەی ئەو سێ کەسە بڕۆنە ناو ژووری تەرمەکەوە، کفنەکەی عیسا دەستی لێ نەدرابوو و شکڵی تەرمی عیسای بەخۆوە گرتبوو و، هەرکەسێ ئەو کفنەی بدیایە، ئەوا دەیزانی کە عیسا بە شێوەیەکی مۆجیزە ئاسا لەناویدا چۆتە دەرەوە. بەڵام دوای ئەوەی کە یەهوودییەکان چوونە ژووری تەرمەکەوە، بە ئەنقەست کفنەکەیان دڕاند و شێواندیان بۆئەوەی هەرکەسێ چاوی بە کفنەکە کەوت، وابزانێ کە بۆ دەرهێنانی تەرمی عیسا، کفنەکەیان دڕاندووە.

من ئەو مەسەلەیەم بە ئادان ئابر گوت و بۆم ڕوون کردەوە کە یەهوودییەکان، دوای ئەوەی چوونە ناو گۆڕەکەوە، کفنەکەی عیسایان دڕاندووە و شێواندوویانە تاکو

مەسەلەی دیارنەمانی تەرمی عیسا بەشێوەی مۆجیزە ئاسا لەناو بچێت و شێوەیەکی ئاسایی لەخۆ بگرێت.

ئادان ئابر گوتی: ئێستە تۆ چی دەکەیت؟

گوتم: من ئێستە لێرە هیچ ئیشێکم نییە و دەچم بۆ لای فەرمانڕەوای گشتی تاکو چۆنییەتی ڕووداوەکەی بۆ بگێڕمەوە. ئیتر بڕیاردان بەدەست ئەوە.

دوای ئەوەی من و ئادان ئابر بەڕێ کەوتین و شەش سەربازەکەی لژیونیش کە خەڵکی سوریا بوون، بە دواماندا هاتن. یەهوودییەکانیش لە دوای ئەوانەوە دەهاتن. لە ڕێگادا سەربازەکانی لژیون، بەبێ پچڕان قسەیان دەکرد و دەیانویست بزانن کە کاتێ گەیشتنە لای فەرمانڕەوای گشتی "یودە"، چی بڵێن باشە.

کاتێ ئێمە چووینە ناو قەڵای "ئەنتۆنییە"، سەیرمان کرد کە "پونتوس پیلات"- فەرمانڕەوای گشتی "یودە" لەسەر ڕاخەرێکی سوور دانیشتووە و کاتێ چاوی پێمان کەوت، گوتی: وەرنە پێشەوە!

ئێمە لێی نزیك بووینەوە و ئەو بە منی گوت: مەزن تیوس، تۆ پیاوێکی زیرەك و دادگەریت. وەرە لەلای ڕاستی من بە. ئەم سێ پیاوە ناودارە یەهوودییەش کە ئەندامی ئەنجومەنی بالاّی جوولەکەکانن، لەلای چەپی من دەبن. ئەو شەش کەسەشتان (ئاماژە بە شەش سەربازەکەی لژیون) لە بەرامبەر من ڕاوەستن!

ئێمە بەقسەمان کرد و پونتوس پیلات بە سەربازەکانی گوت: لە من مەترسن و هەرچی ڕووی داوە، بۆم بگێڕنەوە.

سەربازەکان کە خەڵکی سوریا بوون، کەمێك لە یەکتری ڕا مان و ئینجا یەکێ لەوان لەلایەن خۆی و ئەوانی تریشەوە گوتی: ئەی فەرمانڕەوای گەورە، سوێند بێ بە "سیزار"[14] ئەوەی دەیڵێم ڕاستە. شەوی ڕابردوو بەپێی داوای یەهوودییەکان و ئەو فەرمانەی کە تۆ دەرت کرد، بڕیار وابوو ئەم شەش کەسەمان، دوو کەس دوو کەس لە تەنیشت گۆڕی عیسادا پاسەوانی بکەین بۆئەوەی کەس تەرمەکەی لەگۆڕ دەرنەهێنێت. کاتێ سەرەی پاسەوانییەکەی من و هاوڕێکەم گەیشت و، لەبەرئەوەی یەهوودییەکان میهرەبانییان لەگەڵ ئێمە نواند و خواردنەوەیان بۆ هێنایین، دەستمان بە خواردنەوە

---

[14] لەبەرئەوەی ڕۆمیەکان لە دوای مەرگی (سزار) سوێندیان بە ناوی ئەو دەخوارد، ئەو وڵاتانەشی کە لەژێر دەسەڵاتی ڕۆمیەکان بوون، وەکو خەڵکی سوریا، سوێندیان بە ناوی ئەو دەخوارد.

کرد و، هەروەها لەبەرئەوەی لە تەنیشت گۆڕەکەوە دانیشتبووین، خەومان لێ کەوت. یەك جار بەهۆی بوومەلەرزەوە بەئاگا هاتینەوە و سەیرمان کرد شوێنکەوتوانی عیسا تەرمەکەی ئەویان لە گۆڕ دەرهێناوە و خەریك بوون تەرمەکەیان دەبرد. ئەوان پیاوانی ترسناك بوون و چەکیان پێ بوو، ئەم دوو کەسەشمان نەماندەتوانی ڕووبەڕوویان ببینەوە و ڕێگری لە بردنی تەرمەکە بکەین. بەم جۆرە، تەرمەکەی عیسا لە گۆڕ دەرهێنرا و بردیان، بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکی ئێمەشی تێدا بێت جگە لە خەوتنەکە.

فەرمانڕەوای گشتی پرسی: ئایا زانیتان ژمارەی ئەوانەی کە تەرمەکەی عیسایان لەگۆڕ دەرهێنا و بردیان، چەند کەس بوو؟

ئەو سەربازەی کە بە نوێنەرایەتی ئەوانی تر قسەی دەکرد گوتی: بەڵێ، ئەوان دوازدە کەس بوون.

لەو کاتەدا یەکێ لەو سێ کەسە یەهوودییەی کە ئەندامی ئەنجومەنی باڵای جوولەکەکان بوو، گوتی: من پێموایە سەربازەکان کەمێك هەڵەیان کردووە و ژمارەی ئەو کەسانەی کە تەرمی عیسایان بردووە، یازدە کەس بوون، چونکە یەکێ لە شوێنکەوتووە دوانزە کەسیەکەی عیسا کە لەوانی دیکە جیا بوویەوە، کوژراوە و تەرمەکەی دۆزرایەوە و دەرکەوت کە ئەویان بە زونارەکەی خۆی خنکاندووە.

فەرمانڕەوای گشتی لەو سەربازەی پرسی: کاتێ شوێنەکەوتووانی عیسا تەرمی ئەویان لە گۆڕ دەرهێنا تا بیبەت، ئایا تۆ و هاوڕێکەت تەرمەکەتان بینی یان نا؟

سەربازەکە گوتی: بەڵێ، ئێمە تەرمەکەی عیسامان بینی.

فەرمانڕەوای گشتی پرسی: تەرمەکە کفنی پێوە بوو یان بێ کفن بوو؟

ئەو سەربازە کەمێك لە هاوڕێکانی ڕاما و دیار بوو هاوکاری لەوان دەوێ، بەڵام ئەوان نەیانتوانی کۆمەکی بکەن و سەربازەکە بە فەرمانڕەوای گوت: ئاشکرایە کە تەرمەکەی عیسا کفنی پێوە بوو.

ئەو ئەندامەی ئەنجومەنی باڵای جوولەکەکان کە ڕەخنەی لە ژمارەی شوێنکەوتوانی عیسا گرت، گوتی: نەخێر وانییە. کاتێ تەرمی عیسایان لەگۆڕ دەرهێناوە، کفنی پێوە نەبووە، چونکە شوێنکەوتووەکانی کفنەکەیان دڕاندووە و تەرمەکەیان لێ دەرهێناوە. پاشان کفنەکەیان خستۆتەوە ناو گۆڕەکە و تەرمی بێ کفنیان لەگۆڕەکە دەرهێناوە.

سەربازەکە گوتی: لەوانەیە وابێت.

فەرمانڕەوا پرسی: کاتێ تەرمەکەیان لەگۆڕ دەرهێنا، ڕۆژ هەڵهاتبوو یان نا؟

سەربازەکە وەڵامی دایەوە: ئەی فەرمانڕەوای گەورە، بەو جۆرەی کە گوتم بوومەلەرزە ئێمەی لەخەو هەستاند و سەیرمان کرد تەرمەکەی عیسایان لەگۆڕ دەرهێناوە و خەریک بوون دەیانبرد. ئەو کاتە هەوا بەتەواوی تاریک بوو.

فەرمانڕەوا گوتی: ئافەرین بۆ سەربازانی وەکو ئێوە کە لەو تاریکیەشدا توانیوتانە تەرمەکەی عیسا ببینن و شوێنکەوتووەکانیشی سەرژمێر بکەن!

دیار بوو گوتەی کۆتایی فەرمانڕەوا لە ڕووی گاڵتە پێ کردنەوە بوو، بۆیە ئەو دوو سەربازەی کە دەیانگوت بەهۆی خواردنەوەی شەرابەوە خەویان لێ کەوتووە، بە ترسەوە لەیەکترییان دەڕوانی.

من زمانم کردەوە و گوتم: فەرمانڕەوای گشتی، ئیزن بدەن من قسە بکەم. بەڵام فەرمانڕەوا بە ئاماژەیەکی خۆشەویستانە فەرمانی پێدام بێدەنگ بم و گوتی: تۆ دواتر قسە دەکەیت.

من دەمم داخست و فەرمانڕەوا ئەمەی گوت: ڕوونکردنەوەکانی ئەم سەربازە ڕاستگۆیە وا نیشان دەدات کە ئەوەی گوتوویەتی ڕاستە و شوێنکەوتوانی عیسا سوودیان لە خەوی دوو پاسەوانەکە وەرگرتووە و تەرمەکەی عیسایان لە گۆڕ دەرهێناوە و بردوویانە، هەروەها لەبەرئەوەی هاوڕێ جوولەکەکانی ئێمە لەم دوو پاسەوانە بووراون، بۆیە منیش کەمتەرخەمیەکانیان لەبەرچاو ناگرم و سزایان نادەم. ئایا قسەکەی من پەسەندە یان نا؟

سێ یەهوودییە بەساڵاچووەکە گوتیان: ئەی فەرمانڕەوای گشتی یودە، قسەکەت پەسەندە.

ئەو سەربازانەی کە کەوتبوونە بەر بەخشینی فەرمانڕەوا، چۆکیان دادا و گوتیان: ئەی خوداوەند،[15] قسەکەی تۆ پەسەندە و ئێمە داوا لە خودایانی سوریا و خودایانی ڕۆم دەکەین پاداشتی باشت پێ بدەنەوە.

[15] لە فارسیەکەشدا بە (خوداوەند) هاتووە. دیارە لەو زەمانەدا دەستەڵاتدارەکانیان بە خودا و خودلوەند بانگ کردووە، بەڵام مەبەستی دەربڕینی ئەو جۆرە وشانە چۆن بووە یان نا، ئەوە مێژوو نووسەکان و ئەوانەی شارەزای مێژوون، دەیزانن. (و. کوردی)

فەرمانڕەوا گوتی: ئەم مەسەلەیە کۆتایی پێ هات و ئیتر نابێ سەبارەت بەوە قسە بکرێت.

من هاتمە قسە و گوتم: فەرمانڕەوای گشتی، ئیزنم دەدەیت هەواڵەکانی خۆمت پێ ڕابگەیەنم؟

فەرمانڕەوا گوتی: من دەزانم تۆ پیاوێکی زانا و دادگەریت. بەڵام تۆ ئەوکاتە گەیشتوویتە گۆڕی عیسا کە تەرمەکەیان لە گۆڕەکە دەرهێناوە و بردوویانە، بۆیە نەوتوانیوە بەچاوی خۆت تەرمەکەی عیسا ببینیت، بەتایبەت کە ئەم دوو سەربازە بردنە دەرەوەی تەرمەکەی عیسایان بینیوە.

گوتم: ئەم قسەیە ڕاستە. بەڵام تۆ کارێکت پێ سپاردم، بۆیە دەبوایە من هەواڵەکەم بە تۆ بدایە.

فەرمانڕەوا گوتی: ئەو کارەی من بە تۆم سپارد بۆئەوە بوو کە وامدەزانی ئەم دوو سەربازە شوێنی پاسەوانی خۆیان بەجێ هێشتووە و هەڵهاتوون، لەکاتێکدا ئەوان ڕایان نەکردووە، بەڵکو لە شوێنی پاسەوانی خۆیان بوون، بەڵام لەوێ خەویان لێ کەوتووە. خەوتن لە شوێنی پاسەوانیدا لەگەڵ ڕەهاکردن و هەڵهاتن جیاوازی هەیە. بۆیە دوای ئەو ڕوونکردنەوانەی کە ئێستە من گوێم لێی بوو، هەوڵەکانی تۆ وەلا نراوە و پێویست بەو هەولآنە ناکات کە تۆ بەتەمایت پێم ڕابگەیەنیت.

دوای ئەم قسەیە فەرمانڕەوای گشتی لەسەر ڕاخەرەکەی خۆی هەستایەوە تا جوولەکەکان تێ بگەیەنێ کە دەبێ بڕۆن.

## گفتوگۆکردنم لەگەڵ فەرمانڕەوای گشتیدا

جوولەکەکان ڕۆیشتن و سەربازەکانی لژیونیش دەیانویست دوور بکەونەوە، بەڵام فەرمانڕەوای گشتی پێی گوتن: کەمێك ئارام بگرن.

سەربازەکان ڕاوەستان و پونتوس پیلات، فەرمانده‌ی لژیونی ئاگادار کردەوە و گوتی: وا دیارە تۆ بە پێچەوانەی ئەم سەربازانە هیچ دیاریەکت لە یەهوودییەکان وەرنەگرتووە و هەر بۆیە ئەم دوو سەربازەی کە لەشوێنی پاسەوانییەکەیاندا خەویان لێ کەوتووە، بەتۆ دەسپێرم تا بەپێی یاسای لژیون مامەڵەیان لەگەڵ بکەیت، چونکە هەرچەندە من ئەوانم بەخشیوە، بەڵام پێم وانییە لژیون، کە زۆر پابەندە بە ڕێکخستنەوە، بتوانێت لێیان ببورێت. پاشان فەرمانڕەوا بەجۆرێك کە سەربازەکان گوێیان لێی نەبێت، بە فەرماندەی مەخفەری گوت: دوای ئەوەی کە ئەوانتان زیندانی کرد، دەتوانن لێکۆڵینەوەیان لێ بکەن و بزانن جوولەکەکان چەندە پارەیان پێداون کەوا ئەوان، ئەوەندە بوونەتە کەسانێکی ڕاستبێژ.

فەرماندەی لژیون پێکەنی و، خێرا فەرمانی دەرکرد ئەو دوو سەربازە ببەن بۆ زیندان. ئینجا فەرماندەی لژیون و "ئادان ئابر" ڕۆیشتن و فەرمانڕەوا کەوتە ڕێ و بە منی گوت: "مەزن تیوس" وەرە!

من لەدوای فەرمانڕەوای گشتییەوە کەوتمەڕێ بۆ ژووری کارەکەی و، فەرمانڕەوا دانیشت و پێی گوتم کە دابنیشم. پاشان گوتی: ئێستە ئامادەم بۆ بیستنی ڕاپۆرتەکەت.

من کەمێك بێدەنگ بووم و پاشان گوتم: فەرمانڕەوای گشتی، من لەوێ شتێکم بینی کە مایەی سەرسوڕمانە.

فەرمانڕەوا گوتی: ئەو شتە سەرسوڕهێنەرە چییە؟

گوتم: ڕەفتاری تۆ بووە هۆی سەرسامی من و بڕواشم وایە کە بێ هۆ نییە و، پێویست ناکات داوا لە فەرمانڕەوای گشتی بکەم تا هۆکاری ئەو ڕەفتارانەی خۆیم پێ

بڵێت، چونکە من بە فەرمی سەر بەهیچ کەس و لایەنێك نیم تا بتوانم زۆر لە هیچ کەسێ بکەم.[16]

فەرمانڕەوای گشتی تورەکەیەکی چەرمینی گوشی و کەمێك پارەی ئاڵتونی تێدا دەرهێنا و دەستی بە ژماردنیان کرد و گوتی: هەروەکو هەستت پێ کرد، ڕەفتاری ئەمڕۆی من هۆکاری هەیە، ئەویش هۆکارێکی گەورەیە، بەڵکو دەتوانرێ بگوترێ کە هۆکارێکی گەورە پاڵنەرم بووە تا بەو جۆرە ڕەفتار بکەم. دوای ئەم گوتەیە، دەستی خۆی پڕ کرد لە پارە زێڕەکان و خستیە بەردەمی من و گوتی: ئەو هۆکارەی کە ئەمڕۆ وای لە من کرد بەو جۆرە ڕەفتار بکەم، ئەمەیە. ڕاست بڵێ کە لە دنیادا، لەم هۆکارە گەورەتر بوونی نییە. من ئەگەر پیاوێکی دەوڵەمەند و بەتوانا بوومایە، نەمدەتوانی ئەم زێڕانەم نەوێت چی بگات بەوەی کە پیاوێکی بێ سەرمایە لەقەڵەم بدرێم. ئەگەرچی "کلودیا"ی هاوسەرم دەوڵەمەندە بەڵام ئەو، دەمی تورەکەکەی خۆی بە توندی گرێ داوە و کەمێك لە داراییەکەیم ناداتی. بۆیە من ناچارم ئەو دیاریانە وەربگرم کە جوولەکەکان پێم دەدەن و بەپێی خواستەکانیان ڕەفتاریان لەگەڵ بکەم. هەتا دنیا مابێ، ئەو کەسانەی کە پێویستیان بە فەرمانڕەوا هەیە، هەوڵ دەدەن بەشێوەی ڕەشوە فەرمانڕەوا لەخۆیان ڕازی بکەن و بیانکەنە یاریدەدەری خۆیان.

گوتم: ئەی فەرمانڕەوای گشتی، تۆ گوتت تا دنیا بمێنێ، ڕەشوە پێدان بەردەوامی دەبێت، بەڵام من بڕوام وایە بارودۆخی دنیا گۆڕانکاری بەسەردا دێت.

فەرمانڕەوای "یودە" کە جارجارە خەریکی ژماردنی پارە بوو، پرسی: بۆچی بارودۆخی دنیا گۆڕانی بەسەردا دێت؟

گوتم: بۆئەوەی ئەو "عیسا"یەی کە تۆ لە سێدارەت دا، لەناو گۆڕ هاتۆتە دەرەوە و ڕۆشتووە و، منیش کە خۆم چوومە ناو گۆڕەکەوە، بینیم کفنەکەی بچوکترین گۆڕانکاریشی بەسەردا نەهاتبوو و، هەرکەسێکیش ئەو کفنەی بەو جۆرە بدیایە، وایدەزانی عیسای لەناودایە.

[16] لە ڕۆمدا ئەو کەسانەی کە بۆیان هەبوو زۆر لە بەرپرسەکان بکەن، ئەوانە بوون کە ئەنجومەنی پیران بۆ ڕاگەیشتنی کارەکانی فەرمانڕەواکان و کەسانی تر هەڵیاندەبژاردن و خاوەن سانسۆرەکان وەکو پشکنەرێکی پایەبەرزی ئەمڕۆ وابوون.

ئینجا ئەوەی کە لەناو گۆڕەکەدا بەچاوی خۆم بینیم، بۆ فەرمانڕەوام گێڕایەوە و پێم گوت کە "ئادان ئابر"یش کفنەکەی عیسای بەو شێوەیە بینیوە و گوتیشم کە عیسا قسەکەی بەجێ گەیاند و سێ ڕۆژ دوای مردنی، لەگۆڕ هاتە دەرەوە.

فەرمانڕوای گشتی دوای ئەوەی پارە زۆرەکانی ژمارد، هەموویانی خستە ناو کیسەیەکی چەرمیەوە و بە پارچە پەتێ دەمی کیسەکەی گرێ دا و پاشان گوتی: ئەو پیلانەی کە یەهوودییەکان بۆ تەرمی عیسایان داڕشت، ئەوەندە زیرەکانە بوو کە ئەگەر من بمتوانیایە، دەچووم و سەیری یاریەکەیانم دەکرد.

فەرمانڕەوا ئەوەندە بە باوەڕێکی تەواوەوە ئەم قسەیەی کرد کە منیشی تووشی گومان کرد، ئەمە لەکاتێکدا کە بەچاوەکانی خۆم کفنەکەی عیسام بەدەست لێ نەدراوی بینیبوو کە وای نیشان دەدا عیسا لەناو کفنەکە هاتۆتە دەرەوە بەبێ ئەوەی کفنەکە بدرێت.

فەرمانڕەوای گشتی یودە گوتی: من هەرکە قسەکانی ئەو دوو سەربازەم بیست، زانیم درۆ دەکەن. چونکە کاتێك سەربازی لژیون پاراستنی مۆر و مۆمی لژیونی پێ دەسپێردرێ، مەحاڵە خەوی لێ بکەوێت، بەتایبەت ئەگەر سەربازەکە خەڵکی سوریا بێت کە ئەوەندە خورافە پەرستن و لە گۆڕی مردوو دەترسێن و ناتوانن لە تەنیشت گۆڕدا بخەون. من ئەو بەشەی ڕونکردنەوەکانی تۆ کە دڵێیت بەهۆی بوومەلەرزەوە بەردی سەر گۆڕەکەی عیسا لاچووە، پەسەند دەکەم. بەڵام پاش ئەوە بێگومان تەرمی عیسایان لەگۆڕ دەرهێناوە.

فەرمانڕەوا کەمێك بێدەنگ بوو و پاشان گوتی: من لەبەرئەوەی دەبوایە لەسەر داوای جوولەکەکان عیسام بهێنایەتە قسە، بەتەنیا دواندم. ئەو دەیگوت کە نێردراوی خودایە و بۆئەوە هاتووە تا ڕاستیەکان نیشانی تاکەکانی مرۆڤ بدات. من پێم گوت فەلسەفەکان ماوەیەکە ئەوەیان سەلماندووە کە لە دنیادا ڕاستی تەواو بوونی نییە و هەموو ڕاستیەك ڕێژەییە و، گەورەیی و بچوکی ڕاستیەکانیش پەیوەندیان بە یەکترەوە هەیە. ئەویش دەیگوت وانییە و، من ڕووداو جیا دەکەمەوە لەگەڵ ڕاستی. ئەوەی کە گەورەیی و بچوکی هەیە، ڕووداوە، ئەو ڕووداوەش کە سبەی دێتە پێش، لەوانەیە ڕووداوەکەی ئەمڕۆ بەدرۆ بخاتەوە، بەڵام ڕاستی شتێك نییە کە ئەمڕۆ کاتەکەی بەسەر بچێت یان بگۆڕێت. ئەو شتەی کە هەزار ساڵ لەمەوبەر ڕاست بووبێ، ئەمڕۆش هەر

ڕاسته و هەزار ساڵی تریش هەر ڕاست دەبێ. هەزار ساڵ لەمەوپێش ئەم ڕاستیە هەبووە کە پێنج کۆی پێنج دەکاتە دە. ئەمڕۆکەش ئەمە ڕاستە و هەزار ساڵی تریش هەر پێنج کۆی پێنج دەکاتە دە و، مەحاڵە ڕۆژگارێك بێت بکاتە پانزە. من دەمزانی عیسا ترسی لە من نییە و ڕەفتاری بەجۆرێك بوو کە من خۆم لە ئاستیدا بە بچوك دەزانی. من شەرمم لەوە نەدەکرد کە لەبەرامبەر ئەو پیاوەدا خۆم بە بچوك بزانم، چونکە هەستم دەکرد عیسا بەڕاستی گەورەیە. ئەی مەزن تیوس، لەبەرئەوەی تۆ گوتت کە من عیسام لەخاچ داوە، دەبێ پێت بڵێم کە من نەمویستووە ئەو پیاوە نەرم و نیانە بکوژم. لەکاتی دواندندا چەندین جار ڕێگەی دەرباز بوونم پێ نیشان داوە و تێمگەیاندووە کە ئەگەر لەو ڕێگەیەوە بڕوات دەرباز دەبێ، بەڵام ئەو ئامۆژگاریەکانی منی پەسەند نەکرد و نەیدەویست بچوکترین هەنگاو بۆ دەرباز بوونی خۆی بنێت. هەروەها لەبەرئەوەی بارودۆخی سیاسیش لەگەڵ عیسادا نەدەگونجا، بۆیە نەمتوانی ئەو پیاوە لە مەرگ ڕزگار بکەم. من هەستم دەکرد عیسا دەزانێ فەرمانی لەسێدارەدانی بەسەردا دەدرێت و تەنانەت هەستم دەکرد کە ئەو حەز دەکات لەسێدارە بدرێت. چونکە بە منی دەگوت ئەگەر من نەکوژیت، بەڵگەکانی من پێ ناگەن و، دەبێ لەڕێی ڕاستیدا گیانم فیدا بکەم بۆئەوەی بەڵگەکانم بسەلمێن.

ئینجا فەرمانڕەوا نیگای بڕییە چاوەکانم و گوتی: مەزن تیوس، من دەزانم کە عیسا بۆتۆ گرنگ و بەبەها بووە. ئەو پیاوە باشە بۆ منیش گرنگی و بەهای هەبووە و، ڕام وایە پیاوێکی سروشت پاك بووە. بەڵام ئەو پیاوە پاکە بەو جۆرەی کە خۆت بینیت، بەخاچەوە گیانی سپارد و تەرمەکەیان لەخاچەکە هێنایە خوارەوە و خستیانە گۆڕەوە. لە پیاوێکی زانای وەك تۆ ناوەشێتەوە کە بڵێیت عیسا لە ڕۆژی سێیەمی دوای مردنی زیندوو بۆتەوە و لەگۆڕ هاتۆتە دەرەوە. ئەگەر ئەم قسەیە لەلایەن کەسانی نەزانەوە بکرێت، نابێتە هۆی سەرسوڕمان، چونکە کەسانی نەزان مێشکی خۆیان بۆ درك کردن بە بابەتەکان ناخەنە کار و، هەرچیەك ببیستن یەکسەر وەری دەگرن و، بەو ئاسانییە گومانیان لەو شتانە نییە کە وەریان گرتووە. هەموو جۆرە ڕووداوێکی باوەڕ پێنەکراو لەلایەن کەسانی نەزانەوە شایانی پەسەند کردنە، بەڵام تۆ کە پیاوێکی زانایت، نابێ بڵێیت مردوو زیندوو دەبێتەوە، چونکە هزر و زانست ئەوە پەسەند ناکات کە مردوو

بگەڕێتەوە بۆ ژیان و لەگۆڕ بێتە دەرەوە. عیسا پیاوێکی باش و پەسەندکراو بوو، بەڵام پیاوی باش و پەسەندکراویش دوای ئەوەی کە مرد، بەپێی یاسای سروشت لەناو دەچێت و زیندوو بوونەوە و هاتنە دەرەوەی لە گۆڕ، مەحاڵە.

من ویستم سەبارەت بەو قسانەی کە عیسا لەکاتی دواندنیدا کردبووی، هەندێ پرسیار لە فەرمانڕەوا بکەم، بەڵام هاتنە ژوورەوەی ئادان ئابر بووە هۆی پاشگەز بوونەوەم لەو پرسیارانە. ئادان ئابر هاتە ژوورەوە بۆئەوەی ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەی فەرماندەی لژیون سەبارەت بەو دوو سەربازەی کە پاسەوانی گۆڕی عیسا بوون، بە فەرمانڕەوای گشتی "یودە" ڕابگەیەنێ.

فەرمانڕەوا پرسی: باشە، ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە چی بوو؟

ئادان ئابر گوتی: ئەو دوو سەربازە دانیان بەوەدا نا کە یەهوودییەکان سی درهەمی زیویان بە ڕەشوە داوە بە هەریەکەیان تاکو بڵێن بینیویانە کە شوێنکەوتوانی عیسا تەرمی ئەویان لەگۆڕ دەرهێناوە و بردوویانە، لەکاتێکدا ڕاستیەکەی شتێکی ترە.

فەرمانڕەوا پرسی: ڕاستیەکەی چیە؟

ئەو گوتی: ئەو دوو سەربازە دەڵێن شەوی پێشتر بەپێچەوانەی ئەوەی کە لەلای فەرمانڕەوا گوتویانە، نەنووستوون، چونکە بەهەموو شێوەیەك خەوتن، لەکاتی پاسەوانی کردندا قەدەغەیە. ئەوان ئەوەندە ترساون کە کاتێ بوومەلرزەکە ڕووی داوە، تەنانەت نەشیانوێراوە بخەون بۆیە لە ترسی بوومەلەرزەکە و جووڵانی بەردی گۆڕەکان، لە گۆڕەکەی عیسا دوور کەوتوونەتەوە، بەڵام بەو شێوەیە نا کە نەیبینن. ئەوان ئەوەندە لە گۆڕەکەوە نزیك بوون کە دڵنیان لەوەی کەس لەو گۆڕە نزیك نەبۆتەوە و نەچۆتە ناویەوە تا تەرمی عیسا بێنێتە دەرەوە و، بەو جۆرەی کە ئەو دوو سەربازە دەیڵێن، دوای ئەوەی کە بوومەلەرزە بەردی سەر گۆڕەکەی لاداوە، تیشکێکی وەکو بریقەی ئاسمانیان بینیوە کە لەناو گۆڕەکە هاتۆتە دەرەوە. سەربازەکان بڕوایان وایە تیشکەکە لە ئاسمانەوە نەهات تا بڵێین بریقە و تیشکی ئاسمانییە، بەڵکو لە زەوییەوە، واتە لەناو گۆڕەکەوە هاتۆتە دەرەوە. ئەو دوو سەربازە بە بینینی ئەو ڕووناکیەی کە لەناو گۆڕەکەوە هاتۆتە دەرەوە، ئەوەندە ترساون کە تا ماوەیەك نەیانوێراوە لە گۆڕەکە نزیك ببنەوە. کاتێ لە گۆڕەکە نزیك بوونەوە، بینیویانە کە دەرگای گۆڕەکە کراوەیە. یەکێ لەوان لەلای گۆڕەکە پاسەوانی کردووە و ئەوی تریان ڕۆشتووە و ڕووداوەکەی بۆ

جوولەکەکان گێڕاوەتەوە. ئەوان دەڵێن دڵنیان لەوەی کە دوای بوومەلەرزەکە هیچ کەسیٚ لە گۆڕەکە نزیك نەبۆتەوە تا تەرمی عیسا لە گۆڕ دەربهێنیٚ. سەربازەکان وای بۆ دەچن کە ئەو تیشکەی لە گۆڕەکەوە هاتۆتە دەرەوە، هەمان ئەو عیسا بووە کە دیار نەماوە.

فەرمانڕەوای یودە بەمنی گوت: تۆ باوەڕت بە کام لەم دوو هەواڵەیە؟ تۆ بڕوات وایە شوێنکەوتووانی عیسا تەرمی ئەویان لەگۆڕ دەرهێناوە و بردوویانە تاکو بتوانن بڵێن عیسا لە ڕۆژی سێیەمی دوای مردنی، ڕێك بەپێی گوتەی خۆی زیندوو بۆتەوە و لەگۆڕ هاتۆتە دەرەوە و ڕۆشتووە؟ یاخود بڕوات وایە ئەو تیشکەی کە لە گۆڕەکەوە هاتۆتە دەرەوە، عیسا بووە و بەو شێوەیە لە مەزاری خۆی هاتۆتە دەرەوە و دیار نەماوە؟

گوتم: ئەی فەرمانڕەوای گشتی، من بە چاوەکانی خۆم مەرگی عیسام بە خاچەوە بینی و گومانم لەوە نییە کە مردبوو. ئەمڕۆش بە چاوەکانی خۆم گۆڕەکەیم بینی و دەوروبەری گۆڕەکەم بینی کە بچوکترین نیشانەی پێوە نەبوو تا نیشانی بدات کە گۆڕەکەیان بە پاچ و خاکەناز هەڵدابێتەوە. دوای ئەوەی من و "ئادان ئابر" چووینە ناو گۆڕەکەوە، سەیرمان کرد کفنەکەی عیسا دەستی لیٚ نەدراوە و وا دەهاتە بەرچاو وەك بڵێی تەرمی مردووی لەناودایە. بەڵام دوای ئەوەی دەستمان لە کفنەکە دا، ئینجا زانیمان ناوەکەی بەتاڵە. بۆیە من گومانم لەوە نییە کە عیسا بەپێی گوتەی خۆی لەگۆڕ زیندوو بووبێتەوە و هاتبێتە دەرەوە و، بوومەلەرزەکەش بەو مەبەستە ڕووی داوە تاکو دەمی گۆڕەکە بکرێتەوە و عیسا لەگۆڕ بێتە دەرەوە و بڕوات.

فەرمانڕەوا بە ئادان ئابری گوت: تۆ بڕوات چیە؟ تۆش بڕوات وایە عیسا لەگۆڕەکە زیندوو بۆتەوە و هاتبێتە دەرەوە؟

ئادان ئابر لە وەڵامی فەرمانڕەوادا ڕەوتی پیاوە سیاسیەکانی گرتەبەر و نە وەڵامی ئەرێنی دایەوە و نە وەڵامی نەرێنیش و، گوتی: من ناتوانم سەبارەت بەم بابەتە بۆچوونی خۆم بخەمە ڕوو.

فەرمانڕەوا بە منی گوت: مەزن تیوس، دەزانی ئەگەر من بۆچوونی تۆ پەسەند بکەم، ئەوا لە سەرانسەری ڕۆمدا دەبمە گاڵتەجاڕی خەڵکی؟

پرسیم: بۆچی؟

فەرمانڕەوا گوتی: چونکە ناچارم بە جارچییەکانی ئەم مەملەکەتە بڵێن کە ئەو مردووەی کە سیٚ ڕۆژ لە مردنی تێپەڕیوە و ئەو ماوەیە لەگۆڕدا بوو، زیندوو بوویەوە و لەگۆڕ دەرچووە و هەرکەسیٚ ئەو ببینیٚ دەبیٚ دەستگیری بکات و بیداتە دەستی سەربازەکانی ڕۆم. ناونیشانی مردووە هەڵهاتووەکەش ئەوەیە کە سەرسنگی بەهۆی ئەوەی کە نێزەکیان پێدا کردووە، کون بووە و هەروەها شوێنەواری داکوترانی مێخ لەسەر دەست و پێیەکانیدا دەبینرێت. پاشان فەرمانڕەوا گوتی: مەزن تیوس، من کارم بەسەر بیروبۆچوونی ناخی تۆوە نییە، بەڵام لێت دەپرسم کام لەم دوو هەواڵە زیاتر ڕێی تێدەچێت، ئەگەر بڵێین شوێنکەوتوانی عیسا بە شەو چوونەتە گۆڕەکەیەوە و تەرمەکەیان بردووە، زیاتر باوەڕپێکراوە؟ یاخود بڵێین مردوو زیندوو بۆتەوە و لەناو گۆڕ هاتۆتە دەرەوە؟ بڵیٚ کە هەواڵی یەکەمیان زیاتر باوەڕپێکراوە و لەڕووی سیاسیشەوە یەهوودییەکان ڕازی دەکات، هەروەها لەبەرئەوەش ڕۆم نایەوێت کاریٚ بکات کە جوولەکەکان دەنگیان لێوە بەرز بێتەوە و ڕەخنە بگرن، بۆیە منیش لەبەرئەوەی لەلایەن حکومەتی خۆمەوە لێرە فەرمانڕەوام، ناچارم ڕەچاوی ئەوە بکەم کە ئەو حکومەتە چی بەچاك دەزانیٚ منیش وا بکەم.

گوتم: لەوەدا لەگەڵتدام کە تۆ لەبەرئەوەی لەلایەن دەوڵەتی ڕۆمەوە لێرە فەرمانڕەوایت، دەبیٚ ڕەچاوی بەرژەوەندیەکانی حکومەتەکەی خۆت بکەیت. بەڵام ئەو دوو هەواڵەی کە بە تۆیان ڕاگەیاندووە، یەکێکیان دروست کراوە، ئەویش جوولەکەکانیش دروستیان کردووە و ئەو هەواڵەیان بە هاوپێچ کردن لەگەڵ دیاریەکدا پێشکەش بەتۆ کردووە تا ئێوە لە ڕاپۆرتی فەرمیدا بۆ دەوڵەتی ڕۆم بنووسن کە شوێنکەوتوانی عیسا بەشەو تەرمەکەیان بردووە. من لەوە ڕەخنەت لیٚ ناگرم کە لەبەرچی ئەم هەواڵە پەسەند دەکەیت، چونکە هەروەکو خۆت گوتت، ئەرکی سەرشانی تۆ ئەوەیە. بەڵام ئێزن بدەن سەبارەت بەم بابەتە بیروباوەڕی تایبەتی خۆم کە پشتی بە بینین بەستووە، بپارێزم، بەڵام بیروباوەڕەکەی خۆشم بە خەڵك ناڵێم و لای خۆم دەیپارێزم.

فەرمانڕەوا گوتی: کارێکی باش دەکەیت کە بیروباوەڕی خۆت بە خەڵك ناڵێیت. ئێمە هەرچی زووتر ئەم ڕووداوە لەبیر بەرینەوە، باشترە. ئینجا بە "ئادان ئابر"ی گوت:

ئەو دوو سەربازە یەكی سی درهەمیان لە یەهوودییەكان وەرگرتووە. ئێوە، واتە تۆ و فەرماندەی لژیون، یەكی بیست درهەمیان لێ وەربگرن و لەنێوان خۆتاندا دابەشی بكەن تا هەریەك لە ئێوە، لەسێ بەشی درهەمەكە، دوو بەشتان بەربكەوێت. یەكسەر ئەو دوو سەربازەش ئازاد بكەن، بەڵام شوێنی خزمەتەكەیان بگۆڕن و بیانگوازنەوە بۆ سنوور و پێیان بڵێن زمانی خۆیان بگرن و ئەگەر شتێكیشیان گوت، ئەوا هەردووكیان بێدەنگ بكەن.

هەڕەشەی كۆتایی بەشێوەی ناڕاستەوخۆ منیشی گرتەوە و فەرمانڕەوای گشتی دەیویست پێم بڵێ كە منیش دەبێ زمانی خۆم لەو مەملەكەتەدا بگرم. دواتر زانیم كە دوای ئەوەی لە "یودە"ش چوومە دەرەوە، هێشتا ناتوانم ئەوەی لە گۆڕی عیسادا بینیم، باسی بكەم، چونكە خەڵك وادەزانن من پیاوێكی درۆزنم و بۆئەوەی خۆم بە گەورە پیشان بدەم، درۆ دەكەم و هەركاتێ سور بم لەسەر ئەوەی كە قسەكەی من ڕاستە، "پونتوس پیلات" بە دووزمان تاوانبارم دەكات و دەڵێ كە دەمەوێ ڕێككەوتنەكانی جوولەكە و دەوڵەتی ڕۆم تاریك بكەم و بیشێوێنم. ئەوەشم دەزانی كەسانێك هەبوون كە بە تاوانی لەوە بچوكتریش لەناو چوون.

دوای ئەوەی كە ئادان ئابر ڕۆشت، من گوتم: ئەی فەرمانڕەوا، هەڵبەتە من بابەتی زیندوو بوونەوەی عیسا بە كەس ناڵێم، بەڵام ئایا ئیزنم دەدەیت لێكۆڵینەوە لەبارەی عیساوە بكەم تاكو بزانم ئەو پیاوە كە خۆی بە پێغەمبەر دەزانی، چی گوتووە؟ من مەبەستم لەم لێكۆڵینەوەیە تەنیا بۆ سوودی خۆمە و تەنیا دەمەوێ لە ڕێگەی گوتەكانی ئەو پیاوەوە پەی بە هزری ببەم. تۆ خۆشت دەتگوت كە عیسا پیاوێكی باشە.

فەرمانڕەوا گوتی: باوەڕی خودی خۆم ئەوەیە كە تۆ نابێ بیری خۆت لە خوێندنەوەی بیروبۆچوونەكانی ئایینی یەهوودی بەفیڕۆ بدەیت، بەڵام لەبەرئەوەی هەست ئەكەم كە سەبارەت بە عیسا بزێویت، بۆیە ڕێت پێ دەدەم لێكۆڵینەی لەبارەوە بكەیت، بەمەرجێ سەرنجی خەڵك بۆلای خۆت ڕانەكێشیت. ئەم ڕۆژانە لەم شارەدا هەموو خەڵك لەبارەی عیساوە قسە دەكەن، بەڵام دوای ئەوەی چەند ڕۆژێك تێپەڕی و شوێنكەوتووەكانی بڵاوەیان كرد و هەریەكە و بۆ لایەك ڕۆشتن، ئەوا بەڵێنت دەدەمێ كە عیسا بە تەواوەتی فەرامۆش دەكرێت.

**بەهۆی ئەوەی قسەکانمان گەیشتە ئەم ئاستە، لە فەرمانڕەوا جیا بوومەوە و بەرەو شوێنی پشوودانی ئەفسەرەکان ڕۆشتم تا لەوێ نان بخۆم. کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ بوو، بەڵام نەمدەزانی ئەفسەرە ڕۆمییەکان چی دەڵێن و تەنانەت نەشمدەزانی چی دەخۆم. دوای ئەوەی زانیم نانەکە تەواو بووە، لە جێگەی خۆم هەستامەوە و لە شوێنی پشوودانەکە چوومە دەرەوە و بەرەو شار کەوتمە ڕێ.**

# گفتوگۆکردنم لەگەڵ پیاوە پارەگۆڕەوەکەدا

من لەو دەروازەیەی کەعسیایان لە تەنیشدا لەسێدارەدا، تێپەریم و چوومە ناو شارەوە. دەمبینی زۆربەی خەڵکەکە کە تا ئەوکاتە لە پەرستگابوون، لەوێوە دەگەڕانەوە تاکو بڕۆنەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان و نان بخۆن. لە هەر دوولای شەقامەکەدا دوکانی لێ بوو و هەموو جۆرە کاڵایەکی لەناودا بەدی دەکرا. من لە دوکانەکان نزیك بوومەوە تاکو بزانم چیان تێدایە کە ببێتە جێی بایەخم، بەڵام شتێکی ئاوەهام لە دوکانەکاندا نەدۆزیەوە و، کەلوپەلی دوکانەکان هەر ئەوانە بوون کە من لە ئەسکەندەریە و شارەکانی تر بینیبووم.

ئەو کەسانەی لە پەرستگاوە دەگەڕانەوە، بەپەلە هەنگاویان دەنا، چونکە برسییان بوو و دەیانووسیت زووتر بگەنە ماڵەوە و نان (شیو) بخۆن. بەڵام لەبەرئەوەی من پەلەم نەبوو، بۆیە بە هێواشیێ و لەسەرخۆ دەڕوشیتم بەرێگادا، تاکو گەیشتمە دەروازەی پەرستگاکە و لەوێ چاوم بە دوو ڕیزی سواڵکەر کەوت. پێموایە یەکێ لەو شتانەی کە نابێتە هۆی سەرسامی گەشتیارێك، سواڵکەر و گەدایە. چونکە گەدا لە هەموو شارەکانی دنیادا هەیە. بەڵام من لەهیچ شارێکدا نەمبینیبوو کە ئەو هەموو گەدایە لەیەك شوێندا کۆببنەوە. گەداکان دوو ڕیزی دوور و درێژیان لە هەردوو لای شەقامەکەدا، لە بەرامبەر پەرستگاکە پێك هێنابوو، دیاریش بوو هەریەکەیان جێگەیەکی تایبەتیان هەیە و گەدایەکی تر بۆی نییە جێگەکەیان داگیر بکات. هەندێك لەوان چاویان نەبوو و هەندێکیان دەست یان لاقیان لە دەست دابوو، هەمووشیان هاواریان دەکرد و بە زمانی یەهوودی داوای بەزەییان دەکرد و، ئەوانەی دەستیان هەبوو، دەستیان درێژ دەکرد بۆ وەرگرتنی خێرات. دیمەنی گەداکان بۆ من ئەوەندە نوێ بوو کە ماوەی یەك کاتژمێر لە بەرامبەر دەروازەی پەرستگادا ڕاوەستام و تەماشایانم دەکرد تا پەرستگاکە چۆڵ بوو، گەداکان زانییان کە ئیتر ئەوانیش دەبێ بڕۆن و شیو بخۆن. ئینجا من لەو ڕێگایەی کە پیایدا ڕۆشتبووم، گەڕامەوە و لە شارەکە چوومە دەرەوە و بەرەو ئەو باخە چووم کە گۆڕی لێ بوو. نەریتی یەهوودییەکان وایە کە ڕۆژانی شەممە و ڕۆژانی جەژنی گەورە، لە دوای نانخواردن پشوو دەدەن، بۆیە کە

**من چوومە ناو باخەکەوە کەس لەوێ نەبوو. بەرەو گۆڕەکانی عیسا ڕۆیشتم و جارێکی تر چوومە ناو گۆڕەکەیەوە و سەیرم کرد کفنەکەی کە یەهوودییەکان دڕاندبوویان و شێواندبوویان، لەوێ نەماوە. دیار بوو یەهوودییەکان یان سەربازە ڕۆمییەکان کفنەکەیان بردبوو، بەڵام هێشتا گۆڕەکە بۆنی خۆشی لێوە دەهات. من کەمێك لەو گۆڕەدا مامەوە و بۆنی عەتری ئەوێم کرد و هاتمە دەرەوە.**

**دوای هاتنە دەرەوە لە ناو گۆڕەکە، هەستم بە ماندوویی دەکرد. چونکە دوو شەو لە سەریەك نەخەوتبووم، پێم وابوو لەو باخەدا بخەوم باشترە. لەبن دەرەختێکیاندا باڵا پۆشەکەم پێچا لەخۆم و درێژ کشام و ماوەیەك دواتر خەوم لێ کەوت. کاتێ بەئاگا هاتمەوە، سەیرم کرد خۆر لە کاتی عەسردایە و بەپێوەری ڕۆمییەکان، عەسر چوار کاتژمێر لە نیوەڕۆ تێدەپەڕێت. هەموو نیشانەیەکی ماندوویی لەناو چووبوو و، جەستەم سووك و چالاك ببوو. هەواش وشك و هەست بزوێن ببوو و بە چێژێکی زۆرەوە هەوای هەست بزوێنی ئەو باخەم هەڵدەمژی تاکو چاوم بە باخەوانێك کەوت. باخەوانەکە جلوبەرگێکی وەکو جلوبەرگی کەسە سادەکانی لە بەردابوو و زونارێکی بچووکی لە خۆی بەستبوو. لەبەرئەوەی من بەبێ ئیزنی باخەوان لە باخەکەیدا نووستبووم، بۆیە وام بەباش زانی کە برۆم و ئەم بلبەتەی پێ ڕابگەیەنم. بەمنیان گوتووە کە جوولەکەکان ڕەفتارێکی تایبەتییان هەیە و خێرا دەرەنجێن و، بێگانەکان نابێ کارێ بکەن تا ببێتە هۆی دڵڕەنجانیان. ئەوەبوو هەستامەوە و بەرەو لای باخەوانەکە کە بۆ بەرگری کردن لەتیشکی هەتاو کڵاوێکی جیاوازی لەسەر کردبوو، ڕۆیشتم و گوتم: ئەمڕۆ کاتێ من هاتمە ناو ئەم باخە خۆشەوە، تۆم نەبینی تاکو داوای ڕوخسەتت لێ بکەم تا لێرە بخەوم. هیوادارم دڵت لە من نەرەنجێت لەوەی لە باخەکەتدا نووستووم.**

**پیاوە باخەوانەکە ڕووی کردە من و بەمهیرەبانییەوە بزەیەکی کردو گوتی: هەرکاتێ حەزت کرد، دەتوانی بێیت بۆ باخەکەم و لێرە بنووی، چونکە من تۆ دەناسم.**

**من بڕوام وابوو کە ئەو پیاوە بەهەڵە تێگەیشتووە و منی بە یەهوودی زانییوە، گوتم: ئەی باخەوان، تۆ بە هەڵەدا چوویت، من یەهوودی نیم.**

**ئەو پیاوە کە زەمیلەیەکی بە دەستەوە بوو، دیسان بزەیەکی بۆ کردم و کەوتەڕێ و، بە ئاماژەی سەر پێی گوتم کە لە دوایەوە بڕۆم. من وامزانی دەیەوێت شتێکم پێ**

نیشان بدات یان دەیەوێ بمبات بۆ ماڵی خۆی کە لەو باخەدایە. لە دوای ئەو پیاوەوە ڕۆیشتم و سەیرم کرد لەگەڵ ئەوەی کە بە ساڵدا نەچووە کەچی لەکاتی ڕۆیشتندا بە زەحمەت هەنگاو دەنێ و بە هێواشی دەڕوات، ئینجا چاوم بەو دەستەی کەوت کە زەمیلەکەی پێ هەڵگرتبوو و، بینیم لەسەر نیشانەی برینێکی سەخت و کۆن لەسەر مەچەکی دیارە. بەبینینی نیشانەی برینی سەر مەچەکی ئەو پیاوە باخەوانە، ئەوەندە سەرم سوڕمابوو کە خۆنەوسیتانە ڕاوەستام، بەڵام ئەو بەردەوام بە هەنگاوە سەنگین و بێزراویەکەی دەڕۆیشت و وەکو ئەوەی زانیبێتی کە من ڕاوەستام، ڕووی وەرگێڕا و دیسان بزەیەکی بۆ کردم. زەردەخەنەکەی ئەو پیاوە دڵی منی بەهێز کرد و کەوتمەوە ڕێ، بەڵام ئیتر ئەوم نەبینییەوە و پیاوە باخەوانەکە دیار نەمابوو. من ڕاوەستام و لەسەر زەوی دانیشتم و کەوتمە بیرکردنەوە، چونکە برینە سەختەکەی دەستی ئەو باخەوانە وەك برینی لەخاچ دراوێك وابوو، هەروەها وەك ئەوە وابوو کە مێخێکیان بە دەستیدا داکوتابێت تاکو ئێسکی مەچەکی دەستی بتوانێ بەرگەی کێشی جەستەی بگرێت، چونکە کاتێ کەسێك لە خاچ دەدەن، مێخەکە بەمەچەکی دەستدا دادەکوتن و دەزانن کە ئەگەر مێخەکە بەناو لەپی دەستیدا دابکوترێت، ئێسکەکانی لەپی دەست ناتوانن بەرگەی کێشی لەخاچ دراوەکە بگرن و بەو جۆرەش لەسەر خاچەکە دەکەوێتە خوارەوە. بەڵام دواتر بەخۆم گوت لەوانەیە ئەو باخەوانە بەهۆی ئەوەی بە کەرستەکانی باخەوانی کار دەکات، بۆیە برینداربووە و هۆی برینی مەچەکی دەستی، شوێنەواری خاچ نییە. زەردەخەنەکانی ئەویش نابێ ببێتە هۆی سەرسامی من، چونکە لەوانەیە هەندێ لە باخەوانە جوولەکەکان یان کەسە سادەکان بۆ ڕەچاو کردنی ڕێزگرتنی خەڵك، با بیانیش بێت، زەردەخەنە دەخەنە سەر لێوەکانیان. بەڵام ئەو باخەوانە بەمنی گوت کە من دەناسێ. ئەگەر وادابنێیت کە عیسا بووە، ئەی چۆن من دەناسێ؟ چونکە من پێش ئەوەی بێم بۆ ئەم شارە، عیسام نەبینیبوو تاکو لەمەوپێش لە نێوانماندا ئاشنایەتیەك هەبووبێت. من یەکەم جار لەکاتی هاتنم بۆ ناو ئەم شارە، ئەوم لەسەر خاچ بینی و، ئەویش لەوکاتەدا بەجۆرێك گرفتاری بێزاری ببوو کە نەیدەتوانی لەناو کۆمەڵی خەڵکدا سەیری من بکات و بمناسێت. وا دابنێین کە ئەو باخەوانەی من بینیم، عیسا بووە کە زیندوو بۆتەوە و لە گۆڕ هاتۆتە دەرەوە. بەڵام بۆچی لەنێوان هەموو ئەو کەسانەی کە لەم شارەن، خۆی بە من نیشان دا؟ ئایا ویستی شتێکم پێ

بڵێت؟ ئەگەر وایە ئەی بۆچی خۆی بە من نیشان دا و هیچیشی نەگوت؟ یان لەوانەیە من ئەم باخەوانەم لە خەودا دیبێت و هیچ ڕاستیەکی تێدا نەبێت.

یەکێ لە دوو لایەنەکانی من دەیگووت کە (( مەزن تیوس، تۆپیاوێکی خاوەن بڕوانامە و دنیا دیدەیت و، لە ئەسکەندەریە کتێبە باشەکانت خوێندۆتەوە و لەگەڵ پزیشك و نووژدارەکاندا هەڵسوکەوتت کردووە و، دەزانی کە ئەوان چەندین جار جەستەی مردوویان شی کردۆتەوە و هەرگیز لەو جەستەیەدا ڕۆحیان نەدۆزیوەتەوە. کاتێ کە مرۆ مرد، جەستەی دەشێوێت و لەناو دەچێت و هیچ شتێکی لێ نامێنێتەوە جگە لە ئێسك. ئێسکیش دوای ئەوەی کە ماوەیەك بە سەریدا تێپەڕی، دەبێ بە خۆڵ. تۆ خۆت بینیت کە عیسا بە خاچەوە کۆتایی بە ژیانی هات. بینیشت کە یەکێ لە سەربازەکان بۆ دڵنیا بوون، نێزەکەی خۆی کرد بەناو دڵی عیسادا بۆئەوەی ئەگەر نەمردبێت، بیکوژێت. هیچ هزرێ بڕواناکات کە مردوویەك دوای ئەوەی بە خاك سپێردرا، زیندوو ببێتەوە و لە گۆڕ بێتە دەرەوە، چونکە زیندوو بوونەوەی مردوو مەحاڵە و کەسی ژیر، باوەڕ بە ڕووداوی مەحاڵ ناکات)).

بەڵام لایەنی دووەمی ناخی من دەیگوت: ((ئەی مەزن تیوس، وریابە کە تۆ هەنوکە لە بەرامبەر یەکێ لە ڕووداوە گەورەکانی دنیادا وەستاویت و، ئەگەر بایەخی پێ نەدەیت، ئەو تەمەنەی کە ماوتە بە پەشیمانی دەبەیتە سەر. مەگەر فەلسەفەکان ناڵێن کە هەر شتێك قابیلی بیرکردنەوە بێت، ئەگەری ئەوە هەیە کە دەتوانرێت ئەو شتە بەدەست بهێنرێت یان بێتەدی؟ واتە کاتێك ئێمە بیر لە شتێك دەکەینەوە، بەڵگەی ئەوەیە کە دەتوانرێت ئەو شتە بەدەست بهێنرێت و بێتە دی و، ئەگەر توانای ئەوەی نەبوو کە بێتە دی، ئەوا بە هێزی بیرکردنەوەماندا ختوورەی نەدەکرد تا بیر لەو شتە بکەینەوە. کەواتە کاتێ بیر لەوە دەکەینەوە کە مردوویەك زیندوو دەبێتەوە، بەڵگەی ئەوەیە کە دەتوانرێ و ئەگەری ئەوە هەیە کە مردوو زیندوو ببێتەوە، ئەگەرچی لە سەرەتایی دەستێکردنی دنیاوە تا ئەمڕۆ هیچ مردووێك زیندوو نەبوویێتەوە، بەڵام بەڵگەی ئەوەنییە کە ئەمڕۆ یان لە داهاتوودا مردووەکان دیندوو نەبنەوە. هزری تۆ دەڵێ مەحاڵە مردوو زیندوو ببێتەوە، بەڵام هەستەکان بە تۆیان نیشان دا کە عیسا زیندوو بوویەوە، بۆیە ئەو پیاوەی کە لە شێوەی باخەوانێك خۆی نیشان دا و پێتی گوت کە دەتناسێ، هەمان عیسا بووە. ڕاستە کە ئێمە دەبێ هەموو شتێك بە هێزی بیر

و هۆش لێك بدەینەوە، بەڵام ناتوانرێ ڕاستیی هەستەکان بە ناپەسەند بزانین. هەندێ شت هەیە کە هەستەوەری ئێمە دەیزانێ، بەڵام هزر بەو هەموو هێزەی کە هەیەتی ناتوانێ درکی پێ بکات. ئەگەر پێش ئەوەی کەشتییەك بکەوێتەڕێ، هەموو ئەو مشکانەی کە لە ناویدایە، هەڵبێن و لە کەشتییەکە بڕۆنە دەرەوە بۆئەوەی خۆیان بگەیەننە وشکانی، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو کەشتییە لەناو دەریادا نقووم دەبێ. هزری ئێمە نازانێ بەچی هۆیەك ئەو کەشتییە لە ناو دەریادا نقووم دەبێ، واتە هزری ئێمە ناتوانێ لەوە تێبگات کە مشکەکان بەچی هۆیەك دەزانن کە ئەو کەشتییە، دوای هەڵدانی چارۆکە و چوونە ناو دەریا، نقوم دەبێ و لەناو دەچێت، بەڵام هەستەکان پێمان دەڵێن کە ئەو کەشتییە ئەگەر لە لێواری دەریاوە دووربکەوێتەوە و بەرەو دەریا بڕوات، ئەوا لە مەترسی لەناوچووندایە. هەروەها پێش ئەوەی بوومەلەرزە ڕووبدات، هەندێ لە گیانداران ئۆقرەیان نابێ و ئەگەر گوێدرێژەکان نەبەسترابنەوە، هەڵدێن. هزر ناتوانێ تێبگات کە هەڵهاتنی گوێدرێژەکان بەهۆی چیەوەیە و پێش ڕوودانی بوومەلەرزە، چۆن پێشبینی دەکەن کە بوومەلەرزە ڕوودەدات، بەڵام هەستەکان پێمان دەڵێن ڕوودانی بوومەلەرزە نزیکە و دەبێ لەژێر سەقفی خانووەکان بێینە دەرەوە تاکو نەکەوینە ژێر دارو بەردەوە)).

من ماوەیەك لەو باخەدا بیرم لەم بابەتە دەکردەوە و دوولایەنەکەی ناخم لەگەڵ یەکتردا دەمەقاڵێیان بوو، پێموایە هەتا مرۆڤ وەکو منی لێ نەیەت و دوو جۆر بیروبۆچوونی نەبێت، ناتوانێ لەوە تێبگات کە ئەو ڕۆژە لەو باخەدا هەستم چۆن بووم. لە ناکاو سەیرم کرد ڕۆژ زۆر داچووە و ئەوەندە نابات ئاوا دەبێت و، لەبەرئەوەی زۆریش پێویستم بە پارەیە، بۆیە دەبێ بڕۆم بۆ ناوشار و حەواڵەی خۆم نیشانی ئەو کابرا سەڕڕافە یەهوودییە بدەم کە دەبوو پارەکەم بداتێ تاکو پارەی نەختی لێ وەربگرم.

دوکانی پارەگۆڕەوە یەهوودییەکە لە شوێنێك بوو کە چەندین ڤێلای تازە دروستکراوی لێوە دەبینرا. من دوای چوونە ژوورەوەم بۆ دوکانەکە، حەواڵەکەی خۆم بە شاگردی پارەگۆڕەوەکە نیشان دا و ئەویش چوو بۆلای خاوەنی دوکانەکە. پارەگۆڕەوە یەهۆدییەکە کاتێ حەواڵەکەی بینی، بە زەردەخەنەوە بەرەو ڕووم هات و ئەوەندە لەگەڵم گەرم و گوڕ بوو کە ڕەفتارێکی لەو شێوەیە لە یەهوودییەك بەتایبەت سەڕڕافیش، بەدوور بوو.

ئەو گوتی: من سەرم سوڕماوە لەوەی کە درەنگ هاتی بۆلای من؟ چونکە نامەیەکم لەلایەن پارەگۆڕەوەی ئەسکەندەریەوە، کە ئەم حەواڵەیەی بە تۆ داوە، پێ گەیشتووە و لەناویدا نووسرابوو کە تۆ هاتوویت بۆ ئێرە. من بە ئەزموون دەزانم ئەو گەشتیارە بیانیانەی کە حەواڵەیان لەلای منە، ئەوا هەرکە هاتنە ناو ئەم شارەوە، یەکەم جار دێن بۆلای من و منیش حەواڵەکەی خۆیان بۆ وەرگرتنی پارەکەیان نیشان دەدەم. هەندێ جاریش لەکاتی گەڕانەویان لەم شارە، بەبێ ئەوەی حەواڵەیان پێبێت، دێن بۆلام و داوای پارەم لێ دەکەن بۆئەوەی بگەڕێنەوە بۆ نیشتیمانی خۆیان، چونکە هەرچیەکیان هەبووە، لەم شارەدا خەرجیان کردووە و هەندێکیان پۆشاکی بەری خۆیان دەفرۆشت. تۆش ئەگەر لەکاتی گەڕانەوەت لەم شارە پێویستیت بە پارە بوو، دەتوانی بەبێ شەرم کردن بێیت بۆ لای من. من بڕێك پارەت بە قەرز دەدەمێ تاکو لە کاتی گەڕانەوەدا خەرجی بکەیت، چونکە دەزانم پیاوێکی وەکو تۆ کە خاوەنی ئابڕووە، قەرزەکەی خۆی دەداتەوە، ئینجا گوتی: من یۆنانیم، بەڵام لەسەر ئایینی جوولەکەم و ناوم "ئاریستانووس"ە.

پارەگۆڕەوە یەهوودییەکە لەتەمەنی مندا بوو و، بۆنێکی خۆشی لێوە دەهات و لەبەرئەوەی جوولەکەکان ڕیش دەهێڵنەوە، بۆیە ئەویش ڕیشی هەبوو. من گوتم: بۆیە درەنگتر هاتم بۆلات، چونکە دوای ئەوەی هاتمە ئەم شارەوە، لە قەڵای "ئەنتۆنییە" جێگر بووم، چونکە پێیان گوتم کە لەکاتی جەژنی گەورەی جوولەکەکاندا باشتر وایە لێیان دوور بکەویتەوە و لە ناوچەکانی جوولەکە نشیندا نیشتەجێ نەبیت.

پارەگۆڕەوە یەهوودییەکە بەم قسەیە پەشۆکا و گوتی: ئەو کەسانەی دەڵێن یەهوودییەکان لە ڕۆژانی جەژندا دەبنە خوێن مژ، درۆ دەکەن. ئەنجومەنی باڵای جوولەکەکان بە هەموو هاوتا ئاینییەکانی ئێمەیان ڕاگەیاندووە لە ڕۆژەکانی جەژنی گەورەدا ئارام بن، گەرچی ئێمەی یەهوودی ڕقمان لەو سەربازە ڕۆمییانەیە کە خەڵکی "سوریا"ن و ناتوانین بەرگەی خۆبەزل زانینی ئەوان بگرین، بەڵام ڕێز لەو گەشتیارە بیانیانە دەگرین کە بۆ ئێرە دێن، چونکە دەزانین ئەوان هۆکاری برەودانی کارو کاسبیەکانی ئێمەن و لەم شارەدا پارە خەرج دەکەن و کاڵاکانی کاسبکار و بازرگانانی ئێمە دەکڕن. ئێمەی یەهوودی ئامادەین بەپێی خواستی هەر بیانییەك کە بۆ ئەم شارە دێ، پێشوازی لێ بکەین، ئەگەریش خوازیاری بینینی شوێنەکان و بینا سەرنج

ڕاکێشەکانی ئێمە بن، ئەوا ئامادەین ڕێنوێنێك بخەینە خزمەتی تاکو شوێنە سەیرەکانی شاری ئێمە ببین. ئەگەر خوازیاری زانستیشە، ئەوا زانایانی ئێمە ئامادەن لە دەرس و دەورەکانی خۆیاندا بەشداری پێ بکەن تاکو پەی بە ڕاستیەکانی ئایینی جوولەکە بەرێت و ئاینی ڕاستی ئێمە پەسەند بکات و، ئەگەریش خوازیاری گەڕان و سەیران بێت، ئەوا ئێمە ئامادەین بیبەین بۆ ئەو خانوانەی کە هەموو کەرەستەیەکی خۆشگوزەرانی تیادایە.

گوتم: پاش ئەوەی هاتم بۆ ئەم شارە، بوومەلەرزە نەیهێشت بە ئاسوودەیی کات بەسەر بەرم. تۆ نازانی کاتێ مرۆڤ لە تاریکیدا بەهۆی کەوتنە خوارەوەی گۆزەکان و قەڵغانەکان لەخەو هەڵدەستێت، چ حاڵێکی دەبێت. ئەم ڕووداوە و ڕووداوێکی تر کە لەم شارەدا ڕووی دا ڕێگرن لەوەی کە من بتوانم بڕیاری گەڕان و سەیران بدەم.

پارەگۆڕەوە یەهوودییەکە گوتی: خۆشبەختانە، بوومەلەرزەکە بێ زیان بوو و هیچ وێرانکاریەك ڕووی نەدا، بەڵام تۆ گوتت لەم شارەدا ڕووداوێکی تریش ڕووی دا کە ڕێگری لەوە دەکات سەیران بکەیت، بڵێ ئەو ڕووداوە چیە؟

گوتم: ئەو ڕووداوە ئەوەیە کە کاتێ من دەهاتمە ناو شار، سەیرم کرد ئێوە "عیسا"تان لە نزیك دەروازەی شاردا بە خاچدا داکوتاوە.

کاتێ "ئاریستانووس" وشەی کۆتایی منی بیست، ڕوخساری گۆڕا و گوتی: مەزن تیوس، لە نێوان ئەو گەشتیارە بیانیانەی کە هاتوون بۆ ئێرە، تۆ پیاوێکی جیاوازیت.

پرسیم: جیاوازی من لە چیدایە؟

پیاوە پارەگۆڕاوەکە گوتی: جیاوازی تۆ لەمەدایە کە دوای هاتنە ناو ئەم شارە گەورە و جوان و پیرۆزەدا، تەنیا دزیۆی و نەنگیەکانت بینیوە و باشیەکانی ئەم شارەت بەرچاو نەکەوتووە. من داوات لێ دەکەم کەمێك لەم دوکانەدا پشوو بدەیت بۆئەوەی قسە بکەین تا حاڵێکت بۆ روون بکمەوە.

من دانیشتم و پیاوە پارەگۆڕەوەکە بە شاگردکەی گوت: شەربەتی هەنگوین و شیرینیمان بۆ بێنێت. دوای ئەوەی کە دانیشتم، شاگردی پارەگۆڕەوەکە لە بەردەمماندا دەفرێکی گەورەی پڕ لە شیرینی و دوو جام شەربەتی هەنگوینی دانا و

"ئاریستانووس" خوڵکی کردم کە شەربەت بخۆمەوە و شیرینی بخۆم. منیش نیوەی شەربەتەکەم خواردەوە و پارچەیەك لە شیرینیم خستە دەمم.

پارەگۆڕەوە یەهوودییەکە گوتی: لە ڕابردوودا سیاسەتی ڕۆم لەم مەملەکەتە وابوو کە دوو ڕوویی بکات تاکو بتوانێت فەرمانڕەوایی بکات، بەم جۆرە ئەگەر کەسێك لە نێو ئێمەدا هەستایە و دەنگی بەرز بکردایەتەوە، ڕۆمییەکان پشتی ئەو کەسەیان دەگرت تاکو بتوانن دووبەرەکی لەنێو ئێمەدا دروست بکەن و لاوازمان بکەن تاکو خۆیان فەرمانڕەوایی ئێمە بکەن، بەڵام ئەمڕۆ ڕۆم ئەو سیاسەتەی وەلاناوە و نایەوێ لە نێوان ئێمەدا دووبەرەکی درووست ببێت، بۆیە کاتێ عیسا هەستایەوە و خۆی بە عیسای وادەدراو دەزانی و، ئەنجومەنی باڵای جوولەکەش تاوانباری کرد، فەرمانڕەوای گشتی "یودە" کە ڕۆمییە، پشتگیری ڕای ئەنجومەنی باڵای ئێمەی کرد و فەرمانی دا عیسا لە سێدارە بدەن. ئەگەر سیاسەتی ڕۆم سەبارەت بە مەملەکەتی ئێمە نەگۆڕایە، فەرمانڕەوای گشتی پشتی عیسای دەگرت و هانی دەدا تاکو لەنێوان جوولەکەکاندا دووبەرەکی دروست بکات.

من لە پیاوە پارەگۆڕوەکەم پرسی: ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان چۆن دروست دەبێ؟

"ئاریستانووس" گوتی: ئەنجومەنی باڵای ئێمە هاوشێوەی ئەنجوومەنی پیرانی ئێوەیە. لە ڕۆمدا نوێنەرەکانی ئەنجومەنی پیرانی ئێوە لە نێوان پیاوماقوڵ و زانا و کەسە دیارەکانی تری ئەو خێڵە هەڵدەبژێردرێت و لێرە پیاوماقوڵ و زانا و کەسە دیارەکانی تر بە نوێنەری ئەنجومەنی باڵای یەهوودی هەڵدەبژێردرێت.

ئینجا پیاوە پارەگۆڕەوەکە ئەوەی ڕوون کردوەوە کە ئێوە لەبەرئەوەی لە ڕۆمدا ئەو خودایانە دەپەرستن کە شێوە و شکڵیان هەیە و پەیکەر و وێنەیان هەیە، نازانن پەرستنی خوای نادیار کە بیروباوەڕی ئێمەیە، چەندە لەژیانی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی ئەم گەلەدا کاریگەرە، چونکە هەر پیاوێکی سیاسی یان هەرکەسێکی فریودەر کە بیەوێت لەنێو گەلی ئێمەدا شۆڕش بکات و دەنگی خۆی بەگوێی خەڵکی بگەیەنێ، چارەیەکی نییە جگەلەوەی کە دەبێ کۆمەکی لە ئایین وەربگرێت و بەخەڵك بسەلمێنێ کە مەرامە سیاسیەکەی ماقوڵە و بەپێی یاسای ئایینی یەهوودییە، ئەگینا هیچ کەس گوێ بە قسەکانی ئەو نادات و لە دوایەوە ناڕوات. تەشەنەکردنی لەڕادەبەدەری ئایین لە

هەموو کاروباری ژیانی ئێمە چاکییەکی گەورەی هەیە و نەنگیەکیشی هەیە. چاکییەکەی ئەوەیە کە گەلی جوولەکەی کۆکردۆتەوە و ناهێڵێت ئەم گەلە پەرتەوازە بن، بەڵام نەنگیەکەی ئەوەیە کە ئەو فریودەرە پایە پەرستانەی کە دەیانەوێ مەبەستەکەی خۆیان بەرەو پێش ببەن، دەتوانن بە ناوی ئەوەی کە لایەنگری ئایینن، بە مەبەستەکەی خۆیان بگەن.

من لە وەڵامی پیاوەکەدا گوتم: عیسا پیاوێکی باش بوو و تەنانەت ڕۆمییەکانیش پێ لە باشیەکەی دەنێن.

"ئاریستانووس" گوتی: هەر پیاوێك بیەوێت یاساکانی ئاینی ئێمە بگۆڕێت، تاوانبارە و پێویستە لە سێدارە بدرێ، ئیتر با پیاوێکی گەورە و پایەبەرزیش بێت و باوەڕی وابێت کە گۆڕینی یاساکانی ئاینی ئێمە بە قازانجی کۆمەڵگەی یەهوودییە. چونکە بیروباوەر لەلای ئێمە زۆر ڕێزی هەیە و هەموو جۆرە دژایەتیەك لەگەڵ یاسا ئاینییەکان بە کوفر دەژمێردرێت و هەرکەسێ کوفر بکات، کافر و بێ دینە و ئێمە وا بە پێویستی دەزانین کە ئەو کەسە لە سێدارە بدرێت، چونکە عیسا شتێکی دەگوت کە لەگەڵ ئایینەکەی ئێمەدا نەدەگونجا، لەبەرئەوە ئێمە ئەومان بە کافر دەزانی و فەتوای ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان لەبارەی عیساوە، واتە پێویست بوون بە کوشتنی، لە هەموو ڕوویەکەوە لەگەڵ یاساکانی ئێمەدا دەگونجا. باشتر وایە یەك کەس بمرێت، بەڵام نەتەوەیەك لەناو نەچێت.

گوتم: من هەست ئەکەم ڕستەی کۆتایی تۆم لە یەکێکی تر بیستووە و ئەڵێی ئەم ڕستەیە کۆتایی دروشمێکە کە هەموو جوولەکەکان لەسەر زمانیاندایە.

پیاوەکە گوتی: داوای لێبوردنت لێ دەکەم کە ڕستەیەکم دەربڕی کە پێشتر بیستووتە. من لەگەڵ ئەوەی کە بەپێی یاساکانی ئایینی خۆیان وام بە پێویست دەزانی کە عیسا بکوژرێت، بەڵام بڕوام وایە کە ئەو پیاوێکی باش بوو. هیچ کەسێ خراپەی لە عیسا نەبینیبوو و ئەگەر ئەو پیاوە هەڵبژاردەیە، لە زێدی خۆی واتە لە جەلیلە نەچووبایەتە دەرەوە، مەترسی نەدەهاتە ڕێگەی و هەموو کەسێ خۆشیان دەویست و تەنانەت باجگرەکان (مستوفی)[17] و فەرمانداری ڕۆمیی لە جەلیلەش دەبوونە هاوڕێی.

---

[17] وشەی (مستەوفی) وەرگێردراوی وشەی ئینگلیزی (collector)ـە، کە لە ناوەڕۆکی سەر گورشتەکەدا هەیە.

گوتم: ئاریستانووس، تۆ تێتگەیاندم کە بە بۆچونی ئەنجومەنی باڵای جوولەکە و کۆمەڵگەی جوولەکەکان، دەبوو عیسا لەسێدارە بدرێ. من لەبەرئەوەی باش لەم مەسەلەیە تێگەیشتم، بۆیە ئیتر قسەی لەسەر ناکەم، بەڵام دەمەوێ شتێکی ترت لێ ببیستم.

پیاوەکە گوتی: دەتەوێ چیم لێ بپرسی؟

گوتم: من پیاوێکی گەشتیاریم و لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەچم و لەبەرئەوەی حەزیشم لە فێربوونە، بۆیە لەهەر ولاتێکدا ئەوەی بابەتی فێربوون بێت، خۆم فێردەکەم تاکو زانیاریەکانم زیاتر بکەم و، بۆئەوەی کە گەڕامەوە بۆ نیشتیمانەکەم، هاوڵاتیەکانم بەو زانیاریە زیادانەم سەرسام بن. من لە سەردەمی گەنجێتیم دا پزیشکێکی "سریانی"م بینی کە بە لێهاتوویی نەخۆشەکانی چارەسەر دەکرد. لە وڵاتی میسردا کە لە کۆنەوە لانکەی پێگەیاندنی پزیشکە گەورەکان بووە، تیمارکەری وام بینیووە کە دەیانگوت دەتوانین هەموو جۆرە برینێکی سەخت تیمار بکەین. بەم حاڵەشەوە هەندێ شتم لە عیسا، کە پزیشکیش نەبوو، بیستووە کە زۆر سەیرترە لەو شتانەی کە پێشتر بیستوومە و بینومە. دەڵێن ئەو توانییەتی ئەو نەخۆشانەی کە پزیشکەکان جوابیان کردووە، واتە گوتوویانە کە چارەسەر ناکرێت، تیمار بکات. من حەز دەکەم هەندێ لەو نەخۆشانەی کە لەلایەن عیساوە چارەسەر کراون، ببینم و سەبارەت بە چۆنییەتی چارەسەرکردنەکەیان داوای ڕونکردنەوەیان لێ بکەم تاکو بزانم عیسا چلۆن ئەوانی چارەسەر کردووە و، حاڵی ئەوان لە پێش تیمارکردنەکەیان و دوای تیمار کردنەکەشیان چۆن بووە و ئێستەش چۆنە.

کاتێ قسەکانم گەیشتە ئێرە، وەکو کەسێك کە کتوپڕ بیری بابەتێکی دەکەوێتەوە کە نەیدەویست باسی بکات، گوتم: چاك بوو بیرم کەوتەوە. وابزانم ئەگەر من بتوانم یەکێ لە یاران و شوێنکەوتوانی عیسا بینم و قسەی لەگەڵ بکەم، بتوانم لەبارەی عیساوە زانیاری تەوا بەدەست بهێنم، ئایا تۆ دەتوانی ڕێنوێنیم بکەی بۆلای یەکێك یان چەند کەسێك لە شوێنکەوتوانی عیسا؟

داواکاریەکەی من پیاوە پارەگۆڕەوەکەی بێزار کرد و دوای کەمێك بیرکردنەوە گوتی: قوتابییەکانی عیسا دوازدە کەس بوون و من پێموایە ناتوانی لەم شارەدا بیانبینێت. یەکێ لەو دوازدە کەسە جیابوویەوە، ئەو کەسەش هەمان کەسە کە شوێنی

عیسای بە ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان نیشان دا و ئەو کارەشی بووە هۆی دەستگیر کردنی عیسا و کەسانی تر. یازدە کەسەکەی تر بە ئەگەرێکی زۆر، ئێستە لەرێگای "جەلیلە"دان تاکو بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان. چونکە هەموویان جگە لە یەکێکیان بەناوی (یۆحەننا)، لە کەسە سادەکان و ماسی گرەکانی دەریاچەی "جەلیلە"ن. بەڵام یۆحەننا گەنجێکی خوێندەوار لە خانەوادەیەکی ماقووڵ بوو کە خوێندن و نووسین و قسەکردنی بە زمانی یۆنانی بوو. ئەو بەهۆی پلە و پایەی خێزانی و گەورەییەکەی، بە شوێنکەوتووەکانی دیکەی عیسا نەدەچوو، یان لەگەڵ ئەوان نەدەگونجا یانیش ئەوان لەگەڵ ئەودا نەدەگونجان. بەهەر حاڵ، من نازانم ئێستە شوێنکەوتووەکانی عیسا لە کوێن و ناتوانم ڕێنوێنیت بکەم بۆلای ئەوان، بەڵام...

من لەبەرئەوەی کە دەمزانی پیاوە پارەگۆڕەوەکە دەیەوێت شتێ بڵێ کە بە قازانجی من دەبێت، ئارامم گرت و چاوەڕێی قسەکەیم کرد.

ئەو گوتی: لەبەرئەوەی تۆ دەڵێی کە پیاوێکت بە شوێن وەرگرتنی زانیاریەوەیت و حەز دەکەیت زانیییەکانی خۆت زیاتر بکەیت، من دەتوانم بتناسێنم بە یەکێ لە ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان بە ناوی "نیکۆدموس". ئەو پیاوێکی خۆش ڕەفتارە و ئەگەرچیش ئەو لە ئەنجوومەنی ئەنجومەنی باڵادا پشتگیری لە عیسا دەکرد و بووە هۆی ئاژاوە و، بەهۆیەوە ئەوەندەی نەمابوو لە ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان شەڕێکی خوێناوی ڕووبدات، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا لەبەرئەوەی هەموویان وایانزانی پیاوێکی سادەیە، بۆیە سەرزەنیشتیان نەکرد. من پێموایە ئەگەر تۆ "نیکۆدموس" ببینی و لەگەڵیدا وتووێژ بکەیت، دەتوانی بەهۆیەوەوە پەیوەندی بە یەکێك یان چەند کەسێك لە قوتابییەکانی عیسا بکەیت یاخود "نیکۆدموس" خۆی ئەو زانیاریانەی کەدەتەوێت، پێت دەدات.

گوتم: ئایا "نیکۆدموس" ئەو کەسە نییە کە گوتیان بە هاوکاری پیاوێکی دیکە تەرمی عیسایان لە خاچەکە هێنایە خوارەوە و، بڕیکی زۆریش پارەی لە ماددەی بۆن خۆشدا خەرج کردووە و لە ناو گۆڕەکەی مەسیح دایناوە بۆئەوەی بۆنی گۆڕەکە خۆش بێت؟

کاتێ پارەگۆڕەوەکە (دەڵاڵەکە) ئەم وشانەی لە دەمی من بیست، بۆ ماوەی چرکەیەك ڕوخساری بەیەکدا دا، بەڵام بە پێچەوانەی جوولەکەکانی تر کە ڕەخنەیان

دەگرت و دەیانگوت کە بۆچی نازناوی (مەسیح)م بە عیساوە ناوە، "ئاریستانووس" ڕەخنەی نەگرت و گوتی: ئەو هەواڵەی تۆ ڕاستە و "نیکۆدموس" و پیاوێکی تر بە ناوی "یوسف" تەرمی عیسایان لە خاچ هێنایە خوارەوە و ئەسپەردەیان کرد و، ئەندامانی باڵای جوولەکەکانیش ڕەخنەیان نەگرت، چونکە گوتبوویان کە دەبێ کاریان بەسەر ئەو دووانەوە نەبێت تاکو ئەوان بەپێی ویژدانی خۆیان هەڵسوکەوت بکەن. لەگەڵ ئەوەی هێنانە خوارەوەی تەرمی پیاوێك لە خاچ کە بە تاوانی کوفر لەسێدارە درابێت و ئەسپەر کردنی، دژی یاساکانی ئاینی نییە. بەڵام هەندێك بڕوایان وایە کە "نیکۆدموس" و "یوسف" ئەم کارەیان تەنیا بۆ ئاسوودەکردنی ویژدانی خۆیان ئەنجام نەداوە، بەڵکو دەیانویست دژی پێشەوای گەورەی ڕۆحانیمان، کە هەموو تێچوونەکانی سەربڕینی پەرستگا و هەموو تێچوونەکانی سەرقفڵانەی حەوشەی گشتی بەرستگاکەی گرتۆتە لای خۆی، بووەستنەوە.

پاشان پیاوەکە (دەڵاڵی پارە) چووە ناو بابەتێکەوە کە جێی بایەخی من نەبوو و بە کورتیەکەی ئەوەی کە دەیگوت ئەوەیە کە قوربانی کردنی مەڕ، سوودی زۆری بۆ پێشەوای گەورەی ڕۆحانی کە لەهەمان کاتدا سەرۆکی پەرستگاشە، هەیە و هەروەها هەموو ئەو دەلاڵانەی کە پارە دەگۆڕنەوە و ئەو دەستفرۆشانەی کەلە حەوشەی گشتی پەرستگادا سەکۆ یان ڕایەخ و پارچە زەوییەکیان هەیە، دەبێ سەرقفڵانە بدەن بەپێشەوای گەورەی ڕۆحانی و، بەبێ سەرقفڵانە ناتوانن لە حەوشەی گشتی پەرستگادا کە لایەنگران و شوێنکەوتوانی هەموو ئایینەکانیش دەتوانن بڕۆنە ناوی، خەریکی کارو کاسبی ببن.

کاتێ وەڵامی رەخنەگرانەی پیاوەکە، کە من حەزم پێ نەدەکرد، تەواو بوو، گوتم: زۆر حەز دەکەم "نیکۆدموس" ببینم، بەڵام دەترسم ئەو ڕازی نەبێت بەبینینی من.

ئاریستانووس گوتی: وا بیرمەکەرەوە، چونکە تۆ ڕۆمیت و خەڵکی ڕۆم لەم وڵاتەدا خاوەنی گەورەییەکە کە زۆربەی دەرگاکان دەکاتەوە بە ڕووی مرۆدا و زانایانی ئێمە کە "نیکۆدموس"یش یەکێکە لەوان، بە خۆشحاڵیەوە پێشوازی لە ڕۆمییەکان دەکات، بەتایبەت ئەگەر بزانن ئەوان کەسایەتیەکی گەورە و دیارن و دەیانەوێ زانیاری خۆیان زیاتر بکەن. تۆ ئەگەر بڵێی کە دەتەوێ بۆ فراوان بوونی زانیاری خۆت، لەبارەی

ئایینی جوولەکە بخوێنیتەوە، نیکۆدموس نەك هەر بەمەیل بەڵکو بەشەوقەوە پێشوازیت لێ دەکات.

ئینجا بڕیاردرا کە پیاوە پارەگۆڕەوەکە کاتی دیار لە نیکۆدموس وەربگرێت و بەمن ڕابگەیەنێت. ئەو دەیگوت: دڵنیام ئەندامی ئەنجومەنی بالأمان، سبەی شەو لەدوای خۆر ئاوابوون، کاتی دیدارت بۆ دیاری دەکات و تۆش دەتوانیت ببیبت.

ئینجا من بڕێك لە پارەی حەواڵەکەی خۆم وەرگرت، بەڵام زۆربەی پارە حەواڵە کراوەکەم لەلای پیاوەکە دانا، چونکە ترسام ئەگەر هەموو پارە و پوڵەکەم لێ وەربگرتایە، گشتی خەرج بکەم و لەو وڵاتە بێگانەیەدا بە تەنیا بمێنمەوە.

کاتێ دەمویست لەلای پیاوەکە بڕۆم، پێی گوتم: من نۆکەرێکم هەیە کە هەموو شوێنە گەشت و گوزاریەکانی ئەم شارە شارەزایە، ئەگەر حەز بکەیت، لەگەڵتدا دەینێرم تاکو بتباتە شوێنە خۆش و سەیرەکان.

گوتم: سوپاست دەکەم، بەڵام پێموایە باشترە پشوو بدەم.

پیاوەکە گوتی: بەداخەوە تۆ لەو کەسانە نیت کە حەزدەکەن خۆش ڕابوێرن. ئەگینا لە جێگا گەشتیاریەکانی ئەم شارە چێژی زۆر وەردەگریت. ئێستا لەبەرئەوەی شەو داهاتووە، بهێڵە با خزمەتکارەکەم بە فانۆسێکەوە لەگەڵت بێت و ڕێگاکەت بۆ ڕووناك بکاتەوە.

گوتم: من نامەوێ ببمە جێی سەرنجی هاتووچۆکەران و وای بە باش دەزانم بەبێ فانۆس بگەڕێمەوە.

پارەگۆڕەوەکە گوتی: مەزن تیوس، هەرکاتێ لەم شارەدا تووشی کێشە بوویت، وەرە بۆ لای من، بەڵێنت پێ دەدەم کە کێشەکەت بۆ چارەسەر دەکەم.

من بەسوپاسەوە لەلای پیاوەکە ڕۆیشتم. جارێکی تریش دەڵێم کە من هیچ یەهوودییەکم نەبینیووە وەك ئەو پیاوە پارەگۆڕەوە پیاوەتی و چاکەی هەبێت، بەڵام لە-دڵەوە هەستم بە خۆشەویستی نەدەکرد بەرامبەری، چونکە دڵی من دەیگوت کە هۆی دۆستایەتی لەگەڵ ئەو پیاوە لە ڕووی دڵپاکیەوە نییە. دوای ئەوەی گەیشتمە قەڵای ئەنتۆنییە، بیستم "کلودیا"ی ژنی فەرمانڕەوای گشتی، چەندین جار منی داوا کردووە

و دەیەویت چاوی پێم بکەوێت. بەبێ دواکەوتن ڕێگەی ماڵی فەرمانڕەوام گرتەبەر و بەهۆی یەکێ لە خزمەتگوزارەکانەوە هاتنی خۆم بە "کلودیا" ڕاگەیاند.

کلودیا کە جلەکانی خۆی گۆڕیبوو و خۆی بۆ خەوتن ئامادە کردبوو، ڕۆبێکی لەبەر کرد و لە ژووری خەوەکەی هاتە دەرەوە و لەگەڵ ژنێکی هاوڕێیدا پێشوازی لێ کردم. من کە نیگام بە چاوەکانی کلودیا کەوت، زانیم ئەو ژنە تووشی پەشۆکاوی ڕۆحی بووە.

دوای ئەوەی کە دانیشتم، ژنەکەی فەرمانڕەوای گشتی گوتی: مەزن تیوس، ئاگاداریت کە عیسا زیندوو بۆتەوە و لە گۆڕ هاتۆتە دەرەوە؟

گوتم: کلودیا، تۆ لەبارەی ئەم بابەتەوە قسەت لەگەڵ مێردەکەت کردووە یان نا؟

ژنەکە پرسی: مەبەستت چیە؟

گوتم: ئەگەر لەبارەی ئەم بابەتەوە لەگەڵ مێردەکەت قسە بکەیت، ئەویش دەڵێ کە پێش ئەوەی شەو کۆتایی پێ بێت و دنیا ڕووناك ببێتەوە، سەربازەکانی لژیون بینیویانە کە شوێنکەوتوانی عیسا هاتوون و تەرمی عیسایان لەناو گۆڕەکەیدا دەرهێناوە و بردوویانە.

کلودیا گوتی: تۆ وادەزانی مێردەکەی من جگە لەو بابەتانەی کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی ئەودایە، شتی تر پەسەند دەکات؟ مەحاڵە مێردەکەم شتێك پەسەند بکات، مەگەر لە بەرژەوەندی ماددی یان مەعنەوی خۆی بێت. لەبەرئەوەی کە نوێ بوونەوەی ژیانی عیسا لەگەڵ پەرژەوەنیدەکانی ئەودا ناگونجێ، بۆیە ئەم بابەتە پەسەند ناکات. بەڵام هەندێ لە ژنانی ئەم شارە هاوڕێی منن و لە ماڵی یەکێکیان بیستم کە عیسا لە ناو گۆڕەکە زیندوو بۆتەوە و لەوێ ڕۆیشتووە. یەکێ لە ژنەکان گوتی: لەگۆڕەکەیەوە ڕووناکیەك دەرچووە و پاشان زانراوە کە گۆڕەکە بەتاڵەو تەرمی عیسا دیار نەماوە.

گوتم: کلودیا، هزر بڕوا بەوە دەکات مردوو زیندوو ببێتەوە؟

من ئەم قسەیەم بۆئەوە کرد تا دان بە گوتەکەی "کلودیا"دا نەنێم، چونکە بەڵێنم بە فەرمانڕەوا دابوو کە ئەوەی بینیومە بە کەسی نەڵێم، بۆیە ئەگەر بە ژنەکەیم بگوتایە عیسا زیندوو بۆتەوە و لەگۆڕ هاتۆتە دەرەوە، ئەوا ئەو ژنە قسەکەی منی دەکرد بە

بەڵگە و لە هەموو جێگەیەك دەیگوت كە مەزن تیوس بە چاوەكانی خۆی بینیویەتی كە عیسا زیندوو بۆتەوە و، بە دڵنیاییەوە ئەم قسەیەش دەگەیشتە گوێی فەرمانڕەوا و ئەویش منی بانگ دەكرد و پێی دەگوتم كە بۆچی بەپێچەوانەی بەڵێنی خۆم ڕەفتارم كردووە و ئەوەی كە نەدەبوو بیڵێم، گوتوومە.

كلودیا بە گوتەكەی من دڵگران بوو و گوتی: مەزن تیوس، تۆش گومانت لە زیندوو بوونەوەی عیسا هەیە؟ لەكاتێكدا تۆ لەو كەسانە بوویت كە من دڵنیابووم لەوەی لایەنگری عیسا بیت. بیستیشم كە تۆ یەكەم كەس بوویت چویتە ناو گۆڕەكەی عیسا و بینیوتە كە گۆڕە بەتاڵەكە تەرمی تێدایە، بەڵام كفنەكەی عیسا لەناو گۆڕەكە ماوە.

گوتم: كلودیا، داوات لێ دەكەم بە قسەكانی من دڵگران نەبیت. من كابرایەكم تەنیا ئەو شتانە پەسەند دەكەم كە شایانی بڕوا پێ كردن بێت. لە هەمان كاتدا، ناتوانم لەو شتانە بێ بەقا بم كە لە دنیادا بە شێوەی پەرجوو ڕوو دەدات و هەندێ شت دێتە بوون كە هزری ئێمە توانای پەسەند كردنی نییە.

كلودیا گوتی: هزری تۆ ناتوانێ شتێ پەسەند بكات كە بە چاوی خۆت بینوتە. من دەزانم تۆ بە چاوی خۆت بینیوتە كە گۆڕەكەی عیسا بەتاڵە و تەرمەكەشی لەناو گۆڕەكەیدا نییە و تەنیا كفنەكەی ماوە.

گوتم: كلودیا، تو گوتت كە یەكێ لەو ژنانەی باست كرد گوتویەتی كە ڕووناكیەك لە ناو گۆڕەكەی عیساوە دەرچووە. ئایا ئەو ژنە بە چاوی خۆی ئەم ڕووناكیەی بینیوە یان لە زمانی خەڵكی ترەوە بیستوویەتی؟

كلودیا گوتی: ئەو بە چاوی خۆی ڕووناكیەكەی بینیوە كە لە گۆڕی عیساوە دەرچووە.

گوتم: دەكرێ بڵێیت ئەو ژنە ناوی چیە؟

كلودیا گوتی: ئەو ژنە ناوی "مریەم"ە و خەڵكی "مەجدەلییە"یە هەربۆیە پێشی دەڵێن مریەمی مەجدەلییە. ئەم ژنە لە ڕێی دەریای مەجدەلییەوە هاتووە بۆ ئەم شارە. ئەو ژنێكی هونەرمەندە و دەتوانێ بە پەنجەكانی خۆی شتی جوان دروست بكات. ئەو شتانەی كە ئەو دروستی دەكات، لەلایەن پەرستگای جوولەكەكانەوە بۆ جوانی دێنە كڕین. دەبێ بڵێم كە ئەم ژنە لە رابردوودا ناوبانگی باشی نەبووە و دڵ ڕەشەكان زاڵ

بوون بە سەریدا و ئەویان لە ڕێی ڕاست لاداوە، بەڵام دوای ئەوەی عیسا ڕووبەڕوی ئەو ژنە بوویەوە، مریەمی مەجدەلییە لە ژێر دەستی دڵ ڕەشەکان ڕزگاری بوو و کەوتە سەر ڕێی ڕاست. ئەمڕۆ من ڕۆشتبووم بۆ ماڵی یەکێك لە بانووی یەهوودییەکان کە لەگەڵ من هاوڕێیە تا دیداری لەگەڵ بکەم و، مریەمی مەجدەلییەش لەوێ بوو. ئەوکاتە بوو کە گوتی ڕووناکی لە گۆڕی عیساوە دەرچووە.

گوتم: کلودیا، کێ ناڵێ ئەم ژنە خەونی بینیوە و لەکاتی ڕوئیادا بینیویەتی کە ڕووناکیەك لە گۆڕی عیساوە دەرچووە.

کلودیا گوتی: ئەو لەکاتی بێداریدا دەرچوونی ڕووناکیەکەی بینوە. بەڵام من پێش ئەوەی عیسا لە خاچ بدرێت، لە خەودا بینیم کە دەسگیریان کردووە و دەیانەوێ بیکوژن. لەکاتی خەیاڵدا کەمێك لە خەڵك هاتن بۆلای من و پێیان گوتم کە سوود لە دەسەلاّتی خۆم وەربگرم بۆئەوەی نەهێڵم مێردەکەم ڕێگا بدات عیسا لەناو ببەن، دوای ئەوەی بەئاگا هاتمەوە، بەمێردکەم گوت کە نابێت عیسا لەناو بچێت. بڕوام وایە لە سێدارەدانی عیسا بەهۆی خاچەوە کردارێکی شێتانە بوو و پیاوێکی بێ تاوانیان بە شێوەیەکی دڵتەزێن کوشت.

گوتم: کلودیا، دەکرێ من مریەمی مەجدەلییە ببینم و لەگەڵیدا قسە بکەم؟

کلودیا کاتێك ئەو داواکاریەی بیست، وەلامی ئەرێنی نەدایەوە و گوتی: ژنی یەهوودی لەگەڵ پیاوە بێگانەکاندا دیدار ناکەن. جگە لەوە، مریەمی مەجدەلییە ژنێکی هەستیارە. ئەگەر تۆ زیندوو بوونەوەی عیسا بە درۆ دەزانی و لەگەڵیدا دیدار بکەیت، لەوانەیە زۆر کاری تێبکەیت و بەوەش هەستی بڕوشێنی، چونکە مریەمی مەجدەلییە زۆر بڕوای بی عیسا هەبوو و ئەوی بە مامۆستای خۆی دەزانی. جگە لەوانەش من شوێنی نیشتەجی بوونی ئەو ژنە نازانم و ناتوانم بەجۆرێك ڕێنوێنیت بکەم تا تۆ بتوانی چاوت پێی بکەوێت.

گوتم : کلودیا، ئەگەر من بەپێی ئەم ڕێکەوتنە مریەمی مەجدەلییەم بینی، ئەوەی پێ بڵێم کە تۆ هاوڕێی منیت و، ئیزنم هەیە لەلای ئەو ناوت بهێنم تاکو بڕوام پێ بکات و ئەوەی کە بینیویەتی بۆم باس بکات؟

کلودیا سەرەتا نەیدەویست ئەو مۆڵەتەم پێ بدات، بەڵام دواتر ڕازی بوو بەوەی کە من مریەمی مەجدەلییەم بینی، خۆم وەکو هاوڕێی ئەو بناسێنم و ناوی بهێنم. لەو کاتەدا گفتوگۆی من و کلودیا تەواو بوو و، من لە ماڵەکەی ئەو گەڕامەوە و چووم بۆمەنزڵگەی خۆم کە لەهەمان قەڵادا بوو تا پشوویەك بدەم.

من بۆ زانینی نوێ بوونەوەی ژیانی عیسا پێویستم بە ڕوونکردنەوەی مریەمی مەجدەلییە نەبوو، چونکە ڕووبەڕوو بوونەوەکەی من پێی سەلماندم کە عیسا لە گۆڕ هاتۆتە دەرەوە، بەبێ ئەوەی کفنەکەی تێك بچێت و بدڕێت. بەڵام لەبەرئەوەی لێکۆڵینەوەیەکی تەواو لەبارەی عیساوە بکەم، بۆیە بە پێویستم دەزانی زانیاری لە هەموو ئەو کەسانەی عیسا دەناسن و دەمتوانی دەستم پێیان بگات، وەربگرم.

# دیدار لەگەڵ نیکۆدموسدا

ئەی تولیا، ئەمە چوارەمین نامەیە کە بۆ "ڕۆم"ی دنێرم بۆ تۆ و، کەم تا زۆر بەدواداچوونی ڕووداوەکانت بۆ بەیان دەکەم.

ڕۆژی دوای ئەو شەوەی کە من لەگەڵ "کلودیا" لەبارەی مریەمی مەجدەلییەوە قسەم کرد، دەرکەوت کە فەرمانڕەوای گشتی "یودە" ئەو ڕۆژە دەگەڕێتەوە بۆ "قەیسەریە"(قیصریە) و لە نامەکەی پێشتر پێم گوتی کە کۆشکی فەرمانڕەوایەتی فەرمانڕەوای گشتی لە شاری "قەیسەریە"دایە و، ئەو بەهۆی جەژنی گەورەی جوولەکەکان هات بۆ ئێرە تاکو لە ڕۆژەکانی جەژندا، کە یەهوودییەکان بۆ نزاو پاڕانەوە خۆیان ئامادە کردبوو، ئاسایشی ئەو شارە تێك نەچێت و لەبەرئەوەی ڕۆژانی جەژن کۆتایی پێ هات، بۆیە فەرمانڕەوای گشتی بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ"سیزارە" (قیصریە)[18]. من حەزم نەدەکرد لە قەلآی ئەنتۆنییەدا نیشتەجێ ببم، بەلآم لەبەرئەوەی کە پێیان گوتم لە ڕۆژانی جەژنی گەورەی یەهوودییەکاندا لەوانەیە مەترسیەك ڕووم تێ بکات، هەروەها لەبەرئەوەش کە فەرمانڕەوای گشتی و کلودیا لە قەلآی ئەنتۆنییەدا نیشتەجێ بوون و منیان دەناسی، بۆیە لەو قەلآیەدا نیشتەجێ بووم.

ئەو ڕۆژە، کاتێ زانیم لە قەلآ دەچنە دەرەوە و دەگەڕێنەوە بۆ قەیسەریە، منیش بڕیارمدا لەوێ بڕۆم و لە ناو شار نیشتەجێ ببم، هەروەها لەبەرئەوەی فەرمانڕەوا نیازی گەڕانەوەی هەبوو بۆ قەیسەریە، بۆیە من موورویەکی میسری کە نیشانەی پیرۆزی دەگەیاند و دەڵێن بە هەرکەسێك بێت بەخت یاوەری دەبێت و، "جامێکی بینین"[19] کە لە ئەسکەندەریە دروست دەکرا، پێشکەشم کرد بە فەرمانڕەوا.

---

[18] وشەی (قیصریە) یان (سیزارە) لە دنیای دێریندا بۆ هەندێ وڵات و شار و شەقام بەکاردەهات و ئەو شارەی کە ئەمڕۆ (ئەلجەزیرە)ی پێ دەڵێن، لەکۆندا (سیزارە)یان پێ گوتووە و بۆیە (ئەلجەزیرە)یش کۆی وشەی (جەزیرە) نییە، بەڵکو لە (سیزار)ەوە هاتووە و لە کوردستانیشدا لە هەندێ لە شارەکاندا لە کۆندا، بە بازاڕە بچووکەکانیان دەگووت (قەیسەرییە). (و.کوردی)

[19] (جامی بینین) هەمان ئەو (ئاوێنە)یەی ئەمڕۆیە، لە ئەسکەندەریەی پایتەختی میسر باشترین جۆری ئاوێنەیان دروست دەکرد و لەبەرئەوەی ناوی ئەسکەندەرییەش لە ناوی (ئەسکەندەر) دەچێت، بۆیە هەندێ لە شاعیرەکانی ئێمە وایانزانیوە (ئەسکەندەر)ی سەرداری بەناوبانگی مەقدۆنییە، ئاوێنەی دروست کردووە و بە (ئاوێنەی ئەسکەندەری)یان گوتووە (ئاوێنەی سەرداری بەناوبانگی مەقدۆنییە)، لە کاتێکدا کە مەبەست لە (ئاوێنەی ئەسکەندەری) ئاوێنەی دروستکراوی شاری ئەسکەندەرییەیە.

فەرمانڕەوای گشتی یودە، پێش ئەوەی لە قەلا بچێتە دەرەوە و بگەڕێتەوە بۆ قەیسەریە، بەڵێنی لێ وەرگرتم کە پێش ئەوەی لە ولاتی "یودە" بڕۆم و بگەڕێمەوە بۆ ڕۆم، بڕۆم بۆ قەیسەریە و چاوم پێی بکەوێت. کاتێ ئەم بەڵێنەی لە دەمی من وەرگرت، وای نیشان دەدا کە دیسان خوازیاری دیداری منە، بەلام من دەمزانی کە ئەو حەزی بە نوێ بوونەوەی دیدار نییە و لەو ڕووەوەوە دەیەوێ لە قەیسەریە من ببینێت تاکو بزانێ ئەنجامی لێکۆلینەوەکەم لەبارەی عسیا بەچی گەیشتووە و چ بیروبۆچوونێکم سەبارەت بە ئەو پەیدا کردووە.

پێش چوونە دەرەوە لە قەلای ئەنتۆنییە، وەکو دیاری بڕێ پارەم پێشکەش کرد بە فەرمانڕەوای مەخفەر کە فەرماندەی قەلاکە بوو تاکو لەکاتی مەترسیدا بتوانم جارێکی تر لە قەلای ئەنتۆنییەدا نیشتەجێ ببم.

"ئادان ئابر"، ئەو ئەفسەرە ڕۆمییەی کە ببوو بە هاوڕێی من، پێی گوتم، لەبەرئەوەی کە ڕۆژانی جەژن کۆتایی پێ هاتووە و جوولەکەکان هەستیار نین، بۆیە نیشتەجێ بوونت لەناو شاردا هیچ مەترسییەکی نییە، بەلام ئاگادار بە بەپێچەوانەی یاساکانی ئایینی جوولەکەکان نەجوولێیتەوە و ڕەخنە لە ئایینەکەیان مەگرە.

من پێم گوت: حەزدەکەم خانوو بە کرێ بگرم و تێیدا نیشتەجێ ببم.

"ئادان ئابر" گوتی: دوکاندارێکی سریانی کە ئاشنای منە، خانوویەکی هەیە و خۆی لەگەڵ خێزانەکەیدا لە نهۆنی یەکەمیدا نیشتەجێن و نهۆمی دووەم بەتاڵە و، من دەتوانم ئەو جێگەیەت بۆ بگرم بە کرێ، هەروەها لەبەرئەوەی نهۆمی سەرەوەی ئەو بینایە پلیکانەیەکی هەیە کە ڕاستەوخۆ دەچێتە سەر شەقام، بۆیە بۆ چوونە ژوورەوە و چوونە دەرەوە لێی، پێویست بەوە ناکات بڕۆیتە ماڵی دوکاندارەکە و، لە ڕاستیدا مەنزڵی تۆ خانویەکی سەربەخۆیە. من لە منداڵیەوە خەڵکانی "سوریا"م دەناسی و دەمزانی کە "سریانی"یەکان خەڵکانێکن کە شیوی خۆش دروست دەکەن و ماڵەکانی خۆیان بە پاك و تەمیزی ڕادەگرن و لە هەموو بوار و مەسەلەیەکدا خەڵکێکی دەست پاك و باشن، جگە لە بواری پارەگۆڕینەوە نەبێ.

کاتێ چووم بۆ ماڵی پیاوە سریانییەکە، سەیرم کرد خانوەکەی هەر بەو جۆرەیە کە برادەرەکەم باسی کرد. خاوەن خانووەکە و ژن و کچەکەی لەبەرئەوەی کە دەیانزانی من جگە لە کرێ خانووەکە پارەی خواردنەکەش دەدەم، بە دیدارم خۆشحاڵ بوون و ژن

و کچەکەی هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە خزمەتکردنی منیان گرتە ئەستۆی خۆیان و خواردنیان بۆ دەهێنام و نەیاندەهێشت گۆزەکەم ئاوی لێ ببڕێت. پیاوە دوکاندارەکە کوڕێکیشی هەبوو کە هەرچیەکم بویستایە لە میوە و شتی دیکە، بۆی دەکڕیم. دوای ئەوەی لە خانووی نوێدا جێگر ببووم، لەکاتی خۆرئاوا بووندا بەرەو ماڵی "نیکۆدموس" کەوتمە ڕێ بۆئەوەی دیداری لەگەڵ بکەم.

"نیکۆدموس" ئەو کەسەیە کە پیاوە پارەگۆڕەوەکە پێی گوتبوو تا من دیدار لەگەڵ بکەم و، لەبەرئەوەی کەسێکی ناسراو بوو، بۆیە بۆ دۆزینەوەی ماڵەکەی تووشی گرفت نەبووم، چونکە هەموو کەسێ ئەو دەناسێ و دەیانزانی لە کوێ نیشتەجێ یە و ڕێنوێنی منیان دەکرد.

دوای ئەوەی کە شەو داهات، ئەستێرەکانی ئاسمان بەجۆرێك دەدروشانەوە کە من دەمتوانی بەبێ چرا بەرپێی خۆم ببینم تاوەکو گەیشتمە ماڵی نیکۆدموس. دوای ئەوەی کە تەقەم لە دەرگا دا، خادەمێك دەرگاکەی لێ کردمەوە و پرسی: تۆ ئەو کەسەیت کە گەورەم چاوەڕێی هاتنی دەکات؟

گوتم: بەڵێ، خۆمم.

ئەو، منی بردە ژوورەوە و دەرگاکەی داخست و لە پلیکانەیەك بردمیە سەرەوە و بردمی بۆ ژوورێك. ئەو ژوورە پیاوێکی بەتەمەن لەسەر کورسییەك دانیشتبوو، دوای ئەوەی کە منی بینی، لە جێگەی خۆی هەستایەوە و بەمهرەبانییەوە لەلای خۆی داینیشاندم و پرسی: تۆ "مەزن تیوس"یت کە بۆ وەرگرتنی زانیاری خوازیاری دیدار بوویت لەگەڵ من؟

گوتم: بەڵێ.

پیاوە بەتەمەنەکە گوتی: "ئاریستانووس"ی پارەگۆڕەوە لەبارەی تۆوە قسەی بۆ کردم و گوتی کە حەزدەکەیت هەندێ زانیاری وەربگریت.

گوتم: بەڵێ، بۆ وەرگرتنی زانیاری هاتووم.

ئینجا پیاوە بەتەمەنەکە لەبارەی پەیدابوونی مرۆڤەوە دەستی بە قسان کرد و گوتی: خودا لەسەرەتادا "ئادەم"ی دروست کرد و "حەوا"ی لەو هێنایە بوون و مەبەست لە "ئادەم"، ڕۆحە و لەو ڕووەوە ناوی ئادەمی لێ نراوە تاکو کەسی سادە و سڤیل تێیبگەن. لە ئادەم، حەوای هێنایە بوون و مەبەست لە "حەوا"ش، جەستەیە و

لەو ڕووەوەوە ناوی حەوای لێ نراوە تاکو کەسی سقیل بتوانن تێبیگەن و، دوای ئەوەی کە ڕۆح و جەستە دروست بوون، مرۆڤیش پێك هات.

گوتم: نیکۆدموس، من بیروباوەڕی ئێوەی یەهوودی، بەتایبەت دروست بوونی "ئادەم" و "حەوا"م لەناو کتێبەکاندا خوێندۆتەوە و پێویست ناکات لەبارەی دروست بوونی ئادەم و حەواوە قسەم بۆ بکەیت، ئەوەی کە من لە تۆم دەوێت ئەوەیە کە سەبارەت بە عیسا قسەم بۆ بکەیت و بڵێیت ئەو کەسە کێ بوو؟

نیکۆدموس کاتێ زانی دەمەوێ لەبارەی عیساوە زانیاری لە دەمی ئەوەوە وەربگرم، بە حەسرەتەوە سەری لەقاندو گوتی: بەداخەوە کە ئۆباڵی خوێنی عیسا بە گەردنی ئێمەیە، من دەترسم گەلی جوولەکە تا کۆتایی دنیا تاوانی گوناهی خوێنی عیسا، کە بێگومان نێردراوی خودا بوو، بدەنەوە. چونکە عیسا هەندێ کاری دەکرد کە جگە لە نێردراوی خودا بەکەسی تر نەدەکرا.

پرسیم: تۆ کە خۆت تەرمی عیسات لە خاچ داگرت و خستە ناو گۆڕەوە و گۆڕەکەیت پڕکرد لە ماددەی بۆن خۆش، ئایا بیستووتە کە گیانی بە بەردا هاتۆتەوە و لەگۆڕ هاتۆتە دەرەوە؟

نیکۆدموس هەردوو دەستی بەشێوەی سەرسوڕمان بە بێهێزی بەرز کردەوە و گوتی: من ئاگام لەم مەسەلەیە نییە و ناتوانم لەم مەسەلەیە تێبگەم.

گوتم: ئەگەر من هەڵە نەکەم پێغەمبەرەکانی ئێوە، واتە پەیامبەرانی گەلی ئیسرائیل، گوتویانە کەسێك دێت کە نەوەی ئەستێرەکان یان ئاسمانەکانە، ئایا عیسا کوڕی ئەستێرەکان و ئاسمانەکان نەبوو؟

نیکۆدموس سەری دانەواند و گوتی: پێش ئەوەی فەرمانی لەسێدارەدانی عیسا لەلایەن ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان دەربکرێت، ئەندامانی ئەو ئەنجومەنە بە منیان گوت خۆ تۆ پیاوێکی هۆشیاریت و دەزانی کە پێغەمبەرانی ئێمە نەیانگوتووە پێغەمبەرێك لە جەلیلەوە دەردەکەوێ، کەچی عیسا لە جەلیلەوە هاتووە. ئەم بابەتەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو پێغەمبەر نییە، منیش ئەمەم بەڕاست زانی، چونکە پەیامبەرانی ئێمە نەیانگوتووە کە لە جەلیلیەوە پێغەمبەرێك پەیدا دەبێ، بەڵام دوای ئەوەی کە عیسا ماڵئاوایی لە ژیان کرد و من خستمە ناو گۆڕەوە، لە "مریەم"ی دایکیم بیست کە دەیگوت عیسا لە جەلیلە لەدایك نەبووە، بەڵکو لە "بەیت لەحم" لە دایك بووە. بیستنی

ئەم بابەتە منی پەرێشان و دڵگران کرد، چونکە پێغەمبەرانی ئێمە گوتویانە لە "بەیت لەحم" مەسیحییەك پەیدا دەبێ.

ئینجا "نیکۆدموس" نموونەی گوتەی پێغەمبەرانی ئیسرائیلی سەبارەت بەوەی کە لە "بەیت لەحم" مەسیحییەك پەیدا دەبێت، بۆ بەیان کردم و سەرقاڵی وەرگێڕانی ئەو وتە عیبریە بوو.

گوتم: نیکۆدموس من نامەوێ بزانم کە پێشبینییەکانی پێغەمبەرانی ئێوە سەبارەت بەوەی کە لە "بەیت لەحم" پەیدا دەبێت، ڕاست دەرچووە یان نا؟ و لە ناو گۆڕیش بە قاچی خۆی هاتۆتە دەرەوە یان نا. ئەگەر عیسا لە دوای مردنی لە گۆڕ هاتبێتە دەرەوە، من بە پێغەمبەر و نێردراوی خودای دەزانم، چونکە لە دروست بوونی دنیاوە تا ئەمڕۆ ڕووی نەداوە کە کەسێ دوای مەرگ، زیندوو ببێتەوە. زیندوو بوونەوەی عیسا لە دوای مردنی و هاتنە دەرەوەی لە گۆڕەکەی، ڕووداوێکی شازە و لە سەرەتای دنیاوە تا ئەمڕۆ وێنەی ئەو لە ڕابردوودا نەبینراوە و، من داوات لێ دەکەم ڕاستی ئەم مەسەلەیەم پێ بڵێیت، چونکە من بۆ ئاشکرا بوونی ڕاستیەکان پەرێشانم.

نیکۆدموس گوتی: منیش وەکو تۆ بیستوومە کە عیسا لەناو گۆڕەکە زیندوو بۆتەوە و لەوێ هاتۆتە دەرەوە، بەڵام ناتوانم بڵێم کە چۆن دەبێ مردوویەك زیندوو ببێتەوە. هەروەها شەوی ڕابردوو قوتابییەکانی عیسا لە ماڵێکدا کۆبونەتەوە و دەرگایان لەسەر خۆیان داخستووە تاکو بەهۆی کارەکانی تایبەت بە خۆیان ئاژاوە بنێنەوە. ئەوان لەبەرئەوەی لە ئازاری خەڵکانی دیکە دەترسن، بۆیە ناتوانن بە ئاشکرا شۆڕش بەرپا بکەن، ئەو شەوە کاتێ لەو ماڵە دەرگا داخراوەدا لەگەڵ یەکتریدا خەریکی ڕاوێژ بوون، لەناکاو عیسا لەلای ئەوان خۆی دەرخستووە و چووەتە ناو نیشینگەکەیان و برینەکانی دەست و قاچی کە بەهۆی داکوتانی میخەوە دروست ببوو، نیشانی قوتابییەکانی داوە و تەنانەت خۆیشی نیشانی یەکە بەیەکەی ئەوان داوە و پاشان بەو جۆرەی کە لەناکاو خۆی نیشان دابوو، لەناکاویش دیار نەماوە، ئیتر من نازانم چۆن بیر لەم بابەتە بکەمەوە. چونکە ڕۆژی پێشتر من خۆم لە باخەکەدا (ئەو باغەی کە گۆڕی عیسای لە ناودا بوو) پیاوێکی باخەوانم بینی کە بە دەستەکانییەوە نیشانەی ڕۆچوونی مێخی پێوە دیاربوو.

به بیستنی گوتەی زانا یەهوودییەکە پەشۆکام و ئینجا لە حاڵەتی پەرێشانیدا لێم پرسی: بۆچوونی تۆ سەبارەت بە عیسا چیە و، ئایا ئەو لەبارەی خۆیەوە هیچ شتێکی بەتۆ گوتووە یان نا؟

نیکۆدموس گوتی: سەرەتا کە عیسا بەبۆنەی جەژنی گەورەی ئێمەوە (جەژنی چوونە دەرەوە لە میسر) هات بۆ قودس، هیچ کەسێ ئاگای لە هاتنی ئەو بۆ ئەم شارە، نەبوو. هاتنی عیسا بۆ ئێرە بە نهێنی بوو و تەنیا من دەمزانی کە ئەو هاتۆتە ناو ئەم شارە و، هەر منیش دەمبینی و گفتوگۆم لەگەڵی دەکرد. ئەو لەبارەی خۆیەوە شتێکی پێ گوتم کە بووە هۆی سەرسامی من و منیش نەمتوانی تێبگەم چی دەڵێ.

پرسیم: ئەو چی پێ گوتی؟

نیکۆدموس گوتی: پێی گوتم ((هیچ کەسێ ناتوانێ پلە و پایەی من ببینێت، مەگەر دووبارە لە دایك ببێتەوە)).

کاتێ من ئەم وشەیەم لە دەمی "نیکۆدموس"ەوە بیست، شتێکم کەوتەوە یاد کە چەندین جار لە سەردەمی خوێندن بیستبووم، ئەویش ئەوە بوو کە لایەنگری هەندێ لە قوتابخانەکانی فەلسەفی بڕوایان وایە کە مرۆڤ دوای مردن لە دایك دەبێتەوە و دووبارە دەتوانێ بژێت و، لەوانەشە لەسەر شکڵی گیاندار و ڕووەك زیندوو ببێتەوە. ئەوان دەڵێن ئەگەر کرداری مرۆڤ لەسەردەمی ژیانیدا باش بێت، ئەوا دوای مردنی، کاتێ دووبارە لە دایك دەبێتەوە، شکڵی مرۆڤ وەردەگرێت و هەرکاتێکیش کرداری باش نەبێت، لەسەر شکڵی گیاندار یان ڕووەك درووست دەبێتەوە.

بیستنی ئەوەی کە نیکۆدموس لە دەمی عیساوە گوێی لێ بوو، بووە هۆی سەرسامی و نائومێدی من، چونکە من چاوەڕێم نەدەکرد لە زمانی عیساوە شتی سەیر و سەمەرە و بێ ئەزموون ببیستم. لەکاتێکدا ئەوەی عیسا بە "نیکۆدموس"ی گوتبوو، شتێکی نوێ نەبوو و پێش ئەویش بڕێك لە فەیلەسوفەکان ئەو بۆچوونەیان دەربڕیوە و گوتبوویان کە مرۆڤ پاش مردنی، ژیانی نوێ دەبێتەوە. بەڵام پاشان نیکۆدموس ڕوونکردنەوەیەکی دا کە سەرسامی منی نەهێشت، چونکە زانا یەهوودییەکە وای گوت: دوای ئەوەی کە لە عیسام بیست هیچ کەسێك پلەو پایەی ئەو نابینێت مەگەر دووبارە لە دایك ببێتەوە، لە عیسام پرسی (( مانای ئەم گوتەیە چیە؟ و چۆن دەکرێ کەسێ دووبارە لەدایك ببێتەوە؟ ئایا دەکرێ کەسێ دوای مردنی بگەڕێتەوە بۆ زگی

دایکی خۆی و جارێکی تر لە دنیای منداڵەنەوە بێتە ناو ئەم دنیایەوە؟)) عیسا لە وەڵامدا گوتی ((هەرکەسێ لە ئاو و لە ڕۆح دووبارە لە دایك نەبێتەوە، پلەو پایەی من نابینێت)) و ئەم ڕستەیەی چەندین جار دووبارە کردەوە.

گوتم: من پێموایە مەبەستی عیسا لەو دووبارە لەدایك بوونەوە لە ئاو، ئەوەیە کە پێی دەڵێن (تعمید- لەئاو هەڵکێشان) و لە "میسر"یشدا باوە. لە میسردا گروپێك هەن کە" ئەهلی تەصەوف"ن و، ماوەیەك خۆیان بۆ خوا پەرستی گۆشەنشین دەکەن تاوەکو پەی بەو نهێنییە گەورانە ببەن کە بە بۆچوونی خۆیان پەی بەو نهێنیانە نابەن، پاشان دوای ئەوەی کە قۆناغی گۆشەنشینی ئەوان کۆتایی پێهات، بە ئامادەبونی ڕێبەرێك کە لە قۆناغی گۆشەنیشیندا مامۆستایان بوو، دەیخەنە ناو حەوزێکی تاریکی پڕ لە ئاوەوە، بەڵام ناهێڵن لەناو ئەو حەوزەدا بخنکێت و لەناو ئاوەکە دەیهێننە دەرەوە و لەوە بەداوە کابرای سۆفی کە ماوەیەك گۆشەنشین بووە، قۆناغێکی نوێی ژیان دەبڕێت و، بە بۆچوونی سۆفیەکانی میسر وەکو ئەوە وایە کە دووبارە لە دایك بووبێتەوە. من پێموایە مەبەستی عیسا لە دووبارە زیندوو بوونەوە لە ناو ئاودا، ئەم نەریتەیە کە لایەنی ڕووکەشی هەیە ئەگینا هیچ کەسێ دووبارە لەناو ئاودا زیندوو نابێتەوە، بەڵکو وا پێشان دەدات کە دوای هەڵقورتاندن لە ئاو، چۆتە ژیانێکی نوێوە و بەم نەریتەش دەڵێن (لەئاو هەڵکێشان -تعمید) بۆیە هەرچۆنێك بێت شتێکی نوێ نییە و لە دنیادا ئەزموونی هەیە و ئێستاش لە میسر باوە.

نیکۆدموس گوتی: ڕاستە، ئەم مەسەلەیە تازە نییە. بەڵام پاشان من لە عیسام پرسی کە مەبەستی ئەو لە دووبارە لە دایك بوونەوەی لە ڕۆح چییە؟ عیسا گوتی ((ئەوەی لە جەستە لەدایك دەبێ جەستەیە و ئەوەی لە ڕۆح لەدایك دەبێ ڕۆحە)) . ئینجا گوتی: ((هەوا بۆ هەر جێگەیەك بیەوێت دەڕوات و خەڵك گوێیان لە دەنگی تەوژمەکانییەتی، بەڵام نازانم هەوا لە کوێوە هاتووە و بۆ کوێ دەڕوات)). کاتێ نیکۆدموس ئەم قسەیەی کرد، من کەوتمە یادی ئەو باخەوانەی کە ڕۆژی ڕابردوو لە باخەکەدا بینیم. کاتێ من چوومە ناو باخەکەوە، ئەو پیاوە لەوێ نەبوو و نەشمزانی لەکوێوە دەرکەوت. لەکاتی دیار نەمانی باخەوانەکە لەناو باخەکە، هەر نەشمزانی بۆ کوێ چوو. من دەنگی تەوژمی هەوام بیست، واتە باخەوانەکەم بینی بەبێ ئەوەی بزانم لە کوێوە هاتە ناو باخەکەوە و لە کوێشوە دەرچوو. ئەوەی کە توانیم لە قسەکانی عیسا

بکەم، کە لە دەمی "نیکۆدموس"ەوە هاتە دەرەوە، ئەمە بوو، ئیتر جگە لەوە هیچ گوتەیەکی تری تێنەگەیشتم. کەمێك بێ دەنگی باڵی بەسەر مندا کێشا و پاشان لە زانا یەهوودییەکەم پرسی: تۆ لەبارەی عیساوە هیچ شتێکی تر دەزانی؟

ئەو پیاوە گوتی: من لە قوتابییەکانی ئەوم بیستووە کە پێش ئەوەی عیسا دەست بکات بە بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی و ئامۆژگاری خەڵك بکات، ڕۆیشت بۆ بیابان و لەوێ بۆ ماوەی چل ڕۆژ، بەڕۆژو بوو. مەبەستی ئەو لە خەڵوەتگیری و ڕۆژو گرتنی چل ڕۆژە ئەوە بوو کە هەموو جۆرە هەوا و ئارەزوویەك لەناو ببات کە دەبێتە هۆی لادانی مامۆستایەك بۆئەوەی هیچ جۆرە پاڵنەرێك نەتوانێ لەو ڕێگایە لایبدات کە گرتوویەتە بەر. لەهەمان کاتدا هێزێکی پیس و بزوێنەر عیسای برد بۆسەر کێوێك و لەوێوە شارەکان و زەوی و زار و دارستانەکانی پێ نیشان دا و گوتی: ((ئەگەر تۆ واز لەو پەیامەی خۆت بهێنی و پەیڕەوی لە من بکەیت، دەبیتە پاشای هەموو ئەم شار و زەوی و زارو جەنگەڵانە و، تا کۆتایی ڕۆژی ژیانت، بە خۆشبەختی دەژیت)). بەڵام عیسا فریوی ئەو هێزە پیس و بزوێنەرەی نەخوارد و وازی لە پەیامەکەی خۆی نەهێنا و، دوای ئەوەی ماوەی چل ڕۆژەکە تێپەڕی کرد، لە بیابان گەڕایەوە و دەستی بە بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی کرد، بەڵام بەداخەوە کە بە ئازار و ئەشکەنجە ئەو پیاوە سروشت پاکەیان کوشت.

نیکۆدموس دوای ئەم قسەیە بێدەنگ بوو و منیش ڕێزم لە بێدەنگیەکەی گرت. دوای ئەوەی ماوەیەك تێپەڕی کرد لێم پرسی: تۆ خۆت چۆن بیر لە پلەو پایەی عیسا دەکەیتەوە و چۆنی دەبینی؟

نیکۆدموس دەستەکانی بە شێوەی بێ توانایی ڕاوەشاند و گوتی: چۆن من دەتوانم پێت بڵێم کە پلەو پایەی عیسا چۆنە؟ من هیچ ئاگاداریەکم لە پلەو پایەی ئەو نییە و دەنگی هەوا دەبیستم بەبێ ئەوەی بزانم لە کوێوە شنە دەکات و بۆ کوێ دەچێ. بەڵام لەبیرمە کە عیسا گوتی خودا بۆئەوە ناردومیەتە سەر زەوی تاکو دنیا بەهۆی ئەوەوە ڕزگاریان بێت. بەداخەوە بەم جۆرە نەبوو و دنیاش نەکەوتە بەر لێخۆش بوون، بەڵکو ئەویان گرت و بە خاچێکیان بەستەوە و کوشتیان.

پاشان نیکۆدموس گوتی: بەڵام کاتێ وەرزێر دانەوێڵەی لە کێڵگەدا چاند، ئیتر خۆ لە تەنیشت کێڵگەکە دانانیشێت یان بۆ سەوز بوونی دانەوێڵەکان بەردەوام کار

ناکات. کاری سەرەکی وەرزێر ئەوەیە کە دانەوێڵەی خۆی لەکێڵگەدا بچێنێت و ئینجا باران دەبارێت و با، شنە دەکات و دانەوێڵە سەوز دەکات و قەدەکەی گەشە پێدەکات تا کاتێ دەدروێتەوە. لە هەموو ئەو کاتانەدا وەرزێر لە خەودایە، بەڵام ئەو دانەوێڵەی کە چاندوویەتی شین دەبێت و پێدەگات. عیسا لەناو چوو، بەڵام ئەو تۆوێکی چاند کە هەنوکە لە دڵی مندا چێنراوە و ئەگەر تۆش پیاوێکی ڕاستگۆ بیت، واتە عیسا بە بەڕێز بزانیت، ئەوا دیارە ئەو دانەوێڵەیە لە دڵی تۆشدا چێنراوە. من و تۆ ئیتر کارێکمان نییە جگە لەوەی چاوەڕوانی شین بوو و گەشەکردنی ئەو دانەوێڵەیە بین تا ڕۆژێك پێدەگات. ئەمەیە کە دەڵێم کارم بە عیسا نییە و هەڵبەتە نامەوێ بڵێم ڕێز لە عیسا ناگرم، بەڵکو لەبەرئەوەی کە بۆ عیسا هیچم پێ ناکرێ، بۆیە پێویست ناکات هەوڵ بدەم تا بزانم ئەو چۆن بوو و، پلەو پایەکەشی لە کوێدایە.

گوتم: تۆ کارێکت بە سەر عیساوە نییە، بەڵام من کارم هەیە و دەمەوێ بزانم عیسا چی گوتووە و بەڵگەی ڕاستی گوتەکانی چی بووە؟ تۆ ناتوانی سەبارەت بە عیسا ئەو زانیاریانەم بدەیتێ تا من ڕازی بکەیت، بۆیە داوات لێ دەکەم ڕێنمایم بکەیت بۆ لای قوتابییەکانی تا لەگەڵیان دابنیشم و گفتوگۆ بکەین، چونکە دوور نییە کە عیسا هەندێ شتی بە قوتابییەکانی خۆی گوتبێت کە نەیویستبێ بە تۆ و بە خەڵکی دیکە بڵێت. من پێموایە عیسا هەندێك زانیاری داوە بە قوتابییەکانی و هەندێك نهێنی بۆ ئاشکرا کردوون کە بەباشی نەزانیوە خەڵکی دیکە ئەو نهێنیانە بزانن. من لە دڵی خۆمدا بۆ پەی بردن بە ڕاستیەکان، هەست بە بڵێسەی ئاگرێك دەکەم کە ناهێڵێ ئارام بگرم و، تا نەشزانم عیسا چی گوتووە و ویستوویەتی چی بکات و بەڵگەی ڕاستی گوتەکانی چیە، دانانیشم. تکام لە تۆ ئەوەیە کە ڕێنوێنیم بکەیت بۆ لای شوێنکەوتووەکانی تا کێشەکەی خۆم لەوان بپرسم و ڕاستیەکانم بۆ ڕوون ببێتەوە.

نیکۆدموس گوتی: قوتابی و شوێنکەوتووەکانی لەم جێگەیە دەترسن و پەرتەوازە بوون و لەو شوێنانەی کە کۆدەبنەوە زۆر دەترسن و، بۆیە بەگران دەستت دەیانگاتێ. سەرەڕای ئەمانە، قوتابییەکانی کۆمەڵە کەسانێکی سادە و سڤیلن و هەموویان گەنجن و تێپەڕینی کات، بیری ئەوانی پاك و قووڵ نەکردووە. بەهەر حاڵ، ئەگەریش بتوانی قوتابییەکانی عیسا بدۆزیتەوە و لەگەڵیان قسان بکەیت، هیچ شتێکت بۆ ڕوون نابێتەوە و تەنانەت ئەو شتانەی کە دەیزانی لەبیرت دەچێتەوە.

گوتم: بۆچی عیسا که پیاوێکی گەورە بوو، کەسی سادەی کردووە بە هاوڕێی خۆی و بۆچی جوان ورد نەبۆتەوە تاوەکو زانایان و پیاوانی دیار و بەرچاو ببنە قوتابی و شوێنکەوتەی ئەو؟

نیکۆدموس گوتی: ئەمەی کە تۆ گوتت زۆر گرنگە و بابەتێکی بنەڕەتیە لە ژیانی عیسادا. نەریتی عیسا وا بوو کە پیاوانی سادە و بێ سەرمایەی دەکرد بە هاوڕێی خۆی و دەیگوت کە پلەو پایەکەی تایبەتە بە کەسانی سادەو هەژار، نەك زانایان و پیاوانی سەرمایەدار. بۆیە زانایان یان پیاوانی سەرمایەدار نەیاندەتوانی ببنە قوتابی و شوێنکەوتەی ئەو. من خۆم دەمویست ببمە قوتابی و شوێنکەوتەی، بەلاّم پێویستی بوونە قوتابی من ئەوە بوو کە کارگەی گۆزەگەری خۆم بفرۆشم و لە ئەندامەتی ئەنجومەنی بالاّی یەهوودییەکان دەست بکێشمەوە و هەرچییەکم هەیە لە ڕێگەی خوادا خەرجی بکەم. عیسا دەیگوت کەسانێ دەتوانن ببنە قوتابی ئەو کە بێ سەرمایە بن، بۆیە کەسانی سەرمایەدار لە بەختەوەریی بوون بە قوتابی، بێبەش بوون. بەم حاڵەشەوە من دەزانم عیسا لە نێوان گەورە پیاواندا خاوەنی کۆمەڵێك توانا بوو کە بڕوایان پێی هەبوو. بەلاّم عیسا ئەمەی بە قوتابییەکانی خۆی نەگوت، چونکە بە پێویستی نەدەزانی شوێنکەوتووەکانی ئاگاداری ئەم مەسەلەیە بن.

گوتم: بە هەر حاڵ، من حەز دەکەم قوتابییەکانی عیسا ببینم و لەگەڵیان گفتوگۆ بکەم.

نیکۆدموس گوتی: من دەزانم تۆ پیاوێکیت کە خوازیاری وەرگرتنی زانیاریت، بەلاّم لەبەرئەوەی ڕۆمیت، قوتابییەکانی عیسا وا بیر دەکەنەوە کە نیازی سیخوڕیت هەیە و دەتەوێ ئەوان بدەیت بە دەستی ڕۆمییەکانەوە بۆئەوەی وەکو عیسا لە خاچ بدرێن، بەلاّم تا کاتێ ئەوان تۆ بە سیخور نەزانن، لە قسەکانیان هیچ تێناگەیت، واتە لەبەرئەوەی ئەوان کەسانێکی سادەن، هەندێ شتت پێ دەڵێن کە هزری پیاوێکی وەکو تۆ ئەو شتانە پەسەند ناکات. هەروەها تۆ لەوان دەبیستیت کە عیسا لە ژوورێکدا بووە کە دەرگاکەیان کلیل دابوو، بەلاّم لەو ژوورە چۆتە دەرەوە بەبێ ئەوەی قوفڵی دەرگاکە کرابێتەوە و دەرگاکە بکاتەوە. قوتابییەکانی عیسا ئەوەندە سادەن کە کاتێ ئەو ژنە لە گۆڕی عیسا گەڕایەوە و گوتی تەرمی عیسا لە گۆڕ نەبوو، باوەڕیان بە قسەکەی نەکرد

و، یەکێ لەوان هێشتا ئامادە نییە ئەوە پەسەند بکات کە عیسا زیندوو بۆتەوە و لە گۆڕ هاتۆتە دەرەوە.

من سوور بووم لەسەر ئەوەی نیکۆدموس شوێنی نیشتەجێ بوونی قوتابییەکانی عیسام پێ بڵێت تاکو بڕۆم ئەوان ببینم و لەبارەی عیساوە قسەیان لەگەڵ بکەم، بەڵام ئەو وەڵامی ئەرێنی پێ نەدامەوە و دیار بوو گومانی لەمن هەیە و پێی وایە کە لەبەرئەوەی من ڕۆمیم، لەوانەیە قوتابییەکانی عیسا بدەم بە دەستی ڕۆمییەکانەوە، بەڵام لەبەرئەوەی پێداگری من لە سنوور تێپەڕی کرد، نیکۆدموس گوتی: وەرزێر تۆوەکەی وەشاند و لەوانەیە یەکێ لەو دانەوێڵانە لە دڵی تۆدا ڕووابێت و پێداگرتنی تۆ بۆ وەرگرتنی زانیاری بەهۆی ڕووانی ئەو دانەوێڵەوەیە و بۆئەوەی هەستی بزێوی چالاکی خۆت ڕازی بکەیت، بڕۆ بۆ جەلیلە و لەوێ لێکۆڵینەوە لەو کەسانە بکە کە عیسایان دەناسی و کارە گەورەکانی ئەویان دیتووە، یان پرسیار لەو کەسانە بکە کە بە سەختی نەخۆش بوون و بەدەستی عیسا چارەسەر کراون تاکو لەبارەی ئەو پیاوە گەورەیە قسەت لەگەڵ بکەن و زانیاریت پێ بدەن.

گوتم: لێرەوە تا جەلیلە ڕێگەیەکی دوورە و من پیاوێکی بیانیم و دوای ئەوەی کە گەیشتمە جەلیلە، نازانم بۆ لای کێ بڕۆم و داوا لە کێ بکەم تا لەبارەی عیساوە قسەم لەگەڵ بکات.

نیکۆدموس گوتی: کاتێ گەیشتیە جەلیلە، وەکو ئەو کەسانەی ڕێگەی خۆیان نازانن لە کەسی تر بپرسە کە ڕێگەی ئێوە کامەیە. ئەگەر بیستت یەکێ پێی گوتی کە ڕێگاکان جۆرا و جۆرن و ڕێنوێنی درۆزن زۆرن، پێی بڵێ من بیستوومە کە لە یەك ڕێگا زیاتر نییە و حەز دەکەم لەو ڕێگایەوە بڕۆم. ئەو کاتە ئەو کەسە دەزانێ تۆ لەو کەسانەیت کە ڕێز بۆ عیسا دادەنێیت و ئەو شتانەی کە دەیزانی پێتی دەڵێ.

گوتم: نیکۆدموس، زۆر سوپاست دەکەم بۆ ئەو زانیاریانەی کە پێت دام، بەڵام بیستوومە کە عیسا لەم شارەشدا مۆجیزەی کردووە و من حەزناکەم پێش ئەوەی لەبارەی مۆجیزەی عیساوە زانیاری وەربگرم، لەم شارە بڕۆم.

نیکۆدموس گوتی: لەم شارە و لە دەورووبەری شاردا، سێ کەس هەن کە تۆ دەتوانی لەبارەی عیساوە زانیاریان لێ وەربگریت. یەکێکیان ژنێکە کە لە ڕابردوودا ناوی بە خراپە دەبرا و پێیان دەگوت مریەمی مەجدەلییە، بەڵام عیسا ڕێی ڕاستی پێ

نیشان دا و، لەو کاتەوە مریەمی مەجدەلییە بوو بە کەسێکی پاك و خواناس. بەلام بۆ دیداری دوو کەسەکەی دیکە دەبێ لەم شارە بچیتە دەرەوە و خۆت بگەیەنیتە گوندی"بیتانی" کە لە نزیك شاردایە. لەو گوندە دوو خوشك و برایەك دەژین و یەکێ لەو دوو خوشکە، بە ئیزنی عیسا لەسەر زەوی بەرامبەر بە ئەو دادەنیشت و زانیاری لە عیسا وەردەگرت. ئەم ژنە، دووەم کەسە کە تۆ دەتوانی لەبارەی عیساوە زانیاری لێ وەربگریت. کەسی سێهەم، برای ئەم دوو خوشکەیە و ناوی "لازاروس"ە. لازاروس مالئاوایی لە ژیان کرد و خستیانە ناو گۆڕەوە و ماوەی چوار ڕۆژ لە گۆڕدا بوو، بەلام عیسا ئەوی زیندوو کردەوە و تۆ دەتوانی لەبارەی ئەم مۆجیزەیە لە خودی ئەو بپرسیت و بزانیت کە ئەو، دوای ئەوەی زیندوو بوویەوە، خۆی لە چ بارودۆخێکدا بینییەوە و هەستی بەچی دەکرد.

پرسیم: ئەم سێ کەسە ئامادەن پەسەندم بکەن و لەبارەی عیساوە قسەم لەگەڵ بکەن؟

نیکۆدموس گوتی: ئەگەر تۆ پێیان بڵێیت کە لایەن منەوە دێیت و سلاوی منیان پێ بگەیەنیت، ئامادەن لەبارەی عیساوە قسەت لەگەڵ بکەن؟

گوتم: لازاروس بەڕاستی مردبوو یان....

نیکۆدموس قسەکەی پێ بڕیم و گوتی: من دەزانم تۆ دەتەوێ چی بڵێیت، تۆ دەتەوێ بڵێیت کە هەندێ کەس بە ڕووکەش دەمرن، لەکاتێکدا بەڕاستی نەمردوون. من دەزانم ئەوە ڕووی داوە کە مردوویەکیان خستۆتە ناو تابوتەوە و بەرەو گۆڕستان دەیان برد و، گرووپێك لە دوای مردووەکەوە شیوەنیان دەگێڕا و بە شمشاڵ ئاوازی ماتەمینییان لێ دەدا و کتوپڕ لەناو تابوتەکە هەستاوەتەوە و بەسەرسامیەوە سەیری ئەو کەسانەی دەکرد کە شمشاڵیان لێ دەدا و شیوەنیان دەگێڕا و، ئەو کۆمەڵە خەڵکەش لە ترساندا هەلاتوون. من دەزانم هەندێ جار ڕووی داوە مردوویەك کە بە ڕووکەش مردووە، خستویانەتە گۆڕەوە و هەوڵی داوە خۆی بەردی گۆڕەکە لەسەر خۆی لابدات و هەموو نینۆکەکانی شکاوە و پاش ماوەیەکی کەم خنکاوە و گیانی سپاردووە. لەم جۆرە ڕووداوانە، بەتایبەت لەسەر خاکی ئێمەی جوولەکەکاندا ڕوو دەدات، چونکە ئێمە بەپێی یاسای ئایینی خۆمان پێویستە لەسەرمان مردووەکە لەو

ڕۆژەدا کە دەمرێ، ئەسپەردە بکەین و ناتوانین تەرمی مردووەکە بۆ دوو یان سێ ڕۆژ دابنێین تا بزانین ئایا بەڕاستی مردووە یان مردنەکی ڕووالەتیە.

یەکێ لەو نیشانانەی کە گومانی مردنی لێ دەکرێت و لەلایەن پزیشکەکانیشەوە پەسەندە ئەوەیە کە کاتێ تەرم بۆنی ناخۆش دەگرێت، بەلگەی ئەوەیە کە بەڕاستی مردووە، چونکە تەرمی مرۆڤی زیندوو، هەرچەندە ئەو پیاوە یان ئەو ژنە بە پیس و چەپەلی ژیابێت، بۆنی لاشەی بەسەر چووی لێ نایەت. بۆیەشە باسی ئەمەت بۆ دەکەم تاکو بزانیت لازاروس بێگومان مردبوو، سەرەڕای ئەوەی کە لاشەکەشی بۆنی گرتبوو کەچی عیسا ئەو جۆرە مردووەی زیندوو کردەوە. بەلام ئەگەر تۆ پیاوێکی بەگومانیت، بۆچی دەتەوێ لێکۆلینەوە لەبارەی عیساوە بکەیت؟ چونکە کاتێ مرۆ بەگومان بێت، نابێ لەبارەی گەورە پیاوانەوە لێکۆلینەوە بکات. بەهەر حالْ من پێت دەلێم بڕۆ و لەلای "لازاروس" و دوو خۆشکەکەی قسە بکە و، لەبەرئەوەی تۆ پیاوێکی هۆشمەندی، دەتوانی درك بەوە بکەیت کە ئایا ئەوان ڕاست دەکەن یان نا.

گوتم: نیکۆدموس، من سوپاسی تۆ دەکەم و لەبەرئەوەی منت فێر کرد و ئامۆژگاریت کردم و، بلێ چەندە بڕە پارەت دەوێ تا پێت بدەم؟

نیکۆدموس گوتی: کابرای ڕۆمی، خۆ ئێرە ڕۆم نییە تا کاتێ زاناکان شتێ فێری یەکێ دەکەن، پارەی ماندوو بوونەکەی لێ بستێنن. ئێرە خاکی پیرۆزە و ئێمەی جوولەکە پارەی ماندوو بوون لە هیچ کەسێ وەرناگرین و هەرکەسێ بیەوەێ ببێتە فێرکار و زانستی خۆی فێری خەلك بکات، دەبێت فێری پیشەیەك ببێ تا بەو پیشەیە ژیانی خۆی دابین بکات. هەموو زاناکانی ئێمە کە دەیانەوێ مامۆستایەتی بکەن و زانستەکەی خۆیان فێری خەلك بکەن، خاوەنی پیشەی تایبەتین و بەو پیشەیە پێداویستی ژیانی خۆیان دابین دەکەن. منیش گۆزەگەر و باوکیشم گۆزەگەر بووە و، ژیانی من لە ڕێگەی فرۆشتنی گۆزەوە بەسەر دەبرێت. بۆیە هیچ شتێ لە تۆ وەرناگرم، بەلام بڕۆ بیبەخشە بە هەژارەکان.

کاتێ دەمویست مالئاوایی لێ بکەم و بڕۆم، بە بیانوی ئەوەی کە ڕێگەی ئێمە لەسەر ژووری میوانان بوو، فەرمانی بە خزمەتکارەکەی خۆی کرد تا چرای ژووری میوانان هەلْ بکات. من زانیم کە ئەو زانا یەهوودییە دەیەوێ ژووری پێشوازی خۆی نیشانی من بدات تاکو بزانم ئەو پیاوێکی هەژار نییە و پێویستی بە پارە نییە. لە

ژووری پێشوزاییەکەی شتومەکی گرانبەهای تیادا دەبینرا کە لەگەڵ ژیانی گۆزەگەریەکەیدا ڕێك نەدەکەوت، بەلاّم من بیرم کەوتەوە کە نیکۆدموس گوتی: کارگەی گۆزەگەری هەیە، واتە خاوەنی گۆزەگەرێکە و خۆی گۆزە دروست ناکات. دەستەکانی پیاوە زاناکەش نیشانی دەدا کە لە دەستی پیاوێکی گۆزەگەر ناچێت و ڕوخساری خڕ و گۆشتنی "نیکۆدموس" لەگەڵ ڕیشە سپیەکەی بە ڕوخساری منداڵ دەچوو.

لە ژووری پێشوازیدا کەمێك ڕاوەستام و زانا یەهوودییەکەش ماوەیەك وەستا و سەیری منی کرد و گوتی: چاوەکانی تۆ نیشان دەدەن کە پیاوێکی سرَوشت پاك و دروستکاریت. ئەگەر مرۆڤ لەلایەنی جەستەیی یان ڕۆحییەوە نەخۆش بێت، شوێنەوارەکەی لە چاوەکانیدا دەبینرێ و چاوەکانی تۆش نیشانی دەدەن کە نەخۆشی جەستەییت نییە.

ئینجا زانا یەهوودییەکە تا دەرگای ماڵەکەی خۆی منی ڕەوانە کرد و هەرچەندە دەمویست بیگەڕێنمەوە، پەسەندی نەکرد و گوتی: نەریتی ئێمەی جوولەکە وایە کاتێك میوان دەیەوێ بڕواتەوە، ئەوا تا دەرگای ماڵەوە ڕەوانەی دەکەین.

## دیدار لەگەڵ ئەو پیاوەی کە دوای مردنی، زیندوو بوویەوە

دوای ئەوەی لە ماڵی نیکۆدموس هاتمە دەرەوە و کاتێ چوومە سەر کۆڵانەکان، سەیرم کرد خەڵوەتە و وادیاربوو کەمێ لە شەو تێپەڕ بووە. من بە درێژی ڕێگاکەم جگە لە دوو ئێشکگری یەهوودی، کەسم نەبینی تا گەیشتمە نزیکی حەسارەی شار و لەوێدا کتوپڕ دەنگی ژنێکم بیست کە گوتی: ئەی کابرای بێگانە، چاکەت بە نیسب بێت.[20]

من لە وەڵامی ئەو ژنەدا ئەوەی کە گوتی دووبارەم کردوە و گوتم: چاکەت بەنیسب بێت. ژنەکە لێم نزیك بوویەوە و لە بەرامبەرمدا چۆکی دادا و گوتی: ئەی پیاوی بیانی، من ژنێکی هەژار و بێنەوام.

لەو کاتەدا بەبیرم هاتەوە کە نیکۆدموس گوتی: ئەوەی دەتەوێت بیدەیت بە من، بیبەخشە بە هەژارەکان. ئەوە بوو ئەو پارە زیویانەی کە دەمویست بیدەم بە زانا یەهوودییەکە، دام بەو ژنە. کاتێ ژنەکە پارەکانی لێ وەرگرتم، باوەڕی نەدەکرد ببێتە خاوەنی ئەو زیوانە و پاش ئەوەی زانی من هەموویانم بەخشیوە بە خۆی، زۆر خۆشحاڵ بوو و گوتی: داوا لە خودای خۆم دەکەم پاداتشی چاکەت بداتەوە و ناوی خۆتم پێ بڵێ بۆئەوەی هەمیشە دوعات بۆ بکەم.

من پاش ڕامانێك، ئامادە بووم ناوی بچووکی خۆم بڵێم و گوتم: من ناوم "مارکۆس"ە.

ژنەکە گوتی: من ناوم "مریەم"ە، بەڵام مریەم ناو لەم وڵاتەدا زۆرە و هێندەی ژمارەی دەنکەکانی هەنارێك مریەم هەیە. بەڵام لەبەرئەوەی من خەڵکی دێهاتێکم کە ناوی "بێرت"ە، پێم دەڵێن "مریەمی بێرت" پاشان ئەو ژنە گوتی: تۆ پارەت بە من دا و لە بەرامبەردا داوای هیچت لەێ نەکردم، من حەز دەکەم خزمەتێکت بکەم.

گوتم: مریەمی بێرت، تۆ ئەو پارەیەت لەخۆڕا لەمن وەرنەگرتووە، بەڵکو من قەرزار بووم و ئایینی خودام پەیڕەو کردووە.

ژنەکە گوتی: لەوانەیە تۆ قەرزداری یەکێکی دیکە بووبیت؟

---

[20] وشەی (چاکەت بە نیسب بێ) هەمان (شالوم)ی عیبری و (سەلامو عەلەیکوم)ی عەرەبیە.

گوتم: بەڵێ، من قەرزداری یەکێکی دیکە بووم و ئەو گوتی کە بیدەم بە کەسێکی تر.

ژنەکە گوتی: بەم حاڵەشەوە من حەز دەکەم لە بەرامبەر ئەو پارەی کە لە تۆی وەردەگرم خزمەتێکت بکەم.

گوتم: ئەگەر ڕۆژ بووایە، ئەوا لەبەرئەوەی کە من دەمویست بڕۆم بۆ جێگەیەك، داوام لێ دەکردی ئەو ڕێگەیەم پێ نیشان بدەی، بەڵام لەبەرئەوەی شەوە، پێویستم بە ڕێنمایی تۆ نییە.

ژنەکە گوتی: ڕێگاکان زۆرن و ڕێنماییکەری درۆزن زۆرن.

کاتێ گوێم لەم وشەیە بوو، هەڵوەستەیەکم کرد. نیکۆدموس بەمنی گوتبوو ئەگەر ئەم وشەیە لە دەمی کەسێك بێتە دەرەوە، بەڵگەی ئەوەیە کە دەتوانێت ڕێنمایم بکات و ئەو شتانەی کە نایزانم فێرم بکات. بەڵام بیستنی ئەم گوتەیە لە دەمی ئەم ژنەوە زۆر سەیر بوو. بەم هۆیەوە خەیاڵێك هات بە مێشکمدا و بە خۆم گوت لەوانەیە بتوانم بۆ گەیشتن بە شوێنی مەبەست، هاوکاری لەو ژنە هەژارە وەربگرم بۆیە گوتم: لەیەك ڕێگە زیاتر بوونی نییە و من حەز دەکەم لەو ڕێگەیەوە بڕۆم.

کاتێ ژنەکە گوێی لەم گوتەیە بوو، لێم نزیك بوویەوە و بەبێ ئەوەی ڕووخساری خۆیم نیشان بدات، لێی پرسیم: ئەی پیاوی بیانی، تۆ چیت دەوێ؟

گوتم: من ئەمشەو لەلای پیاوێکی زانا بووم و چاوەڕێم دەکرد هەندێ شتم لەبارەی عیساوە پی بڵێت کە من خوازیاری زانینیانم، بەڵام ئەو پیاوە شتێکی پێ نەگوتم کە شایانی بایەخ پێدان بێت. ئێستە داوا لە تۆ دەکەم هەندێك زانیاری بەسوودم لەبارەی عیساوە پێ بدەیت.

ژنەکە گوتی: ئەی پیاوی بیانی، دەزانی "دەروازەی کانی" لە کوێیە؟

گوتم : نەخێر.

ژنەکە گوتی: بۆیە ئەو دەروازەیەیان ناوناوە (کانی) چونکە نزیکی سەرچاوەیەکە کە ئاوی لێ دەبەن.

گوتم: من شوێنی دەروازەکە دەدۆزمەوە.

ژنەکە گوتی: لەبەرئەوەی دنیا تاریکە، بلێ بزانم ئایا ڕیشت هەیە یان نا؟

گوتم: بۆچی دەتەوێ بزانی کە من ڕیشم هەیە یان نا؟

ژنەکە گوتی: لەبەرئەوەی دەمەوێ ڕێنماییت بکەم بۆلای پیاوێك کە کێشەکەی تۆ ئاسان دەکات و ئەو شتانەی کە نایزانی، پێت دەڵێ، بەڵام ئەو پیاوە ڕقی لەو پیاوانەیە کە ڕیشی خۆیان دەتاشن و، بۆیە ئەگەر ڕیشت درێژ نەبێ، وەڵامت ناداتەوە.

گوتم: من لێدەگەڕێم تا ڕیشم درێژ ببێت.

ژنەکە گوتی: لەمە بەدواوە ڕیشی خۆت مەتاشە و دوای ئەوەی ڕیشت دەرهاتەوە، بڕۆ بۆ دەروازەی کانی بەمەرجێ ڕۆژ بێت. کاتێ گەیشتیە ئەوێ، پیاوێك دەبینی کە بە گۆزەکەیەوە ئاو لە سەرچاوەکە هەڵدەگۆزێ و پاش ئەوەی ئاوی هەڵگۆزی، لە دوایەوە بڕۆ و کێشەکەی خۆتی بۆ باس بکە. ئەو پیاوە وەڵامت دەداتەوە و لەوانەشە وەڵامت نەداتەوە. ئەگەر بێدەنگ بوو، زۆری لێ مەکە، چونکە زۆر کردنی تۆ بێ سوودە و بڕۆ ڕۆژێکی تر لە هەمان شوێن، دوای ئەوەی کە ئەو پیاوە ئاوی لە کانییەکە هەڵگۆزی، بڕۆرەوە بۆلای.

گوتم: ئەی ژن، من هەرگیز لەم شارەدا نەمبینیوە پیاوێك ئاو لە کانی هەڵبگۆزێ و، هەڵگۆزینی ئاو لە کانی و ڕووبارەکان کاری ژنانەیە.

ژنەکە گوتی: ڕاستە، هەمیشە ژنان دەڕۆن بۆ لێواری ڕووبار یان سەرچاوەکان و ئاو هەڵدەگۆزن و، هەر بەم جۆرەشە کە یەکسەر ئەو پیاوە دەناسیتەوە، چونکە تاکە پیاوە ئاو لە کانی هەڵدەگوزێ. تۆ هەر پرسیارێك لەو پیاوە بکەت، وەڵامت دەداتەوە، بەڵام ئەگەر وەڵامی نەدایتەوە، زۆری لێ مەکە و ڕۆژێکی تر بڕۆرەوە بۆلای و ئەگەر ڕۆژی دووەمیش وەڵامی نەدایەوە، بڕۆ و ڕۆژی سێیەم بگەڕێوەرەوە تا کاتێ وەڵامت دەداتەوە.

گوتم: ئەگەر ئەو پیاوە کێشەکەم لەبارەی عیساوە چارەسەر بکات و ئەو زانیاریانەی کە من دەمەوێ پێم بدات، ئەوا جارێکی دیکە قەرزداری تۆ دەبم و دێمەوە بۆ ئێرە و چەندین بەرامبەری ئەمەت دەدەمێ کە ئەم شەو پێتی دەدەم.

ژنەکە گوتی: تۆ قەرزداری من نابیت و بە پێچەوانەوە ئەوە منم کە ئێستە قەرزداری تۆم. قەرزی من بەتۆ ئەوەیە کە ڕێنمایی تۆ بکەم بۆ ڕێگەی ڕاست، ئەوکاتە بەشێك لە قەرزی خۆم داوەتەوە. بەڵام ئەوەشی کە تۆ گوتت بۆ پێدانی پارە بە من دێیتەوە بۆ ئێرە، مەیە، چونکە لێرە من نابینیتەوە و ئیتر من نایەم بۆ ئێرە.

دوای ئەم گوتەیە، ئیتر ئێمە جیا بووینەوە و منیش بەرەو ماڵی خۆم ڕۆیشتم. من ڕوخساری ئەو ژنەم نەبینیبوو و ئەگەر بە ڕۆژیش چاوم پێی بکەوتایەتەوە، نەمدەناسی. بەڵام بەباشی دەنگم دەناسی و لەهەر جێگەیەك دەنگی ئەو ژنەم ببیستایە، دەمزانی کە خۆیەتی.

پێشتر گوتبووم کە ماڵەکەم کەوتۆتە نهۆمی دووەم، ڕاستەوخۆ بەهۆی قادرمەیەکەوە دەکەوێتە سەر شەقام، بەجۆرێك کە بۆ چوونە ژوورەوە بۆ ماڵ، ناچار نەبووم تەقە بدەم لە دەرگا و خاوەن ماڵ لەخەو هەستێنم تاکو بێت و دەرگاکەم بۆ بکاتەوە. کاتێ چوومە ماڵەوە، خەوم لێ نەدەکەوت و لەبیری ئەو ژنە و ڕووداوەکانی تر دەرنەچووم و تەنیا نزیکی بەیانی خەوم لێ کەوت.

ڕیشم دەرهاتەوە و جلێکی سادەم پەیدا کرد و لەبەرم کرد. من بەو ڕیش و کراسەوە شێوەم لە ڕێبوارێك دەچوو، بۆیە ئەگەر کەسێ منی نەناسیایە نەیدەزانی من ڕۆمییەکی ڕێزدارم. من دەمویست بچم بۆ گوندی "بیتانی" و لەگەڵ "لازاروس"دا قسە بکەم.[21]

لەبەرئەوەی گوندی "بیتانی" لەگەڵ شاردا بەینی زۆر بوو، بۆیە ڕۆشتنن بۆ ئەوێ، وەکو گەشتێك (بەڵام گەشتێکی کورت) وابوو. پێش ڕۆیشتنم، نانێك و کەمێك ماسی سوێرم کڕی و کەوتمە ڕێ. هەروەها ڕێگەکەی من بۆ ڕۆیشتن بۆ گوندی "بیتانی" لە "دەروازەی کانی"یەوە گوزەری دەکرد و پێش تێپەر بوونم لە دەروازە، بەرەو گوندی "بیتانی" کەوتمە ڕێ. لە ڕێگادا هەندێ وڵاخدارم بینی کە دەوەنەکانی بیابان یان خەڵوز یان کۆتەرەیان لە گوێ دێژەکانیان بار کردبوو و بەرەو شار دەڕۆیشتن تاکو گەیشتمە گوندی "بیتانی".

گوندی "بیتانی" لەگەڵ دێهاتەکانی "قودس"دا جیاوازی نەبوو و خانووی یەك نهۆمییان هەبو و لە نزیك گوندەکەش ناوچەیەکی دارستان دەبینرا. کاتێ گەیشتمە

---

[21] (لازاروس) لە وەرگێردراوە فارسیەکەیدا بە ناوی (الیعازر) هاتووە و گوندی (بیتانی) کە شوێنی نیشتەجێ بوونی لازاروس بووە، لە وەرگێرداروە فارسیەکەی ئینجیلدا وەرگێرانی (د. بروس لە یۆنانییەوە بۆ فارسی) بە (بیت عینا) ناوبراوە بەڵام ئەم ناوانە لە زمانی فارسیدا پێگەیان نییە و هەموویان ئەو ناوانەن کە وەرگێرەکەی ئینجل نووسیووتی. بەڵام (لازاروس) کە ناوە فەرەنسیەکەی (لازارە) هەروەها (بیتانی) کە گوندێکی ناودارە و دەکەوێتە سەر خاکی فەلەستین، لەو ناوە نێودەوڵەتیانەیە و هەموو کەسێ دەیانزانێت و وەرگێڕی بێ ئەندازەی ئەم سەرگورشتەیە، سەبارەت بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە، لە ڕوونکردنەوەی دوورو درێژی ناوی ئەو کەسانە و شوێنەکان، خۆی پاراستووە بۆئەوەی کە نەوەك بەسەر زۆر فرۆشتنیدا باریکرێت.

دارستانەکە بینیم پیاوێك لەژێر دەرختێکی هەنجیر دانیشتووە. لێی نزیك بوومەوە و گوتم: چاکە بە نسیبی تۆ بێت، ئایا ئێرە گوندی "بیتانی"یە؟

ئەو کەسەی من چووم بۆ لای، چاوانێکی هەبوو کە نەدەبزووت و وەکو دوو دانە بەردی ڕووناك وابوو بەجۆرێك کە وامدەزانی نابینایە. مووی سەری سپی بوو، بەڵام ڕوخساری زۆر گەنج دیار بوو و، لاوێتیەکەی لەگەڵ پێستی سەریدا هاوتا نەبوون.

ئەو پیاوە پێی گوتم: چاکە بەنسیبی خۆت بێت، ئایا ڕێگات ون کردووە و دەتەوی ڕێنمایی بکرێیت؟

گوتم: ڕێگاکان زۆرن و ڕێنوێنیکەری درۆزن زۆرن، بەڵام من داوای ڕێگەی ڕاست لە تۆ دەکەم.

ئەو پیاوەش دوای بیستنی قسەکانی من گوتی: گومانی تێدا نییە کە "نیکۆدموس" تۆی بۆ ئێرە ناردووە تا چاوت بە من بکەوێت.

پرسیم: ناوت چییە؟

ئەو پیاوە گوتی: من ناوم "لازاروس"ە. چیت لە من دەوێ؟

"لازاروس" بە ناتەواوی قسەی دەکرد و وەکو ئەوە وابوو کە نەتوانێ بە ئاسانی زمانی خۆی لە ناو دەمیدا هەڵبسوڕێنێ. دوو چاوە بێ جوولەکەی، بینەری بێزار دەکرد و منیش بۆئەوەی لە بەرامبەر چاوەکانیدا نەبم، لە تەنیشتیدا لەژێر سایەی درەختە هەنجیرەکە دانیشتم و خۆم ئامادە کرد تا لێی بکۆڵمەوە و لێی بپرسم کە چۆن زیندوو بۆتەوە.

چەند ساتێك بێدەنگ بووم و "لازاروس" گوتی: ئەو پێشەوا گەورەانەی ئێمە کە لێرەن حەز دەکەن من بکوژن، چونکە دەزانن تا من زیندوو بم، هەندێ کەس دێنە لام و لێکۆڵینەوەم لەسەر دەکەن و ڕۆحانییەکان نایانەوێ من ببمە هۆی ئەوەی خەڵك لێکۆڵنەوەم لێ بکات. من ناڕۆم بۆ شار و هەمیشە لەم گوندەدام، بەڵام بەهۆی ئەوەوە نییە کە بترسم لەوەی ڕۆحانییەکان لە شاردا بمکوژن، بەڵکو لەڕووی ئەوەوەیە کە حەزم لێرەیە بۆیە لە گوندەکەدا نیشتەجێ بووم. لەوانەیە ڕۆحانییەکان بیانەوێ کەسانێك بنێرن بۆ ئێرە بۆئەوەی بمکوژن، بەڵام من لە پیاوکوژەکەیان ناترسم، چونکە دەزانم کە هیچ کەسێ ناتوانێ من بکوژێ، چونکە من نامرم.

کاتێ "لازاروس" ئەم قسەیەی کرد، من دوو دڵ بووم لەوەی کە ئایا ئەو پیاوە کەسێکی ئاساییە یان نا، پێم گوت: چۆن تۆ دەڵێی کە نامریت، دەکرێ زیندەوەرێك بتوانێ پڕوپاگەندەی ئەوە بکات کە هەرگیز ماڵئاوایی لە ژیان ناکات؟

لازاروس گوتی: بەڵێ، ئەگەر کەسێ بشزانێ کە مەرگی جەستەییەکەی مەرگێکی ڕاستەقینەیە، هەرگیز نامرێ و ژیانی بەردەوامە، منیش دەزانم کە مەرگی جەستەییم مەرگێکی ڕاستەقینە نییە، چونکە ڕۆحی من هەمیشە دەژێت و دەمێنێتەوە و، تەنیا جەستەم دەکوژن و ڕۆحم لە دوای مەرگی جەستەیی، بە زیندوویی دەمێنێتەوە.

گوتم: لازاروس، ڕاستە تۆ مردبوویت و پاشان زیندوو بوویتەوە؟

ئەو پیاوە گوتی: بەڵێ، ئەم مەسەلەیە ڕاستە.

گوتم: ڕاستە عیسای مەسیح کە لەخاچیان دا، تۆی زیندوو کردۆتەوە؟

لازاروس گوتی: بەڵێ، ڕاستە.

گوتم: دەمەوێ بزانم تۆ چۆن زیندوو بوویتەوە؟

"لازاروس" کە بە ناتەواوی قسەی دەکرد و نەیدەتوانی بە ئاسانی زمانی بجوڵێنێ گوتی: من مردبووم و خستمیانە گۆڕەوە و ماوەی چوار ڕۆژ لەناو گۆڕ بووم و لاشەکەم ئامادەی داڕزان بوو. لەو کاتەدا عیسا لە گۆڕەکەی من نزیك بوویەوە و گوتی بەردەکە لەسەر گۆڕەکەم لابەرن و خۆڵەکان لە گۆڕدا بهێننە دەرەوە و من هەستامەوە و لەناو گۆڕ هاتمە دەرەوە و خۆم بە زیندوویی بینییەوە.

ئەو پیاوەی کە گوتی زیندوو بۆتەوە، بەبێ پەرێشانی و خۆشحاڵی دەئاخافت، وەکو ئەوە وابوو کە ڕووداوێکی ئاسایی کە نە بۆ ئەو گرینگە و نە بۆمن، دەگێڕێتەوە.

گوتم: لازاروس، دوای ئەوەی تۆ لەناو گۆڕ زیندوو بوویتەوە و هەستایتەوە، چ هەستێکت هەبوو؟ ئایا زانیت کە مردبوویت و پاشان گیانت هاتۆتەوە بە بەردا؟

لازاروس گوتی: بەڵێ، پاش ئەوەی زیندوو بوومەوە، زانیم کە مردبووم و سەرلەنوێ گیانم هاتۆتەوە بە بەردا.

گوتم: باری جەستەییت چۆن بوو و، پاش ئەوەی زیندوو بوویتەوە خۆت لە چ حاڵەتێکدا دەبینی؟

لازاروس گوتی: دوای ئەوەی زیندوو بوومەوە و هەستامەوە، هەستم بە ماندوویەتیەکی زۆر دەکرد و وەکو ئەوە وابوو کە ماوەیەکی دوورو درێژە باری قورسم بار کردووە.

گوتم: لازاروس، هیچت لە بیرماوە لەو چوار ڕۆژەی کە مردبوویت و لە گۆڕدا بوویت؟

لازارو گوتی: من لەو چوار ڕۆژە هیچم لە یاد نییە.

گوتم: تەنانەت ئەو کاتەش نایەتەوە یادت کە هەست بکەیت لەناو گۆڕدایت یان نا؟

لازاروس گوتی: من لەماوەی ئەو چوار ڕۆژەدا هیچم نایەتەوە یاد و وەك ئەوە وایە کە ئەو چوار ڕۆژە لە ژیان و تەمەنی مندا نەبووە.

گوتم: لازاروس، ئایا ساتی مەرگی خۆتت لەبیرە. دەزانی لەوکاتەدا چیت لێ بەسەر هات؟

لازاروس گوتی: لە دوا ساتەکاتی ژیان، پێش ئەوەی بمرم، هیچ جۆرە ئازارێکم هەست پێ نەکرد و تەنیا هەستم دەکرد کە ناتوانم بە ئاسانی هەناسە بدەم و، وەك ئەوە وابوو کە گەروومیان بە دەریاچەیەك بەستۆتەوە و ڕێگەی هەناسەدانیان بەستووە و تەنانەت دەنگی شڵقە شڵقی ئەو ئاوەم دەبیست کە لە گەروومدا کۆ ببوویەوە.

گوتم: تۆ دەزانی کە لەحاڵەتی سەرەمەرگدایت. ئایا دەتزانی کۆبوونەوەی ئاو لەناو گەرووتدا، نیشانەی ئەوەیە کە کەوتوویتە گیانەلاَ؟

لازاروس گوتی: من نەمدەزانی کە کۆبوونەوەی ئاو لەناو گەرووما و دەنگی شڵقە شڵقی ئاو بەڵگەی ئەوەیە کە لە سەرەمەرگدام و بەزوویی دەمرم، بەڵام بە ڕوخساری خوشکەکانمدا دەمزانی کە مەرگی من نزیکە.

پرسیم: ئەی دوا ساتەکانی ژیانی پێش مردنت لە بیرە؟

لازاروس گوتی: نەخێر، چونکە لەو کاتەدا بەهۆی ئەوەی کە نەمدەتوانی هەناسە بدەم، بێهۆش کەوتبووم.

گوتم: واتە تۆ نەتزانی کەی گیانت لە لاشەت دەرچوو؟

لازاروس گوتی: نەخێر، نەمزانی.

پاشان لازاروس گوتی: من هەرگیز خوشکەکانی خۆم نابەخشم کە عیسایان هێنا بۆ ئێرە. ئەگەر خوشکەکانم بەزۆر عیسایان نەهێنایە بۆ ئێرە، ئەوا بەدەستی

دوژمنەکانی خۆیەوە گرفتار نەدەبوو و نەدەکوژار و، هەرکاتێ بیر لەوە دەکەمەوە کە عیسا پێش ئەوەی من زیندوو بکاتەوە و لەسەر گۆڕەکەم گریاوە، زۆر ناڕەحەت دەبم.

گوتم: لازاروس، تۆ بۆچی گلەییت لە خوشکەکانی خۆت هەیە کە عیسایان هێناوە بۆئێرە؟ ئەوان ئەگەر عیسایان نەهێنایە بۆ ئێرە، ئەوا زیندوو نەدەبوویتەوە و دووبارە خۆشیی ژیانت نەدەبینییەوە.

لازاروس گوتی: نوێ بوونەوە ژیان منی شاد نەکردووە، چونکە کەسێ کە مرد، ئەگەر زیندوو ببێتەوە، شاد نابێت، چونکە دەبێ دووبارە بمرێتەوە. چەند ساتێك بێدەنگی بەرقەرار بوو و "لازاروس" سەیری ئاسمانی دەکرد و منیش سەیری ئەوم دەکرد و زۆر بە قیافەی سەرسام بووم، چونکە وەکو ئەوە وابوو کە ڕوخساری ئەو پیاوەیان لە بەرد دروست کردبێت و هیچ جۆرە شادییەك یان خەمێك لە ڕوخساری نەدەبینرا.

گوتم: لازاروس، بیستووتە کە عیسا زیندوو بۆتەوە و لەناو گۆڕ هاتۆتە دەرەوە و ڕۆیشتووە؟

لازاروس گوتی: کاتێ خوشکەکانم ئەم هەواڵەیان بیست، ڕۆشتن بۆ قودس تاکو تەماشای گۆڕە بەتاڵەکەی عیسا بکەن. بەڵام من بەبێ ئەوەی گۆڕە بەتاڵەکە ببینم زانیم کە زیندوو بۆتەوە، چونکە کەسێ کە بتوانێ لە دوای تێپەڕ بوونی چوار ڕۆژ بە سەر مردنمدا، زیندووم بکاتەوە، دەتوانێ خۆیشی زیندوو بکاتەوە.

گوتم: لازاروس، تۆ حەز دەکەیت عیسا ببینی؟

ئەو پیاوە گوتی: نەخێر... نەخێر.

پرسیم: بۆچی حەز ناکەیت چاوت پێی بکەوێت؟

لازاروس گوتی: تا ڕۆژێك کە من زیندووم، حەز ناکەم عیسا ببینم، چونکە دەزانم کە ئەو لەبەرئەوەی منی زیندوو کردەوە، کوژرا، بۆیە نامەوێ چاوم پێی بکەوێت.

گوتم: تۆ هیچت بیستووە لەبارەی پلەو پایە و دەسەلاتەکەیەوە؟

لازاروس گوتی: ئەوەی کە من دەیزانم ئەوەیە کە لەم دنیایەدا جگە لە مەرگ، هیچ شتێکی ڕاستەقینە بوونی نییە و هەموو شتێك دەمرێت و من و تۆش کە ئێستە پێکەوە قسە دەکەین، مردووین، واتە هەبوونی ئێستای ئێمە ڕێگایەکە بۆ پەیوەست بوونمان بە مەرگەوە.

گوتم: من سەبارەت بە پلەو پایەی عیسا قسەم لەگەڵ کردی، نەك مەرگ.

لازاروس گوتی: دەسەڵاتی عیسا دەسەڵاتی مەرگە، واتە هەر وەك چۆن مەرگ بەسەر هەموو دنیادا حوکم دەکات، ئاوا عیساش بەسەر هەموو دنیا دا حوکم دەکات.

دوای ئەم قسەیە "لازاروس" لە جێی خۆی هەستایەوە و گوتی: حەز دەکەیت خوشکەکانم ببینی؟

گوتم: بەڵێ.

لازاروس گوتی: وەرە تاکو بتبەمە لای خوشکەکانم و لێت جیا ببمەوە، چونکە من ناتوانم زۆر لەگەڵ خەڵك قسە بکەم.

ئێمە بەڕێ کەوتین و من چاوەڕێم دەکرد "لازاروس" ڕاستەوخۆ بمبات بۆ گوند، بەڵام ئەو پیاوە منی لە ڕێگایەکی ناراستەوخۆوە برد بۆ گوندەکە و گەیشتینە گۆڕستان. لازاروس گۆڕێکی پێ نیشان دام کە بەردەکەیان لەسەر لابردبوو و گوتی: ئەمە گۆڕی منە و، دوای ئەوەی بەردەکەیان لابرد، عیسا منی بانگ کرد و لەناو گۆڕەکە هەستامەوە.

دوای ئەوەی گۆڕستانەکەمان تێپەڕ کرد، لازاروس دوو گوێدرێژی پێ نیشان دام کە لە لەوەڕگادا دەلەوەڕان، پاشان چەند درەختێکی میوەی پێ نیشان دام و گوتی: ئەم کێڵگەیە کە دەیبینی، هی منە و ئەم مریشك و کەڵەشێرانەش کە دانەوێڵەی زەوی هەڵدەگرنەوە، هەر هی منە.

کێڵگەکەی لازاروس زۆر خۆش بوو و فشەکلاونەکان[22] تێیدا دەیانخوێند و کلك هەڵتەکێنەکان[23] لە تەنیشت کێڵگەکەدا کلکیان هەڵدەتەکاند. من ئەوەندە ڕۆچووبووم بەناو خۆشی کێڵگەکەدا کە لەبیرم چووبوو لەگەڵ پیاوێکدا دەڕۆم کە لە دنیای مردوواندا هاتووە بۆ ئەم دنیایە.

---

[22] (فشەکلاونە) باڵندەیەکە کە کلاوەیەکی بەسەرەوەیە و هەرئەوەش شێوەیەکی جوانی پێ بەخشیوە و ڕەنگێکی قاوەیی هەیە و لەهەندێ شوێن پێی دەڵێن (سۆفانە). (و.کوردی)

[23] (کلك هەڵتەکێنە) باڵندەیەکی زۆر بچووکە و بەردەوام کلکیان هەڵدەتەکێنن و پێشیان دەگوترێت (شوان هەڵخەڵەتێنە) چونکە زۆر لە نزیکی مرۆڤەوە دەنیشنەوە و ئەگەر مرۆڤ دوایان بکەوێت بۆئەوەی بیانگرێت ئەوا زۆر نافڕن بەڵکو لە شوێنی نزیك دەنیشنەوە و ئەمەش وادەکات مرۆڤ وابزانێ ئەو باڵندەیە توانای هەڵفڕینی نییە، بۆیە هەوڵ دەدات دوای بکەوێت هەروەها شوانەکان زۆر تووشی ئەم باڵندەیە دەبن و بۆیە ئەگەر زۆر شارەزا نەبن ئەوا دوای ئەو باڵندەیە دەکەون و لە مەڕوماڵاتەکانیان دوور دەکەونەوە. (و.کوردی)

# چاوپێکەوتن لەگەڵ خوشکەکانی لازاروسدا

"لازاروس" منی بردە ماڵێك و ڕێنوێنی کردم بۆ ژوورێك. سەیرم کرد لە سەرووی ژوورەکەوە پارچە فەرشێك لەسەر زەوی ڕاخراوە و سندوقێکی دارینیان داناوە و، لە خوارووی ژوورەکەشەوە چەند دەفرێکی گەورە و بچووکی مسی و سواڵەتی (گۆزەڵە) دەبینران. ئەو خانووە چەندین ژووری تریشی تێدا بوو. بە "لازاروس"م گوت: لەبەرئەوەی دنیا گەرمە، ئەگەر کێشە نەبێ با بڕۆین و لە حەوشەکەدا لە ژێر سێبەری درەخت دابنیشین.

ئەو گوتی: بابڕۆین و ڕۆیشتین بۆ حەوشە و، من لە ژێر سێبەری دارێك لەسەر بەردێکی تەخت دانیشتم.

لازاروس خوشکەکانی خۆی کە ناویان "مارتا" و "مریەم" بوو، بانگ کرد و ئەوانیش هاتن و بەپێی نەریتی یەهوودییەکان ڕوخساری خۆیان بە پۆشەرێك داپۆشیبوو، بەڵام بەو جۆرە نا کە نەبینرێن. لازاروس ئاماژەی بەوان کرد و گوتی: ئەمەیان "مارتا" و ئەوی دیکەشیان "مریەم" خوشکی منن و مریەم لە مارتا بچووکترە و هەر چیەکت دەوێ لەوان بپرسە.

دوای ئەم گوتەیە، لازاروس ڕۆشت و خوشکەکانی دوای ڕۆشتنی براکەیان چاویان بڕییە زەوی و وا دیار بوو بەهۆی شەرمەوە نەتوانن قسە بکەن.

من گوتم: من پیاوێکی "ڕۆمی"م و بۆ وەرگرتنی زانیاری سەبارەت بی عیسا هاتووم بۆ ئێرە، چونکە بیستوومە کە عیسا لەم ماڵەدا بووە، ئایا ئێوە دەتوانن سەبارەت بە عیسا کە براکەتانی زیندوو کردۆتەوە، زانیاریم پێ بدەن؟

دوو خوشکەکە لە ژێر پێڵوەکانیانەوە سەیری یەکتریان دەکرد و وەك ئەوە وابوو کە هەر یەکەیان چاوەڕێیە ئەوی تریان قسە بکات. دواجار "مارتا" کە خوشکی گەورەتر بوو، زمانی هێنایە قسە و گوتی: ئەو ڕۆژەی عیسا هات و گەرەکی بوو براکەمان زیندوو بکاتەوە، هەموو دانیشتوانی ئەم گوندە لە گۆڕستان ئامادەبوون. عیسا گوتی کە بەردی سەر مەزاری براکەمان لابدەن و پاشان براکەمی بانك کرد و لازاروس، لە کاتێکدا کە کفنی لەبەردا بوو، لە ناو گۆڕەکە هەستایەوە.

خەڵك لەو كاتەدا كە بینیان مردوویەك كە كفنی لە بەردایە، لە ناوگۆڕ هەستاوەتەوە، ترسان و هەڵهاتن. بەڵام لەبەرئەوەی لازاروس برای خۆمان بوو، كفتەكەیمان لەبەر داكەند و لەبەرئەوەی ماندوو دەهاتەو بەرچاو، بۆیە دامان نیشاند و خواردن و خواردنەوەمان بۆ هێنا و، ئەو خەڵكەش كە لە ترسان ڕایان كردبوو، گەڕانەوە و كاتێك بینیان براكەمان خەریكی خواردن و خواردنەوەیە و قسە دەكات، دەورەیان لێدا و لەبارەی مردنەوە پرسیاریان لێ دەكرد لەوەی كە لە ناوگۆڕدا چۆن گۆزەراندوویەتی. بەڵام براكەمان نەیدەتوانی وەڵامیان بداتەوە، چونكە ئاگای لە بارودۆخی خۆی نەبووە لە ناو گۆڕەكەدا.

مریەم كە خوشكی بچووكتر بوو گوتی: پیاوێك لەم گوندەدایە كە نابینا بوو و عیسا چاوی چاك كردەوە، ئایا دەتەوێ ئەو پیاوە ببینی و لەبارەی چۆنییەتی چاك بوونەوەی چاوی پرسیار لێ بكەن؟

گوتم: نا، نامەوێ، چونكە ئەم بابەتە بەناوبانگە و هەموو كەسێ دەزانی كە عیسا پیاوێكی نابینای چاك كردۆتەوە. من دەمەوێ بزانم چ كاتێك عیسا هاتووە بۆ ئێرە و لەمماڵەدا بووە بە میوانی ئێوە؟

مریەم گوتی: دوای ئەوەی عیسا براكەی ئێمەی زیندوو كردەوە، ڕێگەی بیابانی گرتەبەر تاوەكو لە بزێوی دانیشتوانی ئەم گوندە ئاسوودە بێت. شەش ڕۆژ پێش جەژنی گەورەی جوولەكەكان، عیسا لە بیابانەوە هات بۆ ئەم گوندە و ئەو ڕۆژە دەیگوت: ((من دەزانم كە مردن نێزیكە و دەكوژرێم)). ئەو ڕۆژە، من و خوشكەكەم بڕوامان نەدەكرد بەو جۆرە نەشیاوە و بە ئازارەوە عیسا بكوژن و، هێشتا سەرمان لەوە سوڕماوە كە بۆچی ئەو پیاوە چاكەكارەیان لە خاچ دا.

مارتا هاتە قسە و گوتی: گەورە پیاوان دەڵێن ئەوەی كە لە تابلۆی ئەزەلەدا نووسراوە، دەبێ بەرگی كردار لەبەر بكات و بچێتە بواری جێبەجێ كردنەوە. من لەبەرئەوەی كە ژنم، سەرم لەم بابەتە دەرناچێ و نازانم تابلۆی ئەزەل چیە و چی لەسەر نووسراوە، بەڵام بەو ئەقڵە كەمەی خۆمەوە وا بیر دەكەمەوە كە نابێ مەرگی پیاوێكی وەكو عیسا لەسەر تابلۆی ئەزەل نووسرابێ. مەگەر بڵێم بۆیە بەو شێوە نەشیاوە كوژرا تاكو خەڵك بڕوای پێ بهێن و بڕوا بوون بە عیساش، ببێتە هۆی ڕزگاریی خەڵك.

گوتم: لەبارەی دەسەلاتی عیساوە زانیاریت هەیە یان نا؟

مارتا گوتی: من و خوشکەکەم ئافرەتین و ئێمەی ئافرەت تەنیا ئەوە دەزانین کە چۆن هەویری نان بەدەست بهێنین و بیشێلین و بە چ شێوەیەك نان بکەین و گۆشتی مەڕ لێ بنێین و، لە وەرزی پایزدا بەروبوومی ترێ لە دار مێوەکان بکەینەوە و میوەی دارهەنجیرەکان بچنینەوە. دانایی ئێمە لە سنووری ئەمانەدا تێپەڕ ناکات و، ئێمە ناتوانین بڵێین دەسەڵاتی عیسا چۆنە. مریەم گوتی: ئەوەی من دەیزانم ئەوەیە کە هیچ پیاوێك ناتوانێ وەکو عیسا قسە بکات و، ئەو دەیگوت لەبەرئەوەی کە ئەو ڕووناکییەکە و هاتۆتە دنیا، هەرکەسێ بڕوای بەو هەبێ، ئەوا لە تاریکیدا نامێنێتەوە. دیسان دەیگوت ((هەرکەسێ من ببینێ، دەتوانێ ئەوەشی کە منی ناردووە، ببینێ)). یەکێ لە قسەکانی تریشی ئەوە بوو کە دەیگوت ((من ڕێگەی ڕاست و ڕاستەقینەی ژیانم و دەتوانم لە گوناهی خەڵکانی دیکە خۆش ببم)).

گوتم: قبوڵ کردنی ئەم قسەیە ئاسان نییە. چۆن عیسا دەیتوانی لە گوناهەکانی خەڵکانی دی خۆش ببێت؟ هەموو پەندیارانی دنیا گوتویانە هیچ کەسێ ناتوانێ لە گوناهی کەسێکی تر خۆش ببێ، مەگەر ئەو کەسە خۆی کەوتبێتە بەر ستەم و ئازار و، لە گوناهی ستەمکار و ئازاردەرەکە خوش ببێ. هیچ کەسێ ناتوانێ لە گوناهی کەسێك کە ستەمی لە کەسێکی تر کردووە، خۆشی ببێ و لە ڕووی هزر و لۆژیکەوە، لێخۆش بوونی ئەو جۆرە ستەمکارانە لەلایەن کەسێکەوە کە خۆی ڕووبەڕووی ئەو ستەمە نەبۆتەوە، شایانی قبوڵ کردن نییە.

مارتا و مریەم بێدەنگ بوون و مارتا گوتی: ئەی پیاوی بیانی، وا دیارە تۆ پیاوێکی تێگەیشتوو و هۆشمەندی و دەتوانی لەوە تێبگەیت کە عیسا چی دەگوت. تا ئەو جێگەیەی من دەیزانم، عیسا نەیگوت کە چاوپۆشی لە ماڵی کەسەکان دەکات و لە گوناهی ئەو ستەمکارانەی کە ستەمیان لە خەڵکی تر کردووە، خۆش دەبێ. بەڵکو ئەو گوتی لەو گوناهانە خۆش دەبێت کەلە خودی کەسەکەوە سەرچاوە دەگرێ و جگە لەو کەسە خۆی، زیان بە کەس ناگەیەنێ.

مریەم گوتی: عیسا لەسەر شێوەی مرۆڤ بۆ ئەم جیهانە هات و وەکو مرۆڤێکیش ماڵئاوایی لە ژیان کرد، بەڵام ئەو لە مرۆڤ زیاتر بوو.

گوتم: من ئەم قسەیەت پەسەند ناکەم. من خۆم دەزانم کە عیسا لە کەسی ئاسایی دیارتر بوو و بێگومان شتێك لەودا هەبووە کە لە مرۆڤی ئاساییدا نەبووە (لەو ڕووەوە ئەو قسانەم دەکرد بۆئەوەی ئەو دوو خوشکە بهێنمە قسە و هەندێ شتیان لێوە بزانم)

مریەم گوتی: من دەزانم کە دەبێ لە ناخی دڵەوە خودامان خۆش بوویت و سۆزمان بەرامبەر هاوشێوەکانی خۆمان هەبێت.

گوتم: من نازانم واتای خۆشویستنی خودا چی دەگەیەنێ (ئەمەشم دەگوت بۆئەوەی لەو دوو خوشکە شتێ فێر ببم) مرۆڤ چۆن دەتوانێ کەسێکی خۆش بوویت کە نە دەیبینێت و نە گوێی لە دەنگی دەبێت؟ هەروەها چۆن مرۆڤ دەتوانێ هاوشێوەی خۆی وەکو خۆی خۆش بوویت؟ لەنێو هاوشێوەکانی ئێمەدا کەسانێك هەن کە لە ئەژدیها ئازاردەرترن و چۆن دەتوانرێ ئەو جۆرە کەسانە خۆش بوویسترێن؟

مریەم گوتی: ئەگەر یەکێ لە هاوجۆرەکەت کە لە ئەژدیها ئازاردەرترە، شاپێکی لە ڕوومەتت دا، تۆ لایەکەی ترت ببەرە پێشەوە تاکو شاپێکی ترت لێ بدات و ئەگەر بەو جۆرەت کرد، ئەوا زللەی دووەمت لێ نادات و ئەگەریش لێ ی دایت، ئەوا لەگەڵت دەبێتە هاوڕێت و ئەو کەسەی کە وەکو ئەژدیها ئازاردەر بووە، دوای ئەوە وەکو بەرخی لێدێت.

گوتم: مریەم، ئەم فەرمانەی کەلە عیسات وەرگرتووە هەرگیز لای ئێمەی ڕۆمی پەسەند ناکرێ و ئەگەر کەسێ شەپازلەیەکمان لێ بدات، ئێمە بە شمشێر وەڵامی دەدەینەوە. بەڵام ئەی مریەم، من دەبێ دوو جار ئافەرینت پی بڵێم. ئافەرینی یەکەمی من بۆئەوەیە کە تۆ ئافرەتێکی ژیر و شایستەیت و، ئافەرینی دووەمم بۆئەوەیە کە لە نیکۆدموس باشتر فەرمانەکانی عیسا بڵاودەکەیتەوە و دەیانگەیەنیت، لەکاتێکدا کە ئەو، بانگەشەی ئەوە دەکات کە پیاوێکی زانایە و تۆ هیچ بانگەشەیەکت نییە و خۆت بە ئافرەتێك دەزانیت و بەس.

مریەم گوتی: دەکرێ داوات لێ بکەم بەژیر و شایستە ناوم نەبەیت، چونکە حەز ناکەم.

مارتا گوتی: مریەم، تۆ ئافرەتێکی ژیر و شایستەیت و بوونی ژیری و شایستەیی یەکێکە لە خەڵاتەکانی خودا و، کاتێ پێت دەڵێن ژیر و شایستەیت، نابێ پێت ناخۆش بێت. پاشان بە منی گوت: کابرای بیانی، خوشکی من خاوەنی ژیری و دانایییە و تا ئێستە چەندین داواکاری هەبووە، بەڵام شوی نەکردووە. ئێمە ئەم دوو خوشکە لە دوای

ئەوەی باوك و دایكمان مردن و هەتیو كەوتین، شومان نەكرد و بە چاودێری لازاروسی برامان دەژیاین و "عیسا"ش كە دەیزانی چاودێری "لازاروس" بۆ ئێمە پێویستە، بۆیە ئەوی زیندوو كردەوە تا ئێمە بێ سەرپەرشتیار نەبین.

ئینجا مارتا بەردەوام بوو: كابرای بیانی، پێش ئەوەی عیسا زیندوو بیێتەوە، ئێمە بۆ مەرگی ئەو پرسەدرا بووین، بەڵام پاش ئەمە ئیتر ڕەش پۆش نابین، چونكە دەزانین ئەو زیندووە و دەزانین كە هاتنی عیسا بۆ گۆی زەوی و، مردن و پاشان نوێ بوونەوەی ژیانی، دنیا دەخاتە قۆناغێكی نوێوە و گومانمان نییە كە نیشانەكانی سەردەمی جیهانی نوێ دەردەكەوێت.

ئەم قسەیەی مارتا منی خستە ناو خەیاڵەوە، چونكە خودی خۆشم هەستم دەكرد كە مەرگ و نوێ بوونەوەی ژیانی عیسا، قۆناغێكی تازەی لە ژیانی خەڵكی ئەم جیهانەدا دروست كردووە.

گوتم: من ئەمڕۆ سوودم لە قسەكانی ئێوە وەرگرت و هەرچەندە بڕوام بە هەندێ لە قسەكانتان نەبوو، بەڵام دیسان سوودتان بە من گەیاند و ئێستەش ماڵئاواییتان لێ دەكەم و دەڕۆم.

بەڵام مارتا بانگی هەڵدا: مەڕۆ، من ناهێڵم بە برسێتی و تینوێتی لێرە بڕۆیت. دانیشە تاكو خواردن و خواردنەوەت بۆ بهێنم و، بەبێ ئەوەی گوێ بدات بە پێداگری و بەرهەڵستەكانی من، دیار نەما.

من لە كاتێكدا كە ئامادە ببووم بۆ ڕۆیشتن، لەسەر بەردێك دانیشتم و مریەم لە تەنیشتمدا لەسەر زەوی دانیشت بۆئەوەی من، كە میوانیان بووم، تەنیا نەبم بەڵام چاوەكانی بڕیبووە زەوی.

مارتا هات و سەیرم كرد تەبەقێكی دارینی گەورەی بە دەستەوەیە و ئەو تەبەقەی لەسەر بەردەكە، لە تەنیشتی من دانا و لەناو ئەو تەبەقەیەدا كولێرەیەكی، كە ڕۆن و كونجی بەسەرەوە بوو، تێدا بوو. لە تەنیشتی نانەكەدا لەتێ گۆشتی مەڕ دەبینرا و لەلایەكی تەبەقەكەدا دەفرێكی گەورەی هەنگوین سەرنجی ڕادەكێشا و بڕێك لەو سەوزە بەهاریەنای كە بۆ كردنەوی ئیشتیها دەخورێت، بۆی هێنابووم.

مارتا له مەسینەیەکدا[24] ئاوی هێنا و هەردوو دەستی منی شوشت و خوڵکی کردم تا نان بخۆم.

گوتم: ئەی تۆ و خوشکەکەت نان ناخۆن؟

مارتا گوتی: ئێمە تێرین.

گوتم: "لازاروس"ی براتان نایەت تا لەگەڵم نان بخوات.

گوتیشم: ئەو هەموو خواردنەی کە بۆ منتان هێناوە. زۆرە.

مارتا گوتی: دەبێ ئەوەی لەناو ئەو تەبەقەدایە بیخۆیت.

من لەبەرئەوەی بەپێ لە شارەوە تاکو گوندی "بیتانی" هاتبووم، بە ئیشیتیهاوە دەستم بە خواردنی شیوەکە کرد. کاتێ تێر بووم، دەستم لە خواردن هەڵگرت بەڵام مارتا بە تکا وای لێ کردم دەست بە خواردن بکەمەوە. کاتێ دەستم لە خواردن هەڵگرت و هەرچی مارتا و مریەمی خوشکی تکایان کرد، هیچم نەخوارد، چونکە دەمزانی هەرکاتێ زیاد لەوە نان بخۆم، نەخۆش دەکەوم.

خۆم بۆ هەستان ئامادەکرد و کاتێ هەستامەوە، هەستم کرد پێیەکانم زۆر لاواز بوون و لەپێ کەوتوون، لە هەموو لەشمدا هەستم بە سستی دەکرد. بەخۆم گوت: نەکا ئەم دوو خوشکە ماددەی بێهۆشکەریان کردبێتە خواردنەکەمەوە بۆئەوەی بێهۆشم بکەن. بەڵام ئەو دوو ئافرەتە ئەوەندە سادە و پاك دەهاتنە بەرچاو کە من ئیتر ئەو بیرکردنەوەم لە مێشکی خۆم دەرکرد.

کاتێ لە نانخواردن لێ بوومەوە، کەمێك لە نیوەڕۆ تێپەڕیبوو. مارتا پێی گوتم: ئێستە دنیا گەرمە و لەمماڵەدا بخەوە تاکو هەتاو لە ناوەراستی ئاسمان تێپەڕ بکات و دنیا فێنك بکات، ئینجا بۆ گەڕانەوە بۆ شار بەڕێ بکەوە.

گوتم: دەترسم لەم ماڵەدا بێزارتان بکەم.

مارتا گوتی: چەندَ ژوورێك لەم ماڵەدا هەیە. ئێمە ئەگەر بمانەوێ پشوو بدەین، جێگامان هەیە.

پاشان دوو خوشکەکە ڕێنوێنیان کردم و منیان بۆ ئەو ژوورە برد کە دەبوو پشووی تێدا بدەم.

---

[24] لە فارسیەکەدا بە (ابریق) هاتووە و ئەمیش لە (ئابرین)ی فارسیەوە هاتووە و عەرەبێنراوە (فەرەنگی گۆڤەند و زنار). لە کوردەواری دێرینیشدا هەبووە و پێی دەڵێن (مەسینەی زمڕوت) کە دەفرێکی بەنرخە.

# ئاشنابوون بە ژنێک کە ئازادکرابوو

کاتێ منیان بەرەو ئەو ژوورە ڕەوانە کرد، زانیم ماڵی ئەو دوو خوشکە لەوە گەورەتر و فراوانترە کە من لە کاتی چوونە ژوورەوەدا بیرم لێ دەکردەوە. ئەوان منیان بردە ژوورێکی فێنکەوە. سەیرم کرد جێگەیەکی نووستنیان لەو ژوورەدا ڕاخستبوو کە بۆنی دارچینی لێوە دەهات. لەو ژوورەدا گۆزەڵەیەکی پڕ لە ئاو و تەشتێك و پارچەیەکی لێبوو.

مارتا گوتی: ئێرە ئەو ژوورەیە کە عیسا لێی دانیشتووە و تۆش لێرە پشوو بدە. ئینجا دوو خوشکەکە لە ژورەکە چوونە دەرەوە و منیان بە تەنیا بەجێ هێشت بۆئەوەی بخەوم. من لەسەر ئەو جێگەیەی کە بۆنی دارچینی لێ دەهات، ڕاکشام و دوای ماوەیەك بەهۆی فێنکی ژوورەکە و نەرمی جێگەکە خەوم لێکەوت.

ساتێك بەئاگا هاتمەوە و بەبێ ئەوەی چاوەکانم بکەمەوە، زانیم کە هۆی بەئاگاهاتنەوەی من لەو ژوورەدا ئەوەیە کەسێك لەو ژوورەدایە. من بەباشی هەستم بەو کەسە دەکرد کە لەوێ ئامادەبوو، بەڵام نەمدەبینی. چاوەکانم کردەوە بۆئەوەی ببینم و سەیرم کرد کەس لەو ژوورەدا نییە. بە خۆم گوت لەوانەیە بەهەڵەدا چووبم. پێڵوی چاوەکانم لێك نا و چەند ساتێکی دیکە دیسان هەستم کردەوە کە کەسێك لەو ژوورەدایە.

ئەم ڕووداوە دەجار دووبارە بوویەوە و هەرجارە و چاوەکانم لێك دەنا، هەستم دەکرد کەسێك لەو ژوورەدایە و کاتێ چاوەکانم کردەوە، کەسم نەدەبینی. من دڵنیا بووم لەوەی کە ئەو کەسەی لەو ژوورەدا هەستم پێ دەکرد، عیسایە. هیچ بەڵگەیەکم نەبوو بۆئەوەی بزانم ئەو کەسەی لەو ژوورەدا هەستی پێ دەکەم عیسایە یان نا، بەڵام لە هەمان کاتدا من هەر لەوە دڵنیابووم ئەو کەسەی کە لەکاتی چاو لێك نانم لەو ژوورەدا هەستم پێ دەکرد، عیسایە. جاری یانزەیەم کاتێ کە چاوەکانم داخست، دیسان خەوم لێکەوتەوە.

لە کاتە گەرمەکانی ڕۆژانی بەهار و هاویندا، بەتایبەت لە دوای نانخواردن، ڕێ دەکەوێ کە مرۆڤ چەندین جار بخەوێت و بەئاگا بێتەوە و، منیش ئەو ڕۆژە لەگەڵ ئەوەی کە لە خەو هەستابووم، دیسان نووستمەوە.

جارێکی تر بەئاگا هاتمەوە و هەستم کرد کەسێك لە ژوورەکەدایە و ویستم چاوەکانم بکەمەوە بۆئەوەی ئەو کەسە ببینم، بەڵام هەرچیم کرد نەمتوانی چاوەکانم بکەمەوە و وەك بڵێی دوو کێشی قورسیان لەسەر پێڵووەکانم داناوە کە هەریەکەیان قورسایی هەزار بەردیان[25] هەبێ، بۆئەوەی چاوم نەکرێتەوە. دوا جار بە پەستانێکی زۆر پێڵوی چاوەکانم کردەوە و ئەم جارەیان دیدەکانم کەسێکی لە ژوورەکەدا بینی. من ئومێدم وا بوو کە لەو ژوورەدا عیسا ببینم، بەڵام ئەوم نەبینی و سەیرم کرد ئافرەتێك لە ژوورەکەدا ڕاوەستاوە، ئەو ئافرەتە کە لە تەنیشت جێگە خەوەکەی مندا بوو، جلێکی ڕەشی لەبەردا بوو و پەرچەیەکی دابوو بە دەم و چاویدا، بەڵام نەك بەو شێوەیەی کە نەتوانم دەم و چاوی ببینم. قەد و باڵای وای نیشان دەدا کە گەنج نەبێ و تێپەڕ بوونی ڕۆژەکان، شوێنەواری بەساڵداچووی تەمەنی لە قەد و باڵایدا تۆمار کردبوو. بەڵام شێوەی ئەو ئافرەتە دەری دەخست کە لە سەردەمی گەنجێتیدا زۆر جوان بووبێت.

من کاتێ چاوم بەو ئافرەتە کەوت، لە جێگەی خۆم بەرز بوومەوە و ڕاوەستام، بەڵام ئەو پێی گوتم کە دابنیشم و منیش دانیشتم و ئافرەتەکە گوتی: ئەو خۆی کردە قوربانی تاوەکو ببێتە هۆی ڕزگار بوونی ئێمە.

گوتم: باسی کێ دەکەیت؟

ئەو گوتی: باسی عیسا دەکەم. من دەزانم کە تۆ یەکێ بوویت لە دڵسۆزەکانی ئەو و ئەو ڕۆژەی کە عیسایان لە خاچ دا شەڕت لەگەڵ پیاوێك کرد کە دەیویست سوکایەتی پێ بکات.

گوتم: من ئەو ڕۆژە لەگەڵ کەس شەڕم نەکرد بەڵکو لەگەڵ کەسێکدا دەمەقاڵێم کرد و ئینجا داوام لە ئەفسەرێکی ڕۆمی کە لەوێدا بوو، کرد تا دووری بخاتەوە. بەڵام ڕوخساری تۆ بەلای منەوە ئاشنایە و وەکو ئەوە وایە تۆم بینیبێت و لەناکاو، ئەو ڕۆژەی عیسایان لەخاچ دەدا، تۆ کەوتبیتە بەرچاوم.

ئافرەتەکە گوتی: ڕاستە، تۆ ئەو ڕۆژە منت بینی.

---

[25] دیارە لەو سەردەمەدا چەند بەردێکیان بە کێشێکی دیاریکراو تاشیوە و شتومەك یان کەلوپەلیان پێ کێشانە کردووە. (و.کوردی)

گوتم: ئەو ڕۆژە تۆ لە تەنیشت دایکی عیسادا نەبووی؟

ئافرەتە ڕەش پۆشەکە گوتی: بەڵێ، من لەو ڕۆژە تاریکەدا، بەچاوی خۆم دیمەنی مەرگە دڵتەزێنەکەی عیسام بینی.

گوتم: دەکرێ لێت بپرسم تۆ کێیت، واتە ناوت چییە؟

ئافرەتەکە گوتی: من ناوم "مریەمی مەجدەلییە"یە.

من ناوی "مریەمی مەجدەلییە"م بیستبوو و دەمزانی کە ئافرەتێکی داوێن پیس بووە، بەڵام عیسا ئەوی لە گۆمی خراپەکاندا هێناوەتە دەرەوە و ڕێگەی ڕاستی نیشان داوە. من چاوەڕێم نەدەکرد لەوێ "مریەمی مەجدەلییە" ببینم و بە تایبەتیش چاوەڕێم نەدەکرد بەو شێوە شکۆمەندیە و بەو شکڵە پیرۆزەوە بیبینم، چونکە دەمزانی ئەو ئافرەتە خراپەکارانەی کە دوای ئەوەی بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنمایی دەکرێن و تەوبە دەکەن بۆئەوەی ئیتر تووشی خراپەکاری نەبن، هێشتا ئەوەندە شوێنەواری دۆخی ڕابردوویان لەسەر دەمێنێت کە کاتێ مرۆڤ سەیریان بکات، دەتوانێ بزانێ کە لە ڕابردوودا چۆن بووە. بەڵام مزیەمی مەجدەلییە بەتەواوی گۆڕابوو و لە ڕوخساریدا ئەوە نەدەبینرا کە لە ڕابردوودا خراپەکار بوویت. بە پێچەوانەوە شکڵی ئەو ئافرەتە ئەوەندە لە شەرمی و هێمنیدا بەشکۆ بوو کە مرۆڤ دوای بینینی ئەو ئافرەتە وایدەزانی یەکێ لە ئافرەتە پیرۆزەکانی بینیووە.

گوتم: مریەمی مەجدەلییە، من بە کورتی باسی ژیانی تۆم بیستووە و دەزانم کە لە ڕابردوودا چۆن بوویت؟ من پیرۆزبایت لێ دەکەم کە بەهۆی ڕێنوێنی عیساوە توانیوتە ڕێچکەی ژیانی خۆت بگۆڕیت و ببیتە ئافرەتێکی ئاوا هێمن و بڕوادار. بەڵام نازانم بۆچی هاتوویت بۆ ئێرە و خۆت بە من ناساند؟

ئافرەتەکە گوتی: من بیستوومە کە تۆ، دوای ئەوەی عیسا لەناو گۆڕەکەدا دیار نەماوە، بە فەرمانی فەرمانڕەوای گشتی چوویتە ناو گۆڕەکەی و، تۆ یەکەمین ڕۆمیت کە دوای دیار نەمانی عیسا، چوویتە ناو گۆڕەکەی، بۆیە دەمەوێ ئەوەی کە بینیووتە بۆم باس بکەی. من کاتێ دەڵێم عیسا لە ناو گۆڕ هاتۆتە دەرەوە، کەس باوەڕ بە قسەکەم ناکات، چونکە من ئافرەتم. بەڵام لەبەرئەوەی تۆ پیاویت، بە تایبەت کە پیاوێکی ڕۆمیت، قسەکانت کاریگەری هەیە و بڵێ چیت بینیووە لە ناو ئەو گۆڕەدا.

گوتم: من بە فەرمانی "پوتوس پیلات" و بە هاوکاری ئەفسەرێکی ڕۆمی کە پلەی سەنتوریونی هەبوو چوومەتە ناو گۆڕەکەی عیساوە. پێش ئەوەی بڕۆمە ناو گۆڕەکە، سەیرم کرد بەهۆی بوومەلەرزەوە، بەردی سەر ئەو گۆڕە و گۆڕەکانی تر لەسەر مەزار دوور کەوتبوونەوە. دوای ئەوەی کە ڕۆشتمە ناو گۆڕەکەوە، سەیرم کرد کفنەکەی عیسا بە دەست لێنەدراوی ماوەتەوە، بەجۆرێك کە کاتێ مرۆڤ سەیری ئەم کفنەی بکردایە، وایدەزانی هێشتا تەرمی عیسای لەناودایە و بەڵام ئەگەر کاتێ دەستی لە کفنەکە بدایە، ئینجا دەیزانی کە تەرمی عیسای لەناودا نییە. من ناتوانم بڵێم چۆن تەرمی عیسا لەناو ئەو کفنەدا چۆتە دەرەوە بەبێ ئەوەی کە شێوەی کفنەکە بگۆڕێ و، هیچ ڕونکردنەویەکی زیرەکانەم نییە بۆ ئەو ڕووداوە، چونکە هەرگیز لە جیهاندا شتی لەم جۆرە ڕووی نەداوە. ئینجا بەردەوام بووم، لەگەڵ ئەوەی کە هزرو هۆشم بڕوا ناکات مردوویەك زیندوو ببێتەوە بەجۆرێك کە لە کفنەکەی خۆی بچێتە دەرەوە و کفنەکەش نەگۆڕێت، بەڵام دڵنیام کە ئەم ڕووداوە ڕووی داوە و عیسا لەناو ئەو کفنەدا هاتۆتە دەرەوە. بەڵام دوای من یەهوودییەکان هاتن و لەبەرئەوەی ڕقیان لە عیسا بوو و لێی تووڕە بوون، کفنەکەیان دڕاند و شێواندیان بۆئەوەی بتوانن بڵێن شوێنکەوتوانی عیسا کفنەکەیان دڕاندوە و تەرمەکەیان لە گۆڕ دەرهێناوە تاکو بڵێن عیسا بە پێی گوتەی خۆی، دوای مردن زیندوو بوویەوە و لەگۆڕ هاتۆتە دەرەوە.

پاشان گوتم: بەڵام ئەی مریەمی مەجدەلییە، تۆ لەدوای من ڕۆشتیتە ناو گۆڕی عیسا و بڵێ کە کاتێ پێت نایە ناو گۆڕەکەیەوە، چیت بینی و ئایا کفنەکەی عیسا بەو شێوەیەی کە من بینیم تەرمی تێدا نەبوو، ئایا وەکو من بەبێ دڕاوی و شێواوی کفنەکەت بینی؟

مریەمی مەجدەلییە سەری ڕاوەشاند و گوتی: کاتێ من گەیشتمە گۆڕەکەی عیسا، دنیا تاریك بوو. سەیرم کرد بەردەکە لەسەر مەزارەکە لاچووە و وامدەزانی کەسێك ئەو بەردەی لەسەر گۆڕەکە وەلا ناوە. من نەچوومە ناو گۆڕەکەوە و ئەگەریش بچوومایەتە ناو گۆڕەکەوە، بەهۆی تاریکی هەواوە هیچ شتێکم نەدەبینی. من لە گۆڕەکە دوور کەوتمەوە و خۆم گەیاندە ئەو شوێنەی کە دەمزانی شوێنکەوتە نزیکەکانی عیسا لەوێن. من لەگەڵ خۆم دوو کەسیانم هێنایە تەنیشت گۆڕەکەی عیساوە. یەکێ لەوان"

شەمعون پترۆس" بوو کە پیاوێکی بەتوانا و باڵا بەرز و قەڵەو بوو، ئەوی تریات "یۆحەننا" بوو کە عیسا پێش ئەوەی لە خاچ بدرێ، دایکی سپارد بەو.

"مریەمی مەجدەلییە" بەردەوام بوو: ئەو دوو کەسە دوای ئەوەی هاتنە تەنیشت گۆڕەکەی عیساوە، چوونە ناوەوە و سەیریان کرد گۆڕەکە بەتاڵە. دوای هاتنە دەرەوە لەناو گۆڕەکە، لە ترسی جوولەکەکان لەوێ ڕانەوەستان و دوور کەوتنەوە. بەڵام من لە تەنیشت گۆڕەکە ڕاوەستام و دەستم بە گریان کرد و سەیرم کرد ناو گۆڕەکە ڕووناك بوویەوە. چەمامەوە بۆئەوەی بزانم هۆی ڕووناکی گۆڕەکە چیە، ئایا چرایەك لە ناویدا داگیرساوە کەوا گۆڕەکەی ڕووناك کردۆتەوە یان تیشکی ڕووناکی گۆڕەکە هۆیەکی تری هەیە. ئەو کاتە سەیرم کرد فریشتەیەك لە ناو گۆڕەکەدایە کە پۆشاکی ئاگرینی لەبەردایە و ڕوخساری وەکو مەشخەڵێك دەدرەوشێتەوە و ڕووناکی ناو گۆڕەکە بەهۆی پۆشاك و تیشك دانەوەی ڕوخساری ئەوە. بە بینینی ئەو ڕووناکییە ئەوەندە ترسام کە ویستم هەڵبێم، بەڵام ئەو فریشتەیە ناوی منی هێنا و گوتی ((مریەمی مەجدەلییە، بۆ کوێ دەڕۆی؟)) ئەو کاتە من بە سەرسامیەوە بۆم دەرکەوت ئەو فریشتەی کە بە تیشکەکانی گۆڕەکەی ڕوناك کردۆتەوە، عیسایە.

ئەوەی مریەمی مەجدەلییە لەبارەی ڕووناکایی ناو گۆڕەکەی عیسا باسی دەکرد لەگەڵ ئەوەی کە پاسەوانە ڕۆمییەکان باسیان دەکرد، جیاوازی نەبوو.

کە من چوومە ناو بیر و خەیاڵەوە، مەریەمی مەجدەلییە وا سەرنجی دام کە لەوانەیە باوەڕ بە قسەکەی نەکەم و گوتی: سەرت لەوە سوڕ نەمێنی کە دوای ئەوەی عیسام بینیوە، کەچی نەمناسیوە، چونکە شوێنکەوتووەکانیشی لە دەریاچەی جەلیلە بینیویانە و نەیانناسیوەتەوە. کاتێ قوتابییەکانی عیسا لەسەر بەلەمێك لە دەریاچەی جەلیلەوە تێدەپەڕین، عیسا چووە ناو ئاوەکەوە و بۆئەوەی بەدوایاندا بڕوات، بەسەر ڕووی ئاوەکەوە تێپەڕیوە. قوتابییەکانی عیسا نەیانزانیوە کە پێشەواکەیانە. کاتێکیش من ئەو کەسەم لە ناو گۆڕی عیسادا بینی، وامزانی کە بەڕاستی فریشتەیە. دواتر زانیم فریشتە نییە، بەڵکو پیاوێکە و پۆشاکی ئاگرینی لەبەردایە و ڕوخساری وەکو ئاگر دەدرەوشێتەوە. من بە خۆم گوت لەوانەیە ئەوە تەرمەکەی عیسای بردبێتە دەرەوە و دەمویست بڵێم تەرمەکە بگەڕێنەوە و بیخاتە ناو گۆڕەکە، بەڵام ئەوەندە لەو پیاوە دەترسام کە نەمدەتوانی ئەو قسەیە بهێنمە سەر زمانم و دەمویست هەڵبێم، تاوەکو

ناوی منی هێنا. ئینجا لەو کاتەدا دانیشتم و زانیم کە عیسایە. لە مریەمی مەجدەلییەم پرسی: دواتر چی ڕووی دا؟

مریەم گوتی: ئینجا عیسا پەیامێکی پێدا ناردم بۆ قوتابییەکانی و منیش بە هۆی ئەوەی کە زۆر خۆشحاڵ بووم، وەکو کەسێك کە باڵی لێ پەیدا ببێ و هەڵبفڕێ، کەوتمەڕێ و بە پەلە خۆم گەیاندە قوتابییەکان و پەیامەکەی عیسام پێ گوتن و ئەوەی کەبینیم، بۆم باس کردن، بەڵام قوتابییەکانی عیسا باوەڕیان بە قسەکانی من نەکرد.

منیش باوەڕم بە قسەکانی مریەمی مەجدەلییە نەکرد، بەڵام بە درۆزانیشم نەدەزانی. مریەمی مەجدەلییە ئافرەتێك نەبوو کە درۆ بکات و پێم وابوو لەوانەیە کەوتبێتە بەر کاریگەری بیر و خەیاڵ و هەستی ناخی خۆیەوە و ئەوەی کە بە خەیاڵ و هەستی ناخیدا نەهاتووە، لە شێوەی پیاوێکی ئاگرین کەوتۆتە بەرچاوی.

ئینجا لێم پرسی: ئەی کفنەکەی عیسات بینی یان نا؟

مریەمی مەجدەلییە گوتی: لەو کات و ساتەدا چۆن دەمتوانی ئاگاداری بابەتی کفنەکەی عیسا بم لەناو گۆڕەکەیدا و لەوە بکۆڵمەوە کە کفنەکە دڕاوە یان دەستی لێ نەدراوە. تۆ سەرت لەوە سووڕ دەمێنێ کە چۆن من ئەو شەوە عیسام نەناسیوە، لەکاتێکدا ڕۆژی دواتر دوو کەس لە شوێنکەوتوانی عیسا ئەویان بینیوە و نەیانناسیوە، ئەمەش لەکاتێکدا کە عیسا ماوەیەك لەگەڵیاندا ڕێگەی بڕیوە و لەبارەی نووسراوێکەوە قسەی لەگەڵ کردوون تا نزیکی خۆرئاوا بوون کە گەیشتۆتە گوندێك و لەوێ عیسا لەگەڵیاندا نانیشی خواردووە. لەو کاتەدا تەنیا ئەو دوو کەسە دەزانن کە ئەو کەسەی لەو گەشتەدا هاوڕێیان بووە، عیسایە و دواتر دیار نەماوە.

گوتم: مریەمی مەجدەلییە، بڕوای خودی خۆت چییە. ئایا تۆ بڕوات وایە کە عیسا زیندوو بۆتەوە؟

مریەم گوتی: بەڵێ، من باوەڕم وایە کە عیسا زیندوو بۆتەوە و لە گۆڕ هاتۆتە دەرەوە و لەم جیهانەدا دەژی و بۆ هەرکوێ بیەوێ دەڕوات و هەندێ کەس دەیناسنەوە و هەندێکی تر نایناسنەوە و، ئێمە دەبێ ئارام بگرین تاکو ڕۆژێ بێت و خودی عیسا، خۆی بە هەموان بناسێنێ.

گوتم: مریەم، تۆ گوتت کە عیسا بەسەر ڕووی دەریاچەی جەلیلەوە تێپەڕی. ئایا بەسەر ئاوەکەوە هەنگاوی نا؟

مریەمی مەجدەلییە گووتی: بەڵێ.

گوتم: ئایا دەکرێ مرۆڤێك بەسەر ئاودا هەنگاوبنێ و لە ناو ئاوەکەدا نقوم نەبێ. ئایا بیرو هۆشی تۆ ئەوە پەسەند دەکات کە مرۆڤێك بتوانێ ئەم کارە بکات؟

مریەم گوتی: عیسا ئەوەندە کاری سەرسوڕهێنەری ئەنجام داوە کە تێپەڕینی بەسەر ڕووی ئاوی دەریاچەی جەلیلە لەچاو کارە سەرسوڕ هێنەرەکانی تریدا ڕووداوێکی گرنگ و سەیر نییە.

گوتم: ئەی مریەمی مەجدەلییە تۆ ئافرەتێکی تێگەیشتوویت و من بیستوومە کە تۆ زمانی یۆنانی و هەروەها زمانی ئایینی جوولەکەکان دەزانی. من حەز دەکەم لەبارەی ڕابردووی تۆوە، زانیاریم هەبێت بۆئەوەی زیاتر بتناسم.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: من بۆیە زمانی یۆنانی و زمانی ئایینی یەهوودییەکان دەزانم چونکە لە ڕابردوودا لەگەڵ چین و توێژە جۆراوجۆرەکاندا دەژیام و هەموو جۆرە پیاوێکم دەهێنایە ماڵەکەی خۆم، تا ڕۆژێك بەرەوڕووی عیسا بوومەوە کە تاکە کەسێ بوو، دوای ئەوەی منی بینی، وەکو پیاوانی تر داوای هیچی لێ نەکردم و لەجیاتیدا داوای لێ کردم خۆم باش بکەم و لە ژیاندا ڕێگەی ڕاست بگرمەبەر. ئافرەتانێك هەن کە لە گۆمی گوناهدا پەلەقاژە دەکەن و حەز دەکەن خۆیان ڕزگار بکەن، بەڵام ناتوانن ئەو کارە بکەن، چونکە نایانەوێ و ناتوانن خۆیان بگەیەننە لێواری ڕزگاری. بەڵام هێزی نادیاری عیسا بەجۆرێك کاری لە من کرد کە توانیم لەناو گێژاوی گوناهباریدا خۆم ڕزگار بکەم و بەتەواوی ژیانی خۆم بگۆڕم. کەواتە ئەی پیاوی ڕۆمی، تۆ لەبارەی ڕابردوومەوە هیچم لێ مەپرسە، چونکە حەز ناکەم ڕابردووی خۆم بیربکەوێتەوە و لەبارەی ئەمڕۆمەوە پرسیارم لێ بکە، نەك ڕابردوو.

گوتم: زۆر باشە، سەبارەت بەڕابردووت پرسیارت لێ ناکەم. پرسارێکی ترم ئەوەیە کە، چی وای کرد بڕوا بە من بکەیت لەکاتێکدا من کابرایەکی بێگانەم و، لەبارەی عیساوە قسەم لەگەڵ دەکەی؟

مریەمی مەجدەلییە گوتی: چونکە کاتێ عیسایان لە خاچ دا، من تۆم لەبن خاچەکە بینی و سەیرم کرد بە شێوەیەکی ئاشکرا لایەنگیری عیسا دەکەیت، لە کاتێکدا کە جگە لەو نووسراوەی لە سەرووییەوە هەڵیانواسیبوو، هیچ زانیاریەکت لەبارەی بارودۆخیەوە نەبوو. من کە لەوێ بووم سەیرم کرد تۆ بەرگریت لە عیسا

دەکرد، لەکاتێکدا کە ئەندامانی هۆزەکەی خۆی، واتە یەهوودییەکان، ئەویان کوشت و تەنانەت قوتابییەکانی ئامادە نەبوون بەرگری لێ بکەن. لەناو قوتابییەکانیدا تەنیا یەك کەس کە ناوی "تۆماس"ە، گوتی ((ئێستە کە ڕابەری ئێمە فەرمانی بۆ مەرگ دەرکراوە و بڕیاریان داوە لە سێدارەی بدەن، دەبێ ئێمەش وەکو ئەو بمرین)) بەڵام هیچکام لەوان شمشێریان بەدەستەوە نەگرت تا لەڕێی پێشەوا و سەرکردەکەی خۆیان بجەنگن و بکوژرێن، گوایە دەبوو ئەوە لەبەرچاو بگرن کە عیسا گوتبووی هەرکەسێ بە شمشێر کەسێ بکوژێت، ئەوا بە شمشێر دەکوژرێت. بەڵام عیسا کە ئەم قسەیەی کرد، کاتی لەگەڵ شوێنکەوتووانی خۆی دەچوو بۆ قودس ئەمەشی بەوان گوت کە ((هەرکەسێ ئەمڕۆ عەبایەکی هەبێ، دەبێ بیفرۆشێ و شمشێرێکی پێ بکڕێ)).

مریەمی مەجدەلییە درێژەی پێدا: لەوانەیە مەبەستی عیسا لەم قسەیە ئەوە بووبێ کە ویستوویەتی ئەوان تاقی بکاتەوە و لەوانەشە ویستبێتی ئەوان شمشێر بکڕن بۆئەوەی ببێتە هۆکارێك بۆ بەرگری کردن لە خۆیان و، خۆیان بژێوی دڵیان پەیدا بکەن. تا ئەو جێگەی من ئاگام لێیە، شوێنکەوتووانی عیسا تەنیا دوو شمشێریان پەیدا کرد کە یەکێکیان لەلای "شەمعون پترۆس" بوو. ئەو پیاوە سوودی لە شمشێرەکەی خۆی وەرگرتووە و لە شەوێکدا کە بۆی هاتن و ویستیان بیگرن، بە هێزی شمشێرەکەی گوێی یەکێ لە خزمەتکارەکانی پەرستگای بڕی کە هاتبوو بۆ گرتنی و، ڕایکرد لە دەستیان.

گوتم: مریەمی مەجدەلییە، من هێشتا قوتابییەکانی عیسام نەبینیوە و قسەم لەگەڵیان نەکردووە، بەڵام وا هەست دەکەم کە لەوانەیە تۆ باشتر لە شوێنکەوتووانی عیسا، عیسات ناسیوە. من لەبەرئەوەی ڕۆمیم، ڕێز لە ئافرەتان دەگرم و هۆکارەکەشی ئەوەیە کە لەزێدی مندا ئافرەتان ئازادن و لە کۆمەڵگادا ڕێزیان هەیە و، ڕادەی خوێندەواریان یەکسانە لەگەڵ پیاواندا و هەر زانستێك کە پیاو فێری دەبێ، ئافرەتیش فێر دەبێ. من بە ئەزموون بۆم دەرکەوتووە کە ئافرەتان کاتێ زانیاری پەیدا دەکەن شتێکی زیاتریان هەیە لەچاو ئەو پیاوانەی کە زانان، ئەویش هۆشی سروشتییانە. هەموو ئافرەتێك هۆشی سروشتییان هەیە و تەنانەت ئەو ئەو ئافرەتانەش کە زانا نین، هۆشی سروشتییان هەیە. ئافرەتان بە هۆشی سروشتی خۆیان هەندێ شت دەزانن کە پیاو نایانزانێ و لەبەرئەوەی تۆش ئافرەتیت، دوور نییە کە بە هۆشی سروشتی خۆت شتێك لە عیسا بزانیت کە قوتابییەکانی ئەو، کە پیاون، نەیانزانیوە. بەم حاڵەوە من

حەز دەکەم قوتابییەکانی عیسا ببینم و ئەگەر پێویست نەکات دیدار لەگەڵ هەموو قوتابییەکان بکەم، ئەوا حەز دەکەم لەگەڵ هەندێکیان دیدار بکەم تا بزانم پیاوان سەبارەت بە عیسا چ بیروبۆچوونێکیان هەیە.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: لەگەڵ ئەوەی کە من دەزانم قوتابییەکانی عیسا کەمتەخەرمییان نەکردووە و بۆ بەرگری کردن لە پێشەواکەی خۆیان گیان فیداییان نەکردووە، بەڵام پەیوەندیم خراپ نییە لەگەڵیان و دوای مەرگی عیسا، کاتێك خۆیان حەشاردا، دەمتوانی ئازووقەیان پێ بگەیەنم بۆئەوەی بەهۆی برسێتییەوە لەناو نەچن. بەڵام شوێنکەوتووانی عیسا حاڵی حازر زۆر دەترسێن لەوەی دەستگر بکرێن و ناوێرن بگەڕێنەوە بۆ "جەلیلە" کە زێدی سەرەکی خۆیانە، چونکە جگە لەوەی دیالێکتی ئەوان دەری دەخات کە خەڵکی "جەلیلە"ن، بەڵکو قیافەشیان ئاشنایە. دەبێ بڵێم کە زۆربەی شوێنکەوتووەکانی عیسا ماسی گری دەریاچەی "جەلیلە"ن و قیافەشیان دەری دەخات کە ڕاوچی "جەلیلە"ن. تۆش ئەگەر بیانبینی، هەرچەندە کابرایەکی ڕۆمیت، هەست بە جیاوازی قیافەیان دەکەیت لەگەڵ کەسانی دیکەدا.

پاشان مریەم گوتی: لەوانەیە بەهۆی ئەوەی کە من نازانم بۆچی عیسا قوتابییەکانی خۆی لەناو ماسی گرەکاندا هەڵبژاردوە و لە ناویاندا تەنیا یەك کەس قوتابخانەی بینوە و خاوەنی زانیاریە و ئەوانی تر زانیاریان نییە، بۆیە بڕوام وایە کە ئەگەر شوێنکەوتووانی عیسا لە چینی زاناکان بوونایە، ئەمڕۆ قسەکانی عیسا لە هەموو شوێنێك بڵاو ببویەوە.

گوتەکانی عیسا ئەندێشەیەکی ئەوەندە قوڵ و بیرکردنەوەیەکی وردی دەوێ کە هەر وەکو چۆن زانایەکی "یۆنانی" بۆ ناوی شارێك لە شارەکان کە لە "ئیلیاد"دا ناوی هێناوە، کتێبێك دەنووسی[٢٦]، ئاوا زانایەك دەتوانێ تەنیا بۆیەك وشە لە قسەکانی عیسا، کتێبێك بنووسێت.

گوتم: مریەمی مەجدەلییە تکات لێ دەکەم بە قوتابییەکانی عیسام بناسێنە و ئەگەر پێویست ناکات بە هەموویان ئاشنا بم، ئەوا لەگەڵ دوو سێ کەسیان ئاشنام بکە.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: تۆ هەرچەندە ڕۆمیت، بەڵام جاسوس نیت. ئەگەر تۆ جاسوس بوویتایە، من هەستم دەکرد کە دەتەوێ شوێنکەوتووانی عیسا تووشی گرفت

---

[26] (ئیلیاد) ناوی داستانێکی ناسراوی (هۆمەر)ی شاعیری یۆنانییە کە لەسەر جەنگی (تەروا)ی نووسیوە.

بکەیت. بەڵام خۆشەویستیەك لە تۆدا هەستی پێ دەکرێ کە لە جاسوسێکدا بەدی ناکرێ. بەڵام ئەگەریش بتەوێ خیانەت بە شوێنکەوتوانی عیسا بکەیت، سزا دەدرێیت، واتە عیسا خۆی سزات دەدات.

گوتم: من جاسوس نیم و نامەوێ شوێنکەوتووانی عیسا تاقی بکەمەوە. من پیاوێکم کە دەمەوێ زانیاریم هەبێت و دەمەوێ بزانم عیسا کێ بووە و چی گوتووە و چی کردووە و ئێستاش زیندووە یان مردووە، واتە نوێ بوونەوەی ژیانی ڕاستە یان نا؟

مریەمی مەجدەلییە گوتی: ئایا دەزانی "دەروازەی کانی" لەکوێ یە؟

گوتم: دۆزینەوەی "دەروازەی کانی" گران نییە.

مریەم گوتی: بڕۆ بۆ ئەوێ و لە نزیك "دەروازەی کانی" پیاوێك دەبینی کە ئاو هەڵدەگۆزێ. بچۆ بۆ لایی و داوای لێی بکە ڕێنوێنیت بکات و ئەگەر زانیت ئەو پیاوە وڵامت ناداتەوە، زۆری لێ مەکە و نەرمی بنوێنە و ئارام بگرە تا ڕۆژێك ئەو پیاوە دێتە قسە و ئەو شتانەی کە تۆ حەزت پێ هەیە پێت بڵێ.

ناونیشانی مریەمی مەجدەلییە بۆ دۆزینەوەی ئەو پیاوە، هەر ئەوە بوو کە من پێش کفتوگۆ کردن لەگەڵ مریەمی مەجدەلییە بیستبووم.

گوتم: دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ شار، ئایا حەز دەکەیت لەگەڵ خۆم بتگەیەنمە شار؟

مریەمی مەجدەلییە گوتی: نەخێر، من حەز دەکەم ماوەیەك لێرە بمێنمەوە. بەو جۆرەی کە بینیت، لەمماڵەدا دوو ئافرەت ژیان بەسەر دەبەن کە هەردووکیان عیسا دەناسن و ئەم ژوورەش ئەو شوێنەیە کە عیسا تیایدا دانیشتووە و، تۆ هەرکاتێ حەز بکەیت دەتوانی بێیت بۆ ئێرە. ئەو کاتە پێڵاوەکانم کردە پێم و کاتێ کە دەمویست قەیتانی پێڵاوەکەم بپێچم بەدەوری قاچمدا، مریەم چەمایەوە و دەستی خستە سەر سەرم و بەم جۆرەش ڕێزی لێ گرتم. پاشان من لە پلیکانەکان چوومە خوارەوە بۆ ناو حەوشەی ماڵەکە. حەوشەکە ئەوەندە چۆڵ بوو کە من بەبێ ئەوەی ماڵئاوایی لەو دوو خوشکە و "لازاروس" بکەم، لەو ماڵە چوومە دەرەوە. من دەمتوانی بەدەنگی بەرز ماڵئاوایی لە دانیشتوانی ئەو ماڵە بکەم، بەڵام ئەم کارەم بە باش نەزانی، چونکە دەبووە هۆی ئازاردانی ئەو دوو خوشکە و "لازاروس" و وامزانی ئەوان نووستوون و نەدەبوو ببمە هۆی بێزارییان. بەڵام کاتێ دەمویست لەو ماڵە بچمە دەرەوە، بە پێوەری ئێمەی ڕۆمی بە سێبەری دارەکاندا زانیم کە پێنج کاتژمێر لە نیوەڕۆ تێپەڕیوە.

دوای چوونە دەرەوەم لەماڵی لازاروس و خوشکەکانی، بەرەو شار کەوتمە ڕێ.

# سواڵکەرێکی نابینا

لەو ئێوارەیەی بەهاردا. هەوا زۆر خۆش بوو، لە هەواوە بۆنی گڵ و ئاڵف دەهات. من هەندێ جار بەژێر سێبەری درەختە چڕوپڕەکاندا و ماوەیەکیش لە تەنیشت دارە زەیتونەکانەوە تێدەپەڕیم و، لەبەرئەوەی کە پەلەم نەبوو، بۆیە ئەوەندە بە هێواشی ڕێگام دەبڕی کە کاتێ لە دەروازەی شار نزیك بوومەوە، خۆر بۆ کاتی نانخواردنی ئێوارە نزیك دەبوویەوە.

لەوێدا دەنگێکی بەردەوام هاتە گوێم و ڕێڕەوی دەنگەکەم دۆزیەوە و سەیری ئەو لایەم کرد، بینیم سواڵکەرێکی نابیا لە لێواری جادەدا لە نزیك بەردێك دانیشتووە و بە بەردەوام گۆچانەکی خۆی دەکێشێ بە بەردا بۆئەوەی سەرنجی ڕێبواران بۆ خۆی ڕابکێشێ. لەو کاتەدا، لەو دەوروبەرەدا جگە لە من، هیچ ڕێبوارێکی لێ نەبوو، کاتێك سواڵکەرە نابیناکە گوێی لە دەنگی پێی من بوو، هاواری کرد: ئەی ڕێبوار، من نابینام، بەزەییەکم پێ بکە.

دەبێ ئەوە بڵێم کە پێش ئەوەی من لە شار بچمە دەرەوە تا بەرەو گوندی "بیتانی" بکەومەڕێ، ژنی خاوەن ماڵەکە هەمبانەیەکی بچووکی پێ دام کە لەناویدا کولێرەیەك و بڕێك پەنیری تێدا بوو و گوتی: ((ئەگەر برسیت بوو، لەو نان و پەنیرە بخۆ)). دوای ئەوەی کە گەیشتمە ماڵی لازاروس، بەو جۆرەی کە گوتم، خوشکەکانی خواردنێکی ئەوەندە زۆریان پێ خواردم کە ئیتر پێویستم نەبوو سوود لەو نان و پەنیرەی کە لەناو ئەو هەمبانە بچوکەدا بوو، وەربگرم. ئەوە بوو کە بەرەو سواڵکەرە نابیناکە ڕۆیشتم بۆئەوەی هەمبانەکەی پێ بدەم.

کاتێ لێی نزیك بوومەوە، سەیرم کرد هەردوو کاسەی چاوی بەتاڵە و هیچ شتێکی تێدا نییە و پۆشاکی سواڵکەرەکە شڕو دڕاوە و بۆنێکی ناخۆش کە لە ئەوەوە دەهات، هات بە لوتمدا.

من هەمبانەکەم پێدا و گوتم: ئەم هەمبانە نان و پەنیری تێدایە و هەرچییەك لەناو ئەو هەمبانەدایە بیخۆ.

ئەو کاتە بیرم کەوتەوە کە هەمبانەکە هی ژنی خاوەن ماڵەکەیە و دەبێ بۆی ببەمەوە، بۆیە هەمبانەکەم لە سواڵکەرە نابیناکە وەرگرتەوە و نان و پەنیرەکەم خستە ناو دەستیەوە و هەمبانەکەم هەڵگرت بۆئەوەی بیبەمەوە بۆ خاوەنەکەی.

کاتێ سواڵکەرە نابیناکە بەدەنگی پێمدا زانی کە دوور دەکەومەوە، دەنگی بە هاوار کردەوە و گوتی: ئەی ڕێبوار، شەو نزیك بۆتەوە و من لەم بیابانەدا تەنیام و کەس نییە بمگەیەنێتە شارەکە. ئەگەر تۆ کابرایەکی بەبەزەییت ئەوا بەزەییەکت پێمدا بێتەوە و بمگەیەنەوە شارەکە. من ئەگەر بگەمە ناوشار، ئەوا ڕێگەی خۆم لە شەقام و کۆڵانەکانی شاردا دەدۆزمەوە، بەڵام لەم بیابانەدا ناتوانم ڕێگەی خۆم بدۆزمەوە، چونکە ئاشنا نیم بە بارودۆخی ئێرە و لەسەر تەختە بەردەکان بەزەویدا دەکەوم و ئێسکەکانی دەست و قاچم دەشکێ.

من سەرەتا نەمدەویست ئەو سواڵکەرە نابینایە تا دەروازەی شار ڕێنمایی بکەم، چونکە قێزم لە چڵکنییەکەی دەکردەوە، بەڵام دوای تێپەڕبوونی چەند هەنگاوێك تووشی دوو دڵی بووم و ڕاوەستام.

کە سواڵکەرە نابیناکە زانی ڕاوەستاوم، ئومێدەوار بوو و گوتی: ئەی ڕێبوار، من چاوم نییە و ناتوانم لەم بیابانەدا ڕێگەی خۆم بدۆزمەوە، بەڵام تۆ چاوت هەیە و هەموو جێگایەك دەبینی و دەتوانی تا دەروازەی شار ڕێنمایم بکەی. من تەنیا تا دەروازی شار شارەزام و دوای ئەوەی چوومە ناو شەقامەکانی شار، دەتوانم ڕێی خۆم بدۆزمەوە. شەو لێرەدا هەوا سارد دەبێت و جگە لە سەرما و سۆڵی هەوا، دوای داهاتنی تاریکی، سەگە دڕندەکان هێرشم بۆ دێنن و پارچە پارچەم دەکەن.

ئەوەی کە بووە هۆی دوودڵی من ئەوە بوو کە بیرم کردەوە ئەگەر خۆم نابینا بوومایە و داوای ڕێنمایم لە ڕێبوارێك بکردایە و ئەویش نەهاتایە بەدەم داواکەمەوە، ئایا بەتوندی لێقەوماو و پەشێوحاڵ نەدەبووم؟ بۆیە لە سواڵکەرە نابیناکە نزیك بوومەوە و لەگەڵ ئەوەی کە بێزار بووم لە پۆشاکە شڕو دڕاوەکەی و قێزم لە بۆنە ناخۆشەکەی دەکردەوە، گوتم: من ئامادەم ڕێنمایی تۆ بکەم، بەڵام تۆ چۆن بڕوام پێ دەکەی، خۆ لەوانەیە بتبەم بۆ جێگایەکی تر و دوورت بخەمەوە لە دەروازەکانی شار.

پیاوە سواڵکەرەکە گوتی: من نابینام و ناتوانم ڕێی خۆم بدۆزمەوە و ناچارم بڕوا بە هەموو ئەو کەسانە بکەم کە بیانەوێ ببنە ڕێ نیشاندەری من.

ئەم گوتەیە کاری لە دڵم کرد، چونکە منیش لە ڕێی گەڕان بە شوێن ڕاستیدا وەکو نابینایەك وابووم و بە شوێن ڕێنوێنیك دەگەڕام بۆئەوەی ڕێنوێنیم بکات و ڕاستیەکانی عیسام بۆ ئاشکرا بکات. ئینجا بەرەو ڕووی ئەو پیاوە ڕۆیشتم و قۆڵیم گرت و لەسەر زەوی بەرزم کردەوە و گوتم: بەڕێ بکەوە بابڕۆین.

ئەو پیاوە وەکو زۆربەی نابیاکان سەرێکی گۆچانەکەی خۆی بەرەو ڕووی من درێژ کرد بۆئەوەی گۆچانەکەی بەدەست بگرم و بەهۆی گۆچانەکەوە ڕێنوێنی بکەم، بەڵام من نەمویست گۆچانەکەی بگرم، چونکە ئەگەر سەری گۆچانەکەیم بگرتایە، ئەوا سەرەکەی تری گۆچانەکە لەدەستی ئەودا دەبوو، بەم شێوەیەش وەکو ئەوەی لێ دەهات کە گوێدرێژەیەك ڕێنوێنی بکەم. من نەمدەویست لەگەڵ سواڵکەرە نابیناکە ڕەفتارێ بکەم کە لەگەڵ گوێدرێژەکاندا دەکرێ، ئەوە بوو پیلیم گرت و کەوتینە ڕێ، بەڵام سواڵکەرە نابیناکە بەگۆچانەکەی بۆ ناڕێکی زەوی دەگەڕا تاکو نەکەوێتە ناو چاڵەوە.

دیارە بەم شێوەیە ئێمە نەماندەتوانی بەپەلە ڕێ ببڕین و بە هێواشی ڕێمان دەبڕی.

من لێم پرسی: تۆ کە ناتوانی لەم بیابانەدا ڕێی خۆت بدۆزیتەوە، بۆچی لەم خاکەدا دەرۆزە دەکەی؟ ئایا ناکرێ تۆ وەکو سواڵکەرەکانی تر، لەنزیك دەروازەی شاردا خەریکی دەرۆزە کردن بیت؟

سواڵکەرە نابیناکە کە لە شێوازی قسەکردنی من بۆی دەرکەوتبوو کە بیانیم گوتی: کابرای بێگانە، کاتێ گەنج بووم نەك تەنیا لە تەنیشت دەروازەی شاردا، بەڵکو لە ناوەوەی پەرستگادا دەرۆزەم دەکرد، بەڵام ئەفسوس کە ئێستە پیر بووم و سواڵکەرە گەنجەکان ناهێڵن لە تەنیشت دەروازی شاردا خەریکی دەرۆزەکردن ببم، چی بگات بەناوەوەی پەرستگا.

سواڵکەرە نابیناکە بەجۆرێك ئەو گوتەیەی هێنا بەزماندا کە دیار بوو شانازی بە دەرۆزەکردنی خۆیەوە دەکات لە تەنیشت دەروازەدا و، بەتایبەت لەناو پەرستگادا (لە ڕابردوو) کە (قەیسەر-پاشا) ئەوەندە شانازی بە سەرکەوتنەکانی خۆیەوە نەدەکرد. ئەو ڕۆژە زانیم کە تاکی مرۆڤ هەرچەندە بێ توانا و بچووك بێت، دیسان لە ژیاندا شتێك بۆ خۆیان پەیدا دەکەن کە شانازی پێوە دەکەن.

پیاوە نابیناکە گوتی: لەو کاتەوەی کە پیرو لاواز بووم، سواڵکەرە گەنجەکان ناهێڵن من لە تەنیشت دەروازی شاردا گەدایی بکەم. ئەمەیە کەوا دەکات هەموو ڕۆژێك داوا لەیەکێ لە ڕێبوارەکان دەکەم تاکو لە دەروزەی شار بمباتە دەرەوە و بمگەیەنێتە بیابان و لەسەر ڕێی ڕێبوار و کاروانچیەکان دام بنێ و پێش ئەوەی خۆر ئاوا ببێ، داوا لە ڕێبوارێکی تر دەکەم تاکو بمگەڕێنێتەوە بۆناو شار.

کاتێ پیاوە نابیناکە ئەم قسەیەی دەکرد، بەدەستەکەی تری کە گۆچانی پێ نەگرتبوو دەستی لە جلەکانی من دا و پاشان گوتی: پارچەی جلەکانی تۆ گرانبەهایە و بۆنی خۆشیشت لێوە دێ و وادیارە سەرمایەداریت، بۆچی پیاوێکی بە توانای پارەداری وەکو تۆ لەم کاتەدا کە خۆر لەکاتی ئاوابووندایە دەبێ بەتەنیا لە دەرەوەی شاردا بگوزەرێنێ.

گوتم: هۆی ئەوەی کە لەم کاتەدا لێرم ئەوەیە کە منیش بە شوێن ڕێنوێنێکدا دەگەڕێم تاکو ڕێم پێ نیشان بدات.

پیرە پیاوە سواڵکەرەکە گوتی خۆ تۆ کوێر نیت وا بە شوێن ڕێنوێنێکدا دەگەڕێی؟!

گوتم: چاوم هەڵنایە کەچی هەموو شوێنێکیش دەبینم، بەڵام کوێری دەروونیم، ئایا تۆ ناوی عیسات بیستووە؟ من ئەو عیسا دەڵێم کە لە خاچیان دا.

کاتێ پیرە پیاوەکە ئەم قسەیەی بیست، ڕاوەستا و دیار بوو کە بە قسەکەم سەرسام بووە و پاشان بە هەنگاوە هێواشەکەی خۆی کەوتە ڕێ و گوتی: باسیان کرد کە لە خاچیان داوە. ئەو شایستەی کوشتن بوو.

گوتم: من لە کەسانی ترم بیستووە کە عیسا پیاوێکی چاکەکار بووە و شیفای نەخۆشەکانی داوە و پێداویستی هەژارانی دابین کردوە.

سواڵکەرە نابیناکە گوتی: عیسا پیاوێکی ئاژاوەگێڕ بوو و ئەگەر زیندوو بمایە، هەموو شتێکی لەناو دەبرد و تەنانەت پەرستگای جوولەکەکانیشی وێران دەکرد. باشتر کە لە خاچیان دا و کوشتیان. ئایا تۆ ڕووداوی سواڵکەری "دەروازەی مەڕەکان"ت بیستووە؟

گوتم: نەخێر.

سواڵكەرە نابیناكە گوتی: ئەگەر تۆ ماوەیەك لەم شارەدا بمینێیتەوە، دەروازەكانی ئێرە دەناسیت و دەزانی كە ناوی یەكێ لە دەروازەكان "مەڕەكان"ە. لە تەنیشت ئەو دەروازەیەدا بۆ ماوەی سی و هەشت ساڵ پیاوێكی كەم ئەندام لە جێگایەك، لەسەر دۆشەكێكی كۆنە ڕادەكشا و ڕێبواران و كاروانچییەكان خێر و خێراتیان پێ دەدا و ئەو پیاوە بە ئاسانی دەژیا و لەتاو بژێوی تەنگەتاو نەدەبوو. ڕۆژێك عیسا لە" دەروازەی مەڕەكان" تێپەڕی و سواڵكەرە كەم ئەندامەكەی بینی و پێی گوت: "هەستەوە و بڕۆ لەڕێ".

ئەو پیاوە گوتی: ((من كەم ئەندامم و ناتوانم لەجێگای خۆم بەرز ببمەوە و بڕۆم لەڕێ)). عیسا گوتی: ((من پێت دەڵێم هەستەوە و بڕۆ لەڕێ و پاش ئەوەی كە زانیت دەتوانی بڕۆی لەڕێ، جێگەكەی خۆت كۆبكەرەوە و لەگەڵ خۆتی ببە)).

پیاوە سواڵكەرەكە كە ماوەی سی و هەشت ساڵ نەیدەتوانی هەستێتە سەرپێ، لە جێگای خۆی هەستایەوە و ڕاوەستا، ئینجا هەنگاوی نا و بە سەرسامیەوە زانی كە دەتوانێ بڕوات لەڕێ. پاشان چەمایەوە و دۆشەكەكەی خۆی دەق گرت و خستیە بن باڵیەوە و كەوتە جوڵە. ئەو پیاوە بەدبەختە لەو كاتەدا ئەوەندە خۆشحاڵ بوو كە نەیدەتوانی پێشبینی ئەوە بكات كە كارە سەمەرەكەی عیسا چۆن ئەوی بەدبەخت كردووە.

من بەم گوتەیە سەرسام بووم و گوتم: تۆ دەڵێی كە ئەو پیاوە ماوەی سی و هەشت ساڵ لەسەر جێگە كەوتبوو و نەیدەتوانی لەجێگای خۆی هەستێتەوە و بڕوا لەڕێ و "عیسا" شیفای داوە و، ئەو كابرایە دۆشەكەكەی خۆی دەق گرت و توانی بڕوات لەڕێ، كەواتە چۆن دەكرێ پیاوێك كە دووبارە لەش ساغی بۆ گەڕاوەتەوە و دەتوانێ سوود لەهەر چوار ستوونە ئەندامەكانی خۆی وەربگرێ، بەدبەخت بێ؟

سواڵكەرە نابیناكە گوتی: لە شاردا هیچ كەسێ ناتوانێ گەدایی بكات، مەگەر كەم ئەندام بێت. ئەو سواڵكەرە بێ چارە لەبەرئەوەی لە هەموو سەردەمی گەنجێتیدا لەسەرجێ كەوتبوو، دەرۆزەی دەكرد و تەمەنێكی بە ئاسانی و بەخۆشی دەگوزەراند و هەموو كەسێ ئەویان بە سواڵكەری فەرمی دەناسی و هاوكاری ئەویان بەپێویست دەزانی. بەڵام ئێستە كە چاك بۆتەوە و دەتوانێ بڕوات لەڕێ و، لەبەرئەوەش كە كەمیی جەستەیی نییە، ناتوانێ سواڵ بكات و ئەگەر سواڵیش بكات، ئەوا بەتوندی سزای

دەدرێ چونکە لە یاسای ئێمەدا، دەرۆزە کردن لەلایەن کەسێك کە لەشی ساغ بێت و هیچ کەمییەك لە جەستەیدا نەبێ، حەرامە. بەڵام ئەم پیاوە، ماوەی سی و هەشت ساڵە دەرۆزەی کردووە و بە ئاسانی ژیاوە و هەموو سەردەمی گەنجێتی بە بێکاری و خۆشگوزەرانی بەسەر بردووە و ئێستا کە پیر بووە، ناتوانێ کار بکات و، کار کردن بۆ ئەو دەبێتە هۆی ئەشکەنجەدانی. هەربۆیە عیسا بە چاك کردنەوەی ئەو پیاوە لەسەرجێ کەوتووە، کەسێکی بەختەوەری گۆڕی بە پیاوێکی بەدبەخت، چونکە پیشەی دەرۆزەکردنی لێ سەندەوە.

پاشان پیاوە سواڵکەرەکە بەردەوامی پێدا: جگە لەمەش، ئەو ڕۆژەی کە عیسا ئەو پیاوەی چاك کردەوە و پێی گوت کە دۆشەکەکەی خۆی دەق بگرێت و بیخاتە بن هەنگڵیەوە و بڕوات، ڕۆژی شەممە بوو و لە ڕۆژی شەممەدا لەلای ئێمەی یەهوودییەکان هەموو کارێك قەدەغەیە جگە لە دەرۆزە کرن نەبێ، چونکە دەرۆزە کردن بە کارکردن لەقەڵەم نادرێت و هەڵبەتە تەنیا ئەو کەسانەی کە کەم ئەندامن، دەتوانن سواڵ بکەن. کاتێ ئەو پیاوە کە دۆشەکێکی لەبن هەنگڵدا بوو و چووە ناو شار و بەناو شار و شەقامەکانیدا بەڕێگادا دەڕۆیشت و بەرەو پەرستگا ڕۆیشت، وایاندەزانی ئەو پیاوە بەشوێن کاردا دەگەڕێ. هیچ کەسێ وای نەدەزانی ئەو پیاوەی کە بەپەلە لە شەقامەکاندا دەڕوات بە ڕێگادا و دۆشەکێکی لەبن باڵیدایە، لەجێگا کەوتووەکەی "دەروازەی مەڕەکان" بێت. هەموو کەسێ سەبارەت بەو پیاوە بەگومان بوون و ڕۆحانییەکانی پەرستگا بەتوندی دایانە بەر لێپرسینەوە و گوتیان ((مەگەر تۆ کافر بوویت کەوا لە ڕۆژی شەممەدا بە دوای کاردا دەچی؟))

سواڵکەرە چاك بووەکە سوێندی خوارد کە ئەو کافر نەبووە، بەڵکو یەهوودییەکی باوەڕدارە و نەیویست دۆشەکەکەی خۆی بخاتە بن باڵیەوە و بەناو شاردا بڕوات لەڕێ، بەڵکو عیسا پێی گوتووە کە دۆشەکەکەی خۆی هەڵبگرێت و بڕوات و ئەویش کەوتۆتەڕێ بۆئەوەی ڕووداوی چاك بوونەوەی خۆی بە ڕۆحانییەکانی (سۆفی گەری) پەرستگا بگەیەنێت. ئیتر ئەو ڕۆژە ڕۆحانییەکان زانییان کە عیسا دەست وەردەداتە کاری خوداوەندیش نەك تەنیا پیاوێك کە خوداوەند لە جێگادا خستوویەتی، هەڵدەستێنێتەوە، بەڵکو لە ڕۆژی شەممەدا کە هیچ کەسێ نابێ دەست لە هیچ کارێکەوە بدات، بەو دەڵێ کە دۆشەکی خۆی بخاتە بن باڵیەوە و بەناو شاردا

بڕوات لەڕێ. پیاوێکی لەو جۆرە دەبوو لەسێدارە بدرێ و باشتر کە ئەویان لە خاچ دا و مەترسی ئەویان لە گەلی یەهوودی دوور خستەوە.

من لەبەرئەوەی بێ دەنگیم کرد، سواڵکەرە نابیناکە زانی کە لەگەڵ بیرو باوەڕەکەیدا نیم، پاشان گوتی: ئەگەر عیسا زیندوو بمایە، ئەوا پەرستگاکەی ئێمەی وێران دەکرد و لەناوی دەبرد و دوای وێران بوونی پەرستگاکەش، ئێمەی سواڵکەر لە بەردەم سێدارەدا دەمردین، چونکە ژیانی ئێمە بەندە بە زیارەتکارە یەهوودییەکانەوە کە لە دەوروبەرەوە دێن بۆ ئەم شارە تاوەکو زیارەتی پەرستگاکە بکەن و، هەندێ جاریش بیانییەکانی وەکو تۆ، بۆ بینین یان بۆ ڕابواردن پێ دەنێنە ئەو شارەوە و شتێکمان پێ دەدەن، بەڵام بژێوی ژیانی ئێمە بەپلەی یەکەم لەلایەن خێزانی ئەو زیارتکارە یەهوودیانەوە فەراهەم دەبێت کە دێن بۆ زیارەتی پەرستگا.

پاشان سواڵکەرە نابیناکە بەتوڕەییەوە گۆپاڵەکەی خۆی دا بەزەویدا و گوتی: ئەگەر من چاوم هەبووایە، لەو ڕۆژەی کە عیسایان لە خاچ دا، خۆم دەگەیاندە ڕیزی یەکەمی ئامادەبووان و هاوارم دەکرد ((تا دەتوانن ئەم پیاوە ئازار بدەن)).

گوتم: ئەی کابرا، ئەم قسەیە مەکە، ئەگەر تۆ باوەڕت بە عیسا هەبوایە ئەوا بەو شێوەیەی کە نەخۆشەکانی تری چاک کردۆتەوە، چاوی تۆشی چاک دەکردەوە.

سواڵکەرە نابیانەکە ڕاوەستا و گوتی: ئەی کابرای بیانی، تۆ لە لاینگرانی عیسایت.

گوتم: من لاینگری ئەو نیم، بەڵام بە پیاوێکی گەورەی دەزانم.

سواڵکەرە نابیناکە گوتی: سەیری چاوەکانی من بکە و بزانە چۆن کاسەی هەردوو چاوم وشك بوونەتەوە. تۆ دەڵێی کە ئەگەر من باوەڕم بە عیسا هەبووایە، ئەوا چاوی منی چاك دەکردەوە، بەڵام من دەڵێم تەنانەت خوای گەلی "ئیسرائیل"یش ناتوانێ چاوێك چاك بکاتەوە کە بەم شێوەیە وشك بووبن، مەگەر دوو چاوی نوێ دروست بکات. جگە لەوە، من حەز ناکەم چاوەکانم چاك ببنەوە، چونکە ئەگەر بیناییم بۆ بگەڕێتەوە، ئیتر ناتوانم دەرۆزە بکەم و لەم پیشە ئاسانە بێبەش دەبم.

لەو کاتەدا کە گەیشتمە لای دەروازەکەوە، بە سواڵکەرە نابیناکەم گوت: لەبەرئەوەی گەیشتووینەتە دەروازەی شار، بەجێت دەهێڵم و دەڕۆم.

سواڵکەرە نابیانەکە گوتی: کەمێك ئارام بگرە، من دەمەوێ قسەیەکت پی بڵێم.

لێم پرسی: دەتەوێ چی بڵێیت؟

پیاوە سواڵکەرەکە یەکسەر دەستی خۆی خستە گەردنم و لەپی هەمان ئەو دەستەی خستە سەر دەمم، بەجۆرێك کە نەمدەتوانی هاوار بکەم و داوای یارمەتی بکەم. ئەو پیاوە نابینایە بەجۆرێك گەردنمی دەگوشی کە هەستم دەکرد دەخنکێم. لە هەمان کاتدا دەستەکەی تری نزیك کردەوە لە باخەڵم و دیار بوو دەیەوێ پارەم لێ بدزێ. من هەوڵم دەدا خۆم ڕزگار بکەم بەڵام نەمدەتوانی خۆم لە چنگی دەربکەم. چەند ساتێك پەلەقاژەم کرد و پاشان سواڵکەرە بەتەمەنەکە بەری دام و گوتی: من دەمویست بەم شێوەیە ئامۆژگاریت بکەم و پێت بڵێم کە لەمەودوا، لەم شارەدا ڕێنوێنی سواڵکەرێکی نابینا نەکەیت کە داوای یارمەتیت لێ دەکات، چونکە لەوانەیە جگە لە لەدەستدانی پارە و جلوبەرگ، هەردوو چاوی خۆشت لەدەست بدەی، چونکە ئەگەر سواڵکەرێکی نابینا بیەوێ پارەو جلکت ببات، هەردوو پەنجەی خۆی دەکات بە هەردوو چاوتدا و هەردوو چاوت کوێر دەکات بۆئەوەی نەتوانی بیبینی و بیناسیتەوە و شکایەتی لێ بکەیت. ئەگەر من مەبەستی خراپم پێت هەبوایە، لەم کاتەدا پارە و جلەکانتم دەدزی و هەمیش هەر دوو چاوکانتم کوێر دەکرد.

پیاوە نابیناکە درێژەی پێ دا: سواڵکەرە نابیناکان لەم شارەدا، کاتێ هێرش دەبەن بۆ ڕێبوارێك بۆئەوەی پارە و جلکەکەی بدزن، ئەوا لاسایی دەنگی باڵندەی قومری دەکەنەوە و هەرکە دەنگی قومری بەرز بوویەوە، هەموو ئەو سواڵکەرە کوێرانەی کە لەو نزیکانەدان، خۆیان دەگەیننە هاوکارەکەی خۆیان تاوەکو ڕێبوارەکە ببەزێنن و بەشی خۆیان لە پارە و پۆشاکەکەی وەربگرن.

گوتم: ئەی کابرا، ئەم کارەی کە سواڵکەرە نابیناکان لەم شارەدا دەیکەن، دەبێتە هۆی ئەوەی بەزەیی لەناو بچێت و ئیتر کەس خێر نەدات بە سواڵکەرێکی نابینا.

پیاوە نابیناکە گوتی: لەم شارەدا ئەگەر بەم جۆرە لە جێگایەکی چۆڵدا پیاوێکی نابینا داوای لێ کردیت گۆچانەکەی یان دەستی بگریت و ڕێنمایی بکەیت، داواکەی پەسند مەکە، چونکە هەرچیەکت پێ بێت، لەدەستی دەدەیت و لەوانەشە هەر دوو چاوت کوێر بکات و ئەگەر ڕۆمی بیت، ئەوا دەتکوژێ.

گوتم: تۆ لە کوێوە زانیت کە من "ڕۆمی"م؟

سواڵکەرە نابیناکە گوتی: تۆ "ڕۆمی" نیت، چونکە ڕۆمییەکان بەزەییان نییە و ئەگەر تۆ ڕۆمی بوویتایە، لە جیاتی دەستم بگریت و ڕێنمایم بکەیت، شەپازلەیەکت دەدا بە ڕوومەتمدا و، تەنیا کارێك کە لە ڕۆمییەکان دەوەشێتەوە، دروست کردنی ڕێگا و دروست نەکردنی جۆگەی ئاو و چەسپاندنی پێوەرەکانی ڕۆمە لەسەرانسەری جیهاندا.

لەو کاتەدا ئێمە گەیشتینە دەروازە و من لە سواڵکەرە نابیناکەم پرسی: ئایا تۆ ئەو پیاوەت بینیوە کە سی و هەشت ساڵ ئیفلیج بووە و پاشان بەهۆی عیساوە چاك بوویەوە، یان نا؟

پیاوە نابیناکە گوتی: من ئەوم نەبینیوە، بەڵام لەو کەسانەی کە ئەویان بینیوە، بیستوومە کە بەهۆی چاك بوونەوەوە بەدبەخت بووە. بەڕاست، ئەگەر عیسا بەو جۆرەی کە تۆ دەڵێیت دەتوانێ نەخۆشەکان دەوا بکات و نابیناکان چاك بکاتەوە، بۆچی بینایی ناگەڕێنێتەوە بۆ هەموو ئەو پیاو و ئافرەتە نابینایانەی کە لەم شارەدان؟ بۆچی لەنێو ئەو نەخۆشانەی کە ناتوانرێ دەوا بکرێن تەنیا بینایی بۆ یەك کەسیان دەگەڕێنێتەوە و ئەوانی تر بە حاڵی خۆیان دەهێڵێتەوە کە هەروا بە کوێری ژیان بەرنەسەر؟ چونکە کەسێك کە بە قسەی خۆی بۆ ڕزگاری خەڵك هاتووە، دەبێ هەموو کەسێ ڕزگار بکات، نەك یەك نابینا چاك بکاتەوە و سەدان نابینای تریش بە حاڵی خۆیان بهێڵێتەوە. دەی بڵێ کە من مافی خۆمە بەخراپ باسی بکەم.

گوتم: بیستووتە کە عیسا دوای تێپەڕینی سێ ڕۆژ لە مردنی، زیندوو بۆتەوە و لە گۆڕ هاتۆتە دەرەوە و ڕۆیشتووە؟

پیاوە نابیناکە گوتی: مەگەر تۆ منداڵی کەوا باوەڕت بەم ئەفسانە هەیە؟! چۆن دەکرێ کەسێ کە مردبێت، زیندوو ببێتەوە و لەگۆڕ بێتە دەرەوە؟!

گوتم: کەسێ کە توانای هەبێ هەموو کارێ بکات، ئەوا دەتوانێ لە دوای تێپەڕینی سێ ڕۆژ لە مردنی، زیندوو ببێتەوە و لەناو گۆڕ بێتە دەرەوە.

سواڵکەرە نابیناکە گوتی: ئەگەر بیتوانیایە هەموو کارێ بکات، نەیدەهێشت بە خاچدا هەڵی بواسن یان دوای ئەوەی بە خاچدا هەڵواسرا، خۆی ئازاد دەکرد. ئەی کابرای بیانی، ئەوە بزانە کە لەم دنیایەدا تەنیا دوو هێز هەیە و جگە لەو دووانە هێزی تر بوونی نییە. یەکەمیان هێزی سەروەت و سامانە و دووەمیشیان هێزی بازووە،

پیاوی بە توانانش ئەوەیە کە پارەی هەبێت یان بازوویەکی بەهێز. هێزی پارەش زیاترە لە هێزی بازوو.

گۆی هەتاو گەیشتبووە جێگەیەك کە وای نیشان دەدا تا چەند ساتێکی دیکە لە ئاسۆدا ون ببێ. سواڵکەرە نابیناکە دارەکەی خۆی دا بەزەویدا و گوتی: ئەی کابرای بیانی، مادام تۆ باوەڕت بە عیسا هەیە و بە پیاوێکی گەورەی دەزانی، ئەوا من دەچەمێمەوە و ئەم بەردە لە بەردەم پێی خۆتدا هەڵدەگرم و تۆش داوا لە عیسای خۆت بکە تا ئەم بەردەم بۆ بکات بە پەنیر.

دوای ئەم گوتەیە، پیاوە نابیناکە چەمایەوە و بەردێکی بچووکی هەڵگرت کە لەبەر پێیدا بوو، پاشان خستیە سەر لەپی دەستی.

بینیم کە گەورەیی ئەو بەردە بەقەدەر سێوێك دەبوو و منیش گوتم: ئەی عیسا، هەرچەندە من بڕوام نییە کە تۆ ئەم بەردە بکەیت بە پەنیر، داوات لێ دەکەم ئەو بەردە لە دەستی ئەم پیاوەدا بگۆڕە بە پەنیر . دوای چەند ساتێك، سواڵکەرە نابیناکە بۆنی بەردەکەی کرد و بەسەرسامیەوە گوتی: بۆنی پەنیر لەم بەردە دێت.

پاشان بەردەکەی لە دەمی نزیك کردەوە و قەپی لە پارچەیەکیان گرت و خواردی و گوتی بێگومان پەنیرە.

من ئەو بەردەی کە بوو بە پەنیر لە پیاوە نابیناکەم وەرگرت و خستمە دەممەوە و ددانم پێدا نا و بە سەرسامیەوە بۆم دەرکەوت کە بەڕاستی پەنیرە و هەرچەندە تەپوتۆزاوی بوو، بەڵام تامەکەی وای نیشان دەدا کە لەو پەنیرە مەڕانە دەچێ کە لە شاردا، لە دوکانەکاندا دەیفرۆشن.

هاوارم کرد: ئەی کابرا، هێشتاش لەبارەی عیساوە بەگومانیت و ئامادە نیت بە پیاوێکی گەورەی بزانی؟

سواڵکەرە نابیناکە گوتی: هەر بەو شێوەیەی کە گومانم برد تۆ پیاوێکی سادەیت و ئەگەر سادە نەبوویتایە، باوەڕت بەوە نەدەکرد کە گوایە عیسا لەناو گۆڕدا هەستاوەتەوە و لەوێ هاتۆتە دەرەوە. ئەو پەنیرەی کە تۆ لە منت وەرگرت هەمان ئەو پەنیرە بوو کە تۆ لەگەڵ برێك ناندا پێت دام و بەبێ ئەوەی تۆ بزانی خستمە سەر زەوی و پێم گوتی کە دەمەوێ بەردێك لەسەر زەوی هەڵبگرم. ئینجا تۆش لەڕووی سادەییەوە

باوەڕت کرد کە ئەو بەردە گۆڕاوە بە پەنیر. لە کاتێکدا مەحاڵە بەردێك ببێ بە پەنیر یان نان، بە هەمان شێوەش مەحاڵە مردوویەك زیندوو ببێتەوە.

پرسیم: ناچیتە ژێر باری ئەوەی کە عیسا نەخۆشەکانی چاك کردۆتەوە؟

سواڵکەرە نابیناکە گوتی: من چاوم نییە تا بیبینم و بزانم ئایا عیسا نەخۆشەکانی چارەسەر کردووە یان نا، بەڵام هۆشی من دەڵێ کە نە مردوو زیندوو دەبێتەوە و نە نابینایەکیش کە وەکو من هەردوو چاوی وشك بوونەتەوە، بینایییان بۆ دەگەڕێتەوە.

لەو کاتەدا ئێمە گەیشتینە دەروازە و گوزەرمان کرد لێی. پاسەوانەکانی دەروازە کە سواڵکەرە نابیناکەیان دەناسی، چەند ساتێك قسەیان لەگەڵ کرد و، پیاوە نابیناکە دوای ماڵئاوایی کردن لێیان، بەپەلە لەگەڵ من کەوتەڕێ، چونکە ڕێگەکەی خۆی دەناسی و ئیتر پێویستی بە ڕێ نیشاندان نەبوو. لەولای دەروازەکەوە کۆمەڵێك سواڵکەر دانیشتبوون کە دیاربوو هەندێکیان نابینان و ئەوانی تر دەست یان پێیان لەدەست دابوو.

کاتێ سواڵکەرە نابیناکە چەند هەنگاوێك لە من دوور کەوتەوە، گۆپاڵەکەی خۆی بە ئاڕاستەی سواڵکەرە چاو ساغ و بێ چاوەکان ڕاگرت و گوتی: سواڵکەرەکان، ئەو پیاوەی کە لە پێشەوەی من دێت و جلوبەرگی گرانبەهای لەبەردایە، یەکێکە لە شوێنکەوتوانی عیسا و دەڵێ کە عیسا دوای تێپەڕینی سێ ڕۆژ لە مردنی، زیندوو بۆتەوە و لەناو گۆڕەکەی هاتۆتە دەرەوە و دەتوانێ شیفای نەخۆشەکان بدات و بینایی بگەڕێنێتەوە بۆ نابیناکان، بۆیە دەبێ ئەم پیاوە بەردباران بکرێت.

سەیرم کرد دوو کەس لەو نابینایانەی کە دانیشتبوون، دەستی خۆیان درێژ کرد تاکو بەرد لە زەوی هەڵبگرن، بەڵام ئەو سواڵکەرانەی کە چاویان هەبوو بەرامبەر بە سواڵکەرە نابیناکە نارەزاییان دەربڕی و گوتیان: تۆ هەڵە دەکەیت و ئەم پیاوەی کە تۆ دەیڵێیت، لە شوێنکەوتوانی عیسا نییە، چونکە شوێنکەوتوانی عیسا هەموویان خەڵکی "جەلیلە"ن و ڕوخسارێکی تاریکیان هەیە و ئەم پیاوە دەم و چاوی سپییە و هەموو شتێکی نیشانی دەدات کە بیانییە.

سواڵکەرە نابیناکان کاتێك گوێیان لە قسەکانی سواڵکەرە چاو ساغەکانەوە بوو، ئەو بەردانەی کە هەڵیان گرتبوو، دایان نایەوە. ئینجا هەموو سواڵکەرەکان لەجێی

خۆیان هەستانەوە و دەورووبەریان گرتم و داوای خێراتیان لێ کردم و منیش بڕێك پارەم لە نێوانیاندا دابەش کرد. ئەو سواڵکەرە نابینایەش کە بە هاوکارەکانی خۆی دەگوت تا بەردبارانم بکەن، لێم نزیك بوویەوە و داوێنی گرتم و داوای خێری لێ کردم. من کەواکەم لەبەر خۆم داکەند و دام بەو پیاوە و گوتم: لەبەرئەوەی تۆ ئەم کەوایەت پەسەند کرد و گوتت کە پارچەیەکی باشە، بۆیە دەیدەم بە تۆ تا لەبەری بکەیت. سواڵکەرەکانی دیکە دەنگی ناڕەزاییان بەرز کردەوە و گوتیان ئەم کارە مەکە و کەوا گرانبەهاکەی خۆت مەدە بەم پیاوە، چونکە ئەو، ئەم کەوایە لەبەر ناکات و دەیفرۆشێت.

گوتم: داوی ئەوەی من کەواکەی خۆمم دا بەو، ئیتر خۆی خاوەنی ئەو پۆشاکەیە و دەتوانێ یان لەبەری بکات یانیش بیفرۆشێت.

ئینجا بەڕێ کەوتم. لە شارەکە دوای ئەوەی کە خۆر ئاوا بوو، ژیانی شارنشین وچان دەگرێ، بەڵام هەندی لە دوکانەکان هێشتا کراوەبوون و لە ماڵەکانەوە بۆنی ئاوگۆشت و ماسی دەهات بە لوتدا. من گەڕامەوە بۆماڵی خۆم، واتە ئەو ماڵەی کە لە دوکاندارە سریانەکە بەکرێم گرتبوو.

پیاوە دوکاندارەکە و ژنەکەی، لە دوکانی خۆیاندا دانیشتبوون و کاتێ منیان بەبێ کەوا بینی، سەرسام بوون و لەجێی خۆیان هەستانەوە و لێم نزیك بوونەوە و ئافرەتەکە پرسی: ئایا دزەکان هێرشیان بۆ هێناوی؟

گوتم: نەخێر.

پیاوەکە گوتی: ئەی کەواکەی خۆت لە قوماردا دۆڕاندووە؟

گوتم: نەخێر، من ئەوەم بەکەسێك بەخشی.

پیاوە "سریانی"ەکە بە سرتە بە ژنەکەی گوت: پێموایە مەست بێت و کەواکەیان فڕاندبێت.

من بڕێك پارەم دا بە پیاوە دوکاندارەکە بۆئەوەی تا هەموو دوکانەکانی شار دانەخراون، بچێت و کەوایەکم بۆ بکڕێت. ئەو ڕۆیشت و کەوایەکی بۆ کڕیم و گەڕایەوە و کاتێ کە دەیویست پێم نیشان بدات، داوێنی کەواکەی پێچا بەدەستی خۆیەوە و بەری دایەوە تا پێم بڵێ کە ئەو کەوایە لە پارچەی خوریە و گوتی: باشترین کەوایەك کە توانیم بەدەستی بهێنم، ئەم کەوایە کە بۆم کڕیویت و بڕێك مامەڵەم کرد تاوەکو پۆشاکەکەت بە بەهای هەرزان بۆ بکڕم.

خاوەن ماڵەکە گوتی: ئەگەر تۆ خۆت بچووبیتایە بۆ کڕینی ئەم کەوایە، دوو یان سێ بەرامبەری ئەو بەهایەیان لێ وەردەگرتیت کە من پێم داوە، چونکە تۆ ڕۆمیت و ئاگات لە بەهای کاڵاکان نییە لەم شارەدا و وەکو ڕۆمییەکانی تر ناتوانی مامەڵە بکەیت، لەکاتێکدا من لێزانم و لە مامەڵە کردندا شارەزام. ئەم کەوایە بە ئەندازەی باڵای تۆ دەبێت و ئەگەر حەز بکەیت، دەتوانی زونارەکەی لێ بکەیتەوە. بەڵام بە بۆچوونی من، واباشترە زوناری کەواکەت بهێڵیتەوە، لەبەرئەوەی پیشت داناوە، زوناری پۆشاکەکەت نابێتە هۆی سەرسامی و، خەڵکیش وا نازانن کە تۆ جوولەکە نیت و، لەبەرئەوەی کە من ئەم کەوایەم بە هەرزان کڕیوە، ئەوا بۆ شوکرانەی ئەم سەرکەوتنە بەیانی دەچم بۆ پەرستگا و (پشین)ێك دەخەمە ناو سندوقی هاوکاری پەرستگاوە.

پاشان خاوەن ماڵەکە کەمێك پارەی لە گیرفانی خۆی دەرهێنا و دای بەمن و گوتی ئەمە باقی پارەکەی تۆیە.

من ویستم بڕێك لەو پارەیەی پێ بدەم، بەڵام پیاوە سریانییەکە قبوڵی نەکرد و گوتی: فرۆشیاری ئەم کەوایە بەبۆنەی ئەوەی کە من ئەو کاڵایەم لێ کڕیوە، شتێکم پێ دەدات و من نامەوێ حەقی زەحمەت لە تۆ وەر بگرم.

پاشان خاوەن ماڵەکە گوتی: ئێستا بڕۆ بۆ ژوورەکەی خۆت و پشوو بدە و ئەمشەو لە ماڵ مەچۆرە دەرەوە و ئەو ئاوگۆشتەی کە ژنەکەم دروستی کردووە، بیخۆرەوە و بنوو. من بە ژنەکەم دەڵێم کە بڕێك پیازی زیاتر بکاتە ناو ئاوگۆشتەکەوە تاکو خواردنی پیازی کوڵاو، مەستییەکەت لەناو ببات و بەیانی زوو کە لەخەو هەستای، هەست بە سەرئێشە نەکەیت.

من بە سەرسامیەوە سەیری ئەو پیاوەم کرد و ئەو، ڕوانینی منی بەجۆرێکی تر لێك دایەوە و گوتی: زۆر باشە، لەبەرئەوەی شەراوت خواردۆتەوە و ئەو پیاوەی شەراوخۆر بێت دیسان حەزی لێیە شەراب بخواتەوە، بۆیە شاگردەکەم دەنێرم تاوەکو جامێك شەرابت بۆ بکڕێت، بەڵام ئەوە بزانە کە ناهێڵم لە جامێك زیاتر بخۆیتەوە و پاش خواردنەوەی شەراب و خواردنی ئاوگۆشتی پڕ لە پیاز، بنوو و ئەمشەو لە ژوورەکەی خۆت مەچۆرە دەرەوە و لە پلیکانەکانەوە مەیەرە خوارەوە، چونکە بەهۆی مەستییەوە دەکەویتە خوارەوە و ملت دەشکێ.

گوتم: ئەی پیاوی چاکەکار، تۆ هەڵە دەکەیت و من شەرابم نەخواردۆتەوە.

ئەو پیاوەگوتی: ڕوخسارت وا نیشان دەدات کە شەرابت خواردبێتەوە، چونکە ڕەنگی دەم و چاوت سوور هەڵگەڕاوە، ئەوکاتە بەبیرم هاتەوە کە ئەو ڕۆژەی چووم بۆ گوندی "بیتانی" و لەوێ گەڕامەوە، لەبەر هەتاودا ڕۆیشتبووم بەڕێگادا و تینی خۆر ڕەنگی ڕوخسارمی سور کردۆتەوە.

خاوەن ماڵەکەم گوتی: هەروەها بەم حاڵە مەستیەوە و بەم چاوە گەشانەوە ناتوانی بخەوی.

گوتم: ئەی کابرای چاکەکار، من شەرابم نەخواردۆتەوە و مەستیش نیم. سووریی ڕوخسارم بەهۆی ئەوەیە کە لەبەر هەتاودا ڕۆشتووم بەڕێگادا. بەڵام دڵنیات دەکەمەوە کە دوای ئەوەی چوومە ژوورەکەی خۆم و نانم خوارد، دەنووم، چونکە ماندووم.

کاتژمێرێ دوای ئەوەی کە لە پلیکانەکان ڕۆشتمە سەرەوە، کچی خاوەن ماڵەکە بە دەفرێکی ئاوگۆشتەوە هاتە ژوورەکەمەوە و هەر لەوێدا وەستا تا من نانەکەم خوارد و پاشان گۆزەیەکی منی پڕ کرد لە ئاو و ڕۆیشت. منیش پاش خواردنەوەی چەند قومێك ئاو، نووستم، بەڵام پاش نیوەشەو لەخەو هەستام و کەواکەی خۆم دا بە شانمدا و لە ژوورەکەم چوومە دەرەوە. هەوا فێنك بوو، ئەستێرەکان لە دوورەوە چاویان لە زەوی دادەگرت.

من پاش ئەوەی کە ماوەیەك سەیری ئەستێرەکانم کرد، گوتم: ئەی ئەو عیسایەی کە لەم شارەدا بەو شێوە دڵتەزێنە کوژرایت و پاشان دووبارە ژیانی تازەت بۆ گەڕایەوە، یارمەتیم بدە تاوەکو بتوانم بتناسم. هاوکاریم بکە تا لەگەڵت ئاشنا بم و لە زانستەکانی تۆ بزانم. تا ئەمڕۆ، هەر چیەك فێربووم زانستی دنیایی بووە، زانستی دنیاییش مرۆڤ فێری ڕاستی ناکات. ئەو ڕاستیەی کە زانستی دنیایی فێری مرۆڤی دەکات تەنیا ئەوەیە کە هیچ شتێکی ڕاستەقینە بوونی نییە، بەڵام تۆ دەتوانی ڕاستیم فێر بکەیت تاوەکو بزانم تۆ کێیت و ئەم جیهانە چیە و کێ دروستی کردوە و لە کۆتاییدا جۆری بەشەر و کۆتایی هاتنی جیهان، چی لێ دێت.

پاش ئەم پاڕانەوەیە گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم و نووستم و هەتا دوای ئەوەی کەڕەناکانی پەرستگای یەهوودییەکان لەکاتی هەڵهاتنی خۆردا دەنگیان لێ بەرز نەبوویەوە، بەئاگا نەهاتمەوە.

## گفتوگۆکردنم لەگەڵ دوو پیاودا کە نهێنیان لەلا بوو

ئەی "تولیا"، ئەمە شەشەمین نامەیە کە بۆتی دەنووسم و بەم شێوەیە لە بارودۆخی خۆم ئاگادارت دەکەمەوە.

من نازانم نامەکانم تا چ ئەندازەیەك سەرنجی تۆ ڕادەکێشێ. من ئەوە دەزانم کە ژیانی تۆ لە ناوەندی ڕۆمدا لەگەڵ ژیانی من لێرە جیاوازی هەیە. تۆ لەوێ کاتەکانت لە بەشداری کردن لە جەژنەکاندا بەسەر دەبەیت و میوانداری خانەدانەکان بە تیشکی جوانی خۆت ڕووناك دەکەیتەوە و پرشنگیان پێ دەبەخشی. بەڵام کاتەکانی من لێرەدا لە گەڕان بە دوای ڕاستیدا تێدەپەڕێ. تۆ لەوێ حەزت لە گەشت و گوزارە و منیش لێرە عاشقی بەدەست هێنانی زانیاریم و زەوقی تۆ لەگەڵ زەوقی من چونییەك نییە.

بەڵام من ئەم نامانەت بۆئەوە بۆ نانووسم کە تەنیا ژیانی ئەم شوێنەی خۆم بکەمە جێی سەرنجی تۆ، بەڵکو بۆئەوە بۆت دەنووسم کە خۆم ئاسوودە بکەم.

کاتێ من لە زانکۆی "رودس" دەمخوێند، مامۆستایەکم هەبوو ئامۆژگاری دەکردم کە ((ئەگەر لەڕووی ڕۆحیەوە ناڕەحەت بوویت، ئەوا ئەوەی کە دەیبینیت و دەیبیستیت و هەستی پێ دەکەیت، بینووسە بۆئەوەی تەسکینی دڵت بدەیت))[27] یەکێکی تر لەو ئامۆژگاریانەی کە ئەو مامۆستایەم پێی گوتم ئەوە بوو کە ((کاتێ دەتەوێت مێژوو بنووسیت، بیستراوەکان بخەرە لاوە و بینراوەکان بخەرە بواری نووسینەوە)).

ئەمەش لەبەرئەوەیە چونکە بیستراوەکان جێی باوەڕ نین و تەنانەت کەسی ڕاستگۆ و دەست پاك لەکاتی گێڕانەوەی چیرۆکێکدا لەوانەیە بە ئەنقەست شتێکی لێ زیاد بکەن یان لێی کەم بکەنەوە، بەڵام بینراوەکانی مرۆڤ جێی باوەڕە و دەزانێ کە ئەوەی بینیوویەتی، ڕاستە.

تۆ ئەگەر ئەمڕۆ ببینیت، نامناسیتەوە. ئەو ڕۆژەی کە لە ڕۆما هاتمە دەرەوە، ڕیشم تاشیبوو، بەڵام ئەمڕۆ وەکو جوولەکەکان ڕیشم هێشتۆتەوە. پێش دەرچوونم لە ڕۆما و تا ئەو کاتەی کە نەهاتبووم بۆ ئێرە، یازدە ڕۆژ مووی هەموو جەستەم بەهۆی

---

[27] (رودس) یەکێکە لەو دوازدە دوورگەیەی کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی دەریای (مەدیتەرانە)وە کە لە کۆندا خاوەنی زانکۆیەکی بەناوبانگ بوو. زانکۆی (رودس) وەکو پەرتووکخانەی (ئەسکەندەرییە) بەناوبانگ بوو.

دەرمانی لابردنی مووەوە لادەبرد بۆئەوەی جەستەم مووی پێوە نەبێ، بەڵام پاش ئەوەی هاتم بۆ ئێرە، ئەو خووەم واز لێ هێنا و ئێستە لەشم بە موو داپۆشراوە، هەربۆیە کاتێك لە ڕاڕەوەکاندا دەڕۆم بەڕێگادا، کەس سەرنجم نادات، چونکە شتێکم تێدا بەدی ناکرێ کە شایەنی سەرنجدان بێت.



پێش ئاوا بوونی خۆر، لە ماڵ چوومە دەرەوە و ڕێگەی "دەروازەی کانی"م گرتەبەر. ڕاڕەوی شارەکە، پاش هەڵهاتنی خۆر پڕە لە خەڵك و لە هەموو لایەکەوە دەنگی فرۆشیارەکان دەبیسترێت کە بەلاواندەنەوە کاڵاکانیان دەخەنە ڕوو و، ئەو وشتر و گوێدرێژانەی کە هەموویان زەنگوڵەیان پێوەیە، دێن و دەڕۆن و لە دوکانەوە بۆنی دارچین و زەنجەبیل و مێخەك دێت بە لوتدا.

کاتێ گەیشتمە دەروازەی کانی، سەیرم کرد چەند سواڵکەرێك لە تەنیشت دەروازەکەدا دانیشتوون و داوای خەرجی لە ڕێبواران دەکەن. پێش ئەوەی بگەمە دەروازەکە، چەند ژنێك کە گۆزەی ئاویان بە شانەوە بوو، لەو دیوی دەروازەکەوە هاتنە ناو شارەوە. وا دیاربوو کە چووبوون ئاو بهێنن و لەو کاتەدا دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان. گەیشتنی من بە دەروازەی کانی، هاوکات بوو لەگەڵ ئاوابوونی خۆر و ئەستێرەیەك لە ئاسماندا دەرکەوت و یەکێ لە پاسەوانەکانی دەروازەکە، ئاگرێکی بە دەستەوە بوو و نزیکی کردەوە لە چراکانی دەروازەکە بۆئەوەی دایانبگیرسێنێت.

لەو کاتەدا پیاوێك کە گۆزەیەك ئاوی بە شانەوە بوو، لە دەرەوەی دەروازەکەوە هاتە ناو شار. ئەو پیاوە لە نیگای یەکەمیدا، سەرنجی منی ڕاکێشا، چونکە لێرەدا ئەرکی ئاو هێنان لەسەر ژنانە و پیاو ئاو ناهێنێت. ئەو پیاوەی کە گۆزەکەی پێ بوو، بە هێواشی هەنگاوی دەنا و من کەمێك ئارامم گرت تا ئەو پیاوە لەتەنیشتمەوە تێپەڕی کرد، ئینجا لە دوایەوە بەڕێ کەوتم. لەم شارەدا هەندێ کۆڵان هەیە کە پلیکانەی هەیە و ئەو پیاوە یەکێ لەو کۆڵانانەی گرتەبەر و لە پلیکانەکان چووە سەرەوە. منیش کەوتمە دوای و ئەوەندە نزیك بوومەوە لێی کە دەنگی هەناسەدانی هەڵگری گۆزەکەم دەبیست. وەکو ئەوە وابوو کە گۆزەکە قورس بێت، چونکە ئەو پیاوە هەناسەبڕکێی پێ کەوتبوو. پاشان زانیم ئەو پیاوە ڕێگەی خۆی درێژ دەکاتەوە، چونکە دوای تێپەڕینی دوو سێ

کۆڵان گەیشتین بە شەقامێك کە لەوێوە چووینە ناو ئەو کۆڵانەی کە باسم کرد، ئەمە لەکاتێکدا کە دەیتوانی ڕاستەوخۆ لەو شەقامەوە بڕوات و ڕێگەی خۆی دوور نەخاتەوە. ئینجا گەیشتینە مەیدانێك. بینیم ئەو پیاوە لەلای مەیدانەکە ڕاوەستا و گۆزەکەی لەشانی هێنایە خوارەوە و خستیە سەر زەوی و وەکو ئەوە وابوو کە دەیەوێ پشوو بدات یان چاوەڕوانی کەسێك بێت. من لە تەنشتیدا ڕاوەستام بەبێ ئەوەی لێوم بۆ قسە بکەمەوە.

ئەو پیاوە دوای ساتێك سەری بۆ لای من وەرگێڕا و گوتی: ڕێگات ون کردووە؟

گوتم: چاکە ببێ بە نسیبت، ڕێگەکەکان زۆرن و ڕێنماییکەری درۆزنیش زۆرن.

ئەو پیاوە کەمێك سەیری منی کرد و گوتی: لە دوو ڕێگا زیاتر بوونی نییە، یەکێك ژیانە و ئەوی تر مەرگە.

گوتم: من بڕوام وایە لە یەك ڕێگا زیاتر بوونی نییە و من حەز دەکەم لەو ڕێگەیەوە بڕۆم، بەڵام ناتوانم خۆم ئەو ڕێگەیە بدۆزمەوە و ئومێدم هەیە ڕێنماییکەرێك پەیدا ببێت و ئەو ڕێگایەم پێ نیشان بدات.

ئەو پیاوە بەبێ ئەوەی قسەیەك بکات، کەوتە ڕێ و منیش لە دوایەوە ڕۆشتم و کە کەمێك بە ڕێگادا ڕۆیشتین گوتم: گۆزەکەی خۆت بدە بە من بابۆت هەڵبگرم و تۆش هەناسەت تازە بکەیتەوە، چونکە دەبینم هەناسەبڕکێت پێ کەوتووە و ماندوو بوویت.

پیاوەکە گوتی: هەناسەبڕکێکەی من بەهۆی ماندوویەتیەوە نییە، بەڵکو لە ترسایە.

بەڵام دوای ئەم گوتەیە، گۆزەکەی خۆی دا بەمن تا بۆی هەڵبگرم و ئینجا زانیم کە ئەو گۆزەیە قورس نییە. دیسان کەمێك ڕێگامان بڕی تا گەیشتینە ماڵێك و ئەو پیاوە تەقەی دا لە دەرگای ماڵەکە و ئافرەتێك دەرگاکەی بۆ کردینەوە. ئەو ئافرەتە بەو جۆرە ڕێزی لەو پیاوە گرت کە گۆزەکەی هەڵگرت و ئینجا تێ گەیشتم ئەو پیاوە لەو ماڵەدا خزمەتکار نییە تا ئەویان ناردبێ بۆ ئاو هێنان. ئافرەتەکە دوای کردنەوەی دەرگاکە، بەبێ ئەوەی وشەیەك لە دەمی بێتە دەرەوە، گۆزەکەی لە دەستم گرت و بە ڕێنمایی ئەو پیاوە چوومە ماڵەوە.

پاشان، کوڕێکی گەنجی پازدە ساڵان هات بۆلای من و گوتی: چاکە ببێت بەنسیبت، ئایا حەز دەکەی خۆت بشۆیت؟

گوتم: لێرەدا شتێ هەیە دەستی پێ بشۆم؟
ئەو کوڕە گەنجە ئەو گۆزە ئاوەی کە خۆم هێنابووم، هەڵ گرت و کەمێك ئاوی کرد بە دەستمدا تاکو نیشانی بدات کە لەوماڵەدا ئاو کەم نییە. پاشان پارچە پەڕۆیەکی بۆ هێنام تا دەستمی پێ وشك بکەمەوە و ئینجا گوتی: من ناوم "مارك مەرقۆس"ە و لەو شەوەی کە ئەویان دەگرت، من لەخەو ڕاپەڕیم و کەواکەی خۆم هەڵگرت تا لەبەری بکەم و بڕۆم و ئەو ئاگادار بکەمەوە. بەڵام ئەو کەسانەی کە هاتبوون بۆ گرتنی، کەواکەیان لێ سەندم.
ئەو پیاوەی کە گۆزە ئاوەکەی لە دەرەوەی دەروازەکەوە هێنابوو گوتی: منیش ناوم "نەتانێل"ە و ئێستە کە گەیشتوومەتە ماڵەوە و ترسم نەماوە، دەتوانم پێت بڵێم کە دوای ئەوەی عیسا زیندوو بوویەوە و لەناو گۆڕەکەی هاتە دەرەوە، من ئەوم بینیبوو.
مارك مەرقۆس گوتی: تۆ ئەوت بینی، بەڵام نەوتوانی لە یەکەم نیگادا عیسا بناسی.
"نەتانێل" لە جیاتی ئەوەی وەڵامی ئەو کوڕە گەنجە بداتەوە، دەستی بردە پشتەوە و منی پێ نیشان دا و گوتی: ڕێنوێنی ئەم پیاوە بکە.
مارك بە منی گوت: بەڕێکەوە تا ڕێنوێنیت بکەم.
من کەوتمەڕێ و ئەو کوڕە گەنجە منی لە دالآنێکەوە برد و بە پلیکانەدا چوونییە سەرەوە و گەیشتینە نهۆمی سەرەوە. کاتێ گەیشتینە ئەوێ، زانیم "نەتانیل"یش لە پشتی ئێمەوە دێت. مارك منی بردە ژوورێکی گەورەوە. لەو ژوورەدا چرایەك دەسوتا، بەڵام تیشکی چراکە هەموو ژوورەکەی ڕووناك نەدەکردەوە و گۆشە و تەنیشتەکانی ژوورەکە بە تاریکی دەهاتنە بەرچاو.
پاش ئەوەی چوومە ناو ئەو ژوورەوە، "مارك" و "نەتانێل"یش هاتنە ژوورەوە. لە ناوەڕاستی ئەو ژوورەدا مێزێکیان دانابوو. لە دەوری ئەو مێزەدا ڕیزێك شوێن هەبوو بۆ دانیشتن و بینیم دوو کەس لەو ژوورەدان. یەکێ لەو دووانەم ناسی و زانیم کە هەمان ئەو "یۆحەننا"یە کە کاتێ عیسا بەخاچەوە بوو، لە بەردەم خاچەکە لەلای ئافرەتەکاندا بەدیم کردبوو. بەڵام ئەو پیاوەی تر کە لە "یۆحەننا" بە تەمەنتر بوو، نەمناسی و، ئەو

پیاوە بەبزێوی سەیری منی کرد و سەیرکردنەکەی وای نیشان دەدا کە گومانی لێم هەیە.

من بە "یۆحەننا" و ئەو پیاوەم گوت: چاکە ببێت بە نسیبتان. بەڵام هیچکامیان وەڵامی منیان نەدایەوە و پیاوە بەتەمەنەکە هەندێ جار سەیری ڕوخساری دەکردم و جاری واش هەبوو سەیری پێیەکانمی دەکرد. پاش ئەوەی کە بێدەنگی درێژەی کێشا، "نەتانێل" گوتی: ئەم پیاوە سۆراخی گۆزە ئاوەکەی کرد و هەربۆیەش ئەوم هێنا بۆ ئێرە.

من گوتم: زیاد لە یەك ڕێگا بوونی نییە و خوازیاری دۆزینەوەی ئەو ڕێگەیەم.

پیاوە بەتەمەنەکە بە "نەتانێل" و "مارك مەرقۆس"ی گوت: ئێوە لەم ژوورە بڕۆنە دەرەوە.

ئەو دووانە، چوونە دەرەوە و پیاوە بەتەمەنەکە دەرگاکەی داخست و کێلونی دا و گوتی: کابرای بیانی، چاکە ببێت بەنسیبی تۆ، چیت لە ئێمە دەوێ؟

گوتم: من دەمەوێ ئێوە ڕێگای ڕاستم پێ نیشان بدەن.

پیاوە بەتەمەنەکە گوتی: من وا دەزانم ئەو ڕێگەیەی کە ئێمە دەتوانین نیشانی تۆی بدەین، زۆر بەرین و پان و پۆڕ نەبێت.

بەڵام یۆحەننا بە دەنگێکی لەسەرخۆ بە سەرزەنشتەوە گوتی: "تۆماس"، تۆ سەبارەت بە هەموو شتێك و هەموو کەسێك دوودڵی دروست دەکەیت.

ئینجا ڕووی کردە من و گوتی: هەرکەسێ بۆ ویستی شتێك هەوڵ بدات، لە ئەنجامدا بە مەبەستی خۆی دەگات و هەرکەسێ لە دەرگایەك بدات، وەڵامی دەست دەکەوێت، چونکە لە ئەنجام ئەو دەرگایە دەکرێتەوە. تۆش کابرایەکیت کە دەتەوێ ڕاستیەکان بزانیت و لە دەرگای ئێمەت داوە و بەم هۆیەشەوە ئێمە دەرگامان بۆ تۆ کردۆتەوە.

ئینجا پیاوە گەنجەکە تکای لێ کردم کە لە پشتی مێزەکەوە دابنیشم و منیش دانیشتم و "یۆحەننا"ش لەولای مێزەکەوە دانیشت.

تۆماس پێش ئەوەی دابنیشێ گوتی: من یەکێکم لە دوازدە قوتابییەکانی "عیسا" و "یۆحەننا"ش یەکێکە لەو دوازدە کەسە و لە هەموومان گەنجترە.

پاش ئەوەی کە "تۆماس" دانیشت گوتی: کابرای بیانی، تۆ نابێ گلەیی لە ئێمە بکەیت کە پارێزمان لێ کردوویت، چونکە حکومەتی ئێرە ئامادەیە بمانگرێت و تاوانبارمان بکات بە سوتانی پەرستگاکە، بۆیە ناچارین زۆر پارێز بکەین بۆئەوەی دەستگیر نەکرێین. چونکە ئەگەر یەخسیر بکرێین، لەوانەیە بە تۆمەتی سوتانی پەرستگا بمانکوژن. هەربۆیە پێش ئەوەی لێرە جێی تۆ بکەینەوە، لێکۆڵینەوەمان لێ کردیت و یەکێ لەو کەسانەی کە لە قازانجی تۆ قسەی کردووە، "مریەمی مەجدەلییە"یە و ئەو گوتی کە دەتوانرێ باوەڕت پێ بکرێت.

یۆحەننا گوتی: منیش بە قازانجی تۆ ڕای خۆم دەربڕیوە، چونکە دەتناسم، لەبەرئەوەی تۆم لەبەردەم خاچی عیسادا بینی و قیافەت نیشانی دەدات کە خەمباریت و باوەڕ بەو قسە پڕوپووچانە ناکەیت کە خەڵك لەبارەی عیساوە دەیکەن.

گوتم: یۆحەننا، منیش ناوی تۆم بیستووە و شێوەتم دێتەوە یاد.

لە ڕاستیدا یۆحەننا ئەوەندە جوان بوو کە کاتێ مرۆڤ ئەوی بدیایە، شێوەی لەبیر نەدەچۆوە.

تۆماس لێمی پرسی: باشە، ئێستە کە تۆ هاتوویت بۆ ئێرە بڵێ کە چیت لە ئێمە دەوێ؟

قسەکەی "تۆماس" بەجۆرێك بوو کە هەرکەسێ بیبیستایە وایدەزانی دوازدە قوتابییەکەی عیسا هەندێك نهێنییان لەلایە کە نابێ کەسانی تر لێی ئاگادار بن، منیش بە کزۆڵەییەوە گوتم: من هاتووم بۆ ئێرە بۆئەوەی داواتان لێ بکەم تا ببنە ڕێ نیشاندەرم و ڕێگەی ڕاستم پێ نیشان بدەن.

تۆماس، سەیرێکی یۆحەننای کرد و پاشان گوتی: پێش ئەوەی عیسا بگرن، ڕابەری ئێمە گوتی: کە ((لە ماڵی باوکی من جێگا بۆ هەموو کەسێ هەیە و من پێش ئێوە دەڕۆم و جێگەی ئێوە دیاری دەکەم)) ئەو ڕۆژەی کە پێشەوای ئێمە ئەم قسەیەی دەکرد، ئێمەی بە دوازدە کەس دەزانی، بەڵام دواتر یەکێ لە ئێمە بە ناوی "یەهوودا" خیانەتی بە پێشەواکەمان کرد و یازدە کەسی تری بەوەفا مانەوە. ڕاستیەکەی ئەوەیە کە خۆشم نازنم پێشەوای ئێمە لە کام ڕێگاوە ڕۆیشت تا بتوانم ئەو ڕێگایەی کە بێگومان "ڕێگەی ڕاست"ە، نیشانی تۆی بدەم و، لەبەرئەوەش کە خودی خۆشم نازانم ئەو ڕێگایە کامەیە، بۆیە ناتوانم پێت نیشان بدەم.

یۆحەننا گوتی: تۆماس، ئەم قسەیە مەکە، چونکە پێشەوای ئێمە بە تۆ و بە من و کەسانی تر، واتە بەهەموومانی گوت کە ڕێگەی ڕاست خودی ئەوە و هەرکەسێ بیەوێ بە شوێن ڕاستیدا بگەڕێ، دەبێ بە شوێن خودی ئەودا بگەڕێ.

تۆماس بە کەمێك تووڕەییەوە گوتی: من نازانم مانای ئەم گوتەیە چیە. پێشەوای ئێمە گوتی کە ڕێگەی ڕاست خودی ئەوە، بەڵام من ناتوانم تێبگەم کە مەبەستی لەم قسەیە چی بووە و ئەگەر تۆ تێگەیشتوویت کە پێشەوامان چی گوتووە، ئەوا ڕوونی بکەرەوە با منیش تێ بگەم.

یۆحەننا سەیرێکی منی کرد و گوتی: من دەزانم ڕوونی بکەمەوە، بەڵام...

تۆماس گوتی: مەبەستت لە بەڵام چیە؟

یۆحەننا گوتی: تێگەیشتنی مەبەستێك پێویستی بە لێکدانەوەیەکی ڕاست هەیە و لێکدانەوەی هەموو کەسێکیش تەواو و ڕاست نییە.

من گوتم: ڕاستە کە عیسا ڕۆژی سێیەمی دوای مردنی زیندوو بۆتەوە و لە گۆڕ هاتۆتە دەرەوە؟

یۆحەننا گوتی: بەڵێ، ئەم مەسەلەیە ڕاستە. ڕۆژی سێیەم "مریەمی مەجدەلییە" هات و بە من و "پترۆس" کە ئەویش یەکێکە لە قوتابییەکانی عیسا، گوتی کە بەردی سەر مەزاری عیسا لەسەر گۆڕەکە نییە. من و "پترۆس" دوای بیستنی ئەم قسەیە بەرەو گۆڕی عیسا ڕامان کرد و سەیرمان کرد گۆڕەکە بەتاڵە و تەرمی تێدا نییە.

"تۆماس" بە دەنگێکی گاڵتەجاڕیەوە گوتی: مریەمی مەجدەلییە فریشتەیەکیشی لە گۆڕەکەی عیسادا بینیوە و هەروەها باخەوانێکیشی بینیوە کە گوتویەتی خودی عیسایە.

کاتێ من باسی باخەوانم بیست، هەڵوەستەیەکم کرد، چونکە باخەوانەکەم بینیبوو و بەسەرسامیەوە پرسیم: مریەمی مەجدەلییە باخەوانێکی بینیوە؟

تۆماس تێگەیشت کە من چەندە لە بابەتی باخەوانەکەدا سەرم سوڕماوە و گوتی: ئەوەی کە مریەمی مەجدەلییە گوتی، جگە لە خەیاڵی خۆی هیچی تر نییە. "نەتانێل"یش دەڵێ کە عیسای لە دوای مەرگ لە ڕێگادا بینیوە، بەڵام ئەویش وەکو مریەمی مەجدەلییە فریوی خەیاڵاتی خۆی خواردووە.

یۆحەننا گوتی: لە شەوی ئەو ڕۆژەدا کە عیسا لەگۆڕ هاتۆتە دەرەوە هەندێ لە قوتابییەکانی کە یەکێکیان من بووم، لەم ژوورەدا بووین و لەبەرئەوەی دەترساین بێن و بمانگرن، بۆیە دەرگاکەمان لە خۆمان داخست و کێلونمان دا. بەڵام ئەگەرچی دەرگاکە داخرابوو و کێلونیش درابوو، کەچی عیسا لە هەمان ژووردا خۆی بەئێمە نیشان دا و قسەی لەگەڵ کردین و بەڵێنێکی پێ داین کە من ناتوانم لەلای بیانییەکدا بیدرکێنم. بەڵام دڵنیات دەکەمەوە ئەو پیاوەی کە ئەو شەوە لەم ژوورەدا خۆی پێمان پیشان دا، خودی عیسا بوو بۆیە من بڕوام وایە کە عیسا لە پاش مەرگ، زیندوو بۆتەوە.

تۆماس گوتی: بەڵام من بڕوام وایە کە هەر بەوجۆرەی کە "مریەمی مەجدەلییە" و "نەتانێل" فریوی خەیاڵی خۆیان خواردووە، تۆ و ئەوانی تریش کە ئەو شەوە لێرە بوون، فریوی خەیاڵی خۆتان خواردووە. من ئەو شەوە لێرە نەبووم تاکو عیسا ببینم و بڕوام وایە کە ئەوەی ئێوە بینیوتانە، جگە لە بەرجەستە کردنی بیرکردنەوەکانتان هیچی تر نەبووە. من تەنیا بەیەك شێوە ئامادەم ڕازی ببم کە عیسا زیندوو بۆتەوە، ئەویش ئەوەیە کە بە هەردوو چاوی خۆم ئەو ببینم و بە پەنجەکانی خۆم شوێنی برینی میخەکانی سەر هەردوو مەچەك و پێیەکانی بەرجەستە بکەم و برینەکانی ببینم، ئەگینا باوەڕ ناکەم عیسا زیندوو بووبێتەوە.

کاتێ یۆحەننا ئەم قسەیەی بیست، ئەوەندە پەشۆکابوو کە ڕووی وەرگێڕا، بەڵام ناڕەزایی دەرنەبڕی. من زانیم کە بێدەنگی یۆحەننا بەهۆی ئەوەیە کە دوودڵی "تۆماس" کاری لە قوتابییەکانی تری عیسا کردووە و ئەو کەسانەی کە بە دووچاوی خۆشیان عیسایان بینیوە، بەگومان بوون و لە خۆیان دەپرسن کە ئایا ئەوەی بینیویانە، عیسا بووە یان تارماییەك بووە کە لەخەیاڵی ئەوانەوە هاتۆتە دەرەوە.

من گوتم: ئەی تۆماس، من بەپێچەوانەی تۆوە، بۆئەوەی بڕوا بە نوێ بوونەوەی ژیانی عیسا پەیدا بکەم، پێویستم بەبینینی ئەو نییە. من دەزانم کە عیسا زیندوو بۆتەوە و ئێستە لەسەر زەوییە و چاوەڕوانی دەکەم تا ڕۆژێ بێت و خۆیم پێ نیشان بدات.

تۆماس پێی گوتم: کابرای بیانی، من سەرم لە تۆ سوڕ دەمێنێ کە کابرایەکی "ڕۆمی"ت کەچی کەوایەکی وەکو کەوای یەهوودییەکانت لەبەر کردووە و زوناریشت پێوەیە. سوور بوونی تۆ بۆ پەی بردن بەڕاستیەکانی عیسا، گومانی خراپ دروست

دەکات، چونکە ئێمە دەزانین کە تۆ لە قەڵای ئەنتونییەدا میوانی فەرمانڕەوای گشتی بوویت، ئیتر چۆن دەتوانین باوەڕ بکەین کابرایەکی ڕۆمی کە میوانی فەرمانڕەوای گشتی بووە، "عیسا"ی خۆش بوویت و بیەوێ بیناسێ. من وادەزانم کە تۆ لەو ڕووەوە جلوبەرگی یەهوودییەکانت لەبەر کردووە و زونارت بەستووە بۆئەوەی جاسوسی بکەیت و ئێمە بناسی تاکو ئێمەش لە خاچ بدەن یان بەردبارانمان بکەن.

پاش ئەوە، تۆماس ڕووی کردە یۆحەننا و گوتی: تۆ بینیوتە کە چۆن تاوانبار بەردباران دەکەن؟

یۆحەننا گوتی: نەخێر.

تۆماس گوتی: بەڵام من بینیومە و دەزانم کە چاڵێك هەڵدەکەنن تا دەگاتە کەمەری تاوانبارەکە. ئینجا تاوانبارەکە دەکەنە ناو چاڵەکەوە و ئەو چاڵە بەبەرد و گەچ پڕ دەکەنەوە بەجۆرێك کە تاوانبار ناتوانێت لەناو چاڵەکەدا پێیەکانی خۆی بجوڵێنێت. پاشان خەڵك لە چوار دەورەوە بەرد دەبارێنن بەسەر تاوانبارەکەدا و لێدانی بەردەکان ئەوەندە توندە کە وردە وردە گۆشت لە لاشەی تاوانبارەکە لێ دەکاتەوە و ئەوەندە هاوار دەکات تا گیان دەدات و ئەو کاتەش کە خەریکە گیان دەدات، نایبینیت، چونکە زۆری بەردەکان لەبەرچاوان ونی دەکەن. من کە ئەم دیمەنەم بینیوە، حەز ناکەم ئەوە تاقی بکەمەوە و بەردبارانمان بکەن.

گوتم: تۆماس، من جاسوس نیم و تۆ و ئەوانی تریش نادەم بەدەست ڕۆمییەکانەوە. ئەگەر من جاسوس بوومایە، تا ئێستە ئەوانەی کە دەزانم لایەنگری عیسان، دەمدان بە دەستی ڕۆمییەکانەوە. بەڵام تۆ بۆچی لەم شارەدا ماویتەوە و ناگەڕێیتەوە بۆ زێدی خۆت بۆئەوەی لەوێ لە ئاسایشدا بیت؟

تۆماس گوتی: من ئێستە ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ زێدی خۆم، چونکە دەزانم ڕێگاکان لە ژێر چاودێریدان و دەستگیرم دەکەن و لە خاچم دەدەن یانیش بەردبارانم دەکەن.

یۆحەننا گوتی: تۆماس، تۆ ناتوانی دەست بکەیتەوە بە پیشەکەی پێشترت، چونکە کەرەستەکانی کارەکەی خۆتت فڕێ داوەتە سەر زەوی و لە پشتی عیساوە کەوتوویتە ڕێ و بڕیارت داوە ئەوەی عیسا دەیڵێت بیگەیەنیت بە خەڵك و گوتەکانی عیسا لەنێو خەڵکدا بڵاو بکەیتەوە. هیچ یەکێ لە ئێمە کە قوتابی عیسایین، ناتوانین

بگەڕێینەوە بۆ پیشەکەی جارانمان. ئێمە بەڵێنمان داوە کە وەفادار بین بەرامبەر بە عیسا و، خۆمان بە بڵاوکەرەوەی بیروباوەڕەکەی ئەو بزانین. کاری ئێمە لەم دنیادا بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی عیسایە و جگە لەمە ناتوانین پیشەیەکی ترمان هەبێت.

تۆماس گوتی: بەڵام ئایا دەبینی کە بارودۆخی ژیانی ئێمە چۆنە و هەمیشە تووشی تەنگ و چەڵەمە و مەترسی بووینەتەوە؟ ئەو ڕۆژەی کە ئێمە لەگەڵ عیسا بووین، من ئامادە بووم کەواکەی خۆم بفرۆشم و شمشێرێکی پێ بکڕم بۆئەوەی بۆ بەرگری لە عیسا و خۆمان بەکاری بهێنم و لەگەڵ عیسادا بمرم. بەڵام ئەو ڕازی نەبوو کە من بە فرۆشتنی کەواکەی خۆم شمشێرێك بکڕم و، بەبێ بەرگریش خۆی دا بەدەستی پیاوکوژەکانەوە تا لە خاچی بدەن و ئێمەشی لەم دینایەدا بە تەنیا و بێ پشت و پەنا هێشتەوە، بەجۆرێك کە ئێمە ئەمڕۆ نازانین چی بکەین و بۆ کوێ بڕۆین.

یۆحەننا بە "تۆماس"ی گوت: عیسا خۆی گوتی کە بەرگریکارێکمان بۆ دەنێرێ.

تۆماس گوتی: یۆحەننا، تۆ گەنجێکیت کە هێشتا لە ژیاندا بەپێی پێویست ئەزموونت نییە و لەو ڕۆژەوەی کە خۆت ناسیوە بە خۆشی ژیاویت بۆیە ناتوانی درك بکەیت کە خەڵکی تر چ ئازارێك دەکێشن و چۆن دەژین. من بڕوام وایە کە عیسا ئێمەی بەتەنیا بەجێ هێشتوو و ڕۆیشت و، لەوانەشە بە یەکجاری ئێمەی فەرامۆش کردبێت.

من لە "یۆحەننا"م پرسی: مەبەستی عیسا لەبەرگریەکەی چی بوو؟ و ئەو بەرگریکارەی کە بۆ پاراستنی ئێوە دەینێرێت، کێ یە؟

گەنجەکە گوتی: عیسا نەیگوت ئەو کەسەی کە بۆ بەرگری کردنی ئێمە دێت، کێیە و لە کوێوە دێت، بەڵام گوتی: لە ڕۆژێکدا کە ئێمە بێ هێز و داماو دەبین، ئەوا بەرگریکارێکمان بۆ دەنێرێت و دەمانخاتە پەنای خۆیەوە. تۆماس سەبارەت بەم مەسەلەیە دوودڵە، بەڵام من دوودڵ نیم، چونکە دەزانم ئەوەی کە پێشەوای ئێمە گوتوویەتی بەڕاست دەگەڕێ.

لەوم پرسی: ئایا عیسا سەبارەت بەو بەرگریکارەی کە بۆ ئێوەی دەنێرێت، هیچ ڕوونکردنەوەیەکی نەدا؟

یۆحەننا گوتی: بەڵێ با، بەڵام ئێمە ناتوانین ئەو ڕوونکردنەوەیە بگەیەنینە گوێی بیانییەك، مەگەر عیسا بێت و بە ئێمە بڵێت کە ئەوە بۆ بیانییەکان ئاشکرا بکەین.

گوتم: من کابرایەکی بێگانەم، بەم حاڵەشەوە زۆر ڕێز لە عیسا دەگرم و بڕواشم وایە کە ئەو دەگەڕێتەوە و شوێنکەوتووانی دەبیننەوە. من دەزانم کە عیسا تەنانەت "سامریەکان"ی خۆش ویستووە، لەکاتێکدا کە "سامریەکان" کەوتوونەتە بەر ڕقی جوولەکەکان. من ئێوە دڵنیا دەکەمەوە کە لەلایەن منەوە هیچ هەناگاوێ نانرێ کە بەزەرەری عیسا بێت. چۆن من دەتوانم دژی پیاوێك کە دوای مردن زیندوو ببێتەوە و دەتوانێ لە دەرگا داخراوەکاندا تێپەڕ بکات، هەنگاو بنێم؟ ئەو لەوە بەهێزترە کە پیاوێکی وەکو من بتوانێ زیانی لێ بدات. من لەگەڵ ئەوەی کە ڕۆمیم، سوێند دەخۆم کە لە دژی ئێوە هەنگاو نانێم و، بزێویەکەشم بۆ ناسینی ئێوە و قوتابییەکانی تری عیسا تەنیا بۆ وەرگرتنی زانیاریە و ئامادەم هاوکاری ماددی ئێوەش بکەم و هەرچەندە پارەتان دەوێت و منیش توانای دانی ئەو برە پاریەم هەبێت، پێتانی دەدەم.

تۆماس گوتی: ئەم خۆهەڵکێشانە بسەلمێنە و پارە بدە.

یۆحەننا گوتی: ئێمە پێویستیمان بە پارەی تۆ نییە، یان لە حاڵی حازردا پێویستمان بە پارە نییە، چونکە من بنەماڵەیەکم هەیە کە سەرمایەدارە و دەتوانێ هاوکاریم بکات و "مەتتا"[28]یش پیاوێکی سەرمایەدارە و جگە لەمە، عیسا کۆمەڵێك دۆستی هەیە کە ئامادەن ئەوەندە هاوکاریمان بکەن تا لەڕووی خواردن و شوێنی نیشتەجێ بوونەوە دانەمێنین. ئەوەی کە ئێمە دەمانەوێت خودی ئەوە، چونکە عیسا کۆمەڵێك شتی پێ دەداین کە کەسی تر ناتوانت پێمان بدات و ئێستەش کە لە ئێمە دوور کەوتۆتەوە، لەو شتانە بێ بەش بووین و ناتوانین پێیان بگەین، مەگەر عیسا خۆی بگەڕێتەوە بۆ ناومان.

تۆماس سەیرێکی منی کرد و پاشان بە نەرمی بە "یۆحەننا"ی گوت: ئێمە باشمان نەکرد کە قسەی مریەمی مەجدەلییەمان لەبارەی ئەم کابرایەوە (ئاماژە بە من) قبوڵ کرد، چونکە هەرگیز نابێ باوەڕ بە بیانییەکان بکرێت.

ئینجا بەمنی گوت: ئەی کابرا، تۆ نازانی ئەو کاتەی لەگەڵ عیسا دەمانگوزەراند، چەندە بەهێز بووین. کاتێ عیسا لەگەڵ ئەم دوازدە کەسەماندا بوو، ئەوەندە توانامان هەبوو کە نەك تەنیا دەمانتوانی زاڵ بین بەسەر تاکەکانی بەشەردا، بەڵکو ڕۆحەکانیش لە ئێمە دەترسان و نەیاندەوێرا شەڕمان لەگەڵ بکەن. ئەمڕۆش لەگەڵ ئەوەی کە

[28] (مەتتا) یەکێك بوو لە قوتابییەکانی عیسا.

عیسامان لێ دوور کەوتۆتەوە، ئەوەندە لاوازیشین کە ڕۆمییەکی وەکو تۆ بتوانێ وەکو مەڕ بمانبات بۆ کوشتارگا. ئێمە هەڵەمان کرد کە جێی تۆمان کردۆتەوە و ئێستەش کە هەستمان بە هەڵەی خۆمان کردووە، لەلای خۆمان جێت ناکەینەوە، چونکە کاتێ کەسێك لە خۆمان بە ناوی "یەهوودا" خیانەت بکات، ئیتر چۆن دەتوانین باوەڕ بە تۆ بکەین کە کابرایەکی بیانیت؟

گوتم: بە هێزی خۆتان من مەترسێنن، چونکە لە هێزی ئێوە ناترسێم و سەرم سوڕ دەمێنی لە ئێوە کەشوێنکەوتەی عیسان، ئاخر چۆن هێزی خۆتان بە ڕووی مندا دەکێشن، لەکاتێکدا پێشەوا و مامۆستاکەتان تا ئەو ڕۆژەی کە زیندوو بوو، بەکاری نەهێنا و تەنانەت کاتێ ویستیشیان لە خاچی بدەن، هێزی بەکار نەهێنا.

تۆماس بە یۆحەننای گوت: ئەوەندەی کە قسەمان کرد بەسە و لەم ماڵەش بڕۆنە دەرەوە، چونکە ئەم کابرا بیانییە ئێستە دەزانێ کە ئێمە لەم ماڵەداین و ئەگەر بمێنینەوە، لەوانەیە مەترسیمان بۆ دروست ببێت.

گوتم: من داوای لێبوردن دەکەم کە بە هاتنم بۆ ئەم ماڵە ئێوەم ناڕەحەت کرد. دیسانیش دەیڵێمەوە کە مەبەستم خراپ نییە و کابرایەکم دەمەوێ زانیاری بەدەست بهێنم. من لە "میسر"ەوە هاتووم بۆ ئێرە، چونکە کاتێك لە "مسر" بووم، بیستم کە عیسای مەسیح هاتووە و زانا ڕۆمی و یۆنانییەکانیش نیشانەکانی هاتنی ئەویان باس کردبوو. کاتێ گەیشتمە ئێرە، سەیرم کرد لە خاچیان داوە. من کاتێ عیسام بە خاچەوە بینی، بۆم دەرکەوت کە دەبێ ئەوە ئەو مەسیحە بێت کە "تەورات" هەواڵی هاتنی دابوو. کاتێ زانیم دوای تێپەڕینی سێ ڕۆژ لە مردنی لەناو گۆڕ زیندوو بۆتەوە و لەوێ هاتۆتە دەرەوە، ئینجا زانیم کە بێگومان ئەوە خودی عیسایە.

کاتێ لەم قسانەدا قاڵ بوومەوە، کتوپڕ تێگەیشتم کە جگە لە ئێمە، سێ کەسی تایبەت لەو ژوورەدان. ئەو حاڵەتەی کە لەماڵی "لازاروس"دا بەسەرم هات، لەوێشدا ئەو حاڵەتە ڕووی تێ کردمەوە. لە ماڵی "لازاروس"دا لەبەرئەوەی نووستبووم، لەوانەبوو وا بیربکەمەوە کە ئەوەی هەستم پێ کرد، بەهۆی حاڵەتی خەوتنەوە بووە، بەڵام لەو ماڵەدا و لەو شەوەدا، لەخەودا نەبووم و ئەو حاڵەتەی کە ڕووی تێ کردبووم لەکاتی بێداریدا بەسەرمدا هات. من هەستم دەکرد کەسێك لەو ژوورەدایە کە یۆحەننا و تۆماس نایبینن. منیش ئەوم نەدەبینی، بەڵام بەجۆرێ هەستم بە ئامادەبوونی دەکرد

کە دڵنیا بووم هەڵە ناکەم. زۆر حەزم کرد بانگی بکەم و قسەی لەگەڵ بکەم، بەڵام بەهۆی ئامادەبوونی ئەو دووانەوە بەباشم نەزانی ئەو کەسەی کە لەو ژوورەدا بوو، بانگ بکەم و قسەی لەگەڵ بکەم، چونکە ئەگەر ئەو کەسە بیویستایە ئەو دوو کەسەش بیبینن، ئەوا خۆی پیشانی ئەوانیش دەدا. دیار بوو کە حەز ناکات ئەو دووانە پێی بزانن و حەز دەکات تەنیا من هەست بکەم کە ئەو لەو ژوورەدایە.

ئینجا من ماڵئاواییم لەو دووانە کرد و بۆ ڕۆشتنە دەرەوە لەو ژوورە کەوتمە ڕێ. تۆماس لە پێش منەوە بەڕێ کەوت تاوەکو دەرگای ژوورەکەم بۆ بکاتەوە و بتوانم لێی بچمە دەرەوە، بەڵام تۆماس هەرچی کرد نەیتوانی دەرگاکە بکاتەوە. لەبەرئەوەش کە لە کردنەوەی دەرگاکەدا گیری خوارد، داوای یارمەتی لە یۆحەننا کرد. یۆحەننا لە دەرگاکە نزیك بوویەوە و ئەویش هەوڵی دا دەرگاکە بکاتەوە، بەڵام نەیتوانی. من لە سەرەی خۆمدا لە دەرگاکە نزیك بوومەوە و بینیم کێلون و قوفڵی ئەو دەرگایە لە دار دروست کراوە کە لە ڕۆمدا باو نییە و تایبەتە بە ڕۆژهەلاتی زەوییەوە. من لە کێلون و قوفڵی دارینم نەدەزانی، کەچی بەم حاڵەشەوە هەر کە دەستم دایە دەرگاکە، یەکسەر دەرگاکە کرایەوە. دوای ئەوەی کە دەرگاکە کرایەوە، هەوای فێنکی شەو لە ڕوخسارمی دا و لەو دریاچەیەوە کە لەدیوی بەرامبەرماندا بوو، توانیم ئاسمان ببینم و سەیرم کرد ئاسمان پڕە لە ئەستێرە و لەنێوان هەسارەکاندا ئەستێرەیەك هەیە کە ئەوەندە پڕشنگدارە هەر دەڵێی خۆرێکی بچووکە و لە ئاسماندا هەڵهاتووە.

کاتێ چاوم بەو ئەستێرەیە کەوت، وەك ئەوە وابوو کە ئەو ئەستێرەیەم بە یەکێك لە نیشانەکانی دەرکەوتنی عیسا دەزانی و وامدەزانی کە ئەگەر عیسا دەرنەکەوتایە ئەو ئەستێرەش هەڵنەدەهات.

پاشان ڕووم وەرگێڕا و خواحافیزیم لەو دووانە کرد و گوتم: کاتێ بەرەو ئەم ماڵە دەهاتم، ئەو کەسەی کە گۆزە ئاوەکەی بە شانەوە بوو، منی لە شەقام و کۆڵانێکی زۆرەوە تێپەڕاند. من دەمزانی کە بە ئەنقەست ڕێی خۆی دوور دەخاتەوە بۆئەوەی من نەتوانم ئەم ماڵە بدۆزمەوە، بەڵام ئێستە کە لەم ماڵە دەڕۆم، دەتوانم بەهۆی ئەستێرەکانی ئاسمانەوە ڕێی خۆم بدۆزمەوە. ئینجا بەڕێ کەوتم و لە پلیکانەکان هاتمە خوارەوە.

لە خوار پلیکانەکانەوە "مارك مەرقۆس" ئەو کوڕە گەنجەی کە گوتم لەو ماڵەدا ئاوی بە دەستمدا کرد، چاوەڕێی منی دەکرد و گوتی: دەتەوێ بڕۆیت؟

گوتم: بەڵێ.

مارك گوتی: ئەمشەو کاتێ تۆ هاتی بۆ ئەم ماڵە، بەمنیان گوت کە میوانداری لە تۆ بکەم و پێشوازیت لێ بکەم، بەڵام تۆ ڕۆیشتی بۆ دیداری ئەو دوو کەسە و دەرفەتت بە من نەدا خواردنێکت پێشکەش بکەم و ئێستەش کە دەتەوێ بڕۆیت، بهێڵە با لە دواتەوە بێم تا نەوەك ڕێگاکە ون بکەیت.

گوتم: کوڕێکی گەنجی وەکو تۆ پێویستی بە خەوە و دەبێ زوو بنویت و من نامەوێ لە خەو و ئیسراحەتت بکەم.

مارك گوتی: لە شەوێکی وەکو ئەم شەوەدا دەتوانرێ واز لە خەوتن بهێنرێت، تۆ کەمێك ڕاوەستە با من کەواکەی خۆم لەبەر بکەم و بێمەوە بۆ لات.

ئەو ئافرەتەی کە لەو ماڵەدا دەرگای ماڵەکەی بۆ کردبوومەوە، ویستی بەر لە چوونە دەرەوەی "مارك" بگرێت و پێ ی گوت: بەم شەوە مەڕۆ بۆ دەرەوە.

بەڵام کوڕە گەنجەکە بەگوێ ی ئەو ئافرەتەی نەکرد و کەواکەی خۆی لەبەر کرد و سەیرم کرد گورزێکیشی بەدەستەوە گرت. گورزەکەی سەرێکی خڕی قورسی پێوە بوو کە پاشان زانیم ئەو سەرەی گورزەکە لە ماددەی مس دروست کراوە.

پاش ئەوەی کە گورزی کوڕە گەنجەکەم بینی، بەگومان بووم لەوەی کە نەوەك مەبەستی خراپی پێم هەبێت. بەڵام لێی نەترسام، چونکە "مارك" کەمێك منداڵ بوو و دەمتوانی بیبەزێنم.

پاش ئەوەی کە لە ماڵ چووینە دەرەوە، پێمان نایە ناو کۆڵانە تاریکەکانەوە و "مارك" دەستی منی گرت و ڕێنوێنی کردم و وردە وردە بەدگومانییەکەم لەبارەی ئەو کوڕە گەنجە نەما و زانیم کە بۆ پاراستنی من ئەو گورزەی لەگەڵ خۆی هێناوە و مەبەستی خراپی پێم نییە. من تێگەیشتم کە کوڕە گەنجەکە حەز دەکات لەگەڵم گفتوگۆ بکات، بەڵام بێدەنگی من ئەوی ترساندبوو و نەیدەوێرا شتێکم لێ بپرسێ، بۆیە بۆئەوەی هانی بدەم بۆ گفتوگۆ کردن، گوتم: تۆش عیسات بینیوە؟

مارك گوتی: منیش هەر وەکو باوکم و مامم چەند جارێك عیسام بینیبوو و، دوایین شەو کە عیسا لەگەڵ قوتابییەکانی خۆیدا نانی خوارد، من خواردنم لەبەر دەم

ئەو و قوتابییەکانی دانا و لەبیرم ناچێتەوە کە ئەو ڕۆژەی عیسا بەسواری گوێدرێژەکەیەوە چووە ناو "قودس"، خەڵك کەوا و عەباکانیان لەبەر خۆیان داکەند و لەسەر ڕێگایاندا ڕایانخست تاکو گوێدرێژەکەی عیسا لەسەر کەوا و سەرپۆشەکانی ئەواندا تێپەڕ ببێت و دانیشتوانی ئەم شارە لقی دارە زەیتونەکانیان بەشادیەوە لەسەر ڕێگاکەیدا ڕادەوەشاند. ئەو گوێدرێژەی کە عیسا ئەو ڕۆژە سوار پشتی ببوو، لەلایەن باوکمەوە پێی درابوو و، پاش ئەوەی کە عیسا هاتە ماڵی ئێمە، باوکم و مامم ئەویان برد بۆ باڵەخانەکە و بردیان بۆ ئەو شوێنەی کە تۆ ئەم شەو تێیدا بوویت.

گوتم: باوك و مامی تۆ کێن و چۆن ئەوان زاتیان کرد لەم شارەدا بە ئاشکرا پێشوازی لە عیسا بکەن؟

مارك گوتی: باوکم حەز ناکات ناوی ببرێت و هەر ئەوەندە دەتوانم بڵێم کە باوکم یەکێکە لە قوتابییەکانی عیسا و دەیویست بیهێڵێتەوە لە ماڵەکەماندا. بەڵام عیسا بە باوکمی گوت کە ((ئەگەر من لە ماڵی تۆدا بمێنمەوە، ئەوا ژیانت دەخەمە مەترسیەوە و باشتر وایە لەماڵی تۆ و براکەت بڕۆم)). ئینجا لە ماڵی ئێمە ڕۆیشت و لە جێگەیەکی تر نیشتەجێ بوو. هەمان شەو "یەهوودا" کە یەکێك بوو لە قوتابییەکانی عیسا و پاشان خیانەتی لێ کرد، لەگەڵ هەندێك لە پیاوانی چەکدار هاتن بۆ دەزگیرکردنی عیسا بۆ ماڵی ئێمە و ئەوان چەند مەشخەڵێکیان لەگەڵ خۆیان پێ بوو کە ماڵەکەی ڕۆشن دەکردەوە. هەر لەو شەوەدا بوو کە لەخەو هەستام و ویستم خۆم بگەیەنمە عیسا تا پێی بڵێم کە هاتوون بۆ دەزگیرکردنی.

گوتم: ئایا جوولەکەکان باوکتیان – بەهۆی ئەوەی کە میوانداری عیسا بوو – ئازار نەدا؟

مارك گوتی: بواکمیان برد بۆ ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان و خستیانە بەر لێپرسینەوە بۆئەوەی بزانن بۆچی لەماڵی خۆیدا پێشوازی لە عیسا کردووە. باوکم گوتی کە ئەو کابرایەکە باڵەخانەکەی خۆی بۆ میوانداری یان هاوسەرگیری تەرخان دەکات بۆ خەڵك و هەرکەسێ بیەوێ، دەتوانێ ڕۆژێك یان شەوێ ئەو باڵەخانەیە بەکرێ بگرێت و "عیسا"ش بەم شێوەیە لەو باڵەخانەیەدا نیشتەجێ بوو. ئەم ڕوونکردنەوەیە، ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکانی ڕازی کرد و نەیانتوانی سزای باوکم بدەن. بەڵام

ئەگەر کۆمەڵێك لە ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان لەگەڵ باوکم هاوڕێ یان ئاشنا نەبوونایە، ئەوا هەر سزایان دەدا و ڕەنگە وەکو عیسا لە خاچیشیان بدایە.

پرسیم: بیروبۆچوونت چۆنە سەبارەت بە عیسا؟

مارك گوتی: بێگومان عیسا پێغەمبەری خودایە، چونکە ئەو کارانەی کە ئەو دەیکردن تەنیا لەنێردراوەکانی خودا دەوەشێتەوە و یەکێ لە کارە گەورەکانی ئەوەیە کە لەدوای مەرگ، زیندوو بۆتەوە و ئێستە ئەو لە ژیاندایە و لەنێو ئێمەدایە و تەنانەت مامی من واتە "نەتانێل" دوای ئەوەی عیسا لە گۆڕ هاتە دەرەوە، یەك جار قسەی لەگەڵ عیسا کردووە و نانیشی لەگەڵ خواردوە و، تۆ دەزانی کە مردوویەك یان ڕۆحێك بەبێ جەستە ناتوانێ نان بخوات و بۆیە ئەو کەسەی کە نانی دەخوارد بەبێ هیچ شك وگومانێك، زیندووە.

# دیدار لەگەڵ کابرایەک بە ناوی شەمعون

من بە باوەڕی ئەو کوڕە گەنجە خۆشحاڵ بووم، بەڵام نەمهێنا بە ڕووی خۆمدا و گوتم: وادیارە تۆ گەنجێکی سادەیت و نەوتوانیوە بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری، بخۆێنیتەوە و ئەگەر زانست و زانیاریت هەبووایە، ئەوا بەم ئاسانییە باوەڕت بە عیسا نەدەهێنا.

گەنجەکە گوتی: من زۆر نەزان نیم، چونکە دەتوانم بەزمانی یۆنانی بخوێنمەوە و بنووسم و کەمێکیش لاتینی دەزانم و لەبەرئەوەی باوکم لەگەڵ بازرگانەکان و کاسبکارانی "قوبروس" و تەنانەت لەگەڵ بازرگانەکانی ڕۆمیشدا پەیوەندی هەیە، بۆیە ئاگام لە بارودۆخی وڵاتانی تر هەیە. کەواتە تۆ نابێ من بەکوڕێکی سادە بزانیت و وابزانی بەبێ هیچ زانیاریەك باوەڕ بەکەسێك دێنم. من چەندین جار عیسام بینیوە و گوتەکانیم بیستووە. ئەو دەستی بە سەرمدا دەهێنا و خێری بەسەردا دەباراندم. من لەکاتی ژیانیدا، عیسام بینیوە و دەزانم کە چەندە گەورەیە.

گوتم: مارك، بۆچی "نەتانێل"ی مامت و "مریەمی مەجدەلییە" کە پاش مردنی عیسا ئەویان بینیوە، نەیانتوانیوە بیناسنەوە؟

مارك گوتی: هۆکەی ئەوە بوو کە "عیسای ناصری" نەك لەدوای مردنی بەڵکو پێش ئەوەی بشمرێت دەیتوانی شێوەی خۆی بگۆڕێت و بچێتە سەر شکڵێکی تر.

گوتم: مارك، تۆ گوتت "عیسای ناصری". مەبەستت لە "ناصری" چییە؟

مارك گوتی: بۆیە پێیان دەگوت "عیسای ناصری" چونکە ماوەیەك لە شاری "ناصرە" دا [29] ژیاوە. عیسای ناصری بەو جۆرەی باسی دەکەن، دەڵێن خۆی خستۆتە سەر شێوەی ئەو کەسانەی کە خۆشی ویستوون و لە پاش مەرگیش، بە گۆڕینی شکڵی خۆی، خۆی بە خەڵك نیشان داوە و هەربۆیە کاتێ ئەویان بینیوە، نەیانناسیوەتەوە. ئەگەر تۆش عیسات بدیایە، دەتبینی کە چاوەکانی ئەوەندە بەهێزن کە کەس ناتوانێ سەیری ناو چاوانی بکات. من چەندین جار بیستوومە کە بەتەمەنەکانیش کاتێ

---

[29] ئەم وشەیە لەبنجینەدا (نازرە)یە و ئەو وەرگێڕانەی کە وەریانگێڕاوە بۆ زمانی فارسی، شاری (نازرە)یان– کەلە فەلەستین بووە – بە (ناصرە) هێناوەتە ناو زمانی فارسیەوە و لە ئەنجامدا حەزرەتی (عیسا) بوو بە (عیسای ناصری).

نیگایان دەبڕیە چاوەکانی، نەیاندەتوانی لەبەرامبەر نیگاکانیدا خۆیان ڕابگرن، بۆیە سەریان دادەنواند و چاویان دەبڕیە زەوی.

گوتم: دەکرێ ئەوەی تۆ دەیڵێیت ڕاست بێ. کاتێ من ئەوم بینی، بە خاچەوە بوو و نەمتوانی ئاگام لە هێزی نیگاکانی بێت، چونکە کاتێ مرۆڤ ئازار دەچێژێ هێزی نیگای لاواز دەبێت. جگە لەوەش، ئەو ڕۆژەی کە عیسایان لە خاچ دا، دنیا نیوەتاریك بوو و مرۆڤ نەیدەتوانی بەباشی چاوەکانی ببینێ. منیش شەرمم دەکرد چاو ببڕمە کابرایەك کە ئازار دەچێژێ، هەر بۆیەش نەمتوانی هەست بە هێزی نیگاکانی عیسا بکەم. بەڵام من سەرم لەوە سوڕ دەمێنی کە ئەو پیاوە گەورە بۆچی کۆمەڵێك کەسی بێ ئەزموونی کردووە بە قوتابی خۆی. ئەمانە وا دەزانن ئەرکیان هەر ئەوەیە کە نەهێڵن کەس عیسا بناسێ، بۆیە لەبارەی ئەوەوە زانیاری بە کەس نادەن. ئەگەر عیسا خۆی بناساندایە بە خەڵکی، ئەوا ئەو کەسانەی کە بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێن دەیانتوانی بچن بۆ لای خودی ئەو و لە دەمی عیساوە گوێیان لە ڕاستیەکان بێت. هەروەها پێموایە کە قوتابییەکانی عیسا زیادەڕەوی دەکەن لە ترسی خۆیان و، خۆیان زیاتر لەوەی کە هەیە بە ترسنۆك نیشان دەدەن. بە بڕوای من ئەگەر قوتابییەکانی عیسا خۆیان نیشان بدەن، کەس حەقی بەسەریانەوە نابێت و ناتوانن بیانکوژن.

مارك گوتی: لەبارەی بێ ئەزموونی قوتابییەکانی عیسا هاوڕام لەگەڵت. بەڵام لەمەڕ زیادەڕەوی ترسی قوتابییەکانی، هاوڕا نیم لەگەڵت و دەزانم کە قوتابییەکانی عیسا لە بۆسەی مەترسیدان و هەرکاتێ خۆیان نیشان بدەن، دەکوژرێن.

گوتم: مارك، تۆ لەگەڵ ئەوەی کە گەنجیت، بەڵام هەندێ قسە دەکەیت کە وای نیشان دەدات لەچاو تەمەنت زانیاری زیاترت پێیە. ئایا دەتوانی لەبارەی عیساوە هەندێ ڕاستیم پێ بڵێیت؟

مارك گوتی: عیسا شتێکی بەمن نەگوتووە تا بۆتی باس بکەم، تۆ دەتوانی ئەوە لە "شەمعون"ی خەڵکی دوورگەی "کورن"[30] بپرسیت.

گوتم: شەمعونێ خەڵکی دوورگەی کورن کێیە؟

---

[30] (کورن) دوورگەیەکە لە باشووری یۆنان. بەپێ ی ئەفسانە دێرینەکانی یۆنان، (ئاپۆلۆن) کە جۆرێکە لە خودای جوانی پیاوان، لەوێدا لەدایك بووە و پەرستگایەکیشیان لەو دوورگەیەدا بۆ دروست کردووە. ئەم دوورگەیە بە خەتی لاتینی ئەمڕۆی (سیرن) دەینووسن و پێ ی دەڵێن (کورن).

مارك گوتی: ئەو ڕۆژەی کە عیسایان دەبرد تا لە خاچی بدەن، زۆریان لێ کرد خاچەکە بدا بەشانیدا و بیبات بۆ کوشتارگا، چونکە هیچ کەسێ ئامادە نەبوو خاچەکە و قورسایی کێشەکەی هەڵبگرێت، چونکە ئەرکی ئەوان نەبوو خاچ هەڵبگرن و لەبری هەڵگرتنیدا پارەیان بە کەس نەدەدا، هەربۆیە خاچەکەیان دا بە کۆڵی عیسادا، بەڵام لەبەرئەوەی خاچەکە زۆر قورس بوو، عیسا کەوت بە زەویدا و هەرچەندە بەرزیشیان کردەوە، بەڵام دیسان نەیتوانی خاچەکە هەڵبگرێت. لەو کاتەدا کە سەربازە ڕۆمییەکان عیسایان بۆ کوشتارگا دەبرد، سەیریان کرد کابرایەك لە بیابانەوە دێت و دەیەوێت بێت بۆناو شار. ڕوخساری ئەو کابرایە دەریدەخست کە کابرایەکی وەرزێر بێت، بەڵام سەرکردە ڕۆمییەکان نەیاندەزانی کە کابرایەکی سەرمایەدارە. ئەو پیاوە کە ناوی "شەمعونی خەڵکی دوورگەی کورن" بوو، خاچەکەی دا بە کۆڵیدا و لەگەڵ عیسا بەڕێ کەوت تاکو گەیشتنە کوشتارگا. دوای ئەوە "شەمعون" لەلای حاکم شکایەتی لە سەردارە ڕۆمییەکان نەکرد و لەگەڵ ئەوەی کە لە کارەساتی لەسێدارەدانەکەی عیسا زۆر پەشۆکابوو، دیار بوو کە ئەوکاتەی لەگەڵ عیسادا بەرە و کوشتارگا ڕۆیشتووە، عیسا هەندێ شتی پێ گوتووە و ڕازی کردووە کە لە شکایەت کردن پارێز بکات و، ئەگەرێکی زۆر هەیە عیسا بە "شەمعون"ی گوتبێ کە شیاوی ئەوەیە لەلایەن لێکۆڵەرێکی وەکو تۆ پرسیاری لێ بکرێت.

گوتم: من لە کوێ دەتوانم "شەمعون" بدۆزمەوە؟

مارك گوتی: تۆ دەتوانی لە "نوێژخانەی ئازادکراوەکان"دا شەمعون بدۆزیتەوە و ئەگەریش خۆی لەوێ نەبوو، ئەوا ناونیشانی ماڵەکەیت پێ دەڵێن.

پرسیم: نوێژخانەی ئازادکراوەکان، چیە؟ ئەمە یەکەمجارە کە من ئەم ناوەم بەرگوێ دەکەوێ.

مارك گوتی: نوێژخانەی ئازادکراوەکان ئەو غوڵامە ئازادکراوانە دروستیان کردووە کە لە ڕۆمەوە هاتوون بۆ ئەم وڵاتە. لەکۆندا، هەندێك غوڵام لەم وڵاتەوە براون بۆ ڕۆم و ماوەیەك لە ڕۆم بوون و لەوێ سەروەت و سامانیان پێکەوە ناوە و پاش ئازاد کردنیان، گەڕاونەتەوە و، بۆ سوپاسگوزاری ئەوەی کە ئازاد و دەوڵەمەند بوون، نوێژخانەیەکیان دروست کردووە و بەم هۆیەشەوە بەو نوێژخانەیان دەگوت نوێژخانەی ئازادکراوەکان. هۆیەکی دیکە کە بووە هۆی ئەوەی بەو نوێژخانەیە بڵێن ئازادکراوەکان

ئەوەیە کە لەوێ کتێبە پیرۆزەکانی ئاینی یەهوودی بە زمانی یۆنانی دەخوێنرێن نەك بە زمانی عیبری. "کورن"یش دوورگەیەکی یۆنانییە و شەمعون کە خەڵکی ئەو دوورگەیە، زمانی یۆنانی دەزانێت و هەربۆیە دەچێ بۆ نوێژخانەی ئازادکراوەکان تا لەوێ کتێبی پیرۆزەکەمان بە زمانی یۆنانی بخوێنێتەوە.

گوتم: لەمەڕ ئەوەی کە ئەم زانیاریەت پێدام، خۆشحاڵم و ئێستەش ماڵئاواییت لێ دەکەم و دەڕۆم، چونکە گەیشتوومەتە جێگەیەك کە دەتوانم ڕێی خۆم بدۆزمەوە.

مارك گوتی: پێش ئەوەی خوداحافیزیت لێ بکەم، لەبەرئەوەی تۆ هاوڕێی فەرمانڕەوایشیت، پێت دەڵێم کە ئەگەر کەسێك پرسیاری لێ کردیت، بڵێ کە ئێمە خەڵکێکی گێرەشێوێن نین.

گوتم: کەس لەبارەی قوتابییەکانی عیساوە پرسیارم لێ ناکات و ئەگەریش پرسیاریان کرد، پێیان دەڵێم کە ئەمشەو لەگەڵ دوو کەس لە یارانی عیسا، گفتوگۆم کردووە و بۆم دەرکەوتووە کە هەردووکیان کەسێکی بێ ئازارن و لە بیری پیلان گێران و ئاژاوەنانەوە نین. ئیتر "پونتوس پیلان" گوێ نادات بە مەسەلەی عیسا و حەز دەکات ئەم مەسەلەیە بەتەواوی فەرامۆش ببێت.

پاشان خوداحافیزیم لە کوڕە گەنجەکە کرد و کەوتمەڕێ تا گەیشتمە ماڵەوە و بەیانی ڕۆژی دواتر لەلای خاوەن ماڵەکەم کە گوتم "سریان"ی بوو، سۆراخی نوێژخانەی ئازادکراوەکانم کرد و گوتم کە دەمەوێ شەمعونی خەڵکی دوورگەی کورن ببینم.

هەرکە خاوەن ماڵەکە ناوی "شەمعون"ی بیست، گوتی: من ئەم کەسە دەناسم و دەتوانم لەبارەیەوە زانیاریت بدەمێ.

پاشان دوکانەکەی سپارد بە کوڕەکەی بۆئەوەی کڕیارەکان بەڕێ بکات و ئینجا هات بۆ ژوورەکەی من و گوتی: ئەو شەمعونەی کەتۆ دەتەوێ ببینی، لە دوورگەی "کورن"ە و لەوێ بڕێ پارەی بەدەست هێناوە و هاتووە بۆ ئەم شارە و لە دەرەوەی ئەم شارەدا بڕێك زەوی و باخی زەیتونی کڕیوە و، دەڵێن لە زۆربەی شارەکانی ئەم ناوچەیەشدا زەوی و باخی هەیە. بارودۆخی ژیانی شەمعون وەکو یۆنانییەکان وایە،بەڵام دەڵێن خۆی یەهوودییە و ڕیش دەهێڵێتەوە. شەمعون بە ڕووکەش یاسای جوولەکەکان پەیڕەو دەکات و ڕۆژەکانی شەممە دەست لەهیچ ئیشێکەوە نادات.

پێش ئەوەی کە خاوەن ماڵ بەم شێوەیە "شەمعون"م پێ بناسێنێت، پرسی: دەتەوێ برۆیت و پارەی لەلا دابنێیت یان دەتەوێ پارە لە شەمعون قەرز بکەیت؟ ئەگەر مەبەستت پێدانی پارە یان پێدانی قەرزە، با هەندێ کەسی ترت پێ بناسێنم، چونکە شەمعون کابرایەکی ڕژدە و خواردنی ئەو تەنیا نان و سەوزەیە وەردەگرێت و ئەگەریش پارەیەك بە قەرز بدات ئەوا سوودی لەسەر دادەنێت و ئەگەریش بتەوێ پارەی لەلا دابنێیت، ڕەنگە حاشای لێ بکات و پارەکەت نەداتەوە.

گوتم: من نە دەمەوێ پارەی لێ قەرز بکەم و نە دەشمەوێ پارەی پێ بسپێرم.

خاوەن ماڵ گوتی: ئەی ئیشی چیت پێیە؟

گوتم: ئەم پیاوە، ئەو ڕۆژەی کە عیسایان لە خاچ دا، لەنیوەی ڕێگادا خاچەکەی عیسای بەکۆڵەوە گرتووە و گفتوگۆی لەگەڵ کردووە، منیش دەمەوێ بزانم چی لە عیسا بیستووە.

خاوەن ماڵەکە گوتی: کابرای بیانی، بیر لەم مەسەلەیە مەکەرەوە، چونکە عیسا کابرایەکی گێرەشێوێن و ئاژاوەگێڕ بوو، باشیان کرد کە کوشتیان و جوولەکەکانیان لە ترسی ئەو کابرایە پاراست.

گوتم: کابرای چاکەکار، تۆ لەم ماڵەدا بەباشی ڕەفتارت لەگەڵ کردووم و ژن و منداڵەکانی تۆ زەحمەتیان بۆ کێشاوم و من نامەوێ شتێ بڵێم کە ببێتە هۆی دڵگرانی تۆ، بەڵام من عیسا بە پیاوێکی گەورە دەزانم و باوەڕم بەوە هەیە کە عیسا سێ ڕۆژ لەدوای مردنی، زیندوو بۆتەوە و لەناو گۆڕ هاتۆتە دەرەوە و ئێستاش لەنێو ئێمەدایە، بەڵام ئێمە ئەو نابینین مەگەر جارێ خۆی بیەوێ خۆیمان پێ نیشان بدات. لەبەرئەوەی کە عیسا بە پیاوێکی گەورە دەزانم، بۆیە حەز دەکەم هەندێ زانیاریم دەست بکەوێت و، یەکێ لەو کەسانەش کە دەتوانێ زانیاریم پێ بدات، شەمعونی خەڵکی دوورگەی کورنە.

خاوەن ماڵەکە گوتی: کابرای بێگانە، ئەگەر تۆ هاوڕێی "ئادان ئابر"ی ئەفسەری ڕۆمی نەبوویتایە، تۆم لەماڵەکەی خۆم دەردەکرد، چونکە من نامەوێ کێشە و مەترسی بۆ خۆم دروست بکەم و، ئەگەر جوولەکەکان بزانن یەکێ لە شوێنکەوتووانی عیسا لە ماڵەکەی مندا نیشتەجێیە، ڕەنگە ئەم ماڵە وێران بکەن. بۆئەوەی تۆش بە زیندوویی بمێنیتەوە، باشتر وایە لەبارەی عیساوە قسە نەکەیت، چونکە ئەگەر جوولەکەکان بتناسن و بزانن لایەنگری عیسایت، بەردبارانت دەکەن. تێگەیشتی چیم پێ گوتی؟

گوتم: ئەگەریش یەهوودییەکان بزانن کە من لاینگری عیسام، هەر ناتوان بەردبارانم بکەن، چونکە من کەسێکی ڕۆمیم و جوولەکەکان دەسەڵاتی ئەوەیان نییە ڕۆمییەك مەحکوم بکەن و تەنیا حکومەتی ڕۆم دەتوانێ دادگایی و مەحکومم بکەن.

خاوەن ماڵەکە گوتی: ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە مەسەلەی سیاسیەوە هەیە و ئەگەر تۆ- کە ڕۆمییەکیت- تووشی تاوانێکی سیاسی ببیت، ئەوا ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان مافیان نییە دادگایی و مەحکومت بکەن، بەڵام ئەگەر زمرمر لە ئایینی جوولەکەکان بدەیت، ئەوا بەپێی ئەو یاسایەی کە حکومەتی ڕۆم لەم شارەدا بەرقەراری کردووە، دەتوانن بەردبارانت بکەن. ئەگەر تۆ ڕۆمانیت، کارت بە ئایینی یەهوودییەکانەوە چییە و بۆچی دەست دەخەیتە ئایینەکەیانەوە؟ دان بەوەدا بنێ کە مەبەستت لە پشتگیری کردنی عیسا، دەست وەردانە لە ئایینی جوولەکەکان. تۆ جگە لە مەحکوم بوونت لە ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان، لە بۆسەی مەترسییەکی تریشدایت و ئەو مەترسییەش، هێرشێکە کە لەلایەن پیاوانەوە دەکرێتە سەرت. ئەگەر گەورەپیاوەکانی یەهوودیی بزانن مەحکوم کردنت بەهۆی ئەوەی کە ڕۆمیت، ئاسان نەبێ، ئەوا هانی پیاوان دەدەن تا لە کۆڵانەکاندا هێرشت بۆ بێنن و بتکوژن، بەو جۆرەش خوێنەکەت بەفیڕۆ دەچێت و فەرمانڕەوای گشتیش کە ڕۆمییە، ناتوانێ بکوژەکەت سزا بدات، چونکە بکوژەکەت یەك کەس و دوو کەس و دە کەس نییە و لەبری خوێنەکەت، هەموو دانیشتوانی ئەم شارە کۆمەڵکوژ ناکەن، بەتایبەت ئەگەر فەرمانڕەوای گشتی بزانێ کە تۆ دەستت خستۆتە کاروباری ئاییـنی یەهوودییەکانەوە و، ڕق و کینەی مەزهەبیی ئەوانت هەستاندووە.

گوتم: من سەرم لەوە سوڕماوە کە بۆچی جوولەکەکان تا ئەم ساتە دوژمنایەتیان لەگەڵ عیسادا هەیە.

خاوەن ماڵ گوتی: تۆ کەسێکی ڕۆمیت و وەکو ڕۆمییەکانی تر پێتوایە کە دانایيت لە دانیشتوانی ئەم شارە زیاترە، کەچی هێشتا نەتزانیوە هۆکاری دوژمنایەتی جوولەکەکان لەگەڵ عیسادا چیە؟

گوتم: نەخێر.

پیاوە سریانییەکە بزێوییەکی کرد و گوتی: هۆی سەرەکی دژایەتی لەگەڵ عیسادا، هۆکاری ئابوورییە. پاشان درێژەی دایێ: نازانم بیستووتە یان نا کە قوتابییەکی عیسا، هەموویان کەسی هەژار و کەمدەرامەتن؟

گوتم: با، بیستوومە.

خاوەن ماڵەکەم گوتی: عیسا پیاوماقوڵ و دەوڵەمەندەکانی خۆش نەدەویست.و لەبریدا جووتیارە هەژارەکان و کرێکارەکانی خۆش دەویست و گەرەکی بوو بەدەستی ئەوان گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی گەورە لەم شارەدا دروست بکات.

پرسیم: چۆن دەیویست گۆڕان بکات؟

پیاوە سریانییەکە گوتی: پیلانی عیسا و قوتابیانی ئەوە بوو کە ئەمساڵ لە ڕۆژانی جەژنی گەورەی جوولەکەکاندا شۆڕش بکەن و هێرش بکەنەسەر پەرستگا و وێرانی بکەن و ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکانیش بکوژن و، پاش ئەوەی کە ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکانیان لەناو برد، ئەنجومەنێکی تر دروست بکەن کە ئەندامەکانی پێك هاتبن لە جووتیارە هەژارەکان و کرێکارەکان و، ئەوان سەروەت و سامان بەسەر خەڵکدا دابەش بکەن.

پرسیم: چۆن دەیانتوانی سەروەت و سامان دابەش بکەن؟

پیاوە سریانییەکە گوتی: پیلانی عیسا و پەیڕەوانی ئەوە بوو کە ئەو زەویانەی بۆ کشتوکاڵ دەبێ، لە سەرمایەدارەکانی بسێنێتەوە و بەپێی بژێویان، زەویان بدەنێ و ئەوەی کە دەمێنێتەوە لەنێوان جووتیارە هەژارەکاندا دابەشی بکەن تاوەکو لەم شارەدا هەموو جووتیارەکان بەقەدەر یەکتر زەوییان هەبێت بۆ کشتوکاڵ کردن. کاتێ گەورەپیاوانی جوولەکە لەم مەسەلەیە ئاگادار بوونەوە، زانییان کە ئەگەر عیسا بە زیندوویی بمێنێتەوە، زەوی و زارە فراوانەکانیان لەدەست دەچێت و بڕیاریان دا عیسا بکوژن تا سەروەت و سامانەکەی خۆیان بپارێزن.

گوتم: من پێم وانییە ئەم مەسەلەیە ڕاست بێت، چونکە عیسا گوتوویەتی کە قەڵەمڕەوەکەی لەم جیهانەدا نییە. هەرکەسێکیش بڵێ کە دەستەڵاتەکەی لەم دنیایەدا نییە، ئەوا بۆی نییە لەسەر مەسەلەی ماددی بڕیار بدات. هەروەها بیستوومە کە گوتوویەتی ((هەرگیز بە خراپە پاداشتی خراپە مەدەنەوە و ئەگەر کەسێك شاپێکی لەلایەکی ڕوخسارت دا، ئەوا ئێوە لایەکەی دیکەشتان بخەنە بەردەستی)). ئایا دەکرێ

پیاوێك كە خاوەنی ئەم بیروباوەڕە بێت، بیەوێ پەرستگای یەهوودییەكان وێران بكات و هەموو ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەكان بكوژێت و بەزۆر و زۆرداری، سەروەت و سامانی گەورەپیاوەكان و دەوڵەمەندەكان زەوت بكات و لەنێوان خەڵكانی دیكەدا دابەشی بكات؟

خاوەن ماڵەكەم گوتی: لەم شارەدا هەموویان ئاگایان لەم مەسەلەیە هەیە و تۆ لە هەریەكێ بپرسی، بەم شێوەیە وەڵامت دەداتەوە كە عیسا ویستوویەتی پەرستگاكە وێران بكات و ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەكان بهێنێتە كوشتن و زەوی و زاری سەرمایەدارەكان لەنێو هەژارەكاندا دابەش بكات.

گوتم: من پێموایە كە ئەم پڕوپاگەندانە، ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەكان و سەرمایەدار و پیاوماقوڵەكان دروستیان كردووە تاكو بتوانن پیاوێكی بێ ئازار و چاكەكار بكوژن.

كابرای سریانی گوتی: تۆ دەڵێیت كە عیسا گوتوویەتی دەسەلاتەكەی لەم جیهانەدا نییە و لە دنیایەكی تردایە، لەكاتێكدا كە هەركەسێ بێتە ئەم دنیایە، دەبێ پابەند بێ بە یاساكانی ئەم جیهانەوە. ئەگەر دەسەڵاتی عیسا لەم دنیایەدا نەدەبوو، كەواتە بۆچی هاتە ئەم دنیایەوە و بۆچی كۆمەڵێك كەسی هەژار و كەمدەرامەتی لەدەوری خۆی كۆكردەوە؟ بۆچی بەوانی گوت كە ئەو مەسیحە و مزگێنی دا بە كەسانی كەمدەرامەت و هەژار كە ئەوان لەژێر دەسەڵاتی ئەودا بە خۆشبەختی دەگەن؟ چۆن عیسا دەیتوانی لەم وڵاتەدا كەسانی كەمدەرامەت و هەژار -كە ژمارەیەن لە دەوڵەمەندەكان زیاترە- خۆشبەخت بكات؟ ئایا شتێكی جیا لەمەبوو كە دەبوو سەرمایەی دەوڵەمەندەكان زەوت بكات و لەنێوان كەسە هەژارەكاندا دابەشی بكات؟ من دڵنیام كە ئەگەر عیسایان نەكوشتایە و ڕۆمییەكان لە جەژنی گەورەی ئەم ساڵدا پاسەوانییان نەكردایە و هێزی خۆیان لەم شارەدا بڵاو نەكردایەتەوە و "پونتوس پیلات"ی فەرمانڕەوای گشتی نەهاتایە بۆ ئەم شارە و لە قەڵای "ئەنتۆنییە"دا نیشتەجێ نەبوایە، ئەوا لاینگرانی عیسا ڕادەپەڕین و دەستیان دەدایە كوشتنی بەكۆمەڵ و تاڵانكردن و هەروەها دوكانەكەی من دەدزرا و دەیانسوتاند و منیان دەكوشت و ژن و منداڵەكانیان دەفڕاند.

گوتم: لەمە زیاتر لەسەر ئەو بابەتە قسەت لەگەڵ ناکەم و مەبەستم ئەوە بوو کە بزانم لە کوێ دەتوانم شەمعونی خەڵکی کورن بدۆزمەوە.

خاوەن ماڵ ناونیشانی ماڵی شەمعونی پێدام و پاشان بەڕێ کەوتم.

کاتێ گەیشتمە ماڵی "شەمعون"، نزیکی نیوەڕ بوو، سەیرم کرد دەرگای ماڵەکە داخراوە. تەقەم لە دەرگا دا و ئافرەتێك – کە دیاربوو خزمەتکارە– دەرگاکەی کردەوە و هەرکە منی بینی، ڕوخساری داپۆشی.

من سلاوم لێ کرد و گوتم: هاتووم شەمعونی خەڵکی کورن ببینم.

ئافرەتەکە گوتی: شەمعون ماندووە و لە ژوورێکی نیوەتاریکدا خەوتووە.

من ناوی خۆم پێ گوت و ناوی ئاریستانووسم (ئەو پارەگۆڕەوەی کە هەندێك پارەم لەلای بوو) هێنا تا ئەو ئافرەتە بزانێ لەم شارەدا نەناس نیم و کەسێکی ناسراو هەیە من بمناسێ. ئینجا گوتم: من هاتووم شەمعون ببینم تاوەکو لەبارەی بابەتێکەوە، کە دەزانم حەزی پێ دەکات، گفتوگۆی لەگەڵ بکەم.

ئافرەتەکە بەبێ ئەوەی دەرگاکە دابخات، گوتی: هەرلەوێ بە تا دەگەڕێمەوە.

من لە چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەو ئافرەتەدا خۆم بە تەمەشای ماڵەکەوە خەریك کرد و سەیرم کرد ئەو خانووەیان بە شێوازی یۆنانی دروست کردووە و، حەوزێکی مۆزاییك لە ناوەڕاستی حەوشەکەدایە کە نیگاری جوانی ماسی و باڵندەکانی لەسەر نەخشێنرابوو، ئەمە لەکاتێکدایە کە لە ئایینی جوولەکەکاندا وێنەی گیانداران قەدەغەیە. حەوزەکەیان بەجۆرێك دروست کردبوو کە دەیانتوانی لە ئاوی باران، کە لەسەربانی ماڵەکە دەهاتە خوارەوە (لە کاتی باران بارینددا)، حەوزەکە پڕ بکەن لە ئاو. لە تەنیشت دیوارەکان و لەسەر پایەکان، بە بەرزی سەد پێوانە، گوڵدانی جوانی یۆنانی (کە یەکی گوڵێکیان تێدابوو) دەبینران.

هەرکەسێ ئەو ماڵەی بدیایە، وایدەزانی خاوەن ماڵەکە یۆنانییە یانیش لەو کەسانەیە کە خووی گرتووە بە یۆنانییەکانەوە و زەوق و سەلیقەی ئەوان بەکار دێنێ.

من چاوەڕوان بووم ئەو ئافرەتە خزمەتکارە بگەڕێتەوە، بەلام نەهات و لە جیاتیدا غولامێکی یۆنانی دەرکەوت. بۆیە دەڵێم ئەو غولامە یۆنانی بوو، چونکە جلێکی وەکو غولامەکانی یۆنانی لەبەردا بوو.

پۆشاکی غولامەکە لە کەتانی سپی بوو و زۆر جوان دوورابوو، سەیرم کرد مووەکانی سەری ماش و برنجە، واتە وادیاربوو بەتەمەنە و دوو داری درێژی کتێبێکم لە بنباڵیدا بەدی کرد.[٣١]

کاتێ کە غولامەکە نزیك بوویەوە، سەیرم کرد چاوەکانی زۆر سوورە و بۆم دەرکەوت کە هۆی سوورهەڵگەڕاوی چاوەکانی، بەهۆی خوێندنەوەی زۆرەوەیە لەژێر ڕۆشنایی لاوازدا، چونکە منیش کاتێك لەبەر ڕووناکی لاوازدا بۆ ماوەیەکی زۆر کتێب بخوێنەوە، چاوەکانم سوور هەڵدەگەڕێن.

غولامە ڕۆمییەکە وەکو نەریتی ڕۆمییەکان سلاوی لێ کردم و منی بردەماڵەوە و لە تەنیشت خۆی داینیشاندم و گوتی: لێرە بە تا گەورەم دێت.

من دانیشتم و ئەو غولامە، ئەو کتێبەی کە لە بنباڵیدا بوو، گرت بەدەستەوە و داری کتێبەکەی سووڕاند.

من سەیرێکی کتێبەکەم کرد و پرسیم: ئەمە چییە کە دەیخوێنیتەوە؟

غولامە یۆنانییەکە گوتی: کتێبی یەکێ لە پێغەمبەرەکانی یەهوودییە.

گوتم: کتێبی "ئەشعیا" نییە؟

غولامەکە بەم وشەیە سەرسام بوو و پرسی: چۆن زانیت ئەم کتێبە چییە، تۆ غەیبزانیت؟

گوتم: من غەیبزان نیم، بەڵکو پێشتر ئەم کتێبەم بینیوە، بەڵام دەمەوێ بزانم تۆ بۆچی ئەم کتێبەی "ئەشعیا" دەخوێنیتەوە؟

غولامەکە گوتی: من خۆم حەزم لە خوێندنەوەی ئەم کتێبە نییە، بەڵکو من ڕاهێنەری دوو منداڵی ئاغاکەی خۆمم و بۆئەو دوو منداڵەی دەخوێنمەوە و هەندێ جاریش بۆ ئاغاکەم دەخوێنمەوە.

پاشان لێم پرسی: چی لە زانستی "ڕۆمانی" دەزانی؟

---

[31] لەو سەردەمەدا کە دەتوانین بڵێین سەدەی یەکەمی زاینی بووە، هەموو کتێبەکان بە شێوەی (تۆمار) دەنووسرا و دارێکی خڕو درێژیان لە سەرەتای کتێبەکە دادەنا و دارەکەی تریش لە کۆتاییەکەیدا بەجۆرێك سەرەتا و کۆتایی ئەو کتێبە بە چەسپ دەبەسترایەوە بەو دوو دارەوە و کاتێ بیانویستایە ئەو کتێبە بکەنەوە، ئەوا یەکێ لەو دارەیان بە هێواشی دەسووڕاندەوە هەتا کتێبەکە زیاتر بخوێنرایەتەوە، (تۆمار)ەکە زیاتر بەدەوری دارەکەدا دەپێچرا تا دەگەیشتە کۆتایی کتێبەکە و ئینجا دارەکەی دووەمیان دەسووڕاند تاکو (تۆمار)ەکە بەدەوری ئەوەدا بپێچرێت و کتێبەکە بێتەوە باری جارانی و دیسانەوە ئامادە بکرێت بۆ خوێندنەوە و، هەربۆیە نووسەری ئەو کتێبە دەڵێت کە دوو داری کتێبێکم لەژێر باڵی غولامە بەتەمەنەکەدا بینی.

غولامەکە گوتی: زانستی ڕۆمیی بوونی نییە، چونکە ئەوەی لە ڕۆمانیا لەبارەی زانستەوە کەوتۆتە بەرگوێی خەڵك، ئەوشتانەیە کە لە یۆنانییەوە وەریانگێڕاوە. پیشەی یەهوودییەکان ئەوەیە کە زانستی یۆنانی وەربگێڕن و پاشان وای نیشان دەدەن کە ئەو زانستە هینی خۆیانە.

من مافم دا بە غولامەکە کە شانازی بە زانستی یۆنانییەکانەوە بکات و، پێش ئەوەی وەڵامی ئەو بدەمەوە، شەمعونی خەڵکی کورن دەرکەوت.

سەیرم کرد عەبایەکی داوە بە شانیدا و ریشە درێژەکەی شانە نەکردووە. شەمعون کابرایەکی بەهێز بوو. خاوەنی دوو دەستی گەورەی وەکو دەستی جووتیارەکان بوو.

کاتێ گەیشتە لای من، بەبێ ئەوەی سڵاو بکات، دانیشت و کەمێك بەتوڕەییەوە گوتی: کابرای ڕۆمی، ئیشت بە من چیە و بۆچی دەتویست بمبینی؟

پێش ئەوەی من قسە بکەم، شەمعون بە غولامە یۆنانییەکەی گوت دوور بکەوە و پاش ئەوەی کە دوور کەوتەوە من گوتم: شەمعون، هەروەك بیستوومە تۆ خۆشەویستیت بۆ عیسا هەبووە و تەنانەت لە نیوەی ڕێگادا خاچەکەیت هەڵگرتووە، چونکە بینیوتە ئەو، توانای هەڵگرتنی خاچەکەی نییە. ئەوەشم بیستووە کە تۆ ویستووتە لەگەڵ قوتابییەکانی عیسادا گفتوگۆ بکەیت، بەڵام ئەوان ئامادە نەبوون پێشوازیت لێ بکەن. ئێستە من هاتووم پێت بڵێم کە منیش حەزدەکەم ڕێگەی ڕاست بدۆزمەوە، جا ئەگەر دەتوانی، لە دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست هاوکاریم بکە.

شەمعونی خەڵکی کورن کەمێك بێدەنگ بوو و پاشان گوتی: من نازانم تۆ چی دەڵێیت و مەبەستت لە ڕێگەی ڕاست چییە؟ ئەوەی دەیزانم ئەوەیە کە چەند ساڵێك لەمەوپێش من ڕێگەی خۆم دۆزیوەتەوە و توانیومە سەرکەوتوو بم.

لەو کاتەدا بۆم دەرکەوت کە شەمعون وەکو غولامەکان سەری کەچەڵ کردووە و بەبێ ئاگایی چاوم بە قولەپێی کەوت تاکو بزانم ئەو نیشانەیەی کە بازنەی ئاسنین لەسەر قولەپێی غولامەکان لەسەر گۆشت و ئێسکەکەی دایدەنێت، لەسەر قولەپێی ئەویش دەیبینم یان نا. بەڵام شەمعون بەپەلە هەردوو قاچی خۆی کرد بەژێر مێزەکەوە و لە چاوانم ونی کرد و پاشان بە چەکوشێکی دارین لەبەردێکی بچووکی دا بۆئەوەی بە دەنگی ئەو بەردە، خزمەتکارەکەی ئاگادار بکاتەوە.

پێش ئەوەی خزمەتکارەکە بێت، گوتی: کابرای ڕۆمی، تۆ پیاوێکی بزێویت و دەتوانیت سەیری قولەپێکانی من بکەیت. من دان بەوەدا دەنێم کە لە کۆندا غولاّم بووم، بەلاّم دە ساڵ پێش ئێستا ئازاد بووم و لە "کورن" بە کارکردنەوە خەریك بووم و توانیومە بە بازرگانی دانەوێڵە دەوڵەمەند ببم، ئینجا هاتم بۆ ئەم شارە و ئێستاش لێرە، هەروەك دەبینی وەکو پیاوێکی ئازاد بە خۆشی دەژیم. من دوو کوڕم هەیە کە لەژێر دەستی کابرایەکی یۆنانییدا پەروەردە کراون و هیوادارم ڕۆژێ بتوانم ڕەگەزنامەی ڕۆمیی بۆ هەردوو کوڕەکەم بکڕم.

لەو کاتەدا خزمەتکارێك دەرکەوت کە تەبەقێکی بەدەستەوە بوو. کاتێ تەبەقەکەی خستە سەر زەوی، سەیرم کرد ئاو و هەنگوین و نانی شیرینی و نانی ئاسایی و چەند جۆرێك سەوزەی لەناودایە.

خزمەتکارەکە دەفرێکی دا بەدەستمەوە و کەمێك ئاوی تێ کرد و نانی شیرینی و هەنگوینی پێشکەش کردم. من کەمێك هەنگوینم هەڵگرت و خواردم و پاشان قومێ ئاوم خواردەوە.

پاشان بینیم شەمعون لەتێ نانی هەڵگرت و کەمێ سەوزەی خستە سەری و بردی بۆ دەمی و خواردی و قومێ ئاویشی خواردەوە. پاشان گوتی: ئەم ئاوە هێنی سەرچاوەیەکە کە زۆر لەم شارەوە دوورە و ئاوێکی زولاڵە و من ئەم ئاوە لە هەموو خواردنەوەکانی دیکە بە باشتر دەزانم.

ئینجا ڕوونی کردەوە: کاتێ من گەنج بووم، وەکو باوك و باپیرم غولاّم بووم و، بۆ کارکردن منیان برد بۆ "کورن" کە دەکەوێتە "ئەفریقیا"وە و ڕەنگە تۆ بزانی کە دوو "کورن" هەیە، یەکێکیان دوورگەی کورنە و ئەوی تریان خاکی کورنە لە ئەفریقیا.[32] لەوێ ئێمە هەموو ڕۆژێك لەژێر تیشکی هەتاوی گەرمی ئەفریقیادا کارمان دەکرد و، خواردنمان بریتی بوو لە نانێك کە بە ئارد و جۆ و نۆك و سۆس (کەپەك) دروست دەکرا. من ئەوکاتە هەر حەزم لە نانی شیرین و شەراو دەکرد، بەلاّم پاش ئەوەی کە ئازاد کرام و توانیم نانی شیرین بخۆم و شەراو بخۆمەوە، زانیم کە لە نانی ئاسایی چێژی زیاتر وەردەگرم و ئاو لە دەممدا زولاڵترە لەچاو شەراب. پاشان بە ئەزموون بۆم دەرکەوت کە خواردنە چەورەکان و کەبابی گۆشتی مەڕ و ئاسك، قورس و بێزارم

---

[32] سەرزەمینی کورن لە ئەفریقیا، ناوچەیەکە کە ئەمڕۆ ناوی (سیرنائیك)ە و دەکەوێتە خاکی (لیبیا).

دەکەن، لە کاتێکدا کە نان و سەوزەی تازە و ئاوی کانی دەبێتە هۆی ئەوەی جەستەم سوک ببێت و بە ئاسوودەیی بنووم و هەست بە ماندوویێتی جەستەم نەکەم.

من لەگەڵ ئەوەی کە ماوەیەك بوو ئازاد بووم، بە ئێستاشەوە توانیم وەکو نەریتی سەردەمی غولامیم کە بووە بە یەکێك لە قۆناغەکانی ژیانم، لەسەر زەوی ڕەقەلان بخەوم و، دۆشەك و باليف بەکار نەهێنم، چونکە ئەگەر لەسەر دۆشەك بخەوم و باليف بخەمە ژێر سەرم، خەوم لێ ناکەوێت.

ئەم ڕۆژانە کاتێ لە بیابان کاری کرێکارەکانم تەواو دەبێت و کرێکانیان پێ دەدەم، لقە وشکەکانی ئەو درەختانەی کەوتوونەتە سەر زەوی، کۆ دەکەمەوە و دەیخەمە ناو عەباکەمەوە و بۆ سووتاندن، دەیانهێنمەوە بۆ ماڵەوە. کاتێ خەڵك ئەم کارەی من دەبینن، پێدەکەنن و بە ڕژدم دەزان، لەکاتێکدا من خووم بەم کارەوە گرتووە نەك بەرچاوتەنگ بم.

کاتێ من منداڵ بووم، خووم گرتبوو بەوەوە کە لە بیابان سووتەمەنی بۆ دایکم کۆبکەمەوە. ڕۆژێکیان، کاتێ لە بێستانی یەکێ لە جووتیارەکاندا خەریکی کۆکردنەوەی دارە وشك بووەکان بووم، غافڵگیریان کردم و ئەوەندەیان لێدام کە بێهۆش کەوتم. بەڵام ئەمڕۆ من لە بێستانی خەڵکدا داری وشك کۆناکەمەوە، بەڵکو لە زەوی خۆمدا دار کۆدەکەمەوە و دەیهێنمەوە بۆ ماڵەوە تاکو بۆ سووتاندن بەکاری بهێنم.

خەڵك لەزەوییەکەی مندا داری وشك کۆدەکەنەوە و دەیبنەوە بۆ ماڵەوە و منیش چاوەکانی خۆمیان لێ دادەخەم، مەگەر کاتێ بزانم کە دەیانەوێ میوەکانم ببەن، ئیتر ئەوکاتە قسە دەکەم و ناهێڵم هیچ کەسێ دەست لە میوەی درەختەکانەوە بدات، چونکە دەزانم کە ئەگەر ئەمڕۆ میوە ببەن، ئەوا سبەی دارەکان لە ڕەگەوە هەڵدەکێشن.

کاتێ من غولام بووم، لە بەیانییەوە تا ئێوارە بەبێ وەستان کارم دەکرد و دەرفەتی پشوودانم نەبوو. بەڵام ئەمڕۆ من لەنیوەی ڕۆژدا پشوو بە کرێکارەکانی خۆم دەدەم و ئەوان دەتوان یەك کاتژمێر بخەون و دوای ئەوەی کە لەخەو هەستان، ئیزنی ئەوەیان هەیە نوێژ بکەن و دەست بەکار بکەن.

گوتم: پێش ئەوەی بێیت بۆ ئێرە، بارودۆخی ژیانت چۆن بوو؟

شەمعون گوتی: لەو ڕۆژەوەی هاتووم بۆ ئێرە، ژیانم باشە و بەوجۆرەی کە دەیبینی، ماڵەکەی خۆم لەسەر شێوازی یۆنانییەکان دروست کردووە. بەڵام من کەسێك

نیم کە بەهۆی ماڵی باش و پارەوە لەخۆم بایی ببم و، ئەمڕۆ هەرچەندە کابرایەکی سەرمایەدارم، بەڵام وەکو ئەو سەردەمە دەژیم کە کۆیلە بووم.

گوتم: شەمعون، من خۆشحاڵم کە دەبینم سەرمایە مەستی نەکردویت و خۆت ون نەکردووە. لە وڵاتی ئێمەی ڕۆمی، کەسەکان هەتا ئەو کاتەی کە هەژارن، بێ ڕۆزن و هەرکە دەوڵەمەند دەبن، بەسەر خەڵکدا ڕۆز لێ دەدەن. لەوێ هەرکەسێ کە دەوڵەمەند دەبێ، بڕێ پارە دەدات بە حکومەتی ڕۆم تا بتوانێ ناوبانگی پێ پەیدا بکات و بە پاڵپشتی ئەو ناوبانگیەوە، بەسەر خەڵکدا فیز بکات، بەڵام تۆ لەم نەنگییەوە دووریت، بەڵام من ئەمڕۆ بۆئەوە هاتووم بۆ ماڵەکەت، چونکە بیستوومە کە عیسات بینیوە و دەمویست لێت بپرسم کە چ شتێ لە عیساوە فێر بوویت؟

کاتێ شەمعون ناوی عیسای بیست، چووە ناو خەیاڵەوە و پاشان لێی پرسم: چۆن بوو عیسا چۆتە دڵتەوە؟

گوتم: من گەشتم کرد بۆ ئەم شارە تا لەکاتی جەژنی گەورەی یەهوودییەکان لەم شارەدا بم و پەرستگای یەهوودییەکان ببینم. کاتێ گەیشتمە ئێرە، سەیرم کرد عیسایان لە نزیك دەروازەکەوە لەخاچ داوە و سێ ڕۆژ دوای ئەوەی کە خستیانە گۆڕەوە، لەناو گۆڕەکەدا دیار نەماوە. من لەخۆم ڕابینا تا لەبارەی عیساوە زانیاری بەدەست بخەم بۆئەوەی بزانم کێ بووە و چی کردووە. بیستوومە ئەو ڕۆژی کە دەیانویست بیبەن بۆ لەسێدارەدان، لەنیوەی ڕێگادا تۆ خاچەکەیت گرتووە بەکۆڵەوە و ئێستا هاتووم لێت بپرسم کە ئایا عیسا قسەی لەگەڵت کردووە و هیچی پێت گوتووە یان نا؟

شەمعون گوتی: عیسا قسەی لەگەڵ من نەکرد، بەڵام چەند جارێك سەیری کردم.

گوتم: چی بوو کە تۆ لەخۆت ڕابینا خاچی عیسا هەڵبگریت؟

شەمعون گوتی: من ئەهلی سیاسەت نیم و دەمەوێ بەجۆرێك بژیم کە کەس دوژمنایەتیم لەگەڵ نەکات. ئەو ڕۆژەی کە عیسایان دەبرد بۆ لەخاچ دان، من لەکێڵگە و بیستانەکەم دەگەڕامەوە کە لە دەرەوەی شاردایە و کاتێ گەیشتمە لای عیسا کە لەژێر کێشی قورسی خاچەکەی خۆیدا بوو، زۆر داماو و گیرۆدە بوو و، بە زەویدا کەوتبوو.

پێم گوتی کە من کەمێك وەکو ئەو سەردەمە دەژیم کە غوڵام بووم و، بەتایبەت کاتێ لە کێڵگە و بێستانەکەی خۆمدا بەکارەوە خەریك دەبم، لەگەڵ کۆیلەیەکەدا

جیاوازیم نییە. ئەو ڕۆژەش بە جلوبەرگی دڕاوەوە گەڕامەوە بۆ شار و کاتێ عیسا بە زەویدا کەوت، ئەفسەرێکی ڕۆمی کە پلەی سەنتوریونی هەبوو و لەگەڵ مەحکومەکاندا بوو، منی بینی.

تۆ ئەبێ ئەوە بزانیت کە ڕۆمییەکان خەڵکێکی خۆپەرست و خۆبەزلزان و زۆردارن. ئەفسەرە ڕۆمییەکە، هەرکە منی بینی و سەیری کرد کە بە ڕووکەش هەژارم و وەك غولاَم وام، فەرمانی دا خاچەکە بگرم بەکۆڵمەوە و منیش لەبەرئەوەی کە بە فەرمانی سەردەمی غولاَمی ڕاهاتبووم بە گوێڕایەڵی، خاچەکەم دا بەکۆڵمدا. لەو کاتەدا عیسا لەجێی خۆی هەستایەوە و کاتێ خاچەکەی خۆی بەکۆڵی منەوە بینی، تا ماوەیەکی زۆر هەر سەیری دەکردم.

پرسیم: ئایا عیسا پاش ئەوەی کە بینی خاچەکە بەکۆڵی تۆوەیە، هیچی نەگوت؟

شەمعون گوتی: نەخێر، ئێمە بەردەوام ڕێمان دەبڕی. عیسا زۆر لاواز ببوو و بە زەحمەت هەنگاوی دەنا و هەندێ جار دەیناڵاند تا گەیشتینە جێگایەك كە دەبوو ئەو سێ کەسە لەخاچ بدەن و، لەوانەیە تۆش بزانی کە ئەو دوو تاوانبارەی دیکە کە لەهەر دوو تەنیشتی عیسادا لەخاچ دران، دز بوون. لەوێ بەپێی بەرنامەکەیان، عیسایان لەخاچ دا و، کاتێ جەلادەکە بە چەکوش، مێخی بە مەچەکی دەستەکانی عیسادا دادەکوتا، ئەو بە نیگایەکی درێژخایەن کە نیشانەی ئازارکێشانی پێوە دیاربوو، سەیری منی کرد و، منیش ئەوەندە بە نیگاکەی شێوام کە بۆم دەرکەوت خۆم بۆ ڕاناگیرێت و بەرێ کەوتم و خۆم گەیاندە ئەم ماڵە.

پرسیم: تۆ چۆن لەبەرامبەر نیگای عیسادا شێوایت؟

شەمعون گوتی: یەکەمجارم نەبوو کە لەخاچدانی کەسێك ببینم، بەڵکو چەندین جار لە تەمەنمدا لەخاچدانی غولاَمان و تاوانبارانم بینیوە. من هەندێك غولاَمم دیوە کە پاش کوشتنی کەسێك، ڕاستەوخۆ خۆشیان لەخاچ دراون و لەسەر خاچەکەدا قسەی نەشیاویان گوتووە و یانیش گاڵتەیان کردووە، هەروەها هەندێ تاوانبارم بینیوە کە پاش ئەوەی مێخەکەیان داکوتاوە بە مەچەکی دەستیاندا، بەهۆی ترس و ئازاری زۆرەوە گیانیان سپاردووە.

هیچ یەکێ لەو دیمەنانە منیان پەرێشان نەکردووە، چونکە کەسێ کە غولاَم بێت ئەوەندە دەکەوێتە بەر ستەم و زۆرداریەوە کە بینینی ئەو دیمەنە ستەمکارییانە کاری

لێ ناکات. تۆ ئەگەر پێستی من ببینی، دەزانی کە بەنیشانەی برینە کۆنەکان داپۆشراوە و ئەو برینانەش بەهۆی لێدانەکانی قامچییەوەیە کە لێیان دابووم. کەسێ کە لە سەردەمێکی درێژخایەنی تەمەنی خۆیدا، هەمیشە قامچی لێدراو بێت، بە بینینی پیاوێك کە درابێتە بەر قامچی، دڵی تەنگ نابێ.

بەڵام ئەو ڕۆژە، نیگای درێژخایەنی عیسا کە نیشانی دەدا ئازار دەکێشێ، بەجۆرێك منی هەژاند و پەرێشانی کردم کە بە خۆم گوت: ئەگەر ڕابووەستم، لەوانەیە لەهۆشی خۆم بچم. ئەوەبوو کەکاتێ هاتمەوە بۆناو شار و هاتمەوە بۆ ماڵەوە، چوومە ژوورێکی تاریکەوە و عەباکەی خۆم دا بەسەرمدا، بەڵام بۆ ساتێکیش دیمەنی عیسا لەبەرچاومدا لا نەدەچوو، هەروەها نیگاکەی و ئەو تاجە دڕکاوییەم لەبیر نەدەچۆوە کە بەسەریەوە بوو.

ئەو کاتەی بوومەلەرزەکە ڕووی دا و ڕۆژی دوای بوومەلەرزەکە لە ماڵی خۆم هاتمە دەرەوە و بیستم کە عیسا لەناو گۆڕەکەی هاتۆتە دەرەوە. ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای جوولەکەکان دەیانگوت کە قوتابییەکانی عیسا ئەو پاسەوانانەیان مەست کردووە کە لە تەنیشت گۆڕەکەدا بوون تا بتوانن تەرمەکەی عیسا لە گۆڕ دەربهێنن و بیبەن و پاشان بانگەشەی ئەوە بکەن کە گوایە زیندوو بۆتەوە. بەڵام من باوەڕ بەم پڕوپاگەندەیە ناکەم و بەدرۆی دەزانم. ئەو پیاوەی کە من بینیومە کە بەو شێوەیە سەیری منی کرد، ئەوەندە بەهێز بوو کە بتوانێ خۆی لە گۆڕ دەربکات و ژیانی نوێ بەدەست بهێنێتەوە.

تۆ هاتووی بۆ ئێرە تا لەمن بپرسی کە ئایا عیسا چی پێ گوتووم، بەڵام من جگە لەمانەی کە پێتم گوت، هیچم نییە پێتی بڵێم و، ئێستەش من داوا لەتۆ دەکەم تا لەبارەی عیساوە زانیاریم بدەیتێ.

گوتم: من لەبارەی عیساوە، جگە لەوەی کە هەمووان دەیزانن، هیچ زانیاریەکی دیکەم نییە، چونکە کاتێ ئەو زیندوو بوو، من نەمبینیوە تا گفتوگۆی لەگەڵ بکەم. بەڵام دەتوانم ئەوە بڵێم کە عیسا کابرایەکی زۆر گەورە بوو.

پاشان لە "شەمعون"م پرسی: ئایا تۆ شوێنکەوتووانی ئەو دەناسیت و دەتوانی پێم بڵێی لەکوێ دەتوانم بیانبینم و گفتوگۆیان لەگەڵ بکەم؟

شەمعون گوتی: من شوێنکەوتووانی عیسا ناناسم و لەبەرئەوەی کە ئەهلی سیاسەت نیم، نەمتوانیوە بیاندۆزمەوە؟ بەڵام ئەوەندە دەزانم کە ئەوان بە نیشانەی

تایبەتی یەکتر دەناسنەوە و هەروەها دەزانم کە هاتنی عیسا، لە کتێبی "ئەشعیا"ی پێغەمبەری کوڕانی ئیسرائیلدا پێشبینی کرابوو. ئەمڕۆژانە کتێبی ئەشعیا ئەوەندە گران بووە کە من یەك "تۆماریم" بەتازەیی بە پێنج بەرامبەری بەهای یەکەمی کڕیوە و گوتم کەمێك لەو کتێبەم بۆ بخوێنەرەوە تاکو بزانم لەبارەی عیساوە چییان نووسیوە.

گوتم: تۆ کە کتێبی "ئەشعیا"یان بۆ خوێندوویتەوە، پێتوایە عیسا هەمان ئەو مەسیح و ڕزگارکەرەیە کە هاتۆتە سەر زەوی کە خاچەکەیشیت هەڵگرتووە؟

شەمعون گوتی: ئێستا کە تۆ ئەم قسەیەت کرد، پێموایە دەکرێ عیسا هەمان مەسح بێت کە لە کتێبی ئەشعیا لەبارەیەوە نووسراوە.

گوتم: ئەگەر عیسا هێزێکی سەیری نەبووایە نەیدەتوانی مردوو زیندوو بکاتەوە و لەدوای سێ ڕۆژ لە مردنی، لە گۆڕ بێتە دەرەوە. زیندوو کردنەوەی مردوویەك نیشانەی ئەوەیە کە زیندووکەرەوەکە خاوەنی هێزێکی خوداییە، چونکە مەحاڵە مرۆڤ بتوانێ بە هێزی مرۆڤانە مردوویەك زیندوو بکاتەوە.

شەمعون گوتی: عیسا پەرجوویەکی کرد کە گەورەتر بوو لە زیندوو کردنەوەی مردوو.

پرسیم: ئەو پەرجووە چیی بوو؟

شەمعون گوتی: ڕۆژێ عیسا لە شاری "ئەریحا"دا[33] قسەی دەکرد. لەو شارەدا کابرایەك هەبوو ناوی "زاخوس" بوو کە باجی وەردەگرت، ئەو پیاوە بۆئەوەی باشتر عیسا بناسێت، چووە سەر درەختێکی بەرز. عیسا ئەوی بینی و ئاماژەی پێ کرد کە لەسەر دارەکە بێتە خوارەوە و زاخوس لەسەر دارەکە هاتە خوارەوە و گوتەکانی عیسای بیست و پاشان عیسا چوو بۆماڵەکەی. گوتەکانی عیسا ئەوەندە کاری لە زاخوس کرد کە نیوەی سەروەتەکەی خۆی بەخشی بە هەژار و نیازمەندەکان. من ئەم مۆجیزەیەی عیسا لە زیندووکردنەوەی مردوو بە گەورەتر دەزانم.

کەسێ خاوەنی هێزێك بێت کە لە سەرووی مرۆڤەوە بێت، دەتوانێ مردوویەك زیندوو بکاتەوە و لەناو گۆڕ هەستێتەوە تاکو بڕوات لەڕێ. بەڵام هەمان کەس ناتوانێ دەوڵەمەندێك -ئەویش کە وەرگرێکی باج بێت- کە لەهەموو تەمەنیدا دەستی نوقاو

---

[33] (ئەریحا) کە یەکێك بوو لە شارە ناسراوەکانی (فەلەستین) کە بە پێی مێژووی کۆن (یوشەع)ی پێغەمبەری ئیسرائیلی ئازاد کرد و، لە سەردەمی حەزرەتی عیساشدا ئەو شارە هەبووە.

بووە، والێ بکات نیوەی سەروەت و سامانەکەی خۆی ببخشێ بە هەژار و کەم دەرامەتەکان. تەنیا هێزێکی خودایی دەتوانێت ئەم کارە بکات.

گوتم: تۆ زاخوسی وەرگری باج دەناسی؟

شەمعون گوتی: بەڵێ.

گوتم: وا باشە من و تۆ بەڕێ بکەوین و بڕۆین بۆ شاری ئەریحا و بە زاخوسم پێ ئاشنا بکەیت تاکو بتوانیم لێی بپرسم کە کاتێ عیسا ڕۆیشتووە بۆ ماڵەکەی، چی پێ گوتووە کەوای لێکردووە نیوەی سەروەتەکەی خۆی ببەخشێ بە هەژارەکان.

شەمعون دوودڵ بوو و پاشان گوتی: لێرەوە تا "ئەریحا" ڕێگایەکی دوور و درێژە و هەروەها شەممە دەستی پێ کردووە و تۆش ئەوە دەزانی کە ئێمەی جوولەکە لە ڕۆژی شەممەدا کارناکەین.

پرسیم: ئایا لە ڕۆژی شەممەدا ناڕۆن لەڕێ.

شەمعون گوتی: ڕۆشتن لەڕێ و گەشت کردنیش کارە، ئەگەر ئێمە لە ڕۆژی شەممەدا گەشت بکەین، ئەوا بە پێچەوانەی یاساکانی ئایینی خۆمان ڕەفتارمان کردووە و هەربۆیەشە من ناتوانم لەگەڵت بێم بۆ ئەریحا، بەڵام ئەگەر تۆ حەز بکەیت، ئەوا دەتوانیت بەتەنیا گەشت بکەیت بۆ ئەریحا و لەوێ زاخوس ببینی.

# بۆچوونی شەمعون سەبارەت بە مردن و ژیان

گوتم: شەمعون، من و تۆ بیانین. تۆ لە "کورن"ەوە هاتوویت بۆ ئێرە و منیش لە "ڕۆم"ەوە. من وادەزانم کە چارەنووس وابووە من و تۆ لە دوو مەودای جیاوازەوە بێین بۆ ئێرە بۆئەوەی عیسا ببینین. بەڵام بەداخەوە کە لە دوایین ڕۆژەکانی ژیانی گەیشتین بە عیسا و نەمانتوانی گفتوگۆی لەگەڵ بکەین و لێی بپرسین کامە شارێگایە و، دەبێ لە کوێوە بۆی بگەڕێین. ئێستە دەبێ هەوڵ بدەین تاکو ڕێگای سەرەکی بدۆزینەوە و خۆمان بگەیەنینە مەودای ڕووناکی.

"شەمعون" کەمێ بە گاڵتەجاڕییەوە گوتی: من شارێگەی خۆم دۆزیوەتەوە و دەزانم مەودای ڕووناکی لە کوێیە. ڕێگەی سەرەکی بریتیە لەوەی کە مرۆڤ یاساکانی ئایینی جوولەکە پەیڕەو بکات بەبێ ئەوەی باوەڕی بە خورفاتەکانی هەبێت. من پێموایە کەسانی تر خەیاڵاتی ئایینی یەهوودییان هێناوەتە کایەوە نەك پێغەمبەرانی کوڕانی ئیسرائیل. بۆ نموونە "فەریسییەکان" دەڵێن ئەگەر موو بە مووی یاساکانی ئایینی جوولەکە پەیڕەو بکەین، ئەوا دەبینە خاوەنی ژیانێکی نوێ[34]. بەڵام من لەگەڵ بیروباوەڕی ئەواندا هاوڕا نیم و پێم وانییە مرۆڤ بتوانێ بەهۆی کردارە چاکەکانەوە ببێتە خاوەنی ژیانی تازە، بەڵام پەیڕەوکردنی کردارە چاکەکان بە پێوست دەزانم تا نەوەکانی ئادەم بتوانن لەم دنیایەدا بەخۆشی و ئاسانی بژین.

من بڕوام بە ژیانی پاش مەرگ – کە تەنانەت میللەتی ڕۆم و یۆنان بڕوایان پێی هەیە– نییە و پێموایە مرۆڤ پاش ئەوەی ماڵئاوایی لە ژیان کرد، ئیتر بۆ هەتایە لەناودەچێت. بەڵام دیسان دەیڵێمەوە کە کاری چاکەکردن بە پێویست دەزانم تاکو ئەو شتانەی لە کورنی باکوری ئەفریقیا بینیومن، لەناوبچن. ئەگەر تۆ لە کورنی باکوری ئەفریقیا بوویتایە و بتبینیایە کە لەوێ چۆن لەگەڵ کۆیلەکاندا ڕەفتار دەکەن، ئەوکاتە دانت بەوەدا دەنا کە دەبێ هەوڵ بۆ بەهێز کردنی ئەو بەشەی یاساکانی ئایین کە ئامانجەکەی چاکەکارییە، بدات.

---

[34] (فەریسییەکان) کە وشە تاکەکەی (فەریسی)ە، کۆمەڵێك بوون لە جوولەکەکان کە لە جێبەجێ کردنی یاساکانی ئایینی خۆیان، زۆر دەمارگیر بوون و بچووکترین لادان و کەموکورتیەکیان بە شایەنی کوشتن دەزانی.

ئەوەی کە من لە باکووری ئەفریقیادا بینیوومە ئەمڕۆش لەوێ هەر باوە و لەگەڵ بەندەکاندا بەجۆرێك ڕەفتار دەکەن کە لەگەڵ گیانەوەرەکانی تریشدا بەو شێوەیە ڕەفتار ناکەن. لەخاکی کورنی باکووری ئەفریقیا کە پەیوەستە بە ڕۆمەوە، کۆمەڵێك لە ڕۆمەکان بە دەستی غولامەکانیان هەندێ کاری گەورەی وەکو دروست کردنی شوێنی گەشتیاری و ڕێگاوبان و هەڵکەندنی ڕووبارەکانیان پێ کردوون و دەکەن و، سەگە دڕندەکانیش چاودێر و پاسەوانی غولامەکانن. ئەگەر غولامێك لە چوارچێوەی کارەکەی خۆی هەنگاوێکی زیاتر بنێت، ئەوا دەکەوێتە بەر هێرشی سەگە دڕندەکان و بۆئەوەی زیاتر دڕندە بن، بە گۆشتی غولامەکان، سەگەکان تێر دەکەن و هەموو سەگێك دەزانێ کە ئەگەر غولامێك پارچە پارچە بکات، ئەوا دەبێتە گۆشتی ژەمێك.

لەوێ بچووکترین سزای کۆیلەیەك، بریتیە لە سێدارەدان و هەرکاتێ ڕۆمییەکان بیانەوێ لە باکووری ئەفریقیا کۆیلەیەك لەسێدارە بدەن، ئەوا دەیخەنە بەر هێرشی سەگە دڕندەکان و، سەگە دڕندە و برسیەکانیش بەیەکجار، هێرش دەبەنە سەر غولامەکە و جەستەی پارچە پارچە دەکەن. من لە باکووری ئەفریقیا، واتە لە "کورن"، بینیومە میوانانەکانی ئاغا ڕۆمیەکان کە لە ڕۆمەوە دەهاتن تا لەگەڵیاندا شێوەی لەسێدارەدانی غولامێك ببین، کاتێ دەیانبینی کە سەگە دڕندەکان هێرش دەکەنە سەر غولامەکان، پێدەکەنین و ڕایاندەبوارد. من کاتێ ئەو دیمەنانەم دێتەوە یاد، سوپاسی خودا دەکەم کە ڕۆمی نەبووم.

گوتم: شەمعون، من ڕۆمیم، واتە ناسنامەی ڕۆمیم هەیە و دەشتوانم وەکو هەموو ئەو کەسانەی کە ناسنامەی ڕۆمییان هەیە، ئەڵقەیەکی زێڕ بکەمە پەنجە گەورەکەی خۆمەوە بۆئەوەی هەموو کەسێ من بناسێت و بزانێ کە پێویستە ڕێزم لێ بگرێت. بەڵام لەوکاتەوەی کەلە زانکۆی "ڕودس" خوێندوومە، بۆم دەرکەوتووە کە گەورەیی مرۆڤ بەنیشانەکانی ڕوخسار نییە، بەڵکو گەورەیی ڕاستەقینە ئەوەیە کە مرۆڤ لە ڕووی زانست و هزرەوە لە کەسانی تر لەپێشتر بێت. من لەو زانکۆیەدا فێربووم کە تەنانەت ئەو کەسانەی لە ڕووی زانست و هزرەوە لەکەسانی تر لەپێشتر بن، بۆیان نییە بەسەر خەڵکدا پۆز لێ بدەن، هەربۆیەشە کە ئێستا تۆ، من بە جلوبەرگی یەهوودی و ڕیشەوە دەبینیت، ئەمە لەکاتێکدایە کە ڕۆمییەکان ڕیشیان دەتاشن. هەرچەندە من ڕۆمیم، بەڵام

بەو سوکایەتی پێ کردنانەی ڕۆمییەکان دڵم لە تۆ نارەنجێ، چونکە هەست دەکەم کاتی خۆی لەلایەن هەندێك لە هاونیشتیمانەکانی منەوە ئازار دراویت.

بەڵام لەبارەی بەندەکانیشەوە دەبێ ئەوە بڵێم کە تاکو ئەمڕۆ من حەزم لە مەسەلەی کۆیلە نەکردووە و نەمدەزانی ئەوان لە ژیاندا بێزار بوون. ئەمڕۆ گوتەکانی تۆ، منی ئاگادرا کردەوە کە دەبێ زیاتر گرنگی بە کۆیلەکان بدرێت و بەدرەفتارییان لەگەڵ نەکرێ. بەهەر حاڵ، هەرچەندە من لەبنەڕەتدا ڕۆمیم و لەڕووی زانست و پەروەردەوە لە تۆ لەپێشترم، بەڵام ئامادەم لەگەل تۆ ببمە هاوڕێ.

شەمعون بە ڕقێکەوە تەمەشایەکی کردم و گوتی: کابرای ڕۆمی، تۆ دەڵێی لە زانکۆی "رودس"دا فێریان کردوویت کە گەورەیی مرۆڤ لە پێشکەوتنی ناخدایە نەك لە شوێنەواری جەستەدا. ئەمە لەکاتێکدا کە لە سەرتاپای تۆدا هەست بە خۆبەگەورەزانین و خۆپەرستی دەکرێت و بەجۆرێك قسە دەکەیت کەوا دەزانی هێشتا من غولامم و تۆش لە باکووری ئەفریقیایت و گەورەی منیت. ئەگەر بەو شێوەیەی تۆ دەیڵێیت کە گوایە وا نازانیت گەورەیی مرۆڤ لە نیشانە ڕووکەشەکاندایە و، بەخۆت نەنازیتایە کە ڕۆمیت و مافی ئەوەت هەیە کە ئەڵقەی زێڕین بکەیتە پەنجە گەورەتەوە، هیچ نەبێت یەك ڕۆژ لە تەمەنی خۆت تەرخان دەکرد بۆئەوەی ژیانی غولامی تاقی بکەیتەوە و بزانی چی بەسەر حاڵی ئەواندا دێت. ئەم جلوبەرگە یەهوودییەی کە تۆ لەبەرتکردووە و ئەم ڕیشەی کە هێشتووتەوە هەمووی بۆ فڕوفێڵە و لەڕاستیدا تۆ ڕۆمییەکی خوێنمژیت و من فریوی گوتەکانی تۆ ناخۆم.

گوتم: لەگەڵ ئەوەی کە گوتەکانی تۆ سووکاتی پێکردنە بەڵام من بە بیستنیان تووڕە نابم و لەگەڵ ئەوەی کە ڕۆمیشم، داوای لێبوردنت لێ دەکەم. مامۆستاکەی ئێمە لە دوا شەوی ژیانیدا قاچی قوتابییەکانی شۆردووە تاکو فێری لێبوردەییان بکات و منیش هەرچەندە ڕۆمیم، بەڵام ئامادەم پێیەکانی تۆ بشۆم تا بزانی کە حەزم لێیە وەکو عیسا پیاوێکی لێبوردە بم.

لەوکاتەدا پیاوێك هاتە ئەو ماڵەوە کە باڵایەکی بەرزی هەبوو. کاتێ شەمعون ئەوی بینی، بەمنی گوت: ئەو پیاوەی دەیبینی "ئەلیزەر"ی بەڕێوەبەری کارەکانی منە و پێدەچێ کاری پێم هەبێ.

من زۆر بە وردی سەیری پیاوە بالاّ بەرزەکەم کرد، چونکە هەر چاوم پێی کەوت وامزانی لە جێگایەکی تردا ئەوم بینیوە، تا بەبیرم هاتەوە کە شێوەی ڕێڕۆشتنی لە ڕێڕۆشتنی مامۆستایەك دەچێ کە لە زانکۆی "رودس"دا وانەی بە من و ئەو کەسانە دەگوتەوە کە لەگەڵ من وانەیان دەخوێند، هەروەها وەکو ئەو مامۆستایە سەری کەمێك تاس ببوو.

من بە سەرسامیەوە سەیری ئەو کابرایەم کرد و سەرم لەوە سوڕ دەما کە چۆن ئەو پیاوە زانایە کە مامۆستای "رودس" بوو، هاتۆتە خزمەتی شەمعون (واتە بووە بە غولاّمێکی ئازاد و بەڕێوەبەری کارەکانی). پاشان بەبیرم هاتەوە کە مامۆستاکەی زانکۆی "رودس" چەند ساڵێك لەمەوپێش ماڵئاوایی لەم ژیانە کردووە و ئەو پیاوەی کە شەمعون گوتی ناوی "ئەلیزەر"ە، ئەو مامۆستایە نییە. "ئەلیزەر" بەبێ ئەوەی سەرنجی ئێمە بدات، هاتە ناو حەوشەی ماڵەکەوە و پاشان ڕۆیشت.

شەمعون چەکوشە بچووکەکەی دا بە زەنگۆڵەکەدا و خزمەتکارەکەی خۆی بانگ کرد و گوتی: لەوانەیە "ئەلیزەر" کاری بە من بووبێت بۆیە هاتووە بۆ ئێرە، بڕۆ بەدوایدا و لێی بپرسە بزانە چ کارێکی هەبووە و ئەگەر دەیەوێ من ببینێت، با بگەڕێتەوە.

خزمەتکارەکە بەسەرسامیەوە گوتی: ئەلیزەر لێرە بوو؟

شەمعون گوتی: بەڵێ، ئەو ئێستا لەبەرچاوی ئێمەدا بە حەوشەکەدا تێپەڕی، بەلاّم لەبەرئەوەی لەبەرسێبەر دانیشتبووین، بۆیە ئێمەی نەبینی.

خزمەتکارەکە گوتی: ئەمڕۆ "ئەلیزەر" نەهاتووە بۆ ئێرە و من ئەوم نەبینیوە. ئەگەر ئەو بهاتایە بۆ ئێرە ئەوا من دەمبینی، چونکە ژوورەکەم لە جێگایەکدایە کە هەرکەسێ هاتووچۆ بکات، من دەیبینم.

ئینجا خزمەتکارەکە ڕۆیشت و لە ئافرەتێکی -کە کردنەوە و داخستنی دەرگای حەوشەکەی لە ئەستۆدا بوو- پرسی: پێش کەمێك "ئەلیزەر" نەهات بۆ ئێرە؟

ئافرەتەکە گوتی: نەخێر، ئەمڕۆ "ئەلیزەر" نەهاتووە بۆ ئێرە و دەرگای ماڵەوە داخرابوو و تەنانەت کیلونیش دراوە. ئەو ئافرەتە بەدەنگی بەرز قسەی دەکرد بۆیە ئێمەش گوێمان لە دەنگی بوو.

شەمعون گوتی: هەر ئێستا من بە چاوەکانی خۆم "ئەلیزەر"م بینی کە بەناو حەوشەکەدا تێپەڕی کرد و ئەم پیاوە ڕۆمییەش ئەوی بینیوە.

پاشان لەمنی پرسی: تۆ ئەوت بینی یان نا؟

گوتم: من "ئەلیزەر" ناناسم، واتە ناوی نازانم بەڵام بینیم کە کابرایەکی باڵابەرز بەناو حەوشەکەدا تێپەڕی کرد.

شەمعون لەجێی خۆی هەستایەوە و بۆئەوەی ئەلیزەر بدۆزێتەوە، یەکەبەیەکەی ژوورەکانی ماڵەکە گەڕا، بەڵام "ئەلیزەر"ی نەبینی و گەڕایەوە و بە منی گوت: زۆر سەیرە کە ئەم دوو کەسەمان بە چاوی خۆمان "ئەلیزەر"مان بینی کە بەناو حەوشەکەدا تێپەڕی و ئێستاش ئەو دیار نییە!

گوتم: کاتێ من ئەوم لە کاتی تێپەڕینی بەناو حەوشەکەدا بینی، پێم ئاشنا بوو و کتوپڕ بیرم کەوتەوە کە مامۆستاکەی زانکۆی "رودس"ە کە ماڵئاوایی لە ژیان کردووە و دواتر بۆم دەرکەوت کە مامۆستاکەی زانکۆی "رودس" نییە.

پاشان بە پێکەنینەوە گوتم: خۆشبەختانە ئەو پیاوەی کە بەم حەوشەدا تێپەڕی کرد پێی پەتی بوو و شوێنەواری هەردوو پێی لەسەر مۆزاییکی حەوشەکەی تۆ بەجێ ماوە، ئەگینا من و تۆ واماندەزانی تارماییمان بینیوە.

شەمعون سەیری شوێنەواری هەردوو پێیە پەتیەکەی کرد کە لەسەر مۆزاییکەکە بەجێ مابوو، پاشان بە پەنجەیەکی، شوێنەوارەکانی بەرجەستە کرد و کاتێ پەنجەی لەسەر زەوی هەڵگرتەوە، سەیرم کرد خوێناوی بووە.

کاتێ کە زانیم شوێنەوارێ ئەو دوو پێیەی کابرا لەسەر مۆزاییکەکە خوێناوی بووە، موچرکەیەك بە لەشمدا هات و بە شەمعونم گوت: ئێستا هۆکاری ئەوە دەزانم کە کاتێ عیسا زیندوو بوویەوە و خۆی بە قوتابییەکانی نیشان داوە، بۆچی نەیانناسیوەتەوە.

بەڵام شەمعون گوێی بە قسەکەی من نەدا و گوتی: من وامدەزانی ماڵەکەی خۆم ماڵێکی تۆکمە و تەواوە، بەڵام ئێستا دەبینم کە ئەم ماڵە لەگەڵ کۆڵانەکەدا جیاوازی نییە و هەموو کەسێ دەتوانێ بێتە ناو حەوشەکەوە و بڕواتە دەرەوە.

گوتم: شەمعون، تۆ ئەم پیاوە دەناسی کە بەم حەوشەیەدا تێپەڕی کرد یان نا؟

شەمعون گوتی: بێگومان ئەو "ئەلیزەر"ی بەڕێوەبەری کارەکانی من بوو.

گوتم: بەڵام هەر بەو شێوەیەی کە قوتابییەکانی عیسا و مریەمی مەجدەلییە لێیان تێك چوبوو، من و تۆش هەڵەمان کردووە و سەرمان لێ تێك چووە. ئەم پیاوەی کە ئەڕۆ بەم حەوشەیەدا تێپەڕی کرد، عیسا بوو، بۆیە لە دیدی هەردووکماندا ئاشابوو، بەڵام نەك بەشکڵی عیسا بەڵکو بەشکڵێکی تر. تۆ ئەوت وەکو "ئەلیزەر"ی سەرۆك کارەکانی خۆت بینی و منیش وەکو مامۆستا دێرینەکەی زانکۆی "رودس" هاتە بەرچاوم. بەڵام ئەو عیسا بووە و ئەم دوو جێ پێیەی کە تۆ دەیبینی، پێیەکانی عیسایە و ئێستەش ماڵەکەی تۆ بووە بە شێوێنێکی پیرۆز، چونکە عیسا پیایدا تێپەڕ بووە و شوێنەواری پێی خۆی تێدا بەجێ هێشتووە.

شەمعون گوتی: من بڕوا بەم قسانەی تۆ ناکەم. من پێم گوتی کە من کابرایەکی ئیماندارم، بەڵام خەیاڵ پەرست نیم و کاتێ بە چاوەکانی خۆم شتێك ببینم ناتوانم ئینکاری لێ بکەم. ئێستە من بە چاوەکانی خۆم "ئەلیزەر"ی سەرۆك کارەکانی خۆمم بینی کە بەم حەوشەیەدا تێپەڕی کرد، بۆیە ناتوانم بڵێم عیسا بووە.

گوتم: تۆ چۆن حەز دەکەیت وا بیر بکەرەوە، بەڵام من دڵنیام ئەو پیاوەی کە لێرەوە گوزەری کرد و من وەکو مامۆستا دێرینەکەی خۆم هاتە بەرچاوم، عیسا بووە. "مریەمی مەجدەلییە"ش عیسای بە شێوەیەکی تر بینیوە و نەیناسیوەتەوە تا ئەوکاتەی کە عیسا بەناوی خۆی بانگی کردووە و ئینجا مریەمی مەجدەلییە مامۆستا مەزنەکەی ئێمەی ناسیوەتەوە.

شەمعون گوتی: من کەسێك نیم بڕوا بەم قسانە بکەم و، ئەوەش دەزانم کە بە جادووش ناتوانرێ ئەم کارە ئەنجام بدرێ. من لە ڕابردوودا جادووگەرێکم بینی کە دەیتوانی ڕۆحەکان پیشان بدات، بەڵام ئەو ڕۆحەی کە ئەو دەریدەخست تەنیا وێنەیەك یانیش دوکەڵ بوو، هەروەها پاش ئەوەی کە دوکەڵەکە نەدەما، ڕۆحەکەش لەناو دەچوو. ئیتر ئەوکاتە جادووگەرەکە نەیدەتوانی ڕۆحەکە بگەڕێنێتەوە، چونکە دەبوو کارەکان لەسەرەتاوە دەست پێ بکاتەوە و وێنەیەك دروست بکات و ئاگرێك بکاتەوە تاکو دوکەڵێکی لێ بەرز ببێتەوە. بەڵام هەرگیز ڕێك نەکەوتووە ڕۆحێك کە لەلایەن جادووگەرەوە پیشان دەدرێت، جێ پێی خۆی لەسەر زەوی بەجێ بهێڵێت.

گوتم: شەمعون، ئەوەی کە ئێمە بینیمان ڕۆح نەبوو، بەڵکو جەستەی مرۆڤێك بوو. عیسا زیندوو بۆتەوە و لەناو گۆڕەکەی هاتۆتە دەرەوە و ئێستەش لە نێوان ئێمەدا دەژی و، هەرکاتێ بیەوێ، خۆیمان پێ نیشان دەدات.

شەمعون گوتی: ئەوکاتەی کە عیسا لە ژیاندابوو، لە نیگاکانییەوە بۆم دەکەوت کە دەتوانێ لە دوای مردن، زیندوو ببێتەوە، بەڵام بۆچی ناچێ بۆلای قوتابییەکانی خۆی و خۆی پیشانی ئەوان نادات و، بۆچی خۆی پیشانی تۆ دەدات کە کەسێکی ڕۆمیت و هەروەها خۆی بە من نیشان دەدات کە غولامێکی ئازادکراوم.

گوتم: ئەو خۆی بە قوتابییەکانی نیشان داوە. ئەو بۆئەوەی خۆی بەوان پیشان بدات، چۆتە ژوورێکەوە کە دەرگاکەیان قوفڵ کردبوو. بەڵام بە بۆچوونی من بۆئەوە خۆی بە ئێمە پیشان داوە تاکو پێمان بڵێ کە ئێمەش دەتوانین بچینە سەر ڕێگەی ڕاست.

شەمعون گوتی: با وا دابنێین بەم شێوە بێت و بۆیە خۆی بە ئێمە نیشان داوە تا بەرەو ڕێی ڕاست ڕێنماییمان بکات، بەڵام بۆچی بە شکڵی یەکەمی، خۆی پێ نیشان نەداین؟ من چۆن بزانم کە ئەلیزەری بەڕێوەبەری کارەکانی من، عیسایە. تۆ چۆن دەزانی ئەو پیاوەی کە لە ڕابردوودا لە زانکۆی "ڕودس" مامۆستای تۆ بووە، عیسایە؟ ئایا باشتر نییە کە عیسا بەشکڵی یەکەمجاری، خۆی بە خەڵکی نیشان بدات، نەك بە شکڵ و شێوەی خەڵکی دیکە؟

گوتم: لەوانەیە ئەو کەسەی کە دەمرێ، شکڵ و شێوەی خۆی لەدەست بدات و ئیتر نەتوانێ بچێتەوە سەر ئەو شکڵە. لەوانەیە شکڵی مرۆڤ وەکو قاڵبێك وابێ بۆ جەستەی ئەو، هەروەها دوای ئەوەی کە مرد، ئەو قاڵبە لەناو بچێت و نەتوانێ بچێتەوە سەر ئەو شکڵە. من بە دووری نازانم کە شکڵی مرۆڤ وەکو ئەو دەفرە شووشەیە وابێ کە ئاوی تێدا بێت و ئەو ئاوە لەناو ئەو دەفرە شووشەیەدا یان لەهەر دەفرێکی تردا بێت، دەچێتە سەر ئەو شکڵە و، دوای شکانی ئەو دەفرە شووشەیە دەشکێت و دواتر تازە نابێتەوە، بۆیە ڕەنگە کەسێکیش کە دوای مردن زیندوو دەبێتەوە، نەتوانێ بچێتەوە سەر شکڵی یەکەمجاری و ناچار شکڵی دیکە لەخۆ بگرێت.

شەمعون گوتی: کابرای ڕۆمی، ئەمانەی کە تۆ دەیڵێی، زمان لووسیە و تەنیا ئەو کەسانەی کە وەکو تۆ لە زانکۆی "ڕودس" دەرسیان خوێندووە، بڕوای پێ دەکەن نەك

ئەوانەی کە خاوەن ژیرییەکی تەواون. چۆن دەکرێ کابرایەك کە دەتوانێ لە پاش مەرگ خۆی زیندوو بکاتەوە، نەتوانێ بچێتەوە سەر شکڵی پێشووی خۆی؟

لەو کاتەدا بەتوندی لە دەرگای ماڵی شەمعونیان دا و ئافرەتە خزمەتگوزارەکە چوو دەرگاکە بکاتەوە. دوای ئەوەی کە دەرگاکە کرایەوە، لە نێوان ئەو ئافرەتە و کەسێك کە ئێمە نەماندەبینی و تەقەی لە دەرگا دابوو، بوو بە دەمەقاڵە.

ئینجا کابرایەکی کورتەباڵا کە سەرێکی گەورەی هەبوو، خۆی هەڵدایە ناو ماڵەکەوە و هاتە حەوشەکەوە و، لە کاتێکدا کە دەستەکانی ڕادەوەشاند، هاواری کرد: ئێوە ئەوتان چی لێ کرد؟ ئەوتان لە کوێ شاردۆتەوە؟ من بینیم کە هاتە ماڵەوە. من ڕەشمەی گوێدرێژەکەی خۆم بەست بە حەلقەی دیوارێکەوە و چاوەڕوان بووم تا لەو ماڵە بگەڕێتەوە، بەڵام ئەو نەگەڕایەوە، من دەمەوێ ئەو ببینم.

شەمعون گوتی: ئەی کابرا، تۆ لەبارەی کێوە قسان دەکەیت؟ لەم حەوشەیەدا جگە لە من و میوانەکەم کەسی تری لێ نییە و ماوەیەکی زۆرە کە ئێمە بە گفتوگۆوە سەرقاڵ بووین.

پیاوە کورتەباڵاکە لە من نزیك بوویەوە و بە وردی سەیرێکی کردم و گوتی: ئەو کەسەی کە هاتە ئەم ماڵەوە ئەمە نەبوو. پۆشاکی ئەم کابرایە باش نییە، بەڵام ئەوەی کە هاتە ئەم ماڵەوە، جلێکی هێندە گرانبەهای لەبەردا بوو کە سەرم لەوە سوڕما کە چۆن دەبێ یەهوودییەك پۆشاکی گرانبەها لەبەر بکات. ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم، کەواکەی لە پارچەی خوری سوریایی بوو.

شەمعون گوتێ: ئەم قسانە چیە کە دەیکەیت، بۆچی بەم شێوەیە هاتیە ماڵەکەی منەوە؟

ئەو پیاوە گوتی: من کارم بە تۆ نییە و بۆ بینینی تۆ نەهاتووم بۆ ئەم ماڵە. کاتێ کە دەمویست بێم بۆ ناوشار، سواری گوێدرێژەکەم بووم و بەڕێ کەوتم و پێش ئەوەی بگەمە ناوشار، پیاوێك بەلامدا تێپەڕی کرد. من ئەوم نەناسی تا کەمێك لێم دوور کەوتەوە، ئینجا بانگم کرد، بەڵام ئەو پیاوە وەڵامی نەدامەوە. من گوێدرێژەکەی خۆمم غار پێدا تا پێی بگەم. بەڵام نەمتوانی خۆم بگەیەنمە ئەو پیاوە و پێش من گەیشتە شارەکە تا گەیشتە ئەم ماڵە و پاش ئەوەی هاتە ئەم ماڵەوە، ئیتر نەهاتە دەرەوە.

لەو کاتەدا جارێکی تر تەقەیان لە دەرگا دایەوە و ئافرەتە خزمەتگوزارەکە ڕۆیشت و دەرگاکەی کردەوە و پیاوێك هاتەماڵەوە. ئەو پیاوە باڵای بەرز بوو و "شەمعون" هەر کە ئەوی بینی گوتی: "ئەلیزەر" بۆچی کەمێك لەمەوپێش کە هاتیە ماڵەوە، بە حەوشەکەدا تێپەڕت کرد و قسەت لەگەڵ من نەکرد، ئەی دواتر کە لەم ماڵە ڕۆشتیتە دەرەوە، بۆ کوێ چوویت؟

ئەو پیاوەی کە دیاربوو بەرپرسی کارەکانی "شەمعون"ە، بە بیستنی ئەم قسەیە زۆر سەرسام بوو و گوتی: من ئەمڕۆ نەهاتووم بۆ ئێرە و ئێستەش لە بیابانەوە دێم تاکو پێت بڵێم کە مەڕەکانمان ڕەنگ کردووە.

کاتێ بەرپرسی کارەکان قسەی دەکرد، من چاوم بڕییە قاچەکانی و سەیرم کرد هەر دوو پێی سوور بووە.

ئاماژەم کرد بۆ قاچەکانی و پرسیم: برینداربوویت کەوا پێیەکانت خوێناویە؟ ئەو پیاوە سەری چەماندەوە و سەیرێکی قاچەکانی کرد و گوتی: من بریندار نەبووم و ئەوەی کە دەیبینی ئەو ڕەنگەیە کە بۆ ڕەنگکردنی مەڕەکان بەکارمان هێناوە و پاش ئەوەی کە مەڕەکانمان ڕەنگ کرد، دەرفەتم نەبوو قاچەکانم بشۆم.

پیاوە کورتەباڵاکە هەندێ جار سەیری "ئەلیزەر"ی دەکرد و هەندێ جاریش سەیری من و "شەمعون"ی دەکرد و لەناکاو بە توڕەییەوە گوتی: من لێتان دەپرسم ئەوتان لەکوێ شاردۆتەوە کەچی ئێوە لەبارەی ڕەنگکردنی مەڕەوە قسان دەکەن؟

گوتم: کاکی کورتەباڵا، سەر مەخەرە سەرمان، ئێمە لەم ماڵەدا کەسمان نەشاردۆتەوە. من کابرایەکی ڕۆمێم و ناوم "مەزن تیوس"ە و ئەم پیاوەش کە دەیبینی خاوەنی ئەم ماڵەیە و بە "شەمعونی خەڵکی کورن" ناسراوە و ئەوی تریان بەرپرسی کارەکانییەتی و ناوی "ئەلیزەر"ە. من سەیرم لەوە دێ کە وەکو دێوانەکان هاتیتە ئەم ماڵەوە و بەجۆرێك هاوار دەکەیت کە وادەزانی لە ماڵی خۆتدایت.

پیاوە کورتەباڵاکە، سەرە زلەکەی خۆی بەرز کردەوە و گوتی: سەیری باڵا کورتیەکەی من مەکەن، چونکە من لە شاری "ئەریحا" ناوبانگم هەیە و ئەگەر تۆ بڕۆیت بۆ ئەوێ و لە خەڵك بپرسی "زاخوس" کێیە، ئەوا پێت دەڵێن کە من کابرایەکی بەناوبانگم و پێم خۆش نییە ڕۆمییەك بەسووك سەیرم بکات.

من کاتێ ناوی "زاخوس"م بیست، بەهۆی سەرسامیەکی زۆرەوە هەردوو دەستم بەیەکدا دا.

"شەمعون"یش بەبیستنی ناوی "زاخوس" سەرسام بوو و گوتی: ئێمە ئەمڕۆ لەم ماڵەدا باسی تۆمان دەکرد و ئەگەر سبەی شەممە نەبوایە، دەمانویست گەشتێکی "ئەریحا" بکەین و لەو شارە چاومان پێت بکەوێت، بەڵام چۆن بوو کە تۆ هاتیت بۆ ئێرە؟

"زاخوس" باوەڕی بە قسەکەی شەمعون نەکرد و بە بەدگومانییەوە سەیری دەکرد. من بۆئەوەی بەدگومانییەکەی نەهێڵم گوتم: شەمعون ڕاست دەڵێ و ئێمە ئەمڕۆ باسی تۆمان دەکرد، چونکە تۆ یەکێکیت لەو پیاوانەی کە دوای بینینی عیسا، نیوەی داراییەکەی خۆت بەخشی بە خەڵکی هەژاررو ئەم مەسەلەیە ئەوەندە سەرسوڕهێنەرە کە ئێمە دەمانویست تۆ ببینین و قسەت لەگەڵ بکەین، ئێستە پێمان بڵێ ئایا عیسا پێتی گوت ماڵ و داراییەکەت ببەخشی بە کەسە هەژارەکان؟

زاخوس گوتی: هیچ کەسێ بە منی نەگوتوە ماڵ و داراییەکەی خۆم بدەم بە خەڵکی هەژار. من لە خۆشیدا ئەو بەشەی سامانەکەی خۆم، کە لە ڕێگەی ناڕەواوە بەدەستم هێنابوو، لە نێوان هەژارەکاندا دابەشم کرد. ئەلیزەر بە شەمعونی گوت: من بۆئەوە هاتووم بە تۆ بڵێم کە مەڕەکانمان ڕەنگ کردووە و ئەگەر کارت بە من نییە، ئەوا دەگەڕێمەوە، چونکە هەست دەکەم لێرە هەندێ قسە دەکرێت کە نە بۆ گەدە باشە و نە بۆ دڵ.

من لە بەرپرسی کارەکانم پرسی: تۆ دەزانی کە ئێمە لەبارەی چییەوە قسە دەکەین؟

ئەلیزەر گوتی: ئەوەی کە من لێرە گوێم لێی بوو، بۆم دەرکەوت کە لەبارەی عیساوە قسەتان دەکرد و، منیش نامەوێ لەباری عیساوە هیچ شتێك ببیستم.

گوتم: کابرا، خۆ تۆ سەرمایەدار نیت تا ڕقت لە عیسا بێت، پیاوێکی وەکو تۆ نابێ ڕقی لە عیسا بێت.

ئەلیزەر گوتی: عیسا دەیگوت: ((ئەی زەحمەتکێشەکان و بارقورسەکان، بێن بۆ لای من و من ئازادیتان پێ دەبەخشم)) کۆمەڵێك لە جووتیار و ڕاوچی و کرێکارەکان کاتێ گوێیان لەم قسەیە بوو، هیوایان بەبەردا هاتەوە و بەرەو لای ئەو چوون بە

ئومێدی ئەوەی کە ڕزگاریان ببێت. بەڵام هەموو ئەوانە لەلایەن ئەنجومەنی باڵای جوولەکەکانەوە دەستگیر کران و بردنیان بۆ لای دادوەر و عیساشیان دەستگیر کرد و لە خاچیان دان. منیش لەبەرئەوەی کە نامەوێ کێشە بۆ خۆم بنێمەوە، ئامادە نیم گوێ لەو قسانە بگرم کە پەیوەندی بە عیساوە هەبێت.

زاخوس بە سەرۆك کارەکەی گوت: ئەی کابرا، تۆ لەبارەی عیساوە بەهەڵەدا چوویت و دەستگیرکردنی وەرزێر و ڕاوچی و کرێکارەکان ئەوە ناگەیەنێ کە عیسا ناڕاستی گوتبێ. من پیاوێکی چاکەکار و مهرەبانی وەکو عیسام نەبینیوە و ئەو یەکەم کەسە کە کاتێ منی بینی، گاڵتەی پێ نەکردم و بەناوی خۆم بانگی کردم.[35]

کاتێ من عیسام بینی، چوومە سەر دارێك بەڵام ئەو منی بانگ کرد تا لەسەر دارەکە بێمە خوارەوە و قسەی لەگەڵ کردم و هاتە ماڵەکەمەوە، ئەمە لە کاتێکدایە کە دەیزانی من کێم و چۆن بە شێوازی ناڕەوا دەوڵەمەند بووم. من ئەمساڵ لەکاتی جەژنی گەورەدا، من لە ئەریحاوە نەهاتم بۆ ئێرە و نەچووم بۆ زیارەتی پەرستگا، چونکە دەمزانی کە کابرایەکی گوناهکارم و زیارەتی گوناهکاریش پەسەند ناکرێت و قوربانییەکەی قبوڵ ناکرێ. کاتێ لەو زیارەتکارانەی کە لەم شارە گەڕابوونەوە، بیستم کە عیسایان بە شێوەیەکی دڵتەزێن کوشتووە، چەند ڕۆژێك ئارامم گرت تاکو بزانم چی ڕوو دەدات، بەڵام دوای ئەوە نەمتوانی ئۆقرە بگرم و سواری گوێدرێژەکەی خۆم بووم و ڕێی ئێرەم گرتەبەر بۆئەوەی لەلای قوتابییەکانی عیسا، سۆراخێکی ئەو بکەم و، کاتێ لە شارەکە نزیك بوومەوە، سەیرم کرد لەتەنیشتمەوە تێپەڕی کرد و پێشم کەوت.

شەمعون پرسی: مەبەست لە "ئەو" کێیە؟

زاخوس گوتی: عیسا دەڵێم.

شەمعون گوتی: لەوانەیە تۆ خەونت بینیبێت و لەکاتی خەیاڵدا عیسات بینیبێ.

زاخوس گوتی: من ماندوو نەبووم تاکو لەسەر پشتی گوێدرێژەکە خەوم لێ بکەوێت، گوێدرێژەکەم بە هێواشی ڕێی دەبڕی و ئەویش لە تەنیشتمەوە تێپەڕی کرد. من سەرەتا نەمزانی کە ئەو عیسایە، بەڵام دوای ئەوەی کەوتە پێش منەوە، ئینجا زانیم کە عیسایە. من لە "ئەریحا" بیستبووم کە هەندێك دەیانگوت عیسا سێ ڕۆژ دوای

[35] دیارە ئەو (بە ناو بانگ کردنە) ئەوە دەگەیەنێ کە لەو سەردەمەدا لەو ناوچانە، خەڵکیان بە ناووناتۆرە بانگ کردووە و، جگە لە کەسێك کە سەرمایەدار بووایە یان ڕێزێکی تایبەتی هەبووایە، بۆیە ئەگەر کەسێکیان بە ناوی خۆی بانگ بکردایە، ئەوا دیار بوو کە ئەو کەسە شایانی ڕێزە. (و. کوردی)

مەرگ، زیندوو بۆتەوە و لەناو گۆڕەکەی هاتۆتە دەرەوە، بەڵام ئەو ڕۆژەی کە عیسام بینی و ناسیمەوە، ئینجا زانیم کە پڕوپاگەندەی زیندوو بوونەوەکەی ڕاستە. ئینجا سەیری لای چەپ و ڕاست و سەیری پێشەوەی خۆم کرد تا بزانم کەسێ لە بیاباندایە یان نا. کەس لە بیاباندا نەبوو تا بەهۆی بانگی منەوە بە عیسا بزانێت و مەترسی بۆ دروست بکات. بۆیە دەنگم بەرز کردەوە و عیسام بانگ کرد، بەڵام ئەو دەنگی منی نەبسیت یانیش وەڵامی نەدامەوە. پاش ئەوە، لەبەرئەوەی کە لەشارەکە نزیک بوومەوە، ئیتر هاوارم نەکرد، چونکە دەترسام خەڵك بە هۆی دەنگی منەوە بە عیسا بزانن، بەڵام گومانم نییە کە پێش ئەوەی بێمە ناوشار، توانیومە عیسای مەسیح ببینم.

## گفتوگۆکردن لەبارەی مەسیحەوە

کاتێ "ئەلیزەر" وشەی (مەسیح)ی لە دەمی "زاخوس"ەوە بیست، بە دەنگی بەرز گوتی: ئەم قسەیە مەکە و بە عیسا مەڵێ مەسیح.

زاخوس گوتی: عیسا مردووی زیندوو کردۆتەوە و نەخۆشەکانی چارەسەر کردووە، ئیتر بۆچی پێی نەڵێم مەسیح؟

ئەلیزەر گوتی: ئەو مردووی زیندوو کردەوە و توانی نەخۆشەکان چاك بکاتەوە، بەڵام نەیتوانی لەبەرامبەر ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکاندا بەرگری لە خۆی بکات و، بۆیە دەستگیریان کرد و لەنێوان دوو دزدا لەخاچیان دا. ئەگەر عیسا مەسح و ڕزگارکەر بووایە، ئەی بۆچی نەیتوانی لەبەرامبەر بۆکزێکی ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکاندا بەرگری لە خۆی بکات؟ ئێمە پێش ئەوەی عیسا لەخاچ بدەن، بڕوامان پێ هێنابوو و چاوەڕوان بووین ئامۆژگاریمان بکات و ئێمەش لە دوایەوە بڕۆین، بەڵام کاتێ بینیمان کە لە خاچیان دا، نائومێد بووین و، من ئەوەندە لە هاتنی مەسیح نائومێد بووم کە بڕوام وایە عیسا، نەك هەر مەسیح نەبوو بەڵکو هەرگیز مەسیح لە دنیادا دەرناکەوێت و من بە منداڵەکانی خۆم دەڵێم چاوەڕێی هاتنی مەسیح نەبن.

شەمعونی خەڵکی کورن بە سەرۆك کارکانی خۆی گوت: عیسا دەناسی؟

ئەلیزەر گوتی: بەڵێ، من ئەو دەناسم؟

شەمعون گوتی: ئەی بۆچی قسەت لەگەڵ نەکردووم دەربارەی ئەو؟

ئەلیزر گوتی: من بۆیە لەبارەی عیساوە قسەم لەگەڵ نەکردوویت، چونکە تۆ دەوڵەمەند بوویت و "عیسا"ش ڕقی لە سەرمایەدارەکانە و تەنیا ڕیێی بە هەژارەکان دەدا بچنە لای. من دەمزانی کە تۆ جگە لەوەی دەوڵەمەندیت، ڕژدیشیت و خۆت لقی وشکی دارەکان لەسەر زەوی کۆ دەکەیتەوە و، بۆ سووتاندن دەیانبەیتەوە بۆ ماڵی خۆت بۆئەوەی بێوەژن و منداڵە هەتیوەکان ئەو لقە وشکانە لەسەر زەوی کۆنەکەنەوە و نەیبەنەوە بۆ ماڵەوە تا ئاگری پێ بکەنەوە.

شەمعون گوتی: ڕاستە کە من لقی دارە وشکەکانم لەسەر زەوی کۆدەکردەوە و دەمبردەوە بۆ ماڵی خۆم و بۆ سووتاندن بەکارم دەهێنا، بەڵام بۆئەوە وامنەکردووە تا

بێوەژن و منداڵە هەتیوەکان لە کۆکردنەوەی ئەو دارە وشکانە بێبەش بکەم. من خووم بەم کارەوە گرتووە، هەروەها ئەگەر تۆ لە کارێکی من ناڕازیٚ بوویت، بۆت هەبوو سەرزەنەشتم بکەیت.

ئەلیزەر کە ئەم قسانەی بیست، قسەکەی گۆڕی و گوتی: شەمعون، من بەهەڵەدا چووم و تۆ ڕژد نیت و، بەردەوام چاودێری بێوەژن و منداڵەکان دەکەیت و کۆمەڵێك لە هەژارەکان و ئەوانەی گوێیان پیٚ نادریٚ، لەسەر خوانی تۆ ڕۆزییان دەدرێتیٚ. من دان بە دەستبڵاوی تۆدا دەنێم، بەڵام ئەوە ناگەیەنیٚ کە لە عیسا نارازی نەبم. ئەو، کاتیٚ خۆی بە ئێمە نیشان دا، هەندیٚ شتی گوت و هەندیٚ بەڵێنی لە دەمەوە دەرچوو کە ئێمە واماندەزانی دەبینە خۆشتبەختترین کەسی دنیا، بەڵام ئێمەی بەدەستبەتاڵی بەجیٚ هێشت و ڕۆیشت.

گوتم: ئەلیزەر، عیسا ئێمەی بەدەستبەتاڵی بەجیٚ نەهێشتووە، بەڵکو شتێکی پیٚ داوین کە لە زێڕ بەبەهاترە.

ئەلیزەر پرسی: ئەو شتە چیە؟

من ئاماژەم بە شوێن پێی عیسا کرد و گوتم: ئەمەیە کە ئەو بە ئێمەی داوە.

ئەلیزەر بە وردی سەیری ئەو شوێنەی کرد و ئینجا شەمعون بۆی ڕوون کردەوە و گوتی: پیاوێکی ئاوا، بە حەوشەدا تێپەڕی کرد و شوێنەواری ئەو لە حەوشەدا بەجیٚ ماوە. هەروەها لەبەرئەوەی "ئەلیزەر" دوو دڵ بوو و نەیدەتوانی باوەڕ بە قسەکان بکات، بۆیە شەمعون بە "زاخوس"ی گوت: ئەمڕۆ ئەم دوو کەسەتان دوو دڵن و گومانی "زاخوس" بەهۆی ئەوەوەیە کە وادەزانیٚ عیسا هاتۆتە ئەمماڵەوە و ئێمە ئەومان شاردۆتەوە. گومانی "ئەلیزەر"یش بەجۆرێکی ترە و بڕوای بە عیسا نییە. ئێوە ئەو دوو کەسەتان بڕۆن و هەموو گۆشە و زاویەکانی ئەم ماڵە بپشکنن تاکو بزانن کە ئێمە لەم ماڵەدا کەسمان نەشاردۆتەوە.

ئەلیزەر گوتی: ئێمە بەدەستی بەتاڵەوە ناتوانین بڕۆین و گۆشە و تەنیشتەکانی ئەم ماڵە بپشکنین.

شەمعون پرسی: چیت دەویٚ؟

ئەلیزەر گوتی: ئێمە پێویستیمان بە مقاش و شیش هەیە بۆئەوەی بتوانین بە شێوەیەکی باش ئەم ماڵە بپشکنین تاکو بیدۆزینەوە. "شەمعون" ئافرەتە

خزمەتکارەکەی ئەوماڵەی بانگ کرد و پێی گوت: بزانم ئەم دوو کەسە چەند مقاش و شیشیان دەوێ، پێیان بدە تاکو برۆن و ئەو ماڵە بپشکنن.

کاتێ ئەو دوو کەسە ڕۆیشتن، من و شەمعون ماوەیەك بێدەنگ بووین. ئینجا من گوتم: پێموایە هاتنی "زاخوس" یش بۆ ئەم ماڵە، یەکێکە لە نیشانەکانی زیندوو بوونەوە و ئامادە بوونی عیسا لەم شارەدا، چونکە ئێمە کاتێ ویستمان بڕۆین بۆ لای "زاخوس" و لەبارەی عیساوە قسەی لەگەڵ بکەین و، ئەویش بەبێ ئەوەی ئاگای لە بڕیارەکەی ئێمە بێت، خۆی هات بۆ ئێرە.

شەمعون ویستی شتێك بڵێت بەڵام دەرفەتی نەبوو، چونکە لە ماڵەکەدا دەنگی غەڵبەغەڵب دەهات بە گوێدا، بەڵام ئەو غەڵبەغەڵبە ترسناك نەبوو و وەکو ئەوە وابوو کە کۆمەڵێك لە ژنان و پیاوان و منداڵان خەریکی پشوودان بن و دەپاڕێنەوە. پاشان تەقەیان لە دەرگا دا و ئافرەتە خزمەتکارەکە ڕۆیشت و دەرگاکەی کردەوە.

بەهۆی کردنەوەی دەرگاکە، دەنگی غەڵبەغەڵبەکە زیاتر بوو و ئافرەتە خزمەتکارەکە بە سەرسامییەوە هات بۆلای شەمعون و گوتی: ئەمانەی کە لەبەردەم دەرگاکەدا کۆ بوونەتەوە، هەژارەکانی ئەم شارەن و دەڵێن هەواڵیان پێدراوە کە ئەمڕۆ لەم ماڵەدا خواردن و خواردنەوە دەدرێت بە هەژارەکان و، هاتوون بەشە خواردن و خواردنەوەی خۆیان وەربگرن.

من لێم پرسین: ئەم هەواڵەتان لەکێ بیستوە؟

ئەوان گوتیان: لە تەواوی ئەم شارەدا هەمووی ئاگای لەم مەسەلەیە هەیە و دەزانن کە ئەمڕۆ شەمعونی خەڵکی کورن خێرات دابەش دەکات و خواردن دەدات بە هەژارەکان.

شەمعون بە توڕەییەوە سەیرێکی منی کرد و گوتی: کابرای ڕۆمی، من پێموایە ئەو ڕووداوانەی کە ئەمڕۆ لەم ماڵەدا ڕووی داوە، بەهۆی جادووگەریی تۆوەیە و تۆ جادووگەریت و هەر تۆ پڕوپاگەندەی خێرات و خواردنت لەم شارەدا بڵاو کردۆتەوە.

من ویستم پێی بڵێم کە جادووگەر نیم و جادووم نەکردووە و پڕەپاگەندەی خێرات و خواردنم لەم شارەدا بڵاو نەکردۆتەوە، بەڵام شەمعون بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشت و منیش لە دوایەوە ڕۆیشتم تاکو بزانم بارودرخی دەرەوە چۆنە.

هەرکە سواڵکەرە چاوساغەکان شەمعونیان بینی، دەنگیان بەرز کردەوە و بەناوی خودای قەومی یەهوود داوای خواردن و درهەمیان لێ کرد. شەمعون لێی پرسین: کێ پێی گوتن کە ئەمڕۆ لەمماڵەدا خواردن و خواردنەوە دەدرێت بە هەژارەکان.

ئەوان وەڵامیان دایەوە کە لەم شارەدا هەموو کەسێ ئاگای لەم مەسەلە هەیە و، لەوێ ناڕۆن هەتا خواردن وەرنەگرن.

شەمعون ویستی تێیانبگەیەنێت کە دوژمنەکانی ئەو، پڕوپاگەندەیان بە شاردا بڵاو کردۆتەوە و یانیش بەهەڵە تێگەیشتوون و کەسێکی تر ئەمڕۆ خواردن دەدات بە هەژارەکان و، ئەوان بەهەڵە لەبەردەم ماڵی ئەودا قەڵەباڵغیان دروست کردووە. بەڵام هەژارەکان بڕوایان نەکرد و گوتیان تاکو خواردن و خواردنەوە وەرنەگرین، لێرە ناڕۆین.

شەمعون ناچار بوو بیانهێنێتە ناو حەوشەی ماڵەکەی خۆیەوە تا خواردنیان پێ بدات. بەڵام بە سواڵکەرەکانی ڕاگەیاند و گوتی کە تەنیا ئەوانەی لەبەردەم ماڵەکەدان دەتوانن بێنە ناو حەوشەکەوە و، ئەگەر سواڵکەرێکی تر تازە بگاتە ئێرە، ڕێگەیان پێ نادرێت، چونکە نە لە حەوشەکەدا جێی دانیشتنیان دەبێتەوە و نە ئەوەندەش ئازووقە لە ماڵەکەدا هەیە تا خواردنیان پێ بدرێت.

شەمعون ئافرەتە خزمەتکارەکەی خۆی بانگ کرد و گوتی: لەگەڵ غوڵامە یۆنانییەکە، خواردن و خواردنەوە لە نێوان ئەو سواڵکەرانەی کە لە حەوشەکەدا دانیشتوون و حەفتا کەس بوون، دابەش بکەن.

ئافرەتە خزمەتکارەکە گوتی: ئەو خواردنەی کە ئێمە لەم ماڵەدا هەمانە بەس نییە بۆ تێر کردنی ئەمانە.

شەمعون گوتی: هەرچیەك لەم ماڵەدا هەیە لە نان و ڕۆن و زەیتون و پەنیر و خواردنی وشك و ماسی سوێر، بۆیان بێنن و ئاگاتان لێیان بێت بۆئەوەی هەریەکەیان بەشی خۆی بدرێتێ.

سواڵکەرەکان تا ئەوکاتەی کە لە دەرەوەی ماڵەکە بوون، غەڵبەغەڵبیان دەکرد. بەڵام کاتێ هاتنە ماڵەوە و موزاییك و ستوونە یۆنانییەکان و گوڵدانە جوانەکانیان بینی، بێدەنگ بوون و دیاربوو کەوتوونەتە ژێر کاریگەری جوانی و شکۆی ئەو ماڵە.

کاتێ سواڵکەرەکان بە خواردنی خۆراکەوە خەریك بوون، شەمعون بە منی گوت: خۆشبەختانە ئەمڕۆ دوو کوڕە بچووکەکەی من کە ناویان "ئەسکەندەر" و "روفوس"ە لێرە نین و لە شار چوونەتە دەرەوە و، بەهۆی شەممەوە تا ڕۆژی یەك شەممە ناگەڕێنەوە و ئەگەر خۆیان نەبنە هۆی ئەوەی نەخۆش بکەون، ئەوا مێرووە وردەکان نەخۆشیان دەخەن. بەڵام من ترسم لە خۆم نییە، چونکە ئەو سەردەمەی کە غولام بووم، ئەوەندە بە نەخۆشی جۆراوجۆری مێرووە وردەکان ڕاهاتووم کە ئیدی ئەمڕۆ نەخۆش ناکەوم.

کتوپڕ زاخوس کە لەگەڵ ئەلیزەردا ڕۆیشتبوو بۆئەوەی خانووەکە بپشکن، دەرکەوت. بینینی زاخوس مرۆی دەهێنایە پێکەنین، چونکە سەرتاپای تۆزاوی و ڕەش و سپی دەنواند و دیاربوو بۆ دۆزینەوەی عیسا، کەندوی ئارد و کەندوی خەڵوزیش گەڕاوە.

زاخوس بە توڕەییەوە بە شەمعونی گوت: من تێ ناگەم، تۆ بۆچی ئەم کۆمەڵە خەڵکەت هێناوەتە ئەمماڵەوە، مەبەست ئەوە بووە تا من نەتوانم لە نێوان ئەم کۆمەڵە خەڵکەدا عیسا بدۆزمەوە و تۆش بتوانی لەم ماڵە بیبەیتە دەرەوە.

پاشان زاخوس، لەبەرئەوەی ئارەقی کردبوو و، کاتێ ڕوخساری بەداوێنی کەواکەی پاك دەکردەوە، ڕوخساری بەهۆی تۆزی خەڵوز و تۆزی ئاردەوە ڕەش و سپی ببوو و بە توڕەییەوە لە شەمعونی پرسی: چیت لە مەسیح کردووە؟

شەمعون گوتی: زاخوس، تۆ کە بڕوات بە مەسیح هەیە و ئەوت بینیوە و ناسیوتەتەوە، ئایا عیسا بەو پیاوە دەزانی کە من بتوانم بیشارمەوە و یان بتوانم بەبێ حەزی خۆی لەم ماڵە بیکەمە دەرەوە؟ من سەرەتا وامدەزانی کە ئەمڕۆ مەسیح نەهاتۆتە ئەم ماڵەوە، بەڵام ئێستە بڕوا بەوە دەکەم، چونکە ئەو پێشهاتانەی کە ئەمڕۆ لەم ماڵەدا ڕووی دا، دەری دەخات کە عیسا زیندووە. ئەو هاتە ئەم ماڵەوە، بەڵام نە من ناسیمەوە و نە ئەم پیاوە ڕۆمییەش ناسیەوە کە هاتووە بۆ ئێرە تاکو لەبارەی عیساوە وتووێژم لەگەڵ بکات و، پاش ئەوەی کە سواڵکەرەکان هاتن بۆ ئێرە من وامزانی ئەم کابرایە جادووگەرە، بەڵام ئێستە دەزانم کە جادووگەر نییە.

تاکە شوێنەوارێك کە لە عیساوە لەم ماڵەدا بەجێ ماوە، جێی پێیەکانییەتی و جگە لەمە ئاگام لەو نییە، تۆ کە لەگەڵ عیسادا قسەت کردووە و ئەمڕۆش لە دەرەوەی

شارەکە بینیوتە و ناسیوتەتەوە، داوات لێ دەکەم پێمان بڵێیت کە عیسا چی لەئێمە دەوێت و بۆچی ئەم ژیانە ڕێکوپێکەی ئێمە لەناو دەبات، بەڵام پێش ئەوەی قسە بکەیت و لەبەرئەوەی ئارداوی و خەڵوزاو بوویت، بهێڵە با بتشۆم.

ئینجا شەمعون ئاوی هێنا و من و "ئەلیزەر" یارمەتیمان دا و سەر و ڕوخسار و دەست و قاچەکانی "زاخوس"مان شوشت. پاش ئەوەی کە پیاوە کورتەباڵاکە پاك بوویەوە و لەبری ئەو جلوبەرگەی کە بە ئارد و خەڵوز و تەپوتۆز پیس ببوو، کەوایەکی خاوێن و نوێی هێنا و کردیەبەری.

"زاخوس" کە ئەو میهرەبانییەی لە "شەمعون" بینی، هێمن بوویەوە و دانیشت و گوتی: کاتێ عیسا هات بۆ شارەکەی ئێمە، واتە ئەریحا، پیاوێکی کوێری چاك کردەوە و کاتێ ئەو پیاوە نابینایە، بینایی چاوی بۆ گەڕایەوە و عیسای بینی، پێی گوت ((تۆ کوڕی "داوود"یت)). دوای ئەوە عیسا هات بۆماڵی من و لەوێدا شتێکی وای نەگوت کە تایبەتمەندیەکی تێدا بێت و ئەوەی دەیگوت ئەو شتانە بوو کە خەڵکی تر بیستبوویان. عیسا لە ماڵەکەی مندا گوتی کە لەلایەن مەلەکوتی ئەوەوە ئەو کەسەی کە تووشی گوناه بووبێت و پاشان پەشیمان بووبێتەوە و تەوبە بکات، ئەوا پاداشتی لەسەدا نەوەت و نۆی لەو کەسە زیاترە کە هەست بە پەشیمانی ناکات.

شەمعون گوتی: پەسەندکرنی ئەم بابەتە بۆ من زەحمەتە. چۆن دەکرێ گوناحکار و بەدکارەکان پاداشتیان زیاتر بێت لە چاکەکارەکان؟

زاخوس گوتی: من ئەم ڕاستیەم لە خۆمدا تاقی کردۆتەوە و بۆم دەرکەوتووە کە ڕاستە. من کابرایەکی گوناهبار بووم و هەستم دەکرد شانەکانم لەژێر باری گوناهدا چەماوەتەوە و ناتوانم خۆم ڕاست بکەمەوە. هەر ڕۆژێك تێپەڕی بکردایە، باری گوناهی من سەنگینتر دەبوو. من ئەوەندە خۆم بە گوناهبار دەزانی کە تەنانەت شەیتانیش ڕقی لێم دەبوویەوە تاکاتێ عیسا منی بینی و بەناوی خۆم بانگی کردم و بەبێ ئەوەی ڕقی لێم بێتەوە، هات بۆ ماڵەکەم و، ئەو کە کوڕی "داوود" بوو، لە تەنیشتم دانیشت و منیش لە ئاکارەکانی خۆم پەشیمان بوومەوە و تەوبەم کرد و، هەر کە تەوبەم کرد و گەڕامەوە ئەوەندە خۆم بە بارسوك و خۆشحاڵ دەزانی کە بەهۆی ئەو بارسوکییە زۆرەوە حەزم دەکرد بفڕم، ئەمە لە کاتێکدایە کە پێش ئەوە، پشتم لەژێر بار و پەستانی گوناهدا چەمابۆوە.

ئیتر ئەوکاتە بۆم دەرکەوت بێ هۆ نییە کە پاداشتی ئەو گوناهکارانەی پەشیمان دەبنەوە و دەگەڕێنەوە زیاترە لەو چاکەکارانەی کە هەست بە پەشیمانی ناکەن و، ئەوەندە خۆشحاڵ بووم کە نیوەی سامانەکەی خۆم لە نێوان کەسە هەژارەکاندا دابەش کرد، بەڵام پێموانییە ئێوە تێبگەن کە کاتێ من گەڕامەوە و ئیتر هەستم بە باری گوناه نەدەکرد لەسەر پشتم، چ هەستێکم هەبوو.

شەمعون گوتی: من پێموایە لەبەرئەوەی تۆ زانیوتە کە سەرپێچییەکانت بەزوویی ئاشکرا دەبێت و لەوە ترساویت پێت بزانن کە لەڕێگای ناڕەواوە سەروەت و سامانت بەدەست هێناوە، بۆیە نیوەی سەروەتەکەی خۆت بەخشیوە بە هەژارەکان بۆئەوەی بتوانی نیوەکەی تر بپارێزیت و، ئێستەش لەوە دڵنیایت کە نیوەی داراییەکەت بۆ ماوەتەوە.

زاخوس گوتی: من لە قسەکەی تۆ دڵگران نابم، چونکە دەزانم تۆ ئازادیت لەوەی کە لەبارەی مەبەست پاکی منەوە بەگومان بیت. منیش کاتێ کە دەبینم کەسێك بۆ کارێکی چاکە زەرەر لە خۆی دەدات، دەڵێم چاکە کردنی ئەو کابرایە بۆ مەبەستی بەرژەوەندیەکی تایبەتە و دەیەوێ لەو ڕێگەیەوە سوودی زیاتر وەربگرێت لەوەی کە دەیبەخشێت. بەڵام ئەوەی کە وای لەمن کرد نیوەی سامانەکەم بدەم بە هەژارەکان ئەوەبوو کە عیسا دوای ئەوەی هات بۆ ماڵەکەم، چیرۆکێکی بۆ گێڕامەوە کە وەکو مەتەڵ وابوو.

شەمعون پرسی: دەکرێ ئەو چیرۆکەمان بۆ بگێڕیتەوە؟

زاخوس گوتی: بەڵێ. عیسا بەمنی گوت لە کۆندا کابرایەك هەبوو کە دەبوو لە نیشتمانەکەی خۆیەوە گەشت بکات و بڕوات بۆ جێگایەکی تر تاکو بە پادشایی هەڵبژێردرێت، واتە بۆئەوەی تاجی پادشایی لە پادشایەکی گەورەتر وەربگرێت و بگەڕێتەوە بۆ نیشتیمانی خۆی. ئەو پیاوە پێش ئەوەی بەڕێ بکەوێ، دە هەزار درهەم پارەی نەختی دا بە خزمەتکارەکانی خۆی بەجۆرێك کە هەریەکیان هەزار درهەمی بەرکەوت. ئەو پیاوە بە خزمەتکارەکانی خۆی گوت ((کاتی من ڕۆیشتم، هەریەك لە ئێوە ئەو هەزار درهەمەی کە پێم داون، بیخەنە کار و ئیشی پێوە بکەن تا من دەگەڕێمەوە، دەبێ سەرمایەکەم زیادی کردبێت)). ئینجا بەڕێ کەوت و ڕۆیشت. دەبێ بڵێم کە هاونیشتیمانەکانی، ئەو پیاوەیان خۆشنەدەویست و نەیاندەویست ببێ بە پادشایان.

پاش ماوەیەکی کەم ئەو پیاوە گەڕایەوە و هاتەوە بۆ نیشتمانەکەی و خزمەتکارەکانی خۆی بانگ کرد و لێیانی پرسی ((چیتان بە پارەکانی من کرد؟))

خزمەتکاری یەکەم، دە هەزار درهەمی خستە بەردەمی و گوتی ((من بازرگانیم بە پارەکەی تۆ کرد و پارەکەم بۆ کردوویت بە دەهەزار درهەم))

کاتێ قسەکەی زاخوس گەیشتە ئێرە، من قسەکەیم بڕی و گوتم: من بیستوومە کە عیسا پیاوێکی گەورە بووە و کردارەکانی نیشانەی گەورەیی ئەوە و، پیاوێکی گەورەی وەکو عیسا دەبێ لەسەر بابەتی دوور لە پارەوە قسە بکات و دەبوو قسەکانی لەبارەی ژیانی نوێ و خۆشبەختی بووایە.

زاخوس گوتی: عیسا دەیزانی کە من باج وەردەگرم و لە بابەتی پەیوەست بە پارەوە نەبێت تێ ناگەم.

شەمعون گوتی: زاخوس ڕاست دەڵێت و ئێمەی یەهوودی، زیاتر لە بابەتی پەیوەست بە پارەوە تێ دەگەین وەك لەمەسەلەکانی تر و ئەو هەزار درهەمەی کە ئەو پادشایە داویەتی بە هەریەك لە خزمەتکارەکانی خۆی بۆئەوەی ئیشی پێوە بکەن، بڕێکی زۆرە. بەم حاڵەشەوە ناتوانرێ لەماوەیەکی کەمدا ئەو پارەیە بکرێت بە دە هەزار درهەم و دەبێ ماوەیەکی زۆری بەسەردا بچێت تا ئەو هەزار درهەمە ببێت بە دەهەزار درهەم.

زاخوس گوتی: جا ئێوە دەهێڵن ئەو چیرۆکەی کە لە عیسام بیستبوو، تەواوی بکەم یان نا؟

شەمعون گوتی: درێژەی چیرۆکەکە بگێڕەوە.

زاخوس گوتی: کاتێ پاشاکە سەیری کرد کە خزمەتکاری یەکەم توانیویەتی هەزار درهەم بکات بە دە هەزر درهەم، گوتی ((من ڕێت پێ دەدەم فرمانڕەوایی دە شاری ئەم وڵاتەی من هەڵبژێریت و هەر شارێکت هەڵبژارد، ئەوا من فەرمان دەدەم تۆ بکەمە فەرمانڕەوای ئەو شارانە)).

پاش ئەوە، خزمەتکاری دووەمی بانگ کرد و لێی پرسی کە ((چیت کردووە بە هەزار درهەمەکەی من؟)) ئەو گوتی ((من بە هەزار درهەمەکەی تۆ کاسبیم کردووە و کردوومە بە پێنج هەزار درهەم)).

پادشا گوتی ((من فەرمانڕەوایی پێنج شار لە شارەکانی خۆم دەدەم بە تۆ)).

پادشا بەم شێوەیە بەهۆی ئەوەی کە توانیبوویان پارەکەی زیاد بکەن، بەپێی زیادیی پارەکانیان، فەرمانڕەوایی چەند شارێکی سپارد بە هەریەك لە خزمەتکارەکانی خۆی تا گەیشتە دوایین خزمەتکار. پادشا لێی پرسی کە ((تۆ چیت کرد بە پارەکەی من؟))

خزمەتکارەکە گوتی: ((من لە تۆ دەترسام، چونکە دەمزانی کابرایەکی توندوتیژیت و دەتەوێ لەو جێگەیە درەوبکەیت کە نەتکێڵاوە، چی بکات بەوەی کە کێڵاوتە. من لەوە دەترسام کە ئەگەر کاسبی بە پارەکەی تۆوە بکەم و زەرەری تێدا بکەم و ئەم هەزار درهەمە لەناو بچێت، بۆیە پێچام لە پارچە پەڕۆیەکی کۆنەوە و شاردمەوە و ئێستەش کە تۆ گەڕاویتەوە، هەر وەکو خۆی پێت دەدەمەوە)).

پادشا گوتی ((بۆ گوتەکانت داوای بەڵگەت لێ دەکەم و تۆ گوتت کە من کابرایەکی توندوتیژم و دەمەوێ لەو جێگایە درەو بکەم کە نەمکێڵاوە. تۆ کە منت دەناسی، دوای ئەوەی زانیت لەوە دەترسیت کە ئیش بەم پارەیە بکەیت، ئەی بۆچی نەتدا بە پارەگۆڕەوەیەك تاکو من بتوانم لە دوای گەڕانەوەم، سوودی پارەکەی خۆمی لێ وەربگرم؟)).

خزمەتکارەکە گوتی ((ئەو پارەیەی کە پێت دابووم، ئەمانەتی تۆ بوو، بۆیە نەمدەتوانی ئەو ئەمانەتیە بدەم بە کەسێکی تر و، لەوە دەترسام کە ئەگەر بیدەم بەیەکێکی تر، خیانەت بێت لە ئەمانەتەکە)).

پادشا بە خزمەتکارەکانی خۆی گوت ((لەناو ئێوە، تاکە کەسێك کە کارێکی ژیرانەی کردبێت، ئەم پیاوەیە و لە ئێوەشی بە پاشتر و لەبەرتر دەزانم، چونکە لە ئەمانەتەکەدا خیانەتی نەکردوە و شانی نەداوەتە ژێر باری سەنگینی جوانکارییە دنیاییەکان، بەبێ ئەوەی کە خۆی سوودی لێ ببینێت. زۆربەی خەڵکی دنیا لە هەموو ژیانیاندا هەوڵ دەدەن و، ماڵ و سامان کۆدەکەنەوە و هەرچەندە زیاتر دەوڵەمەندتر بن، ئەوەندە چاوبرسیتر دەبن و گوناهی کۆکردنەوەی ئەو ماڵە بە شێوەی ناڕەوا دەخەنە ملیان بەبێ ئەوەی خۆشیان سوودی لێ ببین. من گومانم لەوە نییە کە خزمەتکارەکانم بۆئەوەی بتوانن لەماوەیەکی کەمدا هەزار درهەمەکە بکەن بە دە هەزار درهەم یانیش پێنج هەزار درهەم، تووشی ستەمکاری بووبن، چونکە هەزار درهەم لە ماوەیەکی کەم دا نابێت بە دەهەزار درهەم، تەنیا مەگەر ستەم لە خەڵکی هەژار بکەن و پارەیان لێ

وەربگرن و لاوازەکان ئازار بدەن. ئەمانە باری گوناهیان گرتووە بە کۆڵەوە و خۆشیان سوودیان لە گوناهەکەی خۆیان نەبینیوە. ئەو دەوڵەمەندانەش کە لە دنیادا بە جۆرەها هۆکاری ناڕەوا سەروەت و سامان خڕ دەکەنەوە، وەکو ئەمانە وان و باری گوناه دەگرنە ئەستۆ، بەڵام سوود لە سەروەتەکەی خۆیان نابینن، چونکە ماڵی دنیا بەجێ دەهێڵن و لەم جیهانە دەڕۆن و سەروەت و سامانەکانیشیان بۆ کەسانی تر بەجێ دەمێنێ)).

من لە "زاخوس"م پرسی: ئەو چیرۆکەی کە تۆ لە عیسات بیست، هەر ئەمەبوو و، هەڵەت تێدا نەکردووە؟

ئەو پیاوە گوتی: لەوانەیە لە شتە لاوەکیەکاندا هەڵەم کردبێ، بەڵام بە گشتی هەڵە ناکەم و ئەوەی کە عیسا گوتی هەر ئەوەندە بوو.

لەناکاو شەمعون بە ئەلیزەری گوت: یەکسەر بڕۆ بۆ کۆگا و هەرچی جلوبەرگ هەیە لەناو کۆگا دەریانبهێنە و لەنێوان ئەو هەژارانەی کەلە حەوشەکەدان و نان دەخۆن، دابەشیان بکە.

هەموویان بەم قەسەیە سەرسام بوون و ئەلیزەر گوتی: بۆچی بڕۆم بۆ کۆگا و ئەو جلانەی کە لەوێن، لەنێوان هەژارەکاندا دابەشی بکەم؟

شەمعون گوتی: چونکە ماڵی دنیا قورسە و من دەمرم و ئەو جلانە هەر بۆ خەڵك دەمێنێتەوە.

ئەلیزەر گوتی: تۆ کە دەتەوێ ئەو پۆشاکانەی کە لە کۆگادان بیاندەیت بە هەژارەکان، لەبیری من و ژن و منداڵەکانیشمدا بە.

شەمعون گوتی: هەرچەندە پۆشاکت بۆ خۆت و ژن و منداڵەکانت دەوێ، هەڵی بگرە و ئەوەی کە ماوە بیدە بە هەژارەکان و ئەگەر کورتی هێنا، ئەوا دەتوانی ئەو کەوایەی کە بە شانمەوەیە، دایبگریت و بیدەی بە هەژارەکان.

زاخوس گوتی: شەمعون، لە هەموو کاتێکدا دەبێ یەکسانی پەیڕەو بکەیت. منیش کاتێ ویستم ماڵ و داراییەکەم ببەخشم بە هەژارەکان، یەکسانیم پەیڕەو کرد و نیوەی ماڵەکەم بەخشی و نیوەکەی ترم هێشتەوە.

کاتێ قسەکەی زاخوس گەیشتە ئێرە، بێدەنگ بوو و سەیرێکی دەرەوەی کرد و گوتی: گوێدرێژەکەی من دیار نەماوە. من کاتێ هاتم بۆ ئێرە گوێدرێژەکەم پێ بوو و بەستبوومەوە بە ئەڵقەی دیوارەوە و ئێستە دەبینم دیار نەماوە.

شـەمعون گـوتی: لەوانەیـە ڕەشمـەی گوێدرێژەکـەت کراوبێتـەوە و ڕۆیـشتبێ، دەتوانی هەر لەم دەوروبەرەدا گوێدرێژەکەت بدۆزیتەوە.

زاخـوس لـەماڵ چـووە دەرەوە و کـەمێك دەوروبـەری ماڵەکـە گـەڕا و گـوتی: گوێدرێژەکە دیار نەماوە و پێموایە ئەوکاتەی کە کۆڵانەکە پڕ بوو لە سواڵکەرەکان، یەکێ لە سواڵکەرەکان ڕەشمەی گوێدرێژەکەی کردۆتەوە و سواری گوێدرێژەکەم بووە و ڕۆیشتووە.

من لە زاخوسم پرسی: تۆ ئێستا دەتوانی بڕۆیت بە دوای دزەکەدا و دەزگیری بکـەیت؟ دزەکـە بـەزوویی دەردەکـەوێت، چـونکە نـاتوانێ گوێدرێژەکـە بـشارێتەوە و ئەگەریش لەناو گەوڕدا پەنهانی بکات، دیسان دەدۆزرێتەوە و تۆش دەتوانی سەربدەی لە گەوڕەکان و گوێدرێژەکەت بدۆزیتەوە.

زاخـوس گـوتی: مـن ناچـم بـەدوای دزەکـەدا، چـونکە لەوانەیـە ئـەو کەسـەی گوێدرێژەکـەی منـی بـردووە، پێویـستی پـێ‌ی بـووە، ئـەگینا نەیدەویـست گوێدرێژەکـەم بدزێت. من دەتوانم گوێدرێژێکی تر بکڕم و سواری پشتی ببم، هەربۆیە ناگەڕێم بەدوای دزەکەدا.

من لە قسەکەی زاخوس و شەمعون سەرم سوڕ مابوو و لە دڵی خۆمدا دانم بەوەدا نا کە گەورەترین مۆعجیزەی عیسا کە لـە زینـدوو کردنـەوەی مردوو گەورەترە، ئەمەیە کە ئەو یەهوودیانەی وەکو زاخوسی وەرگری باج، واتـە پیاوێك کەلە هـەموو تەمەنیـدا خووی بەوەوە گرتووە کە هەر وەربگرێت و هـەرگیز هیـچ نەبەخشێ، شـەمعونی غـولامی ئازاد کراویشی وا لێکردووە کە سامانی خۆیان بدەن بە هەژارەکان.

ئەو کەسانەی کە لە ڕابردوودا غولام بوون و سەختییان کێشاوە، زۆر قەدری مـاڵی دنیا دەزانن. ئەزموونـە زۆر تاڵەکانی ژیانیان فێری کردوون کە هـەر (پشین)ێك نرخ و بەهای خۆی هەیە و ئەو کەسەی کە یەك پشیز زایاتری هەبێت لەچاو یەکێکی تـر وەکو پیاوێك لە قەڵەم دەدرێت کە بەهێزتر بێت لەوی تر.

بەڵام عیسا بە جۆرێك کاری لـە زاخـوس و شـەمعون کردووە کـە ئـەوەی یەکـەمیان نیـوەی سامانەکەی خـۆی ببەخـشێ بـە هـەژارەکان و، پاشـان شـەمعون بـەهۆی بیـستنی چیرۆکێك لە عیساوە-لە زمانی زاخوسەوە- ڕازی بوو تا یارمەتی هەژارەکان بدات.

سـوالْکەرەکان لـە حەوشـەکەدا خـەریکی نـانخواردن بـوون و ئـەلیزەر بەسـتەکانی جلوبـەرگی لـە کۆگاکـە هێنایـە دەرەوە و لـەلای حەوشـەکەدا دایـدەنا بۆئـەوەی دواتـر لەنێوان سوالْکەرەکاندا دابەشی بکات. ئافرەتە خزمەتکارەکەی ئەو مالْە کە دەرگای بە ڕووی سوالْکەرەکان کردەوە، وا تەماشای دەکردن کە بۆچی شەمعون سامانەکەی خۆی لەنێوان سوالْکەرەکاندا دابەش دەکات.

مـن سـەیرم کـرد سـوالْکەرەکان لـەکاتی نانخواردنـدا، وەکـو ئـەو میوانانـەی کەلـە دانیشتنێکندا میوانداری کرابن، خۆشیان بەیەکتری دەناساند.

کاتـێ شـەمعون بینـی کـە مـن بـە سـەیرکردنی سـوالْکەرەکانەوە قالْ بـووم، ئـەویش چاوی بڕییە ئەوان و پاش چەند ساتێك دەنگی بەرز کردەوە: ئەی ئەو کەسـانەی ئـەمڕۆ لەم مالْەدا نان دەخۆن و شەربەت دەخۆنەوە، ئەوە بزانن کە میوانداریی ئێوە عیسایە.

من بە هێمنی بە شەمعونم گوت: لەوانەیـە ئـەو پیـاوەی کـە سـوالْکەرەکانی ئاگـادار کردۆتـەوە و بەهۆیـەوە تـۆش ئـەمڕۆ خواردنیـان پـێ دەدەیـت، خـودی عیـسا بووبێـت. ئەمڕۆ عیسا لـەم مالْـەدا خۆی بە ئێمـە نیـشان دا، بـەلاّم ئێمـە ئـەومان نەناسـی و پـاش ئـەوەی لێـرە ڕۆشـتە دەرەوە، لەوانەیـە سـوالْکەرەکانی ئاگـادار کردبێتـەوە کـە تـۆ خواردنیـان پـێ دەدەیـت تـاکو تاقیـت بکاتـەوە و بزانـێ ئامادەیـت ئـەمڕۆ کۆمـەڵێك لـە سوالْکەرەکان تێر بکەیت یان نا.

شەمعون جارێکی دی بە سوالْکەرەکانی گوت: ئەمڕۆ لـەم مالْـەدا میوانداریی ئێوە عیسایە. ئەنجومەنی بالاّی ئێوە، فەرمانی دا بە کوشتنی عیسا و لەسێدارەیان دا، بەلاّم ئەمڕۆ ئەو خولْکێ ئێوە دەکات.

یەکێ لە سوالْکەرەکان سەری بەرزکردەوە و گوتی: شـەمعون، بـەو عیـسایەی کە ئـەمڕۆ میوانـداری ئێمەیـە، بلْـێ بۆچـی شـەربەتی ترشمـان پـێ دەرخـوارد دەدات؟ ئـەم شەربەتە ترشەی کە ئێمە لەگەلْ شیودا دەیخۆینـەوە، دەمـی تـورش کـردووین و ناهێڵـێ چێژ لەو خواردنە وەربگرین، بە عیسا بلْێ با شەربەتی شیرینمان بداتێ تـاوەکو دەممـان شیرین بێت.

شـەمعون بـە ئـەلیزەر و دوو خزمـەتکاری تـری گـوت تـا شـەربەتی شـیرین بـدەن بـە سـوالْکەرەکان. خزمـەتکارەکان فەرمانەکـەیان جێبـەجێ کـرد و شـەربەتی شـیرینیان بـۆ سوالْکەرەکان هێنا.

پاشان، شەمعون گۆزەڵەیەکی بچووکی هێنا و بە سواڵکەرەکانی گوت: ئەم گۆزەڵەیە پڕە لە ڕۆنی بۆنخۆش، واتە پڕە لە ڕۆنێك کە لەگەڵ بۆنی گوڵدا تێکەڵ کراوە، چونکە ناتوانرێ بۆنی گوڵ بکرێت مەگەر بەهۆی ڕۆنەوە نەبێ. ئێستەش من سەری ئەم گۆزەڵەیە دەکەمەوە و لەم عەترە دەدەم لە ڕوخسار و ملتاندا بۆئەوەی بۆنتان خۆش بێت. ئێستە ئەم حەوشەیە بەبۆنی ناخۆشی ئێوە بۆگەن بووە، بەڵام پاش ئەوەی کە من عەترم پێوەکردن، بۆگەنەکەتان نامێنێت و بۆنی خوشی گوڵ جێی دەگرێتەوە.

شەمعون سەری گۆزەڵەکەی کردەوە و لە سواڵکەرەکان نزیك بوویەوە و عەتری دا لە ڕوخسار و گەردنیان و پاش کەمێکی تر، بۆنی خۆشی عەتر لە هەوادا بڵاوبوویەوە.

لەناو سواڵکەرەکاندا کوڕێکی تەمەن بچووك هەبوو کەکاتێ شەمعون لێی نزیك بوویەوە، دەنگی بەرزکردەوە و گوتی: شانەیەکم بۆ بێنن تا قژی ئەم کوڕە شانە بکەم و مێرووەکان لەسەری دوور بخەمەوە.

شانەیەکیان بۆ برد و شەمعون پرچە شێواو و چڵکنەکەی ئەو کوڕەی شانە کرد و مێرووەکانی لەسەری دەرهێنا و ئینجا کوڕەکەیان لەناو حەوزدا شوشت و پۆشاکێ لە پۆشاکەکانی خۆیی کردەبەری و عەتری دا لە لەشیەوە و گوتی: ئێستە تۆ وەکو کوڕی فەرمانڕەوای گشتیت لێهاتووە و هەرکەسێ بتبینێت، وانازانێ کە تۆ کوڕە سواڵکەرێکیت.

ئەو سواڵکەرانەی کە نانیان خواردبوو و شەربەتیان خواردبۆوە و جلوبەرگیان لە ئەلیزەرە وەرگرتبوو، نیگای ماناداریان لەیەك دەکرد. من پەیم بە واتای نیگاکانیان برد و زانیم بەو شێوەیە بەیەکترێ دەڵێن خاوەنی ئەمماڵەی کە خواردن و خواردنەوە و جلوبەرگی بە ئێمەدا، مەستە و، ئەم بەخشینانەش بەهۆی مەستییەوەیە، بەڵام ئەگەر بێتەوە سەرهۆش خۆی ئەوا پەشیمان دەبێتەوە و جلوبەرگەکانمان لێ وەردەگرێتەوە و واباشترە پێش ئەوەی بێتەوە سەر هۆشی خۆی، لەم ماڵە بڕۆینە دەرەوە.

سواڵکەرەکان هەستانەوە و بە خاوەن ماڵیان گوت: چاکە ببێ بەنسیبت.[٣٦]

شەمعون گوتی: میوانەکانی عیسا، بۆ کوێ دەچن؟ ڕاوەستن.

---

[36] سلاو و ماڵئاوایی جولەکەکان لەم سەردەمەدا، تەنیا ئەم وشەیە بوو کە ئێستەش لە زمانی عەرەبیدا هەیە و ئەمڕۆ بە شێوەی (سەلاموعەلەیك) یان (سەلاموعەلەیکوم) دەگوترێت.

سواڵکەرەکان لە ترساندا ڕاوەستان، چونکە وایاندەزانی شەمعون دەیەوێ ئەوەی کە شایانی وەرگرتنەوەیە (واتە جلوبەرگەکان) لێیان وەربگرێتەوە.

بەڵام ئەو بە من و زاخوسی گوت: هاوکاریم بکەن تا دەرگای سندوقەکەی خۆم بکەمەوە.

من و زاخوسی وەرگری باج، پارمەتیمان دا و قوفڵە گەورەکەی سندوقەکەمان کردەوە و کیسەیەکی چەرمینی هەڵئاوساوی لێ هێنایە دەرەوە و پاشان توورەکەکەی کردەووە و بە دەنگی بەرز بە سواڵکەرەکانی گوت: ئەمڕو لەمماڵەدا، میوانداریی ئێوە عیسایە و ئەو نان و شەربەتەی کە خواردتان، هینی ئەوە و ئەو حەزدەکات هەریەکێ لە ئێوە، کاتێ لەم ماڵە دەڕۆنە دەرەوە، یادگارییەکی لێ وەربگرن.

شەمعون لەناو توورەکە چەرمینەکەدا، پارە و زیوەکانی دەردەهێنا و دەیخستە ناو دەستی سواڵکەرەکان و هەریەکەیان کە بەشی خۆی وەردەگرت، بەپەلە لەو ماڵە دەچووە دەرەوە، چونکە دوای ئەوەی کە شەمعون بڕیاری دا پارەی زیویان لەنێواندا دابەش بکات، گومانی ئەوان لەبارەی مەستیی خاوەن ماڵەکە گۆڕا بە دڵنیایی و ئەوان بێگومان بوون لەوەی کە شەمعون سەرخۆشە و بەدڵنیاییەوە دوای ئەوەی هۆشی هاتەوە سەرخۆی، پەشیمان دەبێتەوە و پارەکەیان لێ وەردەگرێتەوە.

دوای ئەوەی سواڵکەرەکان ڕۆیشتن و غەڵبەغەڵبەکەیان نیشتەوە، شەمعون بە من و زاخوسی گوت: ئەمڕۆ بۆ ئێمە ڕۆژی جەژنە و ئێمە توانیمان عیسا ببینین کە دیارە نەماننناسیوە.

پاشان بە ئەلیزەری گوت: تۆ ئەمڕۆ عیسات نەبینی، بەڵام دەتوانی جێگاپێیەکەی لەم حەوشەیەدا ببینی.

ئەلیزەر گوتی: من ئەمڕۆ بەهۆی وتوویژ لەگەل سواڵکەرەکان ئەوەندە ماندوو بووم کە ئەگەر دە ڕۆژ بە بەردەوامی و بێ پشوودان لە بیابان کارم بکردایە، ئەوەندە ماندوو نەدەبووم. چونکە هەریەکێ لەوان ڕایەکی هەبوو و هەریەکێکیان ناڕەزاییەکی دەردەبڕی و من بەو گرفتە زۆرانەشەوە توانیم هەموویان ڕازی بکەم. ئێستەش ئەگەر ئێوە ئیزن دەدەن، با بڕۆم پشوو بدەم تاکو بتوانم سبەی ئامادە بم بۆ کارکردن.

شەمعون گوتی: بڕۆ و پشوو بدە. بەڵام زاخوس، تۆ ئەمشەو لێرە بمێنەرەوە و لە ژووری میوانخانەکەی من بخەوە، چونکە لێرەوە تا شاری ئەریحا ڕێگەیەکی دوورە و ئەگەر بگەڕێیتەوە، لە بیابان شەوت بەسەردا دێت و ناتوانی خۆت بگەیەنیتە شار.

بەڵام تۆی کابرای ڕۆمی کە ئەمڕۆ هاتیت بۆ ئەم ماڵە و من لاموابوو کە ئیتر ناتبینمەوە، چۆنت حەز لێیە وا بکە، ئەگەر حەز دەکەیت لەم ماڵەدا بمێنیتەوە، ئەوە لێرە بخەوە و ئەگەریش پێتوایە لەماڵی خۆتدا ئاسوودەیت، بڕۆ بۆ ماڵی خۆت. من بۆیە پێت ناڵێم کە دەبێ هەر لێرە بیت، چونکە دەزانم لەم شارەدا ماڵت هەیە و دەتوانی بڕۆیتەوە بۆ ماڵی خۆت و ئاشکرایە کە هەموو کەسێ لە ماڵی خۆیدا ئاسوودەترە. من لەم ڕۆژانەی دواییدا بە ئاسوودەیی نەخەوتووم و بەردەوام پەرێشان بووم و بیرم لە عیسا دەکردەوە. بەڵام ئەمڕۆ کە توانیومە عیسا ببینم، پەرێشانیم نەماوە و دەتوانم بخەوم و خوداحافیزی لە ئێوە دەکەم و دەڕۆم بخەوم.

شەمعون ڕۆیشت بۆئەوەی بخەویت و من و زاخوس کەمێ لە حەوشەکەدا دانیشتین و وتووێژمان کرد. زاخوس دەیویست بزانێ کە من لەبارەی زیندوو بوونەوەی عیساوە چی دەزانم.

من بەکورتی ئەو ڕووداوانەی لە دوای زیندوو بوونەوەی عیسا بۆم هاتبووە پێش (تا ئەو شوێنەی کە پەیوەندی بە عیساوە هەبوو) بۆم باس کرد و گوتم: دوو کەس لە قوتابییەکانی ئەو، بە ناوەکانی تۆماس و یۆحەننام بینیوە و هەروەها لەگەڵ مریەمی مەجدەلییەدا وتووێژم کردووە، بەڵام ئەوان نەیانویست یانیش نەیانتوانی زانیاری ڕوون و ئاشکرام پێ بدەن تا ڕۆحی تینووی من تێر بکەن، بەڵام لەسەرووی ئەمانەوە بڕوام وایە کە هەم مریەمی مەجدەلییە لەدوای مەرگی عیسا، ئەوی بینیوە و هەمیش ژمارەیەك لە قوتابییەکانی ئەو لە ژووری بالاخانەیەك کە کاتێ عیسا لە دەرگای قوفڵکراوی ئەو ژوورە ڕۆشتبووە ژوورەوە، خۆی بەوان نیشان داوە.

پاش ئەم قسەیە، من لە زاخوس جیابوومەوە و گەڕامەوە بۆ ماڵەکەی خۆم.

# هاتنی کابرایەک بۆ ماڵەکەم کە نهێنی لەلابوو

ڕۆژی دواتر شەممە بوو و هیچ دەنگێ لە شارەکەدا بەرز نەدەبۆوە، چونکە بەپێی یاساکانی ئایینی یەهوودییەکان، لە ڕۆژی شەممەدا هەموو جۆرە کار و چالاکیەك، جگە لە خواپەرستی و پاڕانەوە (لە نوێژخانە نەك لەپەرستگا) حەرامە.

شەوی پێشتر، بە بانگەوازێکی تایبەت دەرگای پەرستگاکەیان داخست تاکو جوولەکەکان ئاگادار بکەنەوە کە شەممە دەستی پێ کردووە و تا ڕۆژی یەك شەممە دەرگای پەرستگاکە ناکرێتەوە.[٣٧] منیش ئەو ڕۆژە لەماڵ نەچوومە دەرەوە بۆئەوەی یادەوەریەکانی ڕۆژی پێشتری خۆم بۆتۆ — ئەی تولیا— بنووسم تا لەکاتی عەسردا، ئادەن ئابری ئەفسەری ڕۆمی هات بۆ ماڵەکەم. دەبێ لەبیرت نەچووبێتەوە کە ئادان ئابر هەر ئەو ئەفسەرە بووە کە بەرپرسیارێتی و چاودێری لەسێدارەدانی عیسای پێ سپێردرا و پاش مردنی، لەگەڵ من هات بۆ بینینی مەزارەکەی عیسا.

کاتێ هاتە ماڵەکەمەوە، سەیرم کرد کڵاوخوودی نەکردۆتە سەری و کەوایەکی سریانی[٣٨] لەبەرکردبوو بۆئەوەی جلوبەرگە نیزامییەکەی نەبینرێت. ئادان ئابر دوای هاتنە ژوورەوەی، کەواکەی خۆی داکەند و دانیشت و گوتی: ماوەیەکە تۆم نەبینیوەو وامزانی لەم شارە ڕۆیشتوویت و بەهۆی ئەوەی شەممەیە، هاتووم تا تۆ ببینم، چونکە لە ڕۆژەکانی شەممەدا ئێمەی نیزامیی ڕۆمیی، بۆ ڕێزگرتن لەو بۆنەیە کارناکەین و پشوو دەدەین و سەربازەکان نابەین بۆ مەیدانی سێرکی ئەم شارە تاکو ڕاهێنانی نیزامی و جەنگییان پێ بکەین. لەم ڕۆژەدا، سەربازەکانی ئێمە ئیزنیان نییە لە سەربازخانە بچنە دەرەوە، چونکە دەزانم کە ئەگەر ئیزنی چوونە دەرەوەیان پێ بدرێت، شەراب دەخۆنەوە و گۆشتی بەرازە سەربڕاوەکان بە یەهوودییەکان نیشان دەدەن تاکو

---

[37] گەلی جوولەکە لەیەك پەرستگا و بە گوتەی ئەو گەلە لەیەك (هیکل) (کە ئێمە وشەی "هەیکەل"ی بۆ بەکار دێنین) زیاتریان نەبووە، بەڵام لە شاری (قودس) و شارەکانی تردا نوێژخانەی زۆریان هەبووە و لە ڕۆژەکانی شەممەدا خەڵك لە نوێژخانەکاندا کۆ دەبوونەوە و خوداپەرستیان دەکرد.

[38] (سریانی) واتە شتێك کە تایبەت بێت بەو وڵاتە یان خەڵکی (سوریا) و جلوبەرگی سریانی، واتە ئەو پۆشاکەی کە دانیشتوانی (سوریایی) دەیانپۆشی و زمانی سریانی واتە زمانی خەڵکی سوریا.

تورەیـان بکـەن، چـونکە بـەوجۆرەی کـە دەیـزانین لـە ئـایینی جوولەکەکانـدا خـواردنی گۆشتی بەراز حەرامە و یەهوودییەکان ڕقیان لە بەراز دەبێتەوە.

خاوەن ماڵەکەم خەڵکی سوریا بوو، ئەو کاتێ زانی میوانم بۆ هاتووە، دەفرێکی پڕ لـە خـۆراکی جۆراوجـۆری بـە کوڕەکەیـدا نـارد بـۆ ژوورەکـەم. ئـادان ئـابر پـاش ئـەوەی نەختێ لە خواردنەکەی خوارد، بە وردی سـەیری منـی کـرد و گـوتی: مـەزن تیـوس، تـۆ گۆڕاویت، چونکە نەك هەر وەکو یەهوودییەکان ڕیشت هێشتۆتەوە بەڵکو نینۆکەکانت وەکـو یەهوودییـەکان بـە خەنـە ڕەنـگ کـردووە و هەرکەسـێ تـۆ ببینـێ، وادەزانـێ جوولەکەیت.

گوتم: ئادان ئابر، من دان بەوەدا دەنێم کە دوای ئەوەی هاتوومەتە ئەم شارەوە، هەندێ شتم بینیوە کە منی سەرسام کردووە.

ئەفسەرە ڕۆمییەکـە گـوتی: لەمەبـەدواوە بـەناوی ڕۆمییەکـەم کـە "پرتونیـوس"ە بانگم بکە. پرتونیوس، ناوە ڕۆمییەکەی منـە و کاتێ مووچە وەردەگرم، بـەم نـاوە واژۆ دەکەم و، کاتێ لەسەر تابلۆی مۆمیی فـەرمانی نیزامـی بـۆ مـن دەردەکـەن، بـەم نـاوە بـۆم دەنێرن، دووریش نییە کە من لەگەڵ بەرز بوونەوەی پلەکەم، بگوازرێمەوە بۆ گـوڵ (واتـە وڵاتی فەرەنسای ئەمڕۆ) یان "ئیسپانیا" یاخود "ڕۆم".

گوتم: پیرۆزباییت لێ دەکەم.

من زانیم کە ئادان ئابر بە وردی سـەیری مـن دەکـات و دەتگـوت دەیـەوێ قسەیەك بکات بەڵام نازانێ بیڵێت یان نا. ئینجا گوتی: مەزن تیوس، تۆ ئاگات لەو پڕوپاگەندەیە هەیە کە لەشاردا بڵاوبۆتەوە؟

گوتم: نەخێر.

ئادان ئـابر گـوتی: لـەناو شـار دەڵێن پێش ئـەوەی خـۆر هـەڵهبێت، بوومەلەرزەیـەك ڕووی داوە و زۆربەی ئـەو بەردانـەی کـە لەسـەر گـۆڕەکـان بـوون، لاچـوون و ژمارەیـەك لـە مردووە ناسراوەکان لە گۆڕ هاتونەتە دەرەوە و بەناوشـاردا ڕۆشـتوون و خـەڵك ئـەوانیان بینیوە.

گـوتم: ئـەوە جوولەکـەکان ئـەم پڕوپاگەنـدەیان بـڵاو کردۆتـەوە تـاکو دەنگوباسـی زیندوو بوونەوەی عیسا بە بچووك و بێ کاریگەر نیشان بدەن. من و تۆ ئەوە دەزانین کە لەیەك کەس زیاتر لەناو گۆڕ نەهاتۆتە دەرەوە و ئەو کەسەش عیسایە. ئێستە دەزانم کە

بۆچی دەیانەوێ پلەت بەرز بکەنەوە و لێرەوە بتنێرن بۆ گوڵ یان ئیسپانیا یانیش بۆ خودی ڕۆم، چونکە دەترسن لەوەی کە تۆ بینیوتە، بۆ خەڵکی بگێڕیتەوە. تۆ سەربازێکی سادەی لژیون نیت تا بتوانن پێت بڵێن زمانی خۆت بگرە. تۆ ئەفسەریت و یەهوودییەکان ناتوانن زمانت ببەستن و هەربۆیە لە فەرمانڕەوای گشتی پاڕاونەتەوە بۆئەوەی لەم وڵاتە نەتهێڵن و بتنێرن بۆ جێگەیەکی تر تا لەنێو جوولەکاندا نەبیت و، ئەوەی کە بینیوتە، بۆیان نەگێڕیتەوە.

ئادان ئابر گوتی: لونژینووسی سەربازی لژیون دەناسی؟

گوتم: ئەمە یەکەمجارە گوێم لەم ناوە دەبێت.

ئادان ئابر گوتی: لونژینووس هەر ئەو کەسەیە کە ئەو ڕۆژەی عیسایان لە خاچ دا، نێزەکەی کرد بە جەستەی عیسادا.

گوتم: ئێستە شێوەیم دێتەوە یاد. شتێکی تازەت پێیە لەبارەی ئەوەوە؟

ئادان ئابر گوتی: لەو ڕۆژەوەی کە ئەم کابرایە نێزەکەی کردووە بەجەستەی عیسادا، تا ئەمڕۆ، ناتوانێ هەردوو دەستی خۆی بەکاربهێنێت بۆ نان خوارن نەبێت و، هەرکاتێ بۆ مەشقی سەربازی دێت بۆ سێرك، ناتوانێ نێزەکەی هەڵبدا.

دوو ڕۆژ لەمەوپێش لە مەیدانی سێرکدا ناچاریان کرد نێزەکەی خۆی بە ئامانجی گەواڵێك کە پڕ بووە لە کا، هەڵبدات. بەڵام لەبەرئەوەی لونژینووس هێزی تێدا نەبوو، بە نێزکە قاچی خۆیی بریندار کرد، چونکە لە جیاتی ئەوەی نێزەکە هەڵبدات، کەوتە سەر قاچی. پزیشکی نیزامی وایدەزانی لونژینووس خۆی نەخۆش دەخات و وا خۆی دەنوێنی کە بێ هێزە بۆئەوەی پێش کاتی خۆی، لە خزمەتی سەربازیدا ئازادی بکەن و باقی تەمەنی لەو موڵکەدا پشوو بدات کە حکومەتی ڕۆم پێی دەدات.

تۆ دەزانی کە ماوەی خزمەتی سەربازی لژیون بیست ساڵە و پاش ئەوە خانەنشین دەبن و، حکومەتی ڕۆم لە وڵاتی ڕۆمدا یان لە یەکێ لە شوێنە داگیرکراوەکاندا پارچە زەوییەك دەدەن بە سەربازە خانەنشین کراوەکان بۆئەوەی بەهۆی کشتوکاڵەوە بژێوی ژیانیان دەست بکەوێت. لونژینووس هەژدە ساڵ خزمەتی کردووە و بۆئەوەی خانەنشین بکرێت، دەبێ دوو ساڵی تر خزمەت بکات.

پزیشکە نیزامیەکە پێی وایە هەندێ نەخۆش کە شوێنەواری نەخۆشیەکەیان لەسەر جەستە یان وەکو تا دەرناکەوێت، لەوانەیە بەهۆی قامچیەوە دەربکەوێت هەر

بۆیە فەرمانی دا قامچی بدەن لە لونژینووس. لونـژنیوس کە سـەربازێکی لژیونـە، وەکو سـەربازەکانی تـر بەرگـەی گـرت و پارچـە چـەرمێکی خـستە نێـوان هـەردوو ڕیـزی ددانەکانییەوە و بەتووندی ددانی پێدا دەنا بۆئەوەی هاوار نەکات. بەڵام لێدانەکانی قامـچییەکە کاریگـەری نـەبوو و، بۆیـە لونـژینووس هـەر نـەیتوانی هـەردوو دەسـتەکەی خۆی، بۆ نانخواردن و شیو نەبێت، بجوڵێنێت. هەندێ لە سەربازەکان پێیان وایە کە نەخۆشیەکەی لونژینووس جۆرێکە لە ڕۆماتیسمە.

پرسیم: بۆچوونی تۆ لەم بارەیەوە چییە، ئایا تۆش نەخۆشینەکەی لونـژینووس بە ڕۆماتیسمە دەزانی؟

ئادان ئابر گوتی: ئەوە گومانی تێدا نیە کە عیسا پیاوێکی جیاواز بوو، بەڵام من کە لەسەرەتاوە تاکاتی مردنی عیسا لەبەردەم خاچدا بووم، دەزانم کە عیسا قسەی خراپی نەگوتووە و بەپێچەوانەوە، لەسەر خاچەکە داوای لە خودای خۆی دەکرد کە ئێمە ببەخشێت و دەیگوت ((خودایە، ئەمانە نازانن چی دەکەن و لە گوناهەکانیان خۆش ببە و مەیانخەرە بەر ئازار و ئەشکەنجە)). ئەگەر عیسا بەخاچەکەوە قسەی خراپی بگوتایە، دەمتوانی وا بیر بکەمەوە لونژینووس کەوتبێتە بەر ئەو دوعا خراپەیە، بەڵام عیسا پاڕایەوە و داوای بەخشینی ئێمەی دەکرد.

لە ئادان ئابرم پرسی: بۆچوونی سەربازەکانی لژیون چییە؟

ئادان ئابر گوتی: سەربازخانە شوێنێکی سنووردارە و سەربازەکانیش یەك دەنگن و ڕووداوی تازەی تێدا ڕوو نادات و، لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا لەسەربازخانە، ژیانی سـەربازەکان لەسـەر یـەك بەرنامـە دەڕوات و گـۆڕانی بەسـەردا نایـەت. هەربۆیـە کـاتێ هـەواڵێك لـە دەرەوە دەگاتـە سـەربازخانەکە، خێـرا بـڵاو دەبێتـەوە و بـە زوویـی شوێنەوارەکەی لەناوناچێت. هەواڵی زیندوو بوونەوەی عیساش و هاتنە دەرەوەی لە قەبر، لە سەربازخانەدا دەنگێکی زۆری دایەوە و سەربازەکان ئەوەندە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەم هەواڵە کە ئەگەر لە شەودا گۆزەیەك لە ڕەفەکەوە یان لەسەکۆیەکەوە بکەوێتە خوارەوە و بشکێت، ئەوا هەموو سەربازەکان لەترسان لەخەو ڕادەپەڕن و بەرەو چەکەکانی خۆیان ڕادەکەن.

هەر لەو کاتەوەی کە هەواڵی زیندوو بوونەوەی عیسا بڵاو بۆتەوە، دانیشتوانی شارەکەیش ترسیان لێ نیشتووە و یەهوودییەکان لەو شەوەدا ناتوان بە ئاسوودەیی

بخەون. هەندێ جار منداڵەکانیان دەزیقێنن و دایکیان بانگ دەکەن و دەڵێن کە بێگانەیەك دەستی هێناوە بە دەموچاوماندا. دایك و باوکەکانیشیان چراکە ڕۆشن دەکەن و ماڵەکە دەپشکنن، بەڵام کەس نابینن. ترسی یەهوودییەکان ڕۆ چۆتە ناو ئەندامەکانی ئەنجومەنی باڵایان و، بیستوومە کە هەندێکیان بەردەوام دەستەکانیان دەشۆن، چونکە دەستیان بە خوێناوی دەبینن و، هەرکە دەستیان وشك بوویەوە، دیسان سەیر دەکەن دەستەکانیان خوێناوڵ بۆتەوە.

گوتم: دەتەوێ بڵێیت کە خوێنی عیسا دەستی ئەوانی ڕەنگ کردووە؟

ئادان ئابر گوتی: من خۆم ئاگادار نیم و ئەو قسانە دەگێڕمەوە کە بیستوومن. تەنانەت (سەدوقیەکان)یش کە ئاسانکارییان لەبابەتی ئایینیدا کردووە، خۆیان پاکژ دەکەنەوە، چونکە ترسیان لە زیندوو بوونەوەی عیسا هەیە.[39]

پاشان ئادان ئابر لە منی پرسی: تۆش لە پەرێشانیدا دەژیت؟

گوتم: من پەرێشان نیم و تەنیا ئاواتم ئەوەیە کە (ڕێگەی ڕاست) بدۆزمەوە.

ئادان ئابر گوتی: ((ڕێگاکان زۆرن و ڕێنوێنیکەری گومڕاکەریش زۆرن)).

کاتێ ئەم قسەیەم لە دەمی ئادان ئابر بیست، واقم وڕما، چونکە ئەم ڕستەیە، بەو جۆرەی کە گوتم، نیشانەیەکی تایبەتی قوتابیەکانی عیسا بوو و، هەر بەهۆی ئەم قسەیەشەوە خۆیان بە یەکتر دەناساند.

من، کە بەهۆی سەرسامیەکی زۆرەوە دەستەوئەژنۆ ببووم، گوتم: ئادان ئابر، تۆش شوێنکەوتەی مەسیحیت و بە شوێن ڕێگەی ڕاستیدا دەگەڕێیت؟

ئادان ئابر لە قاقای پێکەنینی دا و گوتی: مەزن تیوس، کەوتیتە داوەوە، من دەمزانی کە لەم دواییانەدا بەدوای قوتابییەکانی عیسادا دەگەڕێیت و دەتویست پەیوەندییان لەگەڵ ببەستی. من لە تۆ زیاتر لەم شارەدا دۆست و ئاشنام هەیە و دەزانم کە قوتابی و شوێنکەوتووانی عیسا بەچ جۆرێك خۆیان بەیەکدی دەناسێنن.

---

[39] لە سێ سەدەی پێش لە دایك بوونی مەسیح، لەنێو جوولەکەکاندا کابرایەك بەناوی (صدوق) هات کە وەکو (لوثر) لەنێو مەسیحییەکاندا، ئایینی مەسیحی سادە و ئاسان کرد و ئایینزای (پرۆتستان)ی پێك هێنا، (صدوق)یش ئایینزای یەهوودی ئاسان و سادە کرد و (دکتور بروس)ی ئینگلیزی، وەرگێڕی ئینجل بۆ زمانی فارسی، لایەنگرەکانی ئەوی بە (صدوقییەکان) ناوزەد کردووە. هەر لەوکاتەدا، گروپێکی دیکە لەنێو جوولەکەکاندا بوون کە پێیان دەگوترا (فەریسییەکان) کە تاکەکەی (فەریسی)ە و ئەوان بۆ پەیڕەوکردنی یاساکانی ئایینی، زۆر دەمارگیر بوون و هەرجۆرە کەمتەرخەمییەکیان، لەکاتی ئەنجامدانی ئەرکێکی ئایینیدا بە شایەنی مەرگ دەزانی بۆیە صدوقییەکان و فەریسییەکان هەردووکیان زیادەڕەو بوون کە یەکێکیان لە ئاسانکاریدا و ئەوی تریان لە دەمارگیری و سەختگیریدا.

گوتم: ئادان ئابر، تۆ چۆن زانیت کە قوتابییەکانی عیسا بەم ڕستەیە یەکتری دەناسن؟

ئادان ئابر گوتی: یەکێ لە هەڵەکانی حکومەتی ڕۆم ئەوەیە کە لژیۆنێك بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لە وڵاتێکدا دەهێڵنەوە و، یەکێ لەو لژیونانەی کە من بۆ ماوەیەکی زۆر لەم شارەدا خزمەتی تێدا دەکەم، لە ئەنجامی مانەوی سەربازانی لژیون بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، سەربازەکان لەگەڵ دانیشتوانی ئەو ناوچەیەدا ئاشنا دەبن و خووی ڕەوشت و ئاکارەکانی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە دەگرن. هەروەها ئەم لژیونەی کە من خزمەتی تێدا دەکەم، لەبەرئەوەی ماوەیەکی دوورودرێژە لەم ولاتەدان، کەوتوونەتە ژێر کاریگەری جوولەکەکانەوە. بەڵام ژمارەیەکیان بەجۆرێ کەوتونەتە ژێر کاریگەری یەهوودییەکانەوە کە تەنانەت بووشن بە یەهوودی.

حکومەتی ڕۆم کاتێ سەربازەکانی لژیونێکی لە یەکێ لە وڵاتانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم دامەزراند، ئەوا پاش کۆتایی هاتنی خزمەتەکەیان، هەر لەو وڵاتەدا زەوی دەدات بە سەربازەکان. ئەو سەربازانەش کە بوون بە یەهوودی ئەوە دەزانن کە دوای کۆتایی هاتنی خزمەتەکەیان، لەهەمان وڵاتدا دەبنە خاوەنی زەوی و هەر لەوێ ژن دەهێنن، هەربۆیە دەبن بە یەهوودی و پاشانیش لەگەڵ ئافرەتە جوولەکەکاندا هاوسەرگیری دەکەن.

ئاشکرایە کە بۆچی ناڵێم ئەوانە بۆئەوە دەبن بە یەهوودی بۆئەوەی بتوانن لەگەڵ کچانی یەهوودیدا هاوسەرگیری بکەن، بەڵام پاش ئەوەی کە بوون بە یەهوودی، ئەوا دەتوانن پاش تەواو بوونی خزمەتەکانیانن، بە ئاسانی لەگەڵ کچانی یەهوودیدا هاوسەرگیری بکەن.

ئەگەر حکومەتی ڕۆم بۆماوەی بیست ساڵ لژیونێك لەم وڵاتانەدا بهێڵێتەوە، سەربازان و ئەفسەرە ڕۆمییەکان ناکەونە ژێرکاریگەری (کلیمیەکان)ەوە[40] و گرفتاری خودا ترسناکەکەی ئەوان نابن.

گوتم: ئەگەر تۆ خودای یەهوودییەکان بەترسناك دەزانی، ئەی بۆچی پاڵپشتیت بۆ خوداکەیان نیشان دا؟

---

[40] (کلیم) نازناوی حەزرەتی (موسا)ی پێغمبەرە و (کلیمیەکان)یش بە شوێنکەوتەکانی ئەو پێغەمبەرە دەگوترێ. (فەرهەنگی بابان، و. کوردی).

ئادان ئابر پرسی: من کەی پاڵپشتیم بۆ خودای یەهوودییەکان نیشان داوە؟

گوتم: لەبیرت چۆتەوە کە کاتێ عیسا بە خاچەوە بوو، تۆ گوتت کە ئەو پێغەمبەرە و، ئایا ئەم گوتەیە بەڵگەی ئەوە نییە کە تۆ لایەنگیریت بۆخودای یەهوودییەکان دەربڕیوە؟ فەرامۆشت کردووە کە کاتێ من و تۆ چووینە ناو گۆڕەکەی عیساوە، سەیرمان کرد کفنەکەی دەستی لێ نەدراوە و هەرکەسێ ئەو کفنەی بدیایە، وایدەزانی تەرمی عیسای تێدایە، ئەمە لەکاتێکدا کە لەناو کفنەکەدا نەبوو؟ پاش ئەوەی بۆت دەرکەوت تەرمی عیسا لەناو کفنەکەدا نییە، زانیم شڵەژایت، ئایا ئەم شڵەژانەی تۆ بەهۆی ئەوە نەبوو کە بڕوات بەوە هێنا کە عیسا پێغەمبەر بێت و، لەدوای مەرگ زیندوو بۆتەوە؟

ئادان ئابر خەیاڵی ڕۆیشت و ناوچاوی بەیەکدا دا و بەبێ مەبەست گوتی: ئەم پیاوە لەم شارەدا زۆر ئازاری ئێمەی دا، چونکە یاسای دنیای تێك داوە. لەسەرەتای دنیاوە هەتا ئەمڕۆ، هەرکەسێ ماڵئاوایی لە ژیان بکردایە، وا دەڕۆیشت کە ئیتر نەگەڕێتەوە. کاتێ کەسێ بمردایە، ئیتر خەڵك خەیاڵیان لەوە ئاسوودە دەبوو کە ئیتر، نە مردوو کاری بەسەر ئەوانەوە هەیە و نە ئەوانیش کاریان بەسەر مردووەکەوە هەیە. بەڵام عیسا ئەم بناغەیەی تێك دا و دەری خست کە دەکرێ مردوو، پاش چەند ڕۆژێك بگەڕێتەوە بۆ ژیان.

گوتم: تۆ نابێ لە زیندوو بوونەوەی عیسا بترسیت، چونکە تۆ، لەگەڵ ئەوەی فەرماندەی دەستەیەك لەو سەربازانە بوویت کە ئەویان برد بۆ شوێنی لەسێدارەدان و لەخاچیان دا، بەڵام عیسا پیاوێکی ڕق هەڵگر نییە و، خودی خۆی گوتویەتی کە ئەگەر شاپێکیان دا لە لایەکی ڕوخسارتان، ئەوا لایەکەی دیکەتانی بخەنە بەردەست تا شاپێکی ترتان لێ بدات. کەواتە پیاوێك کە خاوەنی ئەم بیروباوەڕە بێت، دوای زیندوو بوونەوە یەکێکی وەکو تۆش ئازار نادات چی بگات بەو کەسانەی کە لە پێش مردنی ئازاریان دابێت.

ئادان ئابر گوتی: منیش بیستوومە کە عیسا کابرایەکی بێ ئازار بووە و ناڕەزایی دەرنەدەبڕی ئەگەر کەسێك ئەشکەنجە بدرایە، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسەش کەسێکی ئازاردەر بێت، بۆیە من لە زیندوو بوونەوەی عیسا ناترسم، بەڵام لێتی ناشارمەوە کە حەز ناکەم ڕووبەڕووی ببمەوە، چونکە ئەگەر بۆ یەك جار ئەو ببینم، ئەوا بەهۆی

سەرسامی و ترسێکی زۆرەوە مووەکانم وەکو دەرزییان لێ دێت. من پێم وانییە ڕۆژێك ڕووبەڕووی عیسا ببمەوە، چونکە بیستوومە کە عیسا تەنیا خۆی بەو کەسانە نیشان دەدات کە بووبن بە یەهوودی و، هەروەها خۆی بە ئەو شوێنکەوتە و ئافرەتانە نیشان دەدات کە لە "جەلیلە"وە لەگەڵی هاتبوون و بینیویانە.

گوتم: ئەم قسەیەی تۆ ڕاست نییە، چونکە عیسا خۆی بەو کەسانەش نیشان دەدات کە یەهوودی نین، هەروەها منیش ئەوم بینیوە و یەهوودیش نیم.

ئادان ئابر بە سەرسامیەوە گوتی: لەدوای ئەوەی کە عیسا زیندوو بۆتەوە، چاوت پێی کەوتووە؟

گوتم: بەڵێ، یەکەم جار لەو باخەی کە ئەویان تێدا ناشتبوو، لەسەر شێوەی باخەوانێك بینیم. جارێکی تر لە ماڵی شەمعونی خەڵکی کورن کە غوڵامێکی ئازادکراوە و پیاوێکی سەرمایەدارە، لەسەر شێوەی مامۆستایەك بینیم کە لە زانکۆی رودس دەرسی بەمن دەگوتەوە.

ئادان ئابر گوتی: مەزن تیوس، کاتێ تۆ لە ئەسکەندەریە بوویت و دەچوویت بۆ کتێبخانە، کتێبی زۆرت خوێندۆتەوە و خوێندنەوەی زۆریش کاری تێ کردوویت بیروڕایەکی بۆ دروست کردوویت کە مەترسی هەیە، بەڵام خۆشبەختانە من هاوڕێی تۆم و ئەم بابەتە لەلای کەس باس ناکەم، بەڵام تکای ئەوەت لێدەکەم کە هەرچی زووە لەم شارە و تەنانەت لە وڵاتی یودەش بڕۆ دەرەوە، چونکە ئەگەر بزانن تۆ ئەم قسانە دەکەیت ئەوا ناهێڵن هیچ پشوویەك بدەیت.

کاتێ ئەم قسەیەم لە ئادان ئابر بیست، بۆم دەرکەوت کە هۆکاری سەرەکی هاتنی ئەو بۆ ماڵی من چییە. من وامدەزانی ئادان ئابر بۆ ئەوە هاتووە تا لەبارەی عیساوە قسەم لەگەڵ بکات بەڵام ئەو کاتە بۆم دەرکەوت ئەویان ڕاسپاردووە تا بێت بۆ ماڵی من و پێم بڵێت لەو شار و وڵاتە بڕۆمە دەرەوە.

گوتم: کەواتە ئێوە دەتانەوێ لەم شار و وڵاتە بمکەنە دەرەوە و، تۆش بۆئەوە هاتوویت تا فەرمانی چوونە دەرەوەم پێ ڕابگەیەنیت.

ئادان ئابر گوتی: نا مەزن تیوس، بۆ گەیاندنی فەرمانێکی لەو شێوەیە نەهاتووم بۆ ئێرە و لەڕووی دڵسۆزیەوە ئەمەم بە تۆ گوت. تۆ کابرایەکیت خاوەنی شوناسی ڕۆمیت و کاتێ هاتی بۆ ئەم شارە، "پونتوس پیلات"ی فەرمانڕەوای گشتی یودە و

ژنەکەی خوڵکی تۆیان کرد و پێشوازیان لێ کردیت. بۆیە ناتوانرێ پیاوێکی وەکو تۆ لەم شارە دەر بکرێت. بەڵام فەرماندەی مەخفەری ئەم شارە کە پاراستنی ئاشایشی ئێرەی لە ئەستۆدایە بە منی گوت کە پێت بڵێم ئاگات لە خۆت بێت. نەك لەو ڕووەوە کە ئەو ئازار دەدەیت، بەڵکو لەو ڕووەوە کە ئەو دەترسێ یەهوودییەکان شتێکت بەسەر بێنن.

پرسیم: فەرماندەی بنکەی ئەم شارە لەبارەی منەوە هیچی لە تۆ پرسیوە؟

ئادان ئابر گوتی: بەڵێ، لێی پرسیم کە تۆ چ بیروباوەڕێکت هەیە. من لە وەڵامیدا گوتم کە مەزن تیوس ڕۆمییە و باوەڕی بە خودایانی ڕۆم هەیە. ئەو پرسی ((بۆچی ئەوەندە پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسانە دەبەستێ کە بڕوایان بە عیسا هەیە و شوێنکەوتەی ئەون؟)) من گوتم ئەمڕۆ لەم شارەدا بارودۆخێك هاتۆتە پێشەوە کە هەموو کەسێ تووشی بێ ئاگایی و لەبیرچوونەوە بوون و (مەزن تیوس)یش یەکێکە لەو کەسانە.

گوتم: ئایا ئەو قسانەت بۆ فەرماندەی مەخفەر گێڕاوەتەوە کە من و تۆ پێکەوە دەمانگوتن؟

ئادان ئابر گوتی: من ئەوەندە تێنەگەیشتوو نیم تا وتووێژی تایبەتی بگەیەنمە گوێی فارماندەی مەخفەر.

پاش ئەم قسەیە، ئادان ئابر سەری بەرزکردەوە و سەیری سەقفی ژوورەکەی کرد. پرسیم سەیری چی دەکەیت؟

ئادان ئابر گوتی: وەکو ئەوە وابوو کە دوو دڵۆپ ئاو لە سەقفەکەوە بدا لە ڕوخسارم و سەرم بەرز کردەوە تاکو بزانم لە سەقفی ژوورەکەتەوە ئاو دێتە خوارەوە یان نا.

گوتم: سەقفی ئەم ژوورە دڵۆپی ئاوی پێدا نایەتە خوارەوە، چونکە سەقفی ماڵەکە توندوتۆڵە و هیچی لێ نایەت.

ئادان ئابر گوتی: کەواتە وادیارە وامزانیوە کە لە سەقفی ئەم ژوورەوە دوو دڵۆپ ئاو کەوتۆتە خوارەوە. پاشان بابەتی وتووێژەکەی گۆڕی و گوتی: مەزن تیوس، من دەمەوێ بەڵێنێکم بدەیتێ.

پرسیم: دەبێ بەڵێنی چیت پێ بدەم؟

ئادان ئابر گوتی: من دەمەوێ بەڵێنت لێ وەربگرم کە ئەگەر تۆ عیسات بینیوە و قسەت لەگەڵ کردووە، من لەگەڵ ئەو ئاشت بکەیتەوە تا لە من دڵگران نەبێت. لەوانەیە من خۆم ئەو ببینم، بەڵام لەبەرئەوەی من ئەفسەری ڕۆمیم، ناتوانم لەدوای عیساوە بڕۆم و داوای لێ بکەم لەگەڵم ئاشت ببێتەوە. بەڵام تۆ دەتوانی ببیتە ناوبژێکەری لە نێوان من و ئەودا و ئاشتمان بکەیتەوە.

گوتم: ئەگەر من عیسا ببینم و بتوانم قسەیی لەگەڵ بکەم، ئەوا ئەم کارە دەکەم.

کاتێ وتووێژی ئێمە گەیشتە ئێرە، من لەرزم لێ هات، ئەمە لەکاتێکدا کە هەوا گەرم بوو و لە هەوای گەرمی ئاواشدا مرۆڤ لەرزی لێ نایەت.

ئادان ئابر گوتی: نازانم بۆچی لەرزم لێهاتووە.

گوتم: من پێموایە کە هەڵلەرزینی تۆ بەهۆی ئەوەوەیە کە کەسێك دێت بۆ ئێرە.

ئادان ئابر هەستایەوە و کەواکەی خۆی دا بەشانیدا و ویستی بڕوات، بەڵام پێش ئەوەی لە ژوورەکە بڕواتە دەرەوە، دەنگی پێی دوو کەس کە لە پلیکانە دەهاتنە سەرەوە، هاتە گوێ. یەکێ لەو دوو کەسە زاخوس بوو، بەڵام ڕوخساری ئەوی تریانم نەدەبینی، چونکە بەجۆرێك کەواکەی خۆی دابووە بەر دموچاوی کە ڕوخساری نەدەبینرا.

من هاوارم کرد: زاخوس، چاکە ببێت بە نسیبت، من لەو کاتەوەی کە تۆم بەجێ هێشتوە، لە ماڵەوەم و چاوەڕوان بووم لە تۆوە هەواڵێکم پێ بگات.

زاخوس بە ساردێکەوە وەڵامی دایەوە: چاکە ببێ بەنسیبی تۆ کابرای ڕۆمی.

من بۆم دەرکەوت بینینی ئادان ئابر ئەو پیاوەی ناڕەحەت کردووە کە لەگەڵ زاخوسدا دەهاتە ژوورەوە و، ئەو پیاوەی کە ڕوخساری بەکەواکەی داپۆشیبوو، ئاماژەی بە ئادان ئابر کرد و گوتی: ئەم پیاوە کێیە؟

خاوەن ماڵە سریانییەکەی من کە بۆ ڕێنوێنی کردنی ئەو دوو کەسە هاتبوو کە لە قاپی ژوورەکەدا ڕاوەستابوو و نەهاتە ژوورەوە، لە وەڵامی ئەو پیاوەی کە ڕوخساری داپۆشیبوو گوتی: ئەم پیاوە ئەفسەرێکی ڕۆمییە و پلەی سەنتوریونی هەیە و یەکێکە لە هاوڕێ دێرنەکانی من و متمانەیەکی تەواوم پێی هەیە و، دڵنیات دەکەمەوە هیچ ئازارێکت لەلایەن ئەوەوە پێ ناگات، چونکە ئەم ئەفسەرە ڕۆمییە کابرایەکی مەبەست پاکە و بۆچوونی بەرامبەر هەموو یەهوودییەکان پاکە.

بەڵام ئەم وتەیە پیاوەکەی ڕازی نەکرد و زاخوسی بردە لایەکەوە و بەدەنگێکی بەرز، بەجۆرێك کە ئێمە گوێمان لێی بوو گوتی: تۆ خیانەتت لە من کرد و منت خستە کەمینەوە و مەبەستت ئەوە بووە من بخەیتە داوەوە. ئەم کارەی تۆ لەگەڵ کارەکەی یەهوودا هیچ جیاوازی نییە.

پاش ئەم قسەیە، ئەو پیاوە هەڵوەستەیەکی کرد بۆئەوەی لە ژوورەکە بچێتە دەرەوە و بڕوات، بەڵام من ڕامکرد و قۆڵیم گرت و نەمهێشت بچێتە دەرەوە.

ئادان ئابری ئەفسەری ڕۆمی کە بە وردی سەیری ئەو دوو کەسەی دەکرد، بەو پیاوەی کە ڕوخساری داپۆشیبوو گوتی: بۆچی تۆ بە بینینی ئەفسەرێکی ڕۆمی ڕقت دادێ؟ تۆ لەو یەهوودیانەیت کە لایەنگیری عسیا دەکەن بۆیە لەبارەی ئێمەی ڕۆمییەوە بەدبینیت؟ من پێموایە کە شێوەی قسەکردنی تۆش وەکو قسەکردنی دانیشتوانی جەلیلە وایە، چونکە زۆربەی شوێنکەوتووانی عیسا خەڵکی جەلیلە بوون.

زاخوس گوتی: وانییە. ئەم پیاوەی کە دەیبینی، وەکو من وەرگری باجە و تۆ دەزانیت کە ئێمەی وەرگری باج، دۆستی ڕۆمانیاین، چونکە دەزانین کە لەم شارەدا حکومەتی ڕۆم ئاسایشی بەرقەرار کردووە و بڕوام وایە هەرکەسێ ئارامی و ئاسایشی بوێت، ئەوا دەبێت لەم وڵاتەدا حکومەتی ڕۆمی خۆش بوێت.

ئەو پیاوەی کە ڕوخساری داپوشیبوو، گوتی: زاخوس، بۆچی شتێك دەڵێیت کە ویژدانت ئازار دەدا؟ ئەوە تۆیت کە دۆستی حکومەتی ڕۆمیت، نەك من. ئێمە نابێ بە پێچەوانەی ویژدانی خۆمان، خۆمان بە دۆستی حکومەتی ڕۆم بزانین.

من کە هێشتا قۆڵی ئەو پیاوەم گرتبوو، دەستم لێ بەردا، چونکە هەستم کرد دەستم خەریکە دەسوتێ.

ئینجا بەو پیاوەم گوت: پێموایە من توانیومە بتناسم و بۆیە پێت دەڵێم کە نابێ ترست لەم ئەفسەرە ڕۆمییە هەبێت، چونکە ئەم ئەفسەرە ڕۆمییە لایەنگیری لە پێشەواکەت دەکات و هەرچۆنێك بێت، ئامادەیە لەگەڵی ئاشت ببێتەوە.

لەو کاتەدا ئەو پیاوە، کەواکەی خۆی لە ڕوخساری دوور خستەوە و ڕوخساری دەرکەوت و گوتی: من ناوم "مەتتا"یە و یەکێکم لەو دوازدە کەسەی کە لەلایەن پێشەواکەمەوە وەکو قوتابی خۆی هەڵیبژاردین. من لە ڕۆمییەکان ناترسم، بەڵام لەبەرئەوەی پێشەواکەی ئێمەیان لەخاچ داوە، بۆیە حەز ناکەم بیانبینم. لەوانەیە ڕۆژێ

ڕۆمییەکان منیش بکوژن، بەڵام من لە کوشتن ناترسم، چونکە دەزانم عیسا تەمەنێکی نوێم پێ دەبەخشێتەوە.

گوتم: مەتتا، هیچ کەسێ نایەوێ تۆ بکوژێت بۆیە بە خەیاڵی ئاسوودە دابنیشە و لەبارەی مەسیحەوە قسەمان بۆ بکە. مەتتا، من زۆر حەز دەکەم لەدەمی تۆوە هەندێ شت لەبارەی عیساوە ببیستم، چونکە دەزانم کە تۆ یەکێ لەو دوازدە کەسانە بوویت کە بەردەوام لەگەڵ عیسادا بوویت و سوودت لە لە زانیاریەکانی وەرگرتووە.

بەڵام مەتتا گوتی: من دانانیشم، چونکە هەست دەکەم سەربازەکانی ڕۆم چواردەوری ئەم ماڵەیان گرتووە و دەیانەوێ من دەستگیر بکەن و، هەرچۆن عیسایان بە ئەشکەنجەدان کوشت، دەیانەوێ منیش بە ئەشکەنجەدان بکوژن.

بیستنی ئەم قسەیە بۆ ئادان ئابر ناخۆش بوو و گوتی: ئەی ئەو کابرایەی کە خەڵکی جەلیلەیت، تۆ نابێ ئێمەی ڕۆمییەکان سەرکۆنە بکەیت کە بۆچی پێشەواکەی تۆمان کوشتووە. هیچ ڕۆمییەك نەیدەویست پێشەوا و مامۆستاکەی ئێوە بکوژێت و، فەرمانڕەوای گشتی یودەش نەیدەویست بمرێت، بەڵکو ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان مامۆستاکەی ئێوەیان بەکوشت دا و یەهوودییەکان لە کوشتنی مامۆستا و پێشەواکەی ئێوە بەرپرسیارن، نەك ئێمەی ڕۆمییەکان. هەروەها بۆئەوەی بزانی کە ئەم ماڵە لەژێر گەمارۆی سەربازانی لژیون نییە و منیش هیچ مەبەستێکی خراپم پێت نییە، بۆیە پێت دەڵێم بۆ هەر جێگایەك کە دەتەوێ، بڕۆ.

کاتێ مەتتا زانی کەس مەبەستی خراپی پێی نییە، خەیاڵی ئاسوودە بوو و پاشان سەیری منی کرد و گوتی: کابرای ڕۆمی، من ئەمڕۆ بۆئەوە هاتووم بۆ ئێرە تاکو چاوم بە تۆ بکەوێت و کەمێك قسەت لەگەڵ بکەم. من دەمبیست کە پیاوێکی ڕۆمی هاتووە بۆ ئەم شارە و هەوڵ دەدات خۆی لە قوتابییەکانی عیسا نزیك بکاتەوە تاکو ڕێگە ڕاستەکەی ئەوان بگرێتە بەر. من بە بیستنی ئەم بابەتە سەرسام بووم، چونکە چۆن بڕوا دەکرێ کە کابرایەکی ڕۆمی وەکو تۆ دەیەوێ پێشەوا و مامۆستاکەی ئێمە بناسێ و بیەوێ پەی بە ڕێگەی ڕاست بەرێ. بۆیە ئەمڕۆ هاتووم بۆ ئێرە تا پێت بڵێم کە وازمان لێ بهێنە و لەمە زیاتر مەبە بەهۆی ئازاردانمان. تۆ ناتوانی عیسا بناسیت و ناتوانی ڕێگەی ڕاست بدۆزیتەوە. کەواتە، لەم شارە بڕۆ و ئیتر نەتەوێ لەگەڵ قوتابییەکانی عیسا پەیوەندی بەرقەرار بکەیت. ئەگەریش ناتەوێ لەم شارە بڕۆیت،

لەئێمە نزیك مەکەوە، چونکە هیچ بەرژەوەندیەك لەنێوان ئێمە و تۆدا نییە. تۆ لەکوێ و ئاشنایەتی لەگەڵ عیسا لەکوێ. مەگەر ڕۆمییەك کە ڕۆحی پڕە لە وتەی فەیلەسووفەکان، دەتوانێ لە قسەکانی عیسا تێبگات؟

سەرکۆنەکردنی مەتتا زۆر کاری لەمن کرد و بە توندی منی خەمبار کرد.

لەبەرئەوەی کە "مەتتا" کەواکەی خۆی لە ڕوخساری دوور خستەوە، بەباشی بینیم و سەیرم کرد نیگاکانی ئەو لەگەڵ نیگاکانی کەسانی تردا جیاوازە. بریقەی نیگاکانی ئەو، وەکو بریسکەی چاوی ئەو کەسانە نەبوو کە بە شوێنکەوتەی عیسا دەژمێردران و هەربۆیە لە جیاتی ئەوەی وەڵامێکی توندی بدەمەوە، بە ئاوازێکی هێمن و بە لێبوردییەوە گوتم: مەتتا، من گوتەکانی تۆ بەدرۆ ناخەمەوە. من کابرایەکی ڕۆمیم، بەڵام پێموایە ڕێگەی ڕاستی عیسا بۆ هەموو کەسێك ڕەوایە. من پێموابوو هەرکەسێ بە دڵی پاکەوە لە دەرگای ئەو بدات، ئەوا وەڵامی دەدرێتەوە و دەرگاکەی بەڕوودا دەکرێتەوە. بەم بۆچوون و ئۆمێدەوە بەڕێ کەوتم تا خۆم بگەیەنمە قوتابییەکانی عیسا و لەبارەیەوە زانیاری وەربگرم. ئێستەش من لێت دەپرسم کە ئەگەر عیسا نەیویستووە من بیناسم، ئەی بۆچی لەماڵی شەمعونی خەڵکی کورن خۆی بەمن نیشان دا؟

زاخوس سەیرێکی مەتتای کرد و بە زمانی حاڵ داوای کرد کە مەتتا وەڵامی گونجاو بداتەوە بەمن بەڵام مەتتا گوتی: هاتنی عیسا بۆ ماڵی شەمعونی خەڵکی کورن بەڵگەی ئەوە نییە کە خۆی بە تۆ نیشان دابێت. پێشەوا و مامۆستاکەی ئێمە بۆئەوە هاتووە بۆ ماڵی شەمعون تا خۆی نیشانی زاخوس و شەمعون بدات کە هەردووکیان یەهوودین نەك تۆ کە پیاوێکی ڕۆمیت. من پاش ئەوەی کە بیستم تۆ چوویت بۆ ماڵی شەمعون و عیساش هاتووە بۆ ئەوێ، ئەم بابەتەم لەگەڵ هاوڕێکانی خۆمان باس کرد و هەموویان گوتیان بێگومان عیسا بۆئەوە چووە بۆ ئەو ماڵە تاکو خۆی نیشانی ئەو یەهوودیانە بدات کە لەوێ بوون.

ئێمە پێمانوایە کە تۆ، ئەی کابرای ڕۆمی، جادووگەریت و بۆئەوە دەتەوێ لەبارەی عیساوە زانیاریت دەست بکەوێت تاکو زانیارییە جادووگەرییەکانی خۆت زیاتر بکەیت. چونکە شەیتان بۆئەوەی کارە شەیتانییەکانی خۆی زیاتر بکات، ئەوا دەیەوێ زانیاری زیاتر لەبارەی خوداوەند وەربگرێت تا بەمانەوەی، زیاتر کاری شەیتانیی بکات. ئەو کارانەی کە لە ماڵی شەمعوندا ڕووی دا، هەمووی بەهۆی

جادووگەرییەوەیە و نیشانی دەدات کە تۆ جادووگەریت. تۆ بە زانستی جادوو توانیت شەمعون وا لێ بکەیت بە پێچەوانەی بیرۆکەی خۆی، هەرچی خواردنی هەیە لەوماڵەدا بیدات بە هەژارەکان و هەرچی جلوبەرگ هەیە لەو ماڵەدا پێیان بدات. لەگەڵ ئەمانەش تۆ بەهۆی جادووەوە توانیوتە وای لێ بکەیت شەربەتی تێکەڵەی هەنگوین بدات بە هەژارەکان و هەروەها پارەیان پێ بدات.

لەو کاتەدا "مەتتا" بۆی دەرکەوت کە من زۆر خەمناك بووم و گوتی: کابرای ڕۆمی، لەوانەیە ئێمە هەڵە دەکەین و تۆ جادووگەر نەبیت. لەوانەیە مەبەستی تۆ لە دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ قوتابییەکاندا بۆئەوە نەبێت کە زانستی جادووگەری خۆت زیاد بکەیت. بەڵام بێگومان دێوەزمەیەك بەسەر تۆدا زاڵ بووە و وای لەتۆ کردووە تا بەم جۆرە سوور بیت لەسەر ئەوەی کە لەم ڕێگەیەدا هەنگاو بنێیت. دەست لەم کارە هەڵبگرە و ئیتر لەگەڵ شوێنکەوتووەکانی عیسادا پەیوەندی بەرقەرار مەکە. لەمە بەدواوەش مەڕۆ بۆ ماڵی شەمعونی خەڵکی کورن، چونکە ڕۆشتنی تۆ بۆ ماڵی ئەو، زۆر زەرەری لەو پیاوە داوە و تا ماوەیەك ناتوانێ ئەو زەرەرە قەرەبوو بکاتەوە. هەرچەندە خۆی لەم بارەوە هیچی نەگوتووە، بەڵام من پێت دەڵێم کە لە ڕۆیشتن بۆ ئەو ماڵە پارێز بکە.

تۆ کە کابرایەکی ڕۆمیت دەبێ بزانی کە هیچ بەرژەوەندیەك لە نێوان تۆ و مەسیحدا نییە. هەروەها هیچ بەرژەوەندییەك لە نێوان تۆ و قوتابییەکانی ئەودا نییە. مرۆڤ بۆئەوەی ڕوو بکاتە پیاوێکی وەکو مەسیح، دەبێ پەیڕەوی لێ بکات و خودای گەلی یەهوود بپەرستێ. بەڵام تۆ خودای گەلی جوولەکە ناپەرستیت و خودای تۆ کۆمەڵێك خودای ڕۆمییە کە ناوی هەندێکیان (زوهرە) و (مەریخ)ە کە ئەستێرەکانی ئاسمانن و هەندێکی تریان بەدی هاتووەکانی سەر زەوین. مەرجی یەکەمی ئاسیاوی و بەرژەوەندی پێشەوا و مامۆستاکەی ئێمە ئەوەیە کە وەرگری زانیاری، دەبێت بڕوای بە خودا هەبێت، بەڵام تۆ کافریت. پێشەواکەی ئێمە گوتوویەتی کە یەك شتی پیرۆز نەدەن بە دەمی سەگەوە. مەبەست لەم گوتەیەی پێشەواکەمان ئەوەیە کە نابێ ئەو کەسانە فێری ڕاستی بکەن کە شایانی ئەوە نین فێر ببن. ئەوکەسە شایانی ئەوەیە زانیاری وەر بگرێت کە کاری باشی لێ بووەشێتەوەوە و ئەوەش تەنیا بەوە دەکرێ کە باوەڕت بە

خودا هەبێت. هەر لەبەرئەوەیە کە ئێمە ناتوانین ڕێگەی ڕاستت پێ نیشان بدەین و ناتوانین فێری ڕاستیەکانت بکەین، چونکە تۆ کەسێکی ڕۆمیت.

گوتم: مەتتا، من بڕوام وایە کە ئەگەر عیسا منی ببینیایە، بەم جۆرە قسەی لەگەڵ نەدەکردم. تۆ منت خستە سەر شێوەی سەگ و گوتت کە نابێ شتێکی پیرۆز بدەیت بە دەمی سەگەوە. بەڵام ئەگەر سەگیش بوومایە، ئەوا هەر لەلایەن پێشەوا و مامۆستاکەی ئێوەوە دەر نەدەکرام. خودی مامۆستاکەی ئێوە گوتوویەتی کە سەگێکی زیندوو باشترە لە شێرێکی مردوو. بۆیە تکاتان لێ دەکەم بە سەگێکی زیندووم بزانن و بهێڵن تا لە قاپی ماڵی پێشەوا و مامۆستاکەتان پاسەوانی بکەم. ئایا ئامادەن ئەم خواستەی من پەسەند بکەن؟

ئەوکاتە ئادان ئابری ئەفسەر ڕۆمی کە تا ئەو کاتە بێدەنگ بوو، هاتە قسە و هاواری کرد: مەزن تیوس، مەگەر تۆ ڕۆمی نیت؟ چۆن زاتی تۆ ئیزن دەدات بەم شێوەیە قسە بکەیت و داوا بکەیت کە گەلی یەهوودی بەسەگێك لەقەڵەمت بدەن؟ تۆ کابرایەکی ڕۆمیت و بۆئەوە دروست بوویت کە ئاغای دنیا بیت، چونکە هەرتاکێك لە تاکەکانی ڕۆم کە شوناسی ڕۆمی هەبێت، بە ئاغای دنیا دەژمێردرێت. ئەگەر تۆ کابرایەکی سادە بوویتایە، من پێم وابوو کە ئەم قسەیەی تۆ لەڕووی نەزانینەوەیە. بەڵام تۆ کابرایەکی زانایت و لە زانکۆی ڕودس وانەت خوێندووە و هەروەها خەڵکی ڕۆمیت و زانست فێر بوویت و، زانایەکی ڕۆمیش نابێت تا ئەم ئاستە خۆی بچووك بکاتەوە و، ئێستە من ناچارم بەوە ڕازی ببم کە زیندوو بوونەوەی عیسا ئەوەندە گرنگە کە تەنانەت بیروهۆشی پیاوانی وەکو تۆیان تێك داوە.

چەندساتێك بێدەنگی بەرقەرار بوو و هیچیەك لەو چوار کەسەمان قسەمان نەکرد. پاشان ئادان ئابر بە مەتتای گوت: من سەربازم و پلەی سەنتوریونم هەیە و فەرمانیان بە من دا کە چاودێری بکەم تا عیسا لەخاچ دەدەن. من ڕقم لە خودی عیسا نەبوو و نەشمدەویست بیکوژم. هەرکەسێ لەجێی من بووایە، چارەی نەبوو جگە لەوەی کە دەبووایە ئەو فەرمانەی کە پێی دراوە جێ بەجێ بکات. بۆیە تۆ ئەگەر بتوانی ببیتە هۆکاری ئاشت بوونەوەی من و عیسا، ئەوا من بۆئەوەی تاوانەکانی خۆم بسڕمەوە، وەکو ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان دەستەکانی خۆم دەشۆم و یانیش

جلەکانم دەسووتێنم یان بەهەر شێوەیەکی تر کە ئێوە بتانەوێ، تاوانەکانی خۆم دەسڕمەوە تاکو بزانن کە من حەز ناکەم دژایەتی پێشەواکەی ئێوە بکەم.

من بۆم دەرکەوت کە مەتتا ڕازی بووە بە قسەکانی ئادان ئابر، چونکە دەیزانی کە ڕۆمییەکان ڕقیان لە عیسا نییە یانیش بە لایەنی کەمەوە ئادان ئابر لەگەڵ عیسادا دوژمنایەتی نییە، بۆیە گوتی: کاتێ عیسایان لەخاچ دا، من لەبەردەم خاچەکەدا نەبووم و گوێم لە قسەکانی ئەو نەبووە، بەڵام پێیان گوتووم کە عیسا لە ئێوەی ڕۆمییەکان خۆش بووە و گوتوویەتی کە ئێوە نازانن چی دەکەن، هەربۆیە شایانی لێبوردنن، بۆیە منیش لێتان دەبوورم.

ئادان ئابر گوتی: عیسا ڕاستی دەگوت. من ئەو ڕۆژە نەمدەزانی چی دەکەم، بەڵام ئەگەر بشمزانیایە، نەمدەتوانی ببمە ڕێگر بۆ لەخاچدانی عیسا، چونکە من سەربازم و هیچ چارەیەکم نییە جگە لەوەی کە فەرمانەکانی سەرۆکەکانی خۆم جێبەجێ بکەم. لە لژیونی ڕۆمییەکان، بەهۆی جێبەجێ نەکردنی بچووکترین فەرمان، بەتوندی سزا دەدرێت. ئێستەش کە تۆ لەمن خۆش بوویت، من ئومێدم هەیە کە پێشەواکەی تۆش، واتە عیسا، لەمن خۆش بووە یانیش خۆش دەبێت و دەبێ لە ئێسە بەدواوە کەمێك خەیاڵم ئاسوودە بێ.

پاشان مەتتا سەیری منی کرد و گوتی: کابرای ڕۆمی، ڕەفتاری من لەگەڵ تۆدا دژوارترە لە ڕەفتارم لەگەڵ ئەم ئەفسەرە ڕۆمییەدا. من لەم ئەفسەرە ڕۆمییە خۆش بووم، چونکە پێشەوا و مامۆستاکەی ئێمە گوتی کە ئەو نازانێ چی دەکات. بەڵام نازانم چی لە تۆ بکەم. دڵنەرمی تۆ دەریدەخات کە مەبەستی ئازاردانت نییە و شێوەی قسەکردنیشت وای نیشان دەدا کە دێوەزمە بەسەر تۆدا زاڵ نەبووە، بەڵام تۆ کابرایەکی ڕۆمیت و گۆشتی بەراز و ئەو شتانەی تر کە حەرام و پیسە، دەخۆیت و من ناتوانم تۆ وەکو خۆمان سەیر بکەم و، هەر بەوەش کە زونارت لە جلەکانی خۆت داوە، نابیتە کەسێکی وەکو ئێمە و لە ئێمە نیت.

زاخوس گوتی: ڕاستە، ئەم پیاوە لە ئێمە نییە، چونکە ئەم پیاوە ڕۆمییە و ناتوانێ بێتە ناومان.

گوتم: زاخوس، لەبیرت چۆتەوە کە دوێنێ لە ماڵی شەمعون ڕەفتاری تۆ لەگەڵ مندا بەجۆرێکی تر بوو و منت بە خۆتان دەزانی، ئێستە چی وای لێکردیت کە ڕقت لە من بێت.

زاخوس گوتی: من دوێنێ لە ڕۆشتن بەپێ ماندوو بووم و پاش ئەوەی کە هاتم بۆماڵی شەمعون، ڕووداوەکانی ئەو ماڵە منی گێژ کردبوو، بۆیە دوێنێ نەمدەزانی چی دەڵێم و چی دەکەم. بەڵام ئەمڕۆ ماندوو نیم و هۆشم بە خۆمەوەیە و دەزانم چی دەڵێم و چی دەکەم.

ئادان ئابر گوتی: ئەمڕۆ من کە لەلایەن عیساوە کەمێك خەیاڵم ئاسوودە بووە و پێموایە لێم خۆش بووە، چاکتر وایە بڕۆم، بەڵام من نیگەرانی تۆم.

پریسم: لەچی نیگەرانیت؟

ئادان ئابر گوتی: چونکە تۆ یەك کەسیت و ئەمانە ئاماژە بە (زاخوس و مەتا) دوو کەسن.

کاتێ زاخوس ئەم قسەیەی بیست، دەستی "مەتتا"ی گرت و گوتی: وەرە با لێرە بڕۆین و واز لەم دوو ڕۆمییە بێنین.

بەڵام من نەمهێشت ئەو دوو کەسە بڕۆن و تا ئەو شوێنەی کە توانیم، خۆم بچووك کردەوە و لالأمەوە و گوتم: ئێوە کە قوتابی عیسان و خۆتان لە هەموو کەسێ بە نزیکتر دەزانن لە عیسا، دەبێ بەزەییتان بە مندا بێتەوە. من سەرم لەوە سوڕدەمێنی کە بۆچی ئێوە پەیڕەوی لە دەستوورەکانی عیسا ناکەن و وەکو ئەو، هەموو کەسێك بەخۆتان ناگرن. ئایا لە ئایینی ئێوەدا هاتنە ناوەوەی ئەو بێگانانەی کە بە ڕاستگۆیی و خۆشحاڵییەوە دێن بەرەو لای ئێوە، قەدەغەیە؟ ئێمەی ڕۆمییەکان ئەگەر بزانین کەسانێك بە ڕاستگۆیی و بەخۆشحاڵییەوە بەرەوڕوومان دێن، جێگایان دەکەینەوە، ئەی بۆچی ئێوە جێی ئەو کەسانە ناکەنەوە کە بە ڕاستی بەرەو لای ئێوە دێن؟ خۆ ئەگەر کابرایەکی دەوڵەمەند خواردن بخوات، پاشماوەکەی خۆی دەدات بە سەگەکان ئەگەرچی ڕقیشی لە سەگەکان بێت. ئێستەش ئێوە لە ئاستی مندا دەوڵەمەندن، چونکە عیساتان ناسیوە و دەزانن چی گوتووە، بۆیە من داوا لە ئێوە دەکەم زانیاریم پێ ببەخشن و ئەوەی عیسا گوتویەتی، بە منیش بڵێن.

پێش ئەوەی مەتتا وەڵامی من بداتەوە، ئادان ئابر ڕۆشت. ئەو بەجورێك لەو ژووره چووه دەرەوه وەك بڵێی ناتوانێ لەوه زیاتر پاڕانەوه و لاڵانەوەی ڕۆمییەك لەبەردەم دوو یەهوودیدا، ببینێت.

پاش ڕۆیشتنی ئەفسەره ڕۆمییەکە، مەتتا خۆی بەزەویدا دا و دەستی بە ڕوخساریدا هێنا و گوتی: کابرای ڕۆمی، تۆ داوا لە من دەکەیت ئامۆژگاریت بکەم و بڵێم کە عیسا چی گوتووه، لەکاتێکدا من هێشتا متمانەم بە تۆ پەیدا نەکردووه، هەروەها ئێمە لەنێو خۆشماندا کە قوتابی عیساین، ناکۆکین. پترۆس کە یەکێکە لە قوتابییەکانی عیسا قسەیەك دەکات و یۆحەنناش کە قوتابییەکی تره قسەیەکەی تر دەکات. ئێمە وەکو کۆمەڵێك پەز واین و کەوتووینەتە بەر هێرشی گورگەکان و لەترسی گورگ، هەریەکەمان بەرەو لایەك ڕادەکەین. لەکاتێکدا ئەو مەڕانە هەرکاتێ کۆببنەوه، زیاتر دەتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن. لەوانەیە تۆش کە زوناریکت کردووه بە جلوبەرگەکانتەوه، یەکێك بیت لەو گورگانەی کەوا بەرگی مەڕت پۆشیوه تا بتوانی لە نهێنییەکانی ئێمە تێ بگەیت.

گوتم: من ئەگەر گورگ بوومایە و بەرگی مەڕم لەبەردا بووایە، ئەوەندە لەبەردەم ئێوەدا خۆم بچووك نەدەکردەوه، چونکە گورگ ئەگەر لەبەرگی مەڕیشدا بێت، ناتوانێ بەگشتی ڕەفتاری خۆی بگۆڕێت و هەر بە گورگی دەمێنێتەوه. من بۆیە ئەوەندە لەبەردەم ئێوەدا خۆم بچووك کردۆتەوه چونکە حەز دەکەم لە زانیارییەکانی عیسا سوودمەند ببم.

مەتتا گوتی: تا ئەو ڕۆژەی کە عیسا لە نێوانماندابوو، ئێمە یەك دەنگ بووین و هیچ ناکۆکییەك لەنێوانماندا دروست نەبوو، مامۆستا و پێشەواکەی ئێمە دەیگوت ((ئەگەر دەستی ئێوه خراپەیەکی کرد، ئەوا ئەو دەسته ببڕنەوه و هەرکاتێ چاوتان خراپەیەکی کرد، ئەو چاوه لەناو کاسەدا دەربێنن). بەڵام ئەمڕۆ وا نییە و پێم وانییە لەنێوان قوتابییەکانی عیسادا دوو کەس بدۆزیتەوه کە لەهەموو ڕوویەکەوه یەك بیروباوەڕیان هەبێت.

گوتم: مەتتا، ئەمانەی کە تۆ گوتت هەمووی ڕاستە، بەڵام وەڵامی داخوازییەکەی منت نەدایەوه. من داوا لە تۆ دەکەم زانیاریم فێر بکەیت و پێم بڵێیت کە عیسا چی گوتووه و ئامۆژگارییەکانی چی بوون. ئەگەر ئەم کارەت بەلاوه ناڕەحەتە یان ناتەوێ زانیاریم فێربکەیت، ئەوا پێم بڵێ چۆن لەگەڵ عیسادا پەیوەندی بەرقەرار بکەم. پێموایە

عیسا شتێکی بە ئێوە داوە کە بەهۆیەوە هەرکاتێك بتانەوێ، دەتوانن پەیوەندی پێوە بکەن. ئەم شتەش بەمن بڵێ تاکو خۆم پەیوەندی لەگەڵ ببەستم. من دڵنیام کە هەرکاتێ لەگەڵ عیسادا ئاشنا ببم، ئەوا لە زانیاریەکانی خۆی سوودمەندم دەکات.

زاخوس کاتێ ئەم قسەیەی بیست، دەستی خستە سەر شانی مەتتا و گوتی: ئەم پیاوە زیرەکە و دەیەوێ پەی بەو نهێنیانەی عیسا بەرێت کە تەنانەت ئێمەش ئاگامان لێی نییە. دوێنێ لە ماڵی شەمعون لە منی پرسی کە کاتێ عیسا هاتووە بۆ ماڵی من، چی پێ گوتووم و ئەمڕۆش لێم دەپرسێ کە ئێوەی شوێنکەوتووانی عیسا، بەچ شێوەیەك دەتوانن پەیوەندی پێوە بکەن تاکو هەرچی زووە ڕۆمییەکان یان ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان ئاگادار بکاتەوە و ئەوانیش جارێکی تر عیسا دەستگیر بکەنەوە و لەخاچی بدەنەوە.

گوتم: زاخوس، من سیخوڕ نیم تا ئەو شتەی کە لە مەتتای دەبیستم بیگەیەنمە لای ڕۆمییەکان و ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان. بەڵام ئەگەر سیخوڕ بوومایە و بڕۆشتمایە و ئاگادارم بکردنایەتەوە، ئەوان هەر نەیاندەتوانی جارێکی دی عیسا دەستگیر بکەنەوە و لەخاچی بدەن، چونکە پیاوێك کە ئەوەندە بەتوانا بێت پاش ئەوەی کە مرد، خۆی زیندوو بکاتەوە و لەناو گۆڕ بێتە دەرەوە، دەستگیر ناکرێت و لە سێدارە نادرێت. هیچ هێزێك لە دنیادا ناتوانێت پیاوێکی ئاوا دەستگیر بکات و لەخاچی بدات. کەواتە ئەگەر سیخوڕیش بوومایە، هەر نەمدەتوانی هیچ زیانێك بە عیسا بگەیەنم.

مەتتا وەکو ئەوە وابوو کە قسەکەی منی پەسەند کردبێ و گوتی: عیسا هەندێ شتی بە هەموومان دەگوت و هەندێ خاڵیشی لەگەڵ تاکە تاکەی ئێمەدا باس کردووە. بەڵام لەو ڕووەوە نا کە ئەوانی تر شایەنی بیستنی ئەو بابەتە نەبن، بەڵکو لەبەرئەوە بووە کە دەیزانی شێوەی بیرکردنەوەی هەریەکێ لە ئێمە جیاوازە و تەنیا دەتوانین لەو بابەتانە تێبگەین کە بەدەمیدا دێت و لە شتەکانی دیکە تێناگەین. عیسا دەیزانی کە من کابرایەکی گومرگیم و تەنیا لە ژمارە دەزانم، بۆیە بەجۆرێك قسەی دەکرد کە زیاتر باسی ژمارە و کێشی دەکرد. لە کۆی ئەو شتانەی کە عیسا بە ئێمەی گوتووە، وا دەگەیەنێت کە ئەو نێردراوی خودایە. ئێستەش ئەی کابرای ڕۆمی، تۆ دەتەوێ بزانی فێرکردنەکانی عیسا چی بووە، بەڵام دەزانم کە ڕۆمییەکان ناتوانن پەی بە زانیاریەکانی عیسا ببەن.

پرسیم: بۆچی؟

مەتتا گوتی: چونکە ئێوەی ڕۆمی بە بەڵگەوە ئیش دەکەن و لە ڕووی لۆژیکەوە لەهەموو شتێك دەکۆڵنەوە. کاتێ کە هۆشی ئێوە نەیتوانی پەی بە هۆکاری شتێ ببات، ئیتر وادەزانن ئەو شتە لە ڕووی شێتییەوەیە، ئەگەریش بەهۆی شێتیی نەزان، ئەوا وادەزانن کە بێژەری ئەم قسەیە کاڵفامە، چونکە ئێوە نەتانتووانیوە پێوەری لۆژیك و بەڵگەی خۆتان بسەلمێنن.

گوتم: مەتتا، تۆ لەبارەی منەوە کە ڕۆمییەکم، هەڵە دەکەیت. کاتێ من شتێك دەبیستم، ئەوا دەگەڕێمەوە بۆلای ئاوەزی خۆم تا بزانم هزرم پەسەندی دەکات یان نا. ئەگەر هۆشمم پەسەندی کرد و لە کاتێکیشدا ئەگەر پەسەندی نەکرد، هەر نالێین بێژەری ئەو قسەیە شێتە، بەڵکو دەڵێین ناتوانین پەسەندی بکەین. ئێمە لە ڕۆم خودایەکمان هەیە بەناوی (ژوپیتەر) ئەو گەورەی خوداکانە و هەورەگرمە و هەورە بروسکە دروست دەکات. ئێمە واماندەزانی گەورەی خوداکان بۆئەوە هەورە بروسکە و هەورە گرمە دروست دەکات تا باران ببارێنی و کێڵگە و زەوی و دارستانەکان تێرئاو بکات، بەڵام سەیرمان کرد گەورەی خوداکان هەندێ جار بۆئەوە هەورەگرمە ناکات بۆئەوەی زەوی و کێڵگە و دارستانەکان تێرئاو بکات، بەڵکو بۆئەوە دروستی دەکات تا لافاوێك دروست ببێ و هەموو شتێك لەناو ببات و خۆر دەرنەکەوێ و خەڵك لەناو ببات. هەرچەندە ئەوکارەی گەورەی خوداکان دژی هزر و لۆژیکە، بەڵام هێشتا ئێمە نالێین کە ئەو شێتە، بەڵکو دەڵێین ئێمە ناتوانین لە هۆکارەکانی ئەو کارە تێبگەین.

لەبارەی فێرکردنەکانی عیساشەوە هەروایە و ئەگەر من نەتوانم بە بەڵگەکانی هزر پەی بە فێرکردنەکانی عیسا ببەم، ئەوا پێی نالێم دێوانە، بەڵکو دەڵێم خۆم کورتم هێناوە و ناتوانم لەوە تێبگەم کە عیسا گوتوویەتی.

مەتتا گوتی: عیسا دەڵێ مەلەکوتی من لەم دنیایەدا نییە و، ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان ئەم قسەیان بەدڵ نەبوو و بە دوور لە لۆژیك و هزرێکی تەندروستیان زانی، ئایا تۆ ئامادەیت ئەم گوتەیە پەسەند بکەیت؟

گوتم: بەڵێ، من ئەم قسەیە پەسەند دەکەم، چونکە بڕوام وایە کە عیسا گوتوویەتی (( قەڵەمڕەوی من لەم دنیایە، لەگەڵ ئەو خەڵکە نییە کە لەم دنیایە دەژین، بەڵکو دەبێ ئەم قۆناغە تێپەڕێت و خەڵکی ئەم سەردەمەش دەبێ بڕۆن و خەڵکێکی تری باشتر لە خەڵکی ئەم سەردەمە جێگەیان بگرنەوە)).

مەتتا گوتی: باش تێنەگەیشتوویت. مەبەستی عیسا ئەوە نییە کە خەڵکی ئەم سەردەمە بڕۆن و خەڵکی تر جێگەیان بگرنەوە، بەڵکو عیسا دەیەوێ بڵێت کە ئەو لە

دینای نوێدا، واتە ئەو دنیایەی کە هەرگیز دوایی نایەت، واتە دنیای پاش مەرگی مرۆڤەکان، بوونی هەیە و ئەویش هەرگیز لەناو ناچێت.

ئێمە دوازدە کەسین کە بە قوتابی عیسا دەژمێردرێین و پێمان وایە بۆئەوە، لەجیاتی یازدە کەس یان سیازدە کەس، دوازدە کەسی لە ئێمە هەڵبژاردووە تا بەسەر دوازدە گەلەکەی جوولەکەدا فەرمانڕەوایی بکەین.

گوتم: من پرسیارەکەشم ئەوەیە کە ئایا عیسا بۆئەوە هاتووە کە ئایینی جوولەکە بەهێزتر بکات یان ئایینێکی تری لەجێی دابنێ؟ ئێوە دەڵێن کە گەلی جوولەکە بەهۆی مەسیحەوە لە سەرانسەری دنیادا حکومەت دەکەن و واتای ئەم قسەیە ئەوەیە کە عیسا بۆ بەهێزکردنی ئایینی جوولەکە هاتووە نەك بۆ لەناوبردنی.

مەتتا گوتی: گومانی تێدا نییە کە عیسا بۆئەوە نەهاتووە تا ئایینی یەهوودی لەناو ببات، چونکە کاتێ عیسا چووە ناو پەرستگا گەورەکەی یەهوودییەکانەوە، گوتی: ئێرە ماڵی باوکی منە. عیسا بۆئەوە هات کە ئایینی یەهوودی باشتر بکات. کەواتە چۆن دەکرێ عیسا ئەو یاسا و دەستورانەی خودا کە لەلایەن ئیبراهیم و موساوە نێردراوە بۆ گەلی یەهوود، بەتاڵ بکاتەوە؟ لەلایەکی ترەوە، بێگومان عیسا یاسا و دەستووری نوێی هێناوە، بەڵام ئەم یاسا و دەستورانە دەبێتە هۆی دوژمنایەتی و دووبەرەکی لەنێوان گەلی یەهووددا.

زاخوس بە مەتتای گوت: کێشەکانمان بەپێی پێویست ناڕەحەتمان دەکەن و پێویست ناکات ئەو شتانە لەلای بێگانەیەکدا باس بکەیت.

گوتم: لەبەرئەوەی من ڕۆمیم بۆیە بە بێگانەم دەزانن و ئامادە نین ڕێنوێنیم بکەن.

زاخوس گوتی: من ماوەیەك لەگەڵ ڕۆمییەکاندا ئیشم کردووە و دەیانناسم و دەزانم کە ئێمەی یەهوودی نابێ ڕۆمییەکان ئاشنا بکەین بە نهێنییەکانی ئایینەکەی خۆمان، چونکە ئەگەر ڕۆمییەکان پەی بە نهێنییەکانی ئێمە بەرن، ئەوا یاسا و ڕێساکانی خۆیان بەسەر ئێمەدا دەچەسپێنن و پاشان ڕۆژێ دادێ کە ئێمەش وەکو ئەوان گۆشتی بەراز بخۆین.[41]

پرسیم: ئامادە نین لە ئامۆژگارییەنی عیسا سوودمەندم بکەن و یاساکەنی ئەوم پێ بڵێن؟

---

[41] ئەوەی لێرەدا دەگوترێت، بیروڕای کۆمەڵێك لە زاناکانە کە دەڵێن ((عیساییەکان گۆشتی بەراز ناخۆن، بەڵام پاش ئەوەی لەگەڵ ڕۆمیەکاندا یەکێتییان پەیدا کرد، کەوتنە ژێر کاریگەری یاسا و ڕێساکانی ڕۆمیەکان و دەستیان کرد بە خواردنی گۆشتی بەراز.

مەتتا گوتی: نەخێر، چونکە تۆ بیانیت و ئێمە ناتوانین ڕێگەی ڕاست نیشانی بێگانەیەك بدەین.

گوتم: مەتتا، ئێوە ئامادە نەبوون لە زانیارییەکانی عیسا سوودمەندم بکەن و ڕێگەی ڕاستم پێ نیشان بدەن، بەڵام من بە تەنیایی و بەبێ یارمەتی ئێوە ڕێگەی ڕاست دەدۆزمەوە و دەشزانم کە دەگەمە شوێنی مەبەست و لەمەش زیاتر ئێوە ئازار نادەم و ئەگەر حەز دەکەن ئەوا دەتوانن بڕۆن.

زاخوس بە توندی سەیری منی کرد و هیچی نەگوت، بەڵام مەتتا بەبێ ئەوەی بە توندی سەیرم بکات گوتی: من لە خودی عیسام بیستووە کە گوتی لەوانەیە ناوی زۆر کەس ببرێت، بەڵام بانگەوازکەر و هەڵبژێردراو نەبن. لەوانەیە تۆش لێ ببڕێیت و بتەوێ عیسا بناسی، بەڵام لەوانەیە نەتوانی بیناسیت و ڕێگەی ڕاستیش نەدۆزیتەوە.

دوای ئەم گوتەیە، مەتتا کەواکەی خۆی دا بەسەریدا بۆئەوەی ڕوخساری نەبینرێت و بەبێ ئەوەی ماڵئاواییم لێ بکات لە ژوورەکە چووە دەرەوە و لە پلیکانەکان چووە خوارەوە. پاش ئەو، زاخوس بەبێ ئەوەی خوداحافیزی بکات، لە ژوورەکە چووە دەرەوە.

پاش ڕۆیشتنی ئەو دوو کەسە، بەهۆی خەمبارییەکی زۆرەوە لەسەر تەختەخەوەکەی خۆم ڕاکشام و هەردوو دەستم خستە سەر دەموچاوم، پاشان لەناکاو تووشی نائومێدی بووم چونکە مەتتا بەمنی گوت تا نەبم بە جوولەکە مەحاڵە بتوانم عیسا بناسم و ڕێگەی ڕاست بدۆزمەوە و نەشمدەتوانی ببم بە جوولەکە.

هەندێ جار بیرم لەوە دەکردەوە لەو شارە کە دانیشتوانەکانی خودایەکی بێ شکڵ دەپەرستن، بڕۆمە دەرەوە و بگەڕێمەوە بۆ ڕۆم.[42] من لەم شارەدا نامۆ بووم و هەرچەندە وەکو یەهوودییەکان ڕیشم هێشتبووەوە و جلوبەرگی یەهوودیم لەبەر کردبوو، بەڵام کاتێ بە ڕێگاکاندا دەڕۆیشتم، ئەوانەی لە تەنیشتمەوە گوزەریان دەکرد، ڕوویان وەردەگێڕا و سەیری منیان نەدەکرد و دیار بوو کە دەزانن من بێگانەم.

هەندێ جار بەخۆم دەگوت لەم شارە کۆچ بکەم و بڕۆم بۆ شاری قەیسەرییە. ئەگەرچی قەیسەرییە شارێکی فەلەستینە، بەڵام بە یەکێ لە شارەکانی ڕۆم دەژمێردرا و لەوێش هەم سێرك هەیە و هەمیش تەماشەخانە و، دەتوانم لەوێ ڕابوێرم و کاتەکان بەخۆشی بەسەر بەرم.

---

[42] هەموو خوداکانی ڕۆم پەیکەر بوو، واتە شکڵ و شێوەیان هەبوو و ڕۆمەییەکان و وڵاتە بێ ئایینەکانی تر دەیانگوت کە جوولەکەکان خودای بێ شکڵ و شێوە دەپەرستن.

پاشـان داهـاتووی خـۆم دەهێنایـە بەرچـاوم و سـەیرم دەکـرد کـە ئەگـەر وەکـو ڕۆمییەکانی تر، کاتەکانی خۆم لە ڕابواردن و خۆشیدا بەفیڕۆ بدەم، ئەوا لە دوای بیست ساڵی تر، واتـە لـە تەمـەنی پـەنجا ساڵیدا دەبم بـە کابرایەکی قەڵـەو و ورگ دەرپـەڕیو و سـەرێکی بـێ تـوك و، چـەند ددانێکیـشم کـەوتووە و هـەموو نیـشانەیەکی پیریـم لێ دەرکەوتووە.

خۆم وادەهاتە بەرچاو کە بەهەیکەلێکی قورس و دەمـی بێ ددان و سـەرێکی بێ مـوو، یـان سـەرێکی سـپییەوە لـەنێوان کۆمـەڵێك لـە مۆسـیقاژەن و گـۆرانی بێـژ و چەند ئافرەتێکی هەرزەدا دانیشتووم و مۆسیقاژەن و گۆرانی بێژەکان ئاهەنگی خۆش دەچڕن و، ئافرەتە هەرزەکانیش بە لارولەنجەکانیان تێدەکۆشن من بخەنە سەما، بێ ئاگا لـەوەی کە پیاوێکی بەساڵدا چوو ناتوانێ سەما بکات.

پـاش ئـەو قۆناغـە، سـەرەی مـردن دێـت و پـاش مـردنیش دەمخەنـە سـەر ئـاگر و دەمسوتێنن و خۆڵە مێشەکەم دەکەنە ناو دەفرێکەوە و لە یەکێ لە گۆرستانەکان یان لـە یەکێ لە پەرستگاکاندا ئەسپەردەم دەکەن.[٤٣]

ئەوکاتـە دەسـتکەوتی ژیـانی مـن لـەم جیهانـەدا وەکـو دەسـتکەوتی ژیـانی ئاژەڵێك وایە کە جگە لە خـواردن و خواردنـەوە و تێرکردنـی ئارەزووەکـانی تـر، هـیچ مەبەسـت و ئامانجێکی نییە.

هەرچی زیاتر بیرم دەکردەوە، زیاتر بۆم دەردەکەوت کە من ناتوانم وەکو ئاژەڵ بژیم و تەمەنی خۆم بە خواردن و خواردنەوە و تێرکردنی ئارەزووەکانی ترم بگوزەرێنم.

زۆربەی خانەدانە ڕۆمییەکان خۆشی دنیایان لە خواردن و خواردنەوە و تێرکرنـی ئارەزوەکانیاندا بەدی دەکرد و بەدی دەکـەن، بـەڵام مـن نەمـدەتوانی وەکو ئەوان بم. مـن ئەگـەر بمویـستایە بخـۆم و بخۆمـەوە و کاتـەکانی خـۆم لەگـەڵ ژنانـدا بەسـەر بـەرم، ئـەوا ماوەیـەك لـە زانکـۆی رودسـدا وانـەم نەدەخوێنـد و لـە میـسرەوە ڕێـی ئـەم شـارەم نەدەگرتەبەر.

من لـە منداڵیـەوە هەسـتم دەکـرد شـتێك لەمنـدا هەیـە کە لـە منـداڵی خانەدانەکانی تری ڕۆمدا نییە و، ئەو شتەش وای لە من کردووە تا لـە منداڵەکان دوور بکەومـەوە و لـە بیرکردنەوەدا ڕۆ بچم و، لەکاتێکدا کە منداڵەکان یارییان دەکرد، من کتێب بخوێنمەوە.

---

[43] دیارە ئەوە یەکێ لە تایبەتمەندەکانی رۆم بووە. (و.کوردی)

کاتێ دوازده ساڵان بووم، دەیانویست من بکەن بە ئەندامی (کۆمەڵەی ئەدەبی ڕۆم) و ئەگەر دژایەتی و ناڕەزایی دوو کەس لە ئەندامە بەتەمەنەکانی ئەو کۆمەڵەیە (کۆمەڵەی ئەدەبی) نەبووایە، ئەوا من دەوبوومە ئەندامی کۆمەڵەی ئەدەبی.[44] پاش ئەوەی کە گەورە بووم، ئەوا هەرچەندە بە تکای گەنجێك هەندێ جار دەچووم بۆ لای ژنان، بەڵام ئەو حەزە هەرگیز نەبوو بە نەریتێك کە نەتوانم خۆمی لێ لانەدەم و، هەموو جارێ پەشیمان دەبوومەوە کە بۆچی پیاوێکی وەکو من دەبێ بۆ لای ژنان بچم.

نا، پیاوێکی وەکو من ناتوانێ وەکو خانەدانەکانی تری ڕۆم تەمەنی خۆی لە گاڵتەوگەپدا بەفیڕۆ بدات و دەبێ لە دەرەوەی ژیاندا شتێك بەدەست بخات کە نرخی هەبێت و، ئەگەر من بتوانم عیسا بناسم و ڕێگە ڕاستییەکەی بدۆزمەوە، ئەوا لە تەمەنی خۆمدا ئەنجامێکی بەسوودم دست کەوتووە.

کاتێ بیرکردنەوەی من گەیشتە ئێرە، هەستامەوە و لەسەر تەختەخەوەکەم دانیشتم، چونکە لەناکاو بۆم دەرکەوت کە ئەگەر قوتابییەکانی عیسا باوەشیان بۆ بکردمایەتەوە و ئەوەی کە دەیانزانی بە منیان بگوتایە، ئەوا بێگومان بەهۆی وتووێژ و لێکۆڵینەوەوە خۆم دەسەلماند، چونکە کابرایەکی فەلسەفیم و، پیاوێکیش کە فەلسەفە فێر بووبێت، بەبێ بوونی بەڵگە قسەی خەڵك پەسەند ناکات و داوای بەڵگەیان لێ دەکات. قوتابییەکانی عیساش پیاوانی خوێندەوار و فەلسەفی نەبوون تا بتوانن بە بەڵگەوە بۆم بسەلمێنن کە ئەوەی عیسا گوتوویەتی و دەیڵێت، ڕاستە. لە ئەنجامدا گومانم بۆ دروست بوو و بە خۆم دەگوت کە لەوانەیە ئەوەی عیسا گوتبێتی، ڕاست نەبێ. دەی باشترە کە قوتابییەکانی عیسا منیان پەسەند نەکرد و منیان لە خۆیان دوور خستەوە و دۆخێك نەهاتە پێشەوە کە من لەگەڵ ئەواندا وتووێژ و لێکۆڵینەوە بکەم و تووشی گومان و دوودڵی ببم.

ئەو بەشەی کە پەیوەندی بە پەیامی عیسا و نێردراوی ئەوەوە هەبوو، زۆر کاری لە من کرد و زانیم ڕاستە. عیسا پاش ئەوەی کە هات و قسەکانی خودای گەیاند و مرد، زیندوو بوویەوە و گەڕایەوە بۆ ئەم دنیایە و سەلماندی کە نێردراوی خودایە. ئەو،

---

[44] لەبەرئەوەی ئەم قسەیەی چیرۆکخوان لەوانەیە بەدرۆ بزانرێت بۆیە ئێمەش دەڵێین کە هەر لەم سەردەمەدا (ئێدوارد تایلەر)ی زانای یەهوودی ئەمەریکایی و دروستکەری یەکەمین بۆمبی ئەتۆمی، کاتێ کە یازدە ساڵان بووە، بوو بە ئەندامی کۆمەڵەی کانزاناسی ئەمریکا. هەموو ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە لە زاناکانی کانزاناسی پێك هاتبوون و گەنجترین ئەندامی ئەو کۆمەڵەیە لەدوای (ئێدوارد تایلەر) تەمەنی شەش ساڵ بوو، جگە لەو منداڵە یازدەساڵە کە بەجۆرێك لێهاتوویی خۆی لە زانستەکەدا نیشان دا تا ئەویان کرد بە ئەندامی کۆمەڵەی کانزاناسی.

پاش ئەوەی کە هاتە سەر زەوی گوتی ((ئەی بار قورسەکان وەرن، من ڕزگارتان دەکەم)). بەڵام نەیگوت ((ئەی جوولەکە بارقورسەکان وەرن، من ڕزگارتان دەکەم)).

ئەمە دەیسەلمێنی کە عیسا ئەوە بووە و هەیە کە هەموو میللەتی دنیا ڕزگاریان بێ و منیش کە ڕۆمییەکم، چانسی ڕزگاربوونم هەیە.

لەو کاتەدا چرای ژوورەکەم کوژایەوە، چونکە ڕۆنی چراکەم تەواو ببوو، بەڵام من لە تاریکی نەترسام، چونکە هەستم دەکرد کە جووتێ چاوی ڕووناک لە دەروونی مندایە.

چاوەکانی جەستەی من، جگە لە تاریکی هیچی تری نەدەبینی، بەڵام چاوەکانی دەروونم ڕووناکی دەبینی و بە هێمنی گوتم: عیسا، ئەگەرچی ئێستە تاریکە بەڵام من حەزدەکەم تۆ ببینم، ئایا دەکرێ خۆت نیشانی من بدەیت و لەگەڵ من بدوێیت و ئەو شتانەی کە لە زمانی قوتابییەکانەوە بیستوومە، لە تۆی ببیستم؟

لەو کاتەدا دەستێ کەوتە سەر شانم و من چاوم کردەوە و سەیرم کرد خاوەن ماڵەکەم بە چرایەکەوە هاتە ژوورەکەمەوە. ئەو پیاوە چراکەی خستە سەر ڕەفەکە و پێی گوتم: چیت لێ هاتووە و بۆچی لە تاریکیدا دانیشتوویت، ئایا نەخۆشیت؟

گوتم: نەخێر.

خاوەن ماڵ گوتی: من پێموایە ئەو جولەکانەی کە هاتن بۆ ئێرە تۆیان وا لێ کردووە و، دەترسم هاتوچۆ لەگەڵ ئەم کەسانەدا شێتت بکات.

پرسیم: بۆچی دەترسی من شێت ببم؟

خاوەن ماڵ گوتی: ئەم ئاکارەی تۆ کە لەم تاریکییەدا دانیشتویت و دەنگت لێوە نایەت و داوات لە من نەکرد چراکەت بۆ دابگیرسێنم، نیشانەی شێتییە؟

گوتم: من لە تاریکیدا پێویستم بە چرا نەبوو، چونکە ناخی خۆمم بە ڕووناکی دەبینی.

خاوەن ماڵ گوتی: ئەم قسەیەشت بەهۆی شێتییەوەیە و پیاوی ژیر شتێك ناڵێ کە باوەڕ پێنەکراو بێت. بەڵام مەزن تیوس، من دەزانم چارەسەری تۆ چییە؟

پرسیم: چارەسەری من چیە؟

خاوەن ماڵ گوتی: دەردی تۆ تەنیاییە و چارەسەری ئەم دەردە ژنهێنانە. مەزن تیوس، پیاوێ کە بگاتە تەمەنی تۆ، واتە ماوەی سی ساڵ لە تەمەنی تێپەڕیبێت، دەبێ

**ژن بهێنێت و ئەگەر ژن نەهێنێت، تووشی سەراسێ دەبێت.[45] تۆ کابرایەکی دەوڵەمەندیت و دەتوانی ژن بێنیت و، ئەگەریش سەروەت و سامانت نەبوایە ئەوا دیسان توانات هەبوو ماڵێك بکڕیت و ژنێکی گەنج بهێنیت تامنداڵت بۆ بێنێتە دنیاوە و، بەم شێوەیەش تۆ لەگەڵ منداڵەکانی خۆت سەرقاڵ دەبیت، چونکە دەزانم کە هەموو ئەو کەسانەی خەڵکی ڕۆمن و ناسنامەیان هەیە، بۆ بژێوی ژیانیان مانگانەیەکی بەردەوام لە حکومەتی ڕۆم وەردەگرن و پێویستیان بە کارکردن نییە. ئەگەر تۆ هەژاریش بوویتایە و سەروەت و سامانیشت نەبوایە، ئەوا دیسان هەر توانات هەبوو ژن بێنیت، چونکە گەنجیت و توانای کارکردنت هەیە. مەگەر من کاتێ ژنم هێنا سەروەت و سامانم هەبوو؟**

**گوتم: پیاوی باش، باسی ژنهێنان وەلابنێ و ئەگەر خواردن هەیە لە ماڵدا، بۆم بێنە چونکە برسیمە.**

**خاوەن ماڵ گوتی: من لەم قسەیەی تۆ خەیاڵم ئاسوودە بوو، چونکە بەڵگەی ئەوەیە کە بیری ڕەش و سەراسێکەت دوور کەوتۆتەوە و منیش خۆم برسیمە و هەر ئێستە خواردن بۆ هەردووکمان دێنم.**

**پاشان خاوەن ماڵەکە لە ژوورەکە چووە دەرەوە و چرکەیەك دواتر بە تەبەقێکەوە گەڕایەوە و سەیرم کرد نان و زەیتون و سەوزەی تازەی هێناوە و، دواتر پێکەوە دەستمان بەنانخواردن کرد.**

---

[45] وشەی (سەراسێ) کە لە فارسیدا بە (مالیخولیا) نووسراوە و ئەم وشەیەش لە وشەی لاتینی (مالن خولیا) وەرگیردراوە کە ئەم وشەیە بە (ملیس خول) وەرگێڕدراوە بۆ زمانی یۆنانی کە مانای (بەڵغەمی ڕەش) یان (صەفرا_ڕەنگ زەردی) دەگەیەنێت و هەندێ لە زانایان لەوانە (عەباس ئیقباڵی ئاشتیانی) گوتوویەتی کە (مالیخولیا) لەبەرئەوەی لە وشەی لاتینی (مالن خولیا) وەرگیراوە، بۆیە دەبێ هەر بە (مالن خولیا) بخوێندرێتەوە و بەهۆی هەڵەی لاتینییەوە پیتی(ن) گۆڕاوە بە پیتی (ی). ئەم بیروبۆچوونەش ڕاستە، چونکە هەندێ پیت کە وەردەگێڕدرێتە سەر زمانێکی تر، گۆڕانی بەسەردا دێت.

# هاتنی کەسێکی چاوەڕواننەکراو

ڕۆژی دواتر لە ماڵ چوومە دەرەوە و بە ڕێگاکانی شاردا بەڕێ کەوتم. ئەو ڕۆژە من جگە لە پیاسە کردن هیچ مەبەستێکم نەبوو. لەناو شار کۆمەڵێك لە کاسبکارەکان بازاڕێکی تایبەتیان هەیە، لەوانە مسگەر و ئاسنگەر و پێڵاودروو.

من لە بازاڕی پێڵاودرووا بەسەیری دوورینی پێڵاوەوە سەرقاڵ بووم و پاشان ڕێی دەرەوەی شارم گرتەبەر بۆئەوەی لەسەر یەکێ لە گردە نزیکەکانی نزیکی شارەکە سەیری دیمەنی گشتی شار بکەم.

لەکۆی ئەو شتانەی لە ناوەوە و دەرەوەی شاردا بەدیم کرد، بۆم دەرکەوت هیچ کەسێ لە بیری عیسادا نییە. لە هیچ یەکێ لە شەقامەکانی شاردا لەبارەی عیساوە قسەیان نەدەکرد و لە هیچ دوکانێکدا ناوی عیسا نەدەبیسترا و، وەکو ئەوە وابوو کە دانیشتوانی ئەو شارە بە تەواوی ڕووداوی لەسێدارەدانی عیسایان فەرامۆش کردبێ.

پاش گەڕانەوم بۆ ناو شارەکە، سەرێکم دا لە پەرستگا و چوومە ناو حەوشەی یەکەمی پەرستگاکەوە کە تایبەتە بە بیانییەکان و، کاسبکارەکان تێیدا سەرقاڵن بە کاری خۆیانەوە. لەوێش بەرگوێم نەکەوت کەسێ لەبارەی عیساوە قسە بکات و هەموو قسەکان پەیوەندی بە نرخی شتوومەك و پارەوە هەبوو.

چوونە ژوورەوە بۆ حەوشەکانی تر بۆ بیانییەکان قەدەغەیە، بەڵام ئەگەریش چوونە ژوورەوەی بیانییەکان ئاسایی بووایە، من حەزم نەدەکرد بەشەکانی تری پەرستگاکە ببینم، چونکە لەو ڕۆژەوەی کە دنیا دروست بووە، هەموو پەرستگاکان لە هەموو شوێنێکدا وەکو یەك وان و لە ناویاندا مەڕ و گا و هەندێ جاریش مرۆڤی تێدا دەکەن بە قوربانی و، کاهینەکانی پەرستگا بە بیانووی جۆراوجۆر، زێڕ و زیو لە خەڵك دەستێنن. ئەو ڕۆژە تا نزیکی خۆرئاوابوون، لە شوێنە جیاجیاکانی ناو شار و دەرەوەی شاردا بووم و، کاتێ کە تیشکی خۆر لەسەر دیوارەکانی شاردا دیار نەما، ڕێگەی ماڵەوەم گرتەبەر.

خاوەن ماڵە سریانییەکەم لە بەردەم دوکانەکەی خۆیدا ڕاوەستابوو و هەر کە منی بینی، بەپەلە خۆی گەیاندە من و گوتی: مەزن تیوس، کەسێ هاتووە و دەیەوێ چاوی بە تۆ بکەوێت و ئێستەش لە ژوورەکەدا دانیشتووە و چاوەڕێی گەڕانەوەی تۆیە.

خاوەن ماڵەکە بەجۆرێك ئەم قسەیەی کرد کە وەك بڵێی دەبوو بابەتێکی نهێنی کە نابێت ئاشکرا بکرێت، بە من ڕابگەیەنێت.

گوتم: من لەم شارەدا جگە لە "ئادان ئابر" (ئەو ئەفسەرە ڕۆمییەی کە دوێنێ هات بۆ ئێرە) ئاشنایەتیم لەگەڵ کەسی تر نییە تاکو بێتە ماڵەکەم.

خاوەن ماڵەکە گوتی: خۆشحاڵم بەوەی کە تۆ ئامۆژگارییەکەی دوێنێ شەوی منت جێ بەجێ کرد و بڕیارت دا خۆت لە تەنیایی ڕزگار بکەیت و بە ئافرەتێکت گوتووە بێت بۆ ماڵەکەت و لەم تەنیاییە ڕزگارت بکات. هەرچەندە تۆ گەنجیت و قۆزیت و توانات هەبوو ژنێکی لەو باشتر بێنیت، بەڵام ئەویش خراپ نییە و دوو چاوی جوانی پێوەیە و، بۆئەوەی خەڵك قسەی خراپ نەکەن، پێم گوت کە لە ژوورەوە چاوەڕوانی گەڕانەوەی تۆ بکات. ئەو ئافرەتە ئێستە لە ژوورەکەی تۆدا دانیشتووە و چاوەڕێیە بگەڕێیتەوە.

من بە هیچ ئافرەتێکم نەگوتبوو بێت بۆ ماڵی من و لەم شارەدا هیچ ئافرەتێکم نەدەناسی. لەو ڕۆژەوەی من پێم نایە ئەم شارەوە، تەنیا یەك ئافرەتم بینی ئاشنای من بێت کە ئەویش کلودیای ژنی فەرمانڕەوای گشتی یودە بوو و، ئەو ئافرەتە پاش کۆتایی هاتنی ڕۆژەکانی جەژنی گەورە، لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لەو شارە ڕۆیشت. ئەگەریش لە شارەکەدا بمایە، ئەوا کلودیا نەدەهات بۆ ماڵم. هەربۆیە کاتێ لە پلیکانەکە چوومە سەرەوە، زۆر حەزم دەکرد بزانم ئەو ئافرەتەی هاتووە بۆ دیداری من، کێیە.

پاش ئەوەی چوومە ژوورەوە، سەیرم کرد ژنێك لەسەر زەوی دانیشتووە و بەجۆرێك جلەکەی بە دەوری خۆیدا پێچاوە کە نەمدەتوانی ڕوخساری ببینم. ئەو ژنە کاتێ زانی هاتوومەتە ژوورەوە، پۆشاکەکەی لەسەر ڕوخساری دوور خستەوە و توانیم دەموچاوی ببینم، بەڵام هەر نەمناسی. کاتێ ژنەکە کەوتە قسە و دەنگی بە گوێم ئاشنا بوو، ئینجا زانیم ئەو ژنەیە کە شەوێك لە تاریکیدا ڕووبەڕووم بوویەوە. من ئەو شەوە نەمتوانی ڕوخساری ئەو ژنە ببینم، بەڵام دەنگیم بیستبوو.

ژنەکە گوتی: کابرایی ڕۆمی، ژنێکی وەکو من کە شەوێ لەگەڵ پیاوێکدا ئاشنا بێت، نابێ بە ڕۆژدا بڕوات بۆلای ئەو پیاوە، چونکە زیان بە ناوبانگی دەگەیەنێت. ژنانی وەکو من کەسانێکن کە تەنیا بە شەو لە ماڵ دێنە دەرەوە و بێ ئەوەی ڕۆژ هەڵبێت، دەڕۆنەوە بۆ ماڵەوە و تا شەوێکی تر لە ماڵ ناچنە دەرەوە.

گوتم: مریەمی بێرت، بەو جۆرەی کە دەیبینی من ناوی تۆم فەرامۆش نەکردووە و بە داخەوەم کە ئەو شەوە لە تاریکیدا ڕوخساری تۆم نەبینی، چونکە جوانیت و، بە تایبەت چاوەکانت زۆر جوانە. تۆ بۆ ناوبانگی من ترست نەبێت، چونکە من لەم شارەدا نامۆم و هیچ ناوبانگێکم نییە کە لەدەستی بدەم.

ژنەکە گوتی: باسی جوانی من مەکە، چونکە جوانی، منی چارەڕەش کرد و ئەگەر ژنێکی جوان نەبوومایە، بە شەو هاتوچۆم نەدەکرد.

گوتم: مریەمی بێرت، تۆ بۆچ بابەتێك هاتوویت بۆ ئێرە و دەتەوێ چی بڵێیت؟

ژنەکە گوتی: ئەم شارە وەکو ڕۆم، وەك بیستوومە، شارێکی گەورە نییە تا کەسەکان وەکو ئێرە کە هەمووی یەکتر دەناسن، یەکتری نەناسن و، لەکارەکانی یەکتری دەکۆڵنەوە و دەزانن کە تۆ دەست دەخەیتە ئەو کارانەوە کە پەیوەندی بە تۆوە نییە.

پاشان ئەو ژنە بابەتێکی تری هێنایە پێشەوە و گوتی: ئەو پیاوەت بینی کە گۆزەیەکی ئاوی هەیە؟

گوتم: بەڵێ، ئەوم بینی.

ژنەکە گوتی: پێموایە بەو جۆرەی کە ویستووتە، سوودت لێ نەبینیوە.

من وامزانی مریەمی بێرت کاتێ ڕێنوێنی منی کرد بۆلای ئەو پیاوەی کە گۆزەکەی پێ بوو، ئێستە بۆئەوە هاتووە تا کرێکەی وەربگرێت، بۆیە دەستم کرد بە باخەڵمدا بۆئەوەی پارەی بدەمێ.

مریەمی بێرت گوتی: من بۆئەوە نەهاتووم پارەت لێ وەربگرم و نابێ هیچم بدەیتێ، بەڵکو ئەوە منم کە قەرزداری تۆم.

من بەسەرسامیەوە سەیری ئەو ژنەم کرد و نەمدەزانی بۆچی هاتووە بۆ لای من و چی لێم دەوێ. خاوەن ماڵە سریانییەکەی من تەقەی لە دەرگا دا و پاش ئیزن وەرگرتن، هاتە ژوورەوە و گوتی: خواردنەکەت ئامادەیە و ئەگەریش نان ناخۆیت و وای بەباش

دەزانی کە لەگەڵ هاوڕێکەتدا کات بەسەر بەریت، ئەوا لەوانەیە خواردنەکەت بەگەرمی بۆ هەڵ بگرم تا کاتێ دەرفەتی نانخواردنت دەبێ.

گوتم: خاوەن ماڵە باشەکەم، تۆ سەبارەت بە من و ئەم ژنە هەڵەت کردووە و پەیوەندی من و ئەم ژنە دوورە لەوەی کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە. هاتنی ئەم ژنە، ڕێ لە نانخواردنی من ناگرێت و لەبەرئەوەی برسیمە، پێت دەڵێم کە خواردنەکەم بۆ بێنیت تا لەگەڵ ئەم ژنە نان بخۆم و ئەگەریش خۆت بۆم ناهێنی، ئەوا بە کچەکەت یان ژنەکەت بڵێ خواردنەکە بێنێت.

مریەمی بێرت گوتی: نا نا، من لەگەڵت نان ناخۆم، چونکە نابێ پیاو لەگەڵ ژنێکی وەکو مندا نان بخوات. بهێڵە با لەکاتی نانخواردنـدا خزمەتت بکەم و پاش ئەوەی کە نانت خوارد و تێر بوویت، ئەوا ئەگەر شتێکت لێ مایەوە، من دەیخۆم.

خاوەن ماڵەکە سەیرێکی منی کرد و گوتی: ئەو پیاوەی کە دەیبینی کابرایەکی ڕۆمییە و شارەزای نەریتی ئێرە نییە و نازانێ کە ئەو ژنانەی وەکو تۆ وان، نابێ لەگەڵ پیاواندا نان بخۆن. من ڕازی نابم ژنەکەم یان کچەکەم بۆ هێنانی خواردن بێنە سەرەوە و لەم جێگەیە تۆ ببینن، بەڵام ئیزنت پێ دەدەم بڕۆیتە خوارەوە و لە چێشتخانەدا وەکو کەنیزەکەکان نان بخۆیت.

ژنەکە لەجێی خۆی هەستایەوە و گوتی: من لەگەڵ ئەو پیاوەدا دەڕۆم و لە چێشتخانە خواردنت بۆ دێنم.

ویستم ڕێی لێ بگرم، بەڵام خاوەن ماڵەکە گوتی: بهێڵە با ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات.

ژنەکە لەگەڵ خاوەن ماڵەکەدا ڕۆیشت و ئەوەندەی پێ نەچوو بە تەبەقێکەوە کە چەند دەفرێکی خواردنی لەسەر دانابوو، گەڕایەوە و ئاوی هێنا و من دەستەکانی خۆم شوشت و پارچە پەڕۆیەکی پێدام و دەستم وشك کردەوە.

ژنەکە گوتی: پاش ئەوەی کە نانەکەت خوارد، من دەڕۆم بۆ چێشتخانە و نان دەخۆم.

گوتم: مریەمی بێرت، لەسەر ئەم تەبەقەدا ئەوەندە خواردن هەیە تا سێ کەس تێر بکات و ئێمەش دوو کەسین، بۆیە دانیشە و لێرە نان بخۆ.

مریەمی بێرت گوتی: لەم شارەدا پیاوە یەهوودییەکان لەگەڵ ژناندا نان ناخۆن. تۆ چۆن دەتەوێ لەگەڵ من کە ژنێکی شەوڕەوم، نان بخۆیت؟

گوتم: من یەهوودی نیم و ڕۆمیم بۆیە شورەیی نییە بەلامەوە لەگەڵ ژناندا نان بخۆم.

مریەمی بێرت دانیشیت ومنیش نیوەی ئەو خواردنانەی کە لە تەبەقەکەدا بوو، خستمە بەردەمی ئەو و پاشان کە تێری خوارد، دەستی منی ماچ کرد و گوتی: تۆ یەکەم پیاویت کە بەم شێوەیە ڕەفتارم لەگەڵ دەکەیت و بە هاوسفرەی خۆتم دەزانی. لەم شارەدا، کاتێ کچێ لەدایک دەبێ، باوکی کچەکە وەکو خاوەن پرسە سەرتاپای جلی ڕەش دەپۆشێت و تەنانەت سەیرێکی ڕوخساری منداڵەکەی ناکات و، ئیتر کچەکە بەبێ خوشەویستی باوکی گەورە دەبێت. پاش ئەوەی کە گەیشتە تەمەنی باڵق بوون، باوکی دەیدات بە شوو و هیچ باوکێك گوێ بە تەمەنی مێردی کچەکەی نادات و تەنیا ئەوە لەبەرچاو دەگرێت تا بزانێ ئەوەی کە دەیەوێ ببێ بە زاوای، خاوەنی سەروەت و سامانە یان نا. هەندێ جاریش کچانی دە یان دوازدە ساڵان دەدەن بەو پیرە پیاوانەی کە تەمەنیان هەشتا ساڵ دەبێت.

ئەو ڕۆژانەی کە دەچووم بۆ سەر کانی بۆئەوەی ئاو بهێنم، وێنەی خۆمم لە کانییەکەدا دەبینی و، کە سەیرم دەکرد کچێکی جوانم، حەزم نەدەکرد بمدەن بە پیرە پیاوێکی دەوڵەمەند و هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کاری خراپە بکەم. سەربوردەی من هەر ئەمە بوو و هیچی ترم نییە بۆت باس بکەم، چونکە دەزانم کە خۆت دەزانی کاتێ ژنێك ناوی دەزڕێ، ئەویش لەناو گەلێکی وەکو گەلی یەهوود، تا چ پلەیەك کەم دەبێتەوە.

لەو کاتە بەدواوە، ئیتر کەس بەزەیی بە مندا نەهاتەوە. لەناو گەلی ئێمەدا ژنان بە گشتی لە ئاژەڵ کەمترن، چ بگات بە ژنێك کە وەکو من بەدناویش بێت. بەردەوام دوو شت منی ئازار دەدا، یەکێکیان ئەوەیە کە دەمبینی ژنێکی گوناهکارم و لەلای خودا بێ کەڵکم، ئەوەی تریان ئەوەیە کە دەمزانی هەموو خەڵك بە بوونەوەرێکی گڵاوم دەزانن و پارێزم لێ دەکەن.

گوتم: مریەمی بێرت، گوناهی تۆ لە گوناهی ئەو ژنانە خراپتر نییە کە وەکو تۆ وان و لە ڕێگەی لەش فرۆشیەوە بژێوی پەیدا دەکەن.

مریەمی بێرت گوتی: من لە ژیانمدا هیچ ئومێدێکم نەمابوو و بڕوام نەدەکرد ڕۆژێ دابێت بکەومە بەر لێخۆش بوون، تا کاتێ عیسا هات و پاش ئەوەی ئەو پیاوە دەرکەوت، ئینجا ئومێدێك ڕووناکی بە دڵم بەخشیەوە، چونکە عیسا ناو و ناتۆرەی بە ئێمەی ژنانی خراپەکار نەدەگوت و، بە ڕق و کینەوە لێی نەدەڕوانین و دەیویست ڕێگەی ڕاستیان پێ نیشان بدات. عیسا ڕزق و ڕۆزی دەدا بە هەموو منداڵان و تەنانەت کچە بچکۆلەکانیش، ئەمە لەکاتێکدا کە لەناو گەلی جوولەکەدا باوکەکان ڕقیان لە کچی بچکۆلەیە و بەو جۆرەی کە گوتم یەهوودییەکان لە دوای لەدایك بوونی کچێك، خۆیان ڕەش پۆش دەکەن.

بە داخەوەم کە نەمتوانی لە عیسا نزیك ببمەوە، چونکە دەوروبەرەکەی نەیاندەهێشت نزیکی بکەومەوە، بەڵام لە دوورەوە دەمبینی و سەیرم دەکرد کە قیافەی گوزارشتی لە بەزەیی و هێمنی و چەشنە خۆشەویستییەك دەکات. پاشان، ڕۆحانییەکانی ئێمە، ئەوانەی کە بەدرێژایی تەمەنیان تووشی گوناه نەبوون، مەحکومیان کرد بە لەسێدارەدان و ئەو پیاوە چاکەکارەیان لەخاچ دا و تەرمەکەیان ئەسپەردە کرد.

کاتێ قسەکانی ژنە بەدڕەوشتەکە گەیشتە ئێرە، دەستی کرد بە گریان و پاش ئەوەی کەمێك گریا، ئەشکی چاوەکانی سڕی و گوتی: زیندوو بوونەوەی عیسام لە کەسێك بیستووە کە گومانم لە قسەکانی نییە و هەر ئەو لەبارەی تۆشەوە لەگەڵ من دووا و گوتی کە تۆش دەزانی عیسا زیندوو بۆتەوە و لەناو گۆڕەکەی هاتۆتە دەرەوە.

گوتم: مریەمی بێرت، بۆئەوە هاتوویت کە ئەم مەسەلەیەت بۆ باس بکەم؟

ژنەکە گوتی: ئەوەی کە گوتم، پێشەکییەکە بۆئەو شتەی کە دەمەوێ بیڵێم. من بۆئەوە هاتووم بۆ لای تۆ تا پێشنیار بکەم بە یەکەوە بچین بۆ جەلیلە و لەوێ عیسا ببینین. ئەمڕۆ ئەوەی کە بیەوێ عیسا ببینێت و قاچی هەبێت بۆ ڕۆیشتن، لەم شارە ڕۆیشتوون و تەنانەت کۆمەڵێك لەو ژنانەی کە خوازیاری بینینی عیسا بوون، لەم شارەوە بەرەو جەلیلە کەوتوونەتە ڕێ، چونکە شەوی پێشتر عیسا خۆی بە قوتابییەکان نیشان داوە و گوتوویەتی کە بڕیاری داوە بچێ بۆ جەلیلە و، ئەو کەسانەی کە خوازیاری بینینی ئەون، دەتوانن بڕۆن بۆ جەلیلە.

ئەوەی کە مریەمی بێرت گوتی: بۆ من شتێکی تازە بوو و نەمبیستبوو کە شەوی پێشتر عیسا خۆی بە قوتابییەکانی نیشان داوە و بە پەشۆکاوی گوتم: ژنەکە، زیاتر لەسەر ئەم بابەتە قسە بکە و پێم بڵێ بزانم شەوی پێشتر، عیسا لە کوێ خۆی بە قوتابییەکان نیشان داوە؟

مریەمی بێرت گوتی: شەوی پێشوو یازدە کەس لە شوێنکەوتووانی عیسا، هەر لەو شوێنەی کە پاش زیندوو بوونەوەی عیسا ئەویان بینیبوو، توانیان ئەو ببینن. ئەو یازدە کەسە لە باڵەخانەکەدا کۆ ببوونەوە و عیسا چۆتە ژوورەوە و خۆی پێ نیشان داون. ئەوان بەبینینی عیسا سەرسام ببوون و وایانزانیوە بەهەڵەدا چوون. بەڵام عیسا گوتی ((من لە گۆشت و خوێن و ئێسك دروست کراوم و بوونەوەرێکی خەیاڵی نیم)). بۆئەوەی خەڵکی تر بزانن کە ئەو بوونەوەرێکی خەیاڵی نییە، بەوانی گوتووە کە دەست لە لەشی و بەتایبەت لە برینەکانییەوە بدەن و "تۆماس"یش کە یەکێکە لە قوتابییەکانی عیسا، دەستی خستە سەر برینەکانی. پاشان عیسا گوتی ((من پێش ئێوە دەچم بۆ جەلیلە و هەرکەس خوازیاری بینینی منە، با بێت بۆ جەلیلە و لەوێ چاویان پێم بکەوێت)).

هەر ئەوکاتە، قوتابییەکانی عیسا خۆیان بۆ ڕۆیشتن بۆ جەلیلە ئامادە کرد و ئەمڕۆ بەیانییەکەی، دوو دوو و سێ سێ ڕێی جەلیلەیان گرتەبەر. ژنەکانیش کاتێ زانییان قوتابییەکانی عیسا بەرەو جەلیلە دەڕۆن، ئەوانیش ڕێی جەلیەیان گرتەبەر.

گوتم: تۆ خۆت دوێنێ شەو لەو باڵەخانە بوویت، ئایا لەنێو قوتابییەکاندا عیسات بینیووە؟

ژنەکە گوتی: نەخێر، من دوێنی شەو لەوێ نەبوو.

پرسیم: ئەی چۆن لەم مەسەلەیە ئاگادار کرایتەوە.

ژنەکە گوتی: من ئەم مەسەلەیەم لە مریەمی مەجدەلییە بیست.

گوتم: ئەو چی بە تۆ گوت؟

ژنەکە گوتی: هەموو ئەو شتانەی کە من بە تۆم گوت، مریەمی مەجدەلییە بۆ منی بەیان کرد و گوتی قوتابییەکانی عیسا پێیان گوتووە کە نابێ بێت بۆلای تۆ و ناچاریان کردووە لە تۆ، لەبەرئەوەی بیانیت، خۆی بە دوور بگرێت، هەربۆیە ئەو نەیتوانی بێت

بۆلای تۆ و منی نارد تاکو ئەم هەواڵەت پێ ڕابگەیەنم و پێشت بڵێم کە عیسا چووە بۆ جەلیلە و لەبەرئەوەی کە خوازیاری ناسینی ئەویت، ئەوا بڕۆ بۆ جەلیلە تاکو ببینی.

پرسیم: بۆچی عیسا چووە بۆ جەلیلە و چ بەرژەوەندیەکی هەبووە کەوا ڕۆشتووە بۆ ئەوێ.

ژنەکە گوتی: من ئاگام لە بەرژەوەندی ئەم مەسەلەیە نییە و لەوانەیە قوتابییەکانی عیساش، ئەوانەی کە دوێنی شەو بینیویانە، نەزانن کە بۆچی مەسیح هاتووە بۆ جەلیلە.

پرسیم: بۆچی هاتی بۆ لای من؟

مریەمی بێرت گوتی: بۆئەوەی داوات لێ بکەم من لەگەڵ خۆت ببەی بۆ جەلیلە.

پرسیم: ئەی خۆت ناتوانی وەکو ئەو ژنانەی تر کە بەرەو جەلیلە بەڕێ کەوتوون، بچی بۆ جەلیلە؟

ژنەکە گوتی: ژنەکانی دی بەتەنیا نەڕۆیشتوون، بەڵکو لەگەڵ پیاوەکانی خۆیاندا ڕۆیشتوون. بەڵام کەس ئامادە نییە من لەگەڵ خۆی ببات بۆ جەلیلە، چونکە بە ژنێکی گلاوم دەزانن و هەموویان خۆیان لە من بەدوور دەگرن. جگە لەمانە من پارەی گەشتم پێ نییە و وادەزانم ئەگەر بە تەنیا بەڕێ بکەوم و بڕۆم، ئەوا لە ڕێگادا تووشی سەربازەکانی لژیون یان تووشی دزەکان دەبم.

من دەمزانی ئەوەی کە مریەمی بێرت گوتی، ڕاستە و لەبەرئەوەی کە بیستوویەتی شەوی پێشوو عیسا خۆی بە قوتابییەکان نیشان داوە و پێی گوتوون کە دەڕوات بۆ جەلیلە، بۆیە ئەویش حەز دەکات خۆی بگەیەنێتە جەلیلە.

بەڵام ئێمە لەسەردەمێکدا دەژین کە پڕوپاگەندەی بێ بنەما زووتر بڵاو دەبێتەوە و ڕەنگە مەسەلەی دەرکەوتنی عیسا لە شەوی پێشوودا لەلای قوتابییەکانی، لەوجۆرە پڕوپاگەندانە بێت.

من دڵنیا بووم مریەمی مەجدەلییەش درۆی نەکردووە، بەڵام ئەو کە خۆی لە بالاخانەکەدا نەبووبێ، ئەوا بێگومان دەرکەوتنی عیسای لەکەسانی ترەوە بیستووە. کەواتە پێش ئەوەی بڕۆم بۆ جەلیلە، دەبێ لێکۆڵینەوە بکەم تاکو بزانم ئایا مەسەلەی دەرکەوتنی عیسا لە شەوی پێشوودا و وتووێژی لەگەڵ قوتابییەکاندا، ڕاستە یان نا.

ئەوەبوو بە مریەمی بێرتم گوت: ئێستە شەوە و ناتوانین گەشت بکەین. با ئەمشەو پشوو بدەین و پاش ئەوەی کە ڕۆژ بوویەوە، من لێکۆڵینەوە دەکەم تاکو بزانم ئایا عیسا چووە بۆ جەلیلە یان نا؟ ئەگەر زانیم عیسا چووە بۆ جەلیلە، ئەوا سبەی

پێداویستی گەشت ئامادە دەکەین و بەیەکەوە بەڕێ دەکەوین. من بەجۆرێك پێداویستی گەشت ڕێك دەخەم کە بتوانم بە خێرایی و بەبێ ماندوو بوون بگەینە جەلیلە و لەوێ عیسا ببین.

ژنەکە ئارامی نەگرت و گوتی: لە بەیانییەوە تاکو ئێستا چاوەڕوان بووم بۆئەوەی تۆ ببینم و بەیەکەوە بەڕێ بکەوین بۆ جەلیلە. تۆش دەڵێی پێداویستی گەشت ئامادە دەکەم، بەڵام من دەڵێم پیویستمان بە پێداویستی گەشت نییە و هەر ئێستە دەتوانین بەڕێ بکەوین و لەبەرئەوەی کە هەواش گەرمە، دەتوانین شەوان لە بیاباندا پشوو بدەین.

گوتم: مریەمی بێرت، بە قسەکانتدا دیارە کە ئەزموونت لە گەشت کردندا نییە، چونکە ئەگەر ئەزموونت هەبووایە، ئەوا دەتزانی کە مرۆۆ پێش هەموو گەشتێك، دەبێ پێداویستی گەشت و پێویستی ڕێگا فەراهەم بکات و ئینجا بەڕێ بکەویت بۆئەوەی کە ئەگەر لە ڕێگادا نەخۆش کەوت، بتوانێ خۆی چارەسەری خۆی بکات یان پشوو بدات و، هەروەها بۆئەوەی گرفتاری دەڵەدزەکانیش نەبێت. کەواتە تا سبەی ئارام بگرە و جێبەجێ کردنی کارەکان بسپێرە بە من و خۆم پێداویستی گەشت ئامادە دەکەم و دەتگەیەنمە جەلیلە و کاتێ گەیشتیتە ئەوێ، ئینجا تۆ ڕێنوێنی من بکە.

ژنەکە گوتی: من لە شارەکانی دەوروبەری دەریاچەی جەلیلە، تەنیا شاری "کوفر نائو" دەناسم و شارەزای شارەکانی تر نیم.

گوتم: ناسینی ئەو شارە بەسە، ئێستەش بڕۆ و بخەوە و بەیانی زوو وەرە بۆلای من تا پێت بڵێم کە دەچم بۆ جەلیلە یا نا.

ژنەکە دەترسا بەجێی بهێڵم، واتە نەمەوێ لەگەڵ خۆم بیبەم بۆ جەلیلە بۆیە گوتی: من هیچ شوێنێکم نییە تاکو بۆی بڕۆم و شەو تێیدا بخەوم. بهێڵە با ئەمشەو لەمماڵەدا، لە دەرەوەی ئەم ژوورەدا، لەبەر هەیوانەکەدا بخەوم.

من دەمزانی کە چارەیەکم نییە جگە لەوەی خۆم بە بینینی ئەو ژنە ڕابهێنم، چونکە ئەو چاوەڕێ بوو لەگەڵ خۆم بیبەم بۆ جەلیلە. بۆیە ڕازی بووم کە لە گۆشەیەکی ئەو ژوورەی کە من تێیدا دەخەوتم، بخەوێ.

مریەمی بێرت لە گۆشەیەکی ئەو ژوورەدا خەوت و منیش خەوم لێ کەوت.

## بەرەو دەریاچەی جەلیلە

بەیانی ڕۆژی دواتر، پاش ئەوەی کە دەنگی کەڕەناکانی پەرستگا کەوتە بەر گوێ، مریەمی بێرت لەخەو هەستا و بە هێمنی دەستی کرد بە خوێندنی نوێژی بەیانی. من لە ژوورەکە چوومە دەرەوە و لە پلیکانەکان چوومە خوارەوە و سەیرم کرد خاوەن ماڵە سریانییەکەم دوکانەکەی کردۆتەوە.

پێم گوت: پیاوی باش، کاتی ئەوە هاتووە کە من لەم شارە بڕۆمە دەرەوە و لە گەشت کردنم بەردەوام بم. ئەو ژنەی کە دوێنێ شەو لە ژوورەکەمدا بوو، هێشتاش هەر لەوێیە و بڕیارم داوە لەگەڵ خۆم بیبەم بۆ جێگایەك. بەڵام جلەکانی باش نییە و داوات لێ دەکەم جلێکی باشی بۆ بکڕیت و پەچەیەکی درێژ و جوانیشی بۆ بکڕە با بیدات بە سەریدا تا ئەو کەسانەی کە لەگەڵمدان و دەیبینن، وانەزانن ژنێکی هیچ نەزانە. من دەڕۆم بۆئەوەی کارێك ئەنجام بدەم و هیوادارم تا دەگەڕێمەوە تۆ جلوبەرگەکەت بۆ ئەم ژنە کڕیبێت و پاش ئەوەی کە گەڕامەوە، پارەی جلوبەرگەکەت پێ دەدەم.

خاوەن ماڵەکە گوتی: ئەگەر من لە جێی تۆ بوومایە، جلوبەرگم بۆ ئەم ژنە نەدەکڕی و لەگەڵ خۆم نەمدەبرد بۆ هیچ جێگەیەك. من نازانم لە پاش چوونە دەرەوە لەم شارە بۆ کوێ دەچی، بەڵام ئەوەندە دەزانم کە ئەگەر بتەوێ بچی بۆ هەر شارێك، لەم جۆرە ژنانەی زۆر تێدایە، جا ژنی گەنج و جوانیش. پیاوێکی ژیری وەکو تۆ بۆ ئەم جۆرە ژنانە زەرەر لە خۆی نادات و شارەوشاری پێ ناکات. بەڵام هەرچۆنێك بێت، من خۆشحاڵم کە هۆکارێکت پەیدا کردووە تا پێیەوە مژۆڵ ببیت، هەرچەند ئەگەر ئەو هۆکاری مژۆڵییە ئەم ژنە بیت ئەوا خۆ خەریککردن لەگەڵ ئەم ژنەدا دەبێتە ڕێگر لە بەردەم جوولەکەکاندا کە بیانەوێ تووشی سەراسێت بکەن.

من لە خاوەن ماڵەکەم جیا بوومەوە و بەڕێ کەوتم تاکو خۆم بگەیەنمە دوکانی ئاریستانووسی پارەگۆڕە کە پارەی حەواڵەی منی لەلابوو، چونکە بۆ گەشت کردن بۆ جەلیلە پێویستم بە پارە هەبوو و، بەبێ پارەی نەخت نەمدەتوانی لەو شارە بڕۆم.

ئاریستانووس دوکانەکەی خۆی کردبۆوە و کاتێ منی بینی، زۆر سەرسام بوو و گوتی: ڕیشی تۆ ئێستە زۆر لە ڕیشی من درێژترە و بەم زونارەی کە بەستووتە بە

خۆتەوە لە جوولەکەکان دەچیت. پاشان پرسی: ئەوەی کە ویستت بیزانی، زانیت یان نا؟

گوتم: بەڵێ ئاریستانووس، لێرە ئیشم نییە و دەمەوێ لەم شارە بڕۆم، چونکە هەوای ئێرە گەرمە و بەهۆی نزیک بوونەوەی هاوینیش گەرمتر دەبێ، بەڵام لە کەنارەکانی دەریاچەی جەلیلەدا هەوا فێنکە و دەمەوێ بڕۆم بۆ ئەو ناوچەیە و ماوەیەك لەوێ بژیم و سوود لە هەوای خۆشی ئەوێ ببینم. بیستووشمە کە شاری تەبەرییە یەکێکە لە شارە جوانەکانی ڕۆژهەڵاتی زەوی و پاش ئەوەی کە چووم بۆ ناوچەی جەلیلە، لە شاری تەبەرییەدا نیشتەجێ دەبم.

پیاوە پارەگۆڕەوەکە گوتی: شاری تەبەرییە لەلایەن هیرودی پادشای ئەم وڵاتەوە دروست کراوە و هەموو کەرەستە و پێداویستیەکی خۆشگوزەرانی کە لە ڕۆم و شارەکانی دیکەی یۆناندا هەیە، لەوێش دەستەبەر کراوە بۆئەوەی ئەو گەشتیارانەی کە دەیانەوێ کۆچ بکەن، لەوێ نیشتەجی بن و وایان لێ بکات کە پارەوپوڵی خۆیان لەو شارەدا خەرج بکەن. هەروەها ئەگەر تۆش بڕۆیت بۆ ئەوێ ئەوا پێموایە ڕێوشوێنی گەشتیارەکانی تر دەگریتە بەر و ناچار دەبیت لە تەبەرییەدا بڕێ پارەی باش خەرج بکەیت.

گوتم: ئاریستانووس، مەبەستی من لەم گەشتە تەنیا بۆ خۆشییە و لێتی ناشارمەوە کە لەم گەشتەدا ژنێکیشم لەگەڵدایە.

دراو گۆڕەوەکە گوتی: ئەو ژنەی کە لەگەڵ تۆ دەبێت، چۆنە؟

گوتم: تۆ دەبێ بزانی ژنێك کە ئامادە بێت لەگەڵ پیاوێکی وەکو من کە لەم شارەدا بێگانەم، گەشت بکات، دەبێ چۆن بێت.

ئاریستانووس گوتی: من ناتوانم دەست بخەمە کارەکانی تۆوە، بە تایبەت لەکارێکدا کە باسی ژنی تێدا بێت، چونکە مەسەلەی ژن تەنیا پەیوەندی بەو پیاوەوە هەیە کە خاوەنی ژنەکەیە. بەڵام ئەگەر ئیزنی دەست تێوەردانم هەبووایە لە کارەکانی تۆدا، ئەوا پێم دەگوتی کە لێرەوە ژنێك لەگەڵ خۆت مەبە بۆ تەبەرییە.

گوتم: من ئەم ژنە لەگەڵ خۆم نابەم بۆ جەلیلە، بەڵکو ئەو داوای لە من کردووە تا بیگەیەنمە ئەوێ.

پیاوە دراوگۆڕەوەکە کەمێك سەیری منی کرد و گوتی: من ئاگادارم کە دوێنێ کۆمەڵێك کەس لەم شارەوە بەرەو جەلیلە ڕۆیشتوون و هەندێکیان ژنیان لەگەڵ خۆیان بردووە. نەکا تۆش وەکو ئەوان ڕێی جەلیلە دەگریتەبەر و ژنێکیش لەگەڵ خۆت دەبەی بۆ ئەوێ؟

گوتم: ڕاستیەکەی ئەوەیە کە بیستوومە عیسا، دوای ئەوەی ئەسپەردە کرا و لە گۆڕەکەی زیندوو بوویەوە و هاتە دەرەوە، خۆی بە قوتابییەکانی پیشانە داوە و گوتوویەتی ((من دەڕۆم بۆ جەلیلە و ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ من ببین، بابێن بۆ جەلیلە)). منیش لەبەرئەوەی هیوام وایە لەو ناوچەیەدا عیسا ببینم، بۆیە بەرەو ئەوێ دەڕۆم.

ئاریستانووس بەسەرسامیەوە سەیری کردم و گوتی: مەزن تیوس، ئەگەر من ئەم قسەیەم لە جوولەکەیەك ببیسایە، زۆر سەرسام نەدەبووم، چونکە زۆربەی یەهوودییەکان هیچ زانیارییەکیان نییە و وانەیان نەخوێندووە. کەسانی خوێندەوار و زانایانی جوولەکە، باوەڕ بە شتی مەحاڵ ناکەن، بەڵام کەسانی سادە و هیچ نەزان باوەڕ بەو شتانەش دەکەن کە هزر پەسەندی ناکات. ئەگەر تۆ جوولەکەکی سادە و هیچ نەزان بووتیایە، سەرم لە قسەکانت سوڕ نەدەما، بەڵام سەرم لەوە سوڕماوە کە چۆن ڕۆمییەکی خوێندەواری فەیلەسوف دەڵێ عیسا، پاش ئەوەی کە جەستەیان خستە گۆڕەوە، زیندوو بۆتەوە. مەگەر دەکرێ مردوو زیندوو ببێتەوە؟ مەگەر دەگونجێ مردوویەك کە لەم جیهانەدا ڕۆشتووە، بگەڕێتەوە بۆ ئەم دنیایە؟

قوتابییەکانی عیسا پڕوپاگەندەی زیندووبوونەوەی ئەویان دروست کردووە. ئەوان دەمودەست، پاش بوومەلەرزەکە تەرمی عیسایان لەگۆڕ دەرهێناوە تاکو بتوانن بڵێن کە عیسا زیندوو بۆتەوە. لەم شارەدا ژمارەیەکی زۆری خەڵك عیسایان بینیوە و ناسیویانە و دەتوانن قیافەی بناسنەوە. ئەگەر ئەو زیندوو بووایە، ئەی بۆچی خۆی بە دانیشتوانی ئەم شارە نیشان نادات تاوەکو خەڵك بڕوا بە زیندوو بوونەوەکەی بکەن و بڕوا بکەن کە لە گۆڕ هاتۆتە دەرەوە. ئەگەر گوتەی قوتابییەکانی عیسا لەبارەی زیندوو بوونەوەی ئەوەوە ڕاست بێت، ئەوا دەبێت خۆیان هانی هیسا بدەن تا خۆی بە خەڵك پیشان بدات تاکو هەموو جۆرە گومانێك لەناو بچێت، بەڵام تا ئەمڕۆ یەك کەس لە دانیشتوانی ئەم شارە جگە لە قوتابییەکانی عیسا، ئەویان نەبینیوە و گوتەی

قوتابییەکانی عیسا لەبارەی زیندوو بوونەوی ئەوەوە متمانەی پێ ناکرێت، چونکە هزری مرۆڤ زیندوو بوونەوەی مردوو قبوڵ ناکات.

گوتم: زۆر شت هەیە کە هزری مرۆڤ بڕوای پێ ناکات، بەڵام ئێمە بە چاوەکانی خۆمان دەیبینین کە بوونی هەیە. یەکێ لەوانە هەر ئەم خۆرەیە کە ڕووناکیمان پێ دەبەخشێ؟ "زیموقراتیس"ی زانای یۆنانی گوتوویەتی خۆر ئەوەندە گەورەیە کە هەزار ئەوەندەی زەوی دەبێت و ئێمە دەبینین کە جیهانێکی ئاوا گەورە لەسەر ئێمە ڕاوەستاوە و ناکەوێتە خواریشەوە تاکو تەفروتونامان بکات، ئەمە لەکاتێکدایە کە ئێمە ناتوانین بەردێك بە قەبارەی هێلکەیەك لە هەوادا بەبێ پایە، بەجۆرێك ڕابگرین کە نەکەوێ. هەروەها "زیموقراتیس" گوتوویەتی کە ئەو ئەستێرانەی کە ئێمە لەشەودا، پاش خۆر ئاوابوون دەیانبینین، هەریەکێکیان بۆخۆی دنیایەکە بەقەدەر زەوی. چۆن ئەم هەموو جیهانەی کە لەسەر سەری ئێمە لە هەوادا ڕاوەستاوە، یەکێکیان ناکەوێتە خوارەوە؟ ئایا هەبوونی ئەم هەموو جیهانەی کە بەسەر ئێمەوەن و نەکەوتنە خوارەوەی یەکێك لەوانە، هزر بڕوای پێ دەکات؟

کەواتە ئەگەر هزری ئێمە شتێکی قبوڵ نەکرد، بەڵگەی ئەوە نییە کە ڕوونەدات و بوونی نەبێت. بەهەر حاڵ، من بڕوام وایە زیندوو بوونەوەی عیسا بێ بنەما نییە و قوتابییەکانی ئەو کە دەڵێن ئەویان بینیوە، درۆ ناکەن. من دەڕۆم بۆ ناوچەی جەلیلە بۆئەوەی ئەو ببینم و نکوڵی کردنی تۆ ناتوانێ لە ڕۆیشتن پەشیمانم بکاتەوە.

کاتێ ئاریستانووس زانی من بە ڕاستمە، شێوازی بەیان کردنەکەی گۆڕی و گوتی: مەزن تیۆس، تۆ بڕیاری خۆت لە دەستی خۆتدایە و چۆنت دەوێ وا ڕەفتار بکە و ئەوەی کە من گوتم، بۆئەوەبوو باوەڕت بۆ دروست بکەم.

پاشان گوتی: لەبەرئەوەی کە دەتەوێ گەشت بکەیت، ئیزن بدە با من ڕێنیشاندەرێکی شارەزات بۆ پەیدا بکەم بۆئەوەی لەم گەشتەدا لەگەڵ تۆ بێت و جێگە خۆشەکانی گەشتوگوزارت بۆ پشوودان بۆ دیاری بکات و، خێوەتێکت بە هەموو کەرەستەکانییەوە پێ دەفرۆشم بۆئەوەی شەوان لە خێوەتی خۆتدا بخەویت و ڕۆژەکانیش کاتێ هەوا گەرم دەبێت، لە خێوەتی خۆتدا پشوو بدەیت تا تیشکی هەتاو لێت نەدا.

کـرێی ئـەو ڕێنوێنیکـەرەی بـۆتی پەیـدا دەکـەم و بـڕی خێوەتەکـە بـە هـەموو پێداویستەکانییەوە کەمێك زۆرە، بەڵام بۆ پیاوێکی وەکو تۆ کە سەرمایەدار بێت، گرنگ نییە.

هەرکە پیاوە پارەگۆڕەوەکە گوتی کە دەیەوی ڕێنیشاندەرێك بۆ من دەست بخات، زانیم ئەو ڕێنماییکەرەی کە ئەو بۆ منی پەیدا دەکات، لە ماوەی گەشتەکەدا دەبێتە سیخوڕی من و هەرچیەك بکەم، بە ئاریستانووسی ڕادەگەیەنێ و ئەویش سەرکردەکانی حکومەتی ڕۆم لە یودە ئاگادار دەکاتەوە. ئەوەبوو کە لە پەسەند کردنی ڕێنماییکەر پارێزم کرد و گوتم: لەم گەشتەدا ژنێکم لەگەڵدایە و ئەگەر ڕێنماییکەرم لەگەڵدا بێت، ئەو ژنە ناڕەحەت دەبێت.

کاتێ ئاریستانووس بیری کەوتەوە کە لەو گەشتەدا ژنێکم لەگەڵ دەبێت، گوتی: ئیزن بدە ئاوێنەیەکت پێشکەش بکەم و بیبەیت بۆ ئەو ژنە.

پاشان چووە بەشی دواوەی دوکانەکە و ئاوێنەیەکی هێنا و من هەر کە ئاوێنەکەم بینی، زانیم کە دروست کراوی "یۆنانە" و یۆنانییەکان لە دروست کردنی ئاوێنەی دەستیدا پێشەنگی میللەتەکانی دیکەن. ئاوێنەکە زۆر جوان بوو. من بەهای ئەو ئاوێنەیەم لە ئاریستانووس پرسی و ئەو گوتی: ئەم ئاوێنەیە بەخۆڕاییە و پارەت لێ وەر ناگرم .

پاشان بەپەنجەکانی دەستی بە ژماردن کرد و گوتی: مەزن تیوس، لەم گەشتەدا کە لە ڕێگاتدایە، پێویستت بە ئەسپ یان هێستر یان گوێدرێژ دەبێت و، دەبێ دوو کەسی ئاژەڵدار لەگەڵ خۆت بەریت بۆئەوەی لە ڕێگادا ئاگایان لە گوێدرێژەکان بێت و تیماریان بکەن و جەڵەوداریکت دەوێ بۆئەوەی دەستەجڵەوی ئەسپەکەت یان هێسترەکەت بگرێت و، چێشت لێنەرێکت دەوێ بۆئەوەی خواردن بۆ خۆت و ئەو ژنە دروست بکات و کەسێکت دەوێ بۆئەوەی لە ڕێگادا خواردنەوە و شەربەتت بۆ ئامادە بکات و هەرکاتێ خواردنەوەی ساردت ویست، پێت بدات. تۆ پێویستت بە خێوەتدارێکیش هەیە بۆئەوەی خێوەتەکەت هەڵبدات و، بتوانی لەناو خێمەکەدا پشوو بدەیت و بەیانی زوو کە لەخەو هەستان و ئامادەی ڕۆیشتن بوون، خێوەتەکەت کۆ بکاتەوە.

کاتێ هەژماردنی ئاریستانووس تەواو بوو، بۆم دەرکەوت کە ئەو دوازدە خزمەتکارەی بۆ دیاری کردووم و دەیەوێ لەکاتی گەشت کردنم بۆ جەلیلە دوازدە کەس لەگەڵ خۆم ببەم.

گوتم: ئاریستانووس، من لە پێدانی کرێی ئەم دوازدە کەسە ناترسم، بەڵام لە جەنجاڵی و قەڵەباڵغی دەترسم. ئاراستەی ژیانی من بەردەوام تەنیایی بووە و من چێژ لە تەنیایی وەردەگرم و ناتوانم دوازدە کەس لەگەل خۆم بەرم.

بە ڕەچاوەکردنی ئەوەی کە زانیم ئاریستانووس ئاوێنەیەکی بەخۆڕایی پێداوم و بەم هۆیەشەوە دەیەوێ دوازدە کەس بکات بەبار بە سەرمەوە، ئاوێنەکەم دایەوە و گوتم: ئەو ژنەی کە لەگەڵم گەشت دەکات بۆ جەلیلە ئەم ئاوێنەیە بەکار ناهێنێت و من دڵنیام کە پەسەندی ناکات و ئەگەریش زۆری لێ بکەم، ئەوا ئاوێنەکە فڕێ دەدات. بۆیە ئاوێنەکەی خۆت بگرە و بیفرۆشە یانیش بیکە بە دیاری یەکێکی دیکە.

ئاریستانووس ئاوێنەکەی لە من وەرگرت و گوتی: تۆ دەتەوێ بەبێ خزمەتکار لێرە گەشت بکەیت بۆ جەلیلە؟

گوتم: دوازدە خزمەتکار لە دەوروبەری مندا ئەوەندە جەنجاڵی دروست دەکەن کە شێتم دەکەن، بەڵام لەوانەیە خزمەتکارێك، نەك ڕێنوێنیکەر، هەڵبژێرم.

پیاوە پارەگۆڕەوەکە گوتی: ئێستە کە دەتەوێ خزمەتکارێك بەکار بهێنیت، ئیزن بدە پیاوێکت پێ پیشان بدەم کە لەو باشترت دەست ناکەوێ بۆ خزمەت کردن.

پاشان بە پەنجە، پیاوێکی پیشان دام کە لەوبەری کۆڵانەکەوە لە تەنیشت دیوارێکەوە دانیشتبوو و گوتی: پیاوێك کە لە گەشتەکەتدا سوودی بۆت هەبێ ئەو پیاوەیە و بە (ناتان) بانگ دەکرێ.

پرسیم: ناتان کێیە و لە ڕابردوودا چی کردووە؟

ئاریستانووس گوتی: ناتان دەتوانێ هەموو ئیشێك بکات. من هەرکاتێ ئیشێکم هەبێت، ئەو بانگ دەکەم و کرێیەکی دەدەمێ و هەرکاتێکیش ئیشی نەبێت، ئەوا لەم دەوروبەرەدا دەبینرێت.

پرسیم: تۆ متمانەت بەم پیاوە هەیە؟

ئاریستانووس گوتی: من زۆر متمانەم بەم پیاوە هەیە و هەرگیز نەمبینیوە خیانەت بکات لە ئامانەت و تۆ دەتوانی لە گەشتەکەتدا کیسەی پارەکەی خۆت بەو بسپێریت و لەوە دڵنیا بە کە یەك (پشیز) لە پارەکەت کەم نابێتەوە.

گوتم: بانگی بکە با بێت و لە نزیکەوە چاوم پێی بکەوێت.

ئاریستانووس ئەو پیاوەی بانگ کرد و ناتان لەجێی خۆی هەستایەوە و هات بۆ لامان و، بینیم کە پێی پەتیە و جلێکی کۆنەی لەبەردایە و پرچی کورتە.

پێش ئەوەی ناتان بگاتە لای ئێمە، پیاوە پارەگۆڕەوەکە بە هێمنی پێی گوتم: ئەم کەسە زۆر کەم قسەیە و لەکاتی پێویستدا نەبێت، قسە ناکات.

کاتێ ئەو پیاوە لێم نزیك بوویەوە، ئاریستانووس لە من دوور کەوتەوە بۆئەوەی بە شاگردەکەی خۆی بڵێت پارەم بۆ بژمێرێت و بیخاتە ناو کیسەیەکەوە و حەواڵەیەك بنووسێ بۆ پارەگۆڕەوەیەك لە تەبەرییە بۆئەوەی ئەگەر لەو شارەدا پێویستم بە پارە بوو، لێ وەربگرم.

من سەیرێکی چاوەکانی ناتانم کرد و بینیم چاوەکانی ڕوونە و تۆزقاڵێ خیانەتی پێوە دیار نەبوو و، وەکو چاوەکانی منداڵێکی بێگوناه وابوو.

پێم گوت: ناتان، من دەمەوێ لەگەڵ ژنێکدا لێرەوە بچین بۆ گەشت بۆ لێواری دەریاچەی جەلیلە و، دەمەوێ بڕۆم بۆ تەبەرییە، بۆیە حەزدەکەم بە سادەیی و بەبێ خۆڕازاندنەوە گەشت بکەم. ئەگەر ئارەزوت لێیە ببیتە خزمەتکاری من، ئەوا لەگەڵ خۆم دەتبەم و کرێیەکت پێ دەدەم کە خۆت داوای دەکەیت و، تۆ جگە لەوەی خزمەتکردنی منت لە ئەستۆدایە، پارەکەشم لەلای تۆ دادەنێم.

"ناتان" سەیرێکی جلوبەرگەکەی منی کرد و سەری بە واتای ڕەزامەندی جولاند.

گوتم: ئەرکی تۆ لەو گەشتەی کە لە ڕێگاماندایە، خواردن دروست کردنە بۆ من و ئەو ژنەی کە لەگەڵ مندا گەشت دەکات. تۆ دەتوانی ئەم کارە بکەیت؟

ئەو پیاوە جارێکی تر سەری جولاند و من گوتم: پێموایە چوار گوێدرێژ بەس بێت بۆ ئێمە و بارەکانمان و، بە ئاریستانووس دەڵێم پارە بدات بە تۆ بۆئەوەی پێداویستی بۆ گەشتەکەمان بکڕیت و، هەرچیەك کە پێویست بێ، بیکڕە و نیوەڕۆ وەرە بۆماڵی من.

پاشان ناونیشانی ماڵەکەی خۆم، واتە ئەو ژوورەی کە لە ماڵی پیاوە سریانییەکە بە کرێم گرتبوو، پێدا و دووپاتم کردەوە کە نیوەڕۆ بێت بۆلای من.

ناتان وەڵامی منی نەدایەوە و بە ئاماژەی سەر تێیگەیاندم کە لە مەبەستەکەی من گەیشتووە و دەزانێ من چی دەڵێم. من لە کەمدوویی ئەو پیاوە ڕازی بووم، چونکە دەمزانی کە لە ڕێگادا ناتان بە پرسیارەکانی خۆی بزێوی ناکات و لێم ناپرسێ من کێم و لە کوێوە دێم و بۆچی دەچم بۆ ناوچەی جەلیلە.

پاش ئەوەی کە زانیم ناتان لە مەبەستەکەم گەیشتووە، چووم بۆ لای ئاریستانووس.

ئەو پیاوە تیانووسی هەژمارەکەی خستە بەردەمم تاکو بزانم چەندە پارەم وەرگرتووە و چەند بریشم لەلای ئەو ماوە. پاشان کیسەیەکی پڕ لە پارە و حەواڵەیەکی بۆ پارەگۆڕەوەکەی تەبەرییە پێدام و گوتی: مەزن تیوس، هیوادارم ئەم گەشتەت بەخۆشی بێت و پاش گەڕانەوە لە گەشتەکەت، با چاوم پێت بکەوێ.

من ماڵئاواییم لە پیاوە پارەگۆڕەوەکە کرد و حەواڵە و کیسە پارەکەم هەڵگرت و پاش چوونە دەرەوەم لە دوکانەکەی، بانگی ناتانم کرد و کیسە پارەکەم دایە دەستی و گوتم: لەبەرئەوەی کە دەبێ تۆ پارەکە هەڵبگریت، بۆیە پێویست ناکات پارەگۆڕەوەکە پارە بدات بە تۆ و هەرچەندە پارەت ویست بۆ کڕینی پێداویستیەکانی گەشتەکە، ئەوا لە پارەی ناو ئەم کیسەیە خەرج بکە.

ناتان کیسەکەی لە من وەرگرت و بە دەستەکانی کێشی کرد تاکو بزانێ چەند بڕی تێدایە و پاشان بەبێ ئەوەی قسەیەك بکات، بەڕێ کەوت. لە خۆرهەڵاتی زەویدا، زۆربەی خەڵکەکەی فرەوێژن و بۆ بچووکترین مامەڵە، بە قەدەر نیوەی ڕۆژەکە قسە دەکەن و، بێدەنگی ناتان پێچەوانەی ڕەفتاری هاونیشتیمانەکانی بوو و لەگەڵ ئەوەی کە هیچ قسەیەکی نەکرد، من هەستم کرد لەو پیاوە ڕازیم و دڵسارد نابم لێی.

پاش ئەوەی لە پیاوە پارەگۆڕەوەکە جیا بوومەوە و بەڕێ کەوتم، زانیم ئەو ڕێگەیەی کە گرتوومەتەبەر، پێم ئاشنایە و وەکو ئەوە وابوو کە ئەو ڕێگەیەم پێوابێت. پاشان هاتەوە بیرم کە ئەو ڕێگەیەم لە پشتەوەی ئەو کابرایەی کە گۆزەیەکی ئاوی پێبوو، بڕیوە و ئەو پیاوە منی بەو ڕێگەیەدا برد تا گەیشتینە ئەو ماڵەی کە قوتابییەکانی عیسای لێ بوو. زۆری پێنەچوو کە من خۆم لەبەردەم ماڵێکدا بینییەوە کە

پێشتر بە ڕێنوێنی پیاوە گۆزەدارەکە چووبوومە ناوی. دەرگای ئەو ماڵە داخرابوو و زاتم نەکرد تەقە بدەم لە دەرگا و بەبێ ئەوەی تەقە لە دەرگاکە بدەم، لە بەردەم ئەو ماڵە تێپەڕم کرد.

پاش ڕۆشتنی چەند هەنگاوێك، گەڕامەوە و زاتم دایە بەرخۆم، بەڵام کاتێ گەیشتمە بەردەم دەرگاکە، دیسان زاتم نەبوو تەقە لە دەرگا بدەم. دواجار زانیم کە من ناتوانم تەقە بدەم لەو دەرگایە و جارێکی تر ئەو ماڵە ببینم، بۆیە بەڕێ کەوتم و ڕۆیشتم.

پاش ئەوەی کە نەختێکی تر ڕێگەم بڕی، بۆم دەرکەوت کە ئەو گەڕەکە زۆر چۆڵە، چونکە لەو کاتەوەی کە چوومەتە ناو ئەو گەڕەکەوە تا ئەمکاتە، لە سێ کەس زیاترم نەبینیبوو تا بەوێدا تێپەڕ بن.

جارێکیان دەنگی دارێك کە دەدرا بە بەرددا، سەرنجی منی ڕاکێشا و ڕووم کرد بەلای دەنگەکەوە و سەیرم کرد سواڵکەرێك لەسەر زەوی دانیشتبوو و دارە دەستەکەی خۆی دەکێشی بە بەرددا بۆئەوەی سەرنجی من ڕابکێشێت.

من فێر ببووم کە کاتێ مرۆۆ کاری هەبێ و بیەوێ لە کۆڵانەکانی شاردا تێپەڕ بێت، باشتر وایە پارە نەدات بە سواڵکەرەکان، چونکە ئەگەر پارە بدات بەیەك دووانێکیان، ئەوا سواڵکەرەکانی تر وازی لێ ناهێنن و هەموویان بە یەکەوە بەدووی دەکەون و بەبێ بچڕان پرسیاری لێ دەکەن هەتا پارەی لێ وەربگرن و، لە ئەنجامدا ناهێڵن ئەو پیاوە بەخێرایی لەو کۆڵانە تێپەڕ بکات و خۆی بگەیەنێتە جێی مەبەست. بەڵام لەو شوێنەدا، لە یەك سواڵکەر کە دارەکەی خۆیی دەدا بە زەویدا، زیاتری لێ نەبوو و ئەگەر پارەم پێ بدایە، ئەوا لەوە نەدەترسام کە سواڵکەری تر دەورەم لێ بدەن و کێشەم بۆ دروست بکەن.

ئەوەبوو هەر بۆئەوەی شتێك بدەم بە سوڵکەرەکە، لێی نزیك بوومەوە و سەیرم کرد قاچی نییە، واتە کەسێکی وایە کە بەهۆی کەمئەندامی، شیاو و پێویستە خێری بدرێتی. سکەیەکی زێڕم لە باخەڵم دەرهێنا و خستمە بەردەمی. ئەویش سکەکەی لە زەوی هەڵگرتەوە و خستیە باخەڵی، بەڵام نزای خێری نەکرد. نەریتی سواڵکەرەکان ئەوەیە کە کاتێ خێر لە کەسێك وەردەگرن، نزای خێر بۆ ئەو کەسە دەکەن. بەڵام ئەو

پیاوە لەجیاتی ئەوەی نزای خێر بکات، گوتی: کابرای بیانی، تۆ کە قاچت هەیە، لێرە چی دەکەی؟

پرسیم: من لێرەوە تێدەپەڕم و دەمەوێ بڕۆمەوە بۆ ماڵی خۆم.

سواڵکەرەکە گوتی: ئەمڕۆ ڕۆژی چوونە ماڵەوە نییە، بەڵکو ڕۆژی ڕۆشتنە بەرەو جەلیلە و هەموو ئەو کەسانەی کە قاچیان هەیە، ڕێگەی جەلیلە دەگرنەبەر.

من سکەیەکی ترم لە باخەڵم دەرهێنا و خستمە سەر زەوییەکەی بەردەمی و، سواڵکەرەکە سکەکەی هەڵگرتەوە و خستیە باخەڵی و گوتی: من ئەگەر لاقم هەبووایە، بۆ ساتێکیش لێرە ڕانەدەوەستام و خۆم دەگەیاندە جەلیلە.

پاشان گوتی: تۆ هەر ئەو کابرا بیانییە نیت کە لەم شارەدا کەواکەی خۆت دا بە سواڵکەرێکی کوێر؟

گوتم: کابرا، تۆ چۆن لەم مەسەلەیە ئاگادار کراویتەوە؟

سواڵکەرەکە گوتی: لەم شارەدا کاتێ بیانییەکی دەستبڵاو کەوایەك دەدا بە سواڵکەرێکی کوێر، هەموویان لەم بەخشینە ئاگادار دەکرێنەوە.

گوتم: کابرا، شێوەی ئاخاوتنی تۆ وای نیشان دەدات کە سواڵکەر نەبیت، چونکە سواڵکەرەکان بەم شێوەیە قسە ناکەن.

ئەو پیاوە گوتی: من لە ڕابردوودا سواڵکەر نەبووم، بەڵکو نووسیار بووم و لە تەنیشتی کۆڵانان دادەنیشتم و ئەو کەسانەی دەیانویست نامە بنووسن، من بۆم دەنووسین. بەڵام ئەوا ماوەیەکە بووم بە سواڵکەر، چونکە دەزانم داهاتی سواڵکەری زیاترە لە نوۆسیاری.

گوتم: تۆ لەبارەی جەلیلەوە قەست دەکرد و دەتگوت هەموو خەڵك بەرەو جەلیلە دەڕۆن.

پیاوە سواڵکەرەکە گوتی: بەڵێ، ئەم ڕۆژانە هەرکەسێك قاچی هەبێت، لەم شارە دەڕۆن بۆئەوەی ئەو ببینن.

گوتم: بەڵام دەبینم کەسانێك هەن کە قاچیان هەیە و ناشڕۆن بۆ جەلیلە.

سواڵکەرەکە گوتی: ئەو کەسانەی قاچیان هەیە و ناڕۆن بۆ جەلیلە، وەکو ئەو کەسانە وان کە قاچیان نییە، واتە نابێ شاد بن بە دیداری ئەو و، ئەگەر تۆ ڕۆشتی بۆ جەلیلە، داوای لێ بکە با ڕزق و ڕۆزیت بدات.

مـن لـه سـواڵكەرەكە جیـا بوومـەوە و بـەرەو مـاڵ كەوتمـە ڕێ، بـەڵام دەتكـوت دیوارەكان هاتوونەتە ئاخاوتن و بەمن دەڵێن كە ((بڕۆ بۆ جەلیلە ... بڕۆ بۆ جەلیلە)).

كـاتێ گەیـشتمە مـاڵی خـۆم، سـەیرم كـرد خـاوەن ماڵەكـە لەسـەر پلیكانـەكان ڕاوەستاوە و پـێی گـوتم: مـەزن تیـوس، ژنـان هەمیشە هەسـتی ژنانـەیان هەیە و كـاتێ چاویان بە جل و خشڵی نوێ دەكەوێ، خۆیان بۆ ڕاناگیرێ و دەبێ سەیری بكـەن. كاتـێ كە من پۆشـاك و خـشڵم كـڕی بـۆ ئـەو ژنـەی كە تـۆ هێناوتـە بـۆ ماڵـەوە، ژن و كـچەكەم دەیانویست سەیری بكـەن، هەربۆیە چوونە سەرەوە و سـەرقاڵ بوون بە سـەیركردن و، پاشان یارمەتی ئەو ژنەیان دا كە تۆ هێناوتە بـۆ ماڵـەوە بۆئـەوەی جلوبەرگـەكان بكاتـە بەری.

من نـەمتوانی وەڵامـی خـاوەن ماڵەكـە بدەمـەوە، چـونكە ژن و كـچەكەی لـە نهـۆمی سەرەوە هاواریان كرد و گوتیان: مەزن تیـوس، وەرە و سـەیری بكـە بزانـە چەنـدە جـوان بووە.

من لە پلیكانەكەوە چوومە سەرەوە و چوومە ژوورەوە و سەیرم كرد مریەمی بێرت گەنجتر و جوانتر بووە، چونكە پۆشاكی نوێی پۆشیوە و گووارەی بەگوێیدا هەڵواسیوە و ملوانكەی كردۆتە گەردنی.

كاتێ مریەمی بێرت منـی بینـی، گـوتی: بۆچـی فـەرمانت داوە جلوبـەرگی نـوێم بـۆ بكڕن و وەكو بووك بمرازێننەوە؟ ئەم ژن و كـچەی كە دەیبینـی منیـان شوشـت و جلیـان كردەبـەرم و پرچمیان شـانە كـرد و جگـە لـە جلوبـەرگ، پەچەیەكیـشم هەیـە كە دەتـوانم بیـدەم بـە ڕوخـسارمدا و دەموچـاوم لـە تیـشكی خـۆر بپـارێزم و، پۆشـەرێكی درێژیـشم هەیـە كە هـەموو جەسـتەم دادەپۆشـێ و كـاتێ ئـەو پۆشـەرە بپێـچم بـە خۆمـدا، ئیتر تـۆز نانیشێ بە جلەكانمەوە.

مریەمی بێرت بۆئەوەی پەچە و پۆشەرەكەی خۆیم پێ نیشان بدات، پەچەكەی بە ڕوخـساریدا دا و پۆشــەرەكەی كــردە ســەری و كۆتــایی پۆشــەرەكە دەگەیــشتە لای پێیەكانی.

خـاوەن ماڵـە سریانییەكەشـم بـە پلیكانەكانـدا هاتـە سـەرەوە و هاتـە ژوورەوە و ڕاوەستا بۆئەوەی سەیری مریەمی بێرت بكات. ئینجا باسی نرخی ئەو شتانەی كرد كە

بۆ مریەمی بێرتی کڕیبوو و نرخی یەکە بەیەکەی شتەکانی گوت بۆئەوەی مریەمی بێرت تێبگەیەنێ و بزانێ کە چەندە پارەم بۆ خەرج کردووە.

من سەیرم کرد مریەمی بێرت کاتێ ئاگادار بوویەوە لەو نرخە زۆرەی ئەو شتانەی کە بۆم کڕیبوو، بەجۆرێك خەمبار بوو کە دواجار بزەی لە لێوەکانی تۆرا و پاڵی بە دیواری ژوورەکەوە دا و بە خەمباری ڕاوەستا.

خاوەن ماڵە سریانییەکە و ژن و کچەکەی زانییان کە ئیتر پێویست بە مانەوەی ئەوان ناکات و دەبێ بڕۆن. من سوپاسی ئەو پیاوە خاوەن ماڵەم کرد بەهۆی ئەو زەحمەتەی کە بۆ کڕینی شتەکان کێشابووی و، سوپاسی ژن و کچەکەیم کرد بەهۆی ئەوەی کە مریەمیان شۆردبوو و پرچیان شانە کردبوو و جلیان کردبووە بەری.

پاش ڕۆیشتنی ئەوان، مریەمی بێرت بە خەمباریەوە گوتی: مەزن تیوس، تۆ چیت لە من دەوێ کەوا ئەم جلوبەرگە گرانبەهایانەت بۆ کڕیوم؟ هەرگیز ڕووی نەداوە کەسێ جلوبەرگی جوان و گرانبەهام بۆ بکڕێت، تەنیا ئەو کاتە نەبێ کە کچ بووم و لە ماڵی باوکم هەڵهاتم.

لەو کاتەدا پیرەژنێك منی لە کۆڵاندا بینی و پێی گوتم کە ئەگەر بێیت بۆ ماڵی من، ئەوا جلوبەرگی گرانبەهات بۆ دەکڕم و خواردنی باشت پێ دەدەم. من چووم بۆ ماڵی پیرەژنەکە و ئەویش جلی گرانبەها و جوانی بۆ کڕیم و گوارەی بەگوێمدا هەڵواسی و ملوانکەی کردە گەردنم. من زۆر خۆشحاڵ بووم، چونکە وامدەزانی ئەو پیرەژنە منی خۆشدەوێت تا دوایی زانیم کە ماڵی ئەو پیرەژنە وەکو ماڵانی تر نییە و پیاوی جۆراوجۆر دەهاتنە ئەو ماڵە و، پیرەژنەکەش لێی دەدام و ناچاری دەکردم بە ئارەزوی ئەو پێشوازی لەو پیاوانە بکەم. من ماوەی دە ڕۆژ لەو ماڵە بووم و بەردەوام لەلایەن ئەو ژنەوە ئازار دەدرام و پاش ئەوە هەڵهاتم و ئیتر ئەو پیرەژنە نەیتوانی بمدۆزێتەوە.

من کاتێ تۆم بینی، زانیم کە وەکو پیاوانی تر نیت. دوێنێ شەویش کە لە ماڵەکەی تۆدا خەوتم، بەخۆم گوت کە تۆ لە پیاوانی تر جیاوازتریت، چونکە نەهاتی بۆ لام. بەڵام ئێستە لێت دەترسم، چونکە جلوبەرگی جوان و گرانبەها و گوارە و ملوانکە و پەچە و پۆشەرت بۆ کڕیوم و، دیارە تۆش وەکو ئەو پیرەژنە دەتەوێ زۆرم لێ بکەیت تا خوڵکی خەڵك بکەم.

بەم ئاخاوتنە و بەم جۆرە داوەرییە پێکەنینم دەهات و گوتم: مریەمی بێرت، من پیاوێك نیم کە ژنێك بەکرێ بگرم بۆئەوەی بەهۆی ئەوەوە، کە بەشێوەی ناڕەوا پارە بەدەست دێنێ، بژێوی پەیدا بکەم. هەروەها من پیاوێکم کە بۆ پەیداکردنی بژێوی خۆم پێویستم بەوە نینە دەست بدەمە کاری ناڕاوە و، من دەتوانم لە ڕێگەی ڕەواوە بژێوی خۆم دابین بکەم. بۆیەشە من جوانکارییەکانی دنیام ناوێ، چونکە هەرچەندە مرۆڤ زیاتر بەشوێن جوانکارییەکانی دنیادا بگەڕێ، وەکو بیر هەڵکەنێك وایە کە هەرچی زیاتر چاڵەکە هەڵدەکەنێت بە ئومێدی ئەوەی فێنکی بێتەوە، نازانێ کە هەرچەندە زیاتر قووڵی بکات، زیاتر گەرم دەبێت. من بۆیە لەم شارە دەڕۆم و ڕێگەی جەلیلە دەگرمەبەر، بۆئەوەی پێ بنێمە دنیایەکی باڵاتر لەم دنیایە.

بەڵام مریەمی بێرت گوێی بە قسەکەی من نەدا و بە یەکجاری دەستی بە گریان کرد و لەسەر زەوی دانیشت و گوارەکەی لە گوێی خۆی داکەند و ملوانکەکەی لە گەردنی دوور خستەوە و بە گریانەوە گوتی: من دەزانم کە ئەم گوارە و ملوانکەیە گرانبەهایە، بەڵام بەلای منەوە هیچ نرخێکیان نییە، چونکە تۆ ئەم گوارە و ملوانکەیەت هەڵنەبژاردووە بەڵکو ئەم پیاوە سریانییە هەڵیبژاردووە. ئەگەر تۆ گوارە و ملوانکەیەکت بۆ هەڵبژاردمایە کە لە سواڵەت دروست کرابێت، لەلام بەنرختر دەبوو لەمانەی کە ئەو پیاوە سریانییە هەڵیبژاردووە.

مریەمی بێرت ئەمەی دەگوت و دەگریا و منیش دەمزانی کە گریانەکەی لە ناخی دڵەوەیە و، دەمزانی لەبەرچی گوارە و ملوانکە گرانبەهاکە دوور دەخاتەوە. مریەمی بێرت بەجۆرێك دەگریا کە ئەگەر دەنگی گریانەکەی بگەیشتایەتە گوێی خەڵك، سەرسام دەبوون و دەترسان.

من توڕە بووم و گوتم: مریەم، وانازانی کە ئەگەر دەنگی تۆ بگاتە گوێی خەڵك، چی ڕوو دەدات؟ تۆ نازانی کە ناشرینترین ژن ئەو ژنەیە کە دەگریەت و هەرکە ژنێك دەست دەکات بە گریان، ئەوا هەرچەندە بەقەدەر گوڵیش جوان بێت، جوانییەکەی نامێنێت. من ناتوانم ژنێك کە بەم شێوەیە دەگریە، لەگەڵ خۆم ببەم بۆ ناوچەی جەلیلە، بە تایبەت کە ئەو ژنە ڕاستی نەناسێ و باشییەکانی من بە شێوەیەکی تر لێك بداتەوە.

کاتێ مریەمی بێرت گوێی لەم قسەیە بوو، بە یەکجاری گریانەکەی نەهێشت و فرمێسکی چاوەکانی سڕی و ئینجا وەکو منداڵ دەستی بە پێکەنین کرد و هەستایەوە

و گوتی: مەزن تیوس، بمبەخشە، ئەگەریش تۆ لەگەڵ خۆت بمبەیت بۆ جەلیلە، ئەوا ئومێد دەکەم کە ئیتر نەبمە هۆی بێزاری تۆ.

پێکەنین و ئاکارەکانی مریەم ئەوەندە منداڵانە بوو کە من لە بە یەکجاری بێزاری خۆم فەرامۆش کرد و پێم گوت: مریەم، ئێمە ئەمڕۆ لەم شارە دەڕۆین و بەرەو جەلیلە بەڕێ دەکەوین و تۆ لەڕێدا دەبێ سەرپۆشەکەت بدەیت بە سەرتدا و ئەوەندە سەلارە بیت کە خەڵك و بەتایبەتی سەربازانی لژیون وا تێبگەن کە ژنی منیت و، ئەگەر ئەم هەڵوێستانەت لێ بووەشێتەوە ئەوان بۆیان دەردەکەوێت کە تۆ ژنی من نیت. بەڵام لەبارەی مووررووە سواڵەتیەکانەوە، ئەگەر تۆ ئەو موورروانە پەسەند بکەیت بەو مەرجەی کە من بۆت هەڵبژێرم، ئەوا من ملوانکەیەك و گوارەیەکت بۆ دەکڕم کە لە سواڵەت دروست کرابێ. لەوکاتەدا دەنگی خاوەن ماڵە سریانییەکەم لە خوارەوە بیست کە دەیگوت گوێدرێژەکانیان هێناوە.

من سەیرێکی خۆرم کرد و بینیم کاتی نیوەڕۆیە و بە مریەمی بێرتم گوت کە بۆ ڕۆیشتن ئامادە بێت و خۆیشم لە پلیکانەکانەوە چوومە خوارەوە و مریەم لە دوامەوە هات. کاتێ گەیشتینە ناو کۆڵانەکە، سەیرم کرد ناتان (خزمەتکارە نوێیەکەم) چوار گوێدرێژی بەهێزی هێناوە و دووانیان کورتانی "قەجەری"یان هەیە[46] و یەکێکی تر لە گوێدرێژەکان (هۆپ)ی هەبوو و، لەسەر گوێدرێژێکی تریشیان ژنێك دانیشتبوو کە جلی کۆنە و ڕزاوی لەبەردابوو و سەری بەرز نەکردەوە تا مرۆڤ بتوانێ بەباشی ڕوخساری ببینێت.

ناتان کاتێ منی بینی، کەمێك سەری دانەواند و ڕێزی بۆ نوواندم. پاشان بە ئاماژەکردن خۆری پێ پیشان دام و تێیگەیاندم کە بە پێی فەرمانەکە، لەکاتی نیوەڕۆدا بە گوێدرێژەکانەوە ئامادە بووم.

لە "ناتان"م پرسی: ئەم ژنە کێیە کە هێناوتە لەگەڵ خۆتدا؟ من نامەوێ بێگانە لەگەڵمدا گەشت بکات.

ناتان وەڵامی نەدامەوە و وەك بڵێی کە قسەکەی پەیوەندی بە ئەوەوە نەبێت.

---

[46] لەسەردەمی حەزرەتی مەسیحدا (سلاوی خوای لەسەر بێت) وشەی (قەجەر) بەدیلی نەبووە و کورتانی قەجەر وەرگێڕدراوی دوو وشەی ئینگلیزی (ئیسپلیك) و (مەتن)ە و ( لە وەرگێڕدراوە فارسیەکەیدا گوتوویەتی کە وشەیەکی گونجاوی فارسی ڕەوا نییە بۆ وەرگێڕانی ئەو دوو وشەیە، بۆیە هەر وشەی (قەجەر)م داناوە. ئێمەش دەڵێین لەبەرئەوەی لە کوردیدا بەدیلی نییە، بۆیە وشەی (قەجەر) وەکو خۆی دادەنێینەوە).

خاوەن ماڵە سریانییەکە، لە ژنەکە نزیك بوویەوە و نەختێ قسەی کرد و گەڕایەوە و پێی گوتم: ئەم ژنە ناوی "سوزمان"ە و دەڵێ کە ناتان بەڵێنی پێ داوە وەکو خزمەتکارێکی تۆ بیبات بۆ جەلیلە و، ئەم ژنە ناتوانێ بە پێ بڕوات لەڕێ و توانای پێدانی کرێی گوێدرێژی نییە. سوزمان دەڵێ بۆئەوەی لە جەژنی گەورەی یەهوودییەکاندا لەم شارەدا بەسەر ببات، لە جەلیلەوە هاتووە بۆ ئەم شارە، بەڵام لێرە نەخۆش کەوتووە و نەیتوانیوە لە دوای جەژنی گەورەی یەهوودییەکان بگەڕێتەوە و ئێستەش هیوادارە کە بە هاوکاری تۆ بگەڕێتەوە بۆ جەلیلە.

من سەیرێکی ئەو ژنەم کرد و بینیم کە سەری دانەواندووە و تەماشای دەورووبەری خۆی دەکرد. بە بینینی ئەو تووڕە بووم و گوتم: من پێویستم بە ژنی خزمەتکار نییە و لەو گەشتەی کە ئێمە لە ڕێماندایە، ئەوەندە ئیشمان نییە کە ناچار بین خزمەتکار لەگەڵ خۆمان بەرین. ئەگەر بڕیار وابێ کە هەرکەسێ خەڵکی جەلیلە بێت و لەم شارەدا نەخۆش کەوتبێ من لەگەڵ خۆم بیبەم بۆ جەلیلە، ئەوا دەبێ سەدان گوێدرێژ بەکرێ بگرم و بە هەرجۆرێك بێ من حەز ناکەم ئەم ژنە لەگەڵ خۆم ببەم بۆ جەلیلە.

کاتێ ناتان ئەم قسەیەی بیست، کیسە پارەکەی منی، کە کردبووی بە لا قەدیدا، لێ کردەوە و خستیە سەر زەوی و لە بەردەممدا و بێباکانە بە گوێدرێژەکانەوە بەڕێ کەوت و دوور کەوتەوە. سوزمان دەستی بە گریان کرد و لە گوێدرێژەکە دانەبەزی.

من دەمزانی کە ئەگەر ناتان بڕوات، ئەوا دەبوو خزمەتکارێکی دیکە پەیدا بکەم و، پەیدا کردنی نۆکەرێکی تریش، گەشتەکەی ئێمە دوا دەخات و لەوانەشە خزمەتکارێکی تری وەکو ناتانم دەست نەکەوێ کە متمانەم پێی هەبێت. ئەوەبوو کە بانگم کرد و گوتم: کیسە پارەکە هەڵبگرە. ئەویش کیسە پارەکەی هەڵگرت و منیش گوتم: لەبەرئەوەی کە من هەر دەبێ بڕۆم و تۆش ئەم ژنەت هێناوە، بە ناچاری ڕازی دەبم لەگەڵماندا بێت، بەڵام دەخیلت بم لەم شارە یان لە ڕێگادا کەسی دیکە پەیوەست مەکە بە کاروانەکەمانەوە.

ئینجا زیاد لەو پارەیەی کە خاوەن کاڵەکە هەژماری کردبوو، پارەم بە خاوەن ماڵەکە دا و پێم گوت: لەبەرئەوەی کە جارێکی تر دێمەوە، بۆیە شتومەکەکانم هەڵبگرە تا دەگەڕێمەوە.

خاوەن ماڵ گوتی: هیوادارم بە سەلامەتی بگەیتە جەلیلە و بگەڕێیتەوە.

لە کۆڵانەکەدا کۆمەڵێك پیاو و ژن و سواڵکەر کۆ ببوونەوە. پیاوەکان دەمی گوێدرێژەکانیان دەکردەوە و سەیری ددانەکانیان دەکردن تاکو بزانن تەمەنیان چەندە و سمی گوێدرێژەکانیان دەپشکنی. ژنەکانیش لەبارەی سوزمانەوە قسەیان دەکرد و بە یەکتریان نیشان دەدا، بەڵام سوزمان وەکو نەخۆشێك کە توانای گفتوگۆکردنی نەبێ، سەری بەرز نەکردەوە و لەگەڵ ژنەکان وتووێژی نەدەکرد. سواڵکەرەکانیش بەردەوام داوای خێریان دەکرد و ناتانیش یەکی (پزیش)ێکی پێ دەدان.

کاتێ من و مریەمی بێرت لە ماڵ چووینە دەرەوە تا سواری گوێدرێژ ببین، هەڵا هەڵای سواڵکەرەکان زیاتر بوو و ژنەکان بە پەنجەکانیان مریەمی بێرتیان بەیەکتر نیشان دەدا و پیاوەکانیش بە نیگا بزێوەکانیان سەیری ئێمەیان دەکرد.

پاشان سوار بووین و ناتانیش سوار بوو و بەڕێ کەوتین و، لە دەروازەی ماسی فرۆشەکان کە مەیدانێکیشی هەر بەم ناوەوە لەتەنیشتیدا لەناو شاردا لێیە، چووینە دەرەوە.

من لەسەرەتای ئەم سەربوردا باسی قەڵای ئەنتۆنییەم کردووە و گوتم کە کاتێ هاتمە ئەم شارەوە، لەو قەڵایەدا ژیانم بەسەر بردووە. بەوجۆرەی کە باسم کردووە، قەڵای ئەنتۆنییە شوێنی سەربازانی لژیونی ڕۆم بوو. ئەوان لە دوو ڕێگەوە دەیانتوانی بڕۆنە ناو قەڵاکەوە، یەکێکیان لە ناوەوەی شار و ئەوی تریان لە دەرەوەی شار.

کاتێ لە دەروازەی ماسی فرۆشەکانەوە لەناو شار چووینە دەرەوە، ناتان لە پێشی کاروانەکەوە دەڕۆیشت و سەیرم کرد بەرەو قەڵای ئەنتۆنییە دەڕوات. ناتان لە بەرامبەر دەروازەی قەڵای ئەنتۆنییەدا ڕاوەستا. کاتێ سوزمان چاوی بەو دوو سەربازەی لژیون کەوت کە لە بەردەم دەروازەی قەڵاکەدا پاسەوانییان دەکرد، ئەوەندە ترسا کە دەموچاوی بە گەردنی ئەو گوێدرێژەوە نا کە لەسەری بوو.

من بە ناتانم گوت کە بۆچی ڕاوەستاوە و بۆچی ناڕوات. ناتان بە ئاماژە تێیگەیاندم کە دەبێ بڕۆمە ناو قەڵاکەوە.

تا ئەوکاتە گوێم لە ناتانەوە نەبوو کە تەنانەت یەك وشەش بڵێت بەجۆرێك کە وامزانی لاڵە. بەڵام هەموو جارێ کە مووە کورتەکانی سەریم دەبینی، بە خۆم دەگوت لەوانەیە نەزری کردبێت کە بێدەنگ بێت بۆئەوەی داخوازییەکەی جێبەجی ببێت،

چونکه دەمزانی کە لە یودە هەرکەسێ نەزری گەورە بکات، مووی سەریان کورت دەکەنەوە.

من لەسەر پشتی گوێدرێژەکە دابەزیم و بەرەو دەروازەی قەڵای ئەنتۆنییە ڕۆیشتم و لەبەرئەوەی جلوبەرگی یەهوودیم لەبەردا بوو و ریشێکی درێژم پێوە بوو، پاسەوانەکانی ڕۆم نەیانهێشت بچمە ناو قەڵاکەوە. بەڵام دەنگێك لەسەر بورجی قەڵاکە فەرمانی دەرکرد کە ڕێگەم بدەن و کاتێ سەرم بەرز کردەوە، فەرمانەدەی مەخفەرم ناسی. ئەگەرچی ریشی درێژم هەبوو و جلەکانم وەکو هینی یەهوودییەکان وابوو، بەڵام فەرمانەدەی مەخفەر منی ناسییەوە و، من چوومە ناو حەوشەی قەڵاکەوە و چووم بۆ بورجەکە.

کاتێ دەچووم بۆ لای بورجەکە، فەرمانەدەی مەخفەر لە بورجەکە هاتە خوارەوە و لە خوارەوەی بورجەکە بەیەك گەیشتین و من گوتم: دەمەوێ بڕۆم بۆ ناوچەی جەلیلە و شاری تەبەرییە تاوەکو سوود لە ئاو و هەوای خۆشی ئەوێ ببینم و، ئەو پیاوەی کە ڕێنوێنیکەری منە، ڕاوەستا بۆئەوەی ماڵئاوایی لە تۆ بکەم و پێت ڕابگەینم کە من لەگەڵ دوو ژن و ڕێنوێنیکەرەکەی خۆم گەشت دەکەم.

فەرمانەدەی مەخفەر پرسی: لە کام ڕێگاوە دەچن بۆ تەبەرییە، ئایا لە ڕێگەی (سامەڕا)وە[47] دەچن بۆ تەبەرییە یان لەڕێی (ئەردەن)ەوە؟

من خۆم نەمدەزانی کە دەبێ لە چ ڕێگەیەکەوە بچم بۆ تەبەرییە، بۆیە لە فەرمانەدەی مەخفەرم پرسی: بەڕای تۆ لەکام ڕێگەوە بڕۆم باشترە؟

فەرمانەدەی مەخفەر گوتی: دانیشتوانی سامەڕا خەڵك ئازار دەدەن و کاتێ ڕێبوارێکی ئاسایی و سادە دەبینن، ئازاریان دەدەن. ڕێگەی ئەردەنیش لەم وەرزەی ساڵدا کێشە دروست دەکات چونکە بەهۆی وەرزی بەهارەوە ڕووباری ئەردەن لە حاڵەتی سەرکێشیدایە و، ئەگەر لە لێواری ڕووبارەکەوە بڕۆیت، شەوان گوێت لە نەڕەی شێرەکانەوە دەبێ. ئارەزوت لێیە دوو کەس لەسەربازەکانی لژیون ڕابسپێرم کە لەم گەشتەدا لەگەڵت بێن بۆ تەبەرییە؟ ئەگەر ئارەزووت لێیە ئەو سەربازانە لەگەڵت گەشت بکەن، ئەوا دەبێ خەرجییان بدەیتێ.

---

[47] وشەی (سامەڕا) لە وەرگێڕداروی فارسی ئینجیلەوە وەرگێڕداوە و ئەسڵی ئەم وشەیە (ساماریە) یان (سەمەریە) یە، بەڵام وەرگێڕی ئینجل بە (سامەرا) نووسیویەتی و سامەڕا شارێك بووە لە (فەلەستین)دا و هەڵبەت نابێ لەگەڵ شاری سامەڕای ئێراقدا لێمان تێك بچێ.

له شێوەی ئاخاوتنەکانی فەرماندەی مەخفەر بۆم دەرکەوت کە حەز ناکات دوو سەرباز لەگەڵ خۆم ببەم، بۆیە گوتم: لە دڵسۆزیتان مەمنونم، بەڵام ئێرە خاکێکە کە لەلایەن حکومەتی ڕۆمەوە بەڕێوەدەبرێت و لەهەموو وڵاتێکدا کە حکومەتی ڕۆم جڵەوداری بێت، ئەوا لەو شوێنە ئاسایش بەرقەرارە.

فەرماندەی مەخفەر گوتی: بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من شمشێرێك دەدەم بە تۆ بۆئەوەی لەگەڵ خۆتی بەریت و لەبەرئەوەی کە شوناسی ڕۆمیت هەیە، ئەوا دەتوانی شمشێر هەڵبگریت و، هەروەها فەرمان دەکەم نووسراوێکت پێ بدەن بۆئەوەی هەرکاتێك پێویستی کرد، تۆ بتوانی بە سەربازەکانی پیشان بدەیت تا هاوکاریت بکەن.

بەپێی فەرمانی فەرماندەی مەخفەر، شمشێرێکیان لەگەڵ قایشەکەیدا هێنا و فەرماندەی مەخفەر خۆی قایشەکەی کردە شانم و شمشێرەکە کەوتە سەر ڕووی کەواکەمەوە. کاتێ فەرماندەی مەخفەر شمشێرەکەی بەسەر جلە یەهوودییەکانی منەوە بینی، پێکەنی. پاشان نووسەری نیزامی، ئەو نووسینەی کە بەپێی فەرمانی فەرماندەی مەخفەر نووسیبووی، هێنای و پێی دام و ماڵئاواییم لە فەرماندەی مەخفەر کرد و ئەویش تا نزیکی دەروازەی قەڵاکە ڕەوانەی کردم.

پاش چوونە دەرەوە لە قەڵاکە، سواری پشتی گوێدرێژەکە بووم و کاروانەکەمان بزوت و ئەو ڕێگەیەمان گرتەبەر کە بەدەوری (کێوی زەیتون)دا دەگەڕا. من دەمزانی کە ئەو ڕێگەیە دەگاتە گوندی بیتانی (دێی بەیت عەینا).

پاش ئەوەی شارمان بەجێ هێشت، من لەسەر پشتی گوێدرێژەکە دابەزیم و بەپێ بەردەوام بووم لە ڕێڕۆشتن تا گەیشتینە گوندی بیتانی. لەوێ بە ناتانم گوت ڕاوەستێت و، ڕێی ماڵی لازاروسم گرتەبەر. پاش ئەوەی گەیشتمە ئەوێ، سەیرم کرد لازاروس لە باخچەکەی ماڵەوەیان دانیشتووە و چەندجارێك بانگم کرد تا لای کردبەلای منەوە و لەجێی خۆی هەستایەوە و هات بۆلام.

حاڵ و ئەحواڵی خوشکەکانیم پرسی و ئەو گوتی: خوشکەکانم چوون بۆ جەلیلە.

پرسیم: ئەی بۆچی تۆ نەچوویت بۆ جەلیلە؟ ئایا بیستووتە کە عیسا خۆی بە قوتابییەکانی نیشان داوە و گوتوویەتی ((من بەرەو جەلیلە دەچم و هەرکەسێ ئارەزووی لێیە من ببینێت، بابێت بۆ جەلیلە)).

لازاروس گوتی: من له جەلیله کارم نییه و لێره چاودێری باخەکەی خۆم دەکەم و، لەلای گۆڕەکەمدا کات بەسەر دەبەم.

نیشانەی ترس لە چاوەکانی لازاروس بەدی دەکرا و وەکو ئەو کەسانە قسە دەکات کە دەترسن و گوتی: ئێستە کە تۆ منت بانگ دەکرد، لە ترسا لەرزم لیٚ هات و، هەرکاتیٚ کەسێك بانگم بکات، زۆر دەترسێم.

پریسم: بۆچی دەترسی؟

ئەو پیاوە گوتی: چونکە خۆم لە دنیادا بە نەگونجاو دێتە بەرچاو.

پرسیم: مەبەستت لەم قسەیە چیە؟

لازاروس گوتی: بۆئەوەی لە قسەکەم تیٚ بگەیت، نموونەت بۆ دێنمەوە. ئەگەر ئێمە بەقەدەر سەری دەرزییەك بووینایە و هەموو شتێك لەبەر چاوماندا بەقەدەر نووکی دەرزی یان بچووکتر بووایە، ئەوا دیسان ئێمە خۆمان بە گەورە دەزانی، چونکە وامانـدەزانی کە لەنێوان ئێمە و ئەو شتانەی کە لە دەوروبەری ئێمەدان، شێوە گونجاوییەك هەیە. بەڵام هەرچەندە من گەورەم، بەڵام هەموو شتێك لەبەرچاومدا بەقەدەر نووکی دەرزی وایە و هەربۆیە وادەزانم کە لەنێوان من و دنیادا، هیچ گونجاندێك نییە.

من زانیم کە لەوانەیە لازاروس لەبەرئەوەی کە چەند ڕۆژێك لەناو گۆڕدا کاتی بەسەری بردووە، تووشی تێکچوونێکی زەینی بووە یانیش چاوەکانی بەجۆرێکی تر دەبینێت، چونکە لەوانەیە پاش ئەوەی مردوویەك زیندوو بوویەوە و چاوەکانی کرایەوە، بەجۆرێکی تر دنیا ببینێت کە پێش مەرگ بەوجۆرەی نەبینیوە.

ئینجاماڵئاواییم لە لازاروس کرد و چووم بۆلای کاروانەکەی خۆمان.

# پیاوە لاڵەکە هاتە قسە

کاتێك گەیشتمە کاروانەکە، بینیم کە ناتان بە بزێوییەکی زۆر سەیرم دەکات و چاوەڕێم دەکرد وشەیەك لە دەمی بێتە دەرەوە، بەڵام قسەی نەکرد. ئێمە کەوتینەڕێ و لەوکاتە بەدواوە تا کاتێ کە خۆر ئاوابوو، لەهێچ شوێنێك نەوەستاین و تەنیا دووجار لەلای جۆگەکان ڕاوەستاین تا گوێدرێژەکانمان ئاو بخۆنەوە. من بۆم دەرکەوت ناتان لەلای سامەراوە نەڕۆیشت و، دیار بوو کە ڕێنوێنەکەمان بەباشی نازانێت لە ڕێگەی سامەراوە بڕۆین. ناتان بەبێ پچڕان (هێ)ی لە گوێدرێژەکان دەکرد بۆئەوەی بەخێرایی بڕۆن لەڕێ.

کاتێك خۆر بەتەواوی ئاوا بوو و ئەستێرەکان دەرکەوتن، ناتان لە گوندێك لای دا و گوێدرێژەکانی برد بۆ گەوڕ و، کەلوپەلی خەوی ئێمەشی گواستەوە بۆ ژوورێك. سوزمان بۆئەوەی نیشانمان بدات کە لەو گەشتەدا دەتوانێ هاوکاریمان بکات، لەبەردەم ژوورەکەدا ئاگری کردەوە و دەستی بە دروست کردنی شیو کرد و، کاتێك چێشتەکە لەسەر ئاگرەکە دەکولا، ئاوی هێنا و قاچی من ومریەمی بێرتی شوشت. من چاوەڕێم دەکرد سۆزمان مریەمی بێرت بداتە بەر تانەوتەشەر. بەڵام بە ڕێزەوە ڕەفتاری لەگەڵ دەکرد. کاتێك خواردن ئامادە بوو، سوزمان یەکەمجار بڕێك خواردنی لەبەردەم من دانا و پاشان بەشی مریەمی بێرتیشی دا.

سوزمان و ناتان لە دەرەوەی ژوورەکەی ئێمە بوون و، من هەردووکیانم بانگ کرد بۆ ژوورەوە و گوتم: من شارەزای نەریتی ئێوەی جوولەکە نیم و، نازانم ئامادەن لەگەڵ کەسانێك نان بخۆن کە یەهوودی نین و، لە ژوورێکدا بخەون کە ئەوان تیایدا دەخەون یان نا؟

بەڵام ئێمە ئیستە لە گەشتداین و ئێوە جێگەیەکتان نییە بۆ نانخواردن و خەوتن بۆیە دابنیشن ونان بخۆن و لەم ژوورەدا بخەون.

ناتان و سوزمان دەستەکانیان شوشت و دانیشتن و دەستیان بەنانخواردن کرد. ناتان پێش ئەوەی یەکەم تیکە بخاتە دەمیەوە، بەپێی نەریتی جوولەکەکان نزای کرد، بەڵام من گوێم لە هیچ نەبوو تەنیا ئاکارەکانیم دەبینی. من بۆم دەرکەوت کە ناتان

گۆشت ناخوات و بە خواردنی نان و پەنیر کیفایەت دەکات و گرینگیش بە نانخواردنی سوزمان نادات. پاش ئەوەی کە ناتان هەستایەوە و چوو بۆ گەوڕ و سەری لە گوێدرێژەکان دا، گەڕایەوە و کەواکەی بە سەریدا دا و لە ژوورەکەدا خەوت.

سوزمان پاش ئەوەی نانی خوارد، لقاچی منی ماچ کرد تاکو بەهۆی ئەوەی کە ڕازی ببم لەگەڵمان گەشت بکات، سوپاسم بکات.

گوتم: تۆ دەبێ سوپاسی ناتان بکەیت نەك من، چونکە ئەو بووە هۆی ئەوەی کە تۆ لەگەڵمان بێیت و، من هیوادارم ئەم گەشتە ماندووت نەکات و دیسان نەخۆش نەکەوی.

سوزمان گوتی: ئێمەی ژنانی جەلیلە وەکو پێستی ئەستوور واین و نەخۆشیی من بەهۆی خەفەتەوە بوو نەك ماندوێتی.

سپێدەی ڕۆژی دواتر ناتان ئێمەی لەخەو هەستاند و پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت، سواری پشتی گوێدرێژەکان بووین و کەوتینەڕێ و، کاتێ ڕۆشتین لەڕێ، من لەسەر پشتی گوێدرێژەکە وەنەوزم دەدا و پاش ئەوەی خۆر هەڵهات، تیکەیەك نانم بەدەستەوە گرت و خواردم. بەڵام پاش ئەوەی خۆر هاتە سەرەوە و هەوا گەرم داهات، شەکەتیی من کە بەهۆی ئەو کەم خەویەی شەوی ڕابردوو بوو، بەتەواوی لەناو چوو.

کە سەیری هەرلایەکم دەکرد، زەویم بە سەوزی دەبینی و درەختە زەیتونەکانیشم بە ڕەنگی سپی خۆڵەمێشی لە دامێنی گردەکاندا دەبینی. لە زەوییەوە بۆنی ئالف و گڵ دەهات بە لوتدا و، هەزارەها باڵندە لە کێڵگە و باخچەکاندا دەیانخوێند. دیمەنەکانی زەوی و فێنکیی هەوا ئەوەندە هەست بزوێن بوو کە حەزم دەکرد دابەزم و، بە سەیرکردنەوە لە تەنیشت کێڵگە و باخچەکاندا، تێپەڕ ببم.

بەڵام پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراو بووە هۆی ئەوەی من لە دابەزین پەشیمان ببمەوە. پێشهاتەکە ئەوە بوو کە ناتان، کە تا ئەوکاتە دەنگیم نەبیستبوو، دەستی بەگۆرانی گوتن کرد. دیار بوو کە ڕەونەقی زەوی و شێداری هوا، هەستی ناتانی وا بزواندووە کە ئەو پیاوەی من وامدەزانی لاڵە، هاتە قسە و ئاوازی دەخوێند.

من سەیرێکی مریەمی بێرتم کرد و بە زمانی حاڵ لێم پرسی ((چی بوو کە ئەو پیاوە هاتە قسە؟)) بەڵام ئەو ژنە سەری بەواتای نەرێ جوڵاند، واتە نازانێ کە بۆچی ناتان دەستی بە گۆرانی گوتن کردووە.

ناتان به زمانی (عیبری) گۆرانی دەگوت و من نەمدەزانی چی دەڵێ، چونکە زمانی (عیبری)م نەدەزانی،بەڵام زۆر چێژم لە ئاوازەکەی وەرگرت. هەندێ جار دەنگی ناتان بەرز دەبۆوە و هەندێ جاریش نزم دەبۆوە. گۆرانییەکانی (عیبری) خۆش و جوانن، یانیش لەوانەیە من بەلامەوە جوان بووبێ. ڕەنگە من لەو ڕووەوە گۆرانییەکانی عیبری بە خۆش بزانم کە شارەزاییم لەبارەی مێژووی عیبرییەکان هەیە و دەزانم کە عیبرییەکان هەزارەها ساڵە لە دنیادا دەژین، بۆیە کاتێ گوێم لە گۆرانی عیبری دەبێت، وەکو ئەوە وایە ئەو هاوار و ناڵانەی کە بەهۆی خەفەت یان هاواری شادی خەڵکەوە، کە هەزاران ساڵ پێش ئێستا ژیاون، دەبیستم.

کاتێ گۆرانی گوتنی ناتان تەواو بوو و بێدەنگ بوو، من لە سوزمانم پرسی: ئەم گۆرانییەی کە ناتان خوێندی چی بوو؟

ژنەکە گوتی :بەم ئاوازە دەڵێن ئاوازی (کاروان) و ئێمە ئەمەمان لە باپیرانی خۆمان گوێمان لێ بووە و، باپیرانی ئێمەش لە باپیرانی خۆیان بیستوویانە و واتاکەشی ئاوایە:

((خودا من دەپارێزێت و لە ڕۆژدا بەهۆی خۆرەوە و لە شەودا بەهۆی مانگەوە ڕێگەی من ڕووناك دەکاتەوە و ناهێڵێ لە برسێتی و تینوێتیدا ئازار بچێژم و، هێز بە پێیەکانم و گوێدرێژەکەم دەبەخشێ تا بتوانم ئەم گەشتەم کۆتایی پێ بێنم)).

پاش ئەوەی سوزمان گۆرانییەکەی بۆ وەرگێڕام، خۆی دەستی کرد بە خوێندنی ئەو گۆرانییە و بە ئاوازێکی وەکو ئاوازەکەی ناتان خوێندی. هەرچەندە سوزمان نەیدەتوانی٬وەکو ناتان گۆرانی بڵێ بەڵام من هەر چێژم لە ئاهەنگەکەی ئەو وەردەگرت.

پاش ئەوەی گۆرانییەکەی سوزمان تەواو بوو، دەستی بەگریان کرد. من گوتم: سوزمان بۆچی دەگریت و چی ڕووی داوە کە تۆی خستە گریان؟

سوزمان گوتی: گریانەکەی من بەهۆی خەفەتەوە نییە، بەڵکو لە خۆشیاندایە. خۆشحاڵم کە پاش نەخۆشییەکی سەخت کە وامدەزانی بەزیندوویی نامێنمەوە، چاك بوومەتەوە و هەستاومەتەوە و ئێستەش بەرەو نیشتیمانی خۆم دەڕۆم و جارێکی تر دەریاچەی جەلیلە دەبینمەوە.

من لەم گەشتەدا دوو هاوگەشتم هەبوو کە نەمدەزانی هەست بە ڕۆحیەتیان ببەم، یەکێکیان ناتان و ئەوی تریان سوزمان بوون و، کەمێك بە شێتم دەزانین و هیچ

پەیوەندیەکی ڕۆحیم لەگەڵ ئەو دووانەدا نەبوو. بەڵام دوور نەبوو کە منیش لەچاوی ئەوانەوە لە پیاوێکی شێت بچم و پێم بڵێن کە ئەگەر من کابرایەکی ژیر بوومایە، ئەوا نەدەچووم لەتایبەتمەندیەکانی عیسا بکۆڵمەوە تاکو بزانم چی گوتووە و، پاش ئەوەی کە زیندوو بۆتەوە، بۆ کوێ ڕۆیشتووە و چی دەکات. ئەو ڕۆژە، کاتی نیوەڕۆ هات و چووینە ناو چەمێکەوە کە ڕووباری ئەردەنی پێدا دەڕوات و، لە دوورەوە حەساری شاری ئەریحا دەرکەوت و چاومان بە دارخورماکان کەوت کە یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی دەشتی ئەریحا. کاتێ کەمێك لە دەشتەکە چووینە پێشەوە، بینیمان وەرزێرەکان بە درەوکردنی (جۆ)وە سەرقاڵن و دیاربوو کە هەوای ئەریحا گەرمترە لە هەوای قودس و، جۆ و گەنم لەوێ زووتر پێ دەگات و درەودەکرێت.

"ناتان" ڕازی نەبوو بچینە ناو شاری ئەریحاوە، بۆیە لە تەنیشت حەساری شاردا و لە سێبەری ئەو دیوارەدا، لەنزیك چۆمێك گیرساینەوە. ناتان گوێدرێژەکانی بەرەڵا کرد تاکو لەو لەوەڕگایەی کە لە نزیکییاندا بوو، بلەوەڕێن و خۆی بە نوێژکردنەوە سەرقاڵ بوو. سوزمانیش بەپێی نەریتی جوولەکەکان نوێژی دابەست و مریەمی بێرتیش نوێژی خوێند.

من کاتێك سەیرم کرد ئەو سێ کەسە خەریکی پاڕانەوەن، بەداخەوە بووم کە بۆچی من وەکو ئەوان ناتوانم خواپەرستی بکەم. ئەو سێ کەسە لە کاتی نوێژ کردندا ڕوویان کردبووە قودس، چونکە جوولەکەکان لەهەر شوێنێك بن، لە کاتی نوێژکردندا ڕوو دەکەنە ئەو شارە. ئێمەی ڕۆمییش خواپەرستی دەکەین، بەڵام خواپەرستی ئێمە لەگەڵ یەهوودییەکان جیاوازە. خواپەرستی ئێمەی ڕۆمییەکان تەنها لە هەندێك ڕۆژدایە، ئەویش لەپەرستگادا لەبەردەم پەیکەری خودایاندا و، لە ڕۆژانی تردا خواپەرستی ناکەین.

کاتێ ئەو سێ کەسە یەهوودییە نوێژیان دەخوێند، زانیم ناتان و سوزمان بەوپەڕی خۆشەویستییەوە خەریکی خواپەرستین و ئەوەی کە بە زمان دەیڵێن، لەناو دڵیانەوە هەڵدەقوڵێ. بەڵام نوێژی مریەمی بێرت بەو جۆرەی کە من هەستم دەکرد، تەنها بۆ نەهێشتنی ئەو ئەرکەیە کە لەسەریەتی و وەك ئەوە وابوو کە بەناچاری نوێژ دەخوێنێت. حەزم دەکرد لەو دوو کەسەی کە بەیانی نوێژیان دەخوێند بپرسم کە چی دەڵێن و داوایان لێ بکەم فێری نوێژکردنم بکەن تاکو منیش بتوانم نوێژ بخوێنم. بەڵام

ئەو دووانە یەهوودی بوون و یەهوودییەکانیش خۆیان بە لەبەرتر دەزانن لە هەموو قەوموقیلەکانی تر و بڕوایان وایە میللەتەکانی تر شایەنی ئەوە نین کە لە ڕووی ئایینییەوە فێربکرێن.

پاش ئەوەی ئەو سیانە نوێژیان خوێند، نانمان خوارد و خواردنەکەمان بریتی بوو لە نان و پەنیر و پیاز، چونکە دەرفەتی ئەوەمان نەبوو چێشت دروست بکەین و مانەوەمان لەو شوێنە ئەوەندە درێژەی نەدەکێشا کە دەرفەتی خواردن دروستکردنمان بێت.

لە "ناتان"م پرسی :بۆچی بێدەنگیت و قسە ناکەیت؟

وەڵامی دایەوە: کاتێك مرۆڤ زۆر قسە بکات، بەو ئەندازەیە زیاتر تووشی گوناه دەبێت.

پاش ئەوەی نان خورا، ناتان ڕۆیشت و گوێدرێژەکانی لە لەوەڕگاکە هێنایەوە و سوار بووین و کەوتینەڕێ. بەڵام ئیتر وەکو بەیانییەکە توانامان نەمابوو، چونکە تینی خۆر ئێمەی شەکەت دەکرد و گوێدرێژەکانیش بە گەرمای نیوەڕۆ و عەسر بێزار ببوون. لەتەواوی کاتی عەسردا کە خەریکی ڕۆیشتن بووین، ڕووباری ئەردەنمان دەبینی و جوتیارەکان بەیاریدەی (گا)یەکان خەریکی درەوکردن بوون.

کاتێ خۆر داچوو، گەیشتینە گوندێك کە ڕووبارێکی گەورەی ئاو لە تەنیشتیەوە تێدەپەڕی. بەهۆی ئەوەی کە ماندوو و تۆزاوی ببووین، لەناو ئاوەکەدا خۆمان شوشت و ئینجا خۆمان بۆ پشوودان ئامادە کرد. من بۆم دەرکەوتبوو کە ناتان حەز ناکات بچینە ناو ئەو شارانەی کە لەسەر ڕێگەماندا بوون و لە میوانخانەکاندا بمێنینەوە و لەچێشتی لێنراو و ئامادەکراوی میوانخانەکان بخۆین. منیش زۆر حەزم نەدەکرد مەنزڵ بگرین و، بەهۆی ئەوەی کە هەوا گەرم بوو، حەزم لە خەوتنی ناو بیابان دەکرد و ڕقم لەخواردنی سادەی وەکو نان و پەنیر و سەوزە نەبوو.

پاش ئەوەی کە خۆمان شوشت، مریەمی بێرت یارمەتی سوزمانی دا تا ئاگر بکاتەوە و چێشت لێ بنێ. سوزمان بەوجۆرەی کە گوتم زۆر کەم قسەی دەکرد، بەڵام ئەوکاتەی کە ئەو دوو ژنە خەریکی چیشت لێنان بوون، بەبێ پچڕان قسەی دەکرد، چونکە ژنان کاتێك تەنیان، زۆر لەگەڵ یەك قسە دەکەن و لە قسەکردن چێژ وەردەگرن.

پاش ئەوەی خواردن ئامادە بوو، نانمان خوارد و پاشان ویستمان بنووین. لەکاتی خەوتندا، مریەمی بێرت جێگەی نووستنەکەی خۆی لەمن نزیك کردەوە و گوتی: لەو قسانەی کە من ئەمشەو لەگەڵ سوزماندا کردم، وا هەست دەکەم هەستۆکی دروستی نییە، بەڵام پێدەچێ زانیارییەکی دروستی هەبێت لەبارەی ئەو عیسایەی کەلە خاچ درا، بەڵام نایەوێ زانیاری خۆی ئاشکرا بکات، چونکە لەئێمە دەترسێ.

ناتان کەواکەی دا بەسەریدا و بۆ خەوتن ئامادە بوو. بەڵام سوزمان دانیشتبوو و بەرەو ڕووی قودس خواپەرستی دەکرد و من جارێکی تر نیشانەی نییەت پاکیم لە ڕوخساری ئەو ژنەدا هەست پێ کرد و لێی نزیك بوومەوە و گوتم: سوزمان، من حەزدەکەم بزانم تۆ چۆن خواپەرستی دەکەیت، واتە ئەو نزایەی کە دەیڵێیت چییە تاکو منیش بتوانم وەکو تۆ ڕزگار و خۆشحاڵ ببم.

سوزمان سەیرێکی منی کرد و گوتی: لەبەرئەوەی تۆ چاکەت لەگەڵ من کردووە و ڕازی بوویت من لەگەڵ تۆ گەشت بکەم تا بتوانم بگەڕێمەوە بۆ نیشتیمانەکەی خۆم، بۆیە دەبێ داواکەت جێبەجێ بکەم. بەڵام من ژنێکی نەزانم و ئەو نزایەی کەمن دەیخوێنم، نزای کەسانی نەزانە و ئەگەر من ژنێکی ژیر بوومایە، ئەوا بەجۆرێکی تر نزام دەخوێند و، ئەو کەسانەی کە زانان بەجۆرێکی تر نزا دەکەن.

مریەمی بێرت گوتی: من نازانم سوزمان دانایە یان نەزان، بەڵام ئەوەندە دەزانم ئەو نزایەی ئەو دەیخوێنێ، لەو نزایانە نییە کە کەسانی تر دەیخوێنن و، من هەر گیز نەمبیستووە کەس وەکو ئەو نزا بکات.

گوتم : سوزمان، من حەز دەکەم نزاکەی تۆم گوێ لێ بێت و ئەو نزایەم بە دەنگی بەرز بۆ بخوێنەوە.

سوزمان گوتی: من دیسان پێت دەڵێم کە نزاکەی من نزای کەسانێکە کە زانستیان نییە و ناتوانن نزای باش بخوێنن و لەبەری بکەن.

ئینجا سوزمان بەدەنگی بەرز ئاوای گوت ((ئەی باوکی ئێمە کە لە ئاسماندای، داوات لێ دەکەم مەلەکوتی خۆت کە لە ئاسماندایە، لەسەر زەوی بە ئێمەی نیشان بدە و خواردنی هەموو ڕۆژێکمان پێ بگەیەنە تاکو برسی نەبین و بەوجۆرەی کە ئێمە لەخەتای خەڵك دەبوورێین، تۆش لە خەتای ئێمە خۆش ببە و مەهێڵە خەیاڵاتی گوناه بەسەرماندا زاڵ ببێت...ئامین)).

سوزمان گوتی: ئەمەیە ئەو نزاییەی کە من دەیخوێنم. کاتێ ئەو ژنە نزاکەی گوت، من زانیم کە ئەوەی دیلێت، هەمووی ڕستەی سادەیە و هەموو کەسێك دەتوانێ بیلێت و لەبەری بکات. دیار بوو نزاکەی نزای زانایان نییە، بەڵکو بەجۆرێك دانراوە کە هەموو ژن و پیاوێکی گشتی بتوانێ بیلێن و، پێویستی نەدەکرد سەبارەت بەو نزایەی سوزمان لێکۆلینەوە بکەم، چونکە واتاکەی ڕوون بوو و، سادەیی نزاکەی وای نیشان دەدا کە بۆ هەموو کەسێك تۆمار کراوە.

ئینجا خەوتین و بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر دیسان ناتان بەئاگای هێناینەوە و کەوتینەڕێ. ڕێڕۆشتنی ئێمە لەو ڕۆژەدا جیاواز نەبوو لە ڕۆژی پێشوتر و کاتێك شەو داهات، لە ئاواییەکی نزیك ڕووباری ئەردەن پشومان دا. دیار بوو تینی هەوای بەهار، بەفری کێوەکانی تواندبۆوە و ئاوەکانی ڕووباری ئەردەن کفەڕێژ کردووە. سەرکێشیی ئاو ببووە هۆی ئەوەی کە گیانداران بگوازنەوە بۆ جیگای تر. ئێمە لەو شەوەدا، لە دورەوە دەنگی چەقەڵەکانمان دەبیست و پاشان گرمەگرمێکی وەکو هەورەگرمە کە لە دوورەوە دەبیسترا، دەهاتە گوێ. من زانیم کە ئەو گرمەگرمە دەنگی نەڕەی شێرە، چونکە شەوێك لە ڕۆم، لە سێرکدا گوێم لە نەڕەی شێرێکەوە بوو و دەنگی ئەو گیانەوەرەم دەناسی.

مریەمێ بێرت کە هەرگیز نەڕەی شێری نەبیستبوو، لەرزی لێ هات و گوێدرێژەکان ترسان و ناتانیش بۆئەوەی ترسی گوێدرێژەکان کەم بکاتەوە، هێنانی بۆلای ئێمە و دەرگای ئەو حەوشەیەی کە ئێمە تیایدا خەوتبووین، داخست و بەردێکی خستە پشتەوەی.

## ئەوەی کە سوزمان لەبارەی عیساوە گوتی

سوزمان نەیدەتوانی بنوێت و منیش سوودم لە بێ خەوییەکەی وەرگرت و پرسم: ئەو نزایە لە کێ فێری بوویت کە بۆ منت خوێندەوە؟

لەوکاتەدا دەنگی شێرەکە لە نزیکەوە دەهاتە گوێ و ئەو نەڕەیە ئەوەندە توند بوو کە دیوارەکانی ئەوماڵەی کە ئێمەی لێ بووین، هێنایە لەرزە. ژنەکە پاش ئەوەی دەنگی شێرەکەی بیست، لە ترسان دەستی بە دەمیەوە نا و پاشان پێی گوتم: تۆ نابێ ئەم پرسیارەم لێ بکەیت.

لەو کاتەدا ناتان کەوتە قسە و بە سوزمانی گوت: ئەوەی دەیزانی بیڵێ تاکو مەزن تیوس بزانێ کە چۆن فێری ئەم نزایە بوویت.

ژنەکە گوتی: ئەو کەسەی ئەم نزایەی فێر کردم، ئەو عیسایە کە لە خاچیان دا. من لەو ژنانە بووم کە لە جەلیلەدا ئەوم دەناسی و عیسا ئەو نزایەی فێری من و ژنەکانی تر کرد و گوتی کە ((ئەم نزایە بەسە و پێویست ناکات نزای تر فێر بن)).

گوتم: تۆ لە ناوچەی جەلیلەدا لەگەڵ عیسا ژیانت بەسەر دەبرد؟

سوزمان گوتی: من لەو ژنانە بووم کە لەو ناوچەیەدا لەگەڵ عیسا بووم و، بۆ هەر جێگەیەك بڕۆشتایە، منیش لەگەڵی دەچووم.

پرسیم: چی بوو وای لێ کردیت پەیوەست ببیت بە عیساوە تاکو بۆ هەرکوێ چوو، تۆش بچی؟

سوزمان گوتی: من لە جەلیلەدا بیستم کە هەندێ کەس دەچن بۆ لای عیسا و گوێ بۆ قسەکانی عیسا دەگرن و، ئەو بەخۆڕایی هەندێ شت بە خەڵك دەڵێ و پارەیان لێ وەرناگرێت. ئەم بابەتە بووە هۆی سەرسوڕمانی من، چونکە لە پەرستگای ئێمەی جوولەکەدا، ڕۆحانییەکان بەخۆڕایی هیچ شتێ بە کەس ناڵێن و ئەگەر زانیاری بدەن بە هەرکەسێ، ئەوا پاداشتی لێ وەردەگرن. فێرکردنی بەخۆڕایی لەلایەن عیساوە لە دوو لایەنەوە بووە هۆی سەرسامی من، یەکێکیان ئەوەیە کە ڕۆحانییەکانی ئێمە بە بەلاش خەڵك فێر ناکەن و، ئەوەی تریان ئەوەیە کە خودی خۆم ژنێکی ڕژد بووم و پارەم خۆش

دەویست و سەرم سوڕدەما لەوەی کەسێك زانیاری بدات بەخەڵك و پارەیان لێ وەرنەگرێت. ئەمەبوو کە وای لێ کردم بڕۆم چاوم پێی بکەوێت.

من بڕوام وابوو کە عیسا پێش ئەو ڕۆژە، زانیاری لەبارەی منەوە نییە و نەیزانیوە کە من ژنێکی بەرچاوتەنگم و زۆر پارەم خۆش دەوێ. من ئەوەندە ڕژد بووم کە هەندێ جار نانم نەدەخوارد بۆئەوەی بڕێ لە پارەکەی خۆم لە نانخواردندا خەرج نەکەم. من دەمزانی کە هیچ یەکێك لەو کەسانەی ئەو ڕۆژە لە دەوری عیسا کۆببونەوە، لەبارەی منەوە زانیارییان پێ نەداوە، چونکە هیچ کەسێ پێشبینی نەدەکرد ئەو ڕۆژە پەیوەست ببم بە دەستەی گوێڕایەڵانی عیساوە تاکو لەبارەی منەوە زانیاری پێ بدەن.

هەر ئەو ڕۆژە کاتێ گوێم بۆ قسەکانی عیسا گرتبوو، پیاوێك کە من دەمناسی و دەمزانی دەوڵەمەندە و بۆ زیاد کردنی سەروەت، تەماعکارە، هاتە ناو گوێگرەکانەوە. عیسا پێی گوت ((ئەو ڕۆژەی ئەم دنیایە بەجێ دێڵیت، هیچ شتێك لەو شتانە لەگەڵ خۆت نابەیت کە لەم دنیایەدا فەراهەمت کردووە. سەروەتی ڕاستەقینە ئەو سەروەتەیە کە مرۆڤ پاش مەرگ لەگەڵ خۆی بیبات)).

هەموو ڕۆژێك کە من دەچووم بۆ لای عیسا و گوێم بۆ قسەکانی دەگرت، هەندێ شتم لێ دەبیست کە وای نیشان دەدا کە کابرایەکی ئاسایی نییە. پاشان بڕیارم دا ئەو پارچانەی کەخۆم چنیبووم، بیانفرۆشم و زەوییە کێڵگەکەی خۆم بدەمە دەست کەسێك کە بۆم بەڕێوە ببات و لەگەڵ عیسادا بۆ هەرکوێ چوو، منیش بچم. ئیدی وام کرد و پاش فرۆشتنی پارچەکان و سپاردنی زەوی بە کەسانی بەکاربەر، پارەی نەختی خۆم هەڵگرت و لەگەڵ عیسادا بەڕێ کەوتم و، بۆ هەرکوێ دەچوو، من لەگەڵی بووم.

سوزمان بڕێ بێدەنگ بوو و گوتی: من نامەوێ بە خراپە باسی عیسا بکەم، بەڵام دەبێ بڵێم کە کاتێك من و چەند ژنێك کە لەگەڵی بووین، ئەو ژنانە پاڵپشتی ئەویان نەدەکرد و دەکرا عیسا لەناو بچێت، چونکە ئاگای لە ڕووداوەکانی دنیا نەبوو و وەك ئەوە وابوو کە لەم دنیایەدا ناژی و لە دنیایەکی تر ژیان بەسەر دەبات. لەشاری ناصرەدا دەیانگوت کە عیسا دارتاشێکی زانا بووە و، ئەگەرچی توانیویەتی تایە دروست بکات بۆ گالیسکەکان، بەڵام نەیتوانیوە دەرگا و پەنجەرە دروست بکات.

من لە سوزمانم پرسی: چی وای لێکرد عیسا دەرگا و پەنجەرە دروست بکات؟

سوزمان گوتی: پێویستی نەکردووە دارتاشی بکات، بەڵام پێش ئەوەی عیسا دەست بکات بە ڕێنمونی کردن، پیشەی دارتاشی کردووە و لەڕێگای دارتاشییەوە بژێوی ژیانی پەیدا کردووە. مەبەستم ئەوەیە کە عیسا ئەوەندە لەم دنیایە بێ باك بووە کە تەنانەت گوێی بە دارتاشی نەدەدا کە پیشەی خۆی بوو و، بە گوتەی خەڵکی شاری ناصرەش، نەیدەتوانی دەرگا و پەنجەرە دروست بکات. یەکێکی تر لەو کارانەی عیسا کە بەدڵم نەبوو ئەوە بوو کە ژنێکی کۆترفرۆش بەناوی مریەمی مەجدەلییە لەگەڵ ئەو دەچوو بۆ هەموو جێگەیەك و، عیساش ڕازی بوو بەوەی ئەو ژنە بۆ هەموو شوێنێك بچێت لەگەڵی.

ئەم وتەیەی سوزمان بووە هۆی تووڕەیی مریەمی بێرت و گوتی: من خۆم ناگرم ئەگەر بە خراپە باسی مریەمی مەجدەلییە بکەیت، چونکە مریەمی مەجدەلییە ژنێکی باش و میهرەبانە و، وەکو تۆ کە وەك دڵپیسەکان وایت، بە قسەی ناخۆش خەڵك ئازار نادات.

سوزمان بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە: کاتێ ژنێکی وەکو تۆ لایەنی مریەمی مەجدەلییە بگرێت ئیتر دیارە کە مریەمی مەجدەلییە کەسێکی چۆنە، چونکە مرۆڤ تا کەسێکی وەکو خۆی نەبینێ، پشتگیری لێ ناکات.

مریەمی بێرت پرسی: ئەی دڵڕەش کە وەکو دووپشك هەمیشە پێوە دەدەی، دەتەوێ چی بڵێیت؟

سوزمان گوتی: تۆ وادەزانی من ناوی تۆم نەبیستووە و نازانم لە ڕابردوودا چیت کردووە؟ من ئەگەریش دڵپیس بم، ژنێکم کە پەیداکردنی بژێویم لە ڕێگەی ناشەرعی و دوور لە ئایینەوە نییە. من کاری چنین دەکەم و پارچە دەچنم و، ئەگەر نەمەوێ پیاوێك بگرم بەکرێ بۆ کێلانی کێڵگەکەم، ئەوا خۆم دەچمە دوای گاسنەکەوە و زەوییەکە دەکێڵم. بەڵام تۆ ئەی مریەمی بێرت لە ڕێگەی ڕیسواییەوە بژێوی پەیدا دەکەیت.

مریەمی بێرت خۆی ئامادەکرد بۆئەوەی وەڵامێکی گەورەتر بداتەوە بە سوزمان، بەڵام من کەوتمە نێوانیان و گوتم: شەڕ بخەنە لاوە و جنێو بە یەکتری مەدەن. من بەرگەی شەڕی ئێوە ناگرم، چونکە ناتوانم پشی هیچکامتان بگرم تاکو دەمەقاڵێکە کۆتایی پێ دێت و، ناچارم گوێ بۆ جنێوەکانتان بگرم و بە ئەزموون بۆم دەرکەوتووە کاتێ دوو ژن دەکەونە جنێودان بە یەکتری، قسە پێکگوتنەکانیان بە زووی کۆتایی پێ

نایەت و ئەگەر ئێوە بەردەوام بن لە جنێودان بەیەکتری، ئەوا من لە هێنانی خۆتان پەشیمان دەکەنەوە و، من پەشیمانم لەوەی کە بۆچی دوو ژنم کرد بە هاوگەشتی خۆم.

ژنەکان بێدەنگ بوون و من داوام لە سوزمان کرد لەبارەی عیساوە قسە بکات. سوزمان گوتی: عیسا ئەوەندە بێ ئاگا بوو لەم دنیایە کە لە منداڵی بێ گوناە دەچوو. ڕۆژێ نەبوو عیسا پەرجوو نەکات و، ئەگەر نەخۆشێك نەیتوانیایە خۆی بگەیەنێتە عیسا، ئەوا هەرکە دەستی بگەیاندە کەواکەی، چاك دەبوویەوە. بەڵام ئەو پیاوە گەورە کە هەموو ڕۆژێ پەرجووی دەکرد، لە کردارەکانی دنیایدا وەکو منداڵێك وابوو کە دەبوو بەردەوام پاسەوانی لێ بکرێت و بپارێزرێت. بەهۆی ئەو بێ ئاگاییەوە بوو لە کردارەکانی دنیاییدا کە عیسا بەبۆنەی جەژنی گەورەی ئێمەوە ڕۆشت بۆلای جوولەکەکان و لەوێ گرتیان و دواتر لەخاچیان دا. خەڵك پێیان گوت کە واز لە ڕۆیشتن بهێنێ، بەڵام عیسا کە نەیدەتوانی درك بە ڕووداوەکانی ئەم دنیایە بکات، پەسەندی نەکرد و ئێمەش لەگەڵی چووین.

من ناتوانم بە تۆ بڵێم کە کاتێ عیسایان لەخاچ دا و من نیشانەی ئەشکەنجەی سەختم لە سیمای ئەو پیاوە بێ گوناهەدا بەدی کرد، چی بەسەر حاڵی مندا هات. من تا ئەو ڕۆژەی کە زیندووم، ڕوخساری عیسا کە بە خاچەوە بوو، فەرامۆش ناکەم و بڕوام وایە لەخاچدانی عیسا وەکو لەخاچدانی منداڵێك وابوو کە هێشتا ناتوانێ جیاوازی بکات لەنێوان ئاگر و ئاودا. کاتێ ئەوم بە خاچەوە بینی، ئەوەندە حاڵم تێك چوو کە یەکسەر نەخۆش کەوتم و نەمتوانی بووەستم و، بە ناچاری لە خاچەکە دوور کەوتمەوە و لەژێرزەمینێك کە دەکەوێتە ماڵێکەوە لەبەشی خوارەوەی پەرستگاکە، مامەوە و چەندین شەو و ڕۆژ نەمتوانی یەك تیکە نان بخۆم. ئینجا ئەوەندە نەخۆشینەکەم زیادی کرد کە هەژماری ڕۆژ و شەوم لەبیرچوویەوە و گومانم لەوە نەبوو کە دەمرم. بەڵام نەمردم و بەزیندوویی مامەوە تا ئەو ڕۆژەی کە ناتان منی بینی و، سەیرم کرد مووەکانی سەری کورت کردۆتەوە و بە منی گوت کە عیسا زیندوو بوویەوە و لەناو گۆڕەکەی هاتۆتە دەرەوە و خۆی بە قوتابییەکانی نیشان دەداوە و گوتوویەتی کە ((من بەرەو جەلیلە دەڕۆم و هەرکەسێ دەیەوێ بمبینێ، با بێت بۆ جەلیلە)).

سوزمان بێدەنگ بوو و ناتان گوتی: من عیسام نەبینی، بەڵام پاش ئەوەی کە زیندوو بوویەوە و لەناو گۆڕ هاتە دەرەوە، گومانم لەوە نەبوو کە نێردراوی خودایە، هەر ئەوەشە وای کرد ئێمە چاوەڕێی بکەین و بە ڕزگارکەری خۆمانی بزانین.

سوزمان گوتی: بەڵام من ئەوم دەناسی و ئاگام لە تایبەتمەندیەکانی ژیانی بوو، چونکە جلەکانی عیسام دەشوشت. عیسا ئەگەرچی کە هەموو ڕۆژێ پەرجووی دەکرد، بەڵام کابرایەکی سادە بوو. برسی و تینوی دەبوو و بە هەواڵە خۆشەکان خۆشحاڵ و بە هەواڵە ناخۆشەکان خەمبار دەبوو. من ئەوم باش دەناسی و دەمزانی خاوەنی کەسایەتییەکی سادەیە، پاش ئەوەی کە بیستم زیندوو بۆتەوە و لەگۆڕەکەی هاتۆتە دەرەوە و ڕێگەی جەلیلەی گرتۆتەبەر، سەرم سوڕنەما، چونکە کابرایەکی وەکو عیسا کە پەرجووی دەکرد، دەتوانێت پاش مردنیش زیندوو بێتەوە. من پێموایە ئێستە کە عیسا زیندوو بۆتەوە و ڕۆشتووە بۆ جەلیلە، مەلەکوتی خۆی لەوێ دێنێتە بوون و بەهۆی هاتنە بوونی مەلەکوتەکەی، دنیای دێرین، نوێ دەبێتەوە و دنیایەکی تازە دەست پێ دەکات. من هیوادارم بتوانم لە جەلیلە ئەو ببینم، بەڵام چ ئەو ببینم و چ نەیبینم، چونکە ئەو نزایەی کە فێری کردووم، بەیانیان و نیوەڕوان و شەوان دووبارەی دەکەمەوە.

مریەمی بێرت کە کەوتبووە ژێر کاریگەری گوتەکەی سوزمانەوە، پرسی: تۆ جلەکانی عیسات دەشوشت؟

سوزمان گوتی: ئەگەر تۆ عیسات بدیبایە، دەتبینی کە بەردەوام جلەکانی وەکو شیر سپییە، چونکە من جلەکانی ئەوم دەشوشت و ئەو ژنانەی کە لەگەڵی بوون جلەکانی عیسایان نەدەشوشت و، هیچ یەکێ لەوان لە هەموو تەمەنیاندا جلیان نەشوشتبوو، بەڵکو خزمەتکاریان هەبوو. قوتابییەکانی عیساش ئەوەندەی کە لە بیری خۆیاندا بوون ئەوەندە لەبیری عیسادا نەبوون تاکو جلی بۆ بشۆن، ئەوەش زیاتر لەبەرئەوە بوو کە پیاو جلوبەرگ ناشوات و شۆردنی جلوبەرگ کاری ژنانە.

گوتم: لە بەرامبەر ئەو خزمەتەی کە بەعسات کردووە، پاداشتت وەرگرت؟

سوزمان گوتی: پاداشتی من ئەوەیە کە(ڕەمزی ژیانەوە)م لێ بیست.

ئەم قسەیە هەستی منی بزواند، چونکە شتێك بوو کە من دەمویست بیزانم. من دەمویست بزانم عیسا چی فێری قوتابییەکانی کردووە، بەڵام قوتابییەکانی ئەو هیچیان

به من نەگوت کە منی پێ ڕازی بکەن. بەڵام سوزمان گوتی کە ئەو، ڕەمزی ژیانەوەی پێ گوتووە.

ئەوە بوو کە بە پەلە گوتم: سوزمان، ئەو(ڕەمزی ژیانەوە)یەی کە تۆ لە عیسات بیستووە، چییە؟ من حەز دەکەم تۆ ئەو ڕەمزەم فێر بکەیت.

بەڵام سوزمان وەك ئەوەی بە یەکجاری تووشی گومان و دوودڵییەك ببێت، گوتی: کاتێ من عیسام بە خاچەوە بینی و، هەروەها بەهۆی ئەوەی نیشانەی ئەشکەنجەم لە ڕوخساریدا بەدی کرد، پێنج ئەوەندە ناڕەحەت بووم کە ڕەمزی ژیانەوەی لەبیر بردمەوە.

گوتم: تۆ بە گوتەی خۆت ماوەیەك لەگەڵ عیسا بوویت و جلت بۆ شۆردووە و چێشتت بۆ لێناوە، چۆن دەکرێ ئەو ڕەمزی ژیانەوەیەت لەبیرت چووبێتەوە کە لێت بیستووە؟ با وادابنێین تۆ ڕەمزی ژیانەوەت فەرامۆش کردبێ، ئایا شتێکی ترت بەبیر نایەت کە پێی گوتبی؟ چونکە من بیستوومە کە عیسا لەگەڵ دەوروبەر و قوتابییەکانی قسەی دەکرد و گوتەکانی ئەو بۆ گوێگرەکان ڕاست بووە و لەبارەی تایبەتمەندی مەلەکوتی خۆی لەگەڵ ئەواندا قسەی دەکرد. تۆ کە لەگەڵ ئەو بوویت، بڵێ کە عیسا چی گوتووە؟

دیسان سوزمان لە وەڵامدانەوەی دروست خۆی دزییەوە و، دیار بوو لە من دەترسێت و یانیش حەز ناکات ئەو شتەی کە لە عیسای بیستووە، بە منی بڵێت و بەم جۆرە وەڵامی دایەوە: ئێمەی ئافرەت ناتوانین تێبگەین کە پیاوان چی دەڵێن، ئەویش پیاوێکی وەکو عسیا کە هەرچییەکی دەگوت، دیار بوو. کاتەکانی من و ئافرەتەکانی تر کە لەگەڵ عیسادا بووین، لە چێشت لێناندا بەسەر دەچوو، چونکە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ عیسادا بوون، هەندێ جار دەگەیشتە حەفتا کەس و ئەوانیش خواردنیان دەویست.

گوتم: سوزمان، تۆ لە عیسات نەبیستووە کە گوتەکانی ئەو چۆن دەگاتە خەڵك و، ئایا گتویەتی کە وتەکانی ئەو دەمێنێتەوە؟

**سوزمان گوتی: عیسا دەیگوت کە لە داهاتوودا کەسانێك هەن کە گوتەکانی من دەنووسنەوە و لەنێوان خەڵکدا بڵاوی دەکەنەوە.[48]**

**ئیتر من سەبارەت بە گوتەی عیسا پرسیارم لە سوزمان نەکرد و ئەو ژنە خەوت. بەڵام من نەمدەتوانی بخەوم و چاوم بڕیبووە گڕی فتیلەی چراکە و هەندێ جاریش دەنگی شێرەکانم دەبیست و، هەرجارێك گوێم لە نەڕەی شێرێك بووایە، وامدەزانی لە یەکێ لە سێرکەکانی ڕۆمدام و، تەنانەت بە هێزی خەیاڵ، دەنگی موزیکی سێرکم گوێ لێ دەبوو.**

**پاشان بەخۆم گوت ((ئەگەر من پێویستم نەکردایە لەسەر خۆم کە سەبارەت بە عیسا لێکۆڵینەوە بکەم و بزانم کە ئەو کێیە و چی دەڵێ و مەلەکوتی لەکوێدایە، ناچار**

---

[48] بەو جۆرەی کە دەیزانین گوتەکانی حەزرەتی عیسا (ع) لە دەمی خۆیەوە نەنووسراونەتەوە، بەڵکو پاش ئەو، ئەوەی ئەو گوتوویەتی تۆمار کراوە و ئەو کەسانەی گوتەکانی عیسایان تۆمارکردووە، یان لە قوتابییەکانی ئەو بوون، یان لە قوتابییە پلە دووەکان بوون، واتە قوتابی قوتابییەکانی. ئەوانیش بە نووسینی گوتەکانی عیسا (ع) نەوەستان، بەڵکو ڕووداوەکانی پەیوەست بەو پێغەمبەرەشیان نووسیوەتەوە و ئیتر (ئینجیل) بەو جۆرە دروست بوو. ژمارەی ئەو ئینجیلانەی کە نووسراون تا ئەوەندەی ئاگادارین، لە دە ئینجیل زیاترە، بەڵام تەنها چوار ئینجیلیان لەلایەن کڵێسای عیساییەکانەوە بە فەرمی ناسراوە کە یەکێکیان ئینجیلی (لۆقا) و ئەوی تریان ئینجیلی (مەرقۆس) و سێیەمینیان ئینجیلی (مەتتا)و چوارەمینیشیان ئینجیلی (یۆحەننا)یە و ئەو ئینجیلانەی تر کە لەلایەن کلێسای عیساییەکانەوە بەڕەسمی ناسراوە، ئەمڕۆ هەن و بەدەستی خەڵکەوە دەبینرێن و خۆم ئاگادارم کە پێش جەنگی جیهانی دووەم لە پاریسی پایتەختی فەڕەنسا دامەزراوەیەکی چاپ هەبوو کە ئینجیلی جۆراوجۆری چاپ دەکرد کە بەشێوەی ڕەسمی نەبوو و، دەیفرۆشتن و خاڵێك کە شایانی باس کردن بێت ئەوەیە کە بە پشت بەستن بە شیکردنەوەی زانایانی عیساناسی ئەورووپا و ئەمریکا، لە هەندێ لەو ئینجیلانەی کە لەلایەن کڵێساوە بە فەرمی نەناسراون، هەندێ شت هەیە کە بێگومان وتەی حەزرەتی عیسایە (ع)، بەڵام لەبەرئەوەی کڵێسا بەشەکانی تری ئەو ئینجیلانەی بەدەست تێوەردراو دزانێ، بۆیە ئامادە نییە ئەوانە بەفەرمی بناسێنێ و، هۆی ئەوەی کە ژمارەی ئینجیلەکان زیادی کردووە ئەوەیە کە هەریەکێ لەقوتابییە پلە دووەکان (قوتابی قوتابییەکان)یش کە خوێندەوار بوون، خۆیان بەوە زانیوە کە پێویستە لەسەریان وتە و ڕوونکردنەوەکانی قوتابییە پلە یەکەکانی حەزرەتی عیسا (ع) کە لەزمانی ئەوەوە (حەزرەتی عیسا) بیستوویانە، بینووسنەوە و بۆیە ژمارەی ئینجیلەکان زۆرە. لەو چوار ئینجیلەی کە کڵێسا بەڕەسمی ناساندوویەتی، ناوەڕۆکی سێ ئینجیلیان زۆر لەیەك دەچن و مەسیحییەکان بەو سێ ئینجیلە دەڵێن (سێ توپ تیك) واتە (ئینجیلە چوونیەکەکان) و ناوەڕۆکی ئینجیلی چوارەم لەگەڵ ئنجیلەکانی تردا جیاوازە. دەبێ بزانرێ کە زۆربەی قوتابییەکانی عیسا (ع) نەخوێندەوار بوون و نەیاندەتوانی ئەو شتانەی کە ئەو حەزرەتە گوتوویەتی، بینووسنەوە، بەڵام هەرچییەکی گوتووە لەبەریان دەکرد. ئێمە کە لەدەستپێکردنی خوێندنەوە، واتە لە قۆناغی چوون بۆ قوتابخانەی سەرەتایی، لەگەڵ پەرتووکدا سەروکارمان هەیە و پاشان تا کۆتایی تەمەنمان لە ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب و شتی تر کە چاپ دەکرێن، سوود وەردەگرین، هێشتا ناتوانین بزانین کە دێرینەکان چۆن بەبێ سوودوەرگرتن لە پەرتووك فێری شت بوون و زانیارییان وەرگرتوە و ئەوەی کە دەیانبیست، لەبەری بکەن و بیتەوە بیریان و، بێ ئاگاین لەوەی کە هێزی لەبەرکردنی خەڵکی نەخوێندەوار زۆر بەتوانایە و ئەمڕۆکەش هەروایە و، لەسەردەمی ئیسلامیشدا زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئایەتی قورئانیان لە دوایین پێغەمبەری پایە بەرز (حەزرەتی موحەممەد درودی خوای لەسەر بێت) دەبیست نەخوێندەوار بوون و نەیاندەتوانی بنووسن، بەڵام ئەم ئایەتانەیان لەبەردەکرد. بەهەرحاڵ دەبێ ئەوە بهێنینەوە یاد کە گوتەکانی حەزرەتی عیسا (ع)، پاش ئەو حەزرەتە لەلایەن هەندێ لە قوتابییە پلە یەکەمەکان و هەندێ لە قوتابییە پلە دووەکان نووسراوە و لەنێوان خەڵکدا بڵاویان کردۆتەوە.

نەدەبووم لەم شەوەدا لەو ماڵە، لەگەڵ سەد کەس لە جوولەکەکان کە کەسی سڤیلن، کات بەسەر ببەم و خۆم بخەمە سەر شکڵی جوولەکەکان و ڕیشم درێژ بکەم و جلوبەرگی یەهوودی بپۆشم و زونار ببەستم، بەڵکو لە ڕۆم دەمگوزەراند و جلوبەرگی خاوێنم لەبەردەکرد و ڕیشم دەتاشی و قژی سەرم دەڕازاندەوە و لەگەڵ کەسانێکدا قسەم دەکرد کە وەکو من خوێندەوار بوون و دەیانزانی چییان لێ دەپرسم و، دەیانتوانی وەڵامی پرسیارەکانم بدەنەوە، نەك کەسانێکی وەکو سوزمان و مریەمی بێرت و ناتان کە هەموویان سیڤیلن و ناتوانن درك بە گرنگی پرسیارەکانم بکەن)). ئەو شەوە من بە باشی پشووم نەدا و کاتێ ڕۆژ داهات، بەهۆی بێ خەوی شەوی ڕابردوو، شەکەت بووم.

## دەمەقاڵێ لەگەڵ مریەمی بێرت

مریەمی بێرتیش بە شەکەتی هەستایەوە و کاتێ دەمانویست بکەوینەڕێ، گوتی: باشتروایە ئەمڕۆ ڕێی خۆمان بگۆڕین و لەڕێگای "سامەرە"وە خۆمان بگەیەنینە جەلیلە، چونکە ئەم ڕێگایەی کە پیایدا دەڕۆین، ڕێگەیەکی ترسناکە و دوور نییە شێرەکان هێرشمان بۆ بێنن. لەم شوێنەدا، ڕووباری ئەردەن سەرکەش بووە و شێرەکان بەهۆی کفەڕێژی ڕووبارەکەوە شوێنی خۆیان بەجێ هێشتووە و لە بیاباندا بڵاوەیان کردووە. بەڵام ئەگەر لە ڕێگای سامەرەوە بڕۆین، ئەوا توشیی هێرشی شێرەکان نابین .

ناتان ئەو شمشێرەی کە بەستبووی بە کەمەریەوە بە مریەمی بێرتی نیشان دا و گوتی: ئێمە چەکدارین و ئەگەر شێرەکان هێرشمان بۆ بێنن، بەم شمشێرە دەیانکوژین.

سوزمان بە مریەمی بێرتی گوت: ئەمە ئەو ڕێگەیەیە کە عیسا لێوەی چووە بۆ ناوچەی جەلیلە و ئەگەر هەزار شێریش لەم ڕێگەیە بێت، هێرشمان بۆ ناهێنن و، من بە تەواوی و بە دڵنیاییەوە لەم ڕێگەیەوە دەچم بۆ جەلیلە و بۆئەوەی بشزانی کە ناترسم، لەپێش ئەوانی ترەوە دەڕۆم و دارێك بە دەستمەوە دەگرم و ئەگەر شێرێك ببینم، دارەکەی خۆم ڕادەوەشێنم تاکو شێرەکە ڕادەکات.

مریەمی بێرت گوتی: ئەم دوو کەسە پیاون و تۆش ژنێکی بەساڵاچوویت، ژنێکی گەنجی وەکو من، لەچاو گۆشتی ئەو سێ کەسەتان زۆر ناسکترە، بۆیە هێرش بۆ من دێنن و پارچە پارچەم دەکەن و دەمخۆن.

مریەمی بێرت ئەوەندە دەترسا کە ترسەکە بۆ منیش تەشەنەی کرد و لەخۆم پرسی ((ئایا عیسا لەم ڕێگەیەوە چووە بۆ جەلیلە یان لە ڕێگەیەکی ترەوە ڕۆشتووە؟)) تەنانەت من گومانم هەبوو لەوەی عیسا چووبێت بۆ جەلیلە و، بیرم دەکردەوە کە ڕەنگە ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان ئەو پڕوپاگەندەیان کردبێت تاکو وا لەخەڵکی جەلیلە بکەن لەو شارە بڕۆنە دەرەوە و بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان.

من ئەگەرچی لە سێرکی ڕۆم بینیبووم کە خاوەن شێرێك بە دارێکی بارێك چەندین شێر واڵێ دەکات یاری بکەن و ترسی لێیان نییە، نەمدەویست ئەو ڕۆژە بەو

شمشێرەی کە بەستبووم بە کەمەرمەوە، بڕۆم بۆ شەڕی شێر، چونکە ئەزموونی شەڕکردنم نەبوو لەگەڵ شێری دڕەندەدا و، دەشمزانی بۆئەوەی بەرەنگاری شێر ببیتەوە، جگە لە شمشێر، پێویست بە ئەزموونیش دەکات.

ناتان بۆئەوەی مریەمی بێرت ئاسوودە بکات، گوتی: شێر بە ڕۆژ هێرش ناکات، مەگەر کاتێ ناچاری بکەن لە پەناگەی خۆی بچێتە دەرەوە. ئێمە کارمان بە شێرەکان نییە و لە پەناگاکەی خۆیان دەریان ناکەین، بۆئەوەی هێرشمان بۆ نەهێنن. هەروەها شێر هێرش نابات بۆ مرۆڤ و، بە گۆشتی گیانەوەران تێر دەخوات و، ئەو کەسانەشی کە بە ددان و چنگی شێر دەکوژرێن، ئەوانەن کە بە ڕۆژ، شێر لە پەناگەی خۆی دەردەکەن، بۆیە ئەو گیاندارەش لە ترسی گیانی خۆی دەیانکوژێت.

ئەم قسانە دەبووە هۆی ئاسوودەیی مریەمی بێرت و خۆی و، سواری پشتی گوێدرێژەکان بووین و کەوتینەڕێ. هەرزوو چووینە ناوچەیەك کە بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاستی ئاوی ڕووباری ئەردەن، بەئاو داپۆشرابوو و گوێدرێژەکانی ئێمە بە زەحمەت هەنگاویان دەنا. پاش ئەوەی لەو ناوچەیە چووینە دەرەوە و گەیشتینە وشکاییەك، ژمارەیەك لە سەربازانی لژیون دەرکەوتن و هەرکە چاویان بە مریەمی بێرت کەوت، ویستیان لەسەر گوێدرێژەکە دایبگرن، بەڵام من نەمهێشت و گوتم: ئەم ئاکارەی ئێوە بە پێچەوانەی ئینزیباتی ئەرتەشی ڕۆمە و، هەروەها بە پێچەوانەی ئاکاری باشەیە، من ناهێڵم ئێوە بێ ڕێزی بەرامبەر بەو ژنە بنوێنن کە لەژێر پارێزگاری مندایە.

کە سەربازەکان بینییان من شمشێرێکم بەستووە بە کەمەرمەوە، گوتیان: هێی جوولەکە، کێ مۆڵەتی بە تۆ داوە ئەم شمشێرە ببەستی بە کەمەرتەوە؟

من بەزمانی ڕۆمی گوتم: من جوولەکە نیم، بەڵکو ڕۆمیم، دواتر ئەو کاغەزەی کە فەرماندەی مەخفەری ڕۆم پێی دابووم، پێم نیشان دان.

سەربازەکانی لژیون کە ئەو کاغەزەیان بینی، تۆڕەییەکەیان کەم کردەوە، بەڵام سەریان سوڕدەما لەوەی من کە ڕۆمییەکم، بۆچی ڕیشم هێشتۆتەوە و زونارم بەستووە و جلی یەهوودییەکانم کردۆتە بەرم. ئەگەر ئەو ڕێگایەی کە ئێمەی پێدا تێپەڕ دەبووین، شاڕێگە بووایە، ئەوا سەربازەکانی لژیون بەهۆی ئەوەی کە لە شاڕێگەدا هاتوونەتە ڕێی گەشتیار، بەسەختی تووشی سزا دەبوون. بەڵام ئێمە لە شاڕێگەوە

نەڕۆیشتن و هەروەها هەستم کرد سەربازەکان مەستن و مەستی وای لەوان کردووە چاوی تەماع ببڕنە مریەمی بێرت.

ئەو ڕۆژە کاتێ بێ شەرمی سەربازانی لژیونم بینی، مافم بە جوولەکەکان دا ڕقیان لە ڕۆمییەکان بێتەوە. ئینجا ویستم بزانم ئەو سەربازانە لەو شوێنەدا چی دەکەن و بۆچی مەستن. بە قسەکانیاندا زانیم کە فەرماندەی سەربازەکان کە پلەی سەنتوریونی هەیە، ئارەزووی کردووە ئەو ڕۆژە یەکێ لەو شێرانەی کە لە شەودا دەفەرێنێ، بکوژن و سەربازەکانی خۆی ڕاسپاردووە تا بە هەیاهو و بە پێکدادانی قەڵغانەکانیان، شێرەکە بترسێنن و لە پەناگاکەی دەری بکەن. بەڵام لەبەرئەوەی سەربازەکان دەترسان، شەرابیان نۆشیوە تاکو دڵیان گەرم بێت و هەربۆیەش مەست بوون.

کاتێ من قسەم لەگەڵ سەربازەکان دەکرد، خاوەن پایەکەیان کە پلەی سەنتوریونی هەبوو، دەرکەوت و ئەویش لە بینینی شمشێرەکەی من سەری سوڕما و پاش ئەوەی زانی من ڕۆمیم و دەمەوێ بچم بۆ ناوچەی جەلیلە، گوتی: ژمارەیەك لە یەهوودییەکان چوون بۆ ناوچەی جەلیلە و من پێشبینی دەکەم دیسان ناوچەی جەلیلە شلۆق دەبێ.

پرسیم: ئایا ئەو جولەکانەت بینیوە کە چوون بۆ ناوچەی جەلیلە و دەتوانی ناونیشانی ئەوانم پێ بدەیت؟

خاوەن پایە ڕۆمییەکە گوتی: لەبەرئەوەی ئەوان بە شەودا لەم سنوورەوە تێدەپەڕن، بۆیە چاوم پێیان نەکەوتووە.

من بەهۆی ڕەفتاری ناشرینی سەربازەکان، لای خاوەن پایە ڕۆمییەکە سکاڵام کرد و گوتم: ئەگەر ئەمڕۆ من لێرە نەبوومایە و پارێزگاریم لەو ژنە نەکردایە کە لەگەڵ مندایە، سەربازەکانی تۆ بێ ڕێزییان بەرامبەر بەو دەکرد، بۆیە ناچارم ئەم ڕووداوە ناخۆشە بگەیەنمە فەرماندەی گشتی یودە تاکو هاوشێوەی ئەم ڕووداوە لە ڕێگاکانی ئەم وڵاتەدا ڕوو نەدات و سەربازانی لژیون دەستدرێژی نەکەنە سەر ژنان و نەبنە هۆی بەدناوی ڕۆمییەکان.

خاوەن پایە ڕۆمییەکە تۆڕە بوو و گوتی: ئێستە تۆ من بە فەرماندەی یودە دەترسێنی؟ پاشان، دەنگی بەرز کردەوە: تۆ ئەگەر ڕۆمیت، بۆچی شکڵی یەهوودییەکانت بە خۆت گرتووە و ڕیش و زونارت هەیە؟ ئایا تۆ بەم جلە یەهوودی و

ڕیش و زونارەوە بوویتە هۆی بەدناوی ڕۆمییەکان یان ئێمە کە سەربازین و بەرگری لە ولاتەکانی ڕۆم دەکەین؟

من زانیم کە دەبێ لەگەڵ ئەو ئەفسەرە ڕۆمییەدا نەرم بم. ئەگەر من پۆشاکی ڕۆمیم لەبەردا بووایە، ئەوا ئەو خاوەن پایە نەیدەتوانی دەنگی بەرز بکاتەوە و بە سەرمدا هاوار بکات کە بۆچی دەمەوێ سکالاّ لە سەربازەکانی ئەو لەلای فەرماندەی گشتی یودە بکەم، بەلاّم لەبەرئەوەی جلی جوولەکەکانم لەبەردا بوو و ڕیشم دانابوو، دەیتوانی من بەپیاوێکی گوماناوی نیشان بدات و، ئەوا ئەگەریش بڕۆشتینایە، دەناسرام و ئەفسەرە ڕۆمییەکە سەرزەنشت دەکرا، بەلاّم گەشتەکەی من بۆ جەلیلە دوادەکەوت.

پاش ئەوەی کە من نەرمیم نوواند، ئەفسەرە ڕۆمییەکەش دەنگی خۆی هێور کردەوە و گوتی: لەبەرئەوەی تۆ ڕۆمیت و دەتەوێ بچی بۆ جەلیلە، ئامۆژگاریت دەکەم لە گەشت کردن بۆ ئەوێ پەشیمان ببیتەوە یانیش ناسنامەی خۆت ئاشکرا مەکە، چونکە دانیشتوانی ناوچەی جەلیلە داخ لەدڵن و ئەگەر بزانن تۆ ڕۆمیت و بە تەنها بتگرن، دەتکوژن.

خاوەن پایە ڕۆمییەکە گوتیشی: دوو ساڵ لەمەوپێش لە ناوچەی جەلیلە کەسێك پەیدابوو کە خۆی بە پێغەمبەری جوولەکەکان دەزانی و، ئەوەش پیاوێکی جیا لەو پیاوە بوو کە لەم دواییەدا لەخاچ درا. ئەو پیاوە دەیگوت کە دەتوانێ شوێنکەوتە و پەیڕەوانی خۆی "گیان پۆلاّ بکات"[49] بەجۆرێك کە شمشێر و ڕم و تیر نەچێت بەناو لەشیاندا و برینداریان نەکات. ژمارەیەك دەورەیان دا و ئەویش ئەوانی دەبرد بۆ ڕووباری ئەردەن و دەیگوت ((خۆتان لە ئاوی ئەو ڕووبارە هەڵبقورتێنن)) و پاشان ئەوەی لەناو ئاوەکە دەهاتە دەرەوە، دەیگوت ((ئێوە گیان پۆلاّ بوون و ئیتر بریندار نابن و ناکوژرێن)). حاکمی جەلیلە ئەو پیاوەی دەستگیر کرد و پاش وەرگرتنی فەرمان لەلایەن سەروترەوە، سەری لە لەلاشە جیاکردەوە تا شوێنکەوتووەکانی بزانن کە ئەو درۆ دەکات و ناتوانێ خەڵك گیان پۆلاّ بکات، چونکە ئەگەر بیتوانیایە خەڵك گیان پۆلاّ بکات، خۆشی گیان پۆلاّ دەکرد بۆئەوەی نەکوژرێت. پاش کوژرانی ئەو، ژمارەیەك لە

---

[49] مەبەست ئەوەیە کە هیچ شتێك نەتوانێ جەستەیان بریندار بکات و لە کوردەواری خۆشماندا شتێك هەیە وەکو (نوشتە) یان ئەندامی زاوزێی مێینەی (کەمتیار) کە گوایە هەرکەسێ بیکاتە ملی ئەوا گوللە نایبڕێت و پێی دەڵێن (گوللە بەن) بەلاّم ئێمە بۆیە نەماننووسیوە گوللە بەن چونکە لەو سەردەمەدا گوللە نەبووە، هەروەها ئێستە لە کەرەستەی سەربازیشدا بەرگێک دەکرێتەبەر کە پێی دەڵێن گوللە بەن، بەلاّم لێرە مەبەست ئەوە نییە، چونکە لەو سەردەمەدا زنجیریان کردۆتە بەریان. (و. کوردی)

شوێنکەوتووەکانی لە جەلیلە مانەوە و من پێموایە تازەکی سەریان هەڵداوەتەوە و، ڕەنگە ڕۆشتنی جوولەکەکان بۆ جەلیلە پەیوەست بێ بە سەرکەشی ئەوانەوە. بەهەرحاڵ من داوات لێ دەکەم وریای خۆت بە تاوەکو دانیشتوانی جەلیلە نەزانن تۆ ڕۆمیت، چونکە گیانت دەکەوێتە مەترسیەوە.

نازانم ئەفسەرە ڕۆمییەکە چ بیرێکی کردەوە کە نەبووە ڕێگر لە درێژەپێدانی گەشتەکەی ئێمە و پێی گوتین کە بڕۆین. ئێمە کەوتینەڕێ و لە ڕۆمییەکان دوور کەوتینەوە و پاش ئەوەی کە لێمانەوە ون بوون، مریەمی بێرت بە دەنگێکی گاڵتەئامێزەوە گوتی: من چاوەڕێم نەدەکرد تۆ کە ڕۆمیت، لە ناو هاونیشتیمانەکانی خۆتدا ئەوەندە بێ نرخ بیت کە سەنتوریونێك بتوانێ بەو جۆرە قسەت لەگەڵ بکات.

گوتم: ئەگەر من کڵاو و جلی جەنگیم لەبەردا بووایە، لە چاوی تۆدا بەنرخ و گرنگ دەردەکەوتم؟

مریەمی بێرت گوتی: من ناڵێم کە تۆ کڵاو و جلی جەنگی بکەیتە بەرت، بەڵام لەبەرئەوەی کە ڕۆمیت، دەبێ سوود لە تایبەتمەندیەکانی خۆت وەربگریت. ئێستە هەرکەسێ تۆ ببینێ و ڕیشی درێژ و پێیە تووکاویەکانی تۆ ببینێ، وادەزانێ جوولەکەیت و، کاتێکیش کە تۆ بە جوولەکە دەزانن، من لە خەجاڵەتیدا سوور دەبمەوە. بەڵام ئەگەر تۆ ڕیشت بتاشی و مووی قاچەکانت لابەریت و جلی ڕۆمی لەبەربکەیت، ئەوا من لەو سەیرکردنە گاڵتەئامێزەی کە خەڵك لەتۆی دەکەن، سوور نابمەوە.

من بە بیستنی ئەم قسەیە تووڕە بووم، چونکە چاوەڕێم نەدەکرد ژنێکی وەکو مریەمی بێرت قسەی وا بکات و گوتم: ئەی مریەمی بێرت، وادیارە ڕابردووی خۆت لەبیر کردووە و نازانی کێ بوویت کەوا ئەم قسەیە بە من دەڵێیت و سوکایەتیم پێ دەکەیت؟

مریەمی بێرت گوتی: هەموو کەسێ دەزانێ من لە ڕابردوو کەسێکی گوناهکار بووم و ئینکاری لە ڕابردووی خۆم ناکەم، بەڵام عیسا منی بینی و لە گوناهەکانی من خۆش بوو. بەڵام تۆ، ئەی مەزن تیوس، بڵێ بزانم لە ڕابردوودا چی گوناهێکی گەورەت کردووە کە ئێستا بۆ تەوبەکردن ڕیشت داناوە و مووی جەستەت ناکەیت و جلی یەهوودییەکانت کردۆتە بەرت؟

من وەڵامی ئەو ژنەم نەدایەوە، چونکە بە خۆم گوت ئەو ژنە نازانێ چی دەڵێ و ئەگەر بیزانیایە، ئەوا ئەو قسە زلانەی نەدەکرد. هەروەها دەمزانی کە ئەگەر وەڵام بدەمەوە، دیسان ئەو ژنە قسەی ناقۆڵا دەکات ومنیش زیاتر تووڕە دەبم.

کاتێ مریەمی بێرت کە زانی تاقەتم نییە وەڵامی بدەمەوە، لە سوزمان نزیک بوویەوە و، ئەو دوو ژنە دیسان دەستیان بە قسە کردن کردەوە و من زانیم کە لەبارەی منەوە قسە دەکەن و، گوێ دریژەکەی خۆم پێش خست تا گوێم لە وتووێژەکانی ئەو دوو ژنەوە نەبێت، چونکە پێشبینیم دەکرد تووڕەم بکات.

ئیتر هیچ شتێ ڕووی نەدا تا نزیک بووینەوە لەو شوێنەی کە دەبوو شەو تیایدا پشوو بدەین. پێش ئەوەی بگەینە شوێنی پشوودان، خۆر لە ئاوابوون نزیک بوویەوە و هەواش لەتاو تیشکی ئەرخەوانی خۆر، ئەوەندە سوور هەڵگەڕابوو کە من ترسام. وەك ئەوە وابوو کە هەزاران خەرمان ئاگریان گرتووە و تیشکی ئاگرەکان، ڕەنگی هەوا و زەوی کردووە بە ئەرخەوانی.

لەو شوێنەی کە ئێمەی لێ بووین، ڕووباری ئەردەن لە دۆڵێکی قوڵەوە تێ دەپەڕی، بەجۆرێك کە ڕووناکی خۆر، لەو کاتی خۆرئاوابوونەدا لێی نەدەدا، بۆیە ئاوی ڕووبارەکە لەو دۆڵەدا وەکو خەڵوزی ڕەش دەردەکەوت. من بە بینینی تیشکی سووری خۆر و ڕەشیی ئاوەوە ترسام و بیری ئەو ڕۆژەم کردەوە کە عیسایان لەخاچ دا. ئەو ڕۆژە زەوی لەرزی و هەوا ئەوەندە تاریك بوو کە دەتگوت شەو داهاتووە.

بە خۆم گوت ڕەنگە سووریی تیشکی خۆر و ڕەشی ئاو بەهۆی ئەوەوەیە کە من تووشی گوناهـ بووبم و مریەمی بێرتم بە قسەی ناشرین لە خۆم ڕنجاندووە، بۆیە هەرکە گەیشتینە مەنزڵ دەبێ پۆزشی لێ بخوازم و داوای لێ بکەم بمبەخشێت تا عیسا لە من خۆش ببێت. عیسا گوتویەتی کە ئەگەر کەسێك شەپازلەیەکی دا لە لایەکی ڕوخسارتان، ئەوا لاکەی تری بدەنێ تا شەپازلەیەکیش بدات لە لاکەی ترتان. من نەدەبوو لە بەرامبەر قسە ناپۆڵاکانی مریەمی بێرت قسەی ناشرین بکەم و پێشینەی تاریکی ئەو ژنە بهێنمەوە یادی. کاتێ نێردراوی خودا واتە عیسا، ژنێك ببەخشێ، ئیتر من نابێ ڕابردووی گوناهکاریی بەبیر بهێنمەوە.

ئەوە بوو پاش گەیشتن بە مەنزڵ، دوای ئەوەی خۆمان شوشت و تۆزی ڕێگامان لە جەستەمان کردەوە، من چووم بۆ لای مریەمی بێرت و گوتم: مریەمی بێرت، من لەو قسەیە خۆش بووم کە تۆ ئەمڕۆ پێت گوتم و تۆم بەخشیوە و، تۆش من ببوورە.

لەناکاو چاوەکانی مریەمی بێرت بچوك بوویەوە و، وەکو کەسێك کە زۆر سەری لێ شێوابێت، گوتی: تۆ من دەبەخشی؟ مەگەر من چیم کردبوو کە تۆ وادەزانی مافت هەیە قسەی ناشرینم پێ بڵێیت؟ تۆ ئەمڕۆ لە بەیانییەوە لە من دوور دەکەوتیەوە و بەردەوام بەجۆرێك ڕادەوەستای کە پشتت لە من بێت و، لە ڕێگادا لە من دوور دەکەوتیەوە و ئێستەش دەڵێی من دەبەخشی تا من لێت خۆش ببم. تۆ دەبووا ئارامت بگرتایە تا سەرەتا من تۆ ببەخشم و ئەگەر من زوڵمێکم لە تۆ کردبایە، ئەو کاتە مافی ئەوەت هەبوو مۆڵەتی بەخشین بەخۆت بدەیت.

بە بیستنی ئەم قسەیە، ڕوخسارم گەرم داهات و هەستم کرد ڕەنگی ڕوخسارم ئەرخەوانی بووە و دیسان تووشی توڕەیی بووم. بەڵام چاوم بە ناتان کەوت و سەیرم کرد ئەو پیاوە هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان بەرز کردۆتەوە و وەك ئەوە وابوو کە داوا لە ئاسمان دەکات ئاوەز یان ئارامی ببەخشێ بە وەچەی بەشەر. ئەوە بوو کە بەسەر توڕەیی خۆمدا زاڵ بووم و بە دەنگێکی ئارام گوتم: زۆر باشە مریەمی بێرت، سەرەتا تۆ من ببەخشە، پاش ئەوە من دان بەوەدا دەنێم کە مافی ئەوەم نییە لە تۆ خۆش ببم، چونکە تۆ کارێکت نەکردووە کە پێویست بە بەخشین بکات و، پاش ئەوەی تۆ لە من خۆش بوویت، ئیتر ئێمە دەبینە دوو هاوڕێ.

مریەمی بێرت هەردوو دەستی خستە سەر کەمەرەی و بانگی کرد: سوزمان وەرە بۆ ئێرە.

سوزمان کە دەیویست ئاگر بکاتەوە، دەستی لە ئاگرکردنەوە هەڵگرت و لە مریەی بێرت نزیك بوویەوە و پرسی: چی دەڵێی؟

مریەمی بێرت بە توڕەییەکی زۆرەوە گوتی: سەیرکە و بزانە ئایا ئەم کەسە پیاوە یان یەکێکە لەو ڕۆمییە بێ سەروبەرانەی کە ئێمە لە ڕێگادا، لەبارەیانەوە قسەمان دەکرد؟

ئیتر نەمتوانی پارێز بکەم و دەستم بزووت و زللەیەکم لە ڕوومەتی مریەمی بێرت دا، بەڵام کە دەنگی زللەکە هات، پەشیمان بوومەوە و بەخۆم گوت کە خۆزگایە ئەم کارەم نەکردایە.

چاوەکانی مریەمی بێرت پڕ بوون لە فرمێسك و چەندجارێك دەستی هێنا بە ڕوومەتی خۆیدا (بەو لایەی کە زللەکەی بەرکەوتبوو). من زۆر بێتاقەت بووم و ویستم بڕۆم بۆلای و بڵێم ((مریەم بمبەخشە، چونکە بەدەست خۆم نەبوو)). بەڵام ناتان لە پشتەوەی مریەمی بێرت ئاماژەی بۆ من کرد تاکو وازبهێنم و داوای لێبوردنی لێ نەکەم.

لەو کاتەدا کە من پەرێشان بووم و نەمدەزانی چی بکەم تا مریەمی بێرت لێم ببورێت، مریەم فرمێسکی چاوەکانی سڕی و هات بۆلای من و گوتی: تۆ باشت کرد کە زللەت لە من دا، چونکە ئەمڕۆ زۆر تۆم ڕەنجاند و، لە بەیانییەوە تا ئێستا بە قسە تاڵەکانی خۆم، تۆم نارەحەت کرد و ئێستەش کە شەپازلەت لێ داوم، سزای منت دا و هیوادارم لێم خۆش بووبیت.

پاشان سوزمان شیوی لێنا و نانمان خوارد و، پاش ئەوە ئامادەی خەوتن بووین.

من هێشتا لە بیری ڕەفتارە سەیرەکەی مریەمی بێرت بووم لەو ڕۆژەدا و، نەمدەتوانی بزانم کە بۆچی ئەو ژنە بەو جۆرە ڕەفتاری کرد و چەندین جار بە توندی سوکایەتی پێ کردم، کەچی پاش ئەوەی شەپازلەم لە ڕوومەتی دا، لە جیاتی ئەوەی من داوای لێبوردنی لێ بکەم، ئەو داوای لێبوردنی لە من کرد.

# ژنێکی دەوڵەمەند لە شاری تەبەرییە

ئەو شەوە وەکو شەوی ڕابردوو لە "خیاتی" خەوتین و بەیانی ڕۆژی دواتر کەوتینەوەڕێ. هەرکە یەك لەسەر چواری خۆر هاتە سەرەوە، ناتان ئێمەی لەسەر ڕێگەی کاروانییەکان برد بۆ سەر ڕێگەیەکی تر و ڕۆشتینە سەر تەپۆلکەیەك و، لەناکاو لەسەر تەپۆڵکەکە چاومان بە دەریاچەی جەلیلە کەوت کە دەتوانم بڵێم لە دوورەوە ژێرپێمان بە ڕەنگی شین دەردەکەوت. لە دوورەوە ڕەنگی سپێتی لوتکەی شاخەکان لەوبەری دەریاچەی جەلیلەوە دیاربوو و، ئەو هەوا فێنکەی کە دەیدا لە ڕوخسارمان، وای نیشان دەدا کە گەیشتووینەتە ناوچەیەکی کوێستان.

ئێمە بۆئەوەی بتوانین بگەینە شاری تەبەرییە، پاش هاتنە خوارەوە لە تەپۆڵکەکە، کەمێك لە لێواری دەریاچەی جەلیلەمان بڕی و گەیشتینە جێگایەك کە بۆنی توندی گۆگرد دەهات بە لوتدا. ئەوە ناوبانگی هەیە کە ئەو بۆنی گۆگردە لەشاری (سوودوم) واتە شاری (لوت)ەوە دێت و، شاری سوودوم لە کۆندا لەو حاڵەدا بوو کە بووە هۆی سوتانی ئەو شارە، بەڵام هێشتاش ئەو بۆنی گۆگردەی کە بووە هۆی سوتانی ئەو شارە، دێت بە لوتدا.[50] لە لێواری دەریاچەی جەلیلەدا ڤێلای جوانیان دروست کردووە کە هەموویان لەسەر شێوازی یۆنانی دروست کراون و، یەکێ لە بینا گەورەکانی ڕۆخی دەریاچەکە، حەمامە و، خەڵك لە وڵاتانی دەوروبەر خۆیان دەگەیەننە ڕۆخی دەریاچەی جەلیلە تا بتوانن جەستەی خۆیان بە ئاوی ئەو گەرماوە کە ئاوی گەرمی سروشتییە، بشۆن و نەخۆشییەکان لە خۆیان دوور بخەنەوە و، پزیشکەکانیش دەڵێن کە شوشتنی جەستە بە ئاوی گەرمی سروشتیی لێواری دەریاچەی جەلیلە، بەشێك لە نەخۆشییەکان چارەسەر دەکات.

[50] ئەم پڕوپاگەندەیە بێ بنەمایە و شوێنی شاری (سوودوم) واتە شاری (لوت) بەڕوونی درکەوتووە و زانایەکی ئەمریکی بە ناوی (نیلسۆن کلوك) شوێنی شاری (سوودوم)ی لە کەنارەکانی باشوری دەریاچەی (دەریای مردوو)دا ئاشکرا کردووە و هەموومان ئەوە دەزانین کە ئەو ڕۆژانەی شاری (سوودوم) کە دەکەوێتە کەناری دەریاچەی (دەریای مردوو) وێران بوو، شەش شاری تریش لە کەناری ئەو دەریاچەیەدا وێران بوو.

پێش ئەوەی خۆر ئاوابێت، گەیشتینە شاری تەبەرییە و، من لەگەڵ مریەمی بێرتدا لە میوانخانە نیشتەجێ بووین، بەڵام ناتان و سوزمان نەیانویست لە میوانخانە نیشتەجێ بن و ڕۆشتین بۆ شوێنی یەهوودییەکان بۆئەوەی لەوێ نیشتەجێ ببن. من دەمزانی کە باشتروایە ئەو دوو کەسە لەمن جیا ببنەوە تا خەڵك لە لێواری دەریاچەی جەلیلە ئەوان لەگەڵ من نەبینن. هەروەها زانیم ئەگەر سوزمان، کە لە ڕابردوودا خزمەتکاری عیسا بووە، لەگەڵ من نەبێت، ئەوا بۆ دۆزینەوەی عیسا ئازادترم، بەڵام ئەگەر لەگەڵ من بووایە ئەوا گومانی لێ دەکرا و نەیدەتوانی بە ئاسانی عیسا بدۆزێتەوە، چونکە قوتابییەکانی عیسای لێ دوور دەکەوێتەوە و شوێنی ئەو پیاوەیان بە سوزمان پیشان نەدەدا.

پێش ئەوەی سوزمان و ناتان لە من جیا ببنەوە، من بەڵێنم لە سوزمان وەرگرت کە هەر زانیارییەکی لەبارەی عیساوە دەست کەوت، بەمن بڵێت و ئەگەر جێگاکەشی دۆزیەوە، پێم بڵێت تا بڕۆم و بیبینم.

سوزمان پێی گوتم: لەبەرئەوەی تۆ چاکەت لە گەڵ کردووم و منت هێناوە بۆ ئێرە، من خۆم بە قەرزداری تۆ دەزانم و لە بەرامبەردا هەرجۆرە زانیارییەکم دەست بکەوێت لەبارەی عیساوە، پێتی دەڵێم.

من بڕوای تەواوم بە ناتان هەبوو هەربۆیە ڕازی بووم کە کیسەی پارەکەم لەلای ناتان بێت و، هەر ئەویش چاودێری گوێدرێژەکان بکات. لەکاتێکدا کە دەمزانی ئەو دوو کەسە دەیانەوێ ڕۆژی دواتر بڕۆن بۆکوفرناعوم[51] کە ڕەنگە لەوێ عیسا ببینن. ئەو دوو کەسە بۆیە دەیانویست بڕۆن بۆ کوفرناعوم، چونکە دەیانزانی کە عیسا ماوەیەك لەو شارەدا ئیشی کردووە، لە کاتێدا کە هەرگیز لە شاری تەبەرییەدا نیشتەجێ نەبووە.

نێوان شاری تەبەرییە و کوفرناعوم لە یەك ڕۆژەڕێ (نەك ڕۆژێکی تەواو) زیاتر نەبوو و، ئەگەر ئەو دووانە بەیانی ڕۆژی دواتر لە تەبەرییەوە بەڕێ بکەوتنایە، ئەوا عەسر دەگەیشتنە کوفرناعوم. من شەو لەمیوانخانەی تەبەرییە مامەوە و بەیانی پێش

[51] وەرگێڕی ئینجیل لە زمانی یۆنانییەوە بۆ زمانی فارسی شاری (کاپرنائوم)ی کە دەکەوێتە کەناری دەریاچەی جەلیلە و دەکەوێتە باکوری ئەو دەریاچەیە، بەشێوەی (کوفرناعوم) نووسیویەتی و منیش هەر بەو جۆرە نووسیومەتەوە و بەبێ هۆ نییە کە بڵێین شارەکانی کوفرناعوم و تەبەرییە (کە ئەسڵەن خۆی "تی برياس"ە) لە شارە بەناوبانگە مێژووییەکانی ئایینی جولەکە و مەسیحییە، واتە شوێنی نادیار نین.

هەڵهاتنی خۆر، ڕۆشتم بۆ سەربانی میوانخانەکە بۆئەوەی لەو سەربانەوە دەریاچەی جەلیلە و هەڵهاتنی خۆر ببینم. شنەبایەکی فێنك وەك سروەی داویین ڕۆژەکانی پایز لەڕۆم، لەسەر ڕووی ئاوەکەدا هەڵی دەکرد و، منیش لە بۆنی ئەو سروەیە کە بۆنی ئاڵف و گوڵ و گڵی سەر زەوی دەگەیاندە لوتم، چێژم وەردەگرت.

لەیەك ساتدا تیشکی خۆر کە لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتبووە دەرەوە، دای لە ئاوی دەریاچەکەی جەلیلە و، ڕووی دەریاچەکەش وەکو ئاوێنە دەدرەوشایەوە. تیشکی خۆر دەیدا لە سەدان بینای ڕەنگاوڕەنگ کە لە دەوروبەری دەریاچەکەدا بوون و هەروەها تیشکی خۆرەکە دەیدا لە درەخت و چیمەنەکانیش و، منیش بە بینینی ئەو دیمەنە جۆراوجۆر و جوانانەی کە لەو دەوروبەرەیدا دەمبینی، دڵخۆش بووم.

بەڵام دواتر لەناکاو لەرزم لێ هات و ئەو لەرزە چەند ساتێکی تر، ئەوەندە زیاد بوو کە نەمتوانی لە سەربانەکە بووەستم، بۆیە ناچار بووم بڕۆمە خوارەوە. دوای ئەوەی چوومە ژوورەکەی خۆم، لەرزینەکە بەردەوام بوو و هەرچی بالاپۆش بوو لەو ژوورەدا پێچام لە خۆمەوە تا گەرمم بێتەوە، بەڵام گەرمم نەبوویەوە.

پێشبینی من ڕاست بوو و، خێرا تا دایگرتم و، من تا شەو بەهۆی تینی (تا)وە دەسوتام. پێش ئەوەی هەوا تاریك بێت، مریەمی بێرت کە گوتم لە میوانخانەکەدا نیشتەجێ ببوو، پزیشکێکی یۆنانی بۆ هێنام کە لە تەبەرییە بوو و، ئەو پزیشکە پشکنینی بۆ کردم و ئینجا هەندێ دەرمانی پێ خواردم کە خوێن گەرم دەکەنەوە.

من ماوەی پازدە ڕۆژ نەخۆش بووم و (تا)م هەبوو و، ئێسکەکانی جەستەم ئازاریان هەبوو. لەو ماوەیەدا مریەمی بێرت ڕۆژ و شەو پەرستیاریی منی گرتبووە ئەستۆی خۆی و بەپێی فەرمانی پزیشك، پەرستاریی لێ دەکردم. پاش پازدە ڕۆژ کە (تا)کەم نەما، پزیشك گوتی کە دەبێ لە گەرماوەی ئاوی گەرمی سروشتی تەبەرییەدا جەستەم بشۆم، بەڵام من ئەوەندە لاواز ببووم کە نەمدەتوانی بڕۆم لەڕێ و خۆم بگەیەنمە ئەو گەرماوە. بەڵام سێ ڕۆژی دواتر، بە هاوکاری مریەمی بێرت لە میوانخانە چووینە دەرەوە و ڕۆیشتین بۆ گەرماوەی ئاوی گەرمی سروستی و، لەبەرئەوەی ئاوی ئەو گەرماوە گۆگردی هەبوو، بۆ من بەسوود بوو و، دوای چەندجار شوشتنی لەشم لەو گەرماوەدا، هێزم هاتەوە بە بەردا.

پاش ئەوەی نەخۆشیەکەم نەما و چاك بوومەوە، لە مریەمی بێرتم پرسی: لەو ڕۆژانەی کە من نەخۆش بووم، ناتان و سوزمان هاتن بۆ میوانخانە؟

ئەو گوتی: من ئەوانم نەبینیوە.

پاش ئەوەی نەخۆشینەکەم چارەسەر بوو، ترسام، چونکە پێم وابوو ئەو نەخۆشینە ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بووبێ کە من دەستم لە کارێك وەرداوە و وەردەدەم کە پەیوەندی بە منەوە نییە. من بڕوام وانەبوو کە نەخۆشینەکەی من بەهۆی ئەوەوە بێت کە دەستم وەرداوبێتە بابەتی عیساوە و دەمەوێ پەی بە نهێنییەکانی ببەم، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو گومانەم بۆ دروست بوو، ترسام. کاتێ ڕۆشتم بۆ حەمام و کارمەندانی گەرماوەکە ویستیان ڕیشم بتاشن و مووەکانی جەستەم لێ بکەنەوە و مووی سەرم جوان بکەن، نارەزاییم دەرنەبڕی و لە ئەنجامدا ڕوخسارم وەکو پێش چوون بۆ قودس، بێ ڕیش و سمێڵ و جەستەشم بێ موو بوو و قژی سەریشم جوان بوویەوە.

ڕۆژێ کە لە میوانخانە بووم، مریەمی بێرت بە پەشۆکاوی هاتە ژوورەکەی منەوە و گوتی: وەرە بۆ سەربان تا ئەو دیمەنە سەیرە ببینی.

پرسم: ئەو دیمەنە چیە؟

وەڵامی دایەوە: کلودیای هاوسەری فەرمانڕەوای گشتی یودە لەگەڵ خزمەتکارەکانی خۆی هاتوون بۆ ئەم شارە بۆئەوەی سوود لە گەرماوەی ئاوی سروشتی ئێرە وەربگرێ.

من چوومە سەربانەکە و سەیرم کرد کلودیا بەسەر تەختێکی ڕەوانی زێڕین و ئەرخەوانی هاتە ناو شارەوە و پاشان بیستم کە یەکێ لە بیناکانی لێواری دەریاچەی جەلیلەیان بۆ نیشتەجێ بوونی ئەو و خزمەتگوزارەکانی چۆڵ کردووە و، یەکێ لە حەوشەکانی گەرماوەشیان بۆ ئامادە کردووە. دەبێ بزانین کە گەرماوەی ئاوی گەرمی سروشتی تەبەرییە چەند حەوشەیەکی هەیە کە لە هەریەکەیاندا حەوزێکی تێدایە و هەر حەوزێکیش پڕ دەکرێت لە ئاوی گەرم. ئەو کەسانەی کە نەیانەوێ لە گەرماوەی گشتی لەشیان بە ئاوی گەرمی سروشتی بشۆن یان لە حەوزدا خۆیان نقوم بکەن، ئەوا یەکێ لەوان دەتوانێ حەوشەکە بەکرێ بگرێت، بەڵام کرێی حەوشەکان گرانن.

هاتنی کلودیای ژنی فەرمانڕەوای گشتی یودە، چاوەڕواننەکراو بوو. هەرچەندە دوور نەبوو کە کلودیا هاتووە بۆ تەبەرییە تا سوود لە ئاوی گەرمی سروشتی

وەربگرێت، بەڵام من وابیرم دەکردەوە کە هۆی سەرەکی هاتنی ئەو بۆ تەبەرییە شتێکی ترە و بابەتی سوود وەرگرتن لەئاوی گەرم، هۆی دووەم و یانیش هۆکارێکی لاوەکییە.

من زۆر حەزم دەکرد بزانم هۆی هاتنی کلودیا بۆ تەبەرییە چییە و، بەجۆرێک بزێوی بە سەرمدا زاڵ بوو کە نەمتوانی خۆم ڕابگرم و، دوو ڕۆژ دوای هاتنی کلودیا بۆ ئەو شارە لەوحەیەکم نووسی و دام بە دەستی یەکێ لەخزمەتکارەکانی میوانخانەکە و پێم گوت کە بیبات بۆ مەنزڵی کلودیا و بە خزمەتکارەکەی بڵێت کە ئەو لەوحەیە لەلایەن مەزن تیوسی ڕۆمییەوە نێردراوە و دەبێ بەزووترین کات بگاتە لای کلودیا و وەڵامی لەوحەکە وەربگرێتەوە و بیهێنێتەوە.

خادەمی میوانخانەکە بە لەوەحەکەی منەوە ڕۆیشت و پاش کاتژمێرێک گەڕایەوە و گوتی: کلودیا پەیامی ناردووە کە لە دیداری مەزن تیوس خۆشحاڵ دەبم وداوا دەکات بەزووترین کات بڕوات بۆ لای.

من جلم لەبەرکرد و گۆچانم گرت بە دەستمەوە و بەرەو مەنزڵی کلودیا بەڕێ کەوتم.

لەو کاتەوەی نەخۆش کەوتووم، لاقم دێشێت و هەرچەندە پاش چارەسەر کردن، ئێشی بەشەکانی تری جەستەم نەما، بەڵام ئازاری لاقم هەر مایەوە.

کاتێ گەیشتمە مەنزڵی کلودیا، بینیم کە هەموو خزمەتگوزارەکان چاوەڕێی چوونە ژوورەوەی من دەکەن و هۆیەکەشی ئەوەبوو کە کلودیا پێش ئەوەی بێت بۆ تەبەرییە، گوتی کە لەبەرئەوەی نەخۆشە و پێویستی بە پشوودانە و دەبێ چارەسەری خۆی بکات، نابێ کەس بێت بۆ دیدەنی. بەڵام مۆڵەتی دیداری بە من دا و خزمەتگوزارەکانی کلودیا دەیانویست بزانن من کێم کەوا کلودیا بۆ من، لە قسەکەی خۆی پەشیمان بۆتەوە و مۆڵەتی دیداری پێ داوم. کاتێ من بەگۆچانەوە چوومە مەنزڵەکەی کلودیاوە، خزمەتکارەکانی منیان بۆ ژوورەکەی ڕێنوێنی کرد. من کلودیام لە ژوورێکی فراوان و ڕووەو خۆر بەدی کرد و سەیرم کرد لەسەر جێگەیەکی دارئەرخەوانی ڕاکشاوە و چەند سەرینێکیان خستۆتە ژێر سەری.

ژنەکەی فەرمانڕەوای یودە کاتێ منی بینی، دەنگێکی شادیی بەرز کردەوە و[52] لەسەر جێگەکەی هەستایەوە و دانیشت و هەردوو دەستی بۆ من درێژ کرد و گوتی: مەزن تیوس ئەگەر بزانی بە دیدارت چەندە خۆشحاڵم، چونکە لەم شارەدا تۆ تەنها ڕۆمییەکیت کە دەتوانی پەی بە ڕۆحیەتی من ببەیت و من بناسی.

ئینجا لەبەرئەوەی هەستی بە شەلی من کرد، پرسی: مەزن تیوس، چیت لێ هاتووە و بۆچی دەشەلی؟

گوتم: ماوەیەکە لاقم ئازاری هەیە و ئەگەرچی بەردەوام دەوای دەکەم، بەڵام چاك نابێتەوە.

کلودیا گوتی: منش نەخۆشم و ناتوانم بنووم و کاتێ خەوم لێ دەکەوێت، کابووس دەبینم و پزیشکەکان دەڵێن کە گەدە و جگەرم ناساغە.

من سەیری ڕوخساری کلودیام کرد و بینیم کەمێك بێ ڕەنگ بووە. پاشان ژنێکم بینی کە لەلایەکی جێگەکەی کلودیا دانیشتبوو و تەمەنی وەك ژنی فەرمانڕەوای گشتی یودە دەهاتە بەرچاو، بەڵام جلوبەرگی ژنانی یەهوودی لەبەردا بوو.

کلودیا گوتی: ئەم پیاوە گەنجەی کە دەیبینی ئەوەیە کە گوتم ئومێدەوارم ئەمڕۆ بێت بۆ ئێرە و ناوی مەزن تیوسە و ناوی تەواوی (مەزن تیوس مانی لیانووس)ە و باوکی گەورەترین ئەستێرەناسی ڕۆمە، واتە گەورەترین ئەستێرەناسی دنیا بوو، چونکە کەسێك کە لە ڕۆمدا گەورەترین ئەستێرەناس بێت، بێگومان گەورەترین ئەستێرەناسی دنیاشە. ئەم گەنجە لە منداڵییەوە هاوڕێم بووە و بەشێك لە سەردەمی منداڵیم لە گەڵ ئەودا بەسەر بردووە و، دەبێ پێت بڵێم کە ئەم گەنجە لە نەژادی (ئەتروسك)ە،[53] چونکە باوباپیرانی لەگەڵ خودایەکاندا ژیاون. من ئەمساڵ لەکاتی جەژنی گەورەی جوولەکەکان مەزن تیوسم بینیەوە، بەڵام بڕوام نەدەکرد لێرە ببینم و کاتێ لەوحەکەی گەیشتە دەستم، زۆرخۆشحاڵ بووم.

---

[52] وەك چۆن لەخۆشیدا کەسێك کەسێك دەبینێ و هاوارێکی خۆشی لێ بەرز دەبێتەوە وەك (هێی.... ) دواتر دەڵێ (بەخێر بێیت) یان هەر بەخێرهاتنێکی تر. (و. کوردی)

[53] (ئەتروسك) هۆزێکن کە پێش لاتینییەکان لە ناوەندی (ئیتالیا) دەژیان و لە ڕۆمی دێریندا ئەگەر کەسێك لە نەژادی (ئەتروسك) بووایە ئەوا بەیەکێك لە هۆکارەکانی گەورەیی و زانایی دەژمێردرا بۆیە هەندێ لە ڕۆمیەکان، ڕاست یان درۆ، خۆیان بە نەژادی ئەتروسك دەناساند.

کلودیا لەکاتی ناساندنی من و باوکمدا زیادەوێژی کرد، بەڵام نەریت وایە کە هەرکەسێ بیەوێ کەسێکی تازەهاتوو کە خۆشی دەوێ، بیناسێنێ بەیەکێکی تر، ئەوا بە گەورەتر لەوەی کە هەیە پیشانی دەدات.

ئینجا ژنەکەی فەرمانڕەوای گشتی یودە لە بەرامبەردا ئەو ژنەی ناساند و گوتی: ئەمەی کە دەیبینی ژنی یۆحەننایە و باوکی خەزنەداری هیرودە و، من خۆشم دەوێت و داوام لێ کرد لەگەڵم بێت و ئەویش پەسەندی کرد.[54]

ژنەکە سەیرێکی منی کرد و لە نیگایدا زانیم کە ژنێکی هۆشیارە و گوتی: مەژن تیوس بەخێرهاتی، بەڵام خۆ تۆ ڕۆمیت، بۆچی وەکو نەوەکانی ئیسرائیل جلکت لەبەر کردووە؟

گوتم: من لەبەر دوو هۆکار ئەم جلانەم کردۆتە بەرم، یەکەمیان ئەوەیە کە مرۆڤ چوو بۆ هەر وڵاتێك و چەندە لەوێ نیشتەجێ بێت، جلەکانی دەگۆڕێت بە جلوبەرگی ئەو ناوچەیە و، دووەمیشیان ئەوەیە کە من ڕێز دادەنێم بۆ خودای گەلی ئیسرائیل و یاساکانیان و، لەبەرئەوەی خاوەنی بیرێکی فەیلەسوفیشم بۆیە حەزدەکەم پەی بە یاساکانیان بەرم.

تا ئەو کاتە کلودیا هەستی بە گۆڕینی جلەکانی من نەکردبوو، لەو کاتەدا سەیرێکی پۆشاکەکەی کردم و گوتی: بە ڕاستی تۆ چوویتە سەر شکڵی جوولەکەکان و من دڵنیام کە ئەگەر مێردەکەم جلەکانی تۆ ببینێت، خۆشحاڵ نابێت.

پاشان کلودیا باسی دۆخی میزاجی پونتوس پیلاتی مێردەکەی کرد و منی لە تەنیشت خۆی دانیشاند و فەرمانی دا کە میوە و شیرینیم بۆ بێنن. پاش ئەوەی کەمێك میوە و شیرینیم خوارد، کلودیا بە ژنە یەهوودییەکەی گوت: بڕۆ و بزانە کەس لە ژوورەکەی تەنیشتماندا هەیە، چونکە نامەوێ کەس لەو ژوورەدا بێت و گوێی لە قسەکانم بێت.

ژنەکەی یۆحەننا خۆی گەیاندە دەرگای ژوورەکەی تەنیشتمان و سەیرێکی ژوورەکەی کرد و گوتی: کەس لێرە نییە و، بۆ زیاتر پارێزگاری کردن لەوێ وەستا بۆئەوەی بەردەوام ژوورەکەی تەنیشتمان بخاتە ژێر چاودێرییەوە.

---

[54] (هیرود) ناوی پادشای (یودە)یە و ئەوان کوڕی دوای باوك بە ناوی (هیرود) بانگ دەکرد و پاش ئەوەی حکومەتی ڕۆم خاکی (فەلەستین)ی داگیر کرد، پادشایانی ناوبراو مانەوە و کەوتنە ژێر پارێزگاری ڕۆمەوە.

کلودیا دەنگی نزم کردەوە و پرسی: هێشتا ئەو عیسایەت لەبیر ماوە کە لەخاچ درا؟

گوتم: بەڵێ دێتەوە یادم و دیمەنی ئەو پیاوەم لەبیر ناچێتەوە و حەز دەکەم لەبارەیەوە زانیاری زیاترم دەست بکەوێت، بەڵام قوتابییەکانی بەدگومانن و نایانەوێ ئەوەی کە دەیزانن، بە خەڵکانی تری بڵێن.

کلودیا گوتی: قوتابییەکانی ئەو گەڕاونەتەوە بۆ ئێرە و کاری پێشووی خۆیان دەست پێ کردوەتەوە و، وەکو ساڵانی ڕابردوو، بە ڕاوکردنی ماسی لەم دەریاچەیەدا (ئاماژە بەدەریاچەی جەلیلە) سەرقاڵ بوون.

گوتم: من بیستوومە قوتابییەکانی عیسا گەڕاونەتەوە بۆ جەلیلە، ئایا لێرە ئازار نادرێن؟

ژنەکەی یۆحەننا کە تا ئەو کاتە قسەکانی ئێمەی دەبیست، بەبێ ئەوەی شتێك بڵێت لەناکاو گوتی: لێرە هیچ یەکێ لە قوتابی و شوێنکەوتووانی عیسا ئازار نادرێن و هیرودی پادشای جوولەکەکان دەزانێ کە لە ئازاردانی شوێنکەوتەکان، هیچ لایەك نابەستێتەوە و هێشتا پەشیمانە لەوەی کە بۆچی فەرمانی کوشتنی یەحیای پاك کەرەوە(لەئاو هەڵکێش)ی دەرکرد.[55]

کلودیا بەو ژنەی گوت: تۆ دەزانی کە هەتا توانیم هەوڵمدا نەهێڵم عیسا بکوژن، بەڵام پێم نەکرا و ئەو پیاوە بێ تاوانەیان کوشت.

من بەژنەکەی فەرمانڕەوای یودەم گوت: کلودیا، ئەوە یەکەمجار نییە کە پیاوێکی بێ تاوان بکوژن. پێش عیسا، بێ تاوانێکی زۆر کوژراون و پاش ئەویش، ڕەنگە کەسی بێ تاوانی تر بکوژن. بارودۆخی دنیا وایە و ئێمە ناتوانین ئەم بارودۆخە بگۆڕین، بۆیە باشتروایە لەجیاتی ئەوەی بیر لە عیسا بکەیتەوە، لە بیری خۆتدا بە و هەوڵ بدە چارەسەری خۆت بکەیت.

کلودیا گوتی: مەزن تیوس، تۆ لە گرنگی کات بێ ئاگایت و نازانی ئێمە لەچ سەردەمێکدا دەژین. دنیای ئەمڕۆ جیاوازە لە دوێنێ و، ئێستە ئێمە لە سەردەمێکدا

---

[55] (یەحیای پاك کەرەوە) لە ئینجیلدا بە شێوەی (جوهن بابتیست) هاتوە و ئەو کەسەی ئنجیلی لە زمانی یۆنانییەوە وەرگێڕاوە بۆ زمانی فارسی بە (یەحیای پاك کەرەوە) وەریگێڕاوە. ئەوە پیاوێك بوو کە پێش ئەوەی عیسا ڕێنوێنی خەڵك بکات، دەستی کرد بە ڕێنوێنی کردنی خەڵك و لە بیاباندا وتاری دەدا بۆ خەڵك و، هیرودی پادشای گەلی جوولەکەش فەرمانی دا کە سەری لەلاشەی جیا بکەنەوە.

دەژین کە ڕەنگە لە ژیانی جۆرە بەشەرێکی سەردەمێکی نوێ بێت و، ئێوە چ بڕواتان بە عیسا هەبێت و چ بڕواتان پێی نەبێت، ئەو ئێستە لەنێو ئێمەدا دەژی و ناتوانم لەبیری بکەم.

ژنەکەی یۆحەننا لە کلودیا نزیك بوویەوە و گوتی: ئەو دەزانێ چی دەڵێت؟

من زانیم کە ئەو ژنە لە من دەترسا و حەز ناکات کلودیا لەلای من بڵێ کە عیسا زیندووە و لەنێوان ئێمەدا دەژیت، بۆئەوەی نەوەك مەترسییەك بۆ عیسا دروست ببێت.

بەو ژنە یەهوودییەم گوت: تۆ یەکێك نیت لەو ژنانە کە دوای عیسا کەوتوون و بۆ هەرکوێ دەچوو ئەوانیش دەچوون؟

ژنەکەی یۆحەننا لەم قسەیە سەری سوڕما و پرسی: تۆ لەکوێ دەزانی کە من یەکێکم لەو ژنانەی لەدوای عیساوە ڕۆیشتووم و بۆ هەرکوێ چووە، منیش ڕۆیشتووم؟

گوتم من ناوی تۆم لە یەکێك لەو ژنانە بیستووە کە خزمەتکاری عیسا بووە.

ژنەکەی یۆحەننا گوتی: من نکۆڵی لەو بابەتە ناکەم و دانی پێدا دەنێم کە ماڵی خۆم بەجێ هێشتووە و لە دوای عیساوە بەڕێ کەوتووم و بۆ هەرکوێ چووە، منیش ڕۆیشتووم. دواتر زانیم کە بوونی من لەگەڵ عیسادا ڕەنگە مەترسیدار بێت بۆ مێردەکەم کە خەزنەداری پادشایە و، ڕەنگە لەناوی بەرن یانیش لەسەر کار لای بدەن، بۆیە گەڕامەوە بۆ ماڵەکەم. ئێستە پێم بڵێ ئەو ژنە کێیە کە لەبارەی منەوە زانیاری داوە بە تۆ؟

گوتم: هەندێ کەس لە قودسەوە هاتوون بۆ ئێرە بۆیە منیش ئارەزوی گەشتم کرد و، لە ڕێگادا ژنێك پێی گوتم کە ئەو حزمەتکاری عیسا بووە و جلوبەرگی شۆردووە و خواردنی بۆ لێناوە و، هەمان ژن گوتی کە تۆ ئەی ژنەکەی یۆحەننا، لەو ژنانە بوویت کە لەگەڵ عیسادا بوویت و لەگەڵ ئەو چوویت بۆ هەموو شوێنێك. کاتێ هاتم بۆ ئەم شارە، نەخۆش کەوتم و ئەوەندە نەخۆشییەکەم سەخت بوو کە دەمگوت دەمرم. لە ماوەی نەخۆشییەکەمدا لەسەرجێ کەوتبووم و نەمدەتوانی لەجێی خۆم هەستمەوە. ئێستاش کە لەجێی خۆم هەستاومەتەوە، لاقم ئازاری هەیە و ناتوانم بەبێ گۆچان بڕۆم لەڕێ. من نەخۆشییەکەی خۆم بۆئەوە دەگێڕمەوە کە عیسا نایەوێ خۆی بە من پیشان بدات و، بەوە منی ئاگادار کردۆتەوە کە دەست وەرنەدەمە ئەو کاروبارانەی کە پەیوەندی بە ئەوەوە هەیە. بەڵام تۆ ئەی کلودیا، بەو جۆرەی کە من تێتدەگەم تۆش

**وەکو من بۆ بینینی عیسا هاتوویت بۆ ئەم شارە. ئەگەرچی دەبینم کە نەخۆشیت و پێوستیت بە چارەسەرە، بەڵام ئەگەر حەزت لەو دیدارەی عیسا نەکردایە نەدەهاتی بۆ ئەم شارە.**

**کاتێ من ئەم قسەیەم کرد، ئەو دوو ژنە بە سەرسوڕمانەوە سەیری یەکتریان دەکرد و ئینجا سەیری منیان کرد و، ژنەکەی یۆحەننای خەزنەداری پادشای یەهوودییەکان گوتی: مەزن تیوس، تۆ کە ڕۆمیت و فەیلەسوفیت، بەڕاستی بڕوات وایە کە عیسا زیندوو بۆتەوە و لەناو گۆڕ هاتۆتە دەرەوە و ئیستەش لە نێوان ئێمەدایە؟**

**گوتم: بەڵێ، من بڕواموایە کە عیسا زیندوو بۆتەوە و لەناو گۆڕ هاتۆتە دەرەوە و، ئەو هەمان ئەو مەسیحەیە کە چاوەڕێمان دەکرد. بەڵام بەداخەوە کە شوێنکەوتەکانی عیسا نایانەوێ ڕێنوێنی من بکەن.**

**دوای ئەم قسەیە کتوپڕ پەرێشان بووم و زانیم کە ناچارم ئەوەی کە لە دڵمدایە، بۆ ئەو دوو ژنەی باس بکەم و گلەیی لەو کسانە بکەم کە ئامادە نەبوون ڕێنوێنیم بکەن. بۆیە بە کورتی باسی ئەوەم کرد کە چۆن چووم بۆ گوندی بیتانی و لەوێ لازاروسم بینیوە کە بە دەستی عیسا زیندوو بۆتەوە و لەناو گۆڕ هاتبووە دەرەوە.**

**پاشان، سەبارەت بە تۆماس و یۆحەننا قسەم کرد و ڕووداوەکەیماڵی شەمعونی خەڵکی کورنم بۆ ئەو دوو ژنە گێڕایەوە و گەیشتمە ئەو باسەی کە مەتتا و زاخوس هەڕەشەیان لێ کردووم کە مافم نییە تەنانەت ناوی عیسا بهێنم.**

**ژنەکەی یۆحەننا لە هەڕەشەکەی مەتتا و زاخوس زۆر سەری سوڕما و گوتی: من ناتوانم تێ بگەم کە ئەو دوو کەسە بۆچی بە تۆیان گوتووە کە بۆت نییە ناوی عیسا بهێنی. ئەگەر تۆ بڕوات بە عیسا نەبووایە و ئەوان ناوهێنانی عیسایان لە تۆ قەدەغە دەکرد، ئەو کاتە دەمتوانی هۆی ئەو قەدەغەیەی ئەوان بزانم. بەڵام بەچ بۆنەیەك بە پیاوێك، کە بڕوای بە عیسا هەیە، دەڵێن کە نابێ ناوی ببات؟**

**گوتم: ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە قەدەغەیان کردبێت کە من ناوی عیسا بهێنم، لەبەرئەوەیە کە جوولەکە نیم و، ئەوان بڕوایان وایە کە تامرۆڤ نەبێ بە جوولەکە، ناتوانێت لە باوەڕدارانی عیسا بێت.[56]**

---

[56] تا ساڵی چل و نۆیەمی پاش زایین، هەرکەسێ بیوستایە ببێت بە مەسیحی، دەبووایە یەکەمجار ببێت بە جوولەکە و پیاوەکانیان خەتەنە دەکرد و پاش ئەوەی کە دڵنیا بوون کە بوون بە جوولەکە، ئینجا هانیان دەدان ببن بە مەسیحی، بەڵام لە ساڵی چل و نۆیەمی پاش زایین، یەکەم کۆنگرەی پێشەوایانی ڕۆحانی مەسیحی بەسترا و لەو کۆنگرەیەدا پێشەوایانی ڕۆحانی مەسیحی بڕیاریان دا

ئینجا ژنەکەی یۆحەننا پرسی: تۆ دەتگوت کە کاتێ بەڕێ کەوتیت بۆ ئێرە، ژنێك لەڕێدا لەگەڵ تۆ سەبارەت بە من قسەی کرد و گوتی من لەو ژنانە بووم کە لەگەڵ عیسادا چووم بۆ هەموو جێگەیەك، ئایا دەزانی ئەو ژنە ناوی چییە؟

گوتم: ئەو ژنە ناوی سوزمان بوو، تۆ ئەو دەناسی؟

ژنەکەی یۆحەننا گوتی: بەڵێ ئەو دەناسم و ژنێکی بەساڵاچوو بوو، ڕەخنەگر بوو و بەردەوام بۆڵەی دەهات، بەڵام لەبەرئەوەی عیسا پیاوێکی زۆر چاکەکار بوو، بۆیە ئیزنی دا ئەو ژنەش لەگەڵی بچێت.

کلودیا کە بە وردی سەیری ئێمەی دەکرد، گوتی: مەزن تیوس ئایا دەزانی تۆ لەچاو ئەو کاتەی کە لە ڕۆم بوویت، ئەوەندە گۆڕاویت کە تەنانەت ناوی تولیای خۆشت ناهێنیت و، من ئەمڕۆ نەمبیست ناوی بەریت و، عیسا ئەوەندە تۆی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە کە (تولیا)ت لەبیر چۆتەوە. بەڕاست پێم بڵێ تۆ بۆچی بەدوای عیسادا دەگەڕێیت و چیت لێ دەوێ؟

گوتم: کلودیا، تۆ ئەو پرسیارە لەخۆت بکە و بڵێ چیت لە عیسا دەوێ کەوا هاتوویت بۆ ئەم شارە بۆ بینینی؟

کلودیا گوتی: یەکەم من ئافرەتم نەك پیاو، ئافرەتیش مافی خۆیەتی دوای خەیاڵات بکەوێت. دووەم ئافرەتێکی نەخۆشم و شەوان ناتوانم بخەوم و ئازاری زۆرم هەیە و، هەرکاتێ عیسا ببینم، داوای لێ دەکەم نەخۆشینەکانم دەرمان بکات. سێیەم، من دەمەوێ ئەو ببینم تا بزانم ئەو لەخاچدراوەی کە پاش ئەسپەردە کردن گیانی دێتەوە بە بەردا و لەناو گۆڕ دێتە دەرەوە، لەچ دۆخێکدایە و حاڵی چۆنە.

گوتم: من ئەهلی خەیاڵات نیم _ڕەنگە بە هۆی ئەوەوە بێت کە پیاوم _ و دەمەوێ عیسا ببینم تا ڕەمزی ژیانەوەی لێ ببیستم، چونکە بیستوومە کە ئەو خەڵکی فێرکردووە. جگە لەوە، دەمەوێ ئەو ببینم تا لێی بپرسم کە مەلەکوتەکەی لەکوێیە، یان لەکام ڕێگاوە دەکرێ بگەین بە مەلەکوتەکەی. ئێستە پێم بڵێن کە عیسا کەی هات بۆ جەلیلە و، کەی لێرە خۆی بە خەڵك، واتە باوەڕدارەکانی خۆی پیشان دا؟

---

لەوەبەدواوە مەرجی هاتنە ناو ئایینی مەسیحی پەیوەست نەکرێ بە ئایینی یەهوودییەوە و ئەم نەریتی خەتەنە کردنەی پیاوانیش تا ئەمڕۆ ماوە.

ژنەکەی یۆحەننا گوتی: من نازانم عیسا چ کاتێك هاتوە بۆ ئێرە و لەکوێ خۆی بە پەیڕەوانی خۆی پیشان داوە. هەر ئەوەندە دەزانم کە چەند ڕۆژێ لەمەوپێش حەوت کەس لە شوێنکەوتەکانی لە بەیانییەوە دەستیان بە ماسی گرتن کرد و تۆڕی ماسی گرتنەکەیان پڕ بوو لە نێچیر و، کاتێ لە ماسی گرتن گەڕانەوە، زۆر خۆشحاڵ بوون و پێدەکەنین، بەڵام نەیانگوت هۆی خۆشحاڵی ئەوان چییە. ڕەنگە هۆی خۆشحاڵی ئەوان ئەوەبووبێت کە ئەو ڕۆژە عیسایان بینیبێت، بەڵام بە دووری دەزانم کە تەنیا ڕاوکردنی زۆر، ئەوانی بەو شێوەیە خۆشحاڵ کردبێت؟

گوتم: من سەرم لەوە سوڕدەمێنێت کە بۆچی ڕاز و نهێنی عیسا دراوەتە دەست کەسانی وەکو ڕاوچییەکانی دەریاچەی جەلیلە و، ئێستەش ئەوان کە لە ڕازی عیسا ئاگادارن، بۆچی ژنێکی وەك مریەمی مەجدەلییەیان لەو نهێنییە ئاگادار نەکردۆتەوە، لە کاتێکدا کە ئەو هەمووە پارەی بۆ قوتابییەکانی عیسا خەرج کردووە، یان بۆچی ژنێکی وەکو تۆ لەو نهێنییە ئاگادار ناکەنەوە، لەکاتێدا کە پێمولیە ئەگەر تۆ پارێزگاریت لە قوتابییەکانی عیسا نەکردایە، ئەوان لەم شارەدا ئازار دەدران.

ژنەکەی یۆحەننا گوتی: دیارە هۆکارێکی هەیە کە من ئەوە نازانم. ئینجا کەمێك وەستا و گوتی: بە ئەگەرێکی تەواو، قوتابییەکانی عیسا نهێنییەکی گەورەیان لایە کە لەلایەن عیساوە پێیان دراوە و ئەوانیش ئاشکرای ناکەن، بەڵام من سەرم لەوە سوڕدەمێنێ کە بۆچی عیسا ڕازی گەورەی خۆی سپاردۆتە دەستی کەسانێکی وەکو ڕاوچییەکانی دەریاچەی جەلیلە و بۆچی کەسی دیارتر و باشتری ڕانەسپاردووە بۆ پارێزگاری کردن لەو ڕازە.

کلودیا گوتی: ئەم ڕاوچییانە نەك هەر چاکەکانی ژنەکەی یۆحەننایان لەبەرچاو نەبوو، بەڵکو نەیانکرد ڕێزی من بگرن، چونکە من ژنی فەرمانڕەوای یودەم و هاوڕێیەتی من بۆ ئەوان بەبەهایە. من بەوانم گوت بە عیسا بڵێن کە دەمەوێ ببینم وبینێرن بۆلای من، بەڵام ئەوان داواکەی منیان نەگەیاندە عیسا، لەکاتێکدا ئەگەر عیسایان بناردایە بۆلای من، سوودی عیسای تێدا دەبوو و، لەلایەن منەوە دەپارێزرا.

من بە بیستنی ئەو قسەیەی کە لەدەمی کلودیاوە دەرچوو، سەرم سوڕمابوو چونکە ئەم قسەیە وای پیشان دەدا کە ژنەکەی فەرمانڕەوای گشتی وایدەزانی عیسا وەکو کەسی ئاسایی وایە کە دەیانەوێ خۆیان لە کەسانی سەرناس ودەوڵەمەند نزیك

بکەنەوە تا سوود لە هێز و سەروەری ئەوان وەربگرن و، لە پەنای ئەواندا خۆیان لەهەڕەشەی دوژمنان بپارێزن.

کلودیا غافڵ بوو لەوەی کە عیسا مرۆڤێکی ئاسایی نییە کە پێویستی بە پاراستنی گیانی هۆز بێت. ئەوەبوو کە گوتم: کلودیا، من پێموایە تۆ هێشتا بە باشی عیسا ناناسیت.

کلودیا بە قسەکەی من خەمبار بوو و، وایدەزانی من دەمەوێ گاڵتەی پێ بکەم و گوتی: مەزن تیوس، لەبیرت بێت کە من ژنێکم لە هاوڕێکانی سیزار و، چەندین جار نانی ئێوارەم لەگەڵی خواردووە و، ژنێکی ئاوا ئەگەر عیسا بانگ بکات بۆ دیدار، شایستەیە.

پێش ئەوەی من وەڵامی کلودیا بدەمەوە، ژنەکەی یۆحەننا دەستی ڕاوەشاند، واتە بێدەنگ بم و گوتی: گەلی ئیسرائیل گرنگی بە ژن نادەن و ڕێزیان ناگرێت و وەکو ئاژەڵ لە قەڵەمیان دەدات، بەڵام عیسا گرنگی دەدات بە ئێمەی ئافرەت و ڕێزمان لێ دەگرێت و ئەگەر بیویستایە بۆهەر شوێنێك بچێت، ئیزنی دەدا ئێمەش لە گەڵی بڕۆین. بەڵام ئێستە قوتابییەکانی نایانەوێ ئەوەی کە دەیزانن، بە ئێمەی بڵێن و تەنانەت ئامادە نین پێمان بڵێن کە لەکوێ دەتوانرێ عیسا ببینرێت. عیسا بە ڕاشکاوی گوتی کە مەلەکوتی ئەو لەم دنیایەدا نییە و، قوتابییەکانیشی لە گەڕاندان بۆئەوەی قەڵەمڕەوی عیسا لە خاکی ئیسرائیلدا پەیدا بکەن و هەریەکێکیان لەو قەڵەمڕەوییەدا ببنە خاوەن پایە. بێ ئاگا لەوەی کە لەبەرئەوەی ئیسرائیل عیسای لەخاچ داوە، تووشی غەزەبی خوداوەند بووە و، من دڵنیام گەلی جوولەکە بەهۆی کوشتنی عیساوە، ئەویش بەشێوەیەکی دڵتەزێن، بەدبەخت دەبێت و ڕۆژی ڕەشی ئەم گەلە ئەوەندە درێژە دەکێشی تا تاوانی گوناحی کوشتنی عیسا بدەنەوە.

گوتم: ئەی خێزانی یۆحەننا، ڕۆژی ڕەشی گەلی ئیسرائیل چەند دەخایەنێ؟

ژنەکەی یۆحەننا گوتی: بیستوومە کە سەردەمی بەدبەختیی گەلی جوولەکە دوو هەزار ساڵ درێژە دەکێشێ.

ئینجا لە ژنەکەی یۆحەننام پرسی: بابەتی دیداری عیسا بۆ من زۆر گرنگە، بەڵام نازانم لە کوێ دەتوانرێ بیبینین.

ژنەکەی یۆحەننا گوتی: ئەگەر من ژنی یۆحەننا نەبوومایە و مێردەکەم لە دەرباری پادشای ئیسرائیلدا پلەوپایەیەکی بەرزی نەبووایە، دەڕۆشتم و دەگەڕام و عیسام دەدۆزییەوە. بەڵام ئەگەر من بۆ دۆزینەوەی عیسا بەڕێ بکەوم، هەواڵی گەڕانی من لە هەموو شوێنێك بڵاو دەبێتەوە و بەگران لەسەر مێردەکەم دەوەستێ و لە دەرباری پادشای ئیسرائیلدا دەریدەکەنە دەرەوە.

کلودیا گوتی: من پێموایە قوتابییەکانی عیسا پەیامی منییان پێ نەگەیاندبێ و، نایانەوێ پێی بگەیەنن ئەگینا ئەو دەهات بۆلای من. من هەرچەندە نەخۆشم و بۆ چارەسەر کردن هاتووم بۆ ئێرە، بەڵام ئەگەر ژنی فەرمانڕەوای گشتی نەبوومایە، بە تەختی ڕەوان یان بە بەلەم دەڕۆشتم و عیسام دەدۆزییەوە و گفتوگۆم لەگەڵ دەکرد. بەڵام لەبەرئەوەی ژنی فەرمانڕەوای گشتی یودەم، ناتوانم هەستمەوە و بەدوایدا بگەڕێم.

گوتم: من نە یۆحەننای خەزنەداری هیرودی پادشای ئیسرائیلم و نە هاوسەری فەرمانڕەوای گشتی یودەم و، دەتوانم بڕۆم بۆ دۆزینەوەی عیسا. بەڵام پاش ئەوەی هاتم بۆ ئێرە_ هەر وەك باسم کرد_ نەخۆش کەوتم و پاش هەستانەوەم لەسەر جێگاکە، کۆسپێکی نەخۆشی بەشێوەی ئازاری لاقم مایەوە و من وام هەست دەکرد کە عیسا نایەوێ دەست وەربدەمە کاروبارەکانییەوە و حەز دەکات بۆ دیداری، بە دوایدا بگەڕێم. من پێموایە عیسا هەرکاتێك بیەوێت خۆی پیشانی هەرکەسێك کە حەز بکات بدات، ئەوا نیشان دەدات.

ژنەکەی یۆحەننا گوتی: یەکێ لەو کەسانەی کە پێموایە عیسای لەم ناوچەیەدا بینیوە و دەتوانێ لەبارەی جێگەکەی زانیاری بە تۆ بدات، مریەمی مەجدەلییەیە. لێرەوە تا مەجەدەلیە ڕێگەیەکی دوور نییە و ئەگەر سواری بەلەم بیت، پاش تێپەڕ بوون لە دەریاچە، دەگەیتە مەجدەلییە و، پاش ئەوەی مریەمی مەجدەلییەت بینی، دەتوانی لەبارەی شوێنی عیساوە پرسیاری لێ بکەیت کە لەکوێ دەتوانرێت ببینرێت. هەروەها لەلایەن منەوە بە مرەیەمی مەجدەلییە بڵێ کە من حەز دەکەم چاوم پێی بکەوێت. بەڵام بەهۆی پیشەی مێردەکەم نە دەتوانم بچم بۆ مەجدەلییە بۆلای و نە دەشتوانم ئەو بێنم بۆ ئێرە، چونکە ئەگەر من بچم بۆلای مریەمی مەجدەلییە یان ئەو بێنم بۆ ئێرە، ئەوا پیشەی مێردەکەم لەدەست دەچێت و لە دەربار دەریدەکەنە دەرەوە.

ئینجا ژنەکەی یۆحەننا گوتی: مەزن تیوس، لەبەرئەوەی تۆ ڕۆمیت، دەتوانی مریەمی مەجدەلییە ببینی و دیداری ئەو بۆ تۆ، نابێتە هۆی دروست بوونی کێشە، چونکە کەس ناتوانێ ڕەخنە لە ڕۆمییەکان بگرێت. بەلاّم ئەگەر یەهوودییەك بڕوات بۆلای مریەمی مەجدەلییە، ئەوا لەبەرئەوەی هەمووی دەزانێ کە ئەو ژنە لە شوێنکەوتووانی عیسایە، بە گران دەوەستێ لەسەر هاموشۆکەرەکە.

گوتم: ئەی ژنی یۆحەننا، بیر لەو پێشنیارەی تۆ بۆ ڕۆیشتن بۆ مالّی مریەمی مەجدەلییە، دەکەمەوە و پاشان بڕیار دەدەم.

پاشان بابەتی قسەکردن گۆڕا و کلودیا بە منی گوت: من هیوادارم تا چەند ڕۆژێك حالّم باش ببێت و ئەو کاتە تۆ، ئەی مەزن تیوس، دەبێ بێیت بۆ مالّی من تا بەیەکەوە بچین بۆ سەیرکردنی پێشبڕکێی گالیسکەسواری و بۆ تەماشای شانۆ بانگهێشتت دەکەم، چونکە ئەم شارە هەم ناوەندی گالیسکە سوارییە و هەمیش تەماشاخانە.

گوتم: کلودیا، من بەوپەڕی خۆشحالییەوە بۆ ڕۆیشتن بۆ تەماشاخانە، دێم بۆ مەنزلّەکەت.

کلودیا گوتی: من زۆر حەز دەکەم لەگەلّ تۆ نانی ئێوارە بخۆم بەلاّم حالّی من ناخوازێ کە لەسەر مێزی نانخواردن دابنیشم و، هەرکاتێ چاك بوومەوە بانگهێشتت دەکەم بۆ نانخواردنی ئێوارە.

پاشان بەلّێنمان دا کە هەر زانیاریەکمان دەست کەوت لەبارەی عیساوە، بیگەیەنینە یەکتر و بەیەك بلّێین. ئینجا من و کلودیا و ژنەکەی یۆحەننا مالّئاواییمان کرد و لەو مالّە چوومە دەرەوە.

# دیدار لەگەڵ مریەی مەجدەلییەدا

کاتێ دەمویست بچمە ناو میوانخانەکەوە (ئەو میوانخانەی کە تێیدا نیشتەجێ بووم)، لەولای کۆڵانەکەوە چاوم بە دوکانی بازرگانێکی سریانی کەوت کە قوماشی گرانبەهای دەفرۆشت.

لە دوکانی کاسبکارە سریانییەکە نزیك بوومەوە و بەشی دەستێ جل، قوماشێکی ئاوریشمی زێڕبافم کڕی کە زۆر گرانبەها بوو و، داوام لە بازرگانەکە کرد تورەکەیەکی ئاوریشمی و زێڕبافم پێ بفرۆشێت. کاسبکارە سریانییەکە تورەکەیەکی جوانی لە قوماشی ئاوریشمی زێڕبافی پێدام و، منیش قوماشەکەم دەق کرد و خستمە ناوی و پێم گوت: ئێستەش بە یەکێ لە شاگردەکانی خۆت بڵی تا ئەم قوماشە ببات بۆ ماڵی ژنێك کە ناونیشانەکەی پێ دەدەم.

بازرگانە سریانییەکە پێکەنی و گوتی: خۆش بەحاڵی ئەو ژنەی کە وەها قوماشێکی گرانبەها وەکو دیاری وەردەگرێت.

من ناونیشانی ماڵی کلودیام بە شاگردی بازرگانەکە دا و گوتم: ئەم تورەکەیە بدە بە ژنی فەرمانڕەوا و بڵی لەلایەن مەزن تیوسەوە نێردراوە.

شاگردی دوکانی قوماش فرۆشییەکە ڕۆیشت و منیش بە کۆڵانەکەدا ڕۆیشتم و چوومە ناو میوانخانەکەوە. کاتێ هەنگاوم نایە ژوورەکەم، هەستم کرد مریەمی بێرت سەیری دەستەکانم دەکات. لەبەرئەوەی دوکانی قوماش فرۆشییەکە بەرامبەر میوانخانەکە بوو، بۆیە مریەمی بێرت منی بینی کە چووم بۆ ئەو دوکانە و وایزانی قوماشێکم بۆ ئەو کڕیوە.

کاتێ زانی دەستەکانی من بەتاڵە و قوماشم بۆ ئەو نەکڕیوە، زمانی گلەیی کردەوە و گوتی: مەزن تیوس، تۆ بۆ پیاسە و خۆشگوزەرانی لە میوانخانە دەچیتە دەرەوە و، لێرە من بە تەنیا بەجێ دێڵی، لە کاتێکدا کە من حەز دەکەم لە میوانخانە بڕۆمە دەرەوە و لەگەڵ ژنان دابنیشم و گوێ لە ئاهەنگەکانی مۆسیقا بگرم و، بە بەلەم بەسەر دەریاچەدا بگەڕێم. بەڵام تۆ لەگەڵ خۆتم نابەیت و منیش ناچارم لە بەیانییەوە تا ئێوارە لە میوانخانەکەدا بم.

گوتم: مریەمی بێرت، ئەگەر فەرامۆشت نەکردبێ تۆ بۆ گەڕان بۆ ئەم شارە نەهاتویت و، منیش بۆئەوە نەهاتووم بگەڕێم و پیاسە بکەم. ئێمە هەردووکمان ئامانجێکی ترمان هەبوو لەم گەشتەدا و دەمانویست لێرە مامۆستای گەورەمان ببینین، بەڵام کە ئێستە هاتووین بۆ ئەم شارە، حەزمان لە گەڕان و بیستنی ئاوازەکانی مۆسیقایە.

ئەوە تەنیا مریەمی بێرت نەبوو کە پاش هاتنی بۆ شاری تەبەرییە کە دەکەوێتە لێواری دەریاچەی جەلیلەوە، بەو شێوە جیاوازە بیر بکاتەوە، بەڵکو کلودیای ژنی فەرمانڕەواش لەشاری تەبەرییە بەجۆرێ بیری دەکردەوە کە جیاواز بوو لە بیرکردنەوەی ڕابردووی. پێشتر ژنەکەی فەرمانڕەوا نەیدەگوت کە دەبێ عیسا بچێ بۆلای، بەڵام لە تەبەرییە ئەم قسەیەی کرد و خۆی لە عیسا بە گەورەتر زانی و چاوەڕێ بوو کە کاتێ عیسا بانگ دەکات، عیسا بە خۆشحاڵییەوە بڕوات بۆ مەنزڵەکەی و سەر بەرز بێت بەوەی کە ژنێکی وەکو کلودیا ئەوی بانگ کردووە.

من پێشتر ژنەکەی یۆحەننام نەبینیوە تا بزانم چۆن قسەی کردووە و جیاوازی بکەم لەنێوان قسەی ئەو ڕۆژە و گوفتاری ڕابردووی، بەڵام هەستم دەکرد ئەو ژنە ئەو ڕۆژەی کە ماڵ و مێردەکەی خۆی بەجێ هێشتووە و لەگەڵ ژنانی تردا لەگەڵ عیسادا ڕۆیشتوون، لەوخەیاڵەدا نەبووە و هەربیری لەوە نەکردۆتەوە کە ڕەنگە مێردەکەی لە پیشەی خەزنەداری هیرودی پاشای ئیسرائیل دەربکەن. بەڵام ئاو و هەوای تەبەرییە و خۆشی و ڕەونەقی دەریاچەی جەلیلە و جوانی ماڵە شکۆدارەکەی کلودیا لەو شارەدا و، بۆنی عەتری دڵڕفێنی گوڵەکان، شێوەی بیرکردنەوەی ژنەکەی یۆحەننای گۆڕیوە و وایزانیوە هەرکاتێ بیەوێ بە دوای عیسادا بگەڕێ، ئەوا مێردەکەی پلە و دەسەڵاتی خۆی لەدەست دەدا.

مریەمی بێرت گوتی: من دەزانم بۆچی هاتووم بۆ ئەم شارە و، مەبەستم ئەوە بوو کە عیسا ببینم، بەڵام هێشتا نەمتوانیوە بە دیداری شاد ببم. ئایا لە کاتێدا کە چاوەڕێی دیداری دەکەم، سەیرکردنی دیمەنە جوانەکانی ئەم شارە و گوێ گرتن لە ئاوازەکانی مۆسیقا تاوانە؟ من وەکو کچە منداڵێکی گوندیی وام کە بۆ یەکەم جارە لە گوندەوە دێتە ناو شار و بە دیتنی کەرەستە یارییەکان دێتە جۆش و واقی وڕدەمێنێ. ئەو دەزانێ کە ناتوانێ ببێتە خاوەنی ئەو هەموو کەرەستە یارییانە، بەڵام نابێ دایک و

باوکی ڕێ لە سەیرکردنی شتە یارییەکان لە کچە منداڵەکەیان بگرن و، دەبێ ئیزنی بدەن منداڵەکەیان تەماشایان بکات و دەست بدات لەشتە یارییەکان.

گوتم: مریەمی بێرت، من دەمەوێ بەیانی بەلەمێك بەکرێ بگرم و لێرەوە بڕۆم بۆ مەجدەلییە و تۆش لەگەڵ خۆم دەبەم. کەواتە تۆ سبەی بەسەر دەریاچەی جەلیلەدا دەگەڕێیت و لە خەمەکانت کەم دەبێتەوە.

مریەمی بێرت پرسی: بۆچی مەجدەلییەت بۆ گەڕان و پیاسە هەڵبژادووە؟

گوتم: چونکە مریەمی مەجدەلییە لەوێیە و لە قودس گەڕاوەتەوە.

مریەمی بێرت گوتی: ئەگەرچی مریەمی مەجدەلییە چاکەی لەگەڵ من کردووە و تاکە کەسێ بوو کە بەچاوی سوك تەماشای منی نەکرد و پێی گوتم کە عیسا نێردراوی خودایە، کەچی هەر لێی دەترسێم.

پرسیم: بۆچی لێی دەترسی؟

مریەمی بێرت گوتی: چونکە قسەکانی مریەمی مەجدەلییە کاریگەری هەیە لەسەر من و، کاتێ شتێکم پێ دەڵێ ئەوا منیش ناچارم بە قسەی بکەم.

پرسیم: لەوە دەترسی مریەمی مەجدەلییە شتێك بە تۆ بڵێت کە پێچەوانەی مەیلی تۆ بێت و ناچار بیت بەقسەی بکەیت؟

مریەمی بێرت گوتی: بەڵێ، لەوە دەترسم.

گوتم: بە بۆچونی تۆ مریەمی مەجدەلییە چیت پێ دەڵێ کە لەگەڵ مەیلی تۆدا نەگونجێ، بەڵام ناچار دەبیت بەقسەی بکەیت؟

مریەمی مەجدەلییە گوتی: من پێشبینی دەکەم کاتێ مریەمی مەجدەلییە[57] من ببینێت، پێم دەڵێ ((مریەمی بێرت، تۆ لە تەوبەکارانیت و ئەو ژنەی کە تەوبە دەکات ئیتر نابێ لە گەڵ پیاواندا کات بەسەر ببات و، لە مەزن تیوسی ڕۆمی جیا بەرەوە))، بەڵام مەزن تیوس من نامەوێ لە تۆ جیا ببمەوە.

گوتم: مریەمی بێرت، مەبەستت لەم قسەیە چییە؟ ئایا تۆ چاوەڕێ دەکەی من لەگەڵ تۆ تووشی گوناح ببم؟ لە کاتێکدا کە من ئەو کارە ناکەم.

---

[57] لێرەدا ناوی (مریەمی مەجدەلییە) لە وەرگێردراوە فارسیەکەدا بەهەڵە ناوی (مریەمی بێرت) نووسراوە و ئێمە لێرە ڕاستمان کردۆتەوە. ( و. کوردی)

مریەمی بێرت گوتی: بەڵام چەند ڕۆژێ لەمەوپێش، کاتێ (تا)ت گرتبوو، بەجۆرێکی تر قسەت دەکرد.

پرسیم: ئەو کات چیم دەگوت؟

مریەمی بێرت گوتی: ئەو کاتە داوات لە من دەکرد دەستم بخەمە سەر نێوچاوانت. یان دەستی منت دەگرت و دەتنایە دەستی خۆت و پاش دوو کاتژمێر، کاتێ دەمویست دەستم لە دەستی تۆ دەربێنم، دەتگوت کە دەستی خۆم دوور نەخەمەوە. ئەو ڕۆژانە خۆشترین ڕۆژەکانی من بوو و هەرگیز ئەو ڕۆژە خۆشانە نابینمەوە و، لەوکاتە بەدواوە بەوە دڵخۆشم کە لەگەڵ تۆ دەژیم.

من لە پەیوەندی مریەمی بێرت سەبارەت بەخۆم نەدەترسام، چونکە کاتێ خووت گرت ئەوا پەیوەندیش دروست دەبێ. مریەمی بێرت خووی بەوەوە گرتبوو کە لەگەڵ من ژیان بەسەر ببات و، لەو ڕاهاتنەوە پەیوەندی دروست بوو. بەڵام من حەزم پێ نەدەکرد، واتە وەکو ژن سەیرم نەدەکرد. من زانیم کە دەبێ پەیوەندی من و مریەمی بێرت بپچڕێت، چونکە هەتا زیاتر پەیوەندیمان درێژە بکێشێ، ئەوا ئەو ژنە زیاتر حەز لەلای من دەکات، بەو هۆیەوە جیابوونەوەی لەمن گرانتر دەبێت. خووگرتن ئەوەندە لە دروست کردنی پەیوەندیدا کاریگەرە کە هەندێ لەو کەسانەی سەگ یان غوڵام دەکڕن و ماوەیەك لەگەڵیان دەبێت، ئیتر ناتوانن بەبێ سەگ یان غوڵام بژین.[58]

ڕۆژی دواتر بەلەمێکم بەکرێ گرت و دوو سەوڵ لێدەرم بەکرێ گرت تا بمانگەیەننە مەجدەلییە. کاتێ بەڕێ کەوتین، بینیم مریەمی بێرت لەناو بەلەمەکەدا پەچەی دایەوە بەسەر ڕوخساریدا.

لێم پرسی: بۆچی ڕوخسارت بە پەچە دادەپۆشی؟

مریەمی بێرت گوتی: بۆئەوەی تیشکی هەتاو ڕوخسارم نەشێوێنێ.

مریەمی بێرت پێش ئەوەی بچێ بۆ شاری تەبەرییە، گوێی بە پاراستنی جوانی نەداوە و لە تیشکی خۆر نەدەترسا. بەڵام کە هات بۆ تەبەرییە و لە میوانخانە ژووری گرت، بینی ئەو ژنانەی کە گەشتیار بوون و لەو میوانخانەیەدا نیشتەجێ ببوون، بۆ پاراستنی جوانی خۆیان خەیار دەساون لە ڕوخساریان. مریەمی بێرتیش لاسایی

---

[58] مەزن تیوس کە چیرۆکخوانی ئەم سەرگورشتەیە، ناوی سەگی لەپێش ناوی غوڵامەوە هێناوە و لەم ڕووەوە دەتوانین لەوە تێبگەین کە گرنگی کۆیلەکان لە ڕۆمی دێریندا چەند بووە.

ئەوانی کردەوە و هەموو ڕۆژێ ئاوی خەیاری لە ڕوخساری دەدا بۆئەوەی شەوقی ڕوخساری زیاتر بێت. هەر ئەوکاتە بینی کە ژنان لەکاتی چوونە دەرەوەیان لە میوانخانە، دەمامکێك دەدەن بە ڕوخسارياندا تا تیشکی هەتاو ڕوخساريان نەسوتێنێ، بۆیە ئەو ڕۆژە کاتێ ئێمە سواری بەلەمەکە بووین تا بۆ مەجدەلییە بڕۆین، مریەمی بێرت پەچەی دادایەوە بە ڕوخساریدا تا تیشکی هەتاو ڕوخساری نەسوتێنێ.

کە کەمێك لە تەبەرییە دوور کەوتینەوە، ئەو دوو سەوڵ لێدەرەی کە بەلەمەکەی ئێمەیان لێدەخوڕی، چارۆکەکەیان هەڵکرد بۆئەوەی کەمتر زەحمەت بکێشن. بەڵام هێزی شەماڵ ئەوەندە نەبوو تا گەمیەکە بەتەنیا بجوڵێنێت و بۆیە کاتێ چارۆکەکەیان هەڵکردبوو، ناچار سەوڵیشیان لێ دەدا.

من کاتێ شەپۆلە وردەکانی ئاوی دەریاچەی جەلیلەم تەماشا دەکرد، بەبیرم هاتەوە کە دەیانگوت عیسا بەبێ بەلەم و گەمییە، واتە بەپێ، بەسەر ئەو ئاوی دەریاچەیەدا تێپەڕیوە، بەبێ ئەوەی نقوم ببێت. لەو ڕۆژە هەتاوەدا کە ئاوی دەریاچەکە بە ڕەنگی نیلی دەردەکەوت، ئەو ڕووداوەم بەلاوە مەحاڵ بوو. پاشان زانیم کە دوو سەوڵ لێدەرەکەی گەمییەکە خەڵکی ئەو ناوچەیەن و بە دڵنیاییەکی زۆرەوە عیسایان بینیوە و، کەوتمە ئەو خەیاڵەی کە لەبارەی عیساوە پرسیاریان لێ بکەم.

لێم پرسین: ئایا ئێوە عیساتان، لەو کاتەی کە لە لێواری ئەم دەریاچەدا بانگەوازی بۆ خەڵك کردووە و وتاری بۆ داون، بینیوە؟

دوو سەوڵ لێدەرەکە سەیرێکی یەکتریان کرد و ئینجا یەکێکیان گوتی: کابرای بێگانە، تۆ مەبەستت لەم پرسیارە چییە و دەتەوێ چی بزانی؟

گوتم: کاتێ ئەویان لەخاچ دا، من لەوێ بووم و ئەوم بە خاچەوە بینیوە و بەخۆم گوت کە ئەم کابرایە شایستەی سزایەکی ئاوا سەخت نەبووە.

ئەو سەوڵ لێدەرەی کە قسەی دەکرد گوتی: عیسا وەکو ئێمە خەڵکی جەلیلە بوو. دانیشتوانی قودس ڕقیان لە دانیشتوانی جەلیلەیە و، ئەگەر عیسا نەڕۆیشتایە بۆ ئەوێ و خۆی نەدایەتە دەستی فەریسییەکان و ڕۆحانییەکانی ئەوێ، ئەوا نەدەکوژرا.

من دیسان پرسیم: ئێوە عیساتان بینیوە یان نا؟

دوو سەوڵ لێدەرەکە دیسان نیگایەکیان ئاڵوگۆڕ کرد و دیاربوو کە دەترسان قسە بکەن. بەڵام دواجار غروری نەژادی ئەوان زاڵ بوو بەسەر ترسیاندا و، ئەو سەوڵ

لێدەرەی کە قسەی دەکرد گوتی: هەڵبەتە کە ئێمە ئەومان بینیوە و چەندین جاریش بینیومانە، جارێکیان پێنج هەزار کەسی لە ئێمە واتە دانیشتوانی ئێرە، گوێمان بۆ قسەکانی گرتبوو و ئەو ڕۆژە عیسا بە پێنج نان و دوو ماسی، پێنج هەزار کەسی تێرنان کرد و هەموومان تێرمان خوارد و، ئەوەش یەکێ لە کارە سەرسوڕهێنەکانی عیسا بوو.

پرسیم: ئەو ڕۆژە چی بە ئێوە گوت؟ من حەز دەکەم لە دەمی تۆوە قسەکانی ئەو ببیستم.

سەوڵ لێدەرەکان بێدەنگ بوون و پاش چەند ساتێك ئەو کابرایەی کە قسەی دەکرد گوتی: خەڵکی سڤیلی وەکو ئێمە ناتوانن ئەو شتانە بڵێینەوە کە ئەو دەیگوتن.

گوتم: مەحاڵە ئێوە نەتوانن بڕێ لە گوتەکانی ئەو بڵێنەوە. ئێوە هەرچەندە عەوام و کەم ئاوەز بن، بەڵام دیسان بەشێ لە گوتەکانی ئەوتان لەبیرە و دەتوانن بۆمی دووبارە بکەنەوە.

سەوڵ لێدەرەکە پاش کەمێك بێدەنگی گوتی: ئێمە ئەو بەشەی گوتەکانی کە لەبیرمان ماوە پێتی دەڵێین، بەڵام ئەوە بزانە کە ئەم وشانە ئەو گوتویەتی نەك ئێمە و، ئێمە تەنیا گێڕەوەی گوتەکانی ئەوین.

پاشان دوو سەوڵ لێدەرەکە بە هاوکاری یەك و بە یەك دەنگ گوتیان: ((هەژارەکان ڕزگاریان دەبێ و مەلەکوت هی ئەوانە. کەسانی بێ ئازار ڕزگاریان دەبێت و زەوی دەبێ بە هی ئەوان. ئەوکەسانەی ستەمیان لێ دەکرێت و خەڵك بە سوکیان دەزانن، ڕزگاریان دەبێت. ئێوە کە گوێتان لە قسەکانی منە ڕزگارتان دەبێت و لە ئاسماندا پاداشتان دەدرێتەوە. هیچ کەسێ ناتوانێ گەورەی هەبێت و هەموو کەسێ دەبێ لەنێوان خودا و گەورەی سەر زەوی، یەك کەس هەڵبژێرێت و، چوونە ژوورەوەی کەسانی دەوڵەمەند بۆ مەلەکوت، گرانترە لە تێپەڕینی وشتر بەناو کونی دەرزیدا)).

دوو سەوڵ لێدەرەکە ئەم وشانەیان بە بێ دوو دڵی و بێ هەڵە و بە پاراوی دەگوت. کاتێ ئەو وشانەیان دەگوتەوە، زۆر بە جۆش و خرۆش دەردەکەوتن و، کاتێ گوتیان کە چوونە ژوورەوەی کەسانی دەوڵەمەند بۆ مەلەکوت گرانتر و دژوارترە لە تێپەڕینی وشتر بەناو کونی دەرزیدا، سەیرێکی سەراپای منیان کرد و بۆئەوەی تێم بگەیەنن کە لەبەرئەوەی من دەوڵەمەندم، ئەوا ناچمە ناو مەلەکوتەوە. شێوەی بەیان

کردنی ئەوان وای نیشان دەدا کە ئەو وشانەیان ئەوەندە دووبارە کردۆتەوە بۆیە بە باشی لەبیریان ماوە.

پاش ئەوەی گوتەکانیان تەواو بوو، گوتم: دیسان لە وتەکانی عیسام بۆ بگێڕنەوە و هەرچەندە زیاتر وتەی ئەوم بۆ بگێڕنەوە، باشترە.

ئەو سەولْ لێدەرەی کە لەسەرەتاوە قسەی کردبوو گوتی: ئێمە شتی ترمان لەبارەی عیسا بەبیر نایەت، چونکە هەر وەکو گوتم ئێمە عەوامین.

گوتم: ئەگەر قسەکانی ئەوتان بەبیردا نایەت، ئەوا دەتوانن لەبارەی خۆیەوە قسە بکەن و بڵێن کە ڕۆحییەتی چۆن بوو و چۆن دەژیا.

سەولْ لێدەرەکە گوتی: عیسا کابرایەکی ڕووخۆش و ئارام و بێ ئازار بوو و، لە ماسی گرتندا وێنەی نەبوو و هەموو شەوێ کە دەچوو بۆ ڕاوەماسی، گەمییەی ماسی گرتنەکەی خۆی پڕ دەکرد لە نێچیر و دەگەڕایەوە. لەکاتێکدا کە هەندێ لە ڕاوچییەکان لە سەرەتای داهاتنی شەو تا بەیانی لە دەریاچەدا دەمانەوە بەبێ ئەوەی بتوانن یەك ماسی ڕاو بکەن. عیسا ئاڕاستەکانی (هەوا) و چۆنییەتی شەپۆلەکانی دەریاچەکەی بەباشی دەناسی و دەیگوت کە دەتوانێ ئەو نەخۆشانەی کە چارەسەر ناکرێن، چاك بکاتەوە. بەڵام ئێمە ئەمەمان ئەزموون نەکرد، چونکە نەخۆش نەکەوتین تا بۆ چارەسەرکردن بچین بۆلای. ئەوەی کە ئێمەی زۆر سەرسام دەکرد ئەوەبوو کە عیسا لە شاری ناصرە دەژیا و، ئەگەرچی ناصرە لە شوێنێکدایە کە زۆر لە دەریاچەی جەلیلەوە دوورە، کەچی عیسا لەبارەی ئاراستەکانی هەوای ئەم دەریاچەیە و شەپۆلەکان و ماسییەکانی ناوی، زانیاری زۆری هەبوو. ئێمە کە لە لێواری ئەم دەریاچەیەدا لەدایك بووین و هەر لێرە گەورە بووین، بەقەدەر ئەو، لەبارەی بایەکان و شەپۆل و ماسییەکان زانیاریمان نەبوو. من چەند پرسیارێکی ترم لەو دوو سەولْ لێدەرە کرد، بەڵام وەڵامێکم نەبیست، واتە ئەوان دەیانگوت زانیاریمان نییە.

پاشان گوتم: لە قودس دەیانگوت کە عیسا لەناو گۆڕ زیندوو بۆتەوە و هاتۆتە دەرەوە و ڕۆیشتووە بۆ جەلیلە، ئایا ئێوە لەوێ لەبارەی ئەمەوە هیچتان نەبیستووە؟

سەولْ لێدەرەکان کە ئەم پرسیارەیان گوێ لێ بوو، بە هێزێکی زیاتر سەوڵیان لێ دەدا و، پاشان ئەو پیاوەی کە قسەی دەکرد گوتی: ئەمانە قسەی منداڵانەن و هەموو کەسێکی ژیر دەزانێ کە مردوو هەرگیز زیندوو نابێتەوە. عیسا کەسێ بوو وەکو ئێمە،

واتە نەوەی ئادەم بوو، ئەگەرچیش وتەی بەنرخی دەگوت و کاری بێ وێنەی دەکرد، بەڵام لە ڕووی جەستەییەوە هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ ئێمەدا نەبوو، نانی دەخوارد و تینوی دەبوو و ئاوی دەخواردەوە و لەکاتی ماندوویەتیدا خەوی لێ دەکەوت و، لەبەرئەوەی وەکو ئێمە لە ڕووی جەستەییەوە کەسێکی ئاسایی بوو، بۆیە مردیش و زیندوو نەبۆتەوە و، تۆ ناتوانی بە پرسیارەکانی خۆت بمانخەیتە داوەوە.

گوتم: من مەبەستم ئەوە نییە بتانخەمە داوەوە بەڵکو دەمەوێ لە دەمی ئێوەوە گوێم لە ڕاستییەکان بێت.

سەوڵ لێدەرەکە گوتی: ئەوشتانەی کە تۆ بیستووتە، دەڵێن گوایە لە کوفرناعوم دەنگی داوەتەوە و، ئێمەش لەبەرئەوەی دانیشتوی تەبەرییەین بۆیە ئەم شتانەمان نەبیستووە.

پاشان ئێمە لە مەجدەلییە نزیك بووینەوە. پێش ئەوەی من مەجدەلییە ببینم، بیستبووم کە ئەوێ شارە. بەڵام پاش ئەوەی گەیشتمە مەجدەلییە زانیم شار نییە، بەڵکو شارۆچکەیە، بەڵام شارۆچکەیەکی ئاوەدان و ناوەندێکی گەورەی دروستکەری ماسی سوێر و دوکەڵاوی. پێش ئەوەی بگەینە مەجدەلییە، شەپۆلی هەوا بۆنی کارگە گەورەکانی دروستکەری ماسی سوێر و دوکەڵاوی گەیاندە لوتمان.

پاش ئەوەی گەیشتینە لێوارەکە، دوو سەوڵ لێدەرەکە کە دیاربوو ڕاوچی ماسیشن، گەمییەکەیان خستە سەر خۆڵەکە و من پارەی کرێکەیانم پێ دان و ماڵئاواییم لێ کردن و، لەکاتێکدا کە گۆچانم دەدا لە زەوی و مریەمی برتیشم لەگەڵ بوو، بەڕێ کەوتین. دۆزینەوەی ماڵی مەجدەلییە لەوێ کێشە نەبوو، چونکە هەموویان ئەویان دەناسی و پرسیارمان لە هەرکەسێ بکردایە، ڕێنوێنییان دەکردین.

کابرایەك بە سواری گوێدرێژێکەوە لە پشتمانەوە گەیشت و، سەیرم کرد دوو سەبەتی گەورە بەڵام بە بەتاڵی وەکو دوو سندووق، بە دوو لای کورتانی گوێدرێژەکەیەوە هەڵواسیوە. دیاربوو ئەو پیاوە سەوزە دەچێنێت و سەوزەی بردووە بۆ بازاڕی شارۆچکەی مەجدەلییە و داویەتی بە سەوزەفرۆش و، بە سەبەتە بەتاڵەکان دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. ئەو پیاوە لەبەرئەوەی بینی من دەشەلم و بە زەحمەت هەنگاو دەنێم، منی سواری گوێدرێژەکەی خۆی کرد و لە پێشی سەبەتە بەتاڵەکانەوە دانیشتم

و، لە کاتێکدا کابرای سەوزەکار لەلایەکمەوە ومریەمی بێرت لە لاکەی ترمەوە بە پێ دەڕۆیشتن، بەرەو ماڵی مەجدەلییە بەڕێ کەوتین.

خاوەنی گوێدرێژەکە زانی کە ئێمە بەرەو ماڵی مریەمی مەجدەلییە دەڕۆین، بۆیە لێم پرسی: ئەو ژنە دەناسی یان نا؟

ئەو پیاوە گوتی: لێرە هەمووی مریەمی مەجدەلییە دەناسن.

پرسیم: ڕاستە کە ئەو ژنە کۆتر فرۆشە؟

پیاوەکە گوتی: بەڵێ بەڵام ئەمڕۆ مریەمی مەجدەلییە پێویستی بە کۆتر فرۆشتن نییە، چونکە ژنێکی دەوڵەمەندە و ئێستەش وەکو حەز و زەوقێك بەردەوامی دەدا بە کۆتر فرۆشتن و، زیاتر کۆترەکان بۆ پەرستگا بەخێو دەکات و، ڕەنگە تۆ بزانی کە بەردەوام ژمارەیەك لە کۆترەکانی لە پەرەستگادا دەبینرێت.

گوتم: لە پەرستگاکانی ڕۆمیشدا کۆتری لێیە.

پیاوە سەوزەکارەکە گوتی: مریەمی مەجدەلییە ئەمڕۆ خاوەنی دوو بێستانی سەوزەیە کە سەوزە یانیش شتی هاوینە دەچێنێت و، لەچەند کارگەیەکی دروست کردنی ماسی سوێر و دوکەڵاویدا پشکی هەیە و، چەند ڕۆژێك لەمەوپێش ڕۆیشتبوو بۆ گەشت، بەڵام تازە بیستوومە کە گەڕاوەتەوە.

پاشان سەیرێکی "مریەمی بێرت"ی کرد و گوتی: ئەم ژنە لە مریەمی مەجدەلییە گەنجترە.

گوتم: من کارم نییە بە گەنجی و پیری مریەمی مەجدەلییەوە و، بۆ مەبەستێکی تر دەمەوێ بیبینم.

کاتێ لە ماڵی مریەمی مەجدەلییە نزیك بووینەوە، هەستم بە ناڕەحەتییەك کرد. ناڕەحەتییەکەی من وەکو ئەوکاتە وابوو کە لە ماڵی لازاروسدا مریەمی مەجدەلییەم بینی. خاوەنی گوێدریژەکە گوتی: دەبینم تووشی ترس بوویت.

گوتم: من تووشی ترس نەبووم، بەڵکو هەست بە ناڕەحەتییەك دەکەم لەناو خۆمدا.

پیاوە سەوزەکارەکە گوتی: تەواوی ئەو کەسانەی لە ماڵی مریەمی مەجدەلییە نزیك دەبنەوە، ئاوان و منیش حەز ناکەم نزیك ببمەوە لە ماڵەکەی و، لەبەرئەوەی

ماڵەکەی دەبینی، بۆیە باشتر وایە لەسەر گوێدرێژەکەی من دابەزیت تا من بڕۆم و، تۆ ئەو ڕێگایەی کە ماوتە، بەپێ بڕۆ تا دەگەیتە ماڵەکەی.

من لەسەر گوێدرێژەکە دابەزیم و پیاوە سەوزەکارەکە سواری گوێدرێژەکە بوو و بە خێرایی غاری دەدا بۆئەوەی لەو سنوورە دوور بکەوێتەوە.

مریەمی بێرت پێی گوتم: باشتروایە ئێمەش لێرە دوور بکەوینەوە.

پرسیم: بۆچی؟

ئەو گوتی: بۆئەوەی تیشکی هەتاو نارەحەتم نەکات و، هەرچەندە ڕوخساری خۆم داپۆشیوە کەچی بە تیشکی هەتاو ئازار دەچێژم.

گوتم: مریەمی بێرت، ئێمە کە تا ئێرە هاتووین، نابێ بگەڕێینەوە و دەبێ مریەمی مەجدەلییە ببینین.

هەرزوو گەیشتمە دەرگای ماڵەکەی مریەمی مەجدەلییە و سەیرم کرد دەرگاکە کرایەوە. ئێمە بۆ ژوورەوە هەنگاومان نا و سەیرمان کرد ژنێك لە ناوەڕاستی حەوشە پان و بەرینەکەدا ڕاوەستاوە و، سەرقاڵە بە داکردنی دانەوێڵە بۆ کۆترەکان. ژمارەیەکی زۆری کۆتر لە دەوروبەری ژنەکەدا دەبینران و هەندێکیان لەسەر دەست یانیش لەسەر شانەکانی دەنیشتنەوە. من هەرکە ئەو ژنەم بینی کە جلی ڕەشی لەبەردا بوو، ناسیم و زانیم مریەمی مەجدەلییەیە، بەڵام ئەو ژنە ئەوەندە سەرقاڵ بوو بە پێدانی دانەوێڵە بە کۆترەکان کە ئێمەی نەبینی، تاکو نەختێك بەناو حەوشەکەدا ڕۆیشتین و ئەو کاتە چاوی ژنەکە کەوتە سەر ئێمە و هەرچی دانەوێڵەی پێ بوو، ڕژاندییە سەر زەوی و کۆترەکانی لە شانەکانی خۆی دوور خستەوە و بەرەو ڕووی ئێمە هات.

مریەمی مەجدەلییە کاتێ بەرەو ڕووی ئێمە دەهات، خۆشحاڵ دیاربوو و گوتی: ئەمڕۆ وا هەستم دەکرد کەسانێك لە ڕێگادان و دێن بۆماڵی من، بەڵام نەمدەتوانی پێشبینی بکەم کە یەکێ لەوانە مەزن تیوسی ڕۆمییە وئەوی تریان مریەمی بێرت.

کاتێ مریەمی مەجدەلییە لێم نزیك بوویەوە، بەجۆرێك نیشانەی شادومانی لە چاوەکانیدا بەدی دەکرا کە دەمویست لە بەرامبەریدا چۆك دابدەم و پێیەکانی ڕابموسم، چونکە پێشبینیم نەدەکرد دیداری من ئەوەندە ئەو ژنە خۆشحاڵ بکات.

پێم گوت: مریەمی مەجدەلییە، چاکەت بە نسیب بێت.

مریەمی مەجدەلییە ئیمەی لە حەوشەکەوە برد بۆناو باخەکەی خۆی کە لە تەنیشتی حەوشەکەدا بوو. لەو باخەدا ئیمەی لە ساباتێکدا دانیشاند. ئینجا ڕۆیشت و تەشتێك و جامێ ئاوی هێنا و بەدەستی خۆی پێیەکانی منی شوشت و بە پارچە قوماشێك بۆی وشك کردمەوە. پاشان لە مریەمی بێرت نزیك بوویەوە و پێیەکانی ئەویشی شوشت و وشکی کردەوە. ئینجا جامێ ئاوی ساردی بۆ هێناین بۆئەوەی بیخۆینەوە و تینویەتیەکەمان بشکێنین.

پاش ئەوەی ئاومان خواردەوە، بەشێوەی گاڵتە ئامێز و بەشێوەیەك کە نەبێتە هۆی ڕەنجاندن، بە مریەمی بێرتی گوت: ئەی کچی دێوانە، بڕۆ بە کۆترەکانی من ڕابگە و بە تەنیا جێمان بهێڵە.

مریەمی بێرت لە کەپرەکە چووە دەرەوە و مریەمی مەجدەلییە پێی گوتم: مەزن تیوس، ئایا ئەو جلوبەرگە گرانبەهایەی کە مریەمی بێرت لەبەریدایە تۆ بۆت کڕیوە؟

گوتم: بەڵێ.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: مەزن تیوس، پیاوێکی وەکو تۆ نابێ لەگەڵ ژنێکی وەکو مریەمی بێرت ببێتە هاوڕێ و، تۆ لەوە گەورەتری کە لەگەڵ ژنێکی لەم جۆرە ببیتە دۆست.

گوتم: مریەمی مەجدەلییە، من دۆستایەتیم لەگەڵ ئەم ژنەدا نییە و تەنیا لە ڕووی بەزەییەوە پۆشاکم بۆکڕیوە.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: ئەگەرچی مریەمی بێرت ژنێکی تۆبەکارە، بەڵام من بە چاوەکانیدا دەزانم کە هێشتا هەست و ئارەزوی بێدارە و دەیخاتە وەسوەسەوە و، لەبەرئەوەی بەردەوام لە وەسوەسەی هەواوهەوەسی خۆیدایە، ڕەنگە داوا لە تۆ بکات تووشی گوناح ببیت لەگەڵی، ئایا تا ئێستە شتێکی وای لە تۆ داوا نەکردووە؟

گوتم: بۆ نا، بەڵام من داواکەیم پەسەند نەکرد.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: مەزن تیوس، ژنانی وەکو مریەمی بێرت نازانن کە ڕەنگە پیاوێکی گەنج لە ڕووی بەزییەوە هاوکاری ژنێك بکەن، بەڵکو ئەوان وا بیر دەکەنەوە کە هەر پیاوێك هاوکاری ئەوان دەکات، بۆئەوەیە کە لەگەڵ ئەواندا تووشی تاوان بێت و باشتر وایە ئەم ژنە لە خۆت دوور بخەیتەوە.

گوتم: لەبەرئەوەی من خۆم بە قەرزاری ئەم ژنە دەزانم، بۆیە تاکو ئێستە لە خۆم دوور نەخستۆتەوە، چونکە پاش ئەوەی چووم بۆ شاری تەبەرییە، ئەم ژنە بە دڵسۆزییەوە پەرەستاری لیٚ کردووم بۆیە ویژدانم قبوڵی نەکرد لەخۆمی دوور بخەمەوە.

مریەمی مەجدەلییە پرسی: چی بووە کە تۆ ئەم ژنەت لەگەڵ خۆت هێناوە بۆئێرە؟

گوتم: دەنگوباس وایە کە عیسا لە گۆڕدا زیندوو بۆتەوە و لەمەنزڵگاکەی[59] هاتۆتە دەرەوە، پاشان هاتووە بۆ ناوچەی جەلیلە.

من بڕیارم دا بێم بۆ ئێرە تا بەڵکو عیسا ببینم و، مریەمی بێرتیش کە دەیوست بێت بۆ ئێرە، داوای لە من کرد ببێتە هاوگەشتم و پیاو و ژنێکی تریش بەناوەکانی ناتان و سوزمان لەگەڵمان هاتن، بەڵام پاش ئەوەی گەیشتینە تەبەرییە، لێمان جیابوونەوە.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: من سوزمان دەناسم.

گوتم: مریەمی مەجدەلییە، من پێموایە تۆ یەکێکیت لە قوتابییە نزیکەکانی عیسا، چونکە تۆ یەکەمین کەسیت کە پاش ئەوەی عیسا زیندوو بوویەوە، لەکاتی هاتنە دەرەوە لەناو گۆڕ، ئەوت بینیوە و بەم هۆیەوە ڕەنگە لێرەشدا ئەوت بینیبێت. ئێستە من لێت دەپرسم کە ئایا لێرە دەتوانین بە دیداری عیسا شاد بین یان نا؟

مریەمی مەجدەلییە گوتی: بەداخەوە کە من هێشتا ئەوم لێرە نەبینیوە. من لە قودس کاتیٚ عیسا ڕێگەی ناوچەی جەلیلەی گرتەبەر، هاتم و خۆم گەیاندە ئێرە تا ئەو ببینم. بەڵام عیسا خۆی بە من پیشان نەدا. مەزن تیوس، تۆ لەگەڵ هەندیٚ لە قوتابییەکانی عیسا قسەت کردووە و دەزانی ئەوان چۆنن و چەندە ڕژدن لە گواستنەوەی ئەو زانیارییە دەستوورییانە بۆ خەڵك کە عیسا بەوانی گوتووە. من بیستومە کە ڕۆژیٚ لێرە واتە ڕۆخی دەریاچەی جەلیلە، کاتیٚ قوتابییەکانی عیسا بە ماسی گرتنەوە سەرقاڵ بوون، مەسیح خۆی بەوان نیشان داوە و، ئەوان ئێمەیان لەبیر

---

[59] نووسەر بۆیە وشەی (مەنزڵ)ی بەکارهێناوە چونکە گۆڕی ئەو سەردەمەی جوولەکەکان وەکو مەنزلێك وابووە لەژێر زەویدا کە پێك هاتووە لە دوو ژوور، ژوورێکیان مردووەکەیان تێدا داناوە و ژوورەکەی تر وەکو مەدخەل یان سەرەتایەك بووە بۆ چوونە ژوورەوە بۆلای مردووەکە.(و. کوردی)

نەبووە و داوایان لە مەسیح نەکردووە کە خۆی بە ئێمە پیشان بدات و، خۆشحاڵ بوون کە ئەو ڕۆژە سەدوپەنجا ماسی گەورەیان گرتووە.

پاشان مریەمی مەجدەلییە لەناکاو پەرێشان بوو و، بۆ عیسا دووا و گوتی: ئەی مامۆستای مەزن، بەبێ بوونی تۆ دنیا تاریکە و تیشکی خۆر ناتوانێ دنیا ڕووناك بکاتەوە. خۆت بە ئێمە پیشان بدە تا جوانیی تۆ دنیا ڕووناك بکاتەوە. ئەی فێرکەری مەزن، من لە باسکردنی تۆ زۆر دەترسم و، لەوە دەترسم وەسوەسەی گوناح لە مندا دروست ببێت، بەڵام ئەگەر تۆ ببینم و دەنگت ببیستم، دەزانم کە وەسوەسەی تاوان لەمندا دروست نابێت.

گوتم: مریەمی مەجدەلییە، ئەگەر عیسا پاش زیندوو بوونەوە هاتبێت بۆ جەلیلە، ئەوا بە ئەگەرێکی زۆرەوە تۆ ئەو دەبینیت و دەنگی دەبیستیت، چونکە تۆ یەکێك بوویت لە قوتابییە تایبەت و نزیکەکانی ئەو و، بەدڵنیاییەوە مامۆستای مەزن، تۆ لە دیداری خۆی بێبەش ناکات. بەڵام من ئومێدم نییە ئەو ببینم و دەزانم بەو جۆرەی کە قوتابییەکانی منیان لە خۆیان دوور خستەوە و ئامادە نەبوون لە زانیاریەکانی مامۆستای مەزن بەشدارم بکەن، ئەویش حەز بە چارەم ناکات.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: مەزن تیوس، ئەگەر تۆ بڕوات بە مەسیح هەیە، ئەم قسەیە مەکە. ئەگەر تۆ بڕوات بەو هەبێت، ئەو تۆ دەباتە ناو مەلەکوتی خۆیەوە و دەبیتە خاوەنی ژیانێکی هەمیشەیی.

گوتم: مریەمی مەجدەلییە، من زۆر حەز دەکەم بزانم ژیانی هەمیشەیی هەیە یان نا. کاتێ بۆ گەیشتن بە ناوچەی جەلیلە گەشتمان دەکرد، سوزمان لە ڕێگادا پێی گوتم ((ڕەمزی ژیانی هەمیشەییم لەو بیستووە)). من لە سوزمانم پرسی ئەو ڕەمزەی ژیانی هەمیشەیی چییە کە لە عیسای بیستوە، بەڵام وەڵامی نەدامەوە. سوزمان یان نەیدەتوانی وەڵامی من بداتەوە یانیش نەیویست ڕەمزی ژیانی هەمیشەیی بەمن بڵێت. ئێستە تۆش لەبارەی ژیانی هەمیشەییەوە قسەت کرد، بۆیە پێم بڵێ کە ژیانی هەمیشەیی چییە؟

مریەمی مەجدەلییە گوتی: منیش ناتوانم پێت بڵێم کە ژیانی هەمیشەیی چییە. هەر ئەوەندە دەزانم کە ژیانی هەمیشەیی ژیانی ئەم دنیایە نییە و، جگە لەمە زانیاریم لەبارەی ئەوەوە نییە و دەبێ عیسا خۆی بڵێت کە (ژیانی هەمیشەیی) چییە.

گوتم: مریەمی مەجدەلییە، کەواتە من ئومێدم هەبێت کە لەلایەن عیساوە پەسەند بکرێم و، ئەو من دەباتە مەلەکوتی خۆیەوە؟

مریەمی مەجدەلییە گوتی: ئەگەر تۆ بڕوات بەو هەبێت، هەرچەندە خەڵکی ڕۆمیشیت، ئەوا هەر دەتباتە مەلەکوتی خۆیەوە و لەژیانی هەمیشەی کە جیاوازە لە ژیانی کورتی سەر زەوی، بەشدار دەبیت.

من ئەوەندە بەو موژدەیە خۆشحاڵ بووم کە لەژێر کەپرەکە هەستامەوە و چەند هەنگاوێکم نا، بەڵام ئازاری پێ، وای لێ کردم بووەستم.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: کاتێ هاتی بۆ ماڵەکەی من، بینم گۆچانت بە دەستەوەیە و دەشەلیت، ئێستەش دەبینم بە زەحمەت هەنگاو دەنێیت.

گوتم: پاش ئەوەی لە تەبەرییە نەخۆش کەوتم، قاچم ئازاری پێ گەیشت و (تا)کەم نەما و لەسەر جێگاکەم هەستامەوە، بەڵام ئازاری قاچم مایەوە و ئێستە ناتوانم بەبێ گۆچان بڕۆم لەڕێ.

مریەمی مەجدەلییە پرسی: کوێی قاچت ئازاری هەیە؟

گوتم: هەموو ئەم شوێنانەم دێشێت و پێموایە هەرگیز چاك نابێتەوە.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: کابرای ڕۆمی، تۆ بە ڕاستی بڕوات بە عیسا هەیە؟

گوتم: بەڵێ، بە ڕاستی بڕوام پێی هەیە.

مریەمی مەجدەلییە لێم نزیك بوویەوە و دەستی خستە سەر ئەو قاچەم کە ئازاری هەبوو و گوتی: ئەی ئەو عیسایەی کە نێردراوی خودایت، من ژنێکی گوناهکارم کە قسەت لەگەڵ دەکەم، بەڵام ئەم پیاوە ڕۆمییە بڕوای بە تۆ هەیە و ر بەزەیی پێدا بێتەوە و ئازاری قاچی لەناو ببە و قاچی بگەڕێنەوە دۆخی جارانی کە ساق بوو تا بەهۆی ئازارەوە نەناڵێنێ.

مریەمی مەجدەلییە هەر سەیری منی دەکرد و دەستی دەهێنا بە قاچمدا و، من هەستم دەکرد نیشانەی چاکەکاری لەناو دەستیدا هەیە و، پاش ئەوەی بۆ جاری سێیەم ئەو وشانەی گوت، هەستایەوە و پێی گوتم: بڕۆ لەڕێ.

من بە هاوکاری گۆچانەکەم هەنگاوێکم نا و چاوەڕێی ئازاری قاچم دەکرد، بەڵام زانیم کە ئازاری قاچم نەماوە، ئینجا سێ هەنگاوم نا و هیچ نیشانەیەکی ئازارم هەست

پێ نەكرد، گۆچانەكەم لابرد و بەبێ گۆچان هەنگاوم نا، بەڵام دیسان هەستم بە ئازار نەكرد و بە شادومانییەوە گوتم: مریەمی مەجدەلییە ئازاری قاچم نەما.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: شادومانی ڕاستەقینەی تۆ وا نیشان دەدات كە چارەسەر بوویت و ئیتر ئازارت نییە.

گوتم: شادومانی من بۆئەوە نییە كە ئازارم نەماوە، بەڵكو چارەسەر بوونی نەخۆشیەكەم بەهۆی خۆشەویستی عیسا بەرامبەر بەخۆم دەزانم و، ئەگەر نەیویستایە گوێم پێ بدات و، خۆشی نەویستمایە منی چارەسەر نەدەكرد.

مریەمی مەجدەلییە پێی گوتم: زیاتر بڕۆ لەرێ و بەتوندی پێی خۆت ڕابتەكێنە تا دەربكەوێ نیشانەی ئازارەكەی ماوە یان نا.

من بە خێرایی دەڕۆیشتم لەڕێ و ئینجا ڕام كرد و پاشان ڕاوەستام و، پێی خۆم بەتوندی ڕاتەكاند، بەڵام هیچ جۆرە ئازارێكم هەست پێ نەكرد و وەك ئەوە وابوو كە هەرگیز لاقم ئازاری نەبووە.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: چارەسەربوونی قاچت بەڵگەی ئەوەیە كە عیسا تۆی پەسەند كردووە بۆ مەلەكوتی خۆی و، ئەگەر ڕقی لەتۆ بووایە و نەیویستایە پەسەندت بكات بۆمەلەكوتی خۆی، ئەوا قاچت چاك نەدەبوویەوە.

من بەهۆی چارەسەربوونی ئازاری قاچم ئەوەندە خۆشحاڵ بووم كە نەمدەتوانی وەڵام بدەمەوە. من گومانم نەبوو لەوەی كە شیفای من بەهۆی مۆجیزەی عیساوەیە، چونكە ئازارێكی توند، بەو جۆرە بەیەكجاری لەناو ناچێت، بەڵكو وردە وردە لەناو دەچێت. هیچ پزیشكێكی بەتوانای شارەزا ناتوانێ ئازارێكی توند كە هی نەخۆشییەكی كۆنە، بە یەكجاری لەناو ببات و تەنیا یەك مۆجیزە دەتوانێ ئەو ئازارە بە چركەیەك لەناو ببات.

بەمریەمی مەجدەلییەم گوت: بچوكترین نیشانەی ئازار لە قاچمدا نییە و ئێستە من وەكو ئەو كاتەی كە نەخۆش نەبووم، ساقم.

مریەمی مەجدەلییە چەمایەوە و گۆچانەكەی منی هەڵگرت كە كەوتبووە سەر زەوی و گوتی: لە ئێستەوە ئیتر پێویستت بەم گۆچانە نییە.

گوتم: نا، دڵنیام تا ڕۆژێ كە زیندووم پێویستم بە گۆچان نابێ.

پاش ئەم قسانە، ئێمە لە کەپرەکە هاتینە دەرەوە و مریەمی مەجدەلییە منی برد بۆ لای کۆترەکانی خۆی و پێیانی نیشان دام. ئینجا گەڕاینەوە بۆ ماڵەکەی و چووینە ژوورەوە و سەیرم کرد ژوورەکانی مریەمی مەجدەلییەدا کەلوپەلی ناوماڵی گرانبەهای تێدایە.

مریەمی مەجدەلییە پێی گوتم کە لەکۆندا پەیکەر و وێنەگەلێکی زۆر لە ماڵەکەیان هەبووە، بەلام پاش ئەوەی گۆڕاوە بۆ ژنێکی باوەڕدار، ئەو پەیکەر و وێنانەی کە دوورن لە یاسای ئایینی، لە ماڵەکەی نەیهێشتوون، چونکە بەپێی ئەو بڕوایە نابێ پەیکەری شتێك دروست بکرێ و نابێ وێنەی مرۆڤ و گیانداران دروست بکرێت.

کاتێ گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، مریەمی بێرت هات بۆلامان و مریەمی مەجدەلییە گوتی: مەزن تیوس، کاتی نانخواردنە و تۆ دەبێ لێرە نان بخۆی.

گوتم: مریەمی مەجدەلییە، من بۆ نانخواردن نەهاتووم بۆ ئێرە و نامەوێ ببمە مایەی زەحمەت بۆ تۆ.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: تۆ نابیتە مایەی زەحمەت بۆ من. پاشان منی لەسەر مێزەکە دانیشاند و ئاوی هێنا تا دەستەکانم بشۆم.

پاش ئەوەی دەستەکانم شوشت و وشکم کردەوە، مریەمی مەجدەلییە گوتی: نەریتی ژنانی جوولەکە وایە کە لەگەڵ پیاوان نان ناخۆن و یەکەم جار پیاوان نان دەخۆن ئینجا ژنان دەست بە نانخواردن دەکەن. ئەمڕۆش ئێمە وا ڕەفتار دەکەین و پاش ئەوەی تۆ نانت خوارد، ئینجا من و مریەمی بێرت نان دەخۆین.

ئینجا مریەمی مەجدەلییە نان و سەوزە و پەنیری سوێر و دەفرێ شەربەتی هێنا. پاش ئەوەی کەمێك پەنیرم خوارد و قومێ شەربەتم خواردەوە، مریەمی مەجدەلییە ماسی برژاوی بۆ هێنام، ئینجا ئەو خواردنەی کە بە گۆشتی کۆتر لێی نابوو، پێی خواردم. ئەو ماسییە برژاوە و ئەو گۆشتە کۆترەی کە ئەو ڕۆژە مریەمی مەجدەلییە پێی خواردم، خواردنێ بوو کە بە خودایان دەدرێت و لە هەموو تەمەنمدا خواردنی ئەوەندە بەتامم نەخواردبوو.

گوتم: مریەمی مەجدەلییە، تۆ چی دەکەی کە خواردنەکانی تۆ ئەوەندە بەتام دەبێ.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: مەزن تیوس، چێشت دروستکردن زانستێکە و دەبێ فێری ببی تا بتوانی خواردن بەباشی لێ بنێیت. ئەو کەسانەی لە زانستی چێشت دروستکردن نازانن، ئەو نیعمەتانەی کە خودا دەیدا بە بەندەکانی، بە فیڕۆی دەدەن و مرۆڤ بێزار دەکەن لە نانخواردن، بەلاّم ئەوانەی لە زانستی خۆراك دەزانن، لەبەرئەوەی کە دەتوانن بە نیعمەتەکانی خوا خواردنی خۆش دروست بکەن، ئەوا شوکری نیعمەتی خوا بەجێ دێنن و، چێشت دروستکردنی خۆش، سوپاسکردنی خودایە.

من هەرچەندە زۆرم لە مریەمی مەجدەلییە کرد نانم لەگەڵ بخوات، پەسەندی نەکرد. بەلاّم پاش ئەوەی من تێرم خوارد، ئەو و مریەمی بێرت لەسەر زەوی، لە پشت مێزەکەوە دانیشتن و دەستیان بە نانخواردن کرد. مریەمی مەجدەلییە بزەیەکی کرد بۆ مریەمی بێرت و من زانیم کە ئەو زەردەخەنەیە نیشانەی میوانداریکردنی مریەمی مەجدەلییەیە و، لەبەرئەوەی مریەمی بێرت میوانی ئەوە، بۆیە زەردەخنەی بۆ دەکات ئەگینا بۆچوونی سەبارەت بەو ژنە باش نییە.

مریەمی بێرت گوتی: من زۆر حەزدەکەم ببمە هاوڕێیەکی گیانی بەگیانی ئیبلیس و ببمە شەریکی، بۆئەوەی بتوانم پێداویستی ژیانێکی باش بۆ خۆم فەراهەم بکەم.

مریەمی مەجدەلییە بە پشتی دەستی دای بەدەمیدا و گوتی: ئەی کچی شێت، وس بە و ئەو جۆرە قسانە مەکە.

مریەمی بێرت دەستی بە گریان کرد و مریەمی مەجدەلییە گوتی: مریەمی بێرت من داوای لێبوردن لە تۆ ناکەم، چونکە لە ڕقدا نەمکێشا بە دەمتدا بەڵکو بۆئەوە کێشام بە دەمتدا تا ئاگادارت بکەمەوە و، حەز دەکەم تۆ باش بیت و پاش ئەمە نەگەڕێیتەوە سەر کرداری پێشووت. هەرگیز بیر لەوە نەکەیتەوە ببیتە شەریکی ئیبلیس، چونکە شەریك بوون لەگەڵ ئیبلیسدا دەبێتە هۆی گەندەڵی ڕۆح کە زۆر خراپترە لە گەندەڵی جەستەیی. جەستە ئەگەر گەندەڵ بێ، عەزاب نادرێ، چونکە ئەو کە لەناو دەچێ، تووشی عەزاب نابێ. بەلاّم ڕۆح پاش ئەوەی گەندەڵ بوو، تووشی عەزابێکی بەردەوام دەبێ، چونکە ڕۆح هەرگیز لەناو ناچێت و، تۆش ئەی مریەمی بێرت دەبێ هەموو ڕۆژێك داوا لە خودا بکەی کە لە شەریکیی ئیبلیس بتپارێزێ و هەرگێز شەیتان نەتوانی زاڵ ببێ بەسەر دەروونتدا.

بەڵام تۆ لەجیاتی ئەوەی لە شەریکی ئیبلیس پەنا بەخودا بگری، کەچی لە دڵەوە ئارەزوو دەکەیت لەگەڵ شەیتاندا ببیت بە شەریك تا بە هاوکاری ئەو بتوانی دیاری گرانبەها لە پیاوان وەربگریت. وەسوەسەی تووش بوون بە گوناه لە تۆدا ئەوەندە بەهێزە کە ئەمڕۆ لێرەدا ئەم ئارەزووەت هێنا بە دەمتدا و، تەنانەت شەرمت لەو پیاوە ڕۆمییە نەکرد کە چاکەی لەگەڵ کردوویت کە تۆی هێناوە بۆ ئێرە. ئەم پیاوە تۆی هێنا بۆ ئێرە کە ڕەنگبێ بتوانێ لێرە عیسا ببینێ و بە تەواوی پاك ببێتەوە، بەڵام تۆ بە دڵێکی پڕ لە وەسوەسەی گوناهەوە هاتووی بۆ ئێرە و، چاوەکانی تۆ گەواهی دەدەن کە ئەگەر دەرفەتت بۆ بڕەخسێ، ئەوا دەست لەگوناه کردن هەڵناگری.

من زانیم کە مریەمی بێرت سەیری من ناکات و دەترسێ لەوەی سەیری من بکات. دڵم بەحاڵێ دەسوتا، بەڵام نەمدەتوانی بەر لە سەرزەنشتکردنی مریەمی مەجدەلییە بگرم.

لەبەرئەوەی خواردنی مریەمی مەجدەلییە و مریەمی بێرت تەواو ببوو، مریەمی مەجدەلییە لەجێی خۆی هەستایەوە و گوتی: خۆت یەکلایی بکەرەوە و بڵێ لە ئێستە بەدواوە چ ڕێگەیەك هەڵدەبژێری. ئایا دەتەوێ ببیتە شەریکی ئیبلیس و وەکو جاران تووشی گوناه ببیت یان دەتەوەێ ڕێگەی ڕاست بگریتەبەر و لەگوناه دوور بکەویتەوە و هەمیشە باوەڕدار بیت؟

ئەگەر ڕێگەی یەکەم بگریتەبەر، لە دنیادا، ئەویش تەنیا لە سەردەمی گەنجێتیدا، لە ڕووی خواردن و خواردنەوە و جلوبەرگەوە ئاسوودە دەبیت، بەڵام ڕۆحت تووشی عەزابی هەمیشەیی دەبیت. ئەگەریش ڕێگەی دووەم بگریتەبەر، ئەوا هەرچەندە ڕەنگە لە ڕووی خواردن و خواردنەوە و جلوبەرگەوە زۆر بەخۆشی کات بەسەر نەبەیت، بەڵام لە بەرامبەردا بەختەوەرییەکی هەمیشەییت دەبێ. ئێستە بڵێ کام یەك لەم دوو ڕێگایە هەڵدەبژێری؟

مریەمی بێرت گوتی: من ئارەزووم ئەوەیە وەکو تۆ لە گوناهەکانم ببووردرێت و، ئیتر ژنێکی گوناهکار نەبم و ئەو تەمەنەی کە ماوەمە، بە بڕوا بیبەمە سەر.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: ئەگەر تۆ ژنێکی ڕاستگۆیت و دەتەوێ ڕزگارت ببێ، هەستە و ئەم پۆشاکە جوانەی کە ئەم پیاوە ڕۆمییە بۆی کڕیویت، لەبەرت دایکەنە و ئەو پۆشاکەی کە من پێت دەدەم لەبەری بکە و، لەم ماڵە بمێنەرەوە و ئاو و دانەوێڵە

بدە بە کۆترەکانی من و چاودێری بێستانەکەم بکە. تۆ لێرە برسیت نابێ و بەردەوام بۆ پاراستنی جەستەت لە گەرما و سەرما، پۆشاکت هەیە. ئەوکاتە ڕەنگە عیسا بەزەیی پێتدا بێتەوە و لە گوناهەکانت خۆش ببێت و بتباتە مەلەکوتی خۆیەوە.

مریەمی بێرت بە سەرسوڕمانەوە گوتی: من لەم ماڵە بمێنمەوە و خزمەتکاری تۆ بم؟

مریەمی مەجدەلییە بە توڕەییەوە گوتی: مریەمی بێرت، تۆ چارەت نییە جگە لەوەی کە من دەیڵێم، ناشهێڵم تۆ لەگەڵ ئەم پیاوە ڕۆمییەدا بژیت و وەکو خۆت ئەو ببەیت بەرەو ڕۆخی زەلیلی.

کاتێ مریەمی بێرت ئەم قسەیەی بیست، ڕەنگ بە ڕووخساریەوە نەما و، ئەوکاتە من زانیم کە قسەکەی مریەمی مەجدەلییە کاری کردۆتە سەر ئەم ژنە.

مریەمی بێرت کە هەر بەردەوام بوو لە گریان، هات بۆلای من و داوێنی گرتم و گوتی: مەزن تیویس، ئەم ژنە دەیەوێ بمکات بە خزمەتکار و بێستانەوانی خۆی و ڕەنگە بە کەنیزەیی بمفرۆشێ و، تۆ نازانی ئەم ژنە چەندە سەختگیر و بێ بەزەییە و، ئەگەر لە خەڵکی تر بپرسی ئەوا پێت دەڵێن کە لە کۆندا هەرگیز بەزەیی بە خزمەتکار و کەنیزەی خۆی نەکردووە.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: ئەگەر تۆ کەمێك ئەزموونت هەبووایە، دەتزانی کە دەبێ لەم پیاوە ڕۆمییە دوور بکەویتەوە، چونکە ئەگەر تۆ لەگەڵ ئەم پیاوە ڕۆمییەدا تووشی گوناە ببیت، جگە لەوەی کە ئەوت گوناهبار کردووە، ئەوا بێزاری دەکەیت و لەوەبەدواوە ئەم پیاوە حەزناکات سەیرت بکات. کەواتە تا لەبەرچاوی نەکەوتووی، لێی جیابەرەوە و تا هەرکاتێ یادی تۆ دەکات، بە باشە باست بکات.

کاتێ مریەمی بێرت سەیری کرد من بێدەنگیم کردووە و ئامادە نیم قسەیەك بکەم بۆ پشتگیری کردنی بۆچوونەکەی، داوێنی بەردام و ئیتر نەگریا و گوایە ئامادە بووە لە ماڵی مریەمی مەجدەلییە بمێنێتەوە.

مریەمی مەجدەلییە پێی گوت کە بڕوات و ڕوخساری بشوات و شوێنەواری گریانی پێوە نەهێڵێت و، پاش ئەوەی کە ڕۆیشت، بە منی گوت: مەزن تیوس، ئەم ژنە گەنجە و تۆش گەنجیت و، ژیانی پیا و ژنێکی گەنج بە یەکەوە، لە دواییدا تووشی گوناهیان دەکات. تۆ ئەگەر بتەوێ لەگەڵ ئەم ژنەدا بژیت، وەکو ئەوە وایە کە بەردێك بە

گوریسێکەوە ببەستن بە ملتەوە و بتخەنە دەریاچەی جەلیلەوە و، ئەوکاتە بە دڵنیاییەوە نقوم دەبیٚ و لەناو دەچیٚ.

گوتم: من نامەویٚ لەگەڵ ئەم ژنە بژیم و، ئەوەش ئەوە، کە دەیویست من تووشی گوناه بکات، بەڵام من داخوازییەکەیم پەسەند نەکرد. کاتیٚ سوزمان و ناتان ڕۆیشتن، من بە نەخۆشی لە جێگا کەوتم و ئەگەر نەخۆش نەکەوتمایە، ئەم ژنەم لە خۆم دوور دەخستەوە. بەڵام لەبەرئەوەی نەخۆش کەوتم، نەمتوانی لە خۆمی دوور بخەمەوە و پاش هەستانەوەم لە نەخۆشییەکەم، بە دوور لە پیاوەتیم زانی کە مریەمی بێرت لە خۆم دوور بخەمەوە. من دەمزانی کە ئەم ژنە دەبیٚ لە من جیا ببێتەوە، چونکە ئەگەر لەمە زیاتر لەگەڵ من بژییێت ڕەنگە هێزی بەرگری من تێك بشکێنیٚ و تووشی گوناهم بکات. من لەبیری ئەوەدا بووم کە چۆن لە خۆمی دوور بخەمەوە بەڵام هیچ ڕێگەیەکم نەدەدۆزیەوە. بۆیە خۆشحاڵم کە تۆ پێشنیارت کرد لەم ماڵەدا بمێنێتەوە و، هیوادارم تۆ بەباشی پارێزگاری لیٚ بکەیت و، پاش ئەوەی مریەمی بێرت لە من جیا بوویەوە، من دەتوانم بەبیٚ بەربەست بگەڕێم بە دوای عیسادا و پەیدای بکەم.

مریەمی مەجدەلییە بریٚ سەیری کردم و پاشان پرسی: مەزن تیوس، ئامانجی تۆ چییە لە ژیاندا و، چی بە بەختەوەری دەزانی؟

گوتم: مریەمی مەجدەلییە، من لە خانەوادەیەکی دەوڵەمەند لەدایك بووم و لەبەرئەوەی دەیانتوانی بمخەنە بەر خوێندن، بۆیە خوێندنم تەواو کرد و لە (ئەنتاکیە) زمانە بیانییەکان فێربووم و ئینجا ڕۆشتم بۆ زانکۆی رودس و لەویٚ (لۆژیك و واتاکان و، باس و فەلسەفە)م خوێند. پاش ئەوەی لە زانکۆی رودس دەرچووم، پێم وابوو کە ئارەزوی من ئەوەیە کە وەکو نووسەر(منشی)[٦٠] لای یەکیٚ لە حاکمەکانی مەملەکەتەکانی خۆرئاوای ئیمپراتۆری ڕۆم سەرقاڵی کار بم یانیش بچمە خزمەتی یەکیٚ لە گەورەکانی ڕۆم و ببمە فەیلەسوفی تایبەتی ئەو، چونکە هەندیٚ لە گەورەکانی ڕۆم فەیلەسوفی تایبەتی خۆیان هەیە.

بەڵام پاش ئەوەی کە گەڕامەوە بۆ ڕۆم، زانیم کە بوون بە فەیلەسوفی تایبەتی یەکیٚ لە گەورەکان یان خزمەت کردنی یەکیٚ لە حاکمەکانی مەملەکەتەکانی خۆرئاوایی، ئارەزوویەکی گەورەیە. لەهەمان کاتدا مۆڵەتیان پێدام کە ئەڵقە بکەمە

---

60 (مونشی) کەسێکە بتوانیٚ باش نامە بنووسێت و بابەت برازێنێتەوە (فەرهەنگی گۆڤەند و ژنان). (و. کوردی)

پەنجە گەورەی دەستمەوە.[61] بەلاّم ئەلّقە کردنەپەنجەش منی ڕازی نەکرد و تێگەیشتم کە ئامانجی ژیانی من ئەمە نەبووە کە ئەلّقە بکەمە پەنجەمەوە. بەشێوەیەکی گشتی کە هەرجارێ شتێکم دەویست و کاتێ بەدەستم دەهێنا، لەلام بێبەها دەبوو و، ئەو کاتە دەمزانی کە ئەو شتە لەلای من بەهایەکی ڕاستەقینەی نەبووە، چونکە شتێ خاوەنی بەهایەکی ڕاستەقینە نەبێ کە دەکەوێتە دەست مرۆڤ، نابێ بەهای خۆی لەدەست بدات.

جارێکیان لە ڕۆم مەترسییەکم هاتە ڕێ و زانیم کە ئەگەر لە ڕۆم بمێنمەوە دەکوژرێم، بۆیە لە ڕۆم هاتمە دەرەوە و ڕۆشتم بۆ میسر و لە ئەسکەندەرییە نیشتەجێ بووم. لەوێ بیستم کە عیسا دێت و، لەپڕ وەکو ئەوە وابوو کە ناچارم دەکەن لە میسرەوە بڕۆم بۆ قودس و، کاتی جەژنی گەورەی یەهوودییەکان لەوێ بم. کاتێ گەیشتمە دەروازەی شار، سەیرم کرد سێ کەسیان لەخاچ داوە. دیمەنی لەخاچ دراو بۆ ئێمەی ڕۆمی شتێکی سەمەرە نییە، چونکە ئێمە لە منداڵییەوە ئەو دیمەنە دەبینین و بێ باکین لێی. بەلاّم کاتێ من گەیشتمە دەروازەی شار و لەخاچدراوەکانم بینی، نەمتوانی تێپەڕ ببم و هەرکە چاوم بە لەخاچدراوی ناوەڕاست کەوت، ڕاوەستام.

ئەی مریەمی مەجدەلییە، تۆ ناتوانی تێبگەی کە کاتێ من عیسام بینی، چ حاڵێك ڕووی تێ کردم. حاڵی من پاش بینینی ئەو وەکو حاڵی کەسێ بوو کە لەگەڕاندایە بەدوای گەوهەرێکدا و، بۆ دۆزینەوەی ئەو گەوهەرە بەڕێ دەکەوێ و ساڵەها لە دەریاکان و وشکاییەکاندا تێدەپەڕێ و، لە سەدان کەس پرسیار دەکات تا بزانێ ئەو گەوهەرە لە کوێیە، بەلاّم کاتێ دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی، بە سەرسامیەوە دەبینێ ئەو گوهەرەی کە ئەو هەمووە لە گەڕاندا بوو بەدوایدا، لە ژوورەکەی خۆیدا لەپێش چاویدایە. منیش پاش بینینی عیسا بە خاچەوە، زانیم ئەو شتەی کە هەرگیز بەهای خۆی لەدەست نادات و شایستەی ئەوەیە کە مرۆڤ تەمەنی خۆی لە گەڕان بە دوایدا سەرف بکات، عیسایە.

مریەمی مەجدەلییە پرسی: تۆ چیت دەوێ لە عیسا؟

[61] ئەلّقە یان مستیلە کردنە پەنجە یەکێکە لە نەریتەکانی جۆری مرۆڤ و ناتوانرێ پرەنسیپەکەی دیاری بکرێت و ئەم نەریتە لە ئێرانەوە ڕۆیشتووە بۆ ڕۆم و یەکێ لە باشییەکانی گەورەکان لە ڕۆمدا ئەوە بووە کە ئەلّقەیان دەکردە پەنجە گەورەی دەستیان (و. فارسی). ئەو نەریتە جۆرێکە لە تەوتەم پەرستی کە مامۆستا (شوکور مستەفا) لە کتێبی (سەرچاوەکانی بیروباوەڕی کوردەواری)دا باسی دەکات کە لە مرۆڤە سەرەتاییەکاندا سەری هەڵداوە و کوردیش مێژوویەکی خۆی هەیە لەو جۆرە بیروباوەڕەدا. (و.کوردی).

گوتم: له هەمان چرکەی یەکەم کە عیسام بینی، کەوتمە ژێر کاریگەری ئەوەوە. لەو کاتەوە ئارەزووم ئەوە بوو کە بزانم نهێنی گەورەیی عیسا لە چیدایە، بەڵام نەمدەتوانی لەگەڵیدا بدوێم. پاشان لە قوتابییەکانم دەبیست کە گوتیان نهێنی گەورەیی عیسا لە قەڵەمڕەویدایە و، مەلەکوتی عیسا لەم دنیایەدا نییە بەڵکو لە دنیایەکی تردایە.

کاتێ بیستم کە عیسا ئیمانداران دەباتە ناو مەلەکوتی خۆیەوە، ئارەزووم ئەوە بوو کە منیش بباتە ناو مەلەکوتی خۆیەوە. بەڵام دواتر تووشی نائومێدی بووم، نەك لە ڕووی ئەوەی کە وا بیربکەمەوە عیسا مەلەکوتی نییە، بەڵکو لەو ڕووەوە کە هەستم کرد عیسا بە شایستەم نازانێ بمباتە ناو مەلەکوتی خۆیەوە و، لەبەرچاوی کەوتووم. بەڵام ئەمڕۆ کە لەم ماڵەدا چارەسەرکرام، زانیم کە وانییە و ئەگەر عیسا من بە شایستە نەزانێ کە گرنگیم پێ بدات، ئەوا شیفای نەدەدام.

لەو کاتەدا مریەمی بێرت کە ڕۆشتبوو دەموچاوی خۆی بشوات، گەڕایەوە. بینیم جلەکانی گۆڕیوە و ئەو جلانەی کە من بۆم کڕیبوو، لەبەری داکەندبوو و یەکێ لە جلەکانی مریەمی مەجدەلییەی کردۆتەبەری. بەو جلانەوە مریەمی بێرت ئەوەندە گەنجتر دەردەکەوت کە دڵم بەحاڵی سوتا، بەڵام زانیم کە نابێ خۆم لاوازیی خود بەخەرج بدەم. ئەگەر لاوازیی خودم بەخەرج بدایە و ئەو ژنەم لەگەڵ خۆم ببردایە، ئەوا تووشی گوناه دەبووم و، ئەو ژنەش لە گێژاوی گوناهدا لەناو دەچوو. باشتر وابوو کە مریەمی بێرت لەماڵی مریەمی مەجدەلییە بمێنێتەوە تا ئەو خەیاڵانە لە مێشکی دەربکات کە تووشی گوناه دەبێ پێی.

کاتێ ویستم لەو ماڵە بڕۆم، مریەمی بێرت بە پێچەوانەی چاوەڕوانی من، بێ ئۆقرەیی نەنواند و نەگریا و، من ماڵئاواییم لە دوو ژنەکە کرد و داوام لە مریەمی مەجدەلییە کرد هەر شتێکی لەبارەی عیساوە دەست کەوت، لە تەبەرییە پێم ڕابگەیەنێ.

کاتێ گەیشتمە ڕۆخی دەریاچەی جەلیلە تا بگەڕێمەوە بۆ تەبەرییە، سەیرم کرد دوو ڕاوچییەکە (ڕاوچی ماسی) کە بە بەلەم من و مریەمی بێرتیان هێنابوو بۆ مەجدەلییە، لەوێن و دیاربوو کە چاوەڕێی گەڕانەوەی منیان دەکرد. ئەوان زانییان کە من دەگەڕێمەوە و لەبەرئەوەی پارەی باشم پێدابوون، بۆیە کاتێ هاتم بۆ مەجدەلییە، بیریان لەوە کردەوە کە چاوەڕێم بکەن تا لەکاتی گەڕانەوەشم لە مەجدەلییە، پارەی باشم لێ وەربگرن.

## تۆفان لە دەریاچەی جەلیلەدا

کاتیٚ سواری بەلەمەکە بووین، با هەڵی کرد و هەورێکی ڕەش لەلای سەرەوە هات و دەریاچەی جەلیلە کەوتە شەپۆلدان.

دوو ڕاوچییەکەی ماسی پێیان گوتم: ئەگەرچی دەریاچەی جەلیلە گەورە نییە بەڵام لەکاتی تۆفاندا ترسناك دەبێت و، ئەگەر تۆفان دەست پیٚ بکات ڕەنگە بەلەمەکەی ئێمە نوقم بکات، بۆیە ئایا تۆ دەتوانی مەلەوانی بکەیت؟

گوتم: کاتیٚ من لە زانکۆی رودس دەمخوێند، لە دوورگەی رودسەوە تا قارەی ئاسیا مەلەوانیم کرد، لەکاتێکدا کە لە هەندیٚ شوێندا ڕەوتی ئاوی دەریا خێرا بوو.[٦٢]

بە ڕوخساری ڕاوچییەکاندا دیاربوو کە نازانن دوورگەی رودس لە کوێیە و، ڕەنگە نەشزانن (خوێندن لە زانکۆ) واتای چییە. ئیتر بەوانم نەگوت ئەو ڕۆژەی کە من لە دوورگەی رودسەوە تا کەنارەکانی ئاسیام بە مەلەوانی بڕیوە، بەلەمێکی چارۆکەدار بەدوامەوە بوو تا ئەگەر ئەوەندە ماندوو بووم کە نەتوانم مەلەوانی بکەم، ئەوا لە مەترسی نقوم بوون ڕزگارم بکات و، هەروەها نەشمگوت کە کچێکی گەنج و جوان لەو بەلەمەدا بووە و، پاش ئەوەی کە بەسەرکەوتوویی ماوەی نێوان دوورگەی رودس و کەناری ئاسیام بە مەلەوانی بڕی، تاجێکی گوڵینی لەسەر کردم.

من لەوسەری بەلەمەکە دانیشتم و سەیرم کرد ئەوانەی کە بەلەمەکە لێدەخوڕن، عەباکانیان لەخۆیان پێچاوە تا ئەگەر باران باری، تەڕ نەبن. ئەوان پاش ئەوەی عەباکانیان لەخۆیانەوە پێچا، بەردەوام سەوڵیان لێدەدا و بەلەمەکەیان لێدەخوڕی.

من گومانم نەبوو لەوەی کە ئەوان دەزانن ڕۆیشتووم بۆماڵی مریەمی مەجدەلییە، چونکە لە ناوچەیەکی وەکو مەجدەلییە هەموویان یەکتر دەناسن و کاتیٚ بیانییەك دەچیٚ بۆ ئەویٚ، خەڵك ئەوەندە سەربزێوی دەکەن تا بزانن ئەوکەسە کێیە و لەکوێوە دێت و لەو ناوچەیەدا ئیشی چییە.

---

[62] (دوورگەی رودس) بەو جۆرەی کە دەیزانین زۆر لە قارەی ئاسیا، واتە خاکی ئێستای تورکیا نزیکە و ئەمڕۆش مەلەوانە لێهاتووەکان لە (دوورگەی رودس)ەوە تا خاکی تورکیا بە مەلەوانی ڕێگا دەبڕن.

ئەو دوو ڕاوچییە دەیانزانی کە من مریەمی بێرتم لە شارۆچکەکەی مەجدەلییە داناوە و، ڕەنگیشە زانیبێتیان کە ئەو لە ماڵی مریمی مەجدەلییە دەژی، بەڵام لەبارەی ئەوەوە هیچیان لێ نەپرسیم تاکو یەکێ لەوان گوتی: ئایا ئەو ژنە ناگەڕێتەوە کە لەگەڵ تۆ بوو؟

گوتم: نەخێر، ئەو لە ماڵی مریەمی مەجدەلییە نیشتەجێ بووە.

ئەو پیاوە پرسی: مریەمی مەجدەلییە ئەو ژنەی لە تۆ کڕیوە؟

من پرسیم: مەبەستت لەم قسەیە چییە؟

پیاوەکە گوتی: مریەمی مەجدەلییە لە ڕابردوودا پیشەیەکی هەبوو کە دوور بوو لە پیشەکەی ئەمڕۆی. ئەوکاتە ژنەکانی دەکڕی و لەماڵی خۆی دەیهێشتنەوە، بۆیە من وامزانی ئەو ژنەی لەتۆ کڕیوە.

گوتم: مریەمی مەجدەلییە ئەو ژنەی لە من نەکڕیوە بەڵکو ئەوی لە ماڵی خۆیدا هێشتۆتەوە تا فێری ئیشێکی بکات.

سەوڵ لێدەرەکە گوتی: ڕەنگە بیەوێ فێری مۆسیقا یان گۆرانی گوتنی بکات، چونکە لە کۆندا کاتێ ژنانیان دەکڕی و لە ماڵی خۆیان جێیان دەکردنەوە، ئەوانیان فێری گۆرانی وتن یان مۆسیقا دەکرد.

گوتم: وانییە و مریەمی مەجدەلییە ئەو ژنەی بۆ کارەکانی ماڵداری و بەخێوکردنی کۆترەکانی هێڵاوەتەوە و، هیوای وایە ئەو لە ماڵداری و بەخێوکردنی کۆترەکان شارەزا بێت.

ئیتر ئێمە نەمانتوانی زیاتر گفتوگۆ بکەین، چونکە تۆفان دەستی پێ کرد و دەریاچەی جەلیلە بەجۆرێك کەوتە پێکدادان کە من پێکدادانی وام لە دەریای ڕۆمدا نەبینیبوو. بەهۆی هەڵکردنی (با)وە شەپۆلی وا هەڵدەستا کە بەرزی هەریەکێکیان لە دە پێ تێدەپەڕی و ئەگەر یەکێ لەو شەپۆلانە بکەوتایەتە سەر بەلەمەکە، ئەوا ئێمەی نوقمی ناو دەریاچەکە دەکرد. ئەو دوو کەسە هەوڵیان دەدا کە بە سەوڵەکانی خۆیان ڕێگا لە وەرگەڕنی بەلەمەکە بگرن و ڕەوتی شەپۆلەکانی دەریاچە، ئێمەی بۆ لایەك دەبرد کە دوور بوو لە شوێنی مەبەستی ئێمە.

هەورێکی ڕەش ئاسمانی ئێمەی داپۆشی و هەموو جێگایەك نیوەتاریك بوو، هەورە بروسکە چەخماخەی دەدا و هەورە گرمەش دەیگرماند. هەندێ جار شەپۆلی

دەریاچە بەلەمەکەی بەرز دەکردەوە و ساتێکی تر ئەوەندە بەلەمەکە نزم دەبوویەوە کە من وامدەزانی تا بنی دەریاچەکە دەڕوات.

یەکێ لە دوو سەوڵ لێدەرەکە بە دەنگی بەرز گوتی: ئەم بەلایە بەهۆی ئەم پیاوە ڕۆمییەوە ڕووی تێکردووین.

من گوتم: چیم کردووە وا تۆ دەڵێی بوومەتە هۆی ڕوودانی بەلا؟

سەوڵ لێدەرەکە گوتی: ئەگەر تۆ ژنێکی گەنجی ئیسرائیلیت نەبردایە بۆ ماڵی مریەمی مەجدەلییە کە ژنێکی بەدکارە و، ئەوت پێ نەفرۆشتایە ئەوا ئەم بەلایە بۆ ئێمە دانەدەبەزی.

گوتم: ئەم بەلایە بۆیە دابەزیوە بۆ سەر ئێمە، چونکە بەخراپ بیرمان لە مریەمی مەجدەلییە کردۆتەوە ،و ئەو کە ژنێکی بڕوادارە، وەك ژنێکی خراپ لێتان ڕووانیوە و بۆیە خودا غەزەبی لێ گرتین و بەلای بۆ ناردینە خوارێ.

ئینجا شەستە باران دەستی پێ کرد و لە ماوەی چەند خولەکێکدا من بەجۆرێك تەڕ بووم کە وەکو ئەوە وابوو کەوتبێتمە دەریاچەکەوە و پاشان لەناو ئاوەکە هێناومیانەتە دەرەوە بۆ ناو بەلەمەکە. هەوا گەرم بوو و نمەی باران مرۆڤی ئازار نەدەدا، بەڵام کاتێ با هەڵی کرد، جەستە ئەوەندە سارد دەبوو کە وەکو ئەوە وابوو لە زستاندا مرۆڤ بە ڕووتی بگەڕێ.

پاش ئەوەی باران دەستی پێ کرد، خێرایی (با)ی کەم کردەوە، بەڵام دەریاچەی جەلیلە بەردەوام لە پێکداداندا بوو و بەلەمەوانەکان نەیاندەتوانی بمگەیەننە شوێنی مەبەست، واتە شاری تەبەرییە. لە کاتێکدا بارن دەباری، ئەو ڕۆژە کۆتایی پێ هات و تاریکی شەو دەستی پێ کرد و، هەر ئەوکاتە ڕۆخی دەریاچەکە دەرکەوت و من لە دوورەوە ڕووناکی ئاگرێکم بینی و دیاربوو کە ئەو ئاگرە لە ژوورێك یان لەژێر کەپرێکدا هەڵایساوە.

بە بەلەمەوانەکانم گوت: باشتر وایە بڕۆین بۆ ڕۆخەکە تا بتوانین ئەو جلانەمان وشك بکەینەوە کە تەڕ بوون.

بەلەمەوانەکان گوتیان: ئێرە لێوارێکی باش نییە و گەڕوگولەکان[٦٣] لەم نزیکانەدا دەژیت.

---

[63] مەبەست لەو کەسانەیە کە تووشی نەخۆشی (گول) یان (بەڵەکی) بوون. (وەرگێڕی کوردی)

گوتم: ئێمە سێ کەسین و هیچ شتێکی وامان پێ نییە بۆ دزین بشێن تاکو هێرشمان بۆ بێنن، ئەگەر هێرشیش بێنن ئەوا دەتوانین بەرگری لەخۆمان بکەین، کاریشمان بە گەڕوگولەکانەوە نییە.

سەوڵ لێدەرەکان لە لێوارەکە نزیك بوونەوە و من پێم خستە سەر وشکانی و، پاش من ئەو دوو کەسە هاتنە سەر لێوارەکە و بەلەمەکەیان دەرهێنا.

من بەرەو بڵێسەی ئاگرەکە ڕۆیشتم و بەو جۆرەی کە گومانم بردبوو، بینیم ئەو ئاگرەیان لەژێر ساباتێك هەڵایساندووە و پیاوێك کە پێدەچوو ڕاوچی ماسی بێت، لە تەنیشت ئاگرەکەوە دانیشتووە و دوو ماسی گەورەی لەسەر ئاگرەکە سەروژێر دەکرد تاکو ببرژێ. من لەو ڕووەوە زانیم ئەو ڕاوچی ماسییە چونکە تۆری ماسی گرتنەکەی بەدیواری ساباتەکەدا هەڵواسیبوو.

من لەو پیاوە نزیك بوومەوە و گوتم: چاکەت بە نسیب ببێ.

ئەو پیاوە سەری بەرز کردەوە و گوتی: چاکە بە نسیبی تۆ بێت.

گوتم: تۆفان ئەو بەلەمەی کە منی هەڵگرتبوو، لادا و باران منی تەڕ کردووە، ئایا دەهێڵی لە تەنیشت ئاگرەکەی تۆ جلەکانی خۆم وشك بکەمەوە؟

ئەو پیاوە بە زەردەخەنەیەکەوە ڕازی بوو کە من لەلای ئاگرەکەی دابنیشم و جلەکانی خۆم وشك بکەمەوە. پاش چەند ساتێکی تر دوو سەوڵ لێدەرەکە هاتن بۆ لامان و ڕاوچییەکەی ماسی بە زەردەخەنەیەکەوە ئەو دووانەشی قبوڵ کرد و لەلای ئاگرەکە جێی کردنەوە.

من کە سەرەتا سەرنجی ڕوخساری ئەو پیاوەم نەدابوو، سەیرم کرد ڕوخسارێکی کراوە و ڕووخۆشی هەیە و، مرۆڤ کاتێ سەیری ڕوخساری دەکات تێدەگات کە کابرایەکی باشە و نابێ لێی بترسێت. سەوڵ لێدەرەکان لەگەڵ ئەو پیاوە دەستیان کرد بە قسەکردن و لێیان پرسی کە ئەو ڕۆژە توانیویەتی ماسی زۆر بگرێت یان نا.

ڕاوچییەکە وەڵامی دایەوە: ئەمڕۆ لەچەند ماسییەك زیاترم نەگرتووە و، هەر کە زانیم تۆفان نزیك بۆتەوە، گەڕامەوە بۆ لێوارەکە، بەڵام هیوادارم بەیانی قەرەبووی ئەمڕۆ بکەمەوە و ماسی زۆر بگرم.

ئینجا بەبێ ئەوەی لە ئێمە بپرسێ کە ئایا برسیمانە و حەزمان لە نان هەیە یان نا، نانێکی گەورەی کرد بە چوار بەشەوە و هەر بەشێکی لە نانەکەی خستە بەردەم

هەریەکێ لە ئێمە. پاشان لەو دوو ماسییەی کە لەسەر ئاگرەکە برژا بوون بەشی هەریەکەمانی دا.

من کەمێك لە ماسییەکەم خوارد و زانیم کە گۆشتێکی بەلەزەتی هەیە، بەڵام ئەو پیاوە لەبەرئەوەی خوێی پێ نەبوو تا بیکات بە ماسییەکانەوە، بەو سەوزانەی کە لە سکی ماسییەکاندا جێی کردبوونەوە بۆنخۆشی کردبوون. کاتێ ئەو پیاوە خواردنەکەی تەواو بوو، دارێکی بە دەستەوە گرت و یاری بە خۆڵەمێشی ئاگرەکە دەکرد و چاوی لە خۆڵەمێشەکە هەڵنەدەگرت، ئینجا بۆم دەرکەوت کە میواندارەکەی ئێمە پیاوێکی شەرمنە.

تینی ئاگرەکە جلەکانی منی وشك کردەوە و پاش نانخواردن، چاوەکانم قورس بوون و حەزم دەکرد بنووم و لە تەنیشت ئاگرەکە ڕابکشێم و، پێش ئەوەی خەوم لێ بکەوێت، هەستم کرد میواندارەکە بالاپۆشێکی دا بە سەر مندا تا سەرمام نەبێت.

جارێك بەئاگا هاتمەوە و بینیم هەوا سافە و ئەستێرەکان دەدرەوشێنەوە. دوو سەوڵ لێدەرەکە لە تەنیشت منەوە خەوتبوون، بەڵام میواندارەکە نەدەبینرا. من سەیرێکی دەوروبەرم کرد تا بزانم میواندارەکە لەکوێیە و سەیرم کرد لە تەنیشت دەریاچەکە وەستاوە و سەیری ڕووی ئاوەکە دەکات. بە دۆخی ئەستێرەکان لە ئاسماندا بۆم دەرکەوت سێ یەکی ئاسمان شەوە و نزیکی سپێدەیە.

لە جێی خۆم هەستامەوە و لە میواندارەکە نزیك بوومەوە کە لە ڕۆخی دەریاچەکە وەستابوو و پرسیم: خەریکی سەیری چی دەکەی؟

ئەو پیاوە پاش بیستنی ئەم قسەیە ڕووی وەرگێڕا و وەڵامی دایەوە: من خەریکم سەیری هەڵهاتنی سپێدە دەکەم و هەڵهاتنی سپێدە سوپاس کردنی باوکمە، من دەمەوێ بڕۆم بۆلای باوکم.

ئەوکاتە زانیم کە بە زمانی یۆنانی پرسیام لەو پیاوە کردبوو و ئەویش هەر بە زمانی یۆنانی وەڵامی دامەوە. من دەمزانی ڕاوچییەکانی دەریاچەی جەلیلە کە خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری دەریاچەکەن، زمانی یۆنانی نازانن، بەڵام گومانم برد لەوەی کە ئەو پیاوە ڕاوچی ماسی بێت و ڕەنگە یەکێ لە قوتابییەکانی یەحیای لەئاوهەڵکێش بێت کە لە دەستی زۆرداریی هیرودی پادشای گەلی ئیسرائیل ڕایکردووە و لە ڕۆخی دەریاچەی جەلیلە، بەبێ سەروشوێن دەژی و بە ماسی گرتن بژێوی خۆی دابین دەکات.

**ئەوكاتە گوتم: من ئارەزوم وایە خۆم بگەیەنمە مەلەکوتی ئەو و تۆ ڕێگەی گەیشتن بە مەلەکوتی ئەوم نیشان بدە.**

**پیاوە ڕاوچییەکە گوتی: زیاتر لەیەك ڕێگا نییە بۆ گەیشتن بە مەلەکوتی ئەو و، ئەو ڕێگەیەش شەق هەڵدانە لە دنیا و پەیڕەوی کردنە لە زانیاری و فێرکردنەکانی من و، هەرکەسێ بیەوێ دنیای هەبێ، ناتوانێ بگات بە مەلەکوتی من.**

**دڵم کەوتە تەپەتەپ و هەردوو دەستم بەرەو ڕووی درێژ کرد و گوتم: تۆ کێیت کە بەوجۆرە قسە دەکەی؟ مرۆڤ ناتوانێ بەو جۆرە قسە بکات، بەڵکو تەنیا کەسێك دەتوانێ بەو جۆرە قسە بکات کە بوونەوەرێکی لە مرۆڤ گەورەتر بێت.**

**پیاوە ڕاوچییەکە گوتی: من کەسێکم کە تەواوی دەسەڵاتەکانی زەوی لە دەستی مندایە.**

**ئەوکاتە ئەو پیاوەی کە تا ئەوکاتە سەیری ڕووی دەریاچە یان ئاسمانی دەکرد، ڕووی وەرگێڕا و نیگای کەوتە سەر چاوەکانم. کاتێ ئەو پیاوە گەڕایەوە و سەیری منی کرد، زەردەخەنەیەکی کرد و، زەردەخەنەکەی وەکو ئەوکاتە بوو کە سەرەتای شەو لەلای ئاگرەکە منی قبوڵ کرد. بەڵام کاتێ نیگای کەوتە سەر چاوەکانم، وەکو ئەوە وابوو کە هەموو ئەندامەکانی لەشم یەکە یەکە لەیەك جیا دەکاتەوە بەبێ ئەوەی هەست بە ئازار بکەم.**

**ئەو پیاوە چەند چرکەیەك سەیری کردم، پاشان ڕووی وەرگێڕا و ئاماژەی بۆ شاری تەبەرییە کرد و گوتی: ئەو شارە کچێکی لێیە کە براکەی لە دەست داوە و سەرپەرشتیاری نییە. بەم زووانە لەو شارەدا پێشبڕکێیەکی گالیسکەسواری ئەنجام دەدەن و، تۆ لەو پێشبڕکێیەدا خەڵات وەردەگریت و، لەبەرئەوەی پێویستت بەو خەڵاتە نییە، ئەوا ئەو کچە بێ سەرپەرشتیارە بدۆزەرەوە و خەڵاتەکە بدە بەو.**

**گوتم: لە شارێکی گەورەی وەکو تەبەرییە من چۆن کچێك کە براکەی مردووە و سەرپەرشتیاری نییە، بدۆزمەوە و لەکوێ دیارە کە من براوەی پێشبڕکێی گالیسکەسواری دەبم؟**

**ئەو پیاوە دیسان ڕووی کردە من و چاوەکانی بڕییە نیگاکانم و بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: مەزن تیوس، تۆ زۆر پرسیار دەکەیت و داوای ڕوونکردنەوە دەکەیت.**

من به سەرسامیەوە گوتم: تۆ چۆن ناوی من دەزانی؟ دەکرێ بڵێی تۆ ناوت چیە؟ وەك ئەوە وایە من پێشتر تۆم بینیبێت!

پیاوە ڕاوچییەکە گوتی: ئایا هەر ئەوە بەس نییە کە من ناوی تۆ بزانم؟

پاشان بێدەنگی بەرقەرار بوو و، من زیاتر لە جاران بە بیرمدا هات کە ئەو پیاوە یەکێ لە قوتابییەکانی یەحیای لەئاوهەڵکێش بێت کەوا لە گۆشەگیریدا لە تەنیشت دەریاچەی جەلیلەدا دەژیت و، گوایە بەهۆی گۆشەگیری و تەنیاییەوە بیرکردنەوەی سەیری لێ پەیدا بووە و وادەزانێ کە خاوەنی هەموو هێزەکانی سەر زەوییە.

لێم پرسی: ئایا بە ڕاستی تۆ خاوەنی هەموو هێزەکانی زەوی و ئاسمانیت؟

پیاوە ڕاوچییەکە گوتی: مرۆڤ چاوی هەیە و نابینێت و گوێ ی هەیە و نابیستێت، بەڵام تۆ ئەی مارکۆس مەزن تیوس، ڕۆژێ بۆ گەورەیی ناوی من گیانت فیدا دەکەیت، هەر بەو جۆرەی کە من بۆ گەورەیی ناوی باوکم گیانم فیدا کرد.

گوتم: ئاخر تۆ کێیت کە ئەم قسانە دەکەیت؟

ئەو پیاوە عەباکەی لەسەر شانی خۆی لابرد و خستیە سەر زەوی. بینیم کە پیاوە ڕاوچییەکە لەژێر ئەو عەباوە هیچ جلێکی لەبەردا نییە و تەنیا شەرواڵێکی لەپێدا دەبینرێ. وا دەردەکەوت ئەو ڕاوچییەی کە ئەو شەوە خۆراکەکەی بە ئێمە دا، ئەوەندە هەژارە کە ناتوانێ جلێ بۆ خۆی بکڕێت.

پیاوە ڕاوچییەکە گوتی: دەست بێنە بە پشتمدا.

من دەستم بە پشتیدا هێنا و هەندێ شوێنی ئاوساویم بینی و، لەبەر ڕووناکی کەمڕەنگی ئەستێرەکاندا بۆم دەرکەوت کە شینیش بۆتەوە و، ئینجا بۆم دەرکەوت کە ئەوانە شوێنەواری قامچین. پیاوە ڕاوچییەکە بەشێکی تری جەستەی خۆی پیشان دام و منیش شوێنەواری برینێکم تێدا بەدی کرد. بۆم دەرکەوت ڕاوچییە هەژارەکەیان ئەشکەنجە داوە و، ئەگەرچی دڵم بەحاڵی سوتا، کەچی بەلامەوە سەیر نەبوو، چونکە دەمزانی یەهودییەکان لەو بابەتانەی کە پەیوەندی بە ئایینەوە هەبێت، بێ بەزەیین و هەرکە بگوترێ فلان یەهوودی قسەیەکی کردووە کە لەگەڵ یاساکانی ئایینیدا ناگونجێ، ئەوا ئەو کەسە دەکوژن یانیش ئەشکەنجەی دەدەن.

گوتم: ئەی کابرا، دڵم بەحاڵی تۆ دەسوتێ و ناوی خۆتم پێ بڵێ تا من بەهۆی ئاشنایەکانمەوە پێیان بڵێم کە ئیتر تۆ نەدەنە بەر ئازار و ئەشکەنجە.

ئەو پیاوە وەڵامی نەدایەوە و عەباکەی خۆی لەسەر زەوی هەڵگرتەوە و پێچای لە خۆیەوە و ڕۆشت. حاڵی وا نیشانی دەدا کە ئیتر حەز ناکات لەگەڵ من قسە بکات و منیش کە هەستم بەبێ مەیلی ئەو کرد، نەڕۆیشتم بە دوایدا. ئینجا گەڕامەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێی خەوتبووم و ڕاکشام و یەکسەر خەوم لێ کەوت.

کاتێ بەئاگا هاتمەوە، بینیم خۆر هەڵهاتووە و دەریاچەی جەلیلە وەکو ئاوێنە دەدرەوشێتەوە. ئەو دوو سەوڵ لێدەرە یەهوودیەی کە شەوی پێشتر لە تەنیشت منەوە خەوتبوون، بەئاگا هاتبوونەوە، بەڵام ئەو پیاوە ڕاوچییەی کە شەوی ڕابردوو میوانداری کردین، دیارنەبوو. کابرای ڕاوچی ماسی دیار نەمابوو، بەڵام بەرماوەی خواردنەکەی شەوی ڕابردووی بۆ ئێمە دانابوو و ئێمەش کە هەستمان بە برسیەتی دەکرد، بە ئیشتیهاوە نانمان خوارد و پاشان بەرەو دەریاچەکە ڕۆیشتین و دوو سەوڵ لێدەرەکە بەلەمەکەیان خستە ناو دەریاچەکەوە و سەرکەوتن.

لەبەرئەوەی شەوی ڕابردوو لە ڕاوچییەکەم بیستبوو کە ڕۆژی دواتر بۆ ڕاوی ماسی دەچێ بۆ دەریاچە، بە وردی سەیری ئەو دەوروبەرەم کرد تا بزانم بەلەمەکەی لە دەریاچەکەدا دەبینم یان نا، بەڵام لەسەر ڕووی ئاوەکە هیچ بەلەمێك نەدەبینرا و لێواری ئاوەکەش کەسی لێ نەبوو کە تۆڕ هەڵبدات، بۆیە پێش ئەوەی سواری بەلەمەکە ببم و بکەومەڕێ، سەیرێکی کەنارەکەم کرد تا بزانم شوێن پێی ئەو ڕاوچییە دەبینم یان نا؟ بەڵام هیچ شوێن پێیەکیش دیار نەبوو، پاشان کەوتینەڕێ و من هەستم کرد سەوڵ لێدەرەکان بە خێرایی سەوڵ لێدەدەن و سەیری یەکتری دەکەن و قسە ناکەن، وەك بڵێی هەوڵ دەدەن زووتر لەو ناوچەیە دوور بکەونەوە.

شنەبایەکی ناسك لە دەریاچەکەدا هەڵی دەکرد و ئاوی دەریاچەکە ئەوەندە ئارام بوو کە کاتێك تیشکی خۆر لێی دەدا، دەتگوت لە ئاوێنە دەدا. لەو ڕۆژە خۆشەدا و لەو دەریاچەیەدا کاتێك من پێشهاتەکانی شەوی ڕابردووم بەیاد دەهێنایەوە وەکو ئەوە وابوو کە شەوی پێشتر خەونم دیبێت، چونکە دوور بوو کە پیاوێکی ڕاوچی کە لە گۆشەیەکی چۆڵ لە ڕۆخی دەریاچەی جەلیلەدا نیشتەجێ بووە، زمانی یۆنانی بزانێ.

پاش ئەوەی لە کەنارەکە دوور کەوتینەوە، من لەو دوو سەوڵ لێدەرە کە قسەیان نەدەکرد پرسیم: ئایا ئێوە ئەم پیاوە ڕاوچییەتان دەناسی کە شەوی ڕابردوو نانی پێداین؟

دوو سەولْ لێدەرەکە چەند چرکەیەك بێدەنگ بوون و، پاشان ئەوەی کە لەوی تریان بەتەمەنتر بوو گوتی: ئێمە پێمان وایە ئەو ڕاوچییەی کە دوێنیٚ شەو نانی پێداین، پێشتر بینیومانە و، ئەو لە ڕابردوودا وتاری بۆ خەلْك دەخوێندەوە و پاشان لە جەلیلە ڕۆیشت و، ئیتر ئێمە نەمانتوانی بزانین بۆکویٚ ڕۆیشتووە! چونکە یەحیای لەئاوهەلْکێشیش بەهۆی ئەم سەربزێویانەیەوە سەری بە بادا.

سولْ لێدەرەکەی تر گوتی: دوێنیٚ شەو کاتیٚ من ئەم پیاوە ڕاوچییەم بینی، وامزانی عیسایە، چونکە لە چاوەکانیدا شتێك هەبوو کە عیسای دەهێناوە یاد و، خۆشەویستی و نەرمونیانییەکەشی بە عیسا دەچوو، بەلاّم من زانیم کە بالاّی عیسا بەرزتر بوو لە بالاّی ئەو ڕاوچییە، هەروەها عیسا بە شێوەزاری ئەم ڕاوچییە قسەی نەدەکرد بەلاّم بە دووری نازانم کە ئەم پیاوە یەکیٚ لە قوتابییەکان و نزیکەکانی عیسا بێت کەوا لەم شوێنەدا کە دانیشتوانی لیٚ نییە، نیشتەجیٚ بووە.

هەرکە ئەو پیاوە بە منی گوت کە شەوی ڕابردوو کاتیٚ پیاوە ڕاوچییەکەی بینیوە وایزانیوە عیسایە، تەزولەیەك بە لەشمدا هات و، ئەو تەزولەیە بۆی دەرخستم کە ئەو پیاوە هەر ئەو عیسایەیە کە دوای زیندوو بوونەوە و هاتنە دەرەوەی لەناو گۆڕەکە، ڕێگەی ناوچەی جەلیلەی گرتەبەر، شێوەی قسەکانیشی و بە ئاخاوتنیشی بە زمانی یۆنانی نیشانی دەدا کە عیسا بێت.

بەخۆم گوت: وای.. بۆ تۆ کە ئەوەی دەتویست، دۆزیتەوە و نەتناسی. عیسا ڕاستی گوت کە چاویان هەیە بەلاّم نابینن و گوێیان هەیە بەلاّم نابیستن. من هەرچەندە چاوم هەبوو، بەلاّم نەمتوانی عیسا بناسم. وای! من چەندە نەزان بووم کە نەمتوانی بزانم ئەو پیاوە میهرەبان و بیٚ فیزەی کە بە زەردەخەنەوە ئێمەی قبولْ کرد و بە خۆڕایی نانی پێداین و لەگەلْ من بە زمانی یۆنانی قسەی کرد، عیسا بوو.

من زانیم کە ناتوانم درێژە بە ڕێگەکەم بدەم و بڕۆم بۆ شاری تەبەرییە و، ناچارم بگەڕێمەوە و خۆم بگەیەنمە ئەو کەنارەی کە شەوی ڕابردوو پیاوە ڕاوچییەکەم تێدا بینی.

بە سەولْ لێدەرەکانم گوت: بگەڕێنەوە.

ئەو پیاوەی کە لەوی تریان بە تەمەنتر بوو پرسی: بۆ کویٚ بگەڕێینەوە؟

گوتم: بۆ هەمان ئەو جێگەیەی کە دوێنی شەو نانمان لیٚ خوارد و خەوتین.

ئەو پیاوە گوتی: ئێمە ناتوانین بگەڕێینەوە بۆ ئەوێ.

گوتم: ئێوە دەبێ بەخێرایی بگەڕێنەوە بۆ ئەوێ، ئەگەرنا من خۆم دەخەمە ناو ئاوەکەوە و بە مەلەوانی کردن ڕێگەی ڕۆخەکە دەگرمەبەر.

سەولێ لێدەرەکان کاتێ زانییان ئەگەر بەلەمەکە نەگەڕێننەوە، خۆم دەخەمە ناو ئاوەکەوە، ناچار گەڕانەوە و سەولیان لێدا تا کاتێ گەیشتنە ڕۆخەکە. هێشتا بەشی پێشەوەی بەلەمەکە نەکەوتبووە سەر وشکانی کە من خۆم هەڵدایە دەرەوەی بەلەمەکەوە و پێم خستە سەر وشکانی و، بە پەلە بەرەو ئەو ناوچەیە ڕۆشتم کە شەوی ڕابردوو تیایدا بووم. هەرچی ئەو شتانەی لەوێدا بینیم وەکو ئەوشتانە وابوو کە شەوی پێشوو بینیبووم، بەڵام نە پیاوە ڕاوچییەکە لەوێ بوو نە جێ پێیەکانیشی دیار بوو. بینینی ئەو شتانەی کە شەوی ڕابردوو لەوێدا بوون، دەری خست کە ئەوەی بینیومە و بیستوومە خەیاڵ نەبووە. بۆیە بە درێژایی ڕۆخەکە دەستم بە ڕاکردن کرد بۆئەوەی پیاوە ڕاوچییەکە بدۆزمەوە و هەندێ جار دەوەستام و هاوارم دەکرد ((ئەی عیسا، ئەی ئەو پیاوە چاکەکار و ستەم لێکراوەی کە لەخاچیان دایت، وەڵامم بدەرەوە تا من بتوانم جارێکی تر لەگەڵ تۆ گفتوگۆ بکەم)).

بەڵام هیچ دەنگێ وەڵامی نەدەدایەوە. دوای ئەوەی ماوەیەك بە درێژایی ڕۆخەکە ڕامکرد، ناوچەی پشکنینەکانم گۆڕی و لە زەوییەکانی ناوەوە (ئەو زەوییانەی کە دوور بوون لە دەریاچەکەوە) دەستم بە گەڕان کرد. لەوێش هەندێ جار دەوەستام و هاوارم دەکرد و عیسام بانگ دەکرد، بەڵام دیسان هیچ وەڵامێکم نەبیست.

کاتێ لە دۆزینەوەی عیسا لەو زەویانەی کە دوور بوون لە ڕۆخەکەوە، نائومێد بووم، گەڕامەوە بۆلای دەریاچەکە و کاتێ گەڕامەوە بۆ ڕۆخی دەریاچەی جەلیلە، ئەوەندە ماندوو بووم کە نەمتوانی بەپێوە بووەستم، بۆیە لەسەر زەوی دانیشتم و دوو سەڵ لێدەرەکەی بەلەمەکە منیان لەسەر زەوی بەرز کردەوە و بردمیانە ناو بەلەمەکەوە و سەوڵەکانیان بە دەستەوە گرت و بەلەمەکەیان لێخوڕی و منیش ڕێگریم نەکرد، چونکە هیوام نەما کە دیسان عیسا ببینمەوە.

کاتی گەڕانەوەی بەلەمەکە، من ئەوەندە لە نابینایی خۆم لە شەوی ڕابردوو و نەناسینی عیسا، خەفەتبار بووم کە داوێنی جلەکەی خۆم دا بە ڕوخسارمدا. چونکە بەهۆی ئەوەی کە نەمتوانی عیسا بناسم، لەلای خودی خۆم خەجاڵەت بووم. دوای

ئەوەی داوێنی کراسەکەی خۆم دا بە ڕوخسارمدا و خۆر و دەریاچەکەم لێ پەنهان بوو، پێشهاتەکانی شەوی ڕابردووم بە هەستێکی زیاتر هاتەوە یاد و، من سەرم لەوە سوڕدەما کە چۆن ئەو پیاوە عیسایە؟ چونکە شەوی پێشتر کاتێ جێگای ئێمەی کردەوە، هەموو شتێکی لە مرۆڤ دەچوو و وەکو مرۆڤ قسەی دەکرد و نانی دەخوارد و، بچووکترین جیاوازی لەگەڵ مرۆڤدا نەبوو. چۆن دەکرێ پیاوێ کە گۆشت و ئێسقانی هەیە و وەکو مرۆڤ قسە دەکات و زەردەخەنە دەکات و نان دەخوات، نێردراوی خودا بێت.

من تەواوی ئەو شتانەی کە شەوی پێشتر پیاوە ڕاوچییەکە گوتبووی، لە بیرم مابۆوە و دەمزانی یەکێ لەو شتانەی کە ئەو گوتی ئەمەبوو کە من لە پێشبڕکێی گالیسکەسواریدا براوەی خەڵات دەبم و، باشتر وایە ئەو خەڵاتە بدەم بە کچێك کە سەرپەرشتیار و نان پەیداکەری نییە. هەرکاتێ ئەم بابەتە لە ڕاستی نزیك دەبۆوە، دەردەکەوت ئەو پیاوەی کە دوێنێ شەو میوانداری ئێمەی کرد، عیسا بوو.

کاتێ درێژەی بیرکردنەوەکانم گەیشتە ئێرە، چمکی جلەکەم لادا و بە دوو سەوڵ لێدەرەکەم گوت: ئەگەر بیرتان نەچووبێتەوە من بە ئێوەم گوت کە عیسا ڕۆژی دواتر لەناو گۆر هاتۆتە دەرەوە و هاتووە بۆ ئەم ناوچەیە، بەڵام ئێوە کە شەوی ڕابردوو عیساتان ناسی، بۆچی قسەتان لەگەڵ نەدەکرد؟ هەروەها لەبەرئەوەی من پێم گوتبوون کە عیسا لەناو گۆر هاتۆتە دەرەوە و بەرەو ئەم ناوچەیە هاتووە، ئەوا ئێوە کە عیساتان بینیوە و ناسیوتانە، دەبوو بزانن کە بێگومان خودی ئەوە.

ئەو پیاوەی کە بە تەمەنتر بوو گوتی: پێویستی نەدەکرد لە گەڵ عیسا قسە بکەین، چونکە ئەگەر ئەو بیویستایە قسەیەك بکرێ، خۆی لەگەڵ ئێمە قسەی دەکرد و، ئەگەر ئێمە قسەمان بکردایە ئەوا لەوانەبوو ببوایەتە هۆی ئەوەی ئەو بترسێ. ئێمە پێشهاتەکانی دوێنێ شەو بە کەس ناڵێین و تۆش بە کەسی مەڵێ، چونکە ڕەنگە ببێتە هۆی ئازاردانی زۆری عیسا و، پێمان وایە عیسا لەو ڕووەوە ئەم ناوچە چۆڵەی بۆ خۆی هەڵبژاردووە بۆئەوەی کەس ئەو نەناسێت و لە ئازاردانی لەلایەن ڕۆمییەکانەوە پارێزراو بێت.

گوتم: ئەگەر ئەو پیاوەی کە ئێمە دوێنێ شەو بینیمان عیسا بێت، لە هیچ کەسێك و بگرە لە ئازاردانی ڕۆمییەکان ناترسێ و، عیسا دوای ئەوەی لەناو گۆڕ هاتۆتە

دەرەوە، لە ڕۆژێکدا کە قوتابییەکانی دەرگاکەیان داخستبوو تا کەس نەچێتە ژوورەوە، بەڵام عیسا چووە ناو ژوورەکەوە و خۆی بەوان نیشان داوە.

دوو سەوڵ لێدەرەکە سەیرێکی یەکتریان کرد و ئەوەیان کە بە تەمەنتر بوو گوتی: ئەی کابرای ڕۆمی، تۆ نابێ باوەڕ بە هەموو قسەیەك بکەیت کە لەلایەن خەڵکی ئەم سەرزەمینەوە پێت دەگوترێ، چونکە خەڵکی ئێرە کەسانێکن کە زوو دەکەونە ژێر کاریگەرییەوە و هێزی خەیاڵیی ئەوان بەهێزە.

ئیتر لە نێوان من و سەوڵ لێدەرەکان هیچ قسەیەك نەکرا و، دوای ئەوەی گەیشتینە تەبەرییە، کرێی گەڕانەوەم بۆ تەبەرییە پێ دان و گەڕامەوە بۆ ئەو میوانخانەیەی کە تێیدا نیشتەجێ ببووم.

دوای ئەوەی چوومە ژوورەکەی خۆم لە میوانخانەکە، خۆشحاڵ بووم کە تەنیام و دەتوانم بە بیرکردنەوەکانی خۆم ڕابگەم. ئەگەر مریەمی بێرت لەگەڵ من بووایە، نەیدەهێشت بە ئاگاییەکی تەواوەوە بیر بکەمەوە.

لەو ژوورەدا دیسان پێشهاتەکانی شەوی ڕابردووم هێنایەوە بەرچاوم و، لەبەرئەوەی بەڵگە ماددی و هەست پێکراوەکانی ڕوودانی ئەو پێشهاتەم لەبەرچاو نەبوو، بۆیە جارێکی تر تووشی گومان بووم و بەخۆم گوت کە ڕەنگە بەهۆی تۆفانی ڕۆژی ڕابردوو و ترسی نوقوم بوون لە دەریاچەی جەلیلە و دوای گەیشتنە کەنارەکە، تووشی ماخۆلان بووبم و، ئەوەی بینیومە جگە لە بۆچوون و خەیاڵات هیچی تر نەبووە.

ئەگەر عیسا بیویستایە خۆی بە من پیشان بدات، خۆی دەناساند و ناوی خۆی دەگوت. کەواتە چۆن دەکرێ عیسا کە نێردراوی خودایە، خۆی بە من پیشان بدات بەڵام خۆی نەناسێنێ و ناوی خۆیم پێ نەڵێت.

## بەنیاز بوون کلودیا ببەن بۆ سێرک

من نەمدەتوانی ئارام بگرم و، بۆئەوەی هاوڕایەك پەیدا بکەم، خزمەتگوزاری میوانخانەکەم نارد بۆ ماڵی کلودیای هاوسەری فەرمانڕەوای گشتی تاکو بزانم دەتوانم بیبینم یان نا.

خزمەتگوزاری میوانخانەکە گەڕایەوە و گوتی: کلودیا پەیامی ناردووە کە ئەمڕۆ ناتوانێ بتبینێ، چونکە ئەمڕۆ هەندێ لە گەورەکانی یودە میوانی ئەون، بەڵام بەیانی بانگهێشتی تۆ دەکات بۆئەوەی بچی بۆ ئەوێ بۆ نانخواردن. ڕۆژی دواتر کلودیا یەکێ لە خزمەتکارەکانی خۆی نارد بۆ میوانخانەکە تاکو پێم ڕابگەیەنێ کە بۆ نانخواردن بڕۆم بۆ ماڵەکەی. کاتێ ڕۆیشتم بۆ ماڵی کلودیا، دیاربوو ئەو ڕۆژە تەنیا من میوانی کلودیا نیم بەڵکو چەند کەسێکی تریش لەوێن. ئەوان بریتی بوون لە ڕاوێژکاری ڕۆمیی هیرودی پادشای گەلی ئیسرائیل و، یۆحەننای خەزنەداری پاشای گەلی ئیسرائیل و ژنەکەی (کە من ژنەکەیم لەماڵی کلودیا بینیبوو). ئەگەرچی لەنێو جوولەکەکاندا نەریتی ئەوە نییە ژنان لەگەڵ پیاواندا نان بخۆن، کەچی ژنەکەی یۆحەننا لەگەڵ مێردەکەی یەکێ بوو لە میوانەکان. میوانەکەی تر پزیشکی تایبەتی هیرود بوو و، بە قسەکانی ئەو پیاوەدا زانیم کە لە دوورگەی (کەراس) زانستی پزیشکی خوێندووە و، لەبەرئەوەی ئەو دوورگەیە پەیوەستە بە یۆنانەوە، بۆیە بەجۆرێك بۆتە خاوەنی خواردنەوەی یۆنانی کە لە یۆنانییەکان زیاتر پێشکەوتووەترە.[٦٤]

پزیشکی پاشای گەلی ئیسرائیل و یۆحەننای خەزنەداری ئەو، بارودۆخی یودە و تەبەرییەیان لە من پرسی، بەڵام من تەنیا لەبارەی سوودەکانی ئاوی گەرمی شاری تەبەرییە قسەم کرد و گوتم کە ئاوی گەرمی شار بۆ من زۆر بەسوود بوو.

دواتر کلودیا هات و ئێمە بۆ نانخواردن ڕۆیشتین بۆ ژوری نانخواردن و دانیشتین و، من بینیم کلودیا ڕەنگی پەڕیوە و ژنەکەی فەرمانڕەوای گشتیش بەردەوام لە بێخەوی خۆی شکایەتی دەکرد و دەیگوت کە گەرماوەی گەرمی سروشتی تەبەرییە

[64] دوورگەی (کەراس) دوورگەیەکە لە دوورگەکانی (دەریای ئیجە_اژە) کە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی دەریای ڕۆم و نزیکی خاکی تورکیای ئێستا کە لە کۆندا گرنگی هەبووە.

هێشتا نەیتوانیووە بێخەرییەکەی لەناو ببات. ئینجا بە منی گوت: مەزن تیوس، حاڵی تۆ چۆنە، ئایا ئەو بێتاقەتییەی کە هەتبوو، نەما؟

گوتم: بەڵێ کلودیا، بێتاقەتییەکەم نەما.

کلودیا گوتی: هیرودی پاشای گەلی ئیسرائیل زۆر بەڕێزە و داوام لێ دەکات و دەڵێ کە نیازی وایە بۆخۆشی پێشبڕکێیەکی گالیسکەسواری ڕێك بخات و، من و ژنەکەی کە ناوی "هیرودیاس"ە و خودی هیرود لە (لۆج)ێکدا[65] ئامادە بین و سەیری پێشبڕکێی گالیسکەسواری بکەین، من هێشتا هیرودیاسی ژنی هیرود کە دەڵێن زۆر جوانە، نەمبینیوە، بەڵام بیستوومە کە هاوسەرگیری ئەو لەگەڵ هیروددا بەپێی یاساکانی جوولەکە، یاسایی نییە.

کاتێ پزیشکەکەی پاشای گەلی ئیسرائیل و خەزنەدارەکەی ئەم گوتەیان بیست، دەستەکانی خۆیان بە واتای ناڕەزایی جوڵاند تاکو نیشانی بدەن کە لە وتەکانی کلودیا ڕازی نین.

کلودیا ژنی فەرمانڕەوای گشتی لە ناڕەزایی و نکۆڵیکردنی ئەوان نەترسا و لە منی پرسی: مەزن تیوس، تۆش ئەمەت بیستووە؟

گوتم: بەڵێ منیش ئەم بابەتەم بیستووە و دەزانم کە هیرودیاس براژنی هیرود بووە و، هیرود دەیویست ئەو بکات بە ژنی خۆی و، پێغەمبەرێك بەناوی یەحیای لەئاوهەڵکێش لەو هاوسەرگیرییە ناڕەزایی دەبڕی و گوتی کە پێچەوانە یاساکانی ئایینی یەهوودییەکانە، بەڵام هیرود سەری یەحیای لەئاوهەڵکێشی لەلاشە جیاکردەوە و هیرودیاسی هێنا و، ئەمڕۆش جوولەکەکان ئەم هاوسەرگیرییە بە پێچەوانەی یاساکانی خۆیان دەزانن.

ئینجا گوتم: پێموایە سێرکی ئەم شارە شوێنی پێشبڕکێکەیە و، هیرود دەیەوێ تۆ بیات بۆ سێرك و لە تەنیشت ژنەکەی خۆی داتبنیشێنێت تا سوود لە ئامادەبوونی تۆ وەربگرێت لەوێ، چونکە کاتێ خەڵك ببینێ کە ژنی فەرمانڕەوای گشتی لە تەنیشت ژنەکەی هیرودی پادشاوە دانیشتووە، بەخۆیان دەڵێن کە ئەگەر هاوسەرگیری هیرود لەگەڵ ژنێکدا کە هاوسەرییەتیەکەی یاسایی نەبووایە، ئەوا ژنەکەی فەرمانڕەوای

---

[65] (لوج) لە فارسیەکەدا بە (لن) نووسراوە کە ژوورێکی بچوکە و لە یارگایەك یان شانۆیەکدا لەو ژوورەدا سەیری یاری دەکرێت. (و.کوردی)

گشتی له تەنیشتیدا دانەدەنیشت. بەڵام پێموایە لەو ڕۆژەدا دەبێ بۆ پاراستنی ئاسایش و ڕێکخستن له سیرك، دوو کوهورت[66] له سەربازانی لژیون ئامادە بن تاکو ڕێگربن له هێرشی خەڵك بۆ سەر هیرود و هاوسەرەکەی.

کلودیا گوتی: من نه دۆستایەتیم لەگەڵ ژنەکەی هیروددا هەیه و نه دوژمنایەتیش و، لەبەرئەوەی ڕۆمیم، گوێ نادەمه ئەوەی له تەنیشت ژنی پاشای گەلی ئیسرائیل دابنیشم، ئیتر ئەگەر ژنەکەی یاسایی بێت یان نایاسایی بێت. بەڵام ئەگەر ئامادە بووەکان که یەهوودین، هێرش بکەنه سەر هیرود و ژنەکەی و ناڕەزایی دەرببڕن و قسەی ناشرین بڵێن، پێت وانییه که سوکایەتی به من دەکرێت و بەوەش سوکایەتی به مێردەکەم دەکرێت؟

ڕاوێژکاری ڕۆمیی پادشای گەلی ئیسرائیل گوتی: ئەگەر خەڵك هێرش بکەنه سەر هیرود و ژنەکەی، ئەوا ئەو داوا له فەرمانڕەوای گشتی دەکات تا گوێی جوولەکەکان ڕابکێشێت و، ئەو هێرشەش به شێوەیەکی تر ڕەنگه دژایەتی حکومەتی ڕۆمی لێ بکەوێتەوە بۆئەوەی فەرمانڕەوا هان بدات تا له یەهوودییەکان تووڕە ببێت.

کلودیا گوتی: مێردەکەی من پیاوێکی میانڕەوە و نایەوێ کارێ بکات که جوولەکەکان ناڕازی بکات و، من دڵنیام هیرود ناتوانێ تووڕەیی مێردەکەم بەسەر جوولەکەکان بوروژێنێ، مەگەر ئەوەی یەهوودییەکان بەڕاستی کارێ بکەن که شایەنی سزادان بن. بەڵام لەبەرئەوەی پێشبینی دەکرێت که خەڵك هێرش بکاته سەر هیرود و ژنەکەی، بۆیه له ڕۆژی پێشبڕکێ گالیسکەسوارییەکەدا به شێوەیەکی ناڕەسمی دەچم بۆ سیرك و له لۆجێکی تایبەتی و دوور له لۆجی پاشای گەلی ئیسرائیل دادەنیشم. بەڵام دوای ئەوەی پێشبڕکێکه تەواو بوو، دەڕۆم بۆ لۆجی پاشای گەلی ئیسرائیل و لەگەڵ ئەو و ژنەکەیدا خۆمان بەیەك دەناسێنین. بەمجۆرە ئەگەر جوولەکەکان هێرش بکەنه سەر هیرود و ژنەکەی، ئەوا لەبەرئەوەی من له لۆجی پاشای گەلی ئیسرائیلدا نیم، سوکایەتی بۆ من ناگەڕێتەوە.

پزیشکی تایبەتی پاشای گەلی ئیسرائیل گوتی: مەزن تیوس، تۆ ڕاست دەڵێیت و جوولەکەکان حەزیان له ئەسپسواری و گالیسکەسواری نییه به تایبەت جوولەکەکانی

---

[66] یەك لژیون له ڕومدا پێك دەهات له شەش هەزار سەرباز، هەر دوو هەزار سەربازیش یەك کوهورتیان پێ دەدەن، کەواته هەر لژیونێك خاوەنی سێ کوهورت بووە.

ئەم ناچەیە کە هەموویان جووتیار یان ڕاوچی ماسین. بەڵام ئێمە حەزمان لە گالیسکەسواری هەیە، چونکە لە شارستانییەتی یۆنان و ڕۆم سوودمەندین و، سێرك لە یۆنان و ڕۆمەوە بۆ ئێرە و شوێنەکانی تر تەشەنەی کردووە و، یەکێ لە هۆکارە کاریگەرەکان بۆ فراوانکردنی شارستانییەتی ولاتێك لە ولاتێکی تر، نمایشەکانی سێرك و نمایشەکانی شانۆیە. بەڵام ئەو پێشبڕکێی گالیسکەسوارییەی کە دێتە پێشمان، دەبێتە یەکێك لە دیارترین پێشبڕکێکانی گالیسکەسواری و، دیمەشق و قەیسەرییە هەندێ ئەسپ دەنێرن بۆ ئێرە بۆ بەشداریکردن لە پێشبڕکێی گالیسکەسواری و، تەنانەت چەند هۆزێکی عەرەبیش ئەسپە ڕەسەنەکان دێنن بۆ ئێرە تاکو لە پێشبڕکێکەدا بەشداری بکەن و، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو هۆزانەی عەرەب کە لەگەڵ یەك دوژمنایەتییان هەیە، ببنە دۆستی یەکتر.

گوتم: لە ڕۆم، دوای ئەوەی پێشبڕکێیەکی گالیسکەسواری کۆتایی هات، ئەوانەی کە دۆڕاندوویانە، دەکەونە گیانی ئەوانەی کە بردوویانەتەوە و، هەندێ جار چەندین کەسیان لێ دەکوژرێ، بەڵام لێرە تەنیا ئەسپەکان دەنێرن بۆ بەشداری کردن لە پێشبڕکێی گالیسکەسوایدا بۆئەوەی ئاشت ببنەوە.

ڕاوێژکاری ڕۆمیی پاشای گەلی ئیسرائیل گوتی: هۆیەکەی ئەوەیە کە هەموو میللەتێك خاوەنی سروشتی تایبەتی خۆیەتی.

ئینجا ڕاوێژکاری ڕۆمیی ڕووی کردە کلودیا و گوتی: خۆشبەختانە مێردەکەی تۆ، ئەو پیاوە ئاژاوەگێڕەی کە پڕوپاگەندەی ئەوەی دەکرد کە پێغەمبەرە، لەخاچ دا و، ئێمەش تاکو ماوەیەك لە شەڕی ئایینی ئاسوودە دەبین. بەڵام ئەگەر ئەو بە زیندوویی بمایەتەوە، ئەوا بەردەوام تووشی شەڕی ئایینی دەبووین.

من لە ڕاوێژکاری ڕۆمیم پرسی: تۆ مەبەستت لە پیاوی ئاژاوەگێڕ، عیسایە؟

ئەو گوتی: بەڵێ.

گوتم: بیستووتە کە ئەو ئێستە لەم ناوچەیەدایە (ناوچەی جەلیلە)؟

ڕاوێژکاری ڕۆمیی گوتی: ئەم قسەیە دانیشتوانی ئەم ناوچەیە دەیکەن کە خەیاڵ پڵاون و، هەموو کەسێ دەزانێ کە مردوو زیندوو نابێتەوە.

دوای ئەم قسەیە ڕاوێژکاری ڕۆمیی لە پزیشکە تایبەتییەکەی هیرودی پرسی: ئایا وانییە؟

پزیشکەکە گوتی: وایە، مردوو زیندوو نابێتەوە. ئەگەر مردوویەك زیندوو بوویەوە، ئەوا بەڵگەی ئەوەیە کە نەمردبوو.

ڕاوێژکاری ڕۆمیی گوتی: باشە دەکرێ زیندوو بە هەڵە بە مردوو بزانرێ؟

پزیشکەکە گوتی: بەڵێ، هەندێ جار هەڵبەت، زۆر بە کەمی ڕوو دەدات کە نیشانەی مەرگ لە کەسێکدا دەردەکەوێت بەبێ ئەوەی مردبێت، بۆیە خەڵك ئەسپەردەی دەکەن و مردووەکەش لەناو گۆڕەکە دێتەوە سەرەخۆ، ئینجا بۆی دەردەکەوێ کە ئەویان ئەسپەردە کردووە و، ئیتر لەبەرئەوەی هەوای پێ ناگات، دەخنکێت و بۆ هەتایە دەمرێ.

ڕاوێژکاری ڕۆمیی گوتی: ئایا عیساش لەم جۆرە کەسانە بووە و بەبێ ئەوەی مردبێت، ئەویان ئەسپەردە کردووە و دواتر لە گۆڕدا زیندوو بۆتەوە و لەوێ هاتۆتە دەرەوە؟

پزیشکەکە گوتی: منیش بیستوومە کە عیسا دوای سێ ڕۆژ کە لە مەرگی تێپەڕ بووە، زیندوو بۆتەوە و لەناو گۆڕەکەی هاتۆتە دەرەوە. من لێکۆڵینەوەم لە هەندێ کەس کرد کە لە ڕۆژی مەرگی عیسادا ئەویان بە خاچەوە بینیوە تاکو بزانم لەخاچدانی عیسا چۆن بووە. ئەوان گوتیان کە ئێسقانەکانی لاقی ئەو دوو کەسەیان شکاندووە کە لە تەنیشتیدا لەخاچ درابوون، بەڵام ئێسکی قاچەکانی عیسایان نەشکاندووە. هەروەها دوای مەرگی عیسا، سەربازێك نێزەکەی بە جەستەیدا ڕۆکرد تاکو بزانێ زیندووە یان مردووە. کاتێکیش نێزەکەی لە جەستەی دەرهێنایەوە، لەو شوێنە کون بووەی لەشی، خوێن هاتۆتە دەرەوە. ئەمە ئەوە نیشان دەدات کە عیسا لەو کاتەدا زیندوو بووە، چونکە ئەگەر زیندوو نەبووایە، لە شوێنە کون بووەکەی لەشی خوێن نەدەهاتە دەرەوە. من پێموایە پێش ئەوەی عیسا لەخاچ بدەین، قوتابییەکانی دەرمانێکی بێهۆشکەریان پێداوە تاکو بە خاچەکەوە وەکو مردوو دەربکەوێت و، لەوانەشە عیسا خۆی دەرمانی بێهۆشکەری دابێتە دەست قوتابییەکانی، چونکە بەو جۆرەی کە بیستوویانە، عیسا پیاوێکی جادووگەر بووە و بە تەکنیکی جادوو بەجۆرێك نەخۆشەکانی مژۆڵ کردووە کە ئەوان وایانزانیوە شیفایان دراوە.

من لەو پزیشکەی کە بە یۆنانی وانەی خوێندبوو، پرسیم: دەکرێ نەخۆشێك کە بەهۆی ئازارەوە دەناڵێنێ و لەتاوا پێچ دەخوات، وابزانێ شیفای دراوە؟

پزیشکەکە گوتی: جادووگەرەکان دەتوانن بەجۆرێك نەخۆش مژۆڵ بکەن کە ئازارەکەی فەرامۆش بکات و وابزانێ شیفای دراوە، بەهەرحاڵ بە بۆچوونی من قوتابییەکانی عیسا، پێش لەخاچدرانی پێشەواکەیان، دەرمانی بێهۆشکەریان پێداوە تاکو بە خاچەکەوە وەکو مردوو دەربکەوێت و، دوای ئەوەی عیسایان خستە ناو گۆڕەوە، قوتابییەکانی ئەویان لەناو گۆڕەکە هێناوەتە دەرەوە و بردوویانە و عیسا هاتۆتەوە سەرهۆش، بۆیەشە هەندێ کەس ئەویان بینیوە.

ڕاوێژکاری ڕۆمیی بە پزیشکەکەی گوت: ئایا دەزانی کە تۆ حکومەتی ڕۆم تاوانبار دەکەیت؟

پزیشکەکە گوتی: چۆن؟

ڕاوێژکاری ڕۆمیی پاشای یەهوودییەکان گوتی: هیچ لە دنیادا ئەوەندەی ڕۆمییەکان لە لەخاچداندا پسپۆڕ نین و مەحاڵە حکومەتی ڕۆم کەسێك لەخاچ بدات و بە زیندوویی بمێنێتەوە، مەگەر دوای یەك دوو کاتژمێر دوای لەخاچدان بیهێننە خوارەوە. بەو جۆرەی کە من بیستوومە، عیسا بە ڕەچاوکردنی تەواوی ئەو یاسایانەی پەیوەستن بە لەخاچدانەوە، لەخاچ دراوە و بە قەدەر ئەو دوو کەسەی کە لە تەنیشتی ئەودا لەخاچدرابوون، بەخاچەکەوە ماوەتەوە، ئیتر چۆن دەکرێ بە زیندوویی مابێتەوە؟ چۆن دەکرێ حکومەتی ڕۆم کەسێك لەخاچ بدات و گیانی تیادا بمێنێ؟ من دڵنیام کە ئەگەر پونتوس پیلات ئەم قسەیە لە تۆ ببیستێ، تووڕە دەبێ، چونکە قسەکەی تۆ وانیشان ئەدات کە ئەو، کە فەرمانڕەوایەکی ڕۆمییە، ناتوانێ بە باشی کەسێك لەخاچ بدات. دەکرێ ڕەخنە لە ڕەوتی حکومەتی ڕۆم بگرن و سیاسەتەکەی پەسەند نەکەن، بەڵام ناتوانن لەڕووی لەخاچدانەوە ڕخنە لە حوکمەتی ڕۆم بگرن، چونکە لەم بەشە خاکەدا حوکمەتی ڕۆم ڕکابەر و وێنەی نییە.

من گوتم: ئەو ڕۆژەی کە عیسایان لەخاچ دا، من ڕۆشتم و گەیشتمە دەروازەی شار و ویستم بڕۆمە ناو شارەکەوە و بینیم لە نزیك دەروازەی شاردا سێ کەسیان لەخاچ داوە. ئێوە دەزانن کە بۆ ڕۆمییەك، یەك یان چەندین خاچ شتێکی نەبینراو نییە، بەڵام قیافەی ئەو پیاوەی کە لە ناوەڕاستدا لەخاچ درابوو، سەرنجی منی ڕاکێشا، بۆیە منیش ڕاوەستام و پێیان گوتم کە ئەوە عیسایە. من تا ئەوکاتەی کە عیسا ماڵئاوایی لە ژیان کرد، لەلای خاچەکەیدا بووم و دەتوانم بڵێم کە عیسا پێش ئەوەی لەخاچ بهێنرێتە

خوارەوە،ماڵئاوایی لە ژیان کردبوو. تەنانەت ئەگەر واش بزانین کە عیسا زیندوو بووە، بەڵام دوای ئەوەی یەکێ لە سەربازەکان نێزەکەی خۆی کرد بەناو دڵیدا، گیانی لەدەست دا، چونکە من بینیم کە نێزەکە چوو بە دڵی عیسادا و، مەحاڵە نێزە بڕوا بەناو دڵی مرۆڤدا و ئەو کەسە بە زیندوویی بمێنێتەوە.

بەڵام پزیشکی تایبەتی گەلی ئیسرائیل قسەکەی منی پەسەند نەکرد و گوتی: نە تۆ پزیشکیت و نە ئەو ئەفسەرەی کە لەلای خاچەکەی عیسادا بووە و نە سەربازانی لژیونیش کە لەوێ ئامادە بوون.

ئینجا پزیشکەکە ڕوونکردنەوەی دا و هەندێ بەڵگە و شتی گوت کە زیندوویان بە مردوو زانیووە و ئەسپەردەشیان کردووە.

لەناکاو کلودیا بە دوو پەنجە، گوێی خۆی گرت و بە دەنگێکی ناڕەزاییەوە گوتی: بەسە... بەسە. ئەوەندەی کە باسی مردووەکانتان کرد بەسە و، من کە تووشی بێخەوی بووم، دڵنیام ئەمشەو ناتوانم تا بەیانی بنووم، چونکە وێنەی زیندوو بوونەوەی مردووەکان لەگۆڕدا دێتە بەرچاوم.

پزیشکەکە بێدەنگ بوو و، بۆئەوەی بابەتی گفتوگۆکە بگۆڕێت، ڕووی کردە من و گوتی: ئایا ئەوە ڕاستە کە مریەمی مەجدەلییە ئیشەکەی پێشووی خۆی گۆڕیوە؟

ئەم پرسیارە ئەوەندە بێزارکەر بوو کە هەموو لایەك بێدەنگ بوون و، نە من هیچم گوت و نە ئەوانی تریش.

پزیشکەکە بە سەرسوڕمانەوە سەیری یەکە بەیەکەی ئێمەی کرد و گوتی: من قسەیەکی نابەجێم کرد کە بووە هۆی ئەوەی بێدەنگ بن؟ دانیشتوانی ئەم خاکە کە ناوچەی جەلیلەی پێ دەڵێن، دوو سەد هەزار کەسن، ئەگەرچی کە ناوچەیەکی بچووکە و لەبەرئەوەش کە دەریاچەی جەلیلە کەوتۆتە ناوەڕاستی ئەم ناوچەیە و شار و شارۆچکەکان لە دەوروبەری دەریاچەکەدان و خەڵك بۆ هاتوچۆ کردن سوود لە بەلەم وەردەگرن و بە دەریاچەکەدا تێدەپەڕن، بەڵام هەر گەشتیارێك کە لە دەرەوە بێت بۆ ئەم ناوچەیە، دەناسرێت و هەموو کەسێکیش بینیویانە کە تۆ ئەی مەزن تیوس، ڕۆشتوویت بۆ ماڵی مریەمی مەجدەلییە و، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە لێرە هەموو کەسێ مریەمی مەجدەلییە دەناسن و بینیویانە کە تۆ لەگەڵ کچێکی گەنجدا ڕۆیشتووی بۆ

ماڵی ئەو و کچەکەت لەوێ داناوە، چونکە کاتێ لەو ماڵە هاتوویتە دەرەوە، کچە گەنجەکەت لەگەڵ نەبووە.

من وەڵامم نەدایەوە و پزیشکی تایبەتی پاشای ئیسرائیل دیسان گوتی: هەموو کەسێ دڵنیان کە مریەمی مەجدەلییە ژنێکی ترسناکە و دەبێ مرۆڤ خۆی بە دوور بگرێ لە تێکەڵاوبوون لەگەڵیدا. ئەم ژنە لە گەنجیدا لەگەڵ پیاوێکی شاعیر لە بیابانەکانی فەلەستیندا دەگەڕا و، خەڵکی پەرێشان دەکرد و ئەوانی لە ڕێگەی ڕاست وەردەگێڕا. لەم دواییانەشدا کەوتە شوێن عیسا و هەموومان دەزانین کە عیساش پیاوێکی ئاژاوەگێڕ بووە.

یۆحەننا گوتی: ژنەکەی من مریەمی مەجدەلییە دەناسێت و دەزانێ کە ئەو یەکێك بووە لە شوێنکەوتووانی عیسا. عیسا نەك تەنیا مریەمی مەجدەلییەی شیفا داوە کە نەخۆش بوو، بەڵکو ئەوی بەرەو ڕێگای ڕاستیش ڕێنوێنی کردووە و، مریەمی مەجدەلییە بەهۆی ناسینی عیساوە گۆڕاوە بە ژنێکی خۆپارێز. هەروەها لەبارەی ئەوەی کە گوتت عیسا پیاوێکی ئاژاوەگێڕ بوو، من لە وەڵامدا دەڵێم کە ئەو، نە ئاژاوەگێڕ بوو و نە کوفریشی دەکرد و نە کەسیشی ئازار داوە و، ژنەکەی من کە لێرە ئامادەیە، ماوەیەك لەگەڵ ئەودا بووە و دەڵێ کە عیسا میهرەبانی و بێ فیزییەکی سروشتی هەبووە.

پزیشکی تایبەتی پاشای گەلی ئیسرائیل پرسی: ژنەکەی تۆ بۆچی بوو بە شوێنکەوتەی عیسا؟

یۆحەننا وەڵامی دایەوە: ژنەکەی من خزمێکی هەبوو کە تووشی لەرز و تا ببوو و هیچ پزیشکێ نەیانتوانی نەخۆشییەکەی چارەسەر بکات، بەڵام عیسا هەرکە ئەوی بینی، شیفای دا و، بۆیە ژنەکەی من لەوکاتەوە بوو بە شوێنکەوتەی عیسا.

دوای ئەم قسەیە یۆحەننا دەنگی خۆی بەرزتر کردەوە و گوتی: تا ئەوکاتەی کە عیسا لێرە بوو، فەریسییەکان هەموو ڕۆژێ دەهاتن بۆلای و ئەویان دەهێنایە قسە تا بزانن دەتوانن بە کوفر تاوانباری بکەن یان نا، بەڵام بچوکترین وشە کە بۆنی کوفری لێ بێت، لەزمانی عیسایان نەبیست. ئەگەر عیسا لێرە نەڕۆیشتایە و گرفتاری ئەنجومەنی باڵای جوولەکەکان نەبووایە، نەدەکوژرا. عیسا دەیگوت مرۆڤ دەبێ بە ڕۆح و دڵی خۆی خوداوەند بناسێ. هەروەها دەیگوت کە خوداوەند پێویستی بە دیارییەکانی مرۆڤ

نییە، چونکە بێ نیازە. ئەنجومەنی باڵای جوولەکەکان کاتێ ئەم قسەیان بیست، لەرزیان لێ هات، چونکە دەیانزانی کە ئەگەر ئەو قسەیەی عیسا بچێ بە گوێی جوولەکەکاندا، داهاتی پەرەستگا بەیەکجاری دەوەستێ، چونکە خەڵك لەو ڕووەوە پارە و دیاری جۆراوجۆری تر دەدەن بە پەرستگا، چونکە بڕوایان وایە کە دەگاتە دەستی خودا و، ئەگەر بزانن کە خوداوەند پێویستی بە پارە و دیاری تر نییە، ئەوا ئیتر دیاری نادەن بە پەرستگا و داهاتە زۆرەکەی پەرەستگا دەوەستێ.

ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای جوولەکەکان بیریان لەوە نەکردەوە کە بڕواداران بەهۆی ئەوەی کە ناچارن بەشێك لە داهاتی خۆیان بدەن بە پەرستگا_ بۆئەوەی بگاتە دەستی خودا_ داماو دەبن و لەپێ دەکەون. ئەمڕۆ جووتیارێکی یەهوودی لەم وڵاتەدا شەش جۆر باج دەدات، یەکەمیان ئەو باجەیە کە دەبێ بیدات بە پەرستگا بەناوی ئەوەی کە دەگاتە دەستی خودا. دووەم ئەو باجانەیە کە دەبێ بیدات بە پاشای گەلی ئیسرائیل. سێیەم ئەو باجەیە کە دەبێ بیدات بە ڕۆمییەکان. چوارەم ئەو باجەیە کە تایبەتە بە زەوی و زار کە لە هەموو جووتیارێك وەردەگیرێ. پێنجەم باجی ڕێگایە کە بە ناوی باجی ڕێگاوە هەمیشە لە جووتیارەکان وەردەگیرێ. شەشەم باجی (خوێ)یە.[٦٧]

لەهەموو ئەم باجانە گرانتر ئەو باجەیە کە یەهوودییەکان دەبێ بیدەن بە پەرستگا تا بە بۆچوونی خۆیان بگاتە دەستی خودا. ئەگەر ئەم باجە هەڵبوەشێنرێتەوە ئەوا پێدانی باجەکانی تر بۆ خەڵك دژوار نابێ. عیسا کە دەیزانی پێدانی باج بە پەرستگا خەڵکی هەژار کردووە و ڕێ لەوە دەگرێ کە ئەوان ببنە خاوەنی پارەی خۆیان، گوتی کە خوداوەند پێویستی بە دیارییەکانی مرۆڤ نییە. ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکانیش بۆیە ئەویان کوشت بۆئەوەی داهاتە زۆرەکەی پەرەستگا نەبڕێ.

ڕاوێژکاری ڕۆمیی پاشای گەلی ئیسرائیل گوتی: لەبەرئەوەی باس لە پێدانی باج و هەروەها باسی باجی خوێ بە ڕۆمییەکان کرا، پێویستە ئەوە ڕوون بکەمەوە کە ئەو

---

[67] لە هەندێ لە شارەکانی ئیمپراتۆری ڕۆم (خوێ) کەم بوو. ڕۆمییەکان خوێیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە و لە وڵاتەکانی ترەوە دەیاننارد بۆ ئەو مەملەکەتانەی کە خوێیان کەم بووە و بە نرخێکی گران دەیانفرۆشت و بەوەیان دەگوت (باجی خوێ). ئەم ئاکارە دوای نەمانی ئیمپراتۆری ڕۆم لەو شارانەی کە سەر بە ئیمپراتۆر بوون وەکو وڵاتی فەڕەنسا، مایەوە و دەسەڵاتدارانی فەڕەنسا خوێیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە و بە نرخی گران دەیانفرۆشت بەخەڵك تاکو باجێکی زۆریان بۆ کارگەکانی خوێ کۆ کردەوە و، لە وڵاتی فەڕەنسا، باجی خوێ چەندین جار خەڵکی بەرەو یاخی بوون بردووە. کارگەی خوێ دروست کردن بریتی بوو لە جێگەیەك کە دەکەوتە کەناری دەریاوە و ئاوی دەریایان تێ دەکرد تاکو بە هۆی گەرمی خۆرەوە ببێ بە هەڵم و خوێیەکەی بمێنێتەوە و لە ویلایەتەکانی (گیلان) و (مازندەران)ی ئێرانیش، بە هەمان جۆر خوێیان لە ئاوی دەریا وەگرتووە.

باجەی ڕۆمییەکان کە لە خەڵکی ئەم وڵاتەی وەردەگرن، یەك لەسەر بیستی ئەو باجەیە کە پەرستگا لێیان وەردەگرێت، هەروەها باجی خوێ بۆ حکومەتی ڕۆم هیچ سوودێکی نییە، مەگەر ساڵی وا هەبێ حکومەتی ڕۆم زەرەری گواستنەوەی خوێ لە (دوورگەی سیسیل) یان "کارتاژ"[68] کە دێت بۆ ئێرە، بدات. ئێوە وادەزانن کە حکومەتی ڕۆم سوود لە باجی خوێ وەردەگرێ، لە کاتێکدا کە ئەم باجە کرێی ئەو شتانەیە کە لە دەوروبەرەوە خوێ دێنن بۆ ئەم وڵاتە. خوێی دەریای مردووش باش نییە و زۆر زوو مرۆڤ تووشی نەخۆشی دەکات، ئەگینا حکومەتی ڕۆم وازی لە گواستنەوەی خوێ دەهێنا بۆ ئەم وڵاتە بۆئەوەی خەڵك خوێی دەریای مردوو بەکار بهێنن. هەرچۆنێ بێ ڕۆم حەزناکات فشار بخاتە سەر خەڵکی ئەم وڵاتە و باجی زۆریان لێ وەربگرێت.

کلودیا گوتی: هەرچۆنێ بێ عیسا پیاوێکی چاکەکار و خۆپارێز بوو، ئەگەر جوولەکەکان فشاریان بۆ نەهێنایە، مەحاڵ بوو مێردەکەی من فەرمانی لەسێدارەدانی دەربکردایە.

دوای ئەم قسەیە، کلودیا سەرنێشەی کرد بە بیانوو و ڕۆیشت پشوو بدات و، پزیشکە تایبەتییەکەی پاشای ڕۆمیش ڕۆشت تا دەوا بدات بە کلودیا. یۆحەننا و ژنەکەی ئەویش کارەکانیماڵەوەیان کرد بە بیانوو و ڕۆیشتن و جگە لە من و ڕاوێژکاری ڕۆمیی پاشای گەلی ئیسرائیل، کەسی تر لەو ژوورەدا نەمایەوە. ئەو، لەبارەی بارودۆخی سیاسی ڕۆمەوە پرسیاری لێ کردم. من بۆئەوەی وەڵام نەدەمەوە گوتم: ماوەی ساڵێکە من لە ڕۆم دەرچووم و هیچ پەیوەندیم بەوێوە نییە و لە بارودۆخی سیاسی ڕۆم بێ هەواڵم و، نازانم ئێستە کێ لەوێ دەسەڵاتی هەیە و کێ نییەتی.

ڕاوێژکاری ڕۆمیی گوتی: ئەگەر ڕات لێ بێ، با دوای ئەوەی لێرە چووینە دەرەوە، کەمێ بگەڕێین.

گوتم: پێم وانییە گەڕان بۆ پیاوێك باش بێت کە تازە لەسەر جێگای نەخۆشی هەستاوەتەوە.

ڕاوێژکار گوتی: مەزن تیوس، من و تۆ هەردووکمان ڕۆمین و من ناتوانم بەبێ گەڕان شەو بەسەر بەرم.

گوتم: لێم ببورە، چونکە دۆخی میزاجیم ڕێم پێ نادات بگەڕێم.

---

[68] (کارتاژ) وڵاتێ بوو کە ئەمڕۆ پێ ی دەڵێن (تونس).

ڕاوێژکار گوتی: ڕەنگە بترسی لەوەی پارە خەرج بکەیت. ئەگەر لە پارە خەرج کردن دەترسی پێت دەڵێم میوانی منیت و من کرێی گەڕانەکەی تۆ دەدەم.

لەو کاتەدا پزیشکی تایبەتی پاشای گەلی ئیسرائیل کە ڕۆشتبوو دەوا بدات بە کلودیا، گەڕایەوە و بە هۆی هاتنی ئەو، گفتوگۆی من و ڕاوێژکاری ڕۆمیی پادشا بڕا. من دەمزانی کە ئەو پیاوە دەیەوێ من ببات بۆ ئەو جێگایانەی کە ناوەندی خراپەکارییە و منیش ڕقم لە ڕۆشتن بوو بۆ ئەو شوێنانە. پزیشکی تایبەتی پاشا ویستی بڕوات و ڕوێژکارە ڕۆمییەکەش کە زانی من حەزم لێی نییە لەگەڵ ئەودا بڕۆم، هەستا وماڵئاوایی لێ کردم و ڕۆشت.

منیش کە تەنیا مابوومەوە و ویستم بگەڕێمەوە، کەنیزێك هات و پێی گوتم: کلودیا بانگت دەکات.

بە هاوکاری ئەو کەنیزەکە ڕۆشتم بۆ ژوورەکەی کلودیا و بە کەمێك سەرسوڕمانەوە بینیم کە یۆحەننا و ژنەکەی کە گوتیان بۆ کارە پێویستییەکانی ماڵەوە دەڕۆنەوە، لەوێن.

یۆحەننا پێی گوتم: من و ژنەکەم ویستمان بڕۆین بۆ ماڵی خۆمان، بەڵام کلودیا ئێمەی بانگ کرد و گوتی ((باشتروایە تۆش لە گفتوگۆکردنی ئێمەدا بەشداری بکەیت)).

کلودیا بەمنی گوت: مەزن تیوس، من بۆئەوە تۆم بانگ کرد بۆئەوەی بێیت بۆ ئێرە تا بە ئامادە بوونی تۆ گفتوگۆ بکەین و، جارێ بڵێ کە پاش ئەوەی تۆ مریەمی مەجدەلییەت بینی، لەبارەی عیساوە چی گوت و ئایا ئەوی بینیوە یان نا؟

گوتم: کلودیا نەخێر، مریەمی مەجدەلییە عیسای نەبینیوە.

کلودیا بە یۆحەننای گوت: ئێستە ئەوە بگێڕەوە کە بیستووتە.

ئەو پیاوە گوتی: ئەوەی من بیستومە ئەوەیە کە لە ناوچەی (ناین) کە دەکەوێتە ئەم وڵاتەوە، دوو پیاوی شوانکار عیسایان بینیوە و بە چاکی ئەویان ناسیوە و، یەکێ لەوان بۆ پارێزگاری کردن لە ڕانەمەڕەکەیان ماوەتەوە و ئەوی تریان خۆی گەیاندۆتە گوندەکە بۆئەوەی بە خەڵك ڕابگەیەنێ کە عیسا دەرکەوتووە. بەڵام کاتێ خەڵك لە ئاوایی چوونەتە دەرەوە و هاتوون بۆ ئەو شوێنەی کە عیسای تێدا بینراوە، نەیانبینیوە و عیسا دیارنەماوە.

کلوديا گوتی: من دەبێ بڵێم کە هاتنی من بۆ ئێرە بۆئەوە نەبوو کە جەستەم بە ئاوی گەرمی تەبەرییە بشۆم. سوود وەرگرتن لە ئاوی گەرمی ئێرە بەهانەیە و، من بۆئەوە هاتووم بۆ ئێرە تاکو عیسا ببینم و، ئەویش شیفای من بدات و تەندروستیم بگەڕێتەوە، بەڵام سەرم لەوە سوڕدەمێنێ کە بۆچی خۆی نیشانی من نادات. عیسا کەسێکە دەتوانێ لە بەربەستەکان تێپەڕ ببێت و لە دەرگای داخراوەوە گوزەر بکات، بۆیەشە بە ئاسانی دەتوانێ خۆی نیشانی من بدات. من لە هەڵمژینی بۆنی گۆگردی ئاوی گەرمی ئێرە ماندوو بووم و ئیتر حەز ناکەم لە ئاوی گەرمی ئێرەدا خۆم بشۆم، بە تایبەتی کاتێ دەزانم کە هیچ سوودێکی نییە. جگە لە مەسەلەی ڕق لێبوونەوەم لە ئاوی گەرمی ئەم شارە، کێشەیەکی تریشم بۆ هاتۆتە پێش، ئەویش نەبوونی جلێکی گونجاوە بۆ ئامادەبوون لە مەیدانی پێشبڕکێی گالیسکەسوارییەکەدا. من کاتێ دەمویست بێم بۆ ئەم شارە، پێشبینیم نەدەکرد کە دەبێ لە مەیدانی گالیسکەسواریدا ئامادە بیم، هەربۆیە جلێکی گونجاوم لە گەڵ خۆم نەهێنا.

یۆحەننا گوتی: من ئەم بابەتە بە ڕاوێژکاری هیرود ڕادەگەیەنم تاکو پادشا بڵێ کە جلێکی باش بۆ تۆ بنێرن و، من دڵنیام پۆشاکێکت ئاوریشمیت بۆ دەنێرێ.

کلوديا گوتی: من حەزناکەم هیچ دیارییەك لە پاشای جوولەکەکان وەربگرم، چونکە ژنێکی وەکو من نابێ هیچ دیارییەك لە جوولەکەکان وەربگرێت، تەنانەت ئەگەر پاشاکەشیان بێت. تۆش لەبارەی ئەم بابەتەوە هیچ بە ڕاوێژکاری ڕۆمیی پاشا مەڵێ تاکو ئەویش داوای جل بۆ من نەکات.

دوای ئەوە کلوديا ڕووی کردە من و گوتی: مەزن تیوس باش من دەناسێ و دەزانێ لەو ژنانە نیم کە حەزم لە ڕووکەشی بێت.

من لەو ڕووەوە دەمەوێ بە پۆشاکێکی باش لە مەیدانی پێشبڕکێی گالیسکە سواریدا ئامادە بم، چونکە ناچارم ڕەچاوی پلەوپایەی مێردەکەم و ئابڕووی ڕۆم بکەم. من لەم وڵاتەدا دیارترین ژنی ڕۆمیم و، ئەگەر ژنێکی ئاوا بە پۆشاکێکی ناپەسەندەوە لە پێشبڕکێی گالیسکەسواریدا ئامادە بێت، ئەوا دەبێتە هۆی سەرشۆڕی مێردەکەی و ئابڕووی ڕۆم دەبات، بەڵام ئەمانە کۆمەڵێك شتن کە پیاوان سەری لێ دەرناکەن.

گوتم: کلوديا ڕاست دەکات و ئەمانە کۆمەڵێك شتن کە پیاوان، هەر بەو جۆرەی کە من ناتوانم تێبگەم کە تۆ بۆچی حەز دەکەیت بە پۆشاکی باشەوە لە مەیدانی پێشبڕکێی

گالیسکەسواریدا ئامادە بیت، ناتوانن سەری لێ دەربکەن. تۆ لەجیاتی ئەوەی کە لەبیری عیسادا بیت، لەبیری ئامادە بوونتدایت لە مەیدانی پێشبڕکێی گالیسکەسواریدا و لەبیری ئەوەدایت کە بۆ ئامادە بوون لەو مەیدانەدا چی پۆشاکێ لەبەر بکەیت!

کلودیا گوتی: مەزن تیوس، من هەموو شەوێ تووشی خەیالات دەبم و تا بەیانی ماخۆلان نایەڵێ بخەوم. من نکوڵیم لەوە نییە کە عیسا سەرقاڵی بەدیهێنانی مەلەکوتی نادیاری خۆیەتی. بەڵام لەبەرئەوەی شەو تا بەیانی مژۆڵی جیهانە نادیارەکانم، بۆیە بهێڵە با بەیانی تا شەو مژۆڵی جیهانە دیارەکان بم.

ئیتر لەنێوان ئێمەدا هیچ گفتوگۆیەك نەکرا و، من ماڵئاواییم لە کلودیا و ئەوانی تر کرد و لە ماڵی ژنەکەی فەرمانڕەوای گشتی چوومە دەرەوە تا بگەڕێمەوە بۆ ئەو میوانخانەیەی کە شوێنی نیشتەجێی من بوو.

لە ڕێگادا کاتێ لە تەنیشت دیواری باخێکە تێدەپەڕیم، بینیم ژنێك لەوێدا دانیشتووە. ئەو ژنە بەجۆرێك بەری ڕوخساری خۆی گرتبوو کە ڕوخساریم نەدەبینی، بەڵام دیاربوو کە چاوەڕێی منە، چونکە هەرکە منی بینی، لە جێی خۆی هەستایەوە و بە ناوی خۆم بانگی کردم. بە بیستنی ناوی خۆم لە دەمی ئەو ژنەوە، سەرم سوڕما، بۆیە لێی نزیك بوومەوە تا ڕوخساری ببینم.

ژنەکە بە هێواشی گوتی: لەپێشمەوە بڕۆ و بە کۆڵانی باخەکاندا بڕۆ بۆ ڕۆخی دەریاچەکە و منیش بە دواتدا دێم.

ڕەنگە ئەگەر ژنێکی تر لەو کاتی شەوەدا بە منی بگوتایە بڕۆ بۆ لێواری دەریاچەکە و منیش بە دواتدا دێم، ئەوا من وامدەزانی نیازی وایە تووشی گوناهێکم بکات، بەڵام ئەو ژنە بە ئاوازێك ئەو قسەیەی کرد کە دیاربوو بۆ مەبەستێکی تر دەمبات بۆ لێواری دەریاچە.

دوای تێپەڕ بوون لە کۆڵانی باخەکان، گەیشتینە لێواری دەریاچەکە. ئەو شوێنەی کە گەیشتینێ، لێواری دەریاچەی جەلیلە بوو کە زۆر چۆڵ بوو. نە هیچ کەسێ دەنگی گفتوگۆی ئێمەی دەبیست و نە ئێمەشی دەبینی. لەوێدا ئەو ژنە باڵاپۆشەکەی لە ڕوخساری لادا و من سەیرم کرد سوزمانە. ئەو ژنە ئەگەرچی کە خۆی بە من ناساند، بەڵام سڵاوی نەکرد و لە بینینی من هەستی بە خۆشحاڵی نەکرد.

من بە توڕەییەوە پێم گوت: سوزمان بۆچی تۆ و ناتان لەلای من هەڵهاتن، ئەی ناتان گوێدرێژەکانی چی لێ کردووە و ئایا ئەو کیسە پارەیەی لەلا ماوە کە پێمدا، یان خەرجی کردووە؟

سوزمان گوتی: نە من لە تۆ هەڵهاتووم و نە ناتانیش. کیسە پارەکەی تۆش لەلای ناتانە و گوێدرێژەکانیش هیچیان لێ نەهاتووە.

گوتم: ناتان لە کوێیە و گوێدرێژەکانی چی لێ کردووە؟

سوزمان گوتی: لەبەرئەوەی لە شاری کوفرناعوم بینایەکی نوێ بۆ گومرك دروست دەکەن و پێویستیان بە قوم و گەچ هەبوو، ناتان بە گوێدرێژەکانی تۆ قوم و گەچی دەگەیاندە ئەوێ و، ئەو کاتەی کە تۆ لێرە پشوت دەدا، ئەو کاری دەکرد و سەرمایەکەتی زیاد کردووە و، هەرکاتێ بتەوێ دەتوانی سەرمایەکەی خۆت و گوێدرێژەکانیشت وەربگریتەوە.

گوتم: ئێوە ڕۆشتبوون تا سەبارەت بە عیسا پرسوجۆ بکەن و بزانن ئایا لەم ناوچەیەدایە یان نا.

سوزمان گوتی: بێگومان عیسا لەم ناوچەیەدایە و خۆی بە ژمارەیەك لە شوێنکەوتوانی لە لێواری ئەم دەریاچەیەدا نیشان داوە و تەنانەت لەگەڵیشیاندا نانی خواردووە و گوتویەتی کە شەمعون پترۆس شوانکاری ئێوەیە.[69] واتای شوانکار ئەوەیە کە سەرپەرشتی لە مەڕەکان بکات و، شەمعون پترۆس دەبێ سەرپەرشتی تەواوی ئەو کەسانەی کە بڕوایان بەعیسا هەیە، بگرێتە ئەستۆ. بەڵام ئەو پیاوە دەمارگیرە و تەنیا سەرپەرشتی ئەو کەسانە دەگرێتە ئەستۆ کە لە نەوەی ئیسرائیل بن و، ئەگەر ئەو کەسانە پیاو بن، دەبێ خەتەنە کرابن. تۆ ئەی مەزن تیوس، لەبەرئەوەی ڕۆمیت و خەتەنە نەکراویت، لەلایەن شەمعون پترۆسەوە پشتگیری ناکرێیت. من سەیرم لێ دێت کە بۆچی عیسا پیاوێکی وەکو شەمعون پترۆسی هەڵبژاردووە بۆ ڕابەرایەتیکردنی پەیڕەوانی خۆی، لەکاتێکدا کە دەتوانێ هەندێ کەس هەڵبژێرێ کەباشترن لەو، چونکە ئەم پیاوە جارێکیان دژی عیسا بوو و دەیگوت کە ئەو نێردراوی خودا نییە. بەڵام

---

[69] هەموو ناوی قوتابییەکانی عیسا (ع) کە لەم سەرگورشتەیەدا ناوبراوە، مێژووییە و هەروەها ئەو ژمارە کەمەی ناوە مێژووییەکانی ئەم سەرگوزشتەیەم بە بەراورد لەگەڵ هەمان ئەو ناوانەی کە لە وەرگێڕدراوە فارسیەکەی ئینجیلدا کە لە تاران و وڵاتەکاندا لەبەردەستدایە، وەرمگێڕاوە و شەمعون پترۆس لە دەقە ئینگلیزیەکەی ئەم سەرگورشتەیەدا کە وەرگێڕدراوە، بە(سیمۆن پترۆس) نووسراوە.

ناتوانرێ نکۆڵی لەوە بکرێ کە شەمعون پترۆس پیاوێکی بەهێزە و ڕەنگە هەر بەم بۆنەیەوە بێت کە عیسا ئەوی بۆ ڕابەری شوێنکەوتوانی خۆی هەڵبژاردووە.

دوای ئەم گوتەیە سوزمان چەمایەوە و دەستی هێنا بە پێیەکانی خۆیدا و گوتی: پێیەکانی من ئازاریان هەیە، چونکە لە کوفرناعومەوە تا ئێرە بە پێ هاتووم و، هەڵبەت لەو ڕێگەیەدا دەبێ بە بەلەم ڕێ بکەیت، بۆیە سواری بەلەم ببووم بەڵام دوای ئەوە بە پێ ڕێگاکەم بڕیوە.

گوتم: سوزمان، ئەو بابەتەی کە سەبارەت بە دەرکەوتنی عیسا لەنێو قوتابییەکانیدا لە لێواری ئەم دەریاچەیەدا و، نانخواردن لەگەڵیاندا و هەڵبژاردنی شەمعون پترۆس بۆ شوانکاری یان ڕابەرایەتی پەیڕەوانی عیساوە باست لێوە کرد، لە خودی قوتابییەکانی عیسات بیستووە یان نا؟

سوزمان گوتی: من پیرەژنم و کەس لەگەڵ پرەژنێکدا قسە ناکات تا زانیاری پێ بدات. هیچ یەکێ لەو شوێنکەوتووانەی عیسا کە لە لێواری ئەم دەریاچەیەدا ئەویان بینیوە و قسەیان لەگەڵ کردووە، لەگەڵ من قسەیان نەکردووە. بەڵام بێگومانم کە عیسا لە لێواری ئەم دەریاچەیەدا خۆی بە شوێنکەوتووەکانی نیشان داوە. من ئەگەرچی بەهۆی بە پێ ڕۆشتنێکی زۆر ماندوو بووم، بەڵام ئەو بەپێ ڕۆیشتنە بووە هۆی ئەوەی کە توانیم لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانە قسە بکەم کە لە لێواری ئەم دەریاچەیەدا نیشتەجێن، لە ڕاوچییەکانی ماسی بگرە تا ئەو کەسانەی سکی ماسی هەڵدەدڕن تا ئەوەی لەناو سکی ئەو گیانەوەرەدا هەیە دەری بهێنن و ئەوانەی کە خوێ بە ماسییەوە دەکەن و دەیکەنە ناو خومرەوە بۆئەوەی ببێ بە ماسی سوێر و ئەو کەسانەی کە ماسی دەبرژێنن، قسەم لەگەڵ کردوون. ئەوان هەموویان بڕوایان وایە کە مەسیح دوای ئەوەی کە زیندوو بوویەوە و لەناو گۆڕەکەی هاتە دەرەوە، گەڕاوەتەوە و لە لێواری ئەم دەریاچەیەدا خۆی بە شوێنکەوتووانی نیشان داوە و، یەکێ لەو کەسانەش کە ئەم بابەتەی بە من گوت، ناتان بوو. ناتان پیاوێکی ڕاستگۆیە و گومان لە ڕاستی قسەکەیدا نییە.

ئەو بە منی گوت ((ئەی سوزمان، کاتێ مەزن تیوست بینی لە لایەن منەوە پێی بڵێ کە بێگومان عیسای پێغەمبەری خودا لەناو گۆڕەکەی زیندوو بۆتەوە و لە

مەزارەکەی هاتۆتە دەرەوە و خۆی گەیاندۆتە ئێرە و، خۆی بە شوێنکەوتووەکانی نیشان داوە)). دوای ئەم قسەیە سوزمان کەوتە گریان.

من لێم پرسی: بۆچی دەگرییت؟

سوزمان گوتی: من لەخۆشیدا دەگریم.

من گوتم: سوزمان، من سەرم لەوە سوڕدەمێنی کە بۆچی عیسا خۆی بە تۆ و مریەمی مەجدەلییە نیشان نەدا، چونکە خۆ ئێوە بە ڕاستی بڕواتان بەو هەیە!

سوزمان گوتی: بۆچی عیسا خۆی بە من نیشان بدات. ئێمە ئافرەتین و ئەوەندە گرنگ نین تا عیسا خۆی بە ئێمە نیشان بدات.

دوای ئەوەی کە عیسا هات بۆ ئەم ناوچەیە، لە لێواری ئەم دەریاچەیەدا خۆی بە شوێنکەوتەکانی نیشان داوە و حەفتا کەسی لەوان هەڵبژاردووە تاکو هەواڵی گەڕانەوەی ئەو بە خەڵك ڕابگەیەنن. ئەوانیش هاتوون و هەواڵی گەڕانەوەیان بەو کەسانەی کە زانیویانە عیسایان خۆشدەوێ، ڕاگەیاندووە. هەواڵی گەڕانەوەی عیسا بەشێوەیەکی نهێنی بەهەموو دانیشتوانی شار و شارۆچکە و دێهاتەکانی دەوروبەری دەریاچەی جەلیلە گەیشتووە.

هەرکەسێ کە هەواڵی گەڕانەوەی عیسای بە ئەوی تریان دەگەیاند، پێی دەگوت ((ئاگات لێ بێ کە ئەو، لە چل ڕۆژ زیاتر لەسەر زەوی نامێنێتەوە و دوای چل ڕۆژ، لێرە دەڕوات و، بۆ دنیایەکی تر دەگوازرێتەوە و هەرکەسێ کە دەیەوێ عیسا ببنێ، دەبێ پێش چل ڕۆژ لە کێوەکەی ئەودا ببینێت و ماڵئاوایی لێ بکات و، هەروەها عیسا خۆی ڕۆژی ماڵئاوایی دیاری دەکات)).

گوتم: سوزمان مەبەستت لە (کێوەکەی ئەو) چیە و ئەو کێوە لە کوێیە؟

سوزمان گوتی: من نازانم کێوەکەی ئەو، واتە ئەو کێوەی کە بە ناوی عیساوەیە کەوتۆتە کوێوە و، مەبەستم ئەوەیە کە ناوونیشانی تەواوی نازانم، بەڵام زانیاریم هەیە کە لە دەوروبەری کوفرناعومدا چەند کێوێك هەیە کە عیسا بۆ خواپەرستی بۆی ڕۆیشتووە، بەڵام ئەم کێوە گوایە لە ناوەڕاستی ناوچەی جەلیلەدایە و کەوتۆتە تەنیشت شارێکەوە و، بۆئەوە ئەم کێوەیان هەڵبژردووە تا تێپەڕینی شوێنکەوتووانی عیسا بۆ گەشت بۆ ئەم کێوە نەبێتە هۆی گەڕانی زۆر، چونکە لە شارێکدا لە بەیانییەوە تا شەو

و هەروەها لە شەوەوە تا بەیانی، ژمارەیەکی زۆر لە گەشتیاری سوار و پیادە پیایدا دەڕۆن و، تێپەڕبوونی پەیڕەوانی عیساش، پێویستی بە بەدواگەڕانی زۆر نییە.

گوتم: سوزمان، بۆ ئەم هەواڵەی کە بۆت هێنام زۆر خۆشحاڵم و سوپاست دەکەم و، من بێگومان لەو شاخە ئامادە دەبم بۆئەوەی بتوانم عیسا ببینم. ئەم ناوچەیە چەندین ڕێگای لێیە. شاڕێگاکە ڕێگەیەکە کە بێرەدا، واتە بە تەبەرییە و ناوەڕاستی ناوچەی جەلیلەدا تێدەپەڕ دەبێت و، من پێموایە کە عیسا نابێ لە کوفرناعومەوە دوور بێ. بڕۆ و بە ناتان بڵێ ئەو گوێدرێژانە بۆ ئەو گەشتە ئامادە بکات کە بۆ ئەو شاخەی دەکەین و گوێدرێژێکیش تایبەت بکات بە تۆ، چونکە من لەگەڵ خۆمت دەبەم تا تۆش بتوانی عیسا ببینی. لەلایەن منەوە بە ناتان بڵێ کە بڕیاری من بۆ ڕۆیشتن بۆ ئەو کێوە و ماڵئاوایی کردنم لەگەڵ عیسا، ناگۆڕە و، تەنانەت ئەگەریش بکوژرێم ئەوا هەر دەڕۆم بۆ ئەو کێوە تا عیسا ببینم.

سوزمان گوتی: ئەوەی کە تۆ گوتت، بە ناتانی دەڵێم و، من سوپاسی تۆ دەکەم ئەی کابرای ڕۆمی بۆ ئەو دوو کارە چاکەیەت. یەکەمیان بۆئەوەی منت هێنا بۆ ئێرە و ئەوی تریان بۆئەوەی کە دەتەوێ منیش لەگەڵ خۆت بەریت بۆ کێوەکەی عیسا تا بتوانم ئەو ببینم و ماڵئاوایی لێ بکەم.

من گوتم: وا باشتر نییە کە من بڕۆم بۆ کوفرناعوم تاکو لە شوێنکەوتووانی عیسا نزیك ببمەوە؟

سوزمان گوتی: نەخێر، چونکە ئەگەر تۆ بڕۆیت بۆ کوفرناعوم، قوتابییەکانی عیسا دەتبینن و، لەبەرئەوەی کە دەزانن ڕۆمیت، گومانت لێ دەکەن و وادەزانن بۆ ئازاردانی عیسا هاتووی، چونکە فەرمانی کوشتنی عیسا لەلایەن فەرمانڕەوای ڕۆمیی ئەم وڵاتەوە دەرچووە، بۆیە ئاساییە کە شوێنکەوتووەکانی عیسا نەتوانن گومان لە ڕۆمییەك بکەن.

من باوەڕم بە قسەکەی سوزمان کرد. ژنەکە گوتی: بەو جۆرەی کە من بیستوومە، ڕەنگە ئەو ڕۆژەی کە عیسا ماڵئاوایی لە شوێنکەوتووانی دەکات، ڕێگەی بەدەستهێنانی ژیانی هەتاهەتایی بە شوێنکەوتووەکانی نیشان بدات. شتێکی تر ئەوەیە کە من پێموایە کاتێ ڕوون بوویەوە کە عیسا لە چ ڕۆژێکدا ماڵئاوایی لە قوتابی و شوێنکەوتووانی دەکات، ئەوا ئەو ژمارە قوتابی و شوێنکەوتووانەی کە لە

کوفرناعومدان، به شەو لەو شارە دەردەچن و ڕەنگە لە چەند ڕێگایەکی جیاوازەوە خۆیان بە کێوەکە بگەیەنن.

سوزمان گفتی پێدام کە لە ڕۆژی ماڵئاوایی کردنەکە ئاگادارم بکاتەوە و دواتر گوتی: من دەگەڕێمەوە.

گوتم: سوزمان، تۆ کە لە ڕێگەیەکی دوورەوە هاتوویت، ماندوویت، بۆیە ئەمشەو لەو میوانخانەیەی کە من تیایدا نیشتەجێم، پشوو بدە و بەیانی بڕۆ.

بەڵام سوزمان گوتی کە نایەت بۆ ئەو میوانخانەیە چونکە نابێ من و ئەو پێکەوە ببینن. چونکە هەرکاتێ ببینن کە من و ئەو پێکەوەین، ئەوا بە قوتابییەکانی عیسای ڕادەگەیەنن و ئەوان بەدگومان دەبن و وادەزانن پیلان و مەبەستی خراپ لە کاردایە. ئینجا بەبێ ئەوەی نان بخوات و تەنانەت بێ ئەوەی قومێ ئاو بخواتەوە، ماڵئاوایی لە من کرد و ڕۆشت بۆئەوەی بگەڕێتەوە بۆ کوفرناعوم.

دوای گەڕانەوەی ئەو، من هەستم کرد دڵم لێوڕێژ بووە بە خۆشی، چونکە هیوادار بووم عیسا ببینیم و قسەی لەگەڵ بکەم.

# پێشبڕکێی گالێسکەسواری

ڕۆژێ پێش ئەوەی پێشبڕکێی گالێسکەسوارییەکە لە سێرکی شاری تەبەرییە دەست پێ بکات، کلودیا یەکێ لە خزمەتکارەکانی نارد بۆ لای من تا بڕۆم و بیبینم. کاتێ چوومە ناوماڵەکەی کلودیا، ئەو پۆشاکێکی تایبەتی ڕۆمییەکانی پێ پیشان دام و گوتی: مەزن تیوس، من ئەم پۆشاکەم بۆ تۆ دابین کردووە بۆئەوەی ئەو جلە یەهوودیانەی کە پۆشیوتە، بگۆڕیت و پۆشاکی ڕۆمی بپۆشیت و لە لۆجی تایبەتی مندا بیت و لە پشتی منەوە ڕابووەستیت و، هەروەها هەڵبەت دەتزانی کە من لەبەرئەوەی دۆستایەتیم لە گەڵ تۆ هەیە، بۆیە ئەم شانازییەت بە دیاری دەدەمێ.

من بۆئەوەی ناچار نەبم جلە یەهوودییەکانم لەبەر دابکەنم و جلی ڕۆمی بپۆشم و جلی ڕۆمی بکەمە بەرم، گوتم: کلودیا من بەڵێنت پێ نادەم کە بەیانی لە سێرك ئامادەبم.

کلودیا پرسی: بۆچی؟

گوتم: بۆئەوەی ڕنگە ئەمشەو قوتابییەکانی عیسا بۆ بینینی عیسا بڕۆن بۆ شاخ و من دەبێ ئامادە بم بۆئەوەی لە دوای ئەوانەوە بڕۆم بۆ شاخ و عیسا ببینم.

کلودیا گوتی: من ئاگام لەو بابەتە هەبووە و دەمزانی کە عیسا شوێنکەوتووانی ئاگادار دەکاتەوە کە ڕۆژێکی دیاریکراو لە شاخ یەك ببینن، بەڵام دڵنیابە ئەمشەو و بەیانی ناگاتە جێ.

گوتم: کلودیا تۆ لەم بابەتە ئاگادار بوویت؟

کلودیا گوتی: بەڵێ.

لێم پرسی: کەی ئەم هەواڵەت بیست؟

کلودیا گوتی: من ئەم هەواڵەم لەو یۆحەننایەی کە لە خزمەتی پاشای گەلی ئیسرائیلدایە، بیستم.

پرسیم: بۆچی ئەم هەواڵەی بە من نەگوت؟

کلودیا وەڵامی دایەوە: لەوانەیە پێی گوترابێت کە ئاگای لە زمانی بێت. بەڵام من پێم گوت کاتێ کە دەڕوا بۆ شاخ و لەوێ عیسا دەبینێ، لەبارەی منەوە قسەی لەگەڵ

بکات و بڵێ کە من نەخۆشم و پێویستم بە چارەسەر هەیە. من دەزانم کە ئەگەر عیسا دەست بهێنێ بە پارچە قوماشێکدا و ئەو پارچە قوماشە بنێرێ بۆ نەخۆشەکە و ئەویش پارچە قوماشەکە بئاڵێنێ لە کەمەریەوە، یان بەو پارچە قوماشە جلێك دروست بکات و لەبەری بکات، ئەوا نەخۆشینەکەی چارەسەر دەبێ. یۆحەننا کاتێ بۆ بینینی عیسا دەڕوات بۆ شاخ، پارچە قوماشێك لەگەڵ خۆی دەبات و داوا لە عیسا دەکات دەستی پێدا بێنێ و، دوای ئەوەی گەڕایەوە، پارچە قوماشەکە دەدات بە من و منیش لەبەری دەکەم و لە نەخۆشی ڕزگارم دەبێ.

گوتم: کلودیا، ئایا دەکرێ من بەم جلەی کە پۆشیومە لە سێرك ئامادە بم؟

کلودیا گوتی: تۆ ئەگەر بڕۆی بۆ جێگەیەکی تر جگە لە سێرك، دەکرێ ئەم جلانەت لەبەردا بێت، بەڵام لەبەرئەوەی لە خانەی (لۆج) مندا دەبیت، بۆیە دەبێ جلی ڕۆمی لەبەربکەیت و، بەیانی وەرە بۆ ئێرە و هەر لێرە جلەکانی خۆت بگۆڕە و دوای ئەوەی هاتیتە ناو سێرکەکە، وەرە بۆ خانەکەی من.

ڕۆژی دواتر من ناچار بووم بڕۆم بۆ ماڵی کلودیا و لەوێ جلەکانی خۆم بگۆڕم. هەرکە چوومە ناو ماڵی کلودیا، منیان برد بۆ ژوورەکەی و سەیرم کرد جلە ڕۆمییەکانی من وەکو ڕۆژی پێشتر هەر لەوێدایە و ئارایشتگەرێکیش لەوێیە بۆئەوەی ڕیشم بتاشێ و پرچم برازێنێتەوە. کلودیا جلێکی زۆر بەشکۆی ئەرخەوانی پۆشیبوو و تاجێکی کردبووە سەری. کلودیا ڕۆیشت و منیش لە سێرێك پێی گەیشتمەوە. لە سێرك جێگەی کلودیایان لە شوێنێك تەرخان کردبوو کە ڕووبەڕووی خانەی هیرودی پادشا بێت و بتوانێ ئەوێ ببینێ. دەبێ بڵێم کە سێرکی تەبەرییە گەورە نییە و لە سێ هەزار تەماشاکەر زیاتر ناگرێت.

ئەو ڕۆژەی من چوومە ناو سێرکەکە، بینیم هەموو خانە و شوێنەکان لەلایەن ئامادەبووەکانەوە پڕکراونەتەوە و جێگەی بەتاڵی تێدا نابینرێت. کاتێ ئێمە چووینە ئەوێ، هێشتا هیرود نەهاتبوو. پاشان سەرەتا هیرودیاسی ژنی هیرود هات و، تەماشاچییە جوولەکەکان ئەگەرچی لە هاوسەرگیریەکەی لەگەڵ هیرودا ناڕازی بوون، کەچی هەلهەلەیان بۆ دەکرد.

چەند دەقەیەك دوای هاتنی هیرود، ژمارەیەك لە گلادیاتۆرەکان هاتنە ناو سێرکەکەوە و دوو دوو دەستیان کرد بە زۆرانبازی. بەڵام هەروەکو دیاربوو، شمشێر و

تیرەکانیان لە دار دروست کرابوو بۆئەوەی خوێن نەڕژێتە سەر زەوی، چونکە جوولەکەکان ڕقیان لە خوێن ڕشتنە و، بۆیە هیرودیش لەبەر جوولەکەکان، بریندار کردن و کوشتنی گلادیاتۆرەکانی لەناو سێرکی تەبەرییە قەدەغە کردووە.

دوای ئەوەی گلادیاتۆرەکان ڕۆیشتن، ژمارەیەك لە ئەسپە ڕەسەنەکانیان بە دەورووبەری سێرکدا گێڕا و بە تەماشاچیەکانیان پیشان دا. ئینجا هاتە سەرەی گالیسکەسواری. بە پێی ئەو نەریتەی کە لە ڕۆمەوە تەشەنەی کردووە بۆ هەموو جێگەیەك، پێش ئەوەی پێشبڕکێی گالیسکەسواری دەست پێ بکات، گالیسکەکان لە بەردەم تەماشاچیەکان تێپەڕدەبن بۆئەوەی بەهای ئەسپەکانیان بۆ دەربکەوێت و لێخوڕی گالیسکەکان بناسن.

هەرکە گالیسکەکان بۆ ناسینیان کەوتنە جوڵە، دەلاڵە گرەوکەرەکان کە هەریەکەیان لەوحەیەکیان بە دەستەوە بوو کە بە چینێ مۆم (بۆ نووسین) داپۆشرابوو، کەوتنە جوڵە و لە تەماشاچییەکانیان دەپرسی کە گرەو لەسەر کام گالیسکەیان دەکات. ئەو ڕۆژە لە سێرکی تەبەرییە چەند گالیسکەیەك زیاتر لە گالیسکەکانی تر سەرنجیان ڕادەکێشا، یەکێکیان گالیسکەکەی هیرود بوو کە ئەسپەکانی ڕەنگیان ڕەش بوو و خەڵك وایاندەزانی پێشبڕکێکە دەباتەوە. ئەوی تریان گالیسکەیەك بوو کە ئەسپەکانی ڕەنگیان سپی بوو کە هی یەکێ لە ئەستێرەکانی عەرەبستان بوو، سێیەمینیش گالیسکەیەك بوو کە ئەسپەکانی ڕەنگیان زێڕین بوو و هی یەکێ لە ئەمیرەکانی سوریا بوو.

خەڵك بڕوایان وابوو کە یەکێ لەو سێ گالیسکەیە لە پێشبڕکێی گالیسکەسواریدا دەبێتە براوەی پێشبڕکێکە. لە ڕۆم واباوە کە گالیسکەکان سێ سێ دەڕۆن و کاتێ یەکێ لەو سێ گالیسکەیە بردیەوە، ئەوا دوو گالیسکەکەی تر لە پێشبڕکێکە دەردەکەن و دوای ئەوەی براوەکان دیاریکران، ئەوکاتە یەك یان دوو جار گالیسکە براوەکان (هەر سێ سێ) پێشبڕکێ دەکەن تا یەکێکیان دەیباتەوە و، لە خولی کۆتاییدا دەردەکەوێ کە براوەی یەکەم و دووەم و سێیەم کامەیە. بەڵام لە تەبەرییە لەبەرئەوەی خەڵك حەزیان لە هەڵاهەڵا بوو و دەشیانویست جۆش و خرۆشی ئەسپەکان و لێخوڕەکان ببینن، بۆیە هەموو ئەو گالیسکانەی کە لە پێشبڕکێکەدا بەشدار بوون، بە یەکەوە کەوتنەڕێ.

پێش ئەوەی پێشبڕکێکە دەست پێ بکات، من پێشبینیم دەکرد بە هۆی پێکدادان، دەست و پێی هەندێ لە ئەسپەکان بشکێت و ڕەنگە برێ لە سوارەکانیش بکوژرێن. شوێنی گالێسکەکانیان بە تیروپشك دیاری دەکرد و، لەبەرئەوەی هەموو ئەسپەکان بەگوڕ بوون، بۆیە جێگیرکردنی گالێسکەکان لە شوێنی خۆیاندا (پێش کەوتنەڕێ) گرفتی دروست دەکرد.

لەپڕ کلودیا ڕووی خۆی وەرگێڕا بۆ دواوە و گوتی: مەزن تیوس، بڕی چەند پارەت پێیە؟

دەستم بە گیرفانمدا کرد و گوتم: نزیکەی سەد درهەمم پێیە.

کلودیا گوتی: من دەمەوێ لەسەر گالێسکەی هیرود گرەو بکەم، بۆیە سەد درهەم کەمە بۆ ئەوە.

گوتم: لێرە بەدەستهێنانی پارە کێشە نییە، چونکە هەموو سەڕافەکانی تەبەرییە لەم سێرکەدان و پارە بەو کەسان دەدەن کە دەیانناسن.

کلودیا گوتی: بڕێ پارەی زێڕ ئامادە بکە تا من لەسەر گالێسکەی هیرود گرەو بکەم.

من یەکێ لەو سەڕافانەم بانگ کرد کە لەنێوان تەماشاچیەکاندا بوو و، ئەو نامە ڕێزلێنانەی کە ئاریستانووسی سەڕاف پێی دابووم، نیشانم دا و ئەویش بە خێرایی بیست سکە زێڕی پێ دام و منیش دە سکەیانم دا بە کلودیا تاکو لەسەر گالێسکەکەی هیرود گرەو بکات.

کاتێ گرەو کردنەکەی کلودیا تەواو بوو، دەلاڵەکە بە منی گوت: کابرای ڕۆمی، تۆ گرەو ناکەی؟

من ئاماژەم بە یەکێ لەو گالێسکانە کرد کە ئەسپەکانی ڕەنگیان نیلی بوو و گوتم: من لەسەر ئەم گالێسکەیە گرەو دەکەم.

دەلاڵەکە بە سەرسامیەوە گوتی: ئەسپە لاوازەکانی ئەو گالێسکەیە بچوکترین شەنسیان نییە بۆ سەرکەوتن و من بڕوام وایە کە ئەم گالێسکەیە لە دوای هەموویانەوە دەبێت.

گوتم: بەم حاڵەشەوە، من لەسەر ئەم گالێسکەیە گرەو دەکەم.

دەلاڵەکە گوتی: من گوێڕایەڵی تۆم و ئەرکی خزمەتگوزاری من وادەخوازێ کە ئەوەی ئامادەبووەکان بیانەوێ، ئەنجامی بدەم و بڕی پارەی گرەوەکەیان بنووسم. هەرکە پیاوە دەلاڵەکە بڕی پارەی گرەوەکەی منی لەسەر ئەو گالێسکەیەی کە ئەسپەکانی ڕەنگیان نیلی بوو، نووسی، هیرودی پادشای گەلی ئیسرائیل نێزە تایبەتیەکەی خۆی جولاندەوە تاکو گالێسکەکان دەست بە ڕۆیشتن بکەن. من لەهیچ شوێنێ نەمبینیبوو کە گالێسکەکان بەو جۆش و خرۆشە ترسناکەوە بەڕێ بکەون. هەندێ لەو سوارانەی کە ئەزموونیان هەبوو، بە هەموو هێزیانەوە ڕەشمەی ئەسپەکانیان ڕادەکێشان بۆئەوەی دوابکەون و لە سەرەتای ڕۆشتندا بە هۆی جۆش و خرۆشی هەموانەوە تووشی پێکدادان نەبن، بەلاّم نەیاندەتوانی پێش لە ئەسپەکانیان بگرن.

گوڕی ئەسپەکان لە سەرەتاوە ئەوەندە زۆر بوو کە دوای ئەوەی گالێسکەکان بەڕێ کەوتن، سوارەی گالێسکەکەی ئەمیری عەرەبستان کە ئەسپەکانی ڕەنگیان سپی بوو، نەیتوانی لە کاتی سوڕانەوە پێش لە ئەسپەکان بگرێت و، بۆیە تایەی گالێسکەکە لەگەڵ بەردی کەناری سێرێك پێکیدا دا و من پێموابوو گالێسکەکە تێك شکاوە، بەلاّم دەرکەوت هەڵەم کردووە و چەرخەکە نەشکاوە.

لە هەمان خولی یەکەمدا لەناکاو دوو گالێسکە لە کاتێکدا کە دەیانویست بەرەو لای چەپ بڕۆن، بە یەکیاندا دا و شوفێری گالیسکەی دووەم کە لەپێش گالێسکەی یەکەم بوو، بەجۆرێك پەڕی کە دەتگوت مەنجەنیقێ هەڵیکردووە و، دوای ئەوەی کەوتە خوارەوە، کەوتە ژێر پێی ئەسپەکانی گالێسکەکەی خۆی. کاتێ گالێسکەکان تێپەڕین، ئەو پیاوەیان، کە خوێناوی ببوو، بەرزکردەوە و بردیان، بەلاّم گالێسکە بێ شوفێرەکە بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن و، ئەسپەکانی گالیسکەکە وەکو ڕۆشتنی ئاسایی گالێسکەکانی تر، بە دەوری سێرکدا دەگەڕا.

شوفێری گالیسکەکان بۆئەوەی ڕکابەرەکانیان دوابخەن، فێڵیان دەکرد و هەندێکیان ڕێیان بەوانی تر نەدەدا و، هەندێ لە شوفێرەکان بەو قامچیە درێژەی کە پێیان بوو، دەیاندا لە ڕوخساری ئەسپی گالێسکەکانی تر کە لە تەنیشتیانەوە تێدەپەڕین بۆئەوەی ئەسپەکانیان کوێر بکەن. هەمویان هەوڵیان دەدا پێش بکەون و

ئەوانی تر دوا بکەون. خولانەوەی پێشبڕکێکە چل خولانەوە بوو و، دەبووایە چل جار بە دەوری سێرکدا بسوڕێنەوە.

لە هەشت لای سێرکەکەوە، شازدە کەس، دوو دوو دانیشتبوون و ئەو لەوحانەیان بەدەستەوە بوو کە بە مۆم داپۆشرابوون و لەهەر خولانەوەیەکدا، تێپەڕ بوونی هەر گالێسکەیەکیان لەسەر لەوحەکەدا تۆمار دەکرد. ئەگەر گالێسکەیەك ئەوەندە دوا بکەوتایە کە لەسوڕێکی تردا ئەسپەکان پێی بگەشتنایەتەوە، ئەوا بەبێ ئەوەی خۆی سوڕەکەی پێش خۆی تەواو کردبێ، لە پێشبڕکێکە دەریان دەکردە دەرەوە و، هەر گالیسکەیەك لە پێشبڕکێکە بهاتایەتە دەرەوە، جێی بۆ ئەو شوفێرانەی تر، کە دەیانتوانی باشتر بهاژوون، فراوان دەکرد. من هانی سوارەکانم دەدا و ئەگەرچی کە بەهۆی چوونەدەرەوەی چەند گالێسکەیەك جێگەی ئەوانی تر فراوانتر ببوو، بەڵام دیسان لێخورینی گالێسکەکە لە سێرکدا بە خێراییەکی مەرگهێن، گرفتی هەبوو و لە هەموو ساتێکدا مەترسی مەرگ هەرەشەی لە سوارەکان دەکرد، بۆیە ئەگەر ئەوەی بەهێز نەبووایە، خۆی و ئەسپەکانی بەکوشت دەدا.

بەوجۆرەی کە خەڵك و دەلالەکان پێشبینییان کردبوو، لە هەموو سوڕانەوەکاندا هەرسێ گالێسکەکەی هیرود و ئەمیری عەرەبستان و ئەمیری سوریا لەپێشتر بوون، بەجۆرێك کە خەڵك دڵنیابوون کە ئەو سێ گالێسکەیە یەکەم و دووەم و سێیەم دەبن. هەرجارێك کە ئەو گالێسکەیەی هیرود کە ئەسپەکانی ڕەنگیان ڕەش بوو، لە بەرامبەر کلودیا تێدەپەڕین، هیرود هەستی خۆشحاڵی دەردەبڕی و هەموو تەماشاچیەکانیش دەنگی خۆشحاڵییان بەرز دەکردەوە. ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەسەر هەرسێ گالێسکەی هیرود و ئەمیری عەرەبستان و ئەمیری سوریا گرەویان کردبوو، زۆر زیاتر بوو لە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەسەر گالێسکەکانی تر گرەویان کردبوو.

خەڵك بە هاوارەکانی خۆیان شوفێرەکانی ئەو سێ گالیسکەیان هان دەدا، بەڵام لە سوڕانەوەی سی و پێنجەمدا ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو ڕووی دا و ئەوەش ئەوەبوو ئەو گالیسکەیەی کە من گرەوم لەسەر کردبوو و ڕەنگیان نیلی بوو، چەند گالێسکەیەکی بەجێ هێشت و لەو سێ گالێسکەیەی کە لە پێشەوە بوون، نزیك بویەوە. ئەو گالێسکەیەی کە ئەسپەکانی ڕەنگیان نیلی بوو، لە سوڕانەوەکانی پێشتردا ئەوەندە دواکەوت کە وادەزانرا لە پێشبڕکێکە دەکرێتەدەرەوە، بەڵام لە سوڕی سی و

پێنجەم بەدواوە ئەسپەکانی ئەو گالێسکەیە دەتگوت گیانی تازەیان بەبەردا کراوە و پێشی ئەسپەکانی هەردوو ئەمیری سوریا و ئەمیری عەرەبستانیشی دایەوە.

ئامادەبووەکان بەجۆرێك لە پێشکەوتنی ئەو گالێسکەیە سەرسام ببوون کە لە سووڕی سی و نۆیەمدا غەڵبەغەڵب و هاوارکردیان نەما و، خەڵك بە سەرسامیەوە سەیری ئەو گالێسکەیان دەکرد. لە کۆتایی سوڕی سی و نۆیەمدا ئەو گالێسکەیەی کە ئەسپەکانی ڕەنگیان نیلی بوو، بە هاوتەریب لەگەڵ گالێسکەکانی هیرودی پادشای گەلی ئیسرایلدا دەڕۆیشت، بەڵام دیاربوو کە ئەسپە ڕەنگ نیلییەکان توانای پێشکەوتنیان هەبوو، چونکە دوای چەند ساتێك کە گوێی ئەسپە نیلییەکان هاوتەریب بوو لەگەڵ گوێی ئەسپە ڕەشەکان، ئەسپە نیلییەکان پێشیان دایەوە.

شوفێری گالێسکەکەی هیرود بەجۆرێك قامچی دەدا لە ئەسپە ڕەشەکانی خۆی کە واتدەزانی دەیەوێ بە لێدانی قامچی لەشیان لەت لەت بکات، بەڵام بە لێدانی ئەسپەکان ئەنجامی وەردەگرت، چونکە ئەسپە ڕەشەکانی گالێسکەکەی هیرود لە سوڕی چلهەمدا بەجۆرێك ماندوو ببوون کە نەیاندەتوانی خێراتر بڕۆن، لە کاتێکدا کە ئەسپە نیلییەکان وەکو ئەوە وابوو کە تازە دەستیان کردبێ بەپێشبڕکێ و، بەبێ ماندوو بوون پێشبڕکێیان دەکرد.

ئەو دەلاڵەی کە ئامادەبوو لەگەڵ من گرەو بکات، هات بۆلای من و پیرۆزبایی لێ کردم و سەدوپەنجا سکە زێڕی ژمارد و گوتی: ئەمە بەشی تۆیە. پاشان لێی پرسیم: تۆ چۆن پێشبینیت کرد کە ئەو گالیسکەیەی ئەسپەکانی ڕەنگیان نیلییە، پێشبڕکێکە دەباتەوە؟

گوتم: من پێشبینیم نەکرد، بەڵکو شەوی ڕابردوو لە خەونمدا بینیم کە ئەو گالێسکەیەی کە ئەسپەکانی ڕەنگیان نیلییە، دەیباتەوە.

من ڕاستم بە دەلاڵەکە گوت، چونکە شەوی پێش ڕۆژی پێشبڕکێکە خەوێکم بینیی کە بە کورتی بەم جۆرەیە: لە خەومدا بینیم کە من لە سێرکی تەبەرییەدام و خەڵك لەسەر گالێسکەکان گرەو دەکەن. من لەحاڵەتی خەیاڵدا بینیم ئەو ڕاوچییەی ماسی کە ئەو شەوە دوای تۆفانی دەریاچەی جەلیلە من و لێخوڕەکانی بەلەمەکەی جێ کردەوە، لە سێرکدایە و گالێسکەیەکی پێ پیشان دام کە ئەسپەکانی ڕەنگیان نیلی بوو و گوتی ((لەسەر ئەم گالێسکەیە گرەو بکە چونکە بێگومان پیشبڕکێکە دەباتەوە و خەلاتەکە

دەكات بە نيسبى تۆ و، دواى ئەوەى خەلأتەكەت وەرگرت، بڕۆ بۆ تەماشاخانەى ئەم شارە و خەلأتەكە بدە بە كچێكى گەنج كە سەرپەرشتيارەكەى خۆى لەدەست داوە و لەو تەماشاخانەدايە، چونكە ئەو خەلأتەى كە تۆ وەرى دەگرى، بۆ تۆ بايەخى نييە بەلأم بۆ ئەو كچە بێ سەرپەرشتيارە زۆر بايەخى هەيە)).

من ئەو بەشەى خەوەكەم كە پەيوەندى بە گالێسكەكەوە هەبوو بۆ دەلألەكەم گێڕايەوە و بەشەكەى ترم پێ نەگوت. بەلأم ئەو ڕۆژە، دواى ئەوەى كە چوومە ناو سێركەكەوە و چاوم بەو گالێسكەيە كەوت كە ئەسپەكانى ڕەنگيان نيلى بوو، خەوى شەوى ڕابردووم هاتەوە ياد و لەسەر ئەوە گرەوم كرد.

دواى تەواوبوونى پێشبڕكێى گالێسكەسوارييەكە، كلوديا پێى گوتم كە لەگەلێدا بڕۆم بۆ كۆشكى هيرود، چونكە كلودياى بانگهێشت دەكرد، بەلأم من نەڕۆشتم بۆيە بە كلوديام گوت كە لەبەرئەوەى من بانگهێشت نەكراوم بۆيە ناڕۆم. كلوديا گوتى كە ئەو دەتوانێ من لەگەلێ خۆى ببات و، ئەوەندە ڕێزى هەيە كە بەبێ بانگهێشت كەسێك لەگەلێ خۆى بباتە ناو كۆشكى هيرودەوە. بەلأم من ئەوم تێگەياند كە ڕۆيشتن بۆ كۆشكى هيرود بەبێ بانگهێشتكردن، بۆ من باش نييە و كلودياش بەوە ڕازى بوو.

# دیدارێکی نوێ لەگەڵ میرنا

هەرکە پێشبڕکێی گالێسکەسوارییەکە تەواوبوو، خەڵك لە سێرك چوونە دەرەوە و سێرك کەسی تێدا نەما و لەجیاتیدا زۆریی خەڵکەکە شەقامەکانی تەبەرییەی قەڵەبالغ کرد.

من لەبەرئەوەی بۆم دەرکەوت کە بەشی یەکەمی خەوەکەم بە ڕوئیایەکی ڕاست دەرچووە، زانیم بەشی دووەمیش بەڕاست دەگەڕێ و لە تەماشاخانەکەی (هۆڵی شانۆی) شاری تەبەرییەدا کچێك هەیە کە سەرپەرشتیاری نییە و، من دەبێ خۆم بگەیەنمە ئەو و، ئەو خەڵاتەی کە لە سێرێك وەرمگرتووە پێی بدەم. ئەوەبوو کە لەنێو کۆمەڵی خەڵکەکەدا ڕێگام بۆ خۆم کردەوە و ڕۆشتم بۆ تەماشاخانەکە.

کەس لە هۆڵی شانۆیەکەدا نەبوو و شانۆیان ئەنجام نەدەدا تا تەماشاکەر تێدا بێت. من بە ناوەڕاستی شوێنی دانیشتنی تەماشاچییەکاندا تێپەڕیم و خۆم گەیاندە کۆتایی هۆڵەکە، واتە سەکۆکە. من دەمزانی کە هەموو هۆڵێکی شانۆ چەندین ژێرزەمینی هەیە بۆئەوەی ئەکتەرەکان تیایدا جلەکانی خۆیان بگۆڕن و، ئەو ئەکتەرانەی کە لە شارەکانی ترەوە دێن، لەوێ نیشتەجێ بن و ناچار نەبن لە میوانخانە بمێننەوە و کرێ بدەن.

لەو پلیکانەی کە لە پشتی سەکۆی هۆڵەکەدا بوو، ڕۆشتمە خوارەوە و چوومە ناو ڕاڕەوێکی دووورودرێژ و، دیاربوو کە لە هەردوو لای ئەو ڕاڕەوەدا چەند ژێرزەمینێکی لێیە. لەوێ پیاوێکی یۆنانی بەساڵداچوو دەرکەوت کە چاوەکانی لە مەستیدا ئاسایی دەرنەدەکەوت.

پیرە پیاوە یۆنانییەکە بە گۆچان دەڕۆشت بە ڕێگادا و کاتێ منی بینی، پرسی: تۆ کێیت و لێرەدا چی دەکەیت؟

گوتم: بە منیان گوتووە کچێکی گەنج، کە بەخێوکەری خۆیی لەدەست داوە، لەم تەماشاخانەیەدایە، بۆیە من هاتووم تا بیبینم.

پیرە پیاوەکە کاتێ ئەم قسەیەی لە من بیست، بە وردی سەیرێکی کردم و پرسی: تۆ خەڵکی کوێیت؟

گوتم: تۆ كارت بە ناسنامەی من چیە؟

پیرە پیاوەكە گوتی: ئەگەر هاتووی ئەو كچە گەنجە لێرە ببەی، دەبێ بزانی كە من ناهێڵم لێرە بچێتە دەرەوە، چونكە دوای ئەوەی براكەی كۆچی دوایی كرد، من جەستەی براكەیم بە پارەی خۆم ئەسپەردە كردووە و لەو كاتەوە تا ئێستە من خواردنی پێ دەدەم و، هەركەسێ بیەوێ ئەو كچە لێرە ببات، ئەوا دەبێ پارەكانی من تا دوایین (پشین) بداتەوە، ئەگینا ڕێگر دەبم لە ڕۆیشتنی ئەو كچە.

من دەستم برد بۆ گیرفانی خۆم و دەنگم لەو سكە زێڕانەوە هێنا كە لەناویدا بوو. هەروەها بەو پیاوەم گوت: تۆ من ببە بۆلای ئەو كچە و، بەڵێنت دەدەمێ كە تا دوایین پشیز قەرزی ئەو كچەت پێ بدەمەوە.

پیرە پیاوە یۆنانییەكە كاتێ دەنگی پارەكانی لە گیرفانی مندا بیست، دڵی گەرم بوو. ئینجا منی لە ڕاڕەوەكەوە برد و دەرگایەكی كردەوە پاشان ژێرزەمینێكی بچوك و تاریك دەركەوت. ڕووناكییەك لە دەرچەیەكی بچوكەوە كە لە سەرووی دیواری ژێرزەمینەكەوە بوو، پرشنگی دەدایەوە، بەڵام ئەو ڕووناكییەی كە هاتە ناو ژێرزەمینەكەوە، ئەوەندە كزبوو كە من لە سەرەتا كەسم لەو ژێرزەمینەدا نەبینی.

دوای چەند دەقەیەك كە چاوەكانم بە تاریكی داهات، سەیرم كرد ئافرەتە گەنجەكە لە گۆشەیەكی ژێرزەمینەكەدا ئەژنۆكانی گرتۆتە باوەش و دانیشتووە و پرچەكانی بەر ڕوخساری گرتووە بەجۆرێك كە ڕووخساری نەدەبینرا. لەو ژێرزەمینەدا تەنیا یەك حەسیر و گۆزەیەكی ئاوی لێ بوو، ئیتر نە جێگە خەوێكی لێ بوو و نە خواردن.

لە پیرە پیاوەكەم پرسی: مەگەر ئەم كچە گەنجە نەخۆشە وا ناجوڵێ؟

پیرە پیاوەكە گوتی: نەخێر، ئەو نەخۆش نییە بەڵكو عینادە؟

گوتم: بۆچی دەڵێیت عینادە؟

پیرە پیاوەكە گوتی: بەهۆی ئەوەی لەم شارەدا پێشبڕكێی گالێسكەسواری ئەنجام درا، دوو سێ ڕۆژ لەمەوپێش ژمارەیەكی زۆر لە بیانییەكان هاتنە ئەم شارەوە. من بەم كچە گەنجەم گوت كە لەگەڵ خۆم دەیبەم بۆ دەروازەی شار بۆئەوەی لەوێ گۆرانی بڵێت و سەما بكات و بەم شێوەیە پارە لە بێگانەكان وەربگرین. من دڵنیابووم كە ئەگەر ئەم كچە ڕازی بووایە لە تەنیشت دەروازەكەی ئەم شارەوە گۆرانی بڵێت و سەما بكات، ئەوا لەبەرئەوەی بیانییەكان لەو ڕێگەیەوە دەهاتنە ژوورەوە و ئەویان دەبینی، پارەیەكی

باشمان بەدەست دەهێنا. بەڵام ئەم کچە سەرسەختە قەرزاری منە و ئامادەیە برسێتی بکێشێ، بەڵام گۆرانی نەڵێت و سەما نەکات.

گوتم: دیارە خواردنی پێ نادەیت و ئەم کچە گەنجە بە برسێتی دەهێڵیتەوە.

پیرە پیاوە یۆنانییەکە گوتی: من کابرایەکی هەژارم و ناتوانم پارە بۆ ئەم کچە گەنجە پەیدا بکەم، لەگەڵ ئەمەشدا تا ئەمڕۆ نەمهێشتووە لە برسێتیدا بمرێ.

پرسیم: کێ بەخێوکەری ئەم کچە بوو؟

پیرە پیاوەکە گوتی: براکەی بەخێوکەری ئەم کچە بوو. ئەو لێرە نەخۆش کەوت و مرد و، بەو جۆرەی کە گوتم من بە پارەی خۆم لاشەکەیم ئەسپەردە کرد.

پرسیم: ئەم کچە ئەمڕۆ بەخێوکەری نییە؟

پیرە پیاوەکە وەڵامی دایەوە: نەخێر.

من بەرەو لای کچە گەنجەکە ڕۆشتم و دەستم دا لە شانەکانی بۆئەوەی ئاگاداری بکەمەوە لە خۆم. ئینجا ئەو کیسە پارەیەی کە سەدوپەنجا سکە زێڕی تیدا بوو، لە گیرفانم دەرمهێنا و بەو کچە گەنجەم گوت: سەدوپەنجا سکە زێڕ لەم کیسەیەدایە و من ڕاسپێردراوم ئەو بڕە پارەیە بدەم بە تۆ، ئێستەش ئەم پارەیە بگرە و قەرزەکەی خۆت بدەرەوە بەم پیرە پیاوە و بۆ هەر شوێنێك کە دەتەوەێ، بڕۆ.

کاتێ پیرە پیاوەکە بیستی کە سەدوپەنجا سکە زێڕ لەو کیسەیەدایە و من دەمەوێ ئەو بڕە پارەیە بدەم بەو کچە، لە سەرسامیدا دەنگێکی لێ بەرز بۆوە و گوتی: ئەم خەزێنەیەی قارون لە کوێوە گەیشتووە بەم کچە؟ پاشان دەستی درێژ کرد تا ئەو کیسەیەی کە خستبوومە بەردەمی ئەو کچە گەنجە، هەڵبگرێت.

بەڵام من دەستپێشخەریم کرد و کیسەکەم لەسەر زەوی هەڵگرتەوە و خستمە گیرفانمەوە و بە کچە گەنجەکەم گوت: بۆچی قسە ناکەیت؟ تۆ کێیت و لێرە چی دەکەیت؟ ئایا بە مەیلی خۆت لەم ژێرزەمینە دانیشتوویت یان ئەم پیاوە پیرە تۆی لێرەدا زیندانی کردووە؟

پیرەپیاوەکە گوتی: ئەم کچە ناتوانێ قسە بکات، چونکە برسییەتی، بۆیە پارەیەکم بدەرێ با بڕۆم و کەمێك خواردنی بۆ بکڕم و دوای ئەوەی نانی خوارد، زمانی دەکرێتەوە. من سکەیەکی زێرم خستە ناو دەستی ئەو پیاوە پیرەوە و ئەویش ڕۆشت و، ئیتر من لەو ژێرزەمینەیەدا مامەوە.

پیرەمێردەکە ئەوەندە بەخێرایی گەڕایەوە کە من زانیم ئەو نانەی لە دەرەوە نەکڕیوە، بەڵکو لە ماڵی خۆی کە دەکەوێتە ناو تەماشاخانەکەوە، هێناویەتی. پیرە مێرەدەکە نانەکەی خستە بەردەمی کچە گەنجەکە و، ئافرەتەکەش پارووپەك لەو نانەی خستە دەمیەوە و پاشان گوتی: لەم پارەیەی کە بۆ منت هێناوە پێج سکە زێڕی لێ بدە بەم پیرە پیاوە، چونکە قەرزی ئەم پیاوە لەلای من بۆ ئەسپەردە کردنی براکەم و ئەو خواردنانەی کە پێی داوم، لە سێ یان چوار سکە زێڕ زیاتر نییە، بەڵام من پێنج سکە دەدەم بەو بۆئەوەی بزانێ کە من ئەگەرچی ئافرەتم، بەڵام لەگەڵ پیاوێکی وەکو ئەودا جیاوازیم هەیە.

دەنگی ئەو ئافرەتە ئاشنا بوو بە گوێم و بە وردی سەیری ڕوخساریم کرد، بەڵام لەبەرئەوەی ڕوخساری بە پرچی داپۆشرابوو بۆیە نەمتوانی بە باشی بیناسم. من پێنج سکەم لە کیسەکە دەرهێنا و دام بە پیرە مێردە یۆنانییەکە و، پیرە مێردەکە وەریگرت و خستیە گیرفانییەوە و، ئافرەتە گەنجەکەش بە توڕەییەوە گوتی: ئێستە کە قەرزەکەی خۆت وەرگرتۆتەوە بە تەنیا جێمان بهێڵە.

پیرە پیاوەکە لە ژێرزەمینەکە چووە دەرەوە و دوای ئەوەی دوور کەوتەوە، ئافرەتەکە لێی پرسیم: تۆ لە جیاتی ئەو سەدوپەنجا هەزار سکە زێڕەی کە دەیدەی بە من، چیت لێم دەوێت؟ ئایا حەز دەکەی لەگەڵ من ڕابوێریت کەوا ئەم پارە زۆرە دەدەی بە من؟

گوتم: نەخێر، من کەسێك نیم کە لەگەڵ ژنان ڕابوێرم، بەڵکو بە منیان گوتووە بێم بۆ ئێرە و ئەم پارەیە بدەم بە تۆ و، منیش تەنیا ئەرکی خۆم بەجێ هێناوە.

ژنەکە گوتی: کێ بە تۆی گوتووە بێیت بۆ ئێرە تا ئەم پارەیە بدەی بە من؟

گوتم: پیاوێکی پایەبەرز بە منی گوت کە ئەم پارەیە بدەم بە تۆ.

ژنەکە پرسی: ئایا ئەم پارەیە هی تۆیە یان هی ئەو پیاوە پایەبەرزەیە؟

گوتم: هی منە، بەڵام ئەو پیاوە پێشنیاری کرد کە ئەم بڕەپارەیە بدەم بە تۆ.

ژنەکە پرسی: بە منداڵم دەزانی کەوا بەم جۆرە قسەم لەگەڵ دەکەی؟ چۆن دەکرێ پیاوێك لە سەدوپەنجا سکە زێڕ کە هی خۆیەتی، خۆش بێت و بیدات بە ئافرەتێك بەبێ ئەوەی داوای شتێ بکات لەو ژنە؟ بەڵام بزانە کە من بڕیارم دابوو ئەمشەو لەم ژێرزەمینەدا کۆتایی بە ژیانی خۆم بهێنم و بە پرچم خۆم بخنکێنم.

لەو کاتەدا ژنە گەنجەکە پرچی لە ڕوخساری لادا، ئینجا من ئەوم ناسییەوە و گوتم: ئای میرنا ئەمە تۆی؟

لە سەرەتای ئەم سەرگورشتەیەدا گوتم کە کاتێ لە مسیرەوە بە کەشتی بەڕێ کەوتم تاکو بڕۆم بۆ یودە، لە کەشتییەکەدا بە دوو هونەرمەند کە خوشك و برا بوون، ئاشنا بووم و هەروەها گوتم کە ئەوانیش دەڕۆیشتن بۆ یودە بۆئەوەی لەوێ گۆرانی بڵێن. ژنەکە ناوی میرنا بوو کە لەو کاتەدا لەو ژێرزەمینە نیوەتاریکەدا ناسیمەوە. بەڵام لەبەرئەوەی من جلی یەهوودیم لەبەر بوو، میرنا منی نەناسییەوە تا خۆم پێ ناساند.

ئیتر لەو کاتەدا کەوتە گریان و دڵتەنگیەکەی زۆر کاری لێ کردم و گوتم: میرنا، چی بوو کە تۆ گرفتاری ئەم دۆخە بوویت و ناچار بوویت لەم ژێرزەمینە نیوەتاریکەدا بژیت؟

ئەو گوتی: مەزن تیوس، بەو جۆرەی کە دەیزانی من و براکەم هاتین بۆ ئەم شارە تا لێرە نمایش بکەین و پارە پەیدا بکەین. دوای هاتنمان بۆ ئەم شارە، پێمان نایە شاری (پرا)وە کە یەکێکە لە شارەکانی ئێرە و، ڕۆژێ نمایشمان تێداکرد و لەپڕ جوولەکەکان بە بەرد هێرشیان بۆ هێناین و ئێمەیان بەردباران کرد و، ئەگەر ڕامان نەکردایە، هەر لەوێدا دەکوژراین. دوای ئەوەی لەوێ ڕامان کرد، هاتین بۆ ئەم شارە و لێرەدا کە تایبەتە بە نیشتەجێ بوونی هونەرمەندان، نیشتەجێ بووین.

دوای ڕۆژێ براکەم نەخۆش کەوت و دوای چەند ڕۆژ نەخۆشی،ماڵئاوایی لە ژیان کرد و، ئێمە هەرچیەکمان هەبوو لە شاری پرا بەجێمان هێشت و هەڵهاتین تاکو گیانمان بپارێزن، من نەمتوانی جەستەی براکەم ئەسپەردە بکەم، بۆیە ئەم پیرەپیاوە یۆنانییە کە خزمەتگوزاری ئەم تەماشاخانەیە، لاشەی براکەمی بە پارەی خۆی ئەسپەردە کرد. لەو ڕۆژەوەی کە من لە پرا هەڵهاتم، بەهۆی بەرکەوتنی بەردەکان ناتوانم بڕۆم لەڕێ، بەڵام ئەم پیرەپیاوە زۆری لێ دەکردم تا سەما بکەم و منیش لەبەرئەوەی نەمدەتوانی داواکاریەکەی جێبەجێ بکەم، خواردنی پێ نەدام و، منیش کە توانای سەماکردنم لە خۆمدا بەدی نەدەکرد، هەر لێرەدا ڕادەکشام و چاوەڕوانی مەرگی خۆم دەکرد.

میرنا دوای ئەم قسەیە هەستایەوە و دەستی بەگریان کرد و گوتی: مەزن تیوس، تا ئەو ڕۆژەی کە براکەم زیندوو بوو، من دڵم قایم بوو و دەشمزانی کە دەتوانم سەرکەوتن بەدەست بهێنم. من و براکەم تەواوکەری یەکتر بووین و ئێستە کە ئەوم

لەدەست داوە، بوونی من وەکو بوونێکی ناتەواو وایە و خۆم وەکو کەسێکی بێدەست و پێ دێتە بەرچاو. مەزن تیوس، ئەم پارەیەی کە تۆ بۆ منت هێناوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە من فریو بخۆم و واز لە بڕیاری خۆم بۆ خۆکوژی بهێنم. من دەزانم کە دوای براکەم، نەك هەر درێژەپێدانی ژیانی هونەرمەندی، بەڵکو درێژەپێدانی هەرجۆرە ژیانێك بۆ من مەحاڵە و، وا باشترە پارەی خۆت ببەیت و من بە حاڵی خۆم جێ بهێڵیت تا کۆتایی بە ژیانی خۆم بهێنم.

گوتم: میرنا، ئەم قسەیەی تۆ شێتانەیە. سەیری هەرکەسێ بکەی بۆت دەردەکەوێ کە باوك یان دایك یان برای لەدەست داوە، بەڵام درێژە بە ژیانی خۆی دەدات. داخی گرانی یەکێ لە کەسە نزیکەکانی وەکو برا زۆر بەئازارە، بەڵام مرۆڤ چاری نییە جگە لەوەی کە دەبێ ئارام بگرێت.

کاتێ گفتوگۆکەی ئێمە گەیشتە ئێرە، پیرەپیاوەکە بە قاپێکی گەورەی پڕ لە ئاوگۆشت و نانێکەوە هاتەوە و قاپە ئاوگۆشتەکەی لەبەردەم میرنا دانا و گوتی: من پێموایە کە ئاوگۆشت بۆ تۆ باشترە لە نانی وشك و، باشتر وایە لەم ژێرزەمینە بڕۆیتە دەرەوە و لە ژوورێکی تردا، کە فەرش و جێگەی خەوی لێیە، بژیت.

پاشان بە منی گوت: تۆش ئەگەر حەز دەکەیت دەتوانی ئەمشەو لەو ژوورەدا بیت کە من دەیدەم بەو ژنە.

بە پیرەپیاوەکەم گوت: لێرە بڕۆ و بەتەنیا جێمان بهێڵە، چونکە ئەگەر تۆ لێرەبیت، دەبیتە ڕێگر لەوەی کە ئێمە بتوانین پێکەوە قسە بکەین. پیرەپیاوەکە ڕۆیشت و بینیم کە میرنا بە ئیشتیهاوە دەستی کرد بە خواردنی ئاوگۆشت و نانەکە.

گوتم:من دەتوانم هەست بکەم کە بۆچی جوولەکەکان تۆیان بەردباران کرد، چونکە وابڵاوە کە ژنەکەی هیرود کە بەپێچەوانەی یاساکانی ئایینی یەهوودی بووە بە ژنی ئەو پیاوە، بەجوانی سەمای کردووە و بە سەمای خۆی توانیویەتی هیرود بۆلای خۆی ڕابکێشێت و، هەربۆیە جوولەکەکان ڕقیان لەو ژنانە دەبێتەوە کە سەما دەکەن و، کاتێ سەماکەرێك دەبینن، بەردبارانی دەکەن.

میرنا گوتی: بەردەکانی یەهوودییەکان ئەوەندە منیان لاوازتر کردووە کە تا ئەو ڕۆژەی زیندووم، ناتوانم سەما بکەم.

گوتم: ئەگەر تۆ نەتوانی، ئەوا هیچ ڕوو نادات و، بۆ پەیداکردنی بژێوی تووشی ناڕەحەتی نابیت، چونکە دەتوانی بەم پارەیەی کە بە تۆم داوە، سەرمایە پێکەوە بنێیت و لە یەکێك لە شارەکانی میسر دوکانێك دابنێیت و سەقاڵی کارکردن بیت.

میرنا کیسە پارەکەی لە من وەرگرت و گوشی و، سکەکانی ناوی پشکنی و لێی پرسیم: بۆچی ئەم پارەیە دەدەی بە من؟

گوتم: ئەم پارەیە بە پێی پێشنیاری ڕاوچییەکی ماسی لەلایەن منەوە دەدرێ بە تۆ. ئەو ڕاوچییە دەیگوت کە من لە پێشبڕکێیەکی گالێسکەسواریدا خەڵات وەردەگرم و لەبەرئەوەی پێویستم بەو خەڵاتە نییە، بۆیە باشتر وایە بیدەم بە کچێکی گەنج کە بەخێوکەرەکەی لەدەست داوە.

میرنا بڕێك سەیری منی کرد و گوتی: ئایا ئەو ڕاوچییە پیاوێکی گەنجی لاواز و کەمێك بەرزتر لە ئاستی ناوگین نەبوو، ئایا لەسەر مەچکەکانی هەردوو دەستی نیشانەی برین نەدەبینرا؟

بە سەرسوڕمانەوە لە میرنام پرسی: تۆ چۆن ئەم نیشانانە دەناسی؟ ئەم نیشانانەی کە تۆدەیلێیت، نیشانەکانی عیسایە، ئایا مەگەر تۆ ئەوت بینیوە؟

میرنا گوتی: دوای ئەوەی جوولەکەکان ئێمەیان بەردباران کرد و ئێمە هەڵهاتین، لە هیچ یەکێ لە گوندەکانی جوولەکەکان خواردنیان بە ئێمە نەدەفرۆشت و، من نازانم چۆن دەیزانی کە ئێمە، واتە من و براکەم دوو هونەرمەندە ڕاکردووەکەین و، دەیگوت کە جوولەکەکان بەهۆی تەتەرەکانی خۆیانەوە هەواڵی ڕاکردنی ئێمەیان بە دانیشتوانی ئەو گوندانەی کە لەسەر ڕێگاکەی ئێمە بوون، داوە و ئێمەش کە نەمانتوانی لە ئاواییەکان خواردن بەدەست بهێنین، بە گوڵچنینەوە سکی خۆمان تێر دەکرد تا ڕۆژێك عەسرەکەی گەیشتینە سەر بیرێك و ئاومان لە بیرەکە هەڵگۆزی و تینویەتییەکەمان شکاند و دەست و دەموچاومان فێنك کردەوە. دوای ئەوە، پیاوێك لە ڕێگاوە هات و من سەیرم کرد کە ئەو گەنجە لاوازە و قیافەیەکی زۆر دڵگیری هەیە و شوێنەواری ڕێز و چاکەی لە ڕوخساریدا دیاربوو. دواتر سەیری پێیەکانیم کرد و بینیم سەر هەردوو پێیەکەی بریندارە و دوو برینیش لە مەچەکی هەردوو دەستیدا هەبوو.

ئەو پیاوە لە براکەم نزیك بوویەوە و گوتی ((من تینوومە، کەمێك لەو ئاوەم بدەرێ کە لەم بیرە هەڵتکۆزیوە تا تینویەتییەکەم بشکێت)). براکەم گوتی ((لەبەرئەوەی تۆ

یەهوودیت، بۆیە من ئاو نادەمێ و ئەگەر بشبینم لەناو ئاگردا دەسوتێی، یەك دڵۆپ ئاو ناکەم بە ئاگرەکەدا تا لە بڵێسەی ئاگرەکەی تۆ کەم بکاتەوە)).

ئەو پیاوە لە من نزیك بوویەوە و گوتی ((ئەی ئافرەت، من تینوومە و کەمێك ئاوم بدەرێ)). من سەتڵەکەم خستە ناو بیرەکەوە و ئاوی فێنکم لە بیرەکە هەڵگۆزی و دام بەو پیاوە گەنجە کە دیار بوو زۆر تینوویەتی، ئەویش ئاوەکەی لە من وەرگرت و نۆشی کرد و، دوای ئەوەی تێرئاو بوو، من پێم گوت ((دانیشە تا برینی پێیەکان و دەستەکانت بشۆم)). ئەو پیاوە دانیشت و من برینی هەردوو قاچی و هەردوو دەستیم شوشت و، کاتێ خەریکی شۆردنی برینەکانی بووم، بە سەرسوڕمانەوە سەیرم کرد هەم دەستەکانی و هەم برینی قاچەکانی، لە دوو لاوە بریندار بووە.

گوتم: ((کابرای لاو، چیت بەسەر هاتووە کە دەست و پێیەکانی تۆ بەوجۆرە بریندار بووە؟)) ئەو پیاوە گوتی ((منیان بە چوار مێخدا داکوتا)). ئەگەرچی بە بیستنی قسەی ئەو پیاوە سەرسام بووم، بەڵام هەستم کرد ڕاست دەکات، بە تایبەت کاتێ مرۆڤ سەیری ڕوخساری ئەو پیاوەی بکردایە و هەیبەتی ئەوی ببینیایە، بۆی دەردەکەوت کە مەحاڵە پیاوێکی وەکو ئەو درۆ بکات. برینی مەچەکەکانی دەستی کە لە دوو لاوە بوو و، هەروەها برینی پێیەکانیشی کە دیاربوو لە دوو لاوەیە، دەریدەخست کە شوێنی چەقینی مێخە.

لەو پیاوەم پرسی ((مەگەر تۆ چیت کردبوو کەوا لەخاچیان دایت؟)). ئەو پیاوە گوتی ((من وتەی خودام دەگەیاندە خەڵك و پێم دەگوتن کە بگەڕێنەوە بۆلای خودا)). دوای ئەوە گوتی ((ئەی ئافرەت، ئەوەی کە تۆ ئەمڕۆ بۆ منت کرد، لە ڕاستیدا بۆ ئەو کەسەت کردووە کە منی ناردووە و، لە پاداشتی ئەم کارەت لە گوناهەکانت خۆش بووە و، خوداوەند بەرەکەتی پێ داوی، چونکە تینوویەتی منت شکاند)).

گوتم: ئایاخۆی ئەم وشانەی بە تۆ گوت؟

میرنا گوتی: من ئەو ناناسم و نەمدەزانی ناوی عیسایە و، ئەوا ئێستە ئەم ناوە لە دەمی تۆوە دەبیستم. بەڵام ئەو وشانەی کە گوتم، قسەکانی خودی ئەوە. دوای ئەوە من ڕووم کردە براکەم بۆئەوەی لەبارەی ئەو پیاوەوە قسەی لەگەڵ بکەم و، کاتێ دووبارە ڕووم کردەوە ئەو پیاوە، سەیرم کرد ڕۆیشتووە. سەیری دەوروبەرم کرد تا بزانم ئەو پیاوە لەکوێوە ڕۆیشتووە و، ئەگەرچی کە ئەو ناوچەیە زەوییەکەی لە هەرچوارلاوە

تەخت و بەرین بوو، کەچی ئەو پیاوەم نەبینیەوە و، من و براکەم سەرسام بووین بەوەی کە ئەو پیاوە لەو دەشتە تەخت و بەرینەدا چۆن لەچاو ون بوو.

دەبیٚ بڵێم کە ئێمە لەلای ئەو بیرەئاوەدا برسیمان بوو و، دەشمانزانی کە ئەگەر بۆ بەدەستهێنانی خۆراك بگەڕێینەوە بۆ گوندەکە، وەڵامی نەرێیی دەبیستین، بەتایبەت لەبەرئەوەی کە پارەمان پیٚ نەبوو تا خواردنەکە بە نرخێکی گرانتر لە نرخی ئاسایی بکڕین. مرۆڤ ئەگەر پارەی پیٚ بیٚ، تەنانەت لەو جێگایانەی کە ئەویان بەردباران کردووە، خواردنی دەست دەکەوێت، چونکە ئەگەر بە گرانتر لە نرخی ئاسایی خواردن بکڕیت، فرۆشیارە چاوچنۆکەکان خواردنەکانی خۆیان پێدەفرۆشن، بەڵام ئێمە تەنانەت یەك (پزیش)یشمان نەبوو و نەشماندەتوانی پاروویەك نان بکڕین.

کەمێك دوای ڕۆیشتنی ئەو پیاوەی کە هەردوو دەست و پێی بریندار بوو، پیرەژنێك کە زەمیلەیەکی بە دەستەوە بوو، دەرکەوت. ئەو ژنە بەساڵاچووە نزیکی چاڵەکە کەوتەوە و زەمیلەکەی خۆی کردەوە و، من و براکەم بینیمان کە چەند نانێك و کەمیٚ گۆشتی لێنراو لەو زەمیلەیەدایە. ژنە بەساڵاچووەکە گوتی ((ئەم نان و گۆشتی مەڕە لە زەمیلەکە دەربێنن و بیخۆن)). من گوتم ((ئێمە پارەمان نییە و تەنانەت خاوەنی یەك (پزیش)یش نین تا بیدەین بە حەقی ئەم نان و گۆشتەی تۆدا)). ژنە بەساڵاچووەکە گوتی ((من پارەم لە ئێوە ناوێت و، من نەزرم کردووە تا ئەم نان و گۆشتە بەخۆڕایی بدەم بە کەسانێك کە برسییانە، بۆیە ئەو نان و گۆشتە هی ئێوەیە)). ئێمە سوپاسی ئەو ژنە بەساڵاچووەمان کرد و نان و گۆشتی لێنراوی مەڕەکەمان لە زەمیلەکە دەرهێنا و، ئەو ڕۆژە و شەوی دواتریش لێمان خوارد.

من زانیم کە هەمان ئەو پیاوە چاکەکارە ئەو ژنە بەساڵاچووەی ناردووە بۆسەر بیرەکە تا نان و گۆشت بدا بە ئێمە. دوور نییە ئەو ڕاوچییەی کە بە تۆشی گوتووە بێت بۆ ئێرە تا پارە بدەیت بە من، هەر ئەو بووبیٚ.

گوتم: میرنا، کاتیٚ ئەو ڕاوچییە بە منی گوت کە خەڵاتی پێشبڕکێی گالێسکەسوارییەکە دەبیٚ بە نیسبی من و، من دەبیٚ ئەو خەڵاتە بدەم بە کچێك کە بەخێوکەرەکەی خۆی لەدەست داوە، بەبیرمدا نەدەهات کە لێرە بتدۆزمەوە. من بڕام وایە ئەو ڕۆژەی کە من لە لێوارەکانی میسردا سواری کەشتی بووم و بەڕێ کەوتم، وارێکەوت کە تۆش لەو کەشتییەدا بیت تا لەو کەشتییەدا پێت ئاشنا ببم، ئێستەش

ئەو پارەیە بگرە و هەرچۆنێکت دەوێ خەرجی بکە و، بۆ هەرجێگەیەك دەتەوێ، برۆ و منیش دەڕۆم، چونکە چاوەڕێی پەیامێکی گرنگم کە ئەمڕۆ یان شەو پێم دەگات.

میرنا دەستی منی گرت و گوتی: نا، مەزن تیوس مەڕۆ، دانیشە و لەبارەی ئەو پیاوەوە قسەم بۆ بکە، چونکە ئەو پیاوێکی ئاسایی نەبووە و لە پیاوە پایەبەرزەکان دەچوو و، هێشتاش دەنگەکەی لە گوێمدا دەزرنگێتەوە.

گوتم: میرنا، تۆ ژنێك بوویت کە بە ئاواتی خۆت گەیشتی، چونکە ئەوت بینیوە و دەنگیت بیستووە. بەڵام من بە ئاواتی خۆم نەگەیشتووم و، دەبێ بڕۆم و ئەو ببینم و گوێم لە دەنگی بێت، بۆیە ناتوانم لێرە دوا بکەوم، چونکە ئەگەر لێرە بمێنمەوە ڕەنگە ئەو پەیامە گرنگەی کە من چاوەڕێی دەکەم، پێم نەگات. چونکە ئەو کەسەی ئەو پەیامەم بۆ دێنێ، من نادۆزێتەوە.

ئەمەم گوت و خۆم لە میرنا جیاکردەوە بۆئەوەی لە ژێرزەمینەکە بڕۆمە دەرەوە. بەڵام میرنا پارە زێڕەکەی هەڵدا بۆلای من و گوتی: پارەکەی خۆت هەڵبگرە و برۆ تا بزانی کە ناتوانی بە پارە من بکڕیت. تەنیا پارە دەردی من چارە ناکات، چونکە دوای مردنی براکەم، من نائومێد بووم و ئیتر ناتوانم سەما بکەم و، بەوجۆرەی کەبڕیارم.داوە، ئەمشەو خۆم هەڵدەواسم و کۆتایی بە ژیانی خۆم دێنم، مەگەر ئەوەی کە تۆ چی دەربارەی عیسا دەزانی بە من بڵێیت و من ببەیت بۆ لای ئەو.

گوتم: میرنا، من هیچ زانیارییەکی ڕوون و تایبەتم نییە سەبارەت بە عیسا. بەڵام ئەوە دەزانم کە شێوەی کردارەکانی عیسا بەجۆرێکە کە بیری کەسێکی وەکو من درکی پێ ناکات. من نمونەیەکت پێ دەڵێم کە ژمارەیەکی زۆری ژنانی یەهوودی لەم شارەدان و هەموویان هاوئایینی عیسان، کەچی ئەو خۆی بەهیچ یەکێ لەوان پیشان نادات و لە هەمان کاتدا خۆی لە بەرامبەر ژنێکی میسری وەکو تۆ دەردەخات و بەشداریت دەکات لە سۆزی خۆی، لە کاتێکدا کە تۆ بۆ ئەو بێگانەیت و لە منداڵییەوە تووشی گوناه بوویت.

میرنا گوتی: ئەگەرچی من لە میسر گەورە بووم، بەڵام میسری نیم. باوك و دایکم یۆنانی بوون و من لەیەکێ لە دوورگەکانی یۆنان لەدایك بووم، هەربۆیە لە بنەڕەتدا من یۆنانیم نەك میسری. بەڵام ئەوەی کە گوتت لە منداڵییەوە تووشی گوناه بووم، وایدادەنێین کە من گوناهکار بووم، بەڵام بە هۆی بەردباران کردن و مەرگی براکەمەوە

ژیانم گۆڕاوە. من پێم گوتی کە ناتوانم سەما بکەم و هەربۆیەش ئەگەر سەماکردن گوناه بێت ئەوا من ئیتر ناتوانم تووشی گوناه ببم و، تۆ دەبێ من بگەیەنیتە ئەو پیاوەی کە تۆ دەڵێی ناوی عیسایە تا ئەو، من ڕزگار بکات و من داوات لێ دەکەم ئەو زانیارییانەی کە دەربارەی ئەو هەتە، پێم بدەیت.

گوتم: ئەو زانیارییانەی کە من دەربارەی عیسا هەمە ئەوەیە کە ئەویان لەخاچ دا و پاشان تەرمەکەیان خستە گۆڕەوە و دوای سێ ڕۆژ، عیسا لەناو گۆڕەکەی زیندوو بوویەوە و لەوێ هاتە دەرەوە. جوولەکەکانیش دەڵێن کە عیسا زیندوو نەبۆتەوە، چونکە مردوو زیندوو نابێتەوە، بەڵکو قوتابییەکانی عیسا تەرمی پێشەواکەی خۆیان لەناو گۆڕ دەرهێناوە تا بتوانن بڵێن کە ئەو زیندوو بۆتەوە. بەڵام من کە گۆڕەکەیم بینیوە و سەیری کفنەکەیم کردووە، دەتوانم بڵێم کە بێشك عیسا دوای مەرگ زیندوو بۆتەوە و لەناو گۆڕەکەی هاتۆتە دەرەوە و، هەندێ کەس دوای نوێ بوونەوەی ژیانی عیسا ئەویان بینیوە کە یەکێ لەو کەسانە تۆیت. ئەو زانیارییانەی تر کە لەبارەی عیساوە هەمە ئەوەیە کە عیسا نێردراوی خودایە و لەم دنیایەدا خاوەنی دەسەڵاتێکی زۆر بەهێزە و هیچ کەسێ پێش ئەو، ئەو دەسەڵاتەی نەبووە و دوای ئەوەی زیندوو بوویەوە، بە قوتابییەکانی خۆی گوتووە کە بڕۆن بۆ ناوچەی جەلیلە تاکو ئەو ببینن و، بە ئەگەرێکی زۆر ئەو ڕۆژەی کە تۆ ئەوت لەلای بیرەکەدا بینیوە ئەوکاتە تازە هاتبوو بۆ ئەم ناوچەیە.

هەروەها گوتوویەتی کە لە چل ڕۆژ زیاتر لەماوەی زیندوو بوونەوەی، لەسەر زەوی نامێنێتەوە و دوای ئەوە دەڕوات و کەس نازانێ بۆ کوێ دەڕوات، بەڵام دوای ڕۆیشتن، قوتابییەکان و دۆستەکانی خۆی لە شاخێك کە دەکەوێتە ئەم ناوچەیەوە، دەبینێت و ماڵئاواییان لێ دەکات.

میرنا گوتی: ئەگەر عیسا نێردراوی خودایە، ئەی بۆچی ئەو ڕۆژەی کە من لەلای بیرەکەدا بینیم، تینوی بوو. نێردراوێکی خودا کە توانای ئەنجامدانی هەموو کارێکی هەیە، نابێ تینوی ببێت یان دوای تینویەتی، دەبێ بتوانێ خۆی تێرئاو بکات.

گوتم: میرنا، من ناتوانم وەڵامی تۆ بدەمەوە و بڵێم کە بۆچی نێرداوی خودا دەبێ تینوی بێت و، کاتی تینوی دەبێ، بۆ ئاو بگەڕێ. ئەوەی کە من دەیزانم ئەوەیە کە عیسا پیاوێکە وەکو خەڵکانی تر گۆشت و ئێسقان و خوێنی هەیە و برسی دەبێت و

هەست بە تینوێتی دەکات و، من خۆم ئەوم بە خاچەکەوە بینیی و نیشانەی ئێش و ئازارم تێدا بەدی دەکرد. بەڵام هەمان ئەو پیاوەی کە برسی و تینوی دەبێت و ئێش و ئازاری پێ دەگات، نێردراوی خودایە و ڕەنگە گەورەترین مۆجزیزەکانی ئەو ئەوەبێت کە لە جۆری مرۆڤە و خاوەنەکەی لەم دنیایەدا نییە بەڵکو لە دنیایەکی تردایە.

میرنا گوتی: دوای ئەوەی کە تۆ لەبارەی عیساوە قسەت کرد، من دەزانم کە ئەو تەنیا تۆی بۆ پێدانی پارە بەمن نەناردووە، بەڵکو بۆئەوە تۆی ناردووە بۆلای من تا تۆ جێگەی براکەم بگریتەوە و لەمەبەدواوە من و تۆ وەکو جوتێ کۆتر کە قاچەکانیان پێکەوە بەستووە، پەیوەست بین بە یەکترەوە. عیسا دەیزانی کە من براکەی خۆم لەدەست دەدەم، بۆیە ویستوویەتی بە ناردنی تۆ بۆ ئێرە، برایەکی ترم پێ بەخشێ. کەواتە باشتروایە من و تۆ بڕۆین بۆ شاخەکە و لە بەرامبەر نێردراوی خودا کڕنوش بەرین و داوای لێ بکەین بمانبات بۆناو مەلەکوتی خۆی.

گوتم: میرنا، من پێویستم بە خوشك نییە و حەز ناکەم ببم بە برای تۆ. من لەو ڕووەوە ناڵێم کە ڕقم لە تۆ بێت، بەڵکو بۆئەوە وادەلێم کە نامەوێ خوشکم هەبێ. هەروەها من ناتوانم لەگەڵ خۆم بتبەم بۆ شاخ تا لەوێ عیسا ببینی، ئەویش لەبەر دوو هۆکار: هۆکاری یەکەم ئەوەیە کە قوتابییەکانی عیسا بەخراپ لە من دەڕوانن و وادەزانن سیخوڕم و، دوای ئەوەی کە بگەینە سەر شاخەکە، ڕەنگە پێش ئەوەی عیسا ببینین، من بکوژن و لەبەرئەوەی کە تۆش لەگەڵ مندایت، تۆش بکوژن. هۆکاری دووەم ئەوەیە کەمن ڕۆمیم وخەتەنە نەکراوم و قوتابییەکانی عیسا دەڵێن کە تەنیا ئەو پیاوانە دەتوانن باوەڕ بە عیسا بهێنن کە خەتەنە کراون، بۆیە ڕەنگە لە شاخەکە من ڕاوبنێن و نەهێڵن خۆم بگەیەنمە عیسا. هەربۆیە بە تەنیا دەڕۆم بۆ شاخ، بەڵام بەڵێنت پێ دەدەم دوای ئەوەی عیسام بینی، لەبارەی تۆوە قسەی لەگەڵ دەکەم و، دوای ئەوەش کە گەڕامەوە، وەڵامی عیسات بۆ دەهێنمەوە. بەڵام ئەگەر یەهوودییەکان منیان کوشت یان ئەگەر عیسا منی خستە ناو مەلەکوتی خۆیەوە و منی لەگەڵ خۆی برد، ئەوا ناتوانم بگەڕێمەوە و بتبینمەوە، هەربۆیە ئێستا ماڵئاواییت لێ دەکەم و بەدوای چارەیەك دەگەڕێم.

کاتێ میرنا ئەم قسەیەی منی بیست، ئەو کیسەیەی بۆ هەڵدام کە سکە زێڕەکانی تێدا بوو و گوتی: پارەکەی خۆت هەڵبگرە و بڕۆ، من پێویستم بە پارە نییە. من پێم

گوتی کە حەزدەکەم تۆ بە برای خۆم بزانم و، کەچی تۆ بە لە خۆباییەکی زۆرەوە دەڵێیت کە پێویستت بە خوشك نییە و، ئەو کاتە چاوەڕوانی ئەوەیت کە عیسا تۆ بباتە مەلەکوتی خۆیەوە؟ ئەگەر عیسا پیاوێکی لەخۆڕازی و لوت بەرزی وەکو تۆ بباتە مەلەکوتی خۆیەوە، ئەوا من دڵگرانم بۆ مەلەکوتەکەی ئەو. چونکە بەوجۆرەی کە من لە وتەکانت تێگەیشتووم، عیسا خۆی پیاوێکی بێ فیز و میهرەبان و سادەیە و شوێنکەوتەکانیشی دەبێ وەکو ئەو بێ فیز و میهرەبان و سادە بن. هەرچۆنێ بێ من دوای ئەوەی تۆ لێرە ڕۆشتی، لێرەدا کۆتایی بە ژیانی خۆم دێنم و ئۆباڵی خوێنی من دەکەوێتە ملی تۆ، چونکە تۆ بە لوت بەرزی و لەخۆباییەوە دەبیتە هۆی مردنی من، چونکە ئەگەر خۆپەرست نەبوویتایە، منت لەگەڵ خۆت دەبرد بۆ سەر شاخ تا عیسا ببینم، بۆیە من کۆتاییم بە ژیانی خۆم نەدەهێنا.

دوای ئەم قسەیە، کچە گەنجەکە دەستی بە گریان کرد و من دڵم بۆی تەنگ بوو. زانیشم کە میرنا ڕاست دەکات و خۆپەرستی من بووە ڕێگر لەوەی کە ئەو بە خوشکی خۆم بزانم. کاتێ ئەو گوتی کە تۆ وەکو برای منیت و عیسا تۆی ناردووە بۆ ئێرە تا ببیتە برای من، هەستی لوت بەرزی من بەئاگا هاتەوە و، ئەوە هاتەوە بیرم کە منی مەزن تیوس، لە خانەدانەکانی ڕۆمم و چۆن دەکرێ پیاوێکی وەکو من کە لە خانەدانەکانی ڕۆمە و قۆناغی زانکۆی رودسی تەواو کردووە، کچێکی وەکو میرنا کە گۆرانی بێژە و سەماکەری گەڕۆکە، بە خوشکی خۆی بزانێ. میرنا پێی گوتم کە عیسا پیاوێکی بێ فیزە و شوێنکەوتووانیشی دەبێ بێ فیز بن.

ئەوەی کە ئەو گوتی، ڕاست بوو. منیش ئەوکاتە زانیم کە چوونە ناو مەلەکوتی عیسا بۆ هەموو کەسێ ئاسان نییە و مرۆڤ دەبێ لوت بەرزی و خۆپەرستییەکەی خۆی بخاتە ژێرپێی و، ئەگەر کەسێکی وەکو من لە خانەدانەکانی ڕۆم و دەرچووی رودسیش بێت، دەبێ ئامادە بێ کە کچێکی سەماکەری گەڕۆك بە خوشکی خۆی بزانێت. ئەوەبوو کە بەرەو لای ئەو ڕۆشتم و گوتم: میرنا مەگری، من لەگەڵ خۆم دەتبەم بۆ شاخ.

بەڵام میرنا بە قسەکەی من ڕازی نەبوو و گوتی: ئەگەر دەتەوێ من لەگەڵ خۆت ببەیت بۆ شاخ ئەوا وەکو برایەك ڕەفتارم لەگەڵ بکە و بە میهرەبانییەوە قسەم لەگەڵ بکە، ئەگینا من لەگەڵ تۆ نایەم بۆ شاخ.

منیش بۆئەوەی ئارامی بکەمەوە، دەستم هێنا بە پرچیدا و ئینجا میرنا فرمێسکی چاوەکانی سڕی و خەیاڵی ئاسوودە بوو و، کیسە پارەکەی لەسەر زەوی هەڵگرتەوە و بەرەو دەرەوەی ژێرزەمینەکە بەڕێ کەوتین.

خادەمە یۆنانییەکەی تەماشاخانەکە بینی کە دەمانەوێ بڕۆین، بەڵام ڕێی لە چوونە دەرەوەی میرنا نەگرت، چونکە پارەکەی خۆی وەرگرتبۆوە.

# بەرەو کێوی میعاد

کاتێ ئێمە لە ژێرزەمینەکە هاتینە دەرەوە، سەیرمان کرد شەو داهاتووە و دوای هاتنە دەرەوە لە تەماشاخانەکە بینیمان کە چراکانی شار هەڵکراون.

بە میرنام گوت: دەبێ بەرەو ئەو میوانخانەیە بڕۆین کە منی تیادا نیشتەجێ بووم و، بە دووریشی نازانم ئەمشەو یان بەیانی دەکەوینە ڕێ تاکو خۆمان بگەیەنینە سەر شاخەکە.

میرنا گوتی: هەرکاتێ ویستت بڕۆیت بۆ کێوەکە، منیش لە گەڵت دێم.

گوتم: میرنا، من پێموایە قوتابییەکانی عیسا ئەمشەو یان بەیانی زوو بەرەو شاخەکە دەکەونە ڕێ. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە ئەمشەو و بەیانی، هەزاران تەماشاکەر کە لەملاولاوە هاتبوون بۆ تەبەرییە بۆئەوەی سەیری پێشبڕکێی گالێسکەسواریەکە بکەن، لەم شارە دەڕۆنەوە، هەربۆیە ڕۆیشتنی قوتابییەکانی عیسا بەسەر ڕێگاکەدا سەرنجی کەس ڕاناکێشێ و نابێتە هۆی ئەوەی کە بە دوایاندا بڕۆن.

من ئەوەندە لەبیری ڕۆشتن بووم بۆ کێوەکە کە نەمزانی میرنا پێش ئەوەی بڕواتە ناو میوانخانەکەوە، پێویستی بە پۆشاکە، چونکە ئەو جلانەی کە میرنا لەبەریدا بوو جلێك بوو کە سەماکەرێك بۆ سەماکردن لەبەری دەکات، چونکە ئەوکاتەی ئەویان بەردباران کردووە، جلی سەماکردنەکەی لەبەردا بووە و ئەویش بەو جلانەوە ڕایکردووە و، دواتریش شتێکی پێ نەبووە تا جلەکانی پێ نوێ بکاتەوە. جلەکانی میرنا بریتی بوو لە کراسێکی زۆر کورت کە نەدەگیشتە ئەژنۆکانی و جوتێ پێڵاوی سەماکردن کە پوولەکەی پێوە دوورابوو.

میرنا بەو جلانەوە چووە ناو میوانخانەکەوە، میوانخانەیەك کە هەموو مەعمیلەکانی لە کەسانی خانەدان بوون. خاوەنی میوانخانەکە کە یۆنانی بوو، بە توڕەییەوە بەرەو لای من هات و گوتی: کابرای ڕۆمی، تۆ کاتێ هاتیت بۆ ئەم میوانخانەیە ئافرەتێکت لەگەڵ خۆت هێنا کە هەندێ کەس دەیانگوت ئەوە ئافرەتێکی لەشفرۆش بووە، کەچی من ڕێگریم لە نیشتەجێبوونی ئەو ژنە نەکرد، چونکە جلوبەرگێکی گونجاوی لەبەردا بوو، هەروەها لە ژوورەکەی نەدەهاتە دەرەوە و خۆی بە

پیاوان پیشان نەدەدا. بەڵام ئێستە ئافرەتێکی سەماکەرت لەگەڵ خۆت هێناوە کە مرۆڤ بە بینینی ئەو، لە میوانخانەیەکی ئابڕوومەندی وەکو ئێرە موچڕکەی پێدا دێت. ئایا تۆ ئەی کابرای ڕۆمی شەرمت نەکرد کەوا ئافرەتێکی ئاوات لەگەڵ خۆت هێناوە بۆ ئێرە؟ ئایا لەم شارەدا ژن براوە کەوا ژنێکی بێ سەروبەرت هێناوە بۆ ئەم میوانخانەیە؟

کاتێ خاوەنی میوانخانەکە قسەی دەکرد، من سەیری میرنام دەکرد و دەمبینی کە ئەو ئافرەتە لە خەجاڵەتی وتەریقیدا هەندێ جار سپی دەبوویەوە و هەندێ جاریش سوور دەبوویەوە. من بۆئەوەی میرنا لە خەجاڵەتی و تەریقی دەرباز بکەم و خاوەنی میوانخانەکە ڕازی بکەم تا ئەو کچە لێرە بمێنێتەوە، گوتم: پیاوی باش، بەهەڵەدا چوویت و ئەم کچە گەنجە لەشفرۆش نییە، بەڵکو خوشکی منە. کاتێ من و ئەو سواری کەشتییەك بووین و لە میسرەوە بەرەو ئەم وڵاتە دەهاتین، بوو بە کێشەمان و، خوشکەکەم دوای ئەوەی کەشتییەکە گەیشتە کەنارەکە، لە من جیا بوویەوە و لەگەڵ گروپێك لە گۆرانی بێژ و مۆسیقاژەنە گەڕۆکەکان ڕۆیشت، بەڵام من ئەمڕۆ ئەوم لە تەماشاخانەی ئەم شارەدا دۆزییەوە و زانیم کە ئارەزووی گۆرانی گوتن و مۆسیقاژەنیی لە ناخیدا مردووە، بۆیەشە ئەوم لەگەڵ خۆم هێنا بۆ ئێرە. ئێستەش خوشکەکەم دەنێرم بۆ گەرماوە و دوای ئەوەی خۆی شوشت و جلی گونجاوی لەبەرکرد، تۆ خۆت دەڵێیت کە ئافرەتێکی خانەدان و بەڕەوشتە.

خاوەنی میوانخانەکە لەسەرەتادا باوەڕی بە قسەکانی من نەکرد و لای وابوو کە منیش وەکو میرنا وام (لەکاتێکدا میرنا مەست نەبوو)، بەڵام دوای ئەوەی دڵنیابوو کە من هۆشم لەسەر خۆمە، ڕازی بوو میرنا بێتە ناو میوانخانەکەوە و، کەنیزێکی نارد تا میرنا لە گەرماوەدا بشوات و، کاتێ ئەو کچە گەنجەیان لە گەرماوەدا دەشوشت، من بە خاوەنی میوانخانەکەم گوت کە لە بازاڕ دوو پۆشاك بۆ میرنا بکڕێ.

خاوەنی میوانخانەکە گوتی: من فرۆشیاری جلوبەرگ دێنم بۆ ئێرە تا پۆشاکێك بەبەری ئەم ئافرەتە گەنجە پێ بفرۆشێت.

دوای ئەوەی میرنایان لە حەمام شوشت، ئەو کەنیزەی کە شوشتبووی، پرچی شانە کرد و زۆری پێ نەچوو کە فرۆشیاری پۆشاکەکە هات و دیاربوو کە پێڵاویشی لایە. من جلێکی گونجاو و شایستە و جوتێ پێڵاوم بۆ میرنا کڕی و، پاش ئەوەی کە جلە تازەکەی لەبەرکرد، ئاوێنەیەکی بەدەستەوە گرت و چرکە بە چرکە لە ئاوێنەکەدا

سەیری خۆی دەکرد و، بە چاوەکانیدا دیاربوو کە لە بینینی گەنجێتی خۆی و جلە تازەکە، چێژ وەردەگرێت و گوتی: مەزن تیوس، ئەم جلانەم لێدێت؟

گوتم: میرنا، ئەمشەو یەکێکە لە شەوە گەورەکانی ژیانی من، چونکە ئەمشەو چاوەڕێ دەکەم هەواڵی عیسام پێ بگات و من بەڕێ بکەوم تاکو بڕۆم و لەو کێوە چاوم پێی بکەوێت و، لە شەوێکی ئاوادا من توانام نییە لەبارەی جلوبەرگەوە بۆچوونی خۆم دەرببڕم.

میرنا گوتی: براکەم، تۆ هێشتا لە من تووڕەیت و ناتەوێ بە خوشکی خۆتم بزانی؟

گوتم: خوشکەکەم، من تۆ بە خوشکی خۆم دەزانم و، تۆ دەبێ ئەوە بزانی کە براکەت لە شەوێکی ئاوادا ئەو توانا و زەوقەی نییە تا لەبارەی جلوبەرگ و پێڵاوەوە قسە بکات.

گوتم: میرنا، من چاوەڕێی هەواڵێکم کە دەبێ پێم بگات و، هیوادارم ئەمشەو ئەو هەواڵەم پێ بگات. ئەو هەواڵە بریتییە لە ڕاگەیاندنی کۆبوونەوەی شوێنکەوتووانی عیسا لە شاخ. ئەگەر ئەمشەو ئەم هەواڵەم پێ بگات ئەوا بەخێرایی بەڕێ دەکەوین و، ئەگەر پێم نەگەیشت ئەوا بەیانی زوو لەم شارە دەچینە دەرەوە و بەرەو ئەو شاخەی کە من بڕێ لە ناونیشانەکەیم وەرگرتووە، دەڕۆین و لەبەرئەوەی تۆ لە ژێرزەمینی تەماشاخانەکەدا بێزار بوویت و نەتدەتوانی بە باشی پشوو بدەیت، لێرەدا بخەوە تاکو بەیانی زوو، لەو گەشتەدا ماندوو نەبیت.

میرنا لەسەر پێخەفێك کە خاوەنی میوانخانەکە بە شاگردێکی خۆیدا ناردبووی بۆی، پشووی دا و منیش لەسەر پێخەفی خۆم ڕاکشام و خەوم لێکەوت. وابزانم ماوەی دوو کاتژمێر خەوتم و دواتر بەدەنگی تەقەی دەرگای ژوورەکەم بەئاگایان هێنامەوە و هەستامەوە و دەرگاکەم کردەوە و بینیم شاگردی میوانخانەکەیە، بۆیە لێم پرسی: ئیشت چییە؟

شاگردی میوانخانەکە گوتی: من نەمدەویست بەئاگات بهێنمەوە، بەڵام ئاژەڵدارێك کە دوو گوێدرێژی پێیە، هاتووە و پێداگری کرد کە دەبێ بەئاگات بهێنمەوە و، دەڵێ کە ئەگەر بەئاگات نەهێنمەوە، تووڕە دەبێت.

من بە سەرسامی و خۆشحاڵییەوە پرسیم: ئاژەڵدارەکە بە دوو گوێدرێژەوە هاتووە؟

شاگردی میوانخانەکە گوتی: بەڵێ، تۆ دەتوانی لە پەنجەرەوە ئەو و گوێدرێژەکانی ببینی.

من بەرەو پەنجەرەکە ڕۆشتم و سەیری خوارەوەم کرد و، لەبەر ڕووناکی چرای ناو میوانخانەکەوە ناتانم بینی و هاوارم کرد: ناتان، ئەوە تۆی؟

ناتان گوتی: بەڵێ، خێراکە چونکە دەبێ بکەوینەڕێ.

من بەپەلە ڕۆشتمە خوارەوە و لەناو میوانخانەکە چوومە دەرەوە بۆلای ناتان و ئەو گوتی: بەپێی ئەو فەرمانەی کە لەلایەن عیساوە دەرچووە، ئەمشەو هەموو لایەنگرەکانی لەشاری کوفرناعومەوە بەڕێ کەوتوون و، بەپێی ئەو فەرمانەی کە پێیان گەیشتووە، کۆمەڵی جیاجیا بەڕێ کەوتوون و سوزمانیش لەگەڵ یەکێ لەو کۆمەڵانە ڕۆیشت و منیش یەکێ لە گوێدرێژەکانم دا بە ئەو تا سواری ببێت. گوێدرێژەکەی ترم دایە دەست شەمعون پترۆس، چونکە دایکی بەساڵاچووە و ناتوانێ بەپێ بڕوات و، ئەویش دایکی سوار کرد و بەڕێ کەوت.

پاشان ناتان بە پەشێوی گوتی: بۆچی ڕاوەستاویت و سوار نابیت تا بەڕێ بکەوین و بڕۆین؟ ئەمشەو شەوی بەراتە و، ئەمشەو مەلەکوتی عیسا لەم سەرزەوییەدا پەیدا دەبێت.

گوتم: ناتان، شمشێرەکەی خۆم لەگەڵ خۆم بێنم؟

ناتان گوتی: بۆچی شمشێرەکەی خۆت دێنیت؟

گوتم: ڕەنگە ڕێگەکەم مەترسیدار بێت.

ناتان گوتی: مامۆستاکەی ئێمە گوتوویەتی هەرکەسێ شمشێر ڕابووەشێنێ ئەوا بە شمشێر دەکوژرێت و، ئەمشەو ڕێگەکە نائارام نییە و گریمان ئەگەر نائارامیش بێت، ئەوا هەزارەها فریشتە کە عیسا دەیاننێرێت بۆلای قوتابی و شوێنکەوتووەکانی خۆی، ئەمشەو پارێزگاری لە ئێمە دەکەن.

من لە ناتانم پرسی: دەزانی کێوی میعاد لە کوێیە؟

ئەو گوتی: دەزانم شاخەکە لە کوێدایە، بەڵام ڕێگەیەکی دووورودرێژمان لەپێشە و، دەبێ بە زووترین کات بکەوینەڕێ و بڕۆین و، لەگەڵ ئەوەش کە ڕێگەکە دوورە، باشتروایە کاتێ بگەینە شاخەکە، شەو داهاتبێت بۆئەوەی پێمان نەزانن.

گوتم: من ئێستە دەڕۆمە سەرەوە و جل لەبەر دەکەم و دێمە خوارەوە و بەڕێ دەکەوین.

کاتێ من لەگەڵ میرنا لە نهۆمی سەرەوەی میوانخانەکە هاتینە خوارەوە، ناتان لە یەکەم ساتدا نەیزانی ئەو ژنەی کە لەگەڵ مندایە، مریەمی بێرت نییە. دوای ئەوەی سەیری کرد کە ئەو ژنێکی ترە، بە سەرسوڕمانەوە سەیری منی کرد.

من پێم گوت: مریەمی بێرت ڕۆیشت و ئەم ژنەی کە دەیبینی، ژنێکی بیانییە و من بەڵێنم پێداوە کە بیبەین بۆلای عیسا و ناتوانم بەڵێنەکەی خۆم نەبەمە سەر. بۆیە داوات لێ دەکەم ناڕازی مەبە لە هاتنی ئەم ژنەی کە ناوی میرنایە و بهێڵە لەگەڵمان بێت.

ناتان گوتی: من ناڕازی نیم و دەهێڵم لەگەڵمان بێت.

من زانیم کە ناتان لە هەواڵی دیداری عیسا لە نزیکەوە، ئەوەندە خۆشحاڵە کە ئەگەر لەوکاتەدا داوایان لێ بکردایە ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکانیش کە عیسایان مەحکوم کرد بە لەسێدارەدان، لەگەڵمان بێن، ئەوا ڕازی دەبوو.

پاشان، کەوتینەڕێ و ناتان ئێمەی لە تەبەرییە بردە دەرەوە و، پاش کەمێ کە بەڕێکاوە بووین، بەیانی داهات. دوای هەڵهاتنی بەیانی، ژمارەیەکی زۆر لە ڕێبوارەکان لەسەر ڕێگاکە دەبینران و ئەوانیش ئەو کەسانە بوون کە لە تەبەرییەوە دەگەڕانەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان و دەیانگوت کە بۆ بینینی پێشبڕکێی گالێسکە سواری هاتوون بۆ تەبەرییە.

کاتێ خۆر هەڵهات، من جارێکی تر دەریاچەی جەلیلەم لەبەر ڕووناکی خۆردا بەدی کرد و سەیرم کرد چواردەوری شاری تەبەرییە بە باخ دەوری گیراوە و تەنانەت یەك بست زەوی نەکێڵراو لەو ناوچەیەدا بەدی ناکرێ. من زانیم کە لەسەر هەرپردێك ژمارەیەك لە سەربازانی لژیونی ڕۆمی دانراون و، ئەو کەسانەش کە سواری تەختی ڕەوان یان ئەسپ دەبن، لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرێت و لێی ورد دەبنەوە تا بزانن چەکی پێیە یان نا. جگە لەمانە، ئەوانەی کە سواری ئەسپ و گوێدرێژ ببوون یان لەسەر تەختی ڕەوان دەڕۆشتن، دەبووایە باجیان بدایە بە سەربازانی ڕۆمی. ئێمەش ئەو ڕۆژە سێ جار باجی ڕێگامان دا، چونکە گوێدرێژمان پێ بوو.

نزیکی نیوەڕۆ لەلای بیرێك ڕاوەستاین تا پشوو بدەین و گوێدرێژەکانیش ماندوویان دەربچێت. لەکاتێکدا کە سەیری ڕێبوارەکانمان دەکرد، دەمانزانی کامیان

بەرەو کێوەکە دەڕۆن و کامیان لەو کەسانەن کە دوێنێ سەیری پێشبڕکێی گالێسکەسوارییەکەیان کردووە کەوا ئەو ڕۆژە بۆ وڵاتەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە. ئەوانەی کە بۆ کێوەکە دەڕۆیشتن، هەنگاوی خێرایان دەنا و دیار بوو کە هێزێکی نادیاریان تێدایە. بەڵام ئەوانەی کە دوێنێ لە پێشبڕکێی گالێسکەسوارییەکەدا بەشدارییان کردبوو، ماندوو دیاربوون و بە هەنگاوی هێواش دەڕۆیشتن.

لە کاتێکدا کە ئێمە سەرقاڵی سەیرکردنی ڕێبوارەکان بووین، لە دوورەوە تەپوتۆزێکی زۆر چوو بە ئاسماندا و، پاشان دەنگی زەنگۆڵە و ئینجا دەنگی ڕۆشتنی گالیسکە گەشتە گوێ. ئێمە بینییمان کە ژمارەیەك لە گالێسکە زۆر بەخێرایی لەڕێگاکەوە گەیشتنەجێ و بەتەنیشت ئێمەدا تێپەڕیان کرد و، دوای ئەوەی بڕێك تەپوتۆزیان لە هەوادا بڵاوکردەوە، لەبەرچاو ون بوون. ئەوانە ئەو گالیسکانە بوون کە ڕۆژی ڕابردوو لە پێشبڕکێی گالێسکەسوارییەکەدا لە تەبەرییە بەشداریان کردبوو و، ئەو کاتە دەگەڕانەوە تا بڕۆنەوە بۆ شوێنی یەکەمجاریان.

زۆری پێنەچوو کە لە خوارەوەی ڕێگاکە هاوارێك هاتە گوێ. من هەرکە گوێم لە دەنگی هاوارەکانەوە بوو، هەستم کرد خێرایی ڕۆیشتنی گالێسکەکان ڕووداوێکی ناخۆشی خولقاندووە. هەستەکەم بەڕاست گەڕا، چونکە کاتێ کەوتینەڕێ و درێژەمان بە گەشتەکەمان دا و گەیشتینە ئەو خاڵەی کە هاوارەکانی لێوە دەهاتە گوێ، بینم پیاوێکی گەنج لە تەنیشت ڕێگاکە لەسەر زەوی کەوتووە و، هەروەها لەنزیك ئەوەوە پیرەپیاوێکی نابینا هاوار و ناڵە دەکات و خەڵك بانگ دەکات بۆ یارمەتی دانی.

دیاربوو کە پیاوە گەنجەکە ڕێنوێنیکەری ئەو پیاوە نابینایە بووە و، دوای ئەوەی گالێسکەکان گەیشتوونەتە ئەوێ، توانیویەتی ئەو پیرەپیاوە نابینایە لەسەر ڕێگاکە دوور بخاتەوە تا نەکەوێتە ژێر گالێسکەکە، بەڵام خۆی کەوتۆتە ژێر تایەیەکی گالێسکەکەوە و، بە ئەگەرێکی زۆر قاچی شکاوە، چونکە گەنجەکە نەیدەتوانی لەجێی خۆی هەستێتەوە.

میرنا کە لەسەر پشتی گوێدرێژەکەیدا بوو، دوای ئەوەی ئەو گەنجەی بینی، لەسەر گوێدرێژەکە هاتە خوارەوە و لەلای ئەو گەنجەدا لەسەر زەوییەکە دانیشت و قاچی پشکنی و گوتی: بێگومان قاچی ئەم گەنجە شکاوە و ناتوانێ بڕوات لەڕێ.

گەنجە بریندارەکە گوتی: ئەی جوولەکەکان، من نیگەرانی خۆم نیم، بەلاّم زۆر نیگەرانی ئەم پیرەپیاوە نابینایەم کە لەگەڵ مندایە. من بوومە ڕێنوێنیکەری ئەم پیرەپیاوە تا بیگەیەنمە دەشتێکی بەرز کە شاری (ناصری) لێیە، چونکە لەو دەشتەدا کابرایەکی لێیە کە دەتوانێ چاوە نابیناکانی ئەو چارەسەر بکات و بینایی بۆ بگەڕێتەوە. ئەم پیرەپیاوە هەردەبێ ئەمشەو بگاتە ئەوێ تا چارەسەری بۆ بکرێت و، ئەگەر بەیانی بگاتە ئەوێ، ئیتر دەوا بێ سوود دەبێت بۆی، چونکە ئەو کەسەی کە دەبێ چارەسەری بکات، لەوێ نابێ و، ئەم پیرەپیاوە داماوە تا دوایین ڕۆژەکانی ژیان بە کوێری دەمێنێتەوە.

ناتان لێی پرسی: ئەم پیرەپیاوە چی تۆیە؟

گەنجەکە گوتی: ئەم پیرەپیاوە باوکی منە و، ئەمشەو پیاوێك دێت بۆ دەشتی ناصری کە چاوەکانی باوکم چارەسەر دەکات و بەرەو ڕێی ڕاست هیدایەتی دەکات.

ناتان گوتی: ڕێگاکان زۆرن و ڕێنوێنیکەری گومڕا زۆرن.

گەنجەکە ئەگەرچی کە بریندابوو و ڕوخساریشی خوێناوڵ ببوو، زەردە خەنەیەکی کرد و گوتی: لەیەك ڕێگا زیاتر بوونی نییە.

میرنا گوتی: ئێمەش لەو ڕێگایەوە دەڕۆین و لەبەرئەوەی ڕێگاکەمان یەك ڕێگایە، دەتوانین باوکە نابیناکەی تۆ لەگەڵ خۆمان بەرین. دوای ئەم گوتەیە، میرنا سەیرێکی منی کرد و من ناچاربوو لەسەر پشتی گوێدرێژەکە بێتە خوارەوە تاکو پیرەپیاوە نابیناکە سوار بێت.

کاتێ پیرەپیاوە نابیناکەیان سوار کرد، میرنا گوتی: من دەتوانم بە پێ بێم و، ئێمە کە بەرەو کێوەکە دەڕۆین، باشتروایە ئەم گەنجە بریندارەش سواری گوێدرێژەکەی من بکەین و لەگەڵ خۆمان بیبەین. من پێموایە کە هەرکاتێ برینی قاچی ئەو بپێچین، ئەوا بتوانێ سواری گوێدرێژەکە ببێت.

گەنجەکە گوتی: من نامەوێ ببمە زەحمەت بۆ ئێوە، بەلاّم لەبەرئەوەی ئێمە نەوەی یەك باوکی ئاسمانین، ئەگەر ئێوە یارمەتیم بدەن، ئەوا باوکی ئاسمانیمان پاداشتی ئێوە دەداتەوە.

من دوای بیستنی ئەم قسەیە نارەحەت بووم، چونکە نەمدەتوانی ڕازی بم بەوەی کە پیاوێکی وەکو من کە لە خانەدانەکانی ڕۆمم، لە ڕووی مافەوە لەگەڵ ئەو گەنجە

هەژارە یەهوودییە و باوکە نابیناکەی یەکسان بم و، هەموومان بە نەوەکانی یەك باوك بژمێردرێین. ئەگەرچی کە لە قسەی ئەو گەنجە پەس ببووم، بەلام لەو یارمەتی دانەی کە میرنا بەرامبەر بەو پیرەپیاوە نابینایە و کورە گەنجەکەی ئەنجامی دا، خۆشحاڵ بووم.

پاشان، من و میرنا ڕوخساری ئەو پیاوە گەنجە یەهوودییەی کە خوێناوڵ ببوو، شوشتمان و، من پارچە پەڕۆیەکم لە ناتان وەرگرت و قاچیم توند توند پێچا و، بە هاوکاری میرنا و ناتان خستمانە سەر پشتی گوێدرێژەکە.

پێش ئەوەی بکەوینەڕێ، پیرەپیاوە نابیناکە کە سواری گوێدرێژەکە ببوو، ڕووی خۆی کردە ئەولایەی کە دەنگی میرنای لێوە دەبیسترا و، بڕێ بەزمانی عیبری قسەی لەگەڵ کرد، بەلام میرنا نەیتوانی وەلامی بداتەوە، چونکە زمانی عیبری نەدەزانی.

لەپڕ دەنگی نارەزایی پیرەپیاوە نابیناکە بۆ کورە گەنجەکە بەرز بوویەوە و گوتی: ئەم ژنە کێیە کە ناتوانێ یەك وشەش بە زمانی ئێمە قسە بکات؟ ئەم ژنە بێگانەیە، نەکا تۆ لەگەڵ ئەم ژنە ببیتە ئاشنا؟ لێی دوور بکەوەرەوە، چونکە گلاوە.

من لەم قسەیە، لەدوای ئەوەی کە میرنا یارمەتی ئەو پیرەپیاوە نابینایەی دا، سەرم سوڕمابوو، پاشان کورە گەنجەکەی گوتی: لە نارەزایی باوکم تورە مەبن، چونکە باوکم لە هەموو تەمەنیدا یاساکانی ئیسرائیلی پەیرەو کردووە و، یەکێ لە یاساکانیش ئەوەیە کە پیاوی یەهوودی نابێ لەگەڵ ژنێکی نایەهوودیدا جووت ببێ.

من بە پیاوە نابیناکەم گوت: پیرەپیاو، کاتێ کوڕەکەی تۆ بریندار بوو و تۆش لەتەنیشت ڕێگاکەوە هاوار و ناڵەت دەکرد، ژمارەیەك لە یەهوودییەکان کە هاوئایینی تۆن و لە ڕێگاکەوە تێپەڕیان دەکرد و، کەسیشیان نەیانویست یارمەتیت بدەن و سواری گوێدرێژت بکەن.

بەلام ئەو ژنەی کە تۆ بە گلاوی دەزانی، میسرییە و بە ڕەچەڵەك یۆنانییە، کەچی یارمەتی تۆشی دا و تۆی سواری گوێدرێژەکە کرد. ئەوە بزانە کە منیش بیانیم و ئەگەرچی جلی جوولەکەم لەبەرکردووە، بەلام جوولەکە نیم. بەڵکو من ڕۆمیم و ڕەنگە من لەلای تۆ بوونەوەرێکی گلاو بم. بەلام هیوادارم ئەو گوێدرێژەی کە تۆ سواری پشتی بووی، گلاو نەبێ.

ناتان بۆئەوەی ناوبژیوانی بکات، بە پیرەپیاوە نابیناکەی گوت: پیرەپیاو، من لە شوێنکەوتووەکانی یەحیای لەئاوهەڵکێش بووم. دوای ئەوەی یەحیای لەئاوهەڵکێشیان کوشت، من بەڵێنم دا کە بێدەنگ بم و لێوم بۆ قسە نەکەمەوە مەگەر ئەوەندەی کە پێویست بێ بۆ درێژەدان بە ژیانم لەنێو خەڵکدا. من بەڵێنم دا کە لێوم بۆ قسە نەکەمەوە تا ئەو ڕۆژەی کە ڕزگارکەری ڕاستەقینە دەردەکەوێت و، لەبەرئەوەی ئەم ڕۆژە هاتووە و ڕزگارکەری ڕاستەقینە لەناو گۆڕەکەی هاتۆتە دەرەوە و لەنێو ئێمەدا دەرکەوتووە تاکو لە گوناه پاکمان بکاتەوە و بەرەو ڕێگای ڕاست هیدایەتمان بکات، بۆیە من بێدەنگیم شکاندووە و قسە دەکەم. ئەی کابرای ڕۆمی، لێم قبوڵ بکە کە لەنێو ئێمەی جوولەکەدا تەنانەت کەسی وای تێدا نییە کە بێگوناه بێت، بەڵکو هەموومان گوناهبارین. نە خۆشۆرین دەبێتە هۆی ئەوەی دەروونت پاك ببێتەوە و نە قوربانی. لەنێوان ئێمەدا پیاوێك دەرکەوتووە کە بۆ ڕزگارکردنی ئێمە دروست بووە، کەچی ئەو پیاوەیان دەستگیر کرد و لەخاچیان دا. بەڵام دوای ئەوەی مرد و خستیانە ناو گۆڕەوە، زیندوو بوویەوە و گەڕایەوە بۆلای ئێمە تاکو ڕزگارمان بکات. ئەگەر تۆ بڕوات بەم پیاوە هەبێت، ئەوا چاوەکانت چاك دەبێتەوە و ئەگینا جگە لەمە تا کۆتایی تەمەنت بە نابینایی دەمێنیتەوە.

پیرە پیاوەکە گوتی: ئەم قسانە مەکە، ئەمانەی کە دەیڵێیت کوفرە. واای لە من کە لەگەڵ کۆمەڵێکدا گەشت دەکەم کە هەموویان کافرن و بە پێچەوانەی یاساکانی ئیسرائیل دەجوڵێنەوە.

کوڕە گەنجەکە بە پیرەپیاوەکەی گوت: باوکە، هەرچەندە ئەم کەسانە بۆ ئێمە بێگانەن، بەڵام ئەوە بهێنەرەوە یادت کە ژمارەیەکی زۆر لە نەوەکانی ئیسرائیل بە تەنیشتماندا تێپەڕیان کرد و هیچکامیان یارمەتی ئێمەیان نەدا. بەڵام ئەمانە بەزەییان بە ئێمەدا هاتەوە و خۆیان لەسەر گوێدرێژەکە دابەزین بۆئەوەی ئێمە سوار بکەن.

ئەم قسەیە کاری لە پیاوە نابیناکە کرد و قاچەکانی ڕاوەشاند بۆئەوەی گوێدرێژەکە خێراتر بڕوات و لە ئێمە دوور بکەوێتەوە، بەڵام کوڕە گەنجەکەی لە ئێمە دوور نەکەوتەوە و گوتی: باوکی من بەساڵداچووە و وەکو هەموو بەساڵاچووەکان پەیوەستە بە خوو و نەریتە کۆنەکانەوە. ئەو لە منداڵییەوە لەگەڵ یاساکانی ئیسرائیل گەورە بووە و ناتوانێ بەجۆرێکی تر بیر بکاتەوە. ئەو وادەزانێ هەرکەسێ بەپێی

یاساکانی ئیسرائیل بجوڵێتەوە ئەوا پاك و بێگەردە. هەرچەندە منیش بە یاساکانی ئیسرائیل کاردەکەم، بەڵام خۆم بە پاك نازانم. من هەوڵ دەدەم تووشی گوناه نەبم، بەڵام هەندێ جار خەیاڵی گوناه دێ بە مێشکمدا و بڕوام وایە لە مێشکدا، خەیاڵی تووش بوون بە گوناهیش وەکو گوناهکردن وایە.

من سەیرێکی ڕوخساری ئەو گەنجەم کرد و بینیم چاوەکانی ڕۆشن و سافە و وای نیشانی دەدات کە ڕۆحێکی پاکی هەیە. پێم گوت: ئەی لاو، من وانازانم کە تۆ گوناهکار بیت و بڕوام وایە تۆ بە ئەنقەست تووشی گوناه نابیت.

گەنجەکە گوتی: ئێمە ئەگەر لە هەموو تەمەنماندا تووشی گوناه نەبین، ئەوا دیسان گوناهکارین، چونکە گوناه لەلایەن باوك و دایکە یەکەمینەکەمانەوە بۆمان ماوەتەوە.

پرسیم: مەبەستت لە باوك و دایکی یەکەمین، ئادەم و حەوایە؟

گەنجەکە گوتی: بەڵێ، خودا ئادەم و حەوای لەسەر شێوەی خۆی دروست کرد، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو دووانە تووشی گوناه بوون، بۆیە وەکو تۆزو خۆڵێك کە لەسەر ئاوێنە بنیشێت، تۆز و خۆڵ لەسەر ئەو شکڵەی ئەوان نیشت و ئەوانی گۆڕی.

گوتم: ئەی لاوی یەهوودی، کاتێ من لە ئەسکەندەرییە بووم، لە یەکێ لە قوتابییەکانی زانکۆ بیستم کە بابەتی گوناه لەلایەن ئادەم وحەوا تەنیا وەکو نموونەیەك وایە.

گەنجە یەهوودییەکە گوتی: لە مەبەستت تێ ناگەم.

گوتم: ئەو قوتابییەی زانکۆ کە لەگەڵ من گفتوگۆی دەکرد، دەیگوت کە مەبەست لە ئادەم و حەوا بریتییە لە دوو هێزی ئەرێ و نەرێ کە لە سەرەتای سروشتەوە هەبووە.

گەنجە یەهوودییەکە گوتی: من لەبەرئەوەی نەچوومەتە قوتابخانەوە و وانەم نەخوێندووە، بۆیە نازانم چی دەڵێیت.

من زانیم کە ناتوانم فەلسەفەی ئادەم وحەوا بەو گەنجە تێ بگەیەنم، بۆیە وازم لە قسەکەی خۆم هێنا و گەنجەکە گوتی: من نەخوێندەوارم و وانەم نەخوێندووە، بەڵام عیسام بینیوە و باوەڕم پێی هێناوە و، ئەگەر باوکم ڕێی لێ نەگرتمایە، ئەوا من شوێن عیسا دەکەوتم و بۆ هەر جێگەیەك بڕۆشتایە، منیش دەڕۆشتم. بەڵام باوکم کە

جوولەکەیەکی دەمارگیرە، لایەنگری بیروبۆچوونی ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکانە. باوکم بە منی گوت کە عیسا پیاوێکی ئاژاوەگێرە و من نابێ ببمە قوتابی و شوێنکەوتەی ئەو. من گوتم ((باوکە، پیاوێکی ئاژاوەگێڕ ناتوانێ شیفایی نەخۆشەکان بدات و نابیناکان چاك بکاتەوە)). من لەبەرئەوەی دەمبینی کە باوکم حەز ناکات ببمە یەکێك لە قوتابی و شوێنکەوتەکانی عیسا و لە دوایەوە بڕۆم، بۆیە بەناچاری بەقسەیم کرد، چونکە ڕێزگرتن لە دایك و باوك لەلای ئێمەی جوولەکە پێویستە و، ئێمە نابێ کارێ بکەین کە ببێتە هۆی ئازاردانی دڵی ئەوان. ماوەیەك تێپەڕی و پاشان شەوێك باوکم، دوای ئەوەی نوێژی شەوی خوێند، پشووی دا و بەیانی ڕۆژی دواتر کاتێ لەخەو هەستا، سەیری کرد چاوەکانی هیچ شوێنێ نابینێ. ئەو وایزانی کە هێشتا بەیانی دانەهاتووە و هەوا تاریکە، بەڵام من پێم گوت کە هەوا تاریك نییە و ڕووناکە بەڵام چاوەکانی ئەو نابینێت.

ئەوکاتە باوکم ئامادەبوو کە باوەڕ بە عیسا بێنێت تاکو بەهۆی ئەوەوە چاوەکانی چاك ببێتەوە. بەڵام عیسا ئەو کاتە لەم ناوچەیەدا نەبوو، پاشان بەو جۆرەی کە ئێمە لێرە بیستمان، ئەویان لەخاچ دا و کوشتیان. پزیشکەکانی ئێرەش گوتیان کە ناتوانن چاوەکانی باوکم چارەسەر بکەن و گوتیان کە ناتوانن بزانن بەچ هۆیەك کوێر بووە تا چارەسەری بۆ بکەن. باوکم وایزانی تا کۆتایی تەمەنی بە نابینایی دەمێنێتەوە تاکو هەواڵ گەیشت کە عیسا لەناو گۆڕەکەی زیندوو بۆتەوە و لەناو گۆڕەکەی هاتۆتە دەرەوە و هاتووە بۆ ناوچەی جەلیلە و، دواتر من لەوە ئاگادار بوومەوە کە لە ڕۆژێکی تایبەتدا، عیسا قوتابی و شوێنکەوتووەکانی لە کێوێکدا دەبینێ. باوکم کاتێ ئەم هەواڵەی بیست، هیوای خواست بیناییەکەی بگەڕێتەوە و داوای لە من کرد تا بیبەم بۆلای عیسا، بۆیە منیش دەستیم گرت و بەڕێ کەوتین و، ئیتر ڕووداوەکانی تریش ئێوە دەیزانن و ئەگەر یارمەتی ئێمەتان نەدایە، ئەوا باکم ومن لە ڕێگادا دەماینەوە و نەماندەتوانی خۆمان بگەیەنینە عیسا.

میرنا لێی پرسیم: ئەم گەنجە چی دەڵێ؟

من کورتەی قسەکانی گەنجە یەهوودییەکەم بۆ میرنا گێڕایەوە و ئەویش گوتی: وادیارە ئەم گەنجە دەروونی پاکە و پێموایە دوای ئەوەی کە عیسای بینی، دەچێتە ناو مەلەکوتەکەیەوە.

ئینجا گەنجە یەهوودییەکە لێی پرسیم: لەبەرئەوەی تۆ کابرایەکیت کە قوتابخانەت بینیوە و وانەت خوێندووە، پێم بڵێ کە چی تێگەیشتوویت لە زانیارییەکانی عیسا؟

گوتم: من سەبارەت بە زانیارییەکانی عیسا لە خودی خۆی هیچم نەبیستووە و ئەوەی کە بیستوومە لەلایەن قوتابییەکانییەوە بووە، قوتابییەکانی عیساش لەبەرئەوەی گومانیان لە من هەبوو و لەبەرئەوەش کە ڕۆمیم، بە ڕوونی قسەیان نەدەکرد و، بەو جۆرەی کە دەبووایە، منیان لە زانیارییەکانی عیسا بەشدار نەدەکرد و هەندێ جار ڕستەیەکیان دەگوت بەبێ ئەوەی تەواوی بکەن یان ڕوونکردنەوەی لەبارەوە بدەن. ئەمانە بەجۆرێك بوو کە من ئێستە ناتوانم پێت بڵێم کە زانیارییەکانی عیسا چییە. ئەوەی کە من تا ئێستا_هەڵبەت لەدەمی قوتابییەکانی عیساوە_ لێی تێگەیشتووم ئەمەیە کە عیسا دەڵێ خاوەنی مەلەکوتێکە، بەڵام ئەو مەلەکوتە لەم دنیایەدا نییە و، لەبەرئەوەی مەلەکوتی عیسا لەم جیهانەدا نییە بەڵکو لە دنیایەکی تردایە، بۆیە یاساکان و سیستەمەکانیشی پەیوەستە بە دنیایەکی ترەوە نەك ئەم دنیایە، ئەمەش ئەو شتانەیە کە تا ئەمڕۆ من لێی تێ گەیشتووم، بەڵام هیوادارم دوای بینینی عیسا لە خودی ئەو، هەندێ شتم گوێ لێبێت کە زانیارییەکانم زیاتر بکات.

میرنا گوتی: من ئێستە لە هەمووتان بەختەوەرترم، چونکە بچوکترین ئاگاییم لەبارەی زانیارییەکانی عیساوە نییە تەنیا ئەوە نەبێت کە لە مەزن تیوس بیستوومە و، لەبەرئەوەی ئاگاییم نییە بۆیە بیروهۆشم وەکو لەوحەیەك وایە کە هێشتا شتی لەسەر نەنووسراوە و دەتوانم هەموو شتێك لە عیساوە فێر ببم.

کاتێ میرنا ئەم قسەیەی کرد، من بێدەنگ بووم و چوومە ناو خەیاڵەوە. لەو خەیاڵەمدا من بۆم دەرکەوت کە منیش دەبێ ویژدانی خۆم وەکو لەوحەیەك لێ بکەم کە هیچی لەسەر نەنووسرابێ تاکو بتوانم ئەوەی عیسا دەیلێت، لەسەر لەوحی ویژدانمدا تۆماری بکەم و چاك لێی تێ بگەم. چونکە تاکاتێ لەوحەی ویژدانی مرۆڤ بە تەواوی ساف نەبێ و شوێنەواری هەرجۆرە گوناهێکی لێ لانەبرێت، لەوحەکە هیچی لەسەر تۆمار نابێت. ئەوەبوو کە لە دڵەوە بە تەواوی لە هەموو گوناهەکان پەشیمان بوومەوە و گوتم ((ئەی عیسا، من لە ڕابردوودا کابرایەکی گوناهکار بووم و تووشی هەندێ گوناه دەبووم کە بریتی بوون لە حەزی جنسی، بەڵام لەو ڕۆژەوەی کە تۆم بە خاچەوە بینی تا

ئەمڕۆ، تووشی ئەو جۆرە گوناهانە نەبووم و گوناهی تریشم نەکردووە. بەڵام هەندێ جار بەبێ مەبەست، گرفتاری خۆپەرستی و لوت بەرزی بووگم، چونکە نەمدەتوانی ڕەچەڵەکی خۆم لەبیر بکەم. بەڵام بەڵێن دەدەم کە لە ئێستە بەدواوە تووشی هیچ جۆرە گوناهێك نەبم و، هەوڵ دەدەم خۆپەرستی و لوت بەرزی بەسەرمدا زاڵ نەبێت و، هیوادارم لەمە بەدواوە لەوحی ویژدانم بۆ تۆمارکردن و تێگەیشتنی زایارییەکانی تۆ ئامادە بێت، ئەی عیسا)).

دوای ئەم تەوبەیە، سەرم بەرز کردەوە و چاوم بە تەپۆڵکەیەکی بەرز کەوت کە لە بەرامبەرماندا پەیدا ببوو و، هەرکە ئەو تەپۆڵکە بەرزەم بینی، زانیم کە کێوی میعاد لەوێدایە و ئێمە دەبێ لەوێدا مامۆستای مەزنی خۆمان —عیسا– ببینین.

ڕووناکی هەتاوی عەسر، بەشی سەرەوەی گردەکەی بەباشی ڕووناك دەکردەوە، بەڵام داوێنی خوارەوەی بەهۆی ئەوەی کە سێبەر بوو، بە باشی نەدەبینرا. فراوانی گردەکە و بەرزییەکەی و شێوە سازگارەکەی ئەو گردە، نیشانی دەدا کە بۆ کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك، جێگەیەکی زۆر باشە. ئەوانەی کە دەهاتن بۆ ئەو گردە، دەیانتوانی دەشتەکانی دەوروبەریان ببینن، چونکە گردە بەرزەکە بەسەر ناوچەکانی دەوروبەریدا دەیڕوانی. بەڵام ئەو کەسانەی کە لە دەشتەکانی دەوروبەردا بوون، نەیاندەتوانی ئەوانە ببینن کە لەسەر گردەکەن.

ناتان بە منی گوتبوو کە لە باکووری ئەو گردە شارێك هەیە کە نابێ لێی نزیك ببینەوە و، هەربۆیە ئێمە لە ڕێگای باشوورەوە لەو گردە نزیك بووینەوە. کاتێ کێڵگەکانمان تێپەڕاند و گەیشتینە داوێنی گردەکە و چووینە ناوچەیەکەوە کە ئیتر کێڵگەی تێدا نەبوو، خۆر داچوو. هیچ کەسێ لەسەر ڕێگەکەی ئێمە نەدەبینرا و دەنگی هیچ ئاژەڵێك نەدەهاتە گوێ. کاتێ سەرمان بەرز کردەوە، داوێنی گردەکەمان تا لوتکەکەی، لە سەرووی خۆمانەوە دەبینی و هەروەها ئاسمانیشمان دەبینی کە هێشتا ڕووناك بوو. بێدەنگی ئەو ناوچەیە زۆر کاری لەمن کرد، بۆیە لەوە دڵنیا بووم کە ئێمە چووینەتە ناو ناوچەیەکی پیرۆزەوە.

ئێمە لە داوێنی گردەکە ئەوەندە ماینەوە تا هەوا تاریکی کرد و دواتر بە گردەکەدا چووینە سەرەوە تا گەیشتینە سەر لوتکەکە. لوتکەی گردەکە جێگەیەکی تەخت بوو، کاتێکیش گەیشتینە ئەوێ، بینیمان ژمارەیەك پێش ئێمە هاتوون بۆ ئێرە و

گرووپی بچووك بچووكیان دروست كردووه، دەبێ بڵێم كه درەختیش لەسەر گردەكه هەبوو. ئێمه یارمەتیمان دان تا پیرەپیاوه نابیناكه و كوڕه بریندارەكەی لەسەر گوێدرێژەكه دابەزن و، ناتانیش گوێدرێژەكانی برد و لەژێر دارەكان بەستنییەوه و تورەكەی كردە سەریان و دواتر گەڕایەوه بۆلای ئێمه.

## چاوەڕوانی کردن لەسەر کێوەکە

پاش ئێمە، گروپەکانی تر لە گردەکە هاتنە سەرەوە و شوێنیان گرت و دانیشتن. هیچ کەسێ بە دەنگی بەرز قسەی نەدەکرد و هەموویان بە هێواشی قسەیان دەکرد. ئەگەرچی مانگ دیار نەبوو بەڵام ڕووناکی ئەستێرەکان لوتکەی گردەکەی کەمێك ڕووناك دەکردەوە و، من لەبەر ڕۆشنایی ئەستێرەکان خەملاندم کە شەش سەد یان حەوت سەد کەس و ڕەنگە زیاتریش لەوێ کۆبوونەتەوە. من بڕوام نەدەکرد ئەو هەموو خەڵکە لە یەك شوێندا کۆ ببنەوە و یەك دەنگیشیان لێوە نەیەت.

ماوەیەك تێپەڕی و خەڵك بێدەنگ بوون و، جگە لە چپەچپ هیچیان لێوە نەدەبیسترا تاکو پیاوێ لە ناوەڕاستی خەڵکەکە هەستایەوە و گوتی: هەمووتان گوێ بگرن.

ئەوانەی کە چپەچپیان دەکرد، بێدەنگ بوون و چاوەکانیان بڕییە ئەو پیاوە و پیاوەکەش بەدەنگێکی بەهێز گوتی: گەنم ڕوواوە و بەری گرتووە و کاتی دروێنە هاتووە و، (ئەو)یش کە نزیکەی چل ڕۆژە کە لەنێو ئێمەدا بووە، دەردەکەوێت و پاشان لەلای ئێمە دەڕوات. ئێمە نازانین ئەو بۆ کوێ دەڕوات و ناتوانین بەدوایدا بڕۆین. "ئەو" نانێ بوو کە لەلایەن ئاسمانەوە درا بە ئێمە و هەرکەسێ لەو نانە بخوات، ئەوا دەبێتە خاوەنی ژیانێکی هەتاهەتایی. ئێمە دوازدە کەس بووین کە قوتابی عیسا بووین و لە هەموو شوێنێك لەگەڵ ئەو بووین و یەکێکیان لەلای ئێمە دەرکرا و پاشان یازدە کەسمان ماینەوە. ئێمە دەزانین کە "ئەو" لەو دوایین شەوەدا کە لەگەڵمان بوو، کاتێ نانی پێداین، گوتی ((ئەم نانە گۆشت و جەستەی منە و بیخۆن)). دواتر دەفرێکی پێ پیشان داین و گوتی ((ئەم شەربەتەی کە لەم دەفرەدایە خوێنی منە و بیخۆنەوە)). ئێستەش ئێوە کە هاتوون بۆ ئەم کێوە و دەزانم کە هەمووتان ئەوتان خۆش دەوێت، نانی خۆتان بەناوی ئەوەوە بخۆن و هەموو کەسێ لەکاتی نانخوردندا بەشێ بدات بە یەکێکی تر و، شەربەتەکانتان بەناوی ئەوەوە بخۆنەوە و قومێکی لێ بدەن بە کەسێکی تر و، دوای ئەوەی نانمان خوارد و تێر بووین، چاوەڕوانی هاتنی ئەو دەکەین.

ئەو پیاوە دوای ئەو گوتەیە دانیشت و، ئەو ئامادەبووانەی کە بێدەنگ بوون، دەنگیان لێ بەرز بوویەوە، واتە دەستیان بە چپەچپ کردەوە و خۆیان بۆ نانخواردن ئامادە کرد. ناتان لەو مەشکۆلە ئاوەی کە لەگەڵ خۆمان هێنابوومان، کەمێك ئاوی بە دەستی من و میرنا و گەنجە بریندارەکەدا کرد و، دواتر من ئاوم کرد بە دەستی ناتاندا.

پیرەپیاوە نابیناکە ڕازی نەبوو ناتان ئاو بکات بە دەستیدا بەڵکو کوڕە گەنجەکەی ئاوی کرد بە دەستی پیرە پیاوەکەدا و ئینجا گوتی: من دەبێ نانی خۆم بخۆم و لە نانی ئێوە ناخۆم.

ناتان گوتی: زۆر چاکە، نانی خۆت بخۆ. پاشان نانەکەی لەدەستی پیرەپیاوەکە وەرگرت و کردی بە دوو لەتەوە و نیوەی لێ دا بە پیرە مێردە نابیناکە و نیوەکەی تری دا بە کوڕەکەی و گوتی: بەناوی عیساوە لەم نانە بخۆ تاکو ببنە خاوەنی ژیانی هەتا هەتایی، چونکە ئەم نانەی کە ئێوە بە ناوی عیساوە دەیخۆن، گۆشت و جەستەی ئەوە.

پیرەپیاوەکە و کوڕەکەی دەستیان بە نانخواردن کرد، پاشان ناتان نانەکەی بۆ ئێمەش بەش کرد و بەشی هەریەکەمانی، واتە من و میرنا و خۆی، دا و گوتی: ئەم نانە گۆشت و جەستەی عیسایە، بەناوی عیساوە بیخۆن تاکو ببنە خاوەنی ژیانێکی هەتا هەتایی و، ئێمەش دەستمان بە نانخواردن کرد.

من لەبەرئەوەی برسیم بوو، بەشە نانەکەی خۆم تا دوایین پاروو خوارد و سەیرم کرد میرنا و ناتانیش بە ئیشتیهاوە نان دەخۆن. دوای ئەوەی نان خورا، ناتان مەشکۆلەی شەربەتەکەی کردەوە و کەمێکی لێ کردە دەفرێکەوە و کەمێك ئاویشی تێ کرد و دەفرەکەی خۆمی پێ دام و گوتی: بە ناوی عیسای مامۆستامان بیخۆرەوە.

لەبەرئەوەی دوای نانخواردن هەستمان بە تینوویەتی دەکرد، بۆیە لە نیوەی زیاتری دەفرەکەم خواردەوە و ئینجا دام بە دەستی میرناوە. ئینجا ئەو ژنە دوای وەرگرتنی دەفرەکە گوتی: مەزن تیوس، بۆچی شەربەتت نەخواردۆتەوە؟

گوتم: من لە نیوەی زیاتری دەفرەکەم خواردۆتەوە.

میرنا گوتی: ئەگەر تۆ لە نیوەی دەفرەکە زیاترت خواردۆتەوە، ئەی بۆچی دەفرەکە پڕە؟

من سەیرێکی دەفرەکەم کرد و بینیم ژنەکە ڕاست دەکات و دەفرەکە هەر پڕە. بە خۆم گوت: تۆ بڵێی من ئەو شەربەتەم نەخواردبێتەوە؟ بەڵام تەڕایی گەرووم و نەمانی تینوویەتییەکەم دەیسەلماند کە شەربەتم خواردۆتەوە.

گوتم: میرنا، من دڵنیام کە زیاتر لە نیوەی شەربەتی ئەم دەفرەم خواردبۆوە، بەڵام نازانم چۆن ئەم دەفرە هێشتا هەر پڕە.

میرنا کەمێك لە شەربەتەکەی خواردەوە و دەفرەکەی دا بە ناتان و ئەویش بە سەرسوڕمانەوە سەیری کرد دەفرەکە هەر پڕە لە شەربەت. پیرەپیاوە نابیناکە و کوڕەکەیشی دوای ئەوەی کە بە دەفرەکەی خۆیان شەربەتیان دەخواردەوە، بۆیان دەرکەوت کە ئەو دەفرە بەتاڵ نابێتەوە. کاتێ دەفرەکە لە دەستی ناتانەوە گەیشتە دەستی من، سەیرم کرد دیسان هەر پڕە.

پیرەپیاوە نابیناکە کەوتە گریان و گوتی: من باوەڕم هێنا بەوەی کە ئەو شەربەتەی من خواردمەوە، خوێنی عیسای نێردراوی خودایە، چونکە ئەگەر خوێنی ئەو نەبووایە ئەوا تەواو دەبوو و، هیوادارم عیسا لە گوناهەکانی من خۆش ببێت.

جارێکی تر بۆم دەرکەوت کەمێك نان لە بەردەمی مندایە، لە کاتێکدا کە دڵنیابووم بەشەنانەکەی خۆم تا دوایین پاروو خواردووە. کەمێکیش نان لە بەردەم ناتان و میرناشدا بوو. من گومانم نەما لەوەی کە من ئەمشەو دەتوانم عیسا ببینم. چونکە تەواو نەبوونی نان و ئاوەکە مۆجیزەی ئەو بوو و، ئەو مۆجیزەیە نیشانی دەدا کە "ئەو"، ئەو شەوە دێتە سەر ئەو کێوە.

من و میرنا و ناتان لەوە بەدواوە وەکو ئەو کەسانەی تر کە لەو کێوەدا بوون، چاوەڕوانی هاتنی عیسامان دەکرد. من بۆم دەرکەوتبوو کە هیچ یەکێ لەو کەسانەی لەو کێوەدان، بێ ئۆقرەیی نانوێنن، چونکە هەموویان دەیانزانی کە ئەو شەوە عیسا دەبینن، بۆیە گوتم کە بێگومان عیسا دێت بۆ ئەوێ.

لە ناکاو پیاوە نابیناکە هاواری کرد: ڕۆژ بۆتەوە؟ چونکە ڕووناکی خۆر دەدا لە چاوی من. پاشان ڕووی سەری کردە شوێنێك و منیش ڕووم کردە شوێنێك و، لەناکاو بینیم کە عیسا لە ناوەڕاستی خەڵکەکەدایە. ئەو پیاوە بەهۆی ئەو تیشکەی کە من نەمدەزانی سەرچاوەکەی لە کوێوەیە، ڕووناك بوویەوە. هەروەها لەو شەوە تاریکەدا من و خەڵکانی تر ئەومان وادەبینی کە دەتگوت لەبەر ڕووناکی ڕۆژدا دەیبینین.

عیسا جلێکی سپی و درێژی لەبەردا بوو. قیافەی ئەو هەر بەوشێوە بوو کە من بە خاچەوە بینیبووم. عیسا بە هێواشی هەنگاوی دەنا و دەستی خۆی بەجۆرێك بەرەو شوێنکەوتووەکانی دەجولاند کە دیاربوو بەرەکەتیان پێ دەدات.

لەپڕ ژنێك لەنێو ئامادەبووەکاندا هاواری کرد: ئەی پێغەمبەر وماموٚستای مەزنی من.

دوای ئەم قسەیە، ژنەکە سەری خستە سەر زەوی و لەبەردەم عیسادا کڕنووشی برد. بەهۆی هاواری ئەو ژنەوە، خەڵکەکەی تر کەوتنە گوڕ و هاواریان کرد: ئەی پێغەمبەر وماموٚستای مەزن، ئێمە ببە بۆناو مەلەکوتی خۆت.

عیسا ساتێ وەستا و دواتر بە ئارامی بەدەستی ئاماژەی کرد، پاشان هەموو پیاو و ژنەکان بێدەنگ بوون. لەوە بەدواوە ئیتر دەنگی بەرز لە کەسەوە نەدەهات و بە هێواشی قسەیان دەکرد و، من دەمبیست کە ژن و پیاوەکان بەهێواشی دەیانگوت: خۆیەتی...خۆیەتی... هەموو شتێکی لە عیسا دەچێت.

پیرەپیاوە نابیناکە کە بەردەوام ڕووی سەری کردبووە عیسا، گوتی: من ڕوخساری ئەو نابینم، بەڵام دەبینم کە تیشکێکی فراوانی لێ دەدرەوشێتەوە، چونکە ڕووناکییەکی وەکو ڕووناکی خۆر دەدا لە چاوم.

من ناتوانم بڵێم کە ئەو شەوە لەسەر ئەو کێوەدا، عیسا تاچەند لەگەڵ ئێمە مایەوە، چونکە کات ڕاوەستا و، ئەو شەوەی کە دەبوو تێپەڕ ببێت، بۆ ئێمە ڕاوەستا و، ڕەنگە ئەستێرەکانیش بۆ ئێمە لە ئاسماندا ڕاوەستابن.

عیسا لە یەکە بەیەکەی شوێنکەوتەکانی خۆی کە ئەو شەوە لەو کێوەدا بوون، نزیك بوویەوە و لەگەڵ هەموویان قسەی کرد. ئەو شەوە هیچ کەسێ لە قسەکردن لەگەڵ عیسا بێ بەش نەبوو. هەروەها هەموو دەیانتوانی قسەی لەگەڵ بکەن تاکو عیسا گەیشتە لای ئێمە. کاتێ ئەو لە ئێمە نزیك بوویەوە، من مچڕکەیەکم پێدا هات. موچڕکەکەی من بەهۆی ترسەوە نەبوو، بەڵکو لە خۆشیدا دەلەرزیم. پیرەپیاوە نابیناکە هەردوو دەستی بەرەو لای عیسا بەرز کردەوە و لێوەکانی جولاندەوە. من جوڵەی لێوەکانی ئەو پیاوەم دەبینی بەڵام دەنگیم نەدەبیست. بەڵام عیسا دەنگی ئەو پیاوەی دەبیست، چونکە لێی نزیك بوویەوە و پەنجەکانی هێنا بە چاوەکانیدا و دەستی هێنا بە سەری گەنجەکە و برینەکەیدا. ئەو دووانە لە بەردەم عیسا کڕنووشیان برد و

کڕنووشەکەیان ماوەیەکی زۆری خایاند و وەکو ئەوە وابوو کە نەتوانن سەریان لە زەوییەکە بەرز بکەنەوە.

پاشان عیسا چاوەکانی خۆی بڕییە چاوەکانی من و ئەگەرچی نیگاکانی زۆر هێمن بوون و لە چاوەکانیدا شوێنەواری میهرەبانی و بەزەیی و ستەملێکراوی تیدا دەبینرا، بەڵام من هەستم کرد کە ئەگەر عیسا دەستی خۆی بخاتە سەر شان و سەرم، یەکسەر لەجێدا گیانم دەردەچێت، چونکە هێزێکی نادیار لەو پیاوە مەزنەدا دەدرەوشایەوە کە هەموو کەسێکی لە بەردەم ئەودا بێدەسەڵات دەکرد.

من هاتمە قسە و گوتم: ئەی خوداوەند، من ببە بۆناو مەلەکوتی خۆتەوە.

عیسا وەڵامی دایەوە: هەرکەسێ من وەکو خوداوەند لە قسەکانیدا بەکار بێنێ، ناچێتە ناو مەلەکوتی منەوە، بەڵکو ئەو کەسانە دەڕۆنە ناو مەلەکوتی منەوە کە گوتەکانی من ببیستن و بە فەرمانەکانی خوداکەم ڕەفتار بکەن.

پرسیم: گوتەکانی تۆ چین و فەرمانەکانی خوداکەت چییە؟

عیسا گوتی: وتەکان هەر ئەوانەن کە هەمووجارێ بیستووتانە و دەستووری خوداکەشمتان وەرگرتووە و، ئەوەی کە دەبێتە هۆی ئەوەی ئێوە بڕۆنە ناو مەلەکوتی منەوە، کردارەکانتانە و تەنیا بیستنی وتەکانی من و وەرگرتنی دەستووری خوداکەم ئێوە ڕزگار ناکات.

پرسیم: ئایا مەلەکوتی تۆ لەم دنیایەدایە یان لە دنیایەکی تردایە؟

عیسا گوتی: مەلەکوتی من جێگەیەکی دیاریکراوی نییە بەڵکو لەناو ناخی خۆتاندایە و، هەموو کەسێ دەتوانێ بڕواتە ناو مەلەکوتی منەوە بەبێ ئەوەی لە ناخی خۆی دەربچێت. هەروەها گوتی: هەرکەسێ من بانگ بکات ئەوا هەرگیز لە یادم ناچێت و لە هەر جێگایەك کە دوو یان سێ کەس کۆ دەبنەوە و ناوی من بێنێت، من لەگەڵیاندا دەبم.

دوای ئەم قسەیە عیسا ڕۆشت بۆلای ناتان و من بینیم کە لێوەکانی ناتان دەجوڵێ، بەڵام گوێم لێی نەبوو چی دەڵێ. دڵنیابووم کە ناتانیش گوێی لەو شتانە نەبووە کە من بە عیسام گوت. ئەو شەوە لەسەر ئەو کێوە هەمووان لەگەڵ عیسا قسەیان کرد، بەڵام هیچ کەسێ دەنگی ئەو کەسەی نەدەبیست کە لەگەڵ عیسادا قسەی دەکرد

و، هەروەها دەنگی عیساشیان نەدەبیست مەگەر ئەوکاتە نەبێ کە ئەو پیاوە مەزنە لەگەڵ خودی ئەو کەسەدا قسەی دەکرد.

عیسا دوای ئەوەی کە لەگەڵ ناتان قسەی کرد، لە میرنا نزیك بوویەوە و بڕێك قسەی لەگەڵ کرد و، ئینجا لە ئێمە دوور کەوتەوە. دوای ئەوەی عیسا لە ئێمە دوور کەوتەوە، سەیرم کرد پیرەپیاوە نابیناکە و کوڕەکەی هەڕ سەریان لەسەر زەوییەکەیە و هەڵنەستاون و گوتم ڕەنگە مردبن. من بە مردنی ئەو دووانە (ئەگەر مردبوونایە) سەرسام نەدەبووم، چونکە عیسا دەستی خستە سەر چاو و سەریان و، ئەوانیش کە وەکو من مرۆڤ بوون، نەیاندەتوانی بەرگەی بەرکەوتنی دەستی نێردراوی خودا بگرن. بەڵام ئەوان نەمردبوون بەڵکو خەویان لێ کەوتبوو.

دوای ئەوەی عیسا لە ئێمە دوور کەوتەوە، قوتابییە یازدە کەسەکە دەورەیان دا و قسەیان لەگەڵ دەکرد و، عیساش وەڵامی دەدانەوە، بەڵام من نە دەنگی عیسام دەبیست و نە دەنگی قوتابییە یازدە کەسەکەشم دەبیست.

لە بینینی عیسا و بیستنی قسەکانی ئەوەندە دڵخۆش بووم و، لە هەمان کاتیشدا ئەوەندە کاری تێ کردبووم کە کەوتمە گریان.

بەجۆرێك فرمێسکی شادی لە چاوەکانم دەهاتە خوارەوە کە هەندێ جار نەمدەتوانی عیسا و قوتابییە یازدە کەسەکەی ببینم و لەناکاو سەیرم کرد عیسا دیار نەماوە. من بەهەمان شێوە کە نەمزانی عیسا لە کوێوە و لەچ ڕێگەیەکەوە هاتۆتە سەر ئەو کێوە، نەشمتوانی بزانم چ کاتێك و لە چ ڕێگەیەکەوە لەسەر ئەو کێوە ڕۆشت. هەموو ئەو کەسانەی کە لەسەر ئەو کێوە بوون وەکو من بۆیان دەرکەوت کە عیسا ڕۆشتووە.

کات کە ڕاوەستابوو، کەوتە سەر ڕێڕەوی خۆی و بەردەوامی بە تێپەڕ بوون دا و، ئەو خەڵکەش کە لە تەواوی کاتەکانی ئامادەبوونی عیسادا بێدەنگ بوون، کەوتنەوە دەنگە دەنگ و، ئینجا بۆم دەرکەوت کە لەلای ڕۆژهەڵاتەوە سپێدەی بەیانی دەرکەوتووە.

خەڵك لە یەکتریان دەپرسی کە عیسا چی بەوان گوتووە. منیش کە شادومان بووم، بە ناتانم گوت: عیسا لەگەڵ من قسەی کرد و ئەگەرچی کە من نە جوولەکە بووم و نە خەتەنەش کراوم، منی لەناو مەلەکوتی خۆی دەرنەکرد و پێی گوتم کە ئەگەر

بەپێی گوتەکانی ئەو و فەرمانەکانی خودا ڕەفتار بکەم، ئەوا لە مەلەکوتی ئەودا جێگام دەبێتەوە.

ناتان گوتی: من نەمبیست کە عیسا چی بە تۆ گوتووە. هەرچەند لێوەکانت دەجوڵاندەوە، بەڵام دەنگت لێوە نەدەهات. دیارە گەرووت بەسترابوو و نەتدەتوانی قسەی لەگەڵ بکەیت، بەڵام عیسا لەگەڵ من قسەی کرد و گوێی لە قسەکانی من بوو و وەڵامیشی دامەوە.

میرنا بە خۆشحاڵییەوە قۆڵی منی گرت و گوتی: عیسا بە منی گوت کە لەبەرئەوەی ئاوم پێداوە و لە تینوویەتی ڕزگارم کردووە، هەرگیز لە ژیانمدا تووشی ئازاری تینوویەتی نابم.

ناتان گوتی: ئەو دوو کەسەتان هەڵە دەکەن و ئێوە لەگەڵ عیسا قسەتان نەکردووە، چونکە من گوێم لە دەنگتانەوە نەبوو. بەڵام عیسا لەگەڵ من قسەی کرد و ڕێگەی ڕاستی پێ نیشان دام و گوتی کە هەموو شتێ بۆ مرۆڤ پاکە و هەر شتێ بچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە، خاوێنە. بەڵام ئەو شتانەی کە لە لەش دەردەچن، پیسە و دەبێ دووریان بخەنەوە. هەروەها ئەو شتانەی کە عیسا بە منی گوت ئەوەبوو کە دەبێ قوتابییە یازدە کەسەکانی ئەو لەلایەن شوێنکەوتووەکانییەوە ڕێزیان لێ بگیرێت، چونکە ئەو یازدەکەسە هۆی بڵاوبوونەوەی پەیامەکەی ئەون بەناو شوێنکەتووەکانیدا و، بۆیەشە ئیتر من لەم شەوەوە بڕوا بە قوتابییە یازدە کەسەکەی عیسا دێنم و بە ڕابەری خۆمیان دەزانم. هەروەها لەو شتانەی کە عیسا بە منی گوت ئەوە بوو کە مەلەکوتی ئەو لە تۆوی گیای خەردەل دەچێت. تۆوی ئەو گیایە ماوەیەکی زۆر بە هێواشی گەشە دەکات، بەڵام لەناکاو گەشەی خێرا دەبێت و لقەکانی، شوێنی زۆر داگیر دەکات و مەلەکوتی ئەویش دوای ماوەیەك گەشەی هێواشە و لەناکاو هێز پەیدا دەکات و فراوان دەبێت و، هەموو شوێنێکی دنیا دەبێتە بەشێك لە مەلەکوتی ئەو.

پاشان ناتان ڕوونی کردەوە: ئەو هەندێ شتی تری بەمن گوت و من بەشێکی ئەو قسانەم فەرامۆش کردووە و، بیر دەکەمەوە تا لە داهاتوودا بەشە فەرامۆشکراوەکانم بەبیر بێتەوە.

گوتم: ناتان، من پێموایە ئەمشەو مامۆستای مەزنی ئێمە لەگەڵ هەمووان قسەی کردووە و لەگەڵ هەموو کەسێ بەپێی تێگەیشتنی ئەو کەسە قسەی کردووە و، ئەو

شتانەی پێ گوتوون کە بتوانن لێی تێ بگەن. من پێموایە ئەگەر ئەو شتانەی کە عیسا ئەمشەو لێرەدا بە ئێمەی گوت، بنووسرێنەوە، ئەوا دەبێتە کتێبێکی گەورە. ئەو، لێرە لەگەڵ یەك بەیەکی ئێمە قسەی کرد، بەڵام هیچ یەکێ لە ئێمە وتووێژکانی ئەومان لەگەڵ کەسەکەی تردا گوێ لێ نەبوو.

ناتان دەستی خۆی خستە سەرشانی من و گوتی: من گوێم لێنەبوو کە ئەو چی بەتۆ گوتووە و، لە دەمی تۆشەوە هیچ دەنگێك نەدەهات. بەڵام کاتێ لە تۆ نزیك بوویەوە، بەجۆرێك سەیری دەکردی کە دیاربوو خۆشی دەوێیت.

ئینجا من و ناتان و میرنا ڕێککەوتین کە پێش ئەوەی هەوا ڕووناك بێتەوە، لە کێوەکە بگەڕێینەوە، چونکە دوای ئەوەی هەوا ڕووناك دەبۆوە و بەتایبەت دوای هەڵهاتنی خۆر، قوتابییەکانی عیسا لەوتنەبوو من ببینن و، لەبەرئەوەش کە گومانیان لە من هەبوو، دوور نەبوو کێشەم بۆ دروست بکەن.

## گفتوگۆکردنم لەگەڵ قوتابییەکانی عیسا

کاتێ ویستمان لە کێوەکە بگەڕێینەوە، بینیمان پیاوە نابیناکە و کوڕەکەی هەر سەریان لەسەر زەوی ناوە و ناجوڵێن. ئێمە ئەوانمان جوڵاندەوە تا هەستنەوە، بەڵام هەڵنەستانەوە و ناچار ئارامیمان گرت تا بەئاگا دێنەوە، چونکە نەماندەتوانی واز لەو دووانە بهێنین و بڕۆین.

دوای ئەوەی هەوا ڕووناك بوویەوە، جۆش و خرۆشی ئەو کەسانەی کە لەسەر لوتکەی کێوەکە بوون، زیاتر بوو. هەندێك لەوان بەکۆمەڵ بەڕێ کەوتن و ڕۆشتنەوە بۆلای ئاشناکانیان تاکو لەبارەی عیساوە قسەیان بۆ بکەن. هەندێکیش لە ئامادەبووەکان بەکۆمەڵ نزای ئایینییان دەخوێند و سوپاسی ئەوەیان دەکرد کە بە چاوەکانی خۆیان عیسایان بینیوە و بڕوایان وابوو کە چاوەکانیان هەرگیز کوێر نابێت.

دوای ئەوەی کە ڕۆژ هەڵهات، قوتابییەکانی عیسا دوو دوو و سێ سێ ڕۆشتن تا ئەو کەسانەی کە بەهۆی دەستلێدانی عیساوە خەوی قورسیان لێ کەوتبوو، بەئاگا بێننەوە و بەئاگایان بهێننەوە و، وەکو ئەوە وابوو کە تەنیا ئەوان دەتوانن ئەو کەسانە بەئاگا بهێننەوە و کەسی تر ناتوانێ بەئاگایان بێنێتەوە. سێ کەس لە قوتابییەکانی عیسا بەرەو لای ئێمە هاتن. من لە یەکەم بینینەوە دووانیانم ناسی. یەکێ لەو دووانە کە سەرێکی خڕ و شانێکی پانی هەبوو، شەوی ڕابردوو، پیش هاتنی عیسا قسەی بۆ ئێمە کرد. کەسی دووەم یۆحەننای لاو بوو کە من لەم سەرگورشتەیەدا ناوم هێناوە و، ئەو بەیانییە ڕوخساری ئەو گەنجەم بە درەوشاوەییتر لەهەموو کاتەکانی تر دەهاتە بەرچاو، بەڵام نەمدەتوانی کەسی سێیەم بناسم، بەڵام شکڵ و شێوەی و تەنانەت شێوەی ڕێڕۆشتنی لە عیسا دەچوو. پاشان بیرم کردەوە کە من ئەو قیافە و شکڵ و شێوە ڕێڕۆشتنەم لە جێگەیەکی تردا بینیوە. پاشان هاتەوە یادم کە دوای تۆفانەکە لە دەریاچەی جەلیلە کە من و هاوکارەکانم پێمان نایە سەر وشکانی، ڕاوچییەکی ماسی جێگای کردینەوە و نانی پێ داین و، ئەو ڕاوچییە، قیافە و شکڵ و ڕەفتاری عیسای هەبوو. من نەمدەتوانی بزانم ئەو پیاوەی کە بینیم لەگەڵ دوو سەکەی تردا بەرەو لای ئێمە دێن، هەمان ڕاوچییە یان نا.

کاتێ ئەو سێ کەسە لە ئێمە نزیك بوونەوە، من ڕوخساری خۆم شاردەوە تا نەمبینن، بەڵام ئەوان گوێیان بە من نەدا، بەڵکو بەرەو لای پیرەپیاوە نابیناکە کە خەوتبوو، ڕۆشتن و ئەویان جوڵاندەوە و گوتیان: ئەی ئەوەی کە نووستووی، هەستەوە. ئەمجارە جوڵانەوەی ئەوان پیرەپیاوە نابیناکەی بەئاگاهێنایەوە و سەری لەسەر زەوییەکە بەرزکردەوە و هەستایەوە و، بە خۆشحاڵیەوە هاواری کرد: چاوەکانی من دەبینن، ئێستە ئێوە سێ کەسن، بەڵام من ئێوە ناناسم.

یەکێ لەو سێ کەسە گوتی: ئەم سێ کەسەمان لەو قوتابییانەین کە عیسا هەڵیبژاردووین و، من ناوم شەمعونە، بەڵام عیسا منی ناوناوە پترۆس، ئەی تۆ کێیت؟

پیرەپیاوەکە گوتی: دوێنێ شەو من لەم کێوە ڕووناکییەکی بەهێزم بینی و وامزانی خۆر هەڵهاتووە، بەڵام دیاربوو هەڵەم کردووە. دواتر پیاوێك لێم نزیك بوویەوە کە من ئەوم نەدەبینی، بەڵام زانیم عیسایە. ئەو پیاوە پەنجەکانی خۆی هێنا بە چاوەکانی مندا و هێزەکەی ئەوەندە بەهێز بوو کە من خەوم لێ کەوت. ئێستەش کە لەخەو هەستاوم، دەبینم کە بیناییم بۆ گەڕاوەتەوە و دەتوانم ئێوە و ئەم کێوە ببینم و ئەوخەڵکەش ببینم کە لێرەن.

پاشان پیرەپیاوەکە کوڕە گەنجەکەی لەخەو هەستاند و، لەکاتێکدا کە ئەو کوڕەگەنجەی هێشتا خەواڵو بوو، کردییە باوەش و ماچی کرد و گوتی: دوێنێ شەو عیسا بینایی بۆ گەڕاندمەوە و، من ئێستە هەموو جێگەیەك دەبینم و تا ئەو ڕۆژەی کە زیندووم سوپاسی خودا دەکەم کە عیسای نارد بۆلای ئێمە.

کوڕە گەنجەکەی ئەو پیرەپیاوە چاوەکانی خۆی ولی بۆئەوەی شوێنەواری خەوی لێ دوور بکەوێتەوە و پاشان بە سەرسامییەوە سەیری قاچەکانی خۆی کرد و گوتی: دوێنێ شەو کاتێ هاتین بۆ ئەم کێوە، قاچم بریندار بوو و نەمدەتوانی بڕۆم لەڕێ، کەچی ئێستە هەست بە ئازار ناکەم.

پاشان ئەو پارچە پەڕۆیەی کە برینەکەیمان پێ بەستبوو، کردیەوە و هەموومان بینیمان کە برینی گەنجەکە چاك بۆتەوە، بۆیە کوڕە گەنجەکە زۆر خۆشحاڵ بوو و گوتی: گومانی تێدا نییە کە ئەو پیاوەی دوێنێ شەو هات بۆ ئێرە، عیسا بووە و، ئەو قاچی منی چارەسەر کردووە.

شەمعون پترۆس گوتی: هەموو ئەو کەسانەی کە دوێنی شەو لەم کێوە نەخۆش بوون، بەهۆی عیساوە شیفایان دراوە. هەموو ئەو کەسانەی کە شەوی ڕابردوو بەچاوی نابیناوە هاتن، ئێستە دەبینن و، بینایی ئەوان باشترە لەو کاتەی کە هەموو شتێکیان پێ دەبینی. هەموو ئەو کەسانەی کە شەوی ڕابردوو بەگوێی کەڕەوە هاتن بۆ ئێرە، ئێستە بە باشی دەبیستن. ئەو کەسانەی دوێنێ شەو بە قاچی شەلەوە پێیان نایە سەر ئەم کێوە، ئێستە دەتوانن بەباشی بڕۆن لەڕێ. عیسا دوێنێ شەو نەك هەرهەموو نەخۆشەکان و کەمئەندامەکانی شیفا داوە، بەڵکو لە گوناهی هەمووی خۆش بووە و، ئەمڕۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لەم کێوەدان، بێ گوناهن.

کاتێ شەمعون پترۆس قسەی دەکرد، یۆحەننای لاو زەق زەق سەیری منی دەکرد و دواجار منی ناسییەوە و دەستی شەمعون پترۆسی گرت و منی پێ نیشان دا و گوتی: ئەمە ئەو ڕۆمییەیە کە لەگەڵ ئێمە وتووێژی کرد و پرسیاری بێ مانای لە ئێمە دەکرد.

شەمعون پترۆس نیگایەکی توندی لێ کردم و گوتی: ئاااى، وادیارە دوێنێ شەو ئێمە سیخوڕمان تێدا بووە و ئەم پیاوە بۆ سیخوڕی هاتبوو بۆ ئێرە. سزای خیانەتکار ئەوەیە کە بەردباران بکرێت و، من ئێستە بەو کەسانە دەڵێم کە لێرەن بۆئەوەی ئەم پیاوە بگرن و بەردبارانی بکەن.

بەڵام ئەو قوتابییەی تر کە گوتم شکڵ و ڕەفتاری کەمێك بە عیسا دەچوو و من نەمدەزانی کە ناوی چییە، بە شەمعون پترۆسی گوت: ئەگەر تۆ ئەم پیاوە بسپێری بەو کەسانەی کە لێرەن، خێرا دەیکوژن. باشتروایە ئێمە خەڵك لەم پیاوە ئاگادار نەکەینەوە کە لێرەیە و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەین و بزانین بۆچی هاتووە بۆ ئێرە و، دوای ئەوەی کە زانیمان مەبەستی خراپ بووە، ئەوا دەتوانین سزای بدەین.

گوتم: منیش وەکو ئەوانی تر کە هاتوون بۆ ئێرە تا عیسا ببینن، بۆ بینیی مامۆستای مەزن هاتووم بۆ ئێرە و، زۆر خۆشحاڵم کە ئەوم بینیوە. من لە هەڕەشەی ئێوە ناترسم، چونکە خیانەتکار و سیخوڕ نیم. ئەگەر خیانەتکار و سیخوڕ بوومایە، دوێنێ شەو عیسا خۆی سزای دەدام. ئایا پیاوێکی وەکو ئەو کە هەموو نابینایانی بینا کردەوە و هەستی بیستنی دایەوە بە کەسانی کەڕ و کەسە شەلەکانی چاك کردەوە، ئەگەر خیانەتکار بوومایە، نەیدەتوانی سزای من بدات. عیسا باشتر دەزانێ

یان ئێوە کە قوتابی ئەون؟ و ئایا ئێوە دەتوانن بانگەشەی ئەوە بکەن کە لەو شتانە تێ دەگەن کە هزری ئەو نایبڕێت؟

ئەو سێ کەسە بڕێك بە هێواشی وتووێژیان کرد و پاشان یۆحەننا گوتی: ئەم کابرا ڕۆمییە ڕاست دەکات و ئێمە ناتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین کە لە مامۆستاکەی خۆمان زیاتر تێ دەگەین. ئەگەر ئەم پیاوە خیانەتکار بووایە، ئەوا شەوی ڕابردوو عیسا ئەوی لەم کێوە دەردەکرد و، لەبەرئەوەی کە پێشەواکەمان جێی ئەوی کردۆتەوە، بۆیە ئێمە نابێ بیدەینە دەستی خەڵك تا بەردبارانی بکەن.

هەرچەندە یۆحەننا ئەو قسەیەی کرد، بەڵام لە سەیرکردنەکانی شەمعون پترۆس بەرامبەر من دەمزانی کە هێشتا لە من تووڕەیە. کوڕە گەنجەکە بۆ پشتگیری من گوتی: ڕۆژی ڕابردوو یەکێ لە گالێسکەکان کە بەسەر ڕێگاکەدا تێدەپەڕی، منی کرد بە ژێرەوە و قاچم شکا و، ئەو یەهوودیانەش کە بەوێدا تێدەپەڕین بەزەییان پێمدا نەهاتەوە، بەڵام ئەم کابرا ڕۆمییە (ئاماژە بە من) من و باوکمی سواری گوێدرێژ کرد و هێناینی بۆ ئێرە. ئەگەر یارمەتیدانی ئەم پیاوە نەبووایە، من نەمدەتوانی باوکم بێنم بۆ ئەم کێوە و، چاوەکانی ئەو چاك نەدەبوویەوە و، باوکیشم تا ئەو ڕۆژەی کە زیندوو بوو، بە کوێری دەژیا.

شەمعون پترۆس بە تووڕەییەوە گوتی: کەوتنەژێر گالێسکە و قاچ شکاندنەکەی تۆ بەڵگەی ئەوەیە کە عیسا نەیویستووە تۆ بێیت بۆ ئێرە. هەربۆیە هێنانی تۆ بۆ ئێرە لەلایەن ئەم کابرا ڕۆمییەوە بە پێچەوانی مەیلی ئەو بووە.

کوڕە گەنجەکە کاتێ ئەم قسەیەی بیست، لە بەردەم شەمعون پترۆسدا کڕنوشی برد و گوتی: ئەی پیاوی گەورە و ئاسمانی، ئەگەر من خەتام کردووە، بمبەخشە و، من لەلایەن خۆم و باوکمەوە داوای لێخۆش بوونت لێ دەکەم.

من گوتم: شەمعون پترۆس، هەرچەندە کە من ڕۆمیم بەڵام ئەگەر تۆ بتەوێ، ئەوا ئامادەم لەبەردەم تۆدا کڕنوش بەرم و دوای لێخۆش بوونت لێ بکەم. من خیانەتکار نیم و نامەوێ هەنگاوێ بنێم کە زیانی هەبێ بۆ تۆ و ئەو کەسانەی تر کە قوتابی یان شوێنکەوتەی عیسان. تۆ ئەگەر بەباشی نەزانی ڕووداوەکانی دوێنێ شەو کە لەم کێوەدا ڕووی دا، بگاتە گوێی خەڵکی تر، ئەوا من بێدەنگ دەبم و هەرگیز بە کەس ناڵێم کە عیسا دوێنێ شەو لەم کێوەدا هاتووە بۆلای ئێمە و قسەی لەگەڵ کردووین. بەڵام

ئەگەر بتەوێ هەواڵی زیندوو بوونەوەی عیسا و هاتنی بۆلای شوێنکەوتووانی بگاتە گوێی خەڵکی تر، ئەوا من بەڵێنت دەدەمێ کە لە ئەنجومەنی پیرانی ڕۆم (مەجلسی سینای ڕۆم) بەدەنگی بەرز ئەم هەواڵە دەگەیەنمە سیناتۆرەکان بۆئەوەی لە سەرانسەری ئیمپراتۆری ڕۆم بلاو ببێتەوە.

شەمعون پترۆس بە دەنگێکی بەرز گوتی: ئەی دێوانە بێدەنگ بە، ئەگەر خەڵك ببیستێ کە ڕۆمییەك لەبارەی زیندوو بوونەوەی عیسا و مەلەکوتەکەیەوە قسە دەکات، بەتەواوی لە عیسا و مەلەکوتەکەی دوور دەکەونەوە.

پاشان بە تورەییەوە ڕووی کردە ناتان و گوتی: من تۆم لە شاری کوفرناعوم بینیوە و متمانەم پێ کردی بۆیە هاتنی عیسام لەم کێوەدا پێ ڕاگەیاندی تا بتوانی لێرە عیسا ببینی. بەڵام تۆ سوودێکی نایاساییت لە متمانەی خۆت وەرگرت و ئەم پیاوە بێگانەیەت لەگەڵ خۆت هێناوە بۆ ئێرە.

ناتان گوتی: شەمعون پترۆس، ئەوەت فەرامۆش کردووە کە من لە کوفرناعوم گوێدرێژێکم دا بە تۆ تا بتوانی دایکە نەخۆشەکەی خۆت سوار بکەیت و بیهێنی بۆ ئەم کێوە تا بەهۆی عیساوە چارەسەر بکرێت؟

شەمعون پترۆس سەیرێکی یۆحەننا و پیاوەکەی تری کرد کە لە قوتابییەکان بوو و گوتی: ئەم بابەتە چ پەیوەندیەکی بەهێنانی ئەم پیاوە بێگانەیەوە هەیە بۆ ئێرە؟

ناتان گوتی: ئەو گوێدرێژەی کە من لە کوفرناعوم بە تۆم دا تا دایکە نەخۆشەکەت سوار بکەیت و بیهێنی بۆ ئێرە، هی ئەم پیاوە ڕۆمییەیە. ئەم پیاوەی کە بۆتە هۆی تورەیی تۆ، پیاوێکی چاکەکارە و، گوێدرێژێکیان دایکی تۆ سواری پشتی بووە و گوێدرێژەکەی تریشیان سوزمان سواری پشتی بوو.

شەمعون پترۆس گوتی: دایکی من چاك بوویەوە، بەڵام ناتوانێ بەپێ لێرەوە بگەڕێتەوە بۆ کوفرناعوم و، من و قوتابییەکانی تریش دەبێ بەپێی ڕێنمایی عیسا لەم کێوە بڕۆین و لە قودس بین تا ئەوەی عیسا گوتویەتی، بەڕاست بگەڕێ، بۆیە من ناتوانم دایکم ببەمەوە بۆ کوفرناعوم و هیچ یەکێ لە قوتابییەکانیش ناتوانن دایکم ببەنەوە بۆ ئەو شارە و، ئەگەر ئەو بۆ گەڕانەوەی بۆ کوفرناعوم گوێدرێژی نەبێت، ناتوانێ بڕواتەوە بۆ ئەوێ.

گوتم: شەمعون پترۆس، من پیاوێ نیم کە بە خراپە وەڵامی خراپە بدەمەوە. تۆ دەتوانی ئەو گوێدرێژەی کە ناتان پێی سپاردوویت، لەلات بێت و دایکت سوار بکەیت و بینێریتەوە بۆ کوفرناعوم. ئەگەریش بتەوێ من دوو گوێدرێژەکەی تر کە ئێمە پێی هاتووین بۆ ئەم کێوە، بسپێرم بە تۆ و یەکێ لە قوتابییەکان تا بۆ گەشتەکەتان سوودی لێ وەربگرن، چونکە ئەو پیرەپیاوەی کە نابینابوو، بینایی بۆ گەڕاوەتەوە و کوڕەکەیشی چاك بۆتەوە و هەردووکیان دەتوانن بەپێ بڕۆن، بۆیە پێویستییەکی وامان بە چوارپێ نییە. ئێمەش دەتوانین بەپێ ڕێگا ببڕین و پێویستمان بە گوێدرێژ نییە.

ئینجا ئەو پیاوەی کە تا ئەوکاتە قسەی نەکردبوو و منیش دەمزانی کە یەکێکە لە قوتابییەکان، لێوی بۆ قسە کردەوە و گوتی: گەرچی ئێمە توانیمان مامۆستای مەزنمان ببینین، بەڵام هەموو ئەو بەڵێنانەی کە ئەو بە ئێمەی داوە، نەهاتۆتە دی، لەو بەڵێنانەش کە نەهاتۆتە دی ئەوەیە کە گەلی ئیسرائیل هێشتا مەلەکوتیان نییە و، ئێمە هیواداریین کە دوای ئەوەی ڕۆشتین بۆ قودس، بتوانین مەلەکوتی گەلی ئیسرائیل بدۆزینەوە.

من گوتم: ئەو سیانەتان قوتابی عیسان و دەزانم هەشت کەسی تر هەن کە قوتابی عیسان. من لەبەردەم ئێوەدا کڕنوش دەبەم و تەنانەت سەریشتان بۆ نەوی دەکەم بەمەرجێ ئێوە پێم بڵێن ئەو ڕازە چییە کە شەوی ڕابردوو عیسا لەلای ئێوە باسی کرد؟ من بینیم کە ئەو دوێنێ شەو بە شێوەیەکی نهێنی قسەی کرد، چونکە کاتێ دەیویست قسەتان لەگەڵ بکات، ئێوەی لە خەڵکەکە جیا کردەوە و لە دەوری خۆی کۆی کردنەوە. ئەی قوتابییەکانی عیسا، من دەزانم کە ئەوەی بە ئێوەی گوت پەیوەندی بەم دنیاوە نییە. من عیسام ناسیوە و ئاگادارم کە ڕێنماییەکانی ئەو پەیوەندی بەم دنیایەوە نییە و، هەست دەکەم ئەو ڕازەی کە دوێنێ شەو لەلای ئێوە باسی کرد پەیوەندی بە ژیانی هەمیشەییەوە هەیە. من دەزانم کە ئەم ژیانە هەمیشەیی نییە. ژیانی هەمیشەیی جەستەیی نییە بەڵکو ژیانی هەمیشەی شتێکی ترە و، دەمەوێ بزانم ئەو ژیانە هەمیشەییە چییە؟ ئەگەر ئێوە ئەم ڕازەم پێ بڵێن، ئەوا من کە ڕۆمیم، دەبمە کۆیلەی ئێوە و تا ئەو ڕۆژەی کە زیندوم هەوڵ دەدەم خزمەتکاری ئێوە بم و، ئەگەر بەهۆی ئەو بڕوایەی کە هەتانە و کەوتوونەتە بەر ئازار و ئەشکەنجەی حکومەتی ڕۆم، ئەوا دەسەڵاتی خۆم بەکار دێنم تا ئێوە ئازاد بکەن و ئازار و ئەشکەنجەتان نەدەن.

یۆحەننا گوتی: کابرای ڕۆمی، من هەست دەکەم تۆ ڕاستگۆیت و، دڵسۆزی تۆ بۆ عیسا ڕووکەش و فێڵ نییە. هەربۆیە ئەو ڕازەت پێ دەڵێم تا بتوانی ببیتە خاوەنی ژیانی هەمیشەیی و، لە بەرامبەر ئەوەدا چاوەڕوانی هیچ شتێ لە تۆ ناکەم و نامەوێ خۆت بکەیت بە بەندەی ئێمە. ڕازی ژیانی هەمیشەیی کە عیسا شەوی ڕابردوو بە ئێمەی گوت ئەمەیە کە چۆن خۆتت خۆش دەوێ، کەسانی تریشت هەر ئەوەندە خۆش بووێت و، ئەوەی کە بۆ خۆت پێت خۆش نییە، بۆ کەسانی تریش پێت خۆش نەبێت و، هەرگیز ڕۆحی خۆت بە گوناه پیس مەکە. عیسا بە ئێمەی گوت کەسێ دەگاتە ژیانی هەمیشەیی کە کار بەم فەرمانانە بکات و، تەنیا بیستنی ئەم فەرمانانە بۆ گەیشتن بە ژیانی هەمیشەیی بەس نییە.

گوتم: یۆحەننا، سوپاست دەکەم بۆئەوەی کە پێت گوتم و ئایا دەتەوێ شتی ترم لەبارەی عیساوە پێ بڵێیت؟

شەمعون پترۆس گوتی: ئەوەی کە دەبێ بە تۆی بڵێین ئەمەیە کە ئەگەر بە قسەی خۆت عیسات خۆش دەوێ و خۆت بە شوێنکەوتەی ئەو دەزانی، زمانی خۆت بگرە و لەبارەی عیساوە قسە مەکە مەگەر لەگەڵ ئەو کەسانەدا نەبێ کە شوێنکەوتەی ئەون.

گوتم: من زمانی خۆم دەگرم و لەگەڵ کەسانێك لەبارەی عیساوە قسە ناکەم کە شوێنکەوتەی ئەو نەبن. پاشان بە ناتانم گوت: گوێدرێژەکان لەگەڵ خۆت بەرە و دایکی شەمعون پترۆس سواری یەکێکیان بکە و خۆیشت سواری گوێدرێژێکی تریان ببە و، ئەو ژنە بگەیەنەرە کوفرناعوم و دوای ئەوەی ماندوویەتی گەشتەکەت دەرچوو، وەرەوە بۆ تەبەرییە تا منیش لەوێ بڕۆم.

ناتان گوتی: ئایا تۆ ئێستە بەپێ دەڕۆیت بۆ تەبەرییە؟

گوتم: بەڵێ، من و میرنا بەپێ دەگەڕێینەوە بۆ تەبەرییە.

پاشان دەستی میرنام گرت بۆئەوەی بکەوینەڕێ و لە کێوەکە نەمێنین. من ماڵئاواییم لە یەکە بەیەکەی ئەوان کرد کە لە دەوروبەرمدا بوون و گوتم: چاکە ببێ بە نسیبتان.

# گەڕانەوە بۆ تەبەرییە

کاتێ من و میرنا لە کێوەکە دەهاتینە خوارەوە، سەیرمان کرد ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکەکان لەبەرئەوەی شەوی ڕابردوو تا بەیانی بەئاگا بوون، پالاّ پۆشەکانی خۆیان داوە بە سەریاندا و نووستوون بۆئەوەی پێش ئەوەی بڕۆن، کەمێك پشوو بدەن. کاتێ کە دەستی میرنام گرتبوو و لە کێوەکە دەهاتمە خوارەوە، ڕووداوەکانی شەوی ڕابردووی وەکو ڕووداوی چاك بوونەوەی چاوی ئەو پیرەپیاوە نابینایە و چاك بوونەوەی قاچی کوڕە گەنجەکەیم دەهاتەوە یاد. من ئەوکاتە لە چاك بوونەوەی چاوی ئەو پیرەپیاوە و چاك بوونەوەی قاچی کوڕەکەی سەرم سوڕنەدەما. چونکە ئەو ڕووداوانەم بەلاوە شتێکی بڕواپێکراو بوو، چونکە دوای ئەوەی کە عیسام بینی، بۆم دەرکەوت کە ئەوەندە بەدەسەلاّت و مەزنە کە هەموو کارێکی نائاسایی و دوور لە هزر بۆ ئەو ئاساییە.

من لە ناخی دڵەوە هەستم بە خۆشحاڵیەکی زۆر دەکرد، چونکە دەمزانی دوای ئەوە ئیتر تەنیا نابم و، هەرکاتێ خۆم بە تەنیا ببینم، عیسا بانگ دەکەم و ئەویش خۆی دەگەیەنێتە لای من. میرنا خزمەتی عیسای کردووە و ئاوی پێداوە و بۆیەشە عیسا پاداشتی دایەوە و پێی گوت ((تا ئەو ڕۆژەی کە زیندوویت، هەست بە تینوویەتی ناکەیت)). هەرچەندە من هیچ خزمەتێکی عیسام نەکردبوو، بەلاّم ئەو منی خستە بەر بەزەیی خۆی و، ئەو شەوە لە لێواری دەریاچەی جەلیلەدا خواردنی پێدام (ئەگەر ئەو پیاوە ڕاوچییە عیسا بووبێ) و مۆڵەتی دام لەلای ئاگرەکەی دابنیشم و جلەکانی خۆم وشك بکەمەوە. ئەگەر ئەو ڕاوچییەی ماسی کە ئەو شەوە خزمەتی ئێمەی کرد، عیسا بووبێ، بۆئەوە منی نارد بۆلای میرنا تا ئەو کچە گەنجە دوای مردنی براکەی، بەبێ سەرپەرشتیار نەمێنێتەوە و من بتوانم جێگەی براکەی بگرمەوە.

بۆیە کاتێ لە کێوەکە هاتینە خوارەوە بە "میرنا"م گوت: تۆ لە ئەمڕۆوە خوشکی منیت و منیش برای تۆم و مافی ئەوەت هەیە خۆت بە شەریکی ماڵی من بزانی.

میرنا دەستی منی گوشی و گوتی: مەزن تیوس هەرچەندە من براکەی خۆم لەدەست داوە، بەڵام لەجیاتیدا برایەکی وەکو تۆم پەیدا کردووە کە لە براکەی پێشووترم میهرەبانترە.

پاشان گوتی: ئایا زانیت ئەو کاتەی کە لەسەر کێوەکە بووین، ئەو سێ کەسە چۆن سەیری منیان دەکرد؟

گوتم: ئەو سێ کەسە پیاوانی ئاسمانین و قوتابی عیسان و ڕێزگرتنی ئەوان لەسەر ئێمە پێویستە. ئەگەر بیرت بێ، ئەوان ڕقیان لەمن بوو و تەنیا لە دوایین ساتەکاندا یۆحەننا وشەی بەزەیی لەدەم هاتە دەرەوە. بەوحاڵەشەوە پێشنیاری منیان کرد تا لەبارەی عیساوە قسە نەکەم مەگەر لەگەڵ ئەو کەسانەدا نەبێ کە بزانم لە شوێنکەوتووانی ئەون. هۆی ڕقی ئەو سێ کەسە لەمن و تۆ ئەوەیە کە ئەوان جوولەکەن و ئێمە لەلای ئەوان بێگانە و پیسین. ئێمە نابێ گلەیی لەوان بکەین کە بۆچی ڕقیان لێمانە، چونکە یاسا نەژادی و ئایینییەکانیان وادەخوازێ کە هەرکەسێ یەهوودی نەبێ، بە کەسی خۆیانی نەزانن.

میرنا گوتی: بەڵام عیسا کە دوێنێ شەو لەلای ئێمە دەرکەوت، منی بە ناپاك نەزانی و قسەی لەگەڵ کردم و، ئەگەر من لەلای ئەو ژنێکی پیس بوومایە، ئەوا قسەی لەگەڵ نەدەکردم.

گوتم: منیش لەلای عیسا بە پیاوێکی پیس دەرنەکەوتم، چونکە قسەی لەگەڵ کردم.

میرنا گوتی: بە ڕاستی دوێنێ شەو گەورەترین شەوی ژیانی ئێمە بوو و، من وانازانم شەوێکی وەکو ئەمشەو لە ژیانمدا و لە تەنانەت لە دنیاشدا دووبارە بێتەوە. ئایا بەبیرت دێ کە هەرچەندە شەربەتمان دەخواردەوە کەچی دەفرەکەمان بەتاڵ نەدەبۆوە؟ بەبیرت دێ کاتێ نانمان دەخوارد و تێر بووین، سەیرمان کرد هێشتا نانەکەمان لەبەردەمماندا مابوویەوە؟ بەڵام هیچ یەکێ لە مۆجیزەکانی شەوی ڕابردوو بۆی نەسەلماندم کە عیسا نێردراوی خودایە ئەو کاتە نەبێ کە لەمن نزیك بوویەوە و قسەی لەگەڵ کردم. ئەوکاتە بڕوام هێنا کە عیسا پێغەمبەری خودایە.

پرسیم: چۆن ئەو کاتە بڕوات هێنا کە ئەو نێردراوی خودایە؟

میرنا گوتی: کاتیٚ عیسا لیٚم نزیك بوویەوە و قسەی لەگەڵ کردم، لەناکاو هەستم کرد ئەوەندەم خۆش دەویٚت کە لەسەرەتای تەمەنمەوە تا ئەمڕۆ هیچ کەسیٚکم ئەوەندە خۆش نەویستووە. من بە منداڵی دایکم زۆر خۆش دەویست و، دوای ئەوەی کە گەورە بووم و دایکم لەدەست دا، خووم بە براکەمەوە گرت و نەمدەتوانی لە دووری ئەودا بژیم. بەڵام خۆشەویستی کتوپڕی من بۆ عیسا شتیٚکی تر بوو. من هەرکە ئەوم بینی، زانیم کە چوومەتە ناو مەلەکوتەکەیەوە. ئیٚستەش کە هەوا ڕووناکە و تیشکی خۆر دەدا لە زەوی، من خۆم لە مەلەکوتی عیسادا دەبینمەوە، ئەگەرچی قاچیشم لەسەر زەوی بیٚت. بەلای منەوە بابەتی مەلەکوتی عیسا لەو ساتەوەی کە دویٚنیٚ شەو ئەوم بینی، چارەبوو، چونکە هەرکە ئەوم بینی، یەکسەر خۆشەویستیەکەی لە دڵمدا جیٚی گرت و، ئیتر ئەوکاتە زانیم کە چوومەتە ناو مەلەکوتی عیساوە.

گوتم: میرنا، منیش وەکو تۆ هەست بە خۆشبەختی دەکەم و خۆم بە خۆشحاڵ دەبینیم، هەرچەندە تۆ لەمن بەختەوەرتریت. هۆی بەختیاری تۆ ئەوەیە کە تۆ وەکو من لە زانکۆ نەتخویٚندووە و ئاگاداری بیروبۆچوونەکانی فەلسەفە نیت. ئەگەرچی منیش شەوی ڕابردوو وەکو تۆ بڕوام هیٚنا کە عیسا نیٚردراوی خودایە، بەڵام لەبەرئەوەی هیٚشتا بیروبۆچوونەکانی فەلسەفە لە میٚشکمدا ماوە، بۆیە وەکو تۆ هەست بە خۆشبەختی ڕەها ناکەم. بەم حاڵەشەوە ئیٚستە بە هیچ جۆریٚ نیگەرانی داهاتوو نیم و دەزانم کە خۆشبەختی هەمیشەییمان لەپیٚشە، چونکە هاتنە دەرەوەی عیسا لەناو گۆڕ و قسەکردنی لەگەڵ مندا، بەخشیش و خەزیٚنەیەکە کە هەرگیز تەواو نابیٚ.

ئەوکاتە ئیٚمە گەیشتینە شویٚنیٚك لە داویٚنی کیٚوەکە کە درەختیٚکی هەنجیری پیری سیٚبەرفراوانی لیٚ بوو. من بە میرنام گوت: ئیٚمە نابیٚ پەلە بکەین بۆئەوەی زووتر خۆمان بگەیەنینە تەبرییە. دەبیٚ ئەو کەسانە پەلە بکەن کە بەدوای خۆشبەختیدا دەگەڕیٚن، بەڵام ئیٚمە خۆشبەختی هەمیشەییمان دۆزیوەتەوە و پیٚویست ناکات پەلە بکەین. بۆیە باشتروایە لیٚرە لەژیٚر سیٚبەری ئەم دارهەنجیرەدا پشوو بدەین و، دوای ئەوەی لەخەو هەستاین و ماندوویەتیمان دەرچوو، دریٚژە بە ڕیٚگاکەمان دەدەین.

میرنا پیٚشنیارەکەی منی پەسەند کرد و لەژیٚر سیٚبەری دارهەنجیرەکەدا ڕاکشاین و، دوای ماوەیەك خەومان لیٚ کەوت.

کاتێ لەخەو هەستاین، سەیرمان کرد بەتەواوەتی ماندوویەتیمان دەرچووە. پاشان دەستی یەکترمان گرت و بەڕێ کەوتین بۆئەوەی بگەینە سەر شاڕێگاکە. کاتێ گەیشتینە شاڕێگاکە، چاوم بە دوو ئافرەت کەوت. یەکێکیان سواری گوێدرێژێك بوو و ئافرەتەکەی تریشیان بەپێی پەتی لە دوایەوە دەڕۆشت. من ئەو دووانەم ناسییەوە و زانیم ئەوەی کە سواری گوێدرێژەکە بووە مریەمی مەجدەلییەیە و ئەوی تریان کە بەپێ لە دوای گوێدرێژەکەوە دەڕوات، مریەمی بێرتە.

لەگەڵ میرنا بەرەو لای مریەمی مەجدەلییە ڕۆشتم بۆئەوەی پێیان ئاشنا بکەم، بەڵام ئەو، کاتێ منی لەگەڵ میرنا بینی، بە ساردەوە پێشوازی لێ کردم. مریەمی بێرتیش بەتوندی سەیرێکی میرنای کرد و پاشان گوتی: کابرای ڕۆمی، دەبێ بزانی کە من بە تەواوەتی پاك بوومەتەوە و، هاتنم بۆ ئەم کێوە منی خاوێن کردەوە و، ئێستە هیچ جیاوازییەکم نییە لەگەڵ کچێکی شوونەکردوودا و، ئەگەر تۆ تەماحت لەمن هەیە، ئەوە بزانە کە هەرگیز ناگەی بە من و، هەر ئەو کچە شپرزە لوت کوڵە بۆ تۆ باشە.

من وەڵامی مریەمی بێرتم نەدایەوە، چونکە دەمزانی کە ئەو هەڵەیە و نازانێ میرنا خوشکی منە. پاشان بە مریەمی مەجدەلییەم گوت: بەو جۆرەی کە دەبینم، پیاوێك نییە هاوڕێی گەشتەکەت بێت و لە ڕێگادا بتپارێزێت، بۆیە من ئامادەم لەگەڵ تۆ گەشت بکەم و لە ڕێگادا ئاگاداری تۆ و مریەمی بێرت بم.

پاشان ئاماژەم بە خۆر کرد و گوتم: بەم زووانە ڕۆژ ئاوا دەبێ، بۆیە باش نییە دوای خۆرئاوابوون، دوو ئافرەت بەبێ ئەوەی پیاویان لەگەڵ بێت، گەشت بکەن. من پێشنیارتان دەکەم پێش ئەوەی خۆر ئاوابێ، لە میوانخانەیەکدا بمێننەوە و شەو لەو میوانخانەیەدا بمێننەوە و بەیانی زوو بەڕێ بکەوین و، دواتر من دەتانگەیەنمە ماڵی خۆتان.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: مەزن تیوس من پێویستم بە پارێزگاری تۆ نییە و نامەوێ تۆ من بگەیەنیتەوە ماڵی خۆم.

مریەمی بێرت دیسان بە ڕق و قینەوە سەیرێکی میرنای کرد و پێی گوتم: ئەمڕۆ بەیانییەکەی لەسەر کێوەکە گەنجێکم بینی کە چاوەکانی وەکو ئەستێرە دەدرەوشانەوە و ڕوخساری وەکو گوڵی هەنار وابوو و ماوەیەك بە حەزەوە سەیری کردم و، ئینجا لێی پرسیم کە ماڵم لە کوێیە و منیش ناوونیشانی ماڵی مریەمی مەجدەلییەم پێدا و،

گەنجەکەش گوتی هەرکە لە کێوەکە گەڕایەوە، کەسوکارەکانی خۆی دەنێرێ بۆ ماڵمان تاکو بمخوازن و زوو ببێتە مێردم. ئەو گەنجە باوکێکی دەوڵەمەندی هەیە و، باوکی کێڵگە و ڕەزی ترێ و باخی زەیتون و مەڕی هەیە و، ڕۆژی پێشوو کاتێ هات بۆ ئەم کێوە، نابینا بوو، بەڵام دوێنێ شەو عیسا هەردوو چاوی بینا کردەوە و، من دەزانم دوای ئەوەی کە لەگەڵ کوڕە گەنجەکەیدا هاوسەرگیریم کرد، خۆشبەخت دەبم و جلوبەرگی جوان دەکەمە بەرم.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: مریەمی بێرت ڕاست دەکات. من خۆشحاڵم کە ئەم پێشهاتە هاتە پێشەوە و ئەو پیاوە نابینایە چاك بوویەوە و چاوەکانی بۆ گەڕایەوە و، هەروەها خۆشحاڵم کە کوڕە گەنجەکەی، مریەمی بێرتی ویستووە و ئامادە بووە هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، چونکە ئەگەر ئەو کوڕە گەنجە دڵی نەچووایە بەم ئافرەتەدا، ئەوا نەمدەزانی چی لە مریەمی بێرت بکەم جگە لەوەی کە بمدایە بەتۆ، واتە تۆ ببیتە مێردی ئەو و، ئەگەر لەگەڵ تۆ هاوسەرگیری بکردایە، ئەوا ئافرەتێکی بەدبەخت دەبوو، چونکە گەورەترین بەدبەختی بۆ ئافرەتێکی یەهوودی ئەوەیە کە ببێتە ژنی پیاوێکی نایەهوودی.

گوتم: کەواتە دەبێ منیش خۆشحاڵ بم کە چاوە نابیناکانی ئەو پیاوە یەهوودییە چاك بوویەوە و بیرینی کوڕەکەی چاك بوویەوە و، کوڕە گەنجەکەیشی حەزی لە مریەمی بێرت کردووە. بەڵام بۆچی بە خەیاڵتدا هات مریەمی بێرت بدەی بەمن؟

مریەمی مەجدەلییە گوتی: چونکە مریەمی بێرت کاڵایەك بوو کە تۆ هێنات بۆ ماڵی من. ئەی نەتبیستووە کە دەڵێن کاڵای بێ بەها بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە.[70]

مریەمی بێرت توڕە بوو و گوتی: من بە کاڵای بێ بەها دەزانی؟

مریەمی مەجدەلییە گوتی: مەبەستم ئەوە نییە کە تۆ گەنج و جوان نیت، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە تۆ زۆر سەربەدەرەوە بوویت بۆیە لەو ڕووەوە تۆم بە کاڵای بێ بەها لەقەڵەم داوە.

گوتم: کەواتە ئەو خەوەی کە بە مریەمی بێرتەوە بینیم، پەیوەندی بەم بابەتەوە هەبووە و، پێش ئەوەی من ئەو خەوە ببینم، تۆ خەوت بە منەوە بینیوە و، دەتویست

---

[70] ئەم پەندە لە کوردیدا بەم جۆرەیە: ((ماڵی قەڵب بۆ خاوەنەکەی ئەگەڕێتەوە)). (و. کوردی)

مریەمی بێرت بدەی بەمن، بەڵام خۆشبەختانە کە ئەو گەنجە یەهوودییەی کە چاوەکانی باوکی چاك بوویەوە، حەزی لەم ئافرەتە کردووە و ئامادە بووە بیخوازێت.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: ئەو خەوەی کە تۆ بە مریەمی بێرت ەوە بینیت چی بوو؟

گوتم: خەوم بینی کە من لەگەڵ میرنا _ ئەو ژنەی کە لەگەڵ مندایە_ بە بیابانێکدا دەڕۆیشتین و مریەمی بێرتیش لەدوای ئێمەوە دەهات، بەڵام زۆر قەڵەو دەهاتە بەرچاو و، قیافەی وای نیشان دەدا کە پیربووە و، کاتێ قسەی دەکرد دیاربوو ددانی لە دەمدا نەماوە.

مریەمی بێرت دەنگی ناڕەزایی بەرز کردەوە و گوتی: مارکۆس مەزن تیوسی ڕۆمی، تۆ درۆ دەکەیت و هۆی درۆزنیی تۆ ئەوەیە کە من قەڵەو و پیر نیم و ددانەکانیشم نەکەوتوون و، ددانەکانی من سپیتر و جوانترە لە ددانەکانی تۆ.

گوتم: من ئەو دیمەنەم لە خەودا بینیوە و، دیمەنەکانی خەیاڵیش لەگەڵ دیمەنی بێداریدا جیاوازن، بەڵام هەرچۆنێ بێ خەوەکەی من ئەوەی نیشان دەدا کە ئەگەر تۆ مێردت بە من بکردایە، ئەوا بەوجۆرەی کە مریەمی مەجدەلییە گوتی، بەدبەخت دەبوویت. بەڵام لەمەبەدوا خۆشبەخت دەبیت، چونکە دەتوانی شوو بە گەنجێك بکەیت کە وەکو تۆ یەهوودییە.

پاشان کەمێك بێدەنگ بوو و میرنا بە هێواشی لێی پرسیم: ئەو ئافرەتە کە سواری گوێدرێژەکە بووە، کێیە؟

گوتم: ئەوە ناوی مریەمی مەجدەلییەیە، ئەو لەو ئافرەتانەیە کە بەردەوام لەگەڵ عیسادا بووە و لەگەڵی چووە بۆ هەموو جێگایەك. ئەم ئافرەتە تایبەتمەندییەکی تری هەیە ئەویش ئەوەیە کە یەکەم کەسە کە دوای زیندوو بوونەوەی عیسا، گۆڕە بەتاڵەکەی ئەوی بینیوە.

کاتێ میرنا ئەم قسەیەی بیست، بەرەو لای مریەمی مەجدەلییە ڕۆیشت و پێی گوت: ئەی ئەو ئافرەتە خۆشبەختەی کە شوێنکەوتەی عیسا بوویت، من بە دیداری تۆ زۆر خۆشحاڵم. ئایا دەکرێ لەبارەی عیساوە قسەم بۆ بکەیت؟

مریەمی مەجدەلییە کاتێ بیستی میرنا بە ڕەوشت و لێبووردنەوە قسە دەکات، بۆچوونی لەبارەیەوە باش بوو و دەستی بە قسەکرد و گوتی: بێگومان عیسا نێردراوی

خودایە. هەروەها کاتێ مریەمی دایکی دووگیان بوو، هێشتا زەماوەندی گواستنەوە لەنێوان ئەو و مێردەکەی کە ناوی یوسف بوو، ئەنجام نەدرابوو و، عیسا لە سکی کچێکی شوونەکردوودا گەشەی کرد و ئینجا لەدایك بوو.

میرنا گوتی: من نەمبیستبوو و نەمدەزانی کە عیسا لە سکی کچێکی شوونەکردوودا هاتۆتە دنیاوە.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: بەڵێ، عیسا لە کچێکی شوونەکردوو لەدایك بووە و مریەمی دایکی کە ئەوی بوو، شووی نەکردبوو.

میرنا پرسی: مریەمی مەجدەلییە دەکرێ لەبارەی وتەکانی عیساوە قسەم بۆ بکەیت؟

مریەمی مەجدەلییە وەڵامی دایەوە: عیسا زۆر وتاری داوە و یەکێ لە وتەکانی ئەوەیە کە دەیگوت ((کاتێ جووتیارێ تۆو دەچێنێ، بڕێ لە دانەوێڵەکەی دەکەوێتە سەر بەرد و، لەبەرئەوەی خۆڵی تێدا نییە، سەوز نابێت. بەشێکیشی دەکەوێتە شوێنێك کە شوێنی ڕووانی داری دڕکاوییە و دڕك ڕێگر دەبێ لە ڕووانی گەنم. تەنیا ئەو بەشەی دانەوێڵەکان کە دەکەونە سەر خاك و زەوییەکی گونجاو، بۆ ڕواندن دەشێن و، سەوز دەبن و بەرهەمی دەبێت)). ئەو وتەیەش کە ئەو گوتوویەتی ئاوایە و، تەنیا ئەو کەسانە لەو (لە عیسا) بەهرەمەند دەبن و ڕزگاریان دەبێت کە توانای قبوڵ کردن و کارپێکردنی وتەکانی ئەویان هەبێت.

پاشان مریەمی مەجدەلییە منی بە نموونە هێنایەوە و گوتی: ئەم پیاوە ڕۆمییەی کە ناوی مارکۆس مەزن تیوسە بە چاکەکار دێتەبەرچاو و، دوور نییە ڕووداوەکانی دوێنێ شەو کاریان تێکردبێ، بەڵام دوای ئەوەی گەڕایەوە بۆ ڕۆم و خۆی لە ناو ڕۆمییە بت پەرستەکاندا بینییەوە، وەکو ئەو تۆوەی گەنمی لێ دێت کە کەوتبێتە ناو دڕکەوە. هەر بەو جۆرەی کە ڕەگ و قەدەکانی دڕك ناهێڵێ ئەو تۆوە گەنمە بەرهەمی هەبێت، ئەوا بە قسەی ڕۆمییەکان ڕێگر دەبن لەوەی کە مارکۆس مەزن تیوس ڕزگاری بێت و، بە زوویی عیسا فەرامۆش دەکات و دەگەڕێتەوە بۆلای بتەکانی ڕۆم.

من سەیرێکی دەوروبەرم کرد و سەیری گردە سوورەکانی ناوچەی جەلیلەم کرد کە درەختی سەوزی لە داوێنیدا ڕووابوو و، لەو کاتەدا ئاوابوونی خۆر نزیك دەبوویەوە و سێبەرەکان درێژتر دەبوون و گوتم: مریەمی مەجدلیە، مەحاڵە من ئەم خاکە لەبیر

بکەم. مەحاڵە ڕۆژێ بێت کە ئەم درەختە سەوزانە و ئەو دەریاچە شینە لەیاد بکەم و، بە ڕێگەی یەکەم[71] ڕووداوەکانی دوێنێ شەو فەرامۆش ناکەم. من دوێنێ شەو بەچاوەکانی خۆم بینیم کە عیسا پیاوێکی کوێری بینا کردەوە و کوڕی ئەو نابینایەی کە قاچی شکابوو، وا چاك کردەوە کە دەتگوت قاچی نەشکاوە. من بەجۆرێك بڕوام هێناوە بە عیسا کە دەزانم هەرکاتێ بانگی بکەم، دێت بۆلام و، ئەگەر کاتێ بانگی بکەم و نەیەت بۆلام، ئەوا خۆم بە بەدبەختترین پیاوی ئەم دنیایە دەزانم. ئەم قسەیە بۆئەوە ناکەم کە لەوە بترسم ئەو نەیەت بۆلام، بەڵکو بۆئەوە گوتم کە نیشانی بدەم چەندە دڵم لە بەرامبەر ئەودا پاکە کە بەو جۆرە ناوی دێنم.

کەمێ بێدەنگ بووم و پاشان گوتم: من عیسا بە خاوەنی مەلەکوت دەزانم و بڕوام وایە ئەو مرۆڤێکی ئاسایی نییە و، بەداخەوەم بۆئەوەی زووتر واتە پێش ئەوەی لەخاچ بدرێ، ئەوم نەناسی و خزمەتم نەکرد. ئێستە کە چل ڕۆژی ڕێکە بەسەر دەچێت و عیسا لە ناوماندا دەڕوات و کەس نازانێ بۆ کوێ دەڕوات، ئارەزوویەکم هەیە، ئەویش ئەوەیە کە گیانی خۆم لە ڕێی عیسادا بەخت بکەم، چونکە تەنیا بەهۆی فیداکردنی گیانەوەیە کە دەتوانم بەخۆمی بسەلمێنم کە شایستەی خزمەتکاری ئەوم. من لەبەرئەوەی ڕۆمیم، بۆیە بە شمشێر دەکوژرێم و، ئەگەر ڕۆژێ ڕۆمییەکان بیانەوێ لە سێدارەم بدەن، بە شمشێر سەرم لەلاشە جیا دەکەنەوە، بەلاَم خۆم حەز دەکەم وەکو عیسا لەخاچ بدرێم بۆئەوەی وەکو ئەو ئازاری لە خاچدان بچێژم. مریەمی مەجدەلییە، دڵنیات دەکەمەوە کە من هەرگیز عیسا فەرامۆش ناکەم و ڕۆمییەکان ناتوانن عیسام لەبیر بەرنەوە. من دوای گەڕانەوەم بۆ ڕۆم، ئەگەر قوتابییەکانی عیسا مۆڵەتم بدەن، بۆ ناساندنی عیسا بەربەرەکانێی ڕۆمییەکان دەکەم، تەنانەت ئەگەر دڵنیاش بم لەوەی کە دەکوژرێم.

ئیتر مریەمی مەجدەلییە لەبارەی ئەم بابەتەوە هیچی نەگوت و، پاشان گەیشتینە ئەو میوانخانەیەی کە دەبوو شەو تیایدا بمێنینەوە.

---

[71] مەبەست لە نموونەی چاندنی گەنمەکەیە کە دەکەوێتە سەر بەرد. (و. کوردی)

# پێشنایارەکەی مریەمی بێرت

میوانخانەکە پڕ بوو لە گەشتیار و ژمارەیەك لە گەشتیاران لە بەردەم میوانخانەکەدا ئاگریان کردبۆوە و لە دەوری ئاگرەدا دانیشتبوون و لەبارەی عیساوە قسەیان دەکرد و دیار بوو هەموویان ئەو گەشتیارانە بوون کە لە کێوەکە گەڕابوونەوە.

ئەگەرچی هەموو ژوورەکانی میوانخانەکەیان گرتبوو، بەڵام کاتێ گەشتیارەکان مریەمی مەجدەلییەیان ناسی، جێگایان بۆ کردەوە و، ئەو ژنە و مریەمی بێرتیان لە ژورێکدا خەواند، بەڵام من و میرنا لەلای جوولەکەکان بیانی بووین و ئەوان ئامادە نەبوون جێگا بۆ ئێمە بکەنەوە.

من زۆر حەزم دەکرد لەلای یەکێ لە ئاگرەکان دابنیشم و لە گفتوگۆی گەشیارەکاندا بەشداری بکەم و گوێم لە ستایشکردنەکانی عیسا بێت، بەڵام هیچکامێکیان گوێیان بە من نەدەدا. هەرچەندە من و میرنا بیانی بووین، بەڵام خاوەنی میوانخانەکە بڕێك (کا)ی لە کادێن دەرهێنا و دای بە ئێمە بۆئەوەی لەژێر ساباتێکدا بە زەویدا بلاَوی بکەینەوە و لەوێش بخەوین.

پێش ئەوەی خەومان لێ بکەوێت، من ئەو نزایەی کە لە سوزمانەوە فێر بووم، بە میرنام گوت و ئەویش خێرا فێری ئەو نزایە بوو و گوتم: ئەمە نزایەکە کە زوو فێری دەبیت و فەرامۆش ناکرێت و، من هەموو شەوێ پێش ئەوەی بخەوم ئەم نزایە دووبارە دەکەمەوە.

بەیانییەکەی ڕۆژی دواتر دوای ئەوەی چاوم کردەوە، یەکەم کەس کە بینیم، مریەمی بێرت بوو. سەیرم کرد لەسەر(کا)یەکە لە ژوور سەرمەوە دانیشتووە.

لێم پرسی: لێرە چی دەکەی؟

گوتی: دوێنێ شەو ئاسوودە نەبووم و نەمتوانی بخەوم. هۆی ئاسوودە نەبوونەکەشم ئەوە بوو کە من و مریەمی مەجدەلییە لە ژوورێکی بچوکدا لەگەڵ چەند ژنێکی تر لە گەشتیارەکان خەوتین و، ژوورەکە زۆر گەرم بوو و جێگەیەکی وامان نەبوو تا قاچمان ڕابکێشین. دووەم هۆکاری ئاسوودە نەبوونەکەم ئەوەبوو کە بیرم لەو قسانە دەکردەوە کە دوێنێ بەرامبەر بەتۆ و میرنا کردم و زۆر پەشیمان بووم لەوەی کە بۆچی

ئەو قسانەم کرد. ڕۆژی ڕابردوو کاتێ میرنام لەگەڵ تۆ بینی، لەناکاو ئاگری حەسوودی لە ناخمدا هەڵگیرسا، چونکە وامدەزانی میرنا مەعشوقی تۆیە و، هەرلەبەر ئەمەش بوو ئەو قسانەم کرد. بەڵام دوای ئەوەی کە زانیم میرنا مەعشوقی تۆ نییە، لەو قسانە پەشیمان بوومەوە کە کردوومە و، شەوی ڕابردوو تەنگیی شوێنەکە لە لایەکەوە و پەشیمانیش لەلایەکی ترەوە ڕێگر بوو لە خەوتنم. جگە لەم هۆکارەش ترس و دڵەڕاوکێش ڕێگر بوون لە خەوتنی من.

پرسیم: بۆچی ترس و دڵەڕاوکێت هەبوو؟

مریەمی بێرت گوتی: چونکە دەترسم ئەو گەنجەی کە لە کێوەکە بەڵێنی هاوسەرگیری پێ دابووم و دەیگوت کەسوکارەکانی خۆی بۆ خوازبێنی دەنێرێت بۆماڵی مریەمی مەجدەلییە، بەڵێنەکەی نەباتە سەر، بۆیەشە ئەمڕۆ بەیانییەکەی هاتم بۆ ئێرە بۆئەوەی یەکەم جار بەهۆی قسەکانی دوێنێ داوای پۆزشت لێ بکەم و دووەمیان بۆئەوەی لێت بپرسم کە ئایا ئەو گەنجە بەڵێنەکەی خۆی دەباتە سەر یان نا؟

گوتم: مریەمی بێرت، خەیاڵت ئاسوودە بێت. ئەو گەنجەی کە من بینیومە بەڵێنەکەی خۆی دەباتەسەر و خوازبێنیکەرەکانی دێن بۆ ماڵی مریەمی مەجدەلییە و خوازبێنیت دەکەن و دەبیتە ژنی ئەو گەنجە و، هاوسێ و دراوسێکانیش بەشداری دەکەن لە شاییەکەتدا.

مریەمی بێرت کەمێك بیری کردەوە و گوتی: من بیستوومە کە سرکەی نەخت باشترە لە حەڵوای قەرز و، ئەگەرچی تامی سرکەش ترشە، بەڵام لە حەڵوای قەرز بە باشتر دەزانرێ.

پرسیم: مەبەستت لەم پەندی پێشینانە چییە؟

مریەمی بێرت گوتی: مریەمی مەجدەلییە گوتی کە نیازی وابووە من بدات بە تۆ و، هەرچەندە تۆ ڕۆمیت و هاوسەرگیری ژنێکی یەهوودی لەگەڵ پیاوێکی ڕۆمی بەدبەختیەکی گەورەیە بۆ ژنەکە، بەڵام من ئامادەم تۆ بە مێردی خۆم هەڵبژێرم و، تۆش بەبێ نیگەرانی دەتوانی ببیت بە مێردی من، چونکە من دوێنێ شەو هەموو گوناهەکانم بەخشراوە و وەکو کچێکی شوونەکردوو بێگوناهم.

گوتم: مریەمی بێرت، تۆ چۆن واز لە گەنجێکی جوولەکە دەهێنیت کە تۆی دەوێ و، دەتەوێ ببی بە ژنی من؟

مریەمی بێرت گوتی: چونکە بەڵێنی هاوسەرگیری ئەو گەنجە جوولەکە قەرزە و، هاوسەرگیری لەگەڵ تۆدا نەختینەییە.

گوتم: هەموو هاوسەرگیرییەك پێویستی بە ڕەزامەندی ژن و پیاوەکە هەیە و، تەنیا ڕەزامەندی کەسێك بەس نییە. تۆ واقسە دەکەیت کە گوایە لە ڕەزامەندی من دڵنیایت، لە کاتێکدا من حەز ناکەم ژن بهێنم.

مریەمی بێرت پرسی: بۆچی حەزناکەی ژن بهێنی؟

گوتم: ژن نەهێنانی من چەند هۆکارێکی هەیە. هۆی یەکەمیان ئەوەیە کە من ڕۆمیم و ئێرە فەلەستینە و، ئەگەر بمەوێ ژن بهێنم، ئەوا دەبێ خێزانەکەم ئاگادار بن و لە ئاهەنگی هاوسەرگیریدا بەشداری بکەن. هۆی دووەم ئەوەیە کە دوای ژن هێنان من دەبمە خاوەنی منداڵ و، دوای ئەوەش کە بوومە خاوەنی منداڵ، ناتوانم لە ڕێگەی عیسادا خۆم فیدا بکەم. من بەڵێنم داوە بۆئەوەی ببمە شایستەی خزمەتکردنی عیسا و، خۆم لە ڕێگەیدا فیدا بکەم و، کەسێکیش کە بوو بە خاوەنی منداڵ، ئەوا ئەگەر بیەوێ خۆی فیدا بکات، زەبوونییەکەی ڕەت دەکرێتەوە. چونکە دەزانێ هەرکاتێ بکوژرێ، ئەوا دوای ئەو، منداڵەکانی هەتیو دەکەون. بەڵام کەسێ کە منداڵی نەبێت، بەبێ ترس و دوو دڵی دەمرێ. هۆی سێیەم ئەوەیە کە من لەو ڕۆژەوەی عیسام بەخاچەوە بینی، بیروبۆچوونم لەبارەی ژنەوە گۆڕاوە. تا ئەو ڕۆژەی کە عیسام بینی، من حەزم دەکرد هەندێ جار لەگەڵ ژندا بژیم، بەڵام لەو ڕۆژە بەدواوە حەزم لە ژن نییە. گەورەیی ئەو پیاوە ئەوەندە کاری کردۆتە سەرم کە پەیوەندی پیاو و ژنم بەلاوە نەك بە کەم، بەڵکو بە نەفرەتلێکراو دێتەبەرچاوم. بۆیە من حەز ناکەم ژن بهێنم و، ئەو حەزەی کە لە کەسانی تردا هەیە و دەبێتە هۆی ئەوەی ژن بهێنن، لە مندا نییە.

مریەمی بێرت گوتی: من دەزانم ئەوانەی کە تۆ دەیانڵێیت، پاساوە و، تۆ لەبەرئەوەی ئەو کچە میسرییەت خۆش دەوێ کە لە گەڵتدایە، بۆیە ناتەوێ ببیتە مێردی من. بەڵام من ڕازیم بەوەی کە تۆ دوو ژنت هەبێت و، هەرچەندە جوولەکەکان دوو ژن ناهێنن، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ یەهوودی نیت، دەتوانی دوو ژن بهێنی کە یەکێکیان من و ئەوی تریان ئەم کچەیە کە لەگەڵ تۆدایە.

من لەبەرئەوەی گوێم بۆ قسەی مریەمی بێرت دەگرت، نەمزانی مێرنا لەخەو هەستاوە و گوێ بۆ قسەکانی ئێمە دەگرێت. ئەو کچە گەنجە نەیدەزانی مریەمی بێرت

چی دەڵێ، بەڵام هەستی دەکرد کە قسەکانی پەیوەندنی بە چییەوە هەیە، بۆیە بە زمانی یۆنانی گوتی: مارکۆس مەزن تیوس، من نازانم ئەم ئافرەتە چی دەڵێت، بەڵام هەست دەکەم حەزی لە تۆیە و حەز دەکات تۆ ببیت بە مێردی، دیارە منیش کە لەگەڵ تۆم، کێشە بۆئەم ئافرەتە دروست دەکەم، بۆیە من لەتۆ جیا دەبمەوە و، لەبەرئەوەی کە پارەم هەیە، دەتوانم بژیم و، پارەکەشم هەر ئەوەیە کە تۆ پێت داوم.

گوتم: میرنا، تۆ دەزانی کە من پێم گوتی برای تۆم و تۆش خوشکی منی، وانییە؟

میرنا گوتی: وایە.

گوتم: ئەم خوشك و برایەتییەمان دەمێنێتەوە، بە تایبەت لەوکاتەوەی کە عیسا منی بۆلای تۆ نارد. من هەرگیز لەبیرم ناچێ کە ئەو ڕۆژەی لە دەریاچەی جەلیلە تووشی تۆفان هاتم و دوای ئەوەی تۆفانەکە ئارام بوویەوە، شەو داهات ومن و هاوکارەکانم کە لێخوڕی بەلەمەکە بوون، ناچار بووین لە لێوارێکی نەناسراودا واتە ئەو کەنارەی کە لێخوڕەکانی بەلەمەکە ئەو جێگەیان نەدەناسی، لە بەلەمەکە دابەزین. لەوێ ڕاوچییەکی ماسی کە نەماندەناسی، لەلای ئاگرەکەی خۆی جێگای بۆ کردینەوە و جلوبەرگەکانمان وشك کردەوە و لە خواردنەکەی خۆیی پێداین و تێرنانی کردین. پاشان بە منی گوت کە لە پێشبڕکێیەکی گالیسکەسواریدا خەڵاتی گەورەی پێشبڕکێکە دەبێت بە نسیبم و، لەبەرئەوەی من پێویستم بەو خەڵاتە نییە، باشتر وایە ئەو خەڵاتە بدەم بە کچێکی گەنج کە بەخێوکەرەکەی لەدەست داوە. ئەو شەوە من نەمزانی ئەو پیاوە ڕاوچییە کێیە، بەڵام دوای ئەوەی پێشبینی ئەو پیاوە بەڕاست گەڕا، ئینجا بیرم کردەوە کە ڕەنگە ئەوە عیسا بووبێت. بەهەر حاڵ، ئێمە لەبەرئەوەی بەپێی ویستی عیسا بووین بە خوشك و برا، بۆیە نابێ ئەم پێوەندییە پیرۆزە لەناو بەرین.

مریەمی بێرت کە لە زمانی میرنا تێدەگەیشت، لێی پرسیم: ئەم ئافرەتە چی بەتۆ دەڵێ؟

گوتم: پشتگیری لە تۆ دەکات و دەڵێ کە ئەگەر دەبێتە کێشە بۆ تۆ، ئەوا ئەو لە من جیا دەبێتەوە.

مریەمی بێرت پرسی: تۆ چیت بەو گوت؟

وەڵامم دایەوە: من بەوم گوت کە نابێ لێم جیا ببێتەوە، چونکە پەیوەندەیەکانی من و ئەو پەیوەندییەکی خوشك و برایانەیە. ئەگەریش من ژن بێنم، ئەوا دیسان نابێ

میرنا لە من جیا بێتەوە، چونکە ژن هێنانی برا، نابێ ببێتە هۆی جیابوونەوەی خوشك و برایی.

مریەمی بێرت گوتی: مارکۆس مەزن تیوس، تۆ ئەگەر ببیتە مێردی من، ئەوا من داوا لە ڕۆحانییەکانی خۆمان دەکەم بێیتە ناو ئایینی جوولەکەوە و، دوای ئەوەی کە بوویت بە یەهوودی، ئیتر دەبیتە بەشێك لە دیارترین کەسەکانی کۆمەڵگەی دنیا. تۆ ئێستە پیاوێکی پیسیت و فەرسیەکان کە کۆمەڵێکی دەمارگیری جوولەکەن، دەڵێن کە هەر جوولەکەیەك لەگەڵ ناجوولەکەیەکدا پەیوەندی دروست بکات، پیس دەبێت و دەبێ خۆی بشوات تا خاوێن ببێتەوە. بەڵام دوای ئەوەی کە تۆ بوویت بە یەهوودی و خەتەنەیان کردیت، خاوێن دەبیتەوە و، لەوە بەدواوە بە بەشێك لە کوڕانی ئیسرائیلت دەزانن و دەتوانی بڕۆیت بۆ پەرستگا و لەگەڵ ڕۆحانییەکاندا نان بخۆیت، بەڵام ئەمڕۆ پیسیت و جوولەکەکان تۆ لەخۆیان دوور دەخەنەوە.

گوتم: من ئەگەر پیس بوومایە، پێری شەو لە کێوەکە، عیسا لەگەڵ من قسەی نەدەکرد. گفتوگۆی ئەو لەگەڵ من دەیسەلمێنی کە منی بە پیس نەدەزانی و، منیش بۆ خزمەتکردن بە عیسا ناچار نیم ئایینەکەی پەسەند بکەم.

مریەمی بێرت گوتی: مارکۆس مەزن تیوس، ئایا دەزانی کە من ئەگەر ببمە ژنی تۆ، چەندە فیداکارییەکی گەورە دەکەم لە پێناوی تۆدا؟

گوتم: مریەمی بێرت، تۆ ئەم فیداکارییە مەکە و، ئەو پەیمانە بهێڵەرەوە کە لەگەڵ ئەو کوڕە گەنجە بەستووتە. لەبیرت بێ کە من ئەو گەنجەم بە گوێدرێژەکەی خۆم گەیاندە کێوەکە، چونکە قاچی شکابوو و نەیدەتوانی بڕوات لەڕێ. ئەگەر بە گوێدرێژەکەی خۆم ئەو گەنجەم نەگەیاندایەتە کێوەکە، جگەلەوەی کە نەیدەتوانی عیسا ببینێت و چاك نەدەبۆوە، بەڵکو تۆیشی نەدەبینی تا حەزت لێ بکات. هەروەها ئاشنایەتی تۆ لەگەڵ ئەو گەنجەدا پەیوەستە بە منەوە و، ئەگەر من ئەو گەنجەم نەگەیاندایەتە کێوەکە، تۆ لە گەڵیدا ئاشنا نەدەبوویت. کاتێ ئافرەتێ بەڵێن دەدات بە پیاوێ کە ببێتە ژنی، لەڕاستیدا ژنی ئەوە و نابێ لە بەڵێنەکەی خۆی پەشیمان بێتەوە، مەگەر ئەو پیاوەی کە بەڵێنی هاوسەرگیری پێداوە، بەڵێنەکەی خۆی نەباتە سەر. من پێش ئەوەی گەشت بکەم بۆ ئەو کێوە، هیچ ئاشنایەتییەکی پێشینەم لەگەڵ ئەو گەنجەدا نەبووە، بەڵکو تەنیا لەو گەشتەدا ناسیم. بەڵام دەزانم کە ئەو، کابرایەك نییە

بەڵێنەکەی خۆی بخاتە ژێرپێی. ئەو گەنجێکی ڕۆح پاکە و ڕوخساریشی وانیشانی دەدات کە بەڵێنەکەی خۆی دەباتەسەر. منیش دیارییەکت دەدەمێ کە دیاری هاوسەرگیری تۆیە لەگەڵ ئەو گەنجەدا و، تۆ دەتوانی ئەو دیارییە ببەیت بۆ ماڵی ئەو گەنجە.

مریەمی بێرت گوتی: زۆر باشە، ئەو دیارییەم بدەرێ تا بڕێك لەو زەحمەتانەی کە بۆ تۆم کێشابوو، قەرەبوو بکەیتەوە.

کاتێ لەگەڵ مریەمی بێرت گفتوگۆم دەکرد، ژمارەیەك لە گەشتیارەکانی میوانخانەکە بەڕێ کەوتن و ڕۆشتن. دواتر مریەمی مەجدەلییە هات بۆلای من و گوتی: مارکۆس مەزن تیوس، دەبینی کە خۆر چەندە درەوشاوەیە و چۆن زەوی بەهۆی تیشکی خۆرەوە ڕووناك بۆتەوە و، ئەو کۆترانە دەبینی کە لە ئاسماندا دەفڕن؟ تۆ هەرگیز تیشکی خۆر و دیمەنی ئاسمان و زەویت بەم ئەندازە جوانییە بینیوە؟ جوانییەکە هۆی ئەوەیە کە مەلەکوتی عیسا لەسەر زەوی دروست بووە. ئەمڕۆ من شادومانم، چونکە دەزانم ئەم زەوییەی کە من لەسەری هەنگاو دەنێم، مەلەکوتی عیسایە و ئەم کەشەی کە من هەواکەی بۆ ناو سنگم هەڵدەمژم، مەلەکوتی عیسایە. من ئەمڕۆ هەموو مرۆڤێك بە خوشك و برای خۆم دەزانم و، لەلای من جولەکە و ڕۆمی یەکن و، بەم هۆیەشەوە ئەی مەزن تیوس وەکو برایەکی خۆم دەستت ماچ دەکەم.

پاشان ڕوومەتی میرنا و ئینجا ڕوومەتی مریەمی بێرتی ماچ کرد. من سەیری زەوی و ئاسمانم کرد و زانیم کە مریەمی مەجدەلییە ڕاست دەکات و هەرگیز خۆر ئەوەندە درەوشاوە نەبووە و هیچ کاتێ زەوی ئەوەندە جوان نەبووە و، هیچ ڕۆژێ ئاسمان ئەوەندە بە شینی نەدەبینرا.

دڵم لە خۆشیدا گەشایەوە و هەستم کرد مەلەکوتی عیسا گەیشتۆتە سەر زەوی و، ئەو زەوییەی کە من هەنگاوی لەسەر دەنێم، بەشێکە لە مەلەکوتی عیسا. ئینجا بە شادومانییەوە بەڕێ کەوتم و ئەوەندە خۆشحاڵ بووین کە عەسر گەیشتینە مەجدەلییە و کەسیش بیری خواردن و خواردنەوەی نەبوو.

## میوانداریيەکەی مریەمی مەجدەلییە

کاتێ گەیشتینە ماڵی مریەمی مەجدەلییە، خزمەتکارەکانی لە بینینی ئەو زۆر خۆشحاڵ بوون، چونکە کاتێ مریەمی مەجدەلییە لەگەڵ مریەمی بێرت لەماڵ چۆتە دەرەوە تا بڕوات بۆ کێوەکە، بە خزمەتکارەکانی نەگوتبوو بۆکوێ دەڕوات و، ئەوانیش نیگەران بوون و بۆیەش بە بینینی مریەمی مەجدەلییە زۆر خۆشحاڵ بوون.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: بڕۆن دەرگای کۆگاکە بکەنەوە و هەمووتان جلی تازە لەبەر بکەن. پاشان دەرگای کۆگای خواردنەکە بکەنەوە و ئازوقە دەربێنن و خواردنی جۆراوجۆر و فراوان لێ بنێن، چونکە ئەمشەو لە ماڵەکەمدا میوانداریی دەکەم و، ئەم میوانداریيە بۆ شوکرانەی ئایینی عیسا دەکەم. پێرێ شەو لە کێوەکەدا بەلایەنی کەمەوە پێنج سەد کەس بەچاوی خۆیان عیسایان بینی و، ئەویش کە دوای مردن زیندوو بوویەوە، هات بۆلامان و هەموو ئەو نەخۆش و بریندارانەی کە لە کێوەکە بوون، شیفای دان و هەرکەسێ کوێر بووایە بینایی بۆ دەگەڕایەوە. ئێوە هەندێکتان دەبێ بەپەلە خەریکی چێشت لێنان بن و، هەندێکی تریشتان بڕۆن و لە کۆڵانەکانی مەجدەلییە خەڵك بانگهێشت بکەن و ئەمشەو بۆ نانخواردن بیانهێنن بۆماڵی من، بەلاّم ئاگادار بن ڕۆحانییەکان و گۆرانی بێژ و فەریسییەکان بانگهێشت نەکەن، بەڵکو تەنیا ئەو کەسانە بانگهێشت بکەن کە هەژارن و کەسانی گوناهکارین، چونکە دوای ئەوەی کە عیسا خۆی نیشانی خەڵك دا و مەلەکوتەکەی خۆی بەستەوە بە زەوییەوە، هەموو گوناهکارەکان بەخشران و، هەموو گوناهبارێك لە ئێستادا وەکو بێگوناه وایە مەگەر دیسان تووشی گوناه ببێتەوە و بێگوناهی خۆی لەدەست بدات.

خزمەتکارەکانی مریەمی مەجدەلییە بەقسەیان کرد و کۆمەڵێکیان خەریکی چێشت لێنان بوون و کۆمەڵێکی تریشیان لەماڵ چوونە دەرەوە بۆئەوەی خەڵك بانگهێشت بکەن تا شەو بێن بۆ نانخواردن.

پاشان مریەمی مەجدەلییە دەستی خستە سەرشانم و سەیری کردم و گوتی: کابرای ڕۆمی، تۆ لەبەرئەوەی مامۆستای مەزنی ئێمەت بینیوە بۆیە ئێستە بێگوناهیت، چونکە هەموو گوناهەکانت بەخشراوە، بەلاّم لەوانەیە لە داهاتوودا تووشی گوناه

ببیتەوە. ئەگەر لە داهاتوودا تووشی گوناه بوویت، ئەوا گوناهی خۆت بەبچوك مەزانە و مەڵێ گوناهی من گەورەتر نییە لە گوناهی کەسانی تر. من ناتوانم بڵێم کە ئایا گەورەیی گوناه پەیوەستە بە فراوانی تێگەیشتنەوە یان نا. لەوانەیە لەلای خوداوەند گوناهی ئەو کەسانەی کە بێ ئاگا و نەزانن، بچوکتر بێ لە گوناهی کەسانی بەئاگا و دانا، هەروەکو چۆن گوناهی منداڵێك شایانی چاوپۆشی لێکردنە، بەڵام گوناهی ژنێك یان پیاوێکی پێگەیشتوو چاوپۆشی لێ ناکرێت، چونکە منداڵ بێ ئاگایە و هیچ نازانێ بۆیە هەژمارێکی جیای بۆ دەکەن. ئەگەر تۆ لە داهاتوودا تووشی گوناه بوویت، ئەوا لەجیاتی ئەوەی گوناهەکەی خۆت بە بچوك بزانی، لەلای مامۆستای نەزنمان کە هەموو شتێ دەبینێ و بۆ هەموو شوێنێ دەڕوات، تەوبە بکە.

پاشان مریەمی مەجدەلییە گوتی: عیسا نێردراوی خودایە، بەڵام لە شێوەی مرۆڤ دروست کراوە و چۆتە ژێرباری هەموو ڕێوشوێن و هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ تابتوانێ مرۆڤ ڕزگار بکات. من ئافرەتم و بەقەدەر پیاوان و بەتایبەت بەقەدەر ئەو کەسانەی کە قوتابی عیسان، هۆشم نییە. بەڵام لەوە تێگەیشتووم کە عیسا لەو ڕووەوە لەسەر شێوەی مرۆڤ دروست کراوە و چۆتە ژێرباری ئازارەکانی مرۆڤەوە تا ئێمە بتوانین لەزمانی ئەو تێبگەین، چونکە لەنێو ئەو بوونەوەرانەی کە لەم دنیایەدان، تەنیا لەزمانی مرۆڤ دەگەین. ئێمە ناتوانین لەوە تێبگەین کە (با)یەکان و بارانەکان و دەریاکان و کێو و گیانەوەرەکان چی دەڵێن. ئێمە دەنگی کێوەکان و درەخت و دەریاکان نابیستین، بەڵام دەنگی گیانەوەرەکان دەبیستین، کەچی بەم حاڵەشەوە ناتوانین تێبگەین کە ئەوان چی دەڵێن. لەنێو هەموو بوونەوەرەکاندا تەنیا مرۆڤە کە دەتوانێ لەگەڵمان بدوێ و لێی تێبگەین کە چی دەڵێت. ئەگەر عیسا لەسەر شێوەی مرۆڤ نەهاتایە، ئەوا نەیدەتوانی مرۆڤ هیدایەت بکات بۆ ڕێگەی ڕاست و، ئەم فیداکارییە گەورەیەی کرد تا ببێتە هۆی ڕزگاربوونی ئێمە.

دوای ئەم قسەیە، بابەتی وتووێژەکە گۆڕا و، من لەبارەی ئەو دیارییەی کە دەبوو بەبۆنەی هاوسەرگیری مریەمی بێرت پێم بدایە، قسەم کرد و گوتم: دوای ئەوەی کە گەڕامەوە بۆ تەبەرییە، دیارییەك بۆ مریەمی بێرت دەکڕم.

مریەمی مەجدەلییە گوتی: من زۆر حەز دەکەم مریەمی بێرت زووتر شوو بکات، بەڵام بۆئەوە نا کە لەماڵی من بڕواتە دەرەوە، بەڵکو بۆئەوەیە کە دەزانم لە بێ مێردیدا ئازار دەچێژێ.

پاشان بەو شێوەیە درێژەی دا بە قسەکانی: هەرکە مریەمی بێرت شووی کرد، من لێرە دەڕۆم و لەگەڵ قوتابییەکانی عیسا یەك دەگرمەوە. قوتابییەکانی عیسا بەپێی فرمانی پێشەواکەمان دەڕۆن بۆ قودس و لەوێ چاوەڕێ دەکەن تا ئەوەی کە مامۆستای مەزنمان بەڵێنی داوە، بەرگی ڕاستەقینەی بکرێ بەبەردا.

ئینجا ماڵئاواییم لە مریەمی مەجدەلییە و مریەمی بێرت کرد بۆئەوەی بگەڕێمەوە بۆ ژوورەکەی میرنا. لەکاتی گەڕانەوەماندا، مریەمی بێرت دەستی بە گریان کرد و میرناش گریا و مریەمی بێرتیش گوتی: من نازانم جارێکی تر دەتبینمەوە یان نا.

گوتم: کەس لە داهاتوو ئاگادار نییە و لەوانەیە ڕۆژی بێت من بێمەوە بۆ ئێرە و تۆ ببینمەوە.

ئینجا لەگەڵ میرنا گەڕامەوە و دوای ئەوەی لە مەجدەلییە تێپەڕمان کرد، گەیشتینە لێواری دەریاچەی جەلیلە.

# گەڕانەوە بۆ ڕۆم

ئێمە نەمانتوانی بەلەمێك بەكرێ بگرین و خۆمانی پێ بگەیەنینە تەبەرییە، بەڵام لەبەرئەوەی ماندوو نەبووین، بۆیە وامان بەباشتر زانی كە بەپێ لە لێواری دەریاچەكەوە خۆمان بگەیەنینە تەبەرییە. هەردووكمان لەو پیادەڕۆییە چێژمان وەردەگرت چونكە هەوای سافی دەریامان هەڵدەمژی و پێش ئەوەی خۆریش ئاوا ببێ، گەیشتینە تەبەرییە.

من دەمویست دوای تێپەڕبوون لە مەیدانی گەورەی شاردا، بڕۆم بۆ ئەو لایەی تری تەبەرییە كە گەرماوەی ئاوی گەرمی كانزایی لێ بوو، لەوكاتەدا جەستەی پیاوێكی زل بەر جەستەم كەوت. من بۆئەوەی بزانم ئەو پیاوە كێیە، بە وردی سەیرم كرد و بە سەرسوڕمانەوە بینیم كە شەمعونی خەڵكی كورنە.

لەو ڕۆژەوەی كە ڕووداوەكانی ماڵەكەی ئەو (كە باسەكەی تێپەڕیوە) ڕووی دا، من شەمعونی خەڵكی كورنم نەبینیبۆوە. ئەگەرچی كە ماوەیەكی زۆر بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێنەپەڕیبوو، بۆم دەركەوت شەمعون پیربووە و مووەكانی سەری سپی بوون و شكست لە چاوەكانی ئەودا بەدی دەكرا.

گوتم: شەمعون، من دەمەوێ بە هۆی ئەو ڕووداوەی كە لە ماڵەكەی تۆدا ڕووی دا، داوای لێبوردنت لێ بكەم. ئەگەرچی من لەو ڕووداوەدا خەتابار نەبووم، بەڵام لەبەرئەوەی ڕەنگە تۆ من بە بەرپرسیار بزانی، بۆیە دوای لێبوردنت لێ دەكەم.

شەمعونی ئەهلی كورن گوتی: من تۆ بە بەرپرسیار نازانم لەو ڕووداوە و گلەییم لێت نییە.

گوتم: تۆ ئەوكاتە واتدەزانی من جادووگەرم. ئایا ئێستە بۆت دەركەوتووە كە من جادووگەر نیم؟

شه معون گوتی: بەلێ.

گوتم: منیش وەكو تۆ لە كێوەكە دێمەوە. ئایا حەز دەكەی پێم بڵێیت كە ئێستە بۆچوونت چۆنە بەرامبەر بە "ئەو"؟

شەمعون گوتی: ئێمە لە کێوەکە زیاتر لە پێنج سەد کەس دەبووین، بۆیە سەیر نییە کە من تۆم نەبینیوە. بەتایبەت ئەوکاتەی کە هەندێ لە گەشتیارەکان شەو گەیشتنە سەر کێوەکە، خەڵکەکانی تریان نەبینیوە و خەڵکانی تریش نەیانتوانیوە ئەوان ببینن.

دوای کەمێك بێدەنگی، شەمعونی ئەهلی کورن وای گوت: لە قودس گوتبوویان کە هەرکەسێ دەیەوێ عیسا ببینێ، بڕوات بۆ ناوچەی جەلیلە، بۆیە منیش ڕۆشتم جەلیلەم بەلاّم نەك تەنیا بۆ بینی عیسا، بەڵکو لەم ناوچەیە کاریشم هەبوو. هەندێك لەو کەسانەی کە بۆ بینینی عیسا هاتبوون بۆ ئێرە، نەیانتوانی ئارام بگرن و، کاتێ نەیانتوانی عیسا ببینن، گەڕانەوە. بەلاّم من لە ڕابردوودا کۆیلە بووم و کۆیلەش ڕاهاتووە بەوەی ئارام بگرێ. ئەوەبوو ئارامم گرت تاکو ئاگاداریان کردمەوە کە بۆ بینینی عیسا بڕۆم بۆ شاخ. منیش ڕۆشتم بۆ کێوەکە و بە چاوەکانی خۆم ئەوم بینی و، دڵنیام کە خودی عیسام بینیوە، چونکە من عیسام دەناسی و بەو جۆرەی بۆم گێڕایتەوە، خاچەکەیم بە کۆڵ کێش کرد.

لە منت پرسی کە ئێستە بۆچوونم چۆنە لەبارەی عیساوە. دەبێ پێت بڵێم کە من پێش زیندوو بوونەوەی عیسا، بیروبۆچوونم باش نەبوو بەرامبەری، چونکە عیسا بێزارە لە دەوڵەمەندەکان و تەنیا هەژارەکانی خۆش دەوێ. ئەو سەردەمانەی کە من کۆیلە بووم، چێژم لە ئامۆژگارییەکانی عیسا وەردەگرت، بەلاّم دوای ئەوەی خۆم ئازاد کرد و سەروەت و سامانم پێکەوە نا، ڕام لە فێرکردنەکانی عیسا نەبوو. لەبارەی تازە بوونەوەی ژیانی عیساش گومانم هەبوو، چونکە هەندێ شت هەیە کە تا مرۆڤ بەچاوی خۆی نەیبینێت، ناتوانێ باوەڕی پێ بکات و یەکێ لەوانەش، زیندوو بوونەوەی مردووە. بەلاّم دوای ئەوەی بەچاوەکانی خۆم عیسام لەسەر کێوەکە بینی، ئیتر گومان لە تازە بوونەوەی ژیانی نەما. ئێستە بڕوام وایە کە ئەو نێردراوی خودایە، چونکە نێردراوی خودا دەتوانێ دوای مردن زیندوو ببێتەوە و خۆی نیشانی خەڵك بدات. ئەگەرچی کە حەز ناکەم سەروەت و سامانەکەم لەدەست بدەم، کەچی ئێستە کە بڕوام هێناوە بە زیندوو بوونەوەی عیسا، چارەیەکم نییە جگە لەوەی ملکەچی یاساکانی ببم و، دەست لە سەروەت و سامانەکەم هەڵبگرم. لەوکاتەوەی کە من عیسام لەسەر کێوەکە بینیوە،

هەموو شتێ لەبەر چاومدا بەجۆرێکی تر دەبینرێ، چونکە بە چاوێکی تازەوە دنیا دەبینم.

گوتم: شەمعون، ئایا ڕقت لە منە لەبەرئەوەی کابرایەکی ڕۆمیم؟

شەمعون گوتی: بۆچی ڕقم لە تۆ بێت. مەگەر پێم نەگوتیت کە بە چاوێکی تازەوە دنیا دەبینم؟ ئێستە بەلای منەوە تۆ کە ڕۆمیت، لەگەڵ یەهوودییەك و یۆنانییەك جیاوازیت نییە و هەموو مرۆڤێك بە یەکسانی دەبینم و، ئەوە تەنیا عیسایە کە دەتوانێ لە ناخی خەڵك تێ بگات و بزانێ چی لە ناخی کەسەکاندایە.

دوای ئەوەی لە شەمعونی کورن جیا بووینەوە، ڕێگەی ئەو میوانخانەیەمان گرتەبەر کە شوێنی نیشتەجێ بوونی من بوو. ئەو شەوە من و میرنا لە میوانخانەکە نووستین و ڕۆژی دواتر من بەرەو شوێنی نیشتەجێ بوونی کلودیای ژنی فەرمانڕەوای گشتی یودە ڕۆشتم.[72] من بۆئەوە ڕۆشتم بۆ ماڵی کلودیا تا ڕووداوەکانی سەر کێوەکەی بۆ بگێڕمەوە و بڵێم کە من و خەڵکانی تر عیسامان بینیوە و، ئەو، شیفای نەخۆشەکانی دا و نابیناکانی چاك کردەوە.

کلودیا کاتێ ئەم قسانەی منی بیست، گوتی: بە داخەوە کە من لەو کێوە نەبووم تا داوا لە عیسا بکەم شیفای منیش بدات تا بتوانم شەوان بخەوم.

گوتم: کلودیا، من دڵنیام کە هەرکاتێ تۆ بڕوا بە عیسا بهێنی و بە ڕاستی بە پێغەمبەری خودای بزانی، ئەوا چاك دەبیتەوە. چونکە هەرکەسێ بە دڵێکی سافەوە بانگی عیسا بکات، ئەو دێت بۆلای و، ئەگەرچی بە چاوەکانی خۆی نەیبینیبێ، بەڵام هەرکە عیسا هات بۆلای ئەو کەسە، ئەوا ئەگەر ئەو کەسە نەخۆش بێت، شیفای دەدات.

کلودیا پرسی: ئێستە تۆ دەتەوێ چی بکەیت؟

گوتم: من دەمەوێ لێرە بڕۆم.

کلودیا پرسی: بۆچی دەڕۆی؟

گوتم: بۆئەوەی قوتابییەکانی عیسا ڕۆشتوون بۆ قودس و لەوێ چاوەڕێ دەکەن تا ئەوەی کە عیسا گوتویەتی، بەڕاست بگەڕێ.

کلودیاپرسی: عیسا چی گوتووە؟

---

[72] (یودە) کە عەرەبەکان بە (یەهوودە) وەریدەگێڕن یەکێك بوو لە ناوچەیەکی فەلەستینی گەورە کە هەموو شارەکانی ئەم سەرگوزشتەیەی تێدا بوو و باسیان لێوە کراوە و بە هۆی گەورەیی و مەرکەزییەتی (ستراتیجییەتی) وڵاتی "یودە"وە لە نووسیندا لەجیاتی ( کەنعان) بەکاری دێنین.

گوتم: من لەم بابەتە بێ ئاگام، بەڵام قوتابییەکانی عیسا دەزانن کە لە قودس دەبێ چاوەڕێی چی بکەن.

کلودیا گوتی: بەتەنیا دەڕۆی؟

گوتم: نەخێر، من لەگەڵ کچێکی گەنجدا دەڕۆم بۆ ئەوێ.

پرسی: مارکۆس مەزن تیوس، تۆ خۆشەویستت هەیە؟ ئەو کچەی کە لەگەڵ تۆ گەشت دەکات بۆ فەڵەستین، دەستگیرانی تۆیە؟

گوتم: نەخێر کلودیا، ئەو کچە خوشکی منە.

کلودیا گوتی: من نەمزانیوە کە تۆ خوشکیشت هەیە.

گوتم: پێش ئەوەی بێم بۆ یودە، خوشکم نەبوو، بەڵام دوای ئەوەی هاتم بۆ ئێرە، خوشکم بۆ پەیدابوو، واتە عیسا خوشکێکی بۆ پەیدا کردم و کچێکی گەنجی سپارد بە من بۆئەوەی وەکو برایەك بەخێوی بکەم.

کلودیا گوتی: مارکۆس مەزن تیوس، تۆ دەبێ هاوسەرێك هەڵبژێریت و، ئەگەرچی پیاو لە هەموو قۆناغێکدا دەتوانێ ژن بهێنێ، بەڵام باشترین کات بۆ هاوسەرگیری، ئەم تەمەنەی تۆیە و نابێ بە هۆی تەمبەڵییەوە ئەم هەلە لەدەست خۆت بدەی.

گوتم: کلودیا، من دوای ئەوەی عیسام بینی و بڕوام بەوەی هێنا کە مەلەکوتی ئەو لە زەویدا دروست بووە، بۆ هەمیشە دەستبەرداری ژنهێنان بووم، واتە تا زیندووم ژن ناهێنم.

کلودیا پرسی: بۆچی؟

گوتم: بۆ ئەوی بتوانم تەمەنی خۆم بۆ ناساندنی عیسا بە خەڵك تەرخان بکەم و لە ڕێی ماموستای مەزنمدا گیانم بەخت بکەم، چونکە بڕوام وایە تا کاتێ گیانی خۆم لە ڕێی عیسادا بەخت نەکەم، شایەنی خزمەتکاریی ئەو نابم. پیاوێکی ئاواش نابێ ژن بهێنێ و ببێتە خاوەنی منداڵ، چونکە بوونی ژن و منداڵ، لە فیداکاری پەشیمانی دەکەنەوە.

کلودیا گوتی: مەزن تیوس، من بە قسەکانی تۆ سەرسام نابم، چونکە پیاوێك کە توانیبێتی عیسا، دوای زیندوو بوونەوەی، ببینێت، دەبێتە پیاوێکی جیاواز لە پیاوانی تر و، خۆزگایە دۆخی منیش مۆڵەتی بدامایە کە وەکو تۆ بوومایە، بەڵام بەداخەوە کە

ناتوانم، چونکه ژنی فەرمانڕەوای گشتیم و پلەوپایەی من و مێردەکەم مۆڵەت نادات واز لە ژیانی خۆمان بهێنین و بە دوای عیسادا بڕۆین، ئەگینا منیش پەیڕەویم لەو ڕەوشتەی ئێوە دەکرد.

من سێ ڕۆژ لە تەبەرییە مامەوە تا ناتان گوێدرێژەکانی هێنا و، دواتر من و میرنا و ناتان ڕۆشتین. دوای ئەوەی گەیشتینە قودس، هەر لەو ماڵەی کە لە گەشتی یەکەممدا شوێنی نیشتەجێ بوونم بوو، نیشتەجێ بوومەوە و توانیم بزانم قوتابییەکانی عیسا لە کوێن. ئاشکرایە کە من لەبارەی ئەوەی کە عیسام لەو کێوەدا بینیوە، هیچم بە خاوەن ماڵەکە و ژنەکەی نەگوت. قوتابییەکانی عیسا گوتبوویان کە ئێمە نابێ لەبارەی عیساوە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بدوێین کە شوێنکەوتەی ئەو نین، بۆیە ئێمەش بە قسەی فەرمانەکانی ئەوانمان دەکرد.

دوای ئەوەی میرنام لە ماڵەکەی دانا، لەماڵ چوومە دەرەوە و بەرەو پەرستگا ڕۆشتم تاکو ببینم ئایا دەتوانم قوتابییەکانی عیسا بدۆزمەوە یان نا. بەڵام کاتێ پێم نایە ناو ئەو حەوشە گشتییەی کە گوتم هەموو کەسێ دەتوانێ بڕواتە ناوی، بینیم خەڵك بە گروپی بچوك بچوك لە حەوشەکەدا دانیشتبوون و خەریکی گفتوگۆن. کاتێ بە تەنیشت ئەو گروپانەدا دەڕۆشتم، ئەو کەسانەی کە خەریکی گفتوگۆبوون، قسەکانی خۆیان دەبڕی تاکو من تێپەڕ ببم. دیاربوو کە لەبارەی شتێکەوە قسە دەکەن کە نابێ کەسانی تر گوێیان لێی بێت. من لە خۆپارێزی ئەوان سەرم سوڕمابوو و توانیم بزانم کە دەربارەی چی قسە دەکەن، بۆیە لە نزیك دیوارەکەوە لەسەر زەوی دانیشتم و گوێم قوڵاخ کرد.

دوای چەند چرکەیەك بۆم دەرکەوت لە قسەکانی ئەو کەسانەی کۆ ببوونەوە، ناوی عیسا زۆر دووبارە دەبێتەوە و، بۆم دەرکەوت کە ئەوان لەبارەی عیساوە قسە دەکەن، بۆیە لە جێگای خۆم هەستامەوە و لە یەکێ لە سەڕافەکان کە لە ناوەندی حەوشەی پەرستگاکە دانیشتبوو، نزیك بوومەوە و سکەیەکی زیوم لە گیرفانم دەرهێنا و دام بە سەڕافەکە و داوام لێ کرد (پشین)م بداتێ و خەرجیەکەی لێ هەڵ بگرێت. پێش ئەوەی پیاوە سەڕافەکە سکە پشیزەکان بژمێرێت و بیدات بە من، گوتم: بۆچی خەڵك لێرە هەموویان لەبارەی عیساوە قسە دەکەن؟

سەرافەکە گوتی: بۆیە! چونکە لەناو شاردا هیچ باسێك نییە جگە لە باسی عیسا نەبێت.

گوتم: من ئەمڕۆ هاتووم بۆ ئەم شارە، بەڵام نازانم بۆچی خەڵك لەبارەی عیساوە قسە دەکەن.

سەرافەکە گوتی: بۆئەوەی چەند شەوێك لەمەو پێش عیسا لەناو پەرستگاکەدا دەرکەوتووە و هەموو کەسێ ئەویان بینیوە و لەهەمان کاتدا کە لە پەرستگادا دەرکەوتووە، هەندێ لەخەڵك لە بەشەکانی تری ناو شاریشدا ئەویان بینیوە. لەو شەوەوە تا ئێستا، ڕۆژێ نییە کە شوێنکەوتەکانی عیسا زیاتر نەبن و، بەم هۆیەوشەوە ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان زۆر تووڕە بوون.

پیاوە سەرافەکە جوولەکە نەبوو، بەڵکو دانیشتووی سوریا بوو، بۆیە پرسیم: ئایا لەلایەن ئەنجومەنی باڵای جولەکەکانەوە هیچ بڕیارێك دراوە؟

پیاوە سەرافەکە گوتی: هێشتا نا، بەڵام بێگومان بڕیار دەردەکەن تاکو نەهێڵن خەڵك باوەڕ بە عیسا بهێنن و، من پێموایە کە هاوکاری لە ڕۆمییەکانیش وەردەگرن و بە هاوکاری ڕۆم، بەر لە فراوان بوونی ڕاپەڕینی عیسا دەگرن.

گوتم: ئایا ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای جولەکەکانیش عیسایان بینیوە؟

پیاوە سەرافەکە گوتی: بەڵێ، ئەوانیش عیسایان بینیوە و بەو هۆیەشەوە زۆر ترساون. ئەگەر ئەوان عیسایان نەبینیایە، لە زیندوو بوونەوەی دەکرد و دەیانگوت کە مردوو هەرگیز زیندوو نابێتەوە. بەڵام لەبەرئەوەی ئەویان بینیوە و دڵنیان کە عیسا زیندوو بۆتەوە، لە ترسدا دەژین و لە داهاتووی خۆیان دەترسن. ژمارەیەك لە گەشتیارەکانیش کە لە قودسەوە ڕۆیشتن بۆ ناوچەی جەلیلە و لەوێوە گەڕاونەتەوە، دەڵێن کە لەهەمان شەودا کە دانیشتوانی شار عیسایان بینیوە، لەسەر کێوەکەش لەلای ئەوان دەرکەوتووە و قسەی لەگەڵ کردوون و، بۆیە بچوکترین گومانیان لە زیندوو بوونەوەی عیسا نییە. ئەو گەشتیارانەی کە لە ناوچەی جەلیلەوە هاتوون، دەڵێن کە ئەو شەوە لەسەر ئەو کێوە، بیانییەکانیشی لێ بووە و یەکێ لەوانە پیاوێکی ڕۆمی و ژنێکی میسری بوون کە لەوێ بوون.

من بەم قسەیە سەرسام نەبووم، چونکە دوور نەبوو هەندێ لە گەشتیارەکان زانیبێتیان کە من ڕۆمیم و، دوای گەڕانەوەم لە کێوەکە، ئەم مەسەلەیان بە خەڵکانی تر

گوتبێت. من ماوەی دە ڕۆژ لەگەڵ میرنا لەو شارە مامەوە بەبێ ئەوەی بتوانم هیچ یەکێ لە قوتابییەکانی عیسا بدۆزمەوە.

ڕۆژی دەیەم بیستم کە دوو کەس لە قوتابییەکان بە ناوەکانی پترۆس و یۆحەننا لەلایەن ئەنجومەنی باڵای جولەکەکانەوە دەستگیرکراون؛ بەڵام گیرانەکەیان لە یەك ڕۆژ زیاتری نەخایاندووە و، ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان ناچار بووە ئازادیان بکات. هەر ئەو ڕۆژە فەرماندەی مەخفەر کە لەسەرەتای ئەم چیرۆکەوە گوتم کە لە قەڵای ئەنتۆنییەدابوو، نامەیەکی بۆ نووسیم و تیایدا گوتبووی کە ((لەلایەن پنتوس پیلاتی فەرمانڕەوای گشتی یودەوە فەرمان دەکرێت بە مارکۆس مەزن تیوسی ڕۆمی لە یودە بڕواتە دەرەوە و، لە کاتێکدا ئەگەر ئەم فەرمانە جێبەجێ نەکات، ئەوا بەزۆر لە یودە دەکرێتە دەرەوە)).

من زانیم کە کردنەدەرەوەی منیش بەهۆی بڕیارەکانی ئەنجومەنی باڵای جوولەکەکانەوەیە و، ئەوان زانیویانە شوێنکەوتەی عیسام، بۆیە نەیانویستووە ڕۆمییەکی شوێنکەوتەی گیانی بەگیانی عیسا لە یودە بمێنێتەوە.

دوای وەرگرتنی نامەکە، چووم بۆلای فەرماندەی مەخفەر بۆئەوەی داوای ڕوونکردنەوەی لێ بکەم و ئەو گوتی: ئەم فەرمانە لەلایەن فەرمانڕەوای گشتی یودەوە گەیشتووە بەمن و، منیش هیچ چارەیەکم نییە جگە لەوەی کە دەبێ ئەوە جێبەجێ بکەم.

گوتم: ئایا ئەو گومانەم ڕاستە کە ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکان بوونەتە هۆی کردنەدەرەوەی من؟

فەرمانڕەوای مەخفەر گوتی: ڕاستە، ئەوان حەز ناکەن تۆ لێرە بیت، چونکە دەزانن کە تۆ شوێنکەوتەی عیسایت و، فەرمانڕەوای گشتیش لەبەرئەوەی کە دەیەوێت یەهوودییەکان لەخۆی نەڕەنجێنێت، بۆیە داواکاریی ئەنجومەنی باڵای یەهوودییەکانی قبوڵ کردووە و فەرمانی دەرکردنی تۆی دەرکردووە.

من تا ڕۆژی دواتر مۆڵەتم وەرگرت بۆئەوەی لەو شارە بڕۆمە دەرەوە و بەیانییە زووەکەی ڕۆژی دواتر لەگەڵ میرنا لەو شارە چووینە دەرەوە و ڕێگەی "سوریا"مان گرتەبەر و دەمویست دوای ئەوەی چووین بۆ سوریا، لە "دیمەشق" نیشتەجێ ببم.



**کاتێ کە لە خاکی یودە دەڕۆشتمە دەرەوە، گوێدرێژەکانم بەخشی بە ناتان و، بڕێك پارەشم پێ دا و، ئیتر ئەو پیاوەش بە خۆشحاڵییەوە لە من جیا بوویەوە.**

**★ ★ ★**

**لێرەدا نووسینی مارکۆس مەزن تیوسی ڕۆمی تەواو دەبێت.**

**مارکۆس مەزن تیوس دوای ئەوەی کە ڕۆشت بۆ سوریا، ماوەیەك لە دیمەشق مایەوە و پاشان لەگەڵ میرنا ڕۆشتن بۆ میسر. لە میسردا مارکۆس مەزن تیوس مێردێکی بۆ میرنا پەیدا کرد و، دوای ئەوەی میرنا مێردی بۆ پەیدابوو، مارکۆس مەزن تیوس ڕۆشتەوە بۆ ڕۆم و لەوێ دەستی کرد بە بانگەوازکردن بۆ ناساندنی عیسا و ئایینەکەی. مارکۆس مەزن تیوس توانی ژمارەیەك لە ڕۆمییەکان بهێنێتە سەر ئایینی عیسا و، ماوەیەك حکومەتی ڕۆم حەقی بەسەر مارکۆس مەزن تیوسەوە نەبوو، چونکە نەیانزانیبوو کە ڕێنماییەکانی عیسا کە بەهۆی مارکۆس مەزن تیوسەوە بانگەوازی بۆ دەکرێت، چەندە لە دنیادا بۆ دیکتاتۆری ڕۆم ترسناکە و، هەروەها چەندە بۆ ئەو کەسانەی کە غولامی زۆریان هەیە، ترسناکە.**

**تەنیا لەشاری ڕۆمدا چوارسەد هەزار غولام لەخزمەتی گەورەکاندا دەژیان و، ئەوانیش بە وەرگرتنی ڕێنماییەکانی عیسا دەیانویست ئازاد بن و وەکو کەسانی ئازاد کە ناسنامەی ڕۆمییان هەبوو، بژین. ئەوەبوو کە حکومەتی ڕۆم لە بانگەوازی مارکۆس مەزن تیوس ترسا، بۆیە ئەوی گرت و خستییە زیندانەوە و پاشان بەپێی ویست و ئارەزووی خۆی کوژرا.**

**دەبێ مارکۆس مەزن تیوس بە یەکەم قوربانی ئایینی مەسیح بزانرێ و بەوجۆرەی کە دەیزانین، هەرچەندە ئایینی مەسیح فراوانتر دەبوو، دوژمنایەتی حکومەتی ڕۆم زیاتر دەبوو بەرامبەر بە مەسیحییەکان، بەجۆرێك کە ئەوانیان دەسوتاند یانیش لە سێرکدا دەیاندانە دەرخواردی گیانەوەرە دڕندەکان، بەڵام لە ئەنجامدا ئایینی مەسیح زاڵ بوو و، بوو بە ئایینی فەرمی و میللی ڕۆم.**

**کۆتایی**

ئەم کتێبە یەکێکە لە بەرهەمە گەورەکانی نووسەری گەورەی فنلەندی (میکاڤالتاری) کە لەدوای دوو کتێبە بەناوبانگەکانی (بەسەرهاتی سینۆهە پزیشکی تایبەتی فیرعەون) و (ڕووخانی قوستەنتنییە)ەوە دێت. نووسەر زۆر بوێرە لە هەڵبژاردنی بابەتە مێژووییەکاندا، چونکە هەڵبژاردنی بابەتێك کە سەرچاوەی کەم بێت تا بتوانرێ پشتی پێ ببەسترێ بۆ تەواو کردنی بەرهەمێك، بوێری دەوێت و دەبێ بە ئەمانەتەوە ئەو بەرهەمانە و بەتایبەت بابەتە مێژووییەکان بخاتە بەردەم خوێنەر. نووسەر وەك دوو بەرهەمەکەی تری باسی سەردەمێکی مێژوویی دەکات کە چیرۆکخوان بەردەوام یادەوەرییەکانی خۆی لە گەشتەکەی بۆ "میسر" و "فەلەستین" لە ڕێگەی نامەکانییەوە کە دەینێرێ بۆ خۆشەویستەکەی بە ناوی "تولیا" لە وڵاتی ڕۆم، بەیان دەکات.






لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (7000) دینار